# تەفسیری سووڕەتی

# الكهف و مريم

نووسینی: عەلی باپیر

دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی

چاپی یەکەم ١٤٤١ز - ٢٠٢٠ك

٦٥٣ لاپەڕە

١٧* ٢٤ سم

بابەت : ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی ( ٧ ) ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

# پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتی

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيئَاتِ أعْمَالِنَا، مَنْ يَهْده اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِل فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأشْهَدُ أن لاَ إلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾ النساء.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب .

أمَّا بَعْدُ: فَإنَّ أَصْدَقَ الحَدِيثِ كَلامُ اللهِ، وَخَيْرَ الْهَدِي هَدْيُ مُحَمَّدٍ ﷺ وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٍ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّارِ[١].

**خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکان!**

هیچ گومانی تێدانیە - بۆ مرۆڤی بڕوادار - کە ئەو تەمەنەی لە خزمەت دوایین کتێبی خوا (قورئان)دا بەسەردەبرێ، جا بە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی لە خزمەتدابووندا بێ؛ خوێندنەوە، تێفکرین و ڕامان، فێرکردن، کارپێکردن ... هتد، بە باشترین جێگرتن جێگا دەگرێ و، خاوەنەکەی لە دنیاو دوارۆژدا لێی بەهرەمەندە.

منیش کە - وەك باسکردنی چاکەی خوا (التحدث بنعمة الله) دەیخەمەڕوو- لەوەتی فامم کردۆتەوە، خوای بەبەزەیی و بەخشەر چاکەی لەگەڵ کردووم و، بە فەرمایشتی بەرزو بێ وێنەی خۆیەوە سەرگەرمی کردوومو، بەر لە تەمەنی بیستساڵیی یەوە

---

(١) ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) کە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی فێردەکرد، پێش هەر قسەیەکی گرنگ، بیڵێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییکردن (خِطْبة)و... هتدو، ئەم وتارە، هەرکام لە: الترمذي: (١١٠٥)، النسائي: (١١٠٤)، ابن ماجه: (١٨٩٢) أحمد: (٣٧٢٠)، طبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێکی هێناوە.

هیدایەتی داوم، کە قورئانی بەڕێزو پێز لەبەر بکەم و، سەرقاڵی خوێندنەوەی تەفسیرەکانی قورئان و تێوەڕامانی ئایەتە پڕ بەرەکەتەکانی و، لێوردبوونەوەیان بم.

هەر بۆیەش تێکڕای کتێب و نامیلکەو وتارو دەرسەکانم، کەم و زۆر لەبەر ڕۆشنایی قورئان دابوون، کە دیارە ئەمەش هەر ئەمەش شتێکی سروشتییە؛ ئاخر ئایا ئیسلام بێجگە لە قورئان پاشان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەویش هەر ڕوونکردنەوەی قورئان و چۆنیەتی جێبەجێکردن و کارپێکردنیەتی، شتێکی دیکەیە؟! بێگومان نەخێر.

ئنجا لەمێژ ساڵیش بوو، کە براو خوشکانێکی دڵسۆزی نزیك و ئاشنام، داوایان لێدەکردم کە دەست بکەم بە دانانی تەفسیرو لێکدانەوەیەکی قورئان، هەتا لە ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٨)دا هاتە دڵمەوە، کە ناوی خوای لێبهێنم و دەست بەو کارە گەورەو گرنگە بکەم، بەڵکو وردە وردە بەپێی بوارو دەرفەت، هەرساڵە هەندێکی لێ ئەنجام بدەم، لەگەڵ سەرقاڵیی زۆرو جۆراو جۆریشدا، هەتا دەرفەتێکی وام بۆ دەڕەخسێ کە بتوانم خێرایی تێدا بکەم و خۆمی بۆ یەکلایی (متفرّغ) بکەمەوەو، خوا پشتیوان بێ تەواوی بکەم، ئەگەر ئەمەن بەبەریەوە مابێ.

سەرچاوەی دانانی ئەم تەفسیرو لێکدانەوەیەشم، وێڕای سەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیرانەی کە باون و، دەستم پێیان گەیشتوە، بریتیە لە وردبوونەوەو تێوەڕامانی خۆم لە خودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان: هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (القرآن يُفَسِّر بَعْضُهُ بَعْضاً)، پاشان سوونەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە پێغەمبەری خواش ڕوونکەرەوە (مُبَيِّن)ی قورئانە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل.

واتە: وە زیکرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار، تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی نێرراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بکەیەوە، وە بەڵکو خۆشیان بیربکەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشەر ﷻ - شایستەیی ئەوەم هەبێ تەفسیرو لێکدانەوەیەکی وا بۆ قورئان پێشکەش بە مسوڵمانانی کوردستان بکەم، کە لە قورئان بوەشێتەوەو، مایەی بەهرەو سوودی خوێنەران بێ، بەتایبەتیش کە زیاتر لە سی (٣٠) ساڵە لەگەڵ قورئانی بەرزو مەزن و تەفسیرەکانی و کتێبەکانی سوننەتدا خەریکم و، دەیان کتێب و بەرهەمی جۆراوجۆرم لە زۆربەی بوارەکانی زانستەکانی شەریعەتدا پێشکەش کردوون.

شایانی باسیشە کە ئەو بیست و دوو مانگ زیندانیی کرانەم لەلایەن ئەمریکاوە - لە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاکو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێکی گەورەو گرنگ بوو، بۆ زیاتر پێدا قووڵبوونەوەی کتێبی خوا (تبارك و تعالى)، وە بۆ پەیدابوونی تێگەیشتنی تایبەت لەبارەی زۆرێك لە ئایەتەکانی یەوە، ئەم ڕاستییەش لە مەوسووعەی : (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله تعالى)دا زۆر چاك درەوشاوەتەوە[1]. بەڵام هەڵبەتە ناڵێم و هیچکەسیش بۆی نیە بڵێ: کە ئەم تەفسیرەی من تێروتەواوە، چونکە وێڕای سنووردار بوونی توانا و برستم، لە بەرانبەر کتێبی لە هەموو ڕوویێکەوە ڕەها (مطلق)و بێسنوور (لا محدود)ی خوادا، نەشمویستوە کە زۆر بەملاولادا بچم و بچمە نێو هەندێك وردەکارییەوە، کە یان من تێیدا پسپۆڕو شارەزا نیم، یان خوێنەر پێویستی پێی نیە، لە کاتێکدا دەیەوێ لە قورئان تێبگات و، بزانێ خوا (تبارك وتعالى) ڕاستەوخۆ چی پێ فەرمووە؟!

ئنجا هەر لێرەشەوە بە پێویستی دەزانم پڕ بە دڵ سوپاسی ئەو برا گەنجە ڕووح سووك و گورج و گۆڵ و دڵسۆزە بکەم (حەزی نەکرد ناوی بهێنم)، کە هەڵسا بە نووسینەوەو هێنانە سەر کاغەزو، پاشان تایپکردن و دوایی پێداچوونەوەو هەڵەگیریی، سەرجەم ئەم زنجیرە دەرسە، کە لە ئەسڵدا لە شێوەی وتار (محاضرة)دا پێشکەش کراون، هەروەها هەڵسا بە (تخريج)ی سەرجەم دەقەکانی سوننەت، لە سەرچاوە متمانە پێکراوەکانەوەو، زەحمەت و ماندووبوونێکی زۆری بە سەرجەم بەرگەکانی ئەم تەفسیرە کێشاوە، خوا بە باشترین شێوە پاداشتی بداتەوەو، هەر ساڵح و ساغ و سەلامەت و سەربەرزبێ[2]، لە خوای بەرزو بێهاوتاش داواکارم ئەو جۆرە گەنج و لاوانە لە کوڕان و کچان، لەنێو گەلەکەماندا، زۆر بکات .

---

(١) ئەو مەوسووعەیە کە ئێستا چاپ کراوەو، کەوتۆتە بەردەستی خوێنەران و، سەرجەم هەشت بەرگ و دەوری سێ هەزارو پێنج سەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هەوڵمداوە بەگشتی تێیدا باسی سەرجەم لایەنەکانی ئیسلام بکەم و، تاکە سەرچاوەشم قورئان بووە، وێڕای دەقەکانی سوننەت، کە لە هۆش (ذاكرة)دا بوون.

شایانی باسە ئەو مەوسووعەیە لە چاپی دووەمی دا، کراوە بە دوازدە (١٢) کتێبی سەربەخۆ، بە مەبەستی ئاسانتر سوود لێ بینرانی .

(٢) ئەو برا دڵسۆزە ئێستاش پاش تەواوکردنی نیوەی زیاتری قورئان، لێبڕاوانە بەردەوامە و عەزمیشی جەزم کردوە، کە ئەگەر تەمەنمان بەردەوام بێ، هەتا کۆتایی ئەم تەفسیرە سەرگەرمی کارەکەی بێ .

شایانی باسیشە کە ئێمە لەم تەفسیرەماندا باسی بەش (جزء)ەکانی قورئان و دابەشکردنەکانی دیکەی وەك: - (حزب) - ناکەین، چونکە هەر سوورەتێك بۆخۆی شتێکی سەربەخۆیەو، سەرجەم ئایەتەکانی وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك پێکەوە پەیوەستن و، ئاشکراشە کە دابەشکرانی سەرجەم قورئان بۆ سی (٣٠) بەش (جزء) و شەست (٦٠) (حزب)، شتێکە لەلایەن زانایانەوە کراوە، بۆ ئاسانکاریی خوێندنی قورئان، دیارە ئێمە لە دابەشکردنی بەرگەکانی ئەم تەفسیرەشدا، دیسان حیساب بۆ بەشەکان (أجزاء)ی ناکەین و، بە گوێرەی سوورەتەکان، بەرگەکانی دیاریی دەکەین.

دوا قسەشم ئەوەیە کە:

ئەم تەفسیرە - وەك پێشتر گوتمان - لە ئەسڵدا بەشێوەی دەرس و وتار پێشکەش کراوە، بەڵام دواتر خۆم دووجار بە وردیی پێیدا چوومەوەو، بەپێی پێویست دەستکاریيم کردوە، دیارە هەموو دەرسێکیش بەناوی خواو ستایشی خوا ﷻ دەستی پێکردوە، بەڵام ئێمە لە سەرەتای دەرسەکانەوە، ئەوانەمان لابردوە، بۆ زۆر دووبارە نەبوونەوەو، ئەو (خطبة الحاجة)یەی لە سەرەتای ئەم پێشەکییەوە هاتوە، لەجیاتی سەرەتای سەرجەم دەرسەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ،

وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧

هەولێر

# بەرچاو ڕوونییەكی گرنگ لەبارەی ئەم تەفسیرەوە

**خوێنەری بەڕێز !**

هەرچەندە لە (پێشەكی گشتیی) ئەم تەفسیرەدا باسمان كردوە كە بۆ نووسینی ئەم تەفسیرە، لە هەموو ئەو تەفسیرە باوانەی دەستم پێیان گەیشتوە، بەهرەمەندبووم، هەروەها لە كۆتایی هەر بەرگێكی ئەم تەفسیرەدا، سەرجەم ئەو تەفسیرانەی كەم و زۆر لێیان سوودمەند بووم، ناوەكانیانمان بە ڕیز نووسیون، بەڵام لێرەش وەك جەختكردنەوەی زیاترو بەرچاوڕوونیی باشتر بۆ ئێوەی بەڕێز دەڵێم :

مادام ناوی تەفسیرەكانمان نووسیوە، نە پێویست دەكات و نەدەشگونجێ، بۆ هەر تێگەیشتن و بیرۆكەیەك، كە زۆربەی تەفسیرەكان لەبارەی ئایەتێكەوە، یان ڕستەو برگەیەكی ئایەتێكەوە، دەیهێنن، ئێمە هەموو جارێ ناوی ئەو تەفسیرانە بێنین، بەڵام بێگومان هەر كات بیرۆكەو تێگەیشتنێكی تایبەتی یەكێك لە تەفسیرەكان هەبێ و بكەوێتە بەرچاوم، ئنجا چ پەسندی بكەم، چ ڕەفزی بكەم، هەر كات بە پێویستی بزانم، بە تایبەت ئاماژەی پێدەكەم، ئەگەرنا بە ئاماژەی گشتیی و بە نووسینی ناوی تەفسیرەكان لە كۆتایی هەر بەرگێك دا، ئیكتیفا دەكەم و، زۆریش لە ئەمانەتی زانستیی (الأمانة العلمیة) دەخەفتێم و مەبەستمە ڕەچاوی بكەم، چونكە ئەمینیی و ئەمانەت پارێزیی، ڕەوشتێكی گەورەو بەرزی مسوڵمانەتییە .

شایانی باسیشە جاری وا هەیە بیرۆكەو تێگەیشتنێكی تایبەتیی خۆمم، دەربارەی كۆمەڵە ئایەتێك یان ئایەتێك یان ڕستەو برگەیەكی ئایەتێك، بۆ دروست دەبێ، وەك تێگەیشتن و بۆچوونی خۆم دەینووسم، كەچی ڕەنگە لە تەفسیرەكانی دیكەش - یەكێكیان یان زیاتر - دا هەبێ، ئەویش بەهۆی ئەوەوەیە كە من ئەو تەفسیرەم نەكەوتۆتە بەر دیدە، یان دیتوومەو لەیادم نەماوە.

# پێشەکی ئەم بەرگە

بەڕێـــــزان!

ئەم بەرگە (بەرگی پازدەیەم) لە تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز، دوو سووڕەتی تێدان:

١- سووڕەتی (الكهف).

٢- سووڕەتی (مريم).

شـایانی باسیشـە وێـڕای تەفسـیرکردنی ئایەتەکانـی ئەم دوو سـووڕەتە بـە حەوت هەنـگلو، وەك عادەتـی خۆمـان، لەهـەرکام لـەم دوو سـووڕەتەش دا، کۆمەڵێـك بابـەت و کورتـە بـاس هەن:

أ)- لە سووڕەتی (الكهف)دا، ئەم سێزدەیە هەن:

١- بەسەرهاتی هاوەڵانی ئەشکەوت لە سێ تەوەردا.

٢- قوڵە باسێك: حوکمی ڕاگرتنی سەگ.

٣- قوڵە باسێك حوکمی پارە پێکەوە کۆکردنەوە و شت کڕین بەهاوبەشێتیی.

٤- کورتە باسێك لە بارەی دروستکردنی مزگەوتەوە لەسەر گۆڕ.

٥- دەرس و پەندەکانی بەسەرهاتی هاوەڵانی ئەشکەوت.

٦- چوار سەرنجدانی گرنگ لەم ئایەتی ژمارە (٥١).

٧- دوو فەرمووده لە بارەی مشت و مڕ و (جدال)ەوە.

٨- نوکتەیەکی ڕەوانبێژیی.

٩- پێنج دەقی سوننەت و دوو زانیاریی گرنگ، لە بارەی بەسەرهاتی مووسا و خضرەوە.

١٠- دەرس و پەندو حوکمە شەرعییەکانی بەسەرهاتی مووسا و خضر.

١١- کورتە باسێك لەبارەی: خضر و زانیاریی پەنهانەوە.

١٢- بەسەرهاتی ذیلقەرنەین و چەند زانیارییەکی مێژوویی و جوگرافیی.

١٣- دەرس و پەندەکانی بەسەرهاتی (ذي القرنين).

ب- لە سووڕەتی (مریم)دا، ئەم دوازدەیە هەن:

١- ئیعجازێکی زانستی لە پێنج ئایەتی سەرەتای سووڕەتی (مریم) (١-٥)دا.

٢- پوختەی ژیاننامەی زەکەریا و یەحیا (عَلَيْهِما الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم).

٣- کورتەی بەسەرهاتی مەریەم و عیسای کوڕی.

٤- پەند و دەرس و حیکمەت لە بەسەرهاتی مەریەم و عیسادا.

٥- قوڵە باسێك: هەڵێنجانی دوو حوکمی گرنگ لە دوو ئایەتی (٤٧ و ٤٨).

٦- کورتە باسێك لە بارەی ئیسحاقەوە ﷺ.

٧- کورتە باسێك لە بارەی یەعقووبەوە ﷺ.

٨- جیاوازیی نێوان (رسول) و (نبي).

٩- کورتە باسێك لە بارەی (ئیسماعیل)ەوە ﷺ.

١٠- کورتە باسێك لە بارەی ژیان و بەسەرهاتی ئیدریسەوە ﷺ.

١١- کورتە باسێك دەربارەی چوونە سوێی دۆزەخ و ڕەتبوون بەسەر (صراط)دا.

١٢- پێنج کورتە سەرنجی زمانەوانیی لە دوو ئایەتی (٧٦ و ٧٧)دا.

کەواتە!

دەتوانین بڵێین: ئەم بەرگی پازدەمە، یەکێکە لە بەرگە هەرە چڕ و پڕ و قەڵەباڵغەکانی ئەم تەفسیرە و، بابەت و باسی زۆری کەوتوونە خۆی، کە وێڕای زیاتر بەرچاو ڕوونکردنەوەی خوێنەرانی سەنگین و شیرین لە بارەی تێگەیشتنی ئایەتەکانی هەردووك سووڕەتی (الكهف) و (مریم)ەوە، لە زۆر ڕووی دیکەشەوە، مایەی هۆشیاریی و بەرچاو ڕوونیی دەبن بۆیان.

ماوەتەوە بڵێم:

ستایشی شایستە بۆ خوای بەخشەری بەخشندە ئێستا (١/ ذي القعدة/ ١٤٤١هـ، ٢٠٢٠/٦/٢٢ز) لە تەفسیرکردنی قورئانی بەرز و بە پێزدا گەیشتووینە سووڕەتی (النبأ)،

واتـە: لـە سـی (٣٠) بـەش (جـزء)ی قورئـان، تەنیـا بەشـی کۆتایـی مـاوەو، خـوا پشـتیوان بـێ ئەویـش بـەم نزیکانـە تـەواو دەکەیـن و، ئێسـتاش هەمـوو ئـەوەی کە تەفسـیرمان کـردوە و، بە دەنـگ و وێنـە (صـوت و صـورة) تۆمـار کـراوە، کاری لەسـەر دەکـرێ بـۆ چـاپ و بڵاوکردنـەوە، لـە خـوای بـەرز و مـەزن و بەبەزەیـیـش دەپاڕێمـەوە: بـە باشـترین شـێوە پاداشـتی سـەرجەم هاوکارانـم بداتـەوە، لـە ئامادەکردنـی ئـەم تەفسـیرەدا، کـە ئومێـدم وایـە پیـت و پێزێکـی زۆری تێدابـێ و، لـە داهاتـوودا بـە زۆر شـێوە و لـە زۆر ڕووەوە، بەهـرەی لێوەربگیـرێ و قـەدری بزانـدرێ، چ بـە زمانـی کوردیـی کـە پێـی ئامادەکـراوە، چ بـە زمانەکانـی دیکـەش!

سُبْحَانَك اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

١/ ذي القعدة/ ١٤٤١هـ

٢٠٢٠/٦/٢٢ز

هەولێر

## دەستپێک

بەڕێــــزان!

ئەمــڕۆ کــە: ٢٧/ ذي القعــدة/ ١٤٣٨ ك، بەرانبــەر (٢٠١٧/٨/١٩) ز، لــە شــاری هەولێــر دەســتدەکەین بــە توێژینــەوەو لێکۆڵینەوە لـە بارەی ســوورەتی (الكَهْف)ەوە، ســەرەتا پێناســەیەکی ئــەو ســوورەتە دەکەیــن و، ئاماژەیــەك بــە نێوەڕۆکەکــەی دەکەیــن، لــە نــۆ (٩) بڕگــەدا.

### پێناسەی سوورەتی (الكهف):

**یەکەم: نـــــاو:** ئەم سوورەتە ناوی سوورەتی (الكَهْف)ە، واتە: ئەشکەوت، تەنیا ئەو ناوەی هەیە لە لای زانایان، لەبەر ئەوەی لە سەر زاری موبارەکی پێغەمبەر ﷺ ئەو ناوەی لێنراوە، وەك لەم فەرموودەیەدا هاتوە: {عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَنْ حَفِظَ عَشْرَ آيَاتٍ مِنْ أَوَّلِ سُورَةِ الْكَهْفِ، عُصِمَ مِنَ فتنة الدَّجَّالِ} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٢١٧٦٠، وَمُسْلِمٌ: ٨٠٩، وَأَبُو دَاوُدَ: ٤٣٢٣، وَالنَّسَائِيُّ فـي الكُبْرَى: ١٠٧٨٧).

واتــە: ئەبــو دەردای ﷺ دەڵــێ: پێغەمبــەر ﷺ فەرموویــەتی: هــەر کەســێك دە (١٠) ئایــەتی ســەرەتای ســوورەتی (الكَهْـف)، لەبــەر بــکات، لــە خراپــەو ئــاژاوەی دەججــاڵ پارێــزراو دەبــێ.

**دووەم: شوێنی دابەزینی:** شوێنی دابەزینی ئەم سوورەتە، شاری مەککەیە، واتە: ئەم سوورەتە یەکێکە لە سوورەتە مەککەییەکان، هەڵبەتە هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئایەتێك، یان زیاتری لە مەدینە هاتۆتە خوار، بەڵام ئەو ڕایەی کە زۆربەی هەرە زۆری زانایانی لەسەرن، ئەوەیە کە ئەم سوورەتە، هەمووی سوورەتێکی مەککەییەو، هەموویشی بە یەکەوە هاتۆتە خوار.

**سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:** ڕیزبەندیی ئەم سوورەتە موبارەکە، لە (مُصْحَف)دا ژمارە: (١٨)یە، واتە: لە پێش ئەم سوورەتەدا، حەڤدە (١٧) سوورەتی دیکە هەن، لەو موصحەفەی کە لە بەردەستمانە، بەڵام لە ڕیزبەندیی دابەزیندا، ژمارە: (٦٨)ە، بە لای هەندێکیانەوە، هەندێکیشیان دەڵێن: ژمارە: (٧٠)یە، ئەوانەی کە دەڵێن: ژمارە (٦٨)ە، یانی: (٦٧) سوورەت لە پێش ئەم سوورەتەدا، دابەزیون و، ئەوانەش کە دەڵێن: ژمارە (٧٠)یە، یانی: (٦٩) سوورەت لە پێش ئەم سوورەتەدا، هاتوونە خوار.

**چوارەم: پێگەو پایەی ئەم سوورەتە:** لە چەند فەرمایشتێکدا، وەك مانگی چواردە دەدرەوشێتەوە، کە ئەم سوورەتە پێگەو پایەیەکی زۆر بەرزی هەیە، بۆ وێنە:

**١)- [مَنْ قَرَأَ الْعَشْرَ الأَوَاخِرَ مِنْ سُورَةِ الكَهْفِ، عُصِمَ مِنَ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ] (أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٢٧٥٥٦، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح، رجاله ثقات، رجال الشيخين، غير معدان بن أبي طلحة اليعمري، فمن رجال مسلم).**

واتــە: هــەر کەسـێك دە (١٠) ئایەتــەکانی کۆتایــی لــە ســوورەتی (الكهـف) بخوێنــێ، لــە ئــاژاوەی دەججــاڵ پارێــزراو دەبــێ.

**٢)- [مَنْ حَفِظَ عَشْرَ آيَاتٍ مِنْ أَوَّلِ سُورَةِ الْكَهْفِ، عُصِمَ مِنَ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ]، (أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٢١٧٦٠، وَمُسْلِمٌ: ٨٠٩، وَأَبُو دَاوُدَ: ٤٣٢٣، وَالنَّسَائِيّ فِي الكبرى: ١٠٧٨٧).**

پێشــتریش ئــەم فەرموودەمــان هێنــا، ئەمەیــان دەڵــێ: ســەرەتای ســوورەتی (الكهـف)، ئەمــەش وای لــێ دەخوێنرێتــەوە، کــە چ دە (١٠) ئایــەتی ســەرەتای ســوورەتی (الكهـف)، لەبــەر بکرێــن، چ دە (١٠) ئایــەتی کۆتایــی لەبــەر بکرێــن و بخوێنرێــن، ئــەو ئامانجــە دەپێکــن، کــە بریتیــە لــە پارێــزرانی مــرۆڤ، لــە ئــاژاوە و بــەڵای دەججــاڵ.

**٣)- [مَنْ قَرَأَ سُورَةَ الكَهْفِ، كَانَتْ لَهُ نُوراً مِنْ مَقَامِهِ إِلى مَكَّةَ، وَمَنْ قَرَأَ بِعَشْرِ آيَاتٍ مِنْ آخِرِهَا، ثُمَّ خَرَجَ الدَّجَّالُ لَم يَضُرَّهُ] (أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ: ٢٠٧٢ وقال: صَحيح عَلَى شَرْطِ الشَّيْخين، والبَيْهَقِي فِي شعب الإيمان: ٢٤٤٦، وغيرهما، وَصَحَّحَهُ الألباني).**

واتــە: هــەر کەسـێك ســوورەتی (الكهـف) بخوێنــێ، لــەو شــوێنەوە کــە لێیــەتی (واتــە: کــە ســوورەتەکەی تێــدا دەخوێنــێ) تاکــو مەککــە بــۆی دەبێتــە ڕووناکیــی و، هــەر کەسـێك دە (١٠) ئایــەت لــە کۆتاییەکــەی بخوێنــێ و، دوایــی دەججــاڵ دەربچــێ، زیــانی پــێ ناگەیەنــێ.

**٤)- [مَنْ قَرَأَ سُورَةَ الْكَهْفِ فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ، أَضَاءَ لَهُ مِنَ النُّورِ مَا بَيْنَ الْجُمُعَتَيْنِ]، (أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ: ٣٣٩٢، وقال: صحيح الإسناد، والبَيْهَقِي في شعب الإيمان: ٢٤٤٤ وَصَحَّحَهُ الألباني).**

واتــە: هــەر کەسـێك لــە ڕۆژی جومعــەدا ســوورەتی (الكهـف) بخوێنــێ، نێــوان ئــەو دوو جومعەیــەی (واتــە: ئــەو جومعــەی کــە تێیــدا دەخوێنــێ و، جومعــەی کــە دادێ) بــۆی پــڕ نــوور و بەرەکــەت دەکات.

٥)-{عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ، يَقُولُ: قَرَأَ رَجُلٌ الْكَهْفَ، وَفِي الدَّارِ دَابَّةٌ، فَجَعَلَتْ تَنْفِرُ، فَنَظَرَ فَإِذَا ضَبَابَةٌ، أَوْ سَحَابَةٌ قَدْ غَشِيَتْهُ، قَالَ: فَذَكَرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: اقْرَأْ فُلَانُ، فَإِنَّهَا السَّكِينَةُ تَنَزَّلَتْ عِنْدَ الْقُرْآنِ أَوْ تَنَزَّلَتْ لِلْقُرْآنِ}، (أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٨٥٣٢، وَالبُخَارِيُّ: ٨٣٩، وَمُسْلِمٌ: ٧٩٥، وفي البُخَارِيُّ: ٥٠١٨، من حديث أسيد بن خضير، وفيه أنه هو الذي كان يقرأ القرآن، وفي مسلم: ٧٦٩).

واتـە: بـەڕاء ﷺ دەڵـێ: پیاوێـك سـوورەتی (الكهـف)ی خوێنـد و، لـە ماڵەكەیانـدا (لـە خانووەكەیانـدا) ئاژەڵێـك هەبـوو، {لـە صەحیحـی بوخاریـی و موسـلیم دا دەڵـێ: ئـەو ئاژەڵـە، وڵاخـە بەرزەیـەك بـووە}، كاتێـك كـە ئـەو قوڕئـانی دەخوێنـد ئەویـش دەسـڵەمیەوە و خـۆی ڕادەپسـكاند، ئەویـش تەماشـای كـرد، بینـی تـەم و مژێـك، یاخـود هەورێـك لـە سـەریەوەیەتی دایپۆشـیوە، دوایـی ئـەوەی بـۆ پێغەمبـەر ﷺ بـاس كـرد، ئەویـش فەرمـووی: فـڵان كـەس بخوێنە! ئـەوە ئارامیـی (سـكینة) بـووە دابەزیـوە لـەلای قوڕئـان، یـان: بـۆ قوڕئـان [ فریشـتەكان بـوون، ئۆخـژن و ئارامییـان دابەزانـدوە بـۆ سـەر دڵ و دەروونی ئـەو كەسـەی كـە قوڕئانەكـەی خوێندوە].

## پێنجەم: ژمارەی ئایەتەكانی سوورەتی (الكَهْف):

قوڕئـان خوێنـەكانی مەككـەو مەدینـە، ئایەتەكانییـان بـە (١٠٥) دانـاون و، قوڕئـان خوێنەكانی شـام بـە: (١٠٦) یـان دانـاون و، قوڕئـان خوێنـەكانی بەسـڕە بـە: (١١١) یـان. دانـاون و، قوڕئـان خوێنـەكانی كووفـەش بـە: (١١٠) یـان دانـاون.

ئـەو (مصحف)ەی لەبـەر دەسـتی ئێمەیـە، بـە پێـی قیرائـەتی (حَفْـص)، ئـەو سـەرژمێرییەی قوڕئـان خوێنـانی كووفـەی ڕەچـاو كـردوە، كـە: (١١٠)یـە.

پێویسـتە ئـەوە بزانیـن كـە دەگوتـرێ: هەندێكیـان بـە (١٠٥) و، هەندێـك بـە (١٠٦) و، هەنـدێ دەڵێـن: (١١٠) یـان (١١١)، مەبەسـت ئـەوە نیـە كـە، ئەوانـەی دەڵێـن: (١٠٥) ئایەتـە، واتـە هـەر (١٠٥) ئایەتـە و، ئایـەتی (١٠٦)ی لەگـەڵ نیـە! یاخـود ئایەتەكانـی دیكـەی تاكـو: (١١١)ی لەگـەڵ نیـن! بەڵكـو وەك جـاری دیكـەش گوتوومانـە: مەبەسـت لێـرەدا كورتیـی و درێژیی ڕسـتەكان بـووە، هەیانبـووە ئایەتێـكی كردۆتـە دوو بـەش، بەڵكـو كردوویەتـە سـێ بـەش، بـەوە ژمـارەی ئایەتـەكان زۆر بـووە، ئەگەرنـا وەك وشـەو پیتـەكانی قوڕئـان، هیـچ دوو زانایـەك، كێشـەیان نەبـووە لەسـەر پیتێـك، یـان وشـەیەكی قوڕئـان[1]، مەگـەر جیاوازیـی خوێندنـەكانی قوڕئـان، ئـەوە جیایـە، ئەگەرنـا هیـچ كـەس كێشـەی نەبـووە، لەسـەر ئـەوە كـە: ئـەم وشـەیە لـە قوڕئانـە، ئـەوەی دیكـە بڵـێ: نەخێـر لـە قوڕئـان نیـە، چ جـای ئایـەت!!

---

(١) وشەكانی قوڕئان ژمارەیان: (٧٧٤٣٩)ەو، پیتەكان (حروف) یش ژمارەیان: (٣٢١١٨٠) یە.

**شەشەم: هۆی هاتنە خواری كۆی سوورەتی (الكهف):**

وەك دوایی لە دەرسەكاندا پێی دەگەین: دەربارەی هەندێ لە ئایەتەكان، هۆی هاتنە خواری تایبەت باسكراوە، بەڵام كۆی ئەم سوورەتە، وەك (الطبري بە ژمارە: (٢٢٧٩٩) هێناویەتی لە تەفسیرەكەی خۆی دا[١]، هەروەها (السيوطي) لە تەفسیرەكەی خۆی: (الدر المنثور في التفسير بالمأثور) دا[٢] هێناویەتی، هەروەها هەردوو نوسەری: (الإستيعاب في بيان الأسباب)[٣] هێناویانە، بەڵام ئەوان گوتوویانە: (**قُلْنَا: سَنَدُهُ ضَعِيفٌ**) گوتمان: سەنەدەكەی لاوازە، بەڵام گرنگ ئەوەیە زۆربەی تەفسیرەكانی قورئان، ئەو بەسەرهاتەیان هێناوە، دەربارەی هۆی هاتنە خواری ئەم سوورەتە، كە ئێمە سەرەتا دەقە عەرەبییەكەی دێنین، دوایی مانای دەكەین.

**[عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، قَالَ: ثَنِي شَيْخٌ مِنْ أَهْلِ مِصْرَ، قَدِمَ مُنْذُ بِضْعٍ وَأَرْبَعِينَ سَنَةً، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: بَعَثَتْ قُرَيْشٌ النَّضْرَ بْنَ الْحَارِثِ، وَعُقْبَةَ بْنَ أَبِي مُعَيْطٍ إِلَى أَحْبَارِ يَهُودَ بِالْمَدِينَةِ، فَقَالُوا لَهُمْ: سَلُوهُمْ عَنْ مُحَمَّدٍ، وَصِفُوا لَهُمْ صِفَتَهُ، وَأَخْبِرُوهُمْ بِقَوْلِهِ، فَإِنَّهُمْ أَهْلُ الْكِتَابِ الْأَوَّلِ، وَعِنْدَهُمْ عِلْمُ مَا لَيْسَ عِنْدَنَا مِنْ عِلْمِ الْأَنْبِيَاءِ.**

**فَخَرَجَا حَتَّى قَدِمَا الْمَدِينَةَ، فَسَأَلُوا أَحْبَارَ يَهُودَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَوَصَفُوا لَهُمْ أَمْرَهُ وَبَعْضَ قَوْلِهِ، وَقَالَا: إِنَّكُمْ أَهْلُ التَّوْرَاةِ، وَقَدْ جِئْنَاكُمْ لِتُخْبِرُونَا عَنْ صَاحِبِنَا هَذَا، قَالَ: فَقَالَتْ لَهُمْ أَحْبَارُ يَهُودَ: سَلُوهُ عَنْ ثَلَاثٍ نَأْمُرُكُمْ بِهِنَّ، فَإِنْ أَخْبَرَكُمْ بِهِنَّ فَهُوَ نَبِيٌّ مُرْسَلٌ، وَإِنْ لَمْ يَفْعَلْ فَالرَّجُلُ مُتَقَوِّلٌ، فَرُوا فِيهِ رَأْيَكُمْ:**

**١- سَلُوهُ عَنْ فِتْيَةٍ، ذَهَبُوا فِي الدَّهْرِ الْأَوَّلِ، مَا كَانَ مِنْ أَمْرِهِمْ، فَإِنَّهُ قَدْ كَانَ لَهُمْ حَدِيثٌ عَجِيبٌ.**

**٢ -وَسَلُوهُ عَنْ رَجُلٍ طَوَّافٍ، بَلَغَ مَشَارِقَ الْأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا، مَا كَانَ نَبَؤُهُ؟**

**٣ - وَسَلُوهُ عَنِ الرُّوحِ مَا هُوَ؟ فَإِنْ أَخْبَرَكُمْ بِذَلِكَ، فَإِنَّهُ نَبِيٌّ فَاتَّبِعُوهُ، وَإِنْ هُوَ لَمْ يُخْبِرْكُمْ، فَهُوَ رَجُلٌ مُتَقَوِّلٌ، فَاصْنَعُوا فِي أَمْرِهِ مَا بَدَا لَكُمْ.**

**فَأَقْبَلَ النَّضْرُ وَعُقْبَةُ، حَتَّى قَدِمَا مَكَّةَ عَلَى قُرَيْشٍ، فَقَالَا: يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ: قَدْ جِئْنَاكُمْ بِفَصْلِ مَا بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ مُحَمَّدٍ، قَدْ أَمَرَنَا أَحْبَارُ يَهُودَ أَنْ نَسْأَلَهُ، عَنْ أُمُورٍ، فَأَخْبَرُوهُمْ بِهَا، فَجَاءُوا رَسُولَ**

---

(١) ج١٥ ص١٩٢ - ١٩٣.

(٢) ج٥ ص٣٧٦.

(٣) ج٢ ص٤٧٠ - ٤٧١.

اللّهِ صَلى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالُوا: يَا مُحَمَّدُ! أَخْبِرْنَا، فَسَأَلُوهُ عَمَّا أَمَرُوهُمْ بِهِ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللّهِ صَلى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «أُخْبِرُكُمْ غَدًا بِمَا سَأَلْتُمْ عَنْهُ»، وَلَمْ يَسْتَثْنِ، فَانْصَرَفُوا عَنْهُ، فَمَكَثَ رَسُولُ اللّهِ صَلى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَمْسَ عَشْرَةَ لَيْلَةً، لا يُحْدِثُ اللّهُ إِلَيْهِ فِي ذَلِكَ وَحْيًا، وَلا يَأْتِيهِ جِبْرَائِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ، حَتَّى أَرْجَفَ أَهْلُ مَكَّةَ، وَقَالُوا: وَعَدَنَا مُحَمَّدٌ غَدًا، وَالْيَوْمَ خَمْسَ عَشْرَةَ، قَدْ أَصْبَحْنَا فِيهَا، لَا يُخْبِرُنَا بِشَيْءٍ مِمَّا سَأَلْنَاهُ عَنْهُ.

وَحَتَّى أَحْزَنَ رَسُولَ اللّهِ صَلى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُكْثُ الْوَحْيِ عَنْهُ، وَشَقَّ عَلَيْهِ مَا يَتَكَلَّمُ بِهِ أَهْلُ مَكَّةَ، ثُمَّ جَاءَهُ جِبْرَائِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ، مِنَ اللّهِ عَزَّ وَجَلَّ، بِسُورَةِ أَصْحَابِ الْكَهْفِ، فِيهَا مُعَاتَبَتُهُ إِيَّاهُ عَلَى حُزْنِهِ عَلَيْهِمْ، وَخَبَرُ مَا سَأَلُوهُ عَنْهُ مِنْ أَمْرِ الْفِتْيَةِ وَالرَّجُلِ الطَّوَّافِ، وَقَوْلُ اللّهِ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ ﴾الأسراء)[1].

واتە: موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەگێڕێتەوە دەڵێ: پیاوێک لە خەڵکی میسر، کە ماوەی چل و ئەوەندە ساڵەیە هاتوە بۆ ئێرە [دەبێ چووبێ بۆ ئەو شوێنەی کە موحەممەدی کوڕی ئیسحاقی لێیە، ئنجا ئایا مەککە بووە یان مەدینە؟] بۆی باس کردین لە عیکریمەوە [عیکریمە قوتابی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس بووە] ئەویش لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، ئاوای بۆ باسکردین، گوتی: قورەیشییەکان نەزری کوڕی حارس و عوقبەی کوڕی ئەبی موعیطیان ناردن بۆ لای زانایەکانی جوولەکە لە شاری مەدینە و، پێیانگوتن: [واتە: قورەیشییەکان بەو دووانەیان گوت] لە جوولەکەکان لە بارەی موحەممەدەوە بپرسن و سیفەتەکانی موحەممەدیان بۆ باس بکەن و، لە بارەی ئەو قسەیەوە کە دەیکات [مەبەستیان قورئان بووە]، هەواڵیان پێ بدەن، چونکە ئەوانە خاوەنی کتێبی یەکەمن و، زانیارییەکیان لەلایە لە زانیاریی پێغەمبەران، کە لەلای ئێمە نیە.

ئەو دوو کەسەش [واتە: نەزری کوڕی حارس و عوقبەی کوڕی ئەبی موعیط]، چوونە مەدینە و لەوێ لە زانایانی جوولەکەکانی مەدینەیان پرسی، لە بارەی پێغەمبەرەوە ﷺ، سیفەت و حاڵی پێغەمبەریان بۆ باسکرد و، هەندێ لە قسەکانیشییان [واتە: ئەو قورئانەی] کە دەیفەرموو، ئەوەشیان بۆ باسکردن و گوتیان: ئێوە خاوەنی تەوراتن، بۆیە هاتووین، تاکو لە بارەی ئەو هاوەڵەمانەوە هەواڵمان پێ بدەن، دەڵێ: زاناکانی جوولەکە گوتیان: لە بارەی سێ شتانەوە پرسیاری لێ بکەن کە ئێمە پێتان دەڵێین، ئەگەر هەواڵی

---

(١) جامع البيان، ج١٥، ص١٩٢،١٩٣، الدر المنثور في التفسير بالمأثور، ج٥، ص٣٧٦، الإستيعاب في بيان الأسباب ج٢، ص٤٧٠، ٤٧١.

پێدان و ئەو سێ شتەی زانین، ئەوە پێغەمبەرێکی ڕەوانەکراوە، بەڵام ئەگەر هەواڵی پێ نەدان، ئەوە بابایەکە لە خۆوە قسە هەڵدەبەستێ، دوایی خۆتان دەزانن کە چی لەگەڵدا دەکەن، ئەگەر ناڕاست بوو:

**١- لە بارەی کۆمەڵە گەنجێکەوە لێی بپرسن، کە لە ڕۆژگاری پێش ئەم ڕۆژگارەی ئێمەدا ڕۆیشتوون، هەواڵەکەیان چی بووە؟ چونکە هەواڵێکی سەرسوڕهێنەریان هەیە! {مەبەستیان هاوەڵانی ئەشکەوت بووە}.**

**٢- لە بارەی پیاوێکەوە لێی بپرسن، کە زۆر گەڕاوە و گەیشتۆتە ڕۆژهەڵاتەکان و ڕۆژئاوایەکانی زەوی، لێی بپرسن هەواڵی چی بووە!**

**٣- لە بارەی ڕووحەوە لێی بپرسن، کە ئایا ڕووح چییە؟**

تنجا ئەگەر هەواڵی پێدان لە بارەی ئەو سێ شتەوە، دیارە پێغەمبەرەو شوێنی بکەون، بەڵام ئەگەر هەواڵی پێ نەدان، ئەوە پیاوێکە لە خۆوە قسە هەڵدەبەستێ، ئەو کاتە ئەوەی پێتان چاکە، لە بارەیەوە بیکەن.

تنجا نەزری کوڕی حارس و عوقبە، لەوێ ڕۆیشتن و، هاتنەوە مەککە بە قوڕەیشیان گوت: ئەی کۆمەڵی قوڕەیش! یەکلاکردنەوەی کێشەی نێوان ئێوە و موحەممەدمان بۆ هێناون، جوولەکەکان پێیان گوتووین: لە بارەی چەند شتێکەوە پرسیاری لێبکەین، تنجا سێ شتەکانیان بە قوڕەیشییەکان گوتن، دوایی هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، گوتیان: ئەی موحەممەد! هەواڵمان پێ بدە و، ئەو سێ شتەی کە جوولەکەکان پێیان گوتبوون، ناڕاستەی پێغەمبەریان ﷺ، کردن {واتە: دەربارەی هاوەڵانی ئەشکەوت و، ذو القرنین و، ڕووح} پێغەمبەر ﷺ، پێی فەرموون: بەیانیی وەڵامی ئەوەتان دەدەمەوە کە پرسیاری لە بارەوە دەکەن، نەشیفەرموو: (إن شاء اللّه)! ئەوانیش ڕۆیشتن.

پێغەمبەری خوا ﷺ پازدە (١٥) شەوان مایەوە، خوای پەروەردگار لەو بارەوە وەحیی بۆ نەنارد و جیبریلیش دانەبەزی بۆ لای، تاکو خەڵکی مەککە دەستیان کرد بە پروپاگەندەو گوتیان: موحەممەد هەواڵی پێداین: کە بەیانی وەڵامی پرسیارەکانمان بداتەوە، کەچی ئەمڕۆ ئێمە پازدەیەمیشمان گوزەراند، هیچ هەواڵی پێ نەداین، لەو بارەوە کە پرسیارمان لێ کردووە!

تنجا ئەوەش پێغەمبەری خوای ﷺ دڵتەنگ کرد، کە وەحیی بۆ نەهات و دواکەوت و، ئەو پروپاگەندەیەی کە خەڵکی مەککە دەیانکرد، زۆر لە سەر دڵی قورس بوو، دوای پازدە ڕۆژەکە، جیبریل دابەزی، کە لە لایەن خوای پەروەردگارەوە سوورەتی (الكهف)ی هێنا بوو، جۆرێك لە سەرزەنشتی تێدا بوو، بۆ پێغەمبەر ﷺ، لەسەر ئەوە، کە زۆر دڵتەنگە، بە هۆی پشت تێکردنی کافرەکانی قورەیشەوە و، وەڵامی ئەو سێ پرسیارەشی تێدابوون کە ئاراستەی کرابوون، هەم هی گەنجەکان [هاوەڵانی ئەشکەوت]، هەم ئەو پیاوە گەڕۆکە (ذو القرنين)، هەروەها فەرمایشتی خوا لە سوورەتی (الإسراء)دا کە دەفەرموێ:

﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ٨٥ ﴾.

واتە: لەبارەی ڕووحەوە پرسیارت لێ دەکەن؟ بڵێ: ڕووح لە کاری پەروەردگارمە و، کەمێکیش نەبێ، زانیارییتان نەدراوەتێ.

وەك گوتمان: ئەم بەسەرهاتە، ئەگەر لە ڕووی سەنەدیشەوە ئیشکالێکی هەبێ، بەڵام مانا و نێوەڕۆکەکەی هیچ گرێی تێدا نیە و، عەقڵ و لۆژیك ڕەفزی ناکەن و، تەفسیرەکانیش، مەگەر چۆن، دەنا هەموویان هێناویانە، هەیە بە کورتیی و، هەیە بەو دەقە تەواوەی کە من هێنام.

**حەوتەم: نێوەڕۆکی ئەم سوورەتە:**

ئەم سوورەتە موبارەکەش، وەك سەرجەم سوورەتە مەککەییەکان، تەوەرەکانی: بووناسیی و خواناسیی و خوا بەیەکگرتن، وەحیی و پێغەمبەرایەتیی، پاداشت و سزاو ڕۆژی دوایی، باسی بەهەشت و باسی دۆزەخ، حەقیقەتی ژیانی دنیای کەم بایەخ و، ئەوە کە ژیانی راستەقینە لە دوارۆژە، بۆ ئەهلی ئیمان، پاشان ئارامگریی لە سەر قسەو پروپاگەندەی ناحەزان، دەگرنە نێوخۆیان، ئەمانەش ئەو تەوەرانەن، کە لەم سوورەتە موبارەکەدا، جەختیان لەسەر کراوەتەوە.

**هەشتەم: دەرسەکانی ئەم سوورەتە :**

بەڕێزان! ئێمە ئەو سەدو دە (١١٠) ئایەتەی ئەم سوورەتە موبارەکە، دابەش دەکەین بۆ نۆ (٩) دەرس:

دەرسی یەکەم: ئایەتەکانی: (١ - ٨)، ئەم دەرسە وەك پێشەکیی وایە بۆ کۆی بابەتەکانی دیکە.

دەرسی دووەم: ئایەتەکانی: (٩ - ٢٦)، واتە: (١٨) ئایەت، کە بەسەرهاتی هاوەڵانی ئەشکەوت دەگرێتە خۆی.

دەرسی سێیەم: ئایەتەکانی: (٢٧ - ٣١)، واتە: (٥) ئایەت، تێیدا چەند ڕێنماییەکی گرنگ لە لایەن خوای میهرەبانەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ خراونە ڕوو.

دەرسی چوارەم: ئایەتەکانی: (٣٢ - ٤٤)، واتە: (١٣) ئایەت، کە ئەویش بەسەرهاتێکی دیکەی دوو هاوەڵی تێدایە، کە یەکیان دەوڵەمەندو لە خۆی باییە و، ئەوی دیکەشیان هەژار و نەدار، بەڵام شوکرانە بژێرە.

دەرسی پێنجەم: ئایەتەکانی: (٤٥ - ٥١)، واتە: (٧) ئایەت، کە ژیانی دنیاو ڕۆژی دواییان، تێیدا پێناسە کراون.

دەرسی شەشەم: ئایەتەکانی: (٥٢ - ٥٩) واتە: (٨) ئایەت، کە سەرەنجامی هاوبەش بۆ خوا دانەران و، ئامانجی دابەزێنرانی قورئان و، نێررانی پێغەمبەران و، هۆکاری کافر بوونی کافران و، سزای لادەران و... هتد، دەگرێتە خۆی.

دەرسی حەوتەم: ئایەتەکانی: (٦٠ - ٨٢) واتە: (٢٣) ئایەت، باسی بەسەرهاتی مووسا ﷺو، ئەو بەندە چاکەیەی، کە زۆرێک لە زانایان دەڵێن: (خضر) بووە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەریشدا ﷺ ئەو ناوەی بۆ بەکارهێنراوە.

دەرسی هەشتەم: ئایەتەکانی: (٨٣ - ٩٨) واتە: (١٦) ئایەت، باسی بەسەرهاتی (ذو القرنین)ە.

دەرسی نۆیەم: ئایەتەکانی: (٩٩ - ١١٠) واتە: (١٢) ئایەت، باسی سەرەنجامی بێبڕواو بڕواداران و، باسی خوا بە یەکگرتن و شیرك و، کۆمەڵێك ڕاستیی دیکە، کە ئەو سووڕەتە موبارەکەیان پێ خەتم کراوە.

کەواتە: لە کۆی (١١٠) ئایەت، (٧٠) ئایەت بۆ چوار بەسەرهاتەکە تەرخان کراون:

١- هاوەڵانی ئەشکەوت، (١٨) ئایەت.

٢- دوو پیاوەکە، پیاوێکی دەوڵەمەندی لە خۆبایی و، هەژارێکی شوکرانە بژێر، (١٣) ئایەت.

٣- بەسەرهاتی مووسا ﷺ لەگەڵ بەندە چاکەکە (خضر)دا، (٢٣) ئایەتی بۆ تەرخان کراون.

٤- بەسەرهاتی (ذو القرنین)، (١٦) ئایەتی بۆ دانراون.

هاوکات (٤٠) ئایەتیش بەم شێوەیەن:

١ - هەشت (٨) ئایەت، پێشەکیین.

٢ - دوازدە (١٢) ئایەت، لە کۆتاییدا هاتوون.

پاشان لە نێواخنی بەسەرهاتەکانیشدا یەکیان بە پێنج (٥) ئایەت و، ئەوی دیکەیان بە حەوت (٧) ئایەت و، ئەوە دیکەشیان بە هەشت (٨) ئایەت، خەتم کراون، کەواتە: (٢٠) + (٢٠) = (٤٠) + (٧٠) = (١١٠).

**نۆیەم: پێنج سوورەت لە هەموو قورئاندا بە ستایشکردنی خوا، دەستیان پێکردوە، ئەوانیش:**

١- سوورەتی **(الفاتحة)** ئایەتی دووەم دەفەرموێ: ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، بەشێك لە زانایانیش ڕایان وایە: ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ ئایەتی یەکەمە و ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ ئایەتێکە بۆ زانینی سەرەتای سوورەتەکان و ئایەتێکی سەربەخۆیە، نەك بەشێك بێ لە سوورەتەکان، بۆیەش لە کاتی سەرژمێری ئایەتەکانیاندا حیساب نەکراوە.

٢- سوورەتی **(الأنعام)**: ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَۖ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ يَعۡدِلُونَ ١ ﴾.

٣- سوورەتی **(الكهف)**: ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ ١ ﴾.

٤- سوورەتی **(سبأ)**: ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَهُ ٱلۡحَمۡدُ فِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ١ ﴾.

٥- سوورەتی **(فاطر)**: ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ جَاعِلِ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُوْلِيٓ أَجۡنِحَةٖ مَّثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۚ يَزِيدُ فِي ٱلۡخَلۡقِ مَا يَشَآءُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١ ﴾.

ئنجا با تەماشایەکی ئەو پێنج (٥) سوورەتە بکەین: سەرەتاش دەڵێین: (ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ)، یانی: ستایش بۆ خوا، وشەی **(الحمد)** کە (أل)ی لەسەرە و بۆ ناساندن **(تعریف)**ە، مەبەست پێی جینسە، واتە: تێکڕای ستایشکردن و مەدح کردن و پێهەڵگوتن، هەمووی هی خوایە.

١) - ئنجا لە سوورەتی **(الفاتحة)**دا، باسی پەروەردگارێتیی خوا، بۆ جیهانییەکان کراوە: ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، ستایش هەمووی بۆ خوای پەروەردگارو خاوەن و مشوورخۆری جیهانییانە.

٢) - بەڵام لە سوورەتی (الأنعام)دا، باسی بەدیهێنەرایەتیی خوا کراوە، بۆ ئاسمانەکان و زەوی و، ئەوە کە تاریکییەکان و ڕووناکیی داناون، دەفەرمووێ: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ ۖ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴿١﴾ ﴾.

٣) - لە سوورەتی (الكهف)یشدا، باسی دابەزاندنی کتێبی خوا کراوە، بۆ سەر باشترین بەندەی خۆی (موحەممەد) ﷺ کە کۆتایی پێغەمبەرانە، دەفەرمووێ: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ﴿١﴾ ﴾.

٤) - بەڵام لە سوورەتی (سبأ)دا، باسی خاوەنداریتیی خوا کراوە، بۆ ئاسمانەکان و زەوی، دەفەرمووێ: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١﴾ ﴾، ستایش بۆ ئەو خوایەی هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدا هەیە، هی ئەوە و، لە سەرەتاو کۆتاییدا {یاخود: لە دنیاو دواڕۆژدا} ستایش هەر بۆ ویەو، ئەو کاربەجێی شارەزایە.

٥) - لە سوورەتی (فاطر)یشدا، باسی داهێنان (إبداع)ی خوا کراوە، بۆ ئاسمانەکان و زەوی: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ... ﴾

بێگومان هەر کام لە وشەکانی (خلق، إبداع، فطر)، مانایان لێك نیزیکە، بەڵام جیاوازیشیان هەیە، چونکە وشەی هاوواتا (مترادف) لە قورئاندا نین، بەڵام جیاوازیی وردیان هەن و، ئینسان دەبێ سەرنج بدات بۆ ئەوەی جیاوازییەکەیان بزانێ.

بۆ وێنە: وشەی (فاطر)، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازیبێ) دەڵێ: نەمدەزانی وشەی (فاطر) یانی چی! هەتا ڕۆژێ گوێم لە دوو عەرەبی خێڵەکیی بوو، لەسەر بیرێك، ناکۆکییان هەبوو، یەکێکیان گوتی: (أنا فطرتها)، واتە: من یەکەمجار ئەو بیرەم لێداوە، کەواتە: (فاطر) یانی: کەسێك کە لە نوێ و لە نەبوو، شتێکی پەیدا کردوە.

کەواتە: وەك دەبینین: خوا عز وجل ستایشی خۆی دەکات، بەڵکو تێکڕای ستایش بۆ خۆی بڕیار دەدا، بەڵام لە گۆترە نا! بەڵکو لە بەر ئەوەی:

١ - پەروەردگاری جیهانییەکانە.

٢ - بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە.

٣ - دابەزێنەری تەواوترین و باشترین کتێبی خۆیەتی بۆ سەر چاکترین بەندەی.

٤ - پاشان خاوەنی ئاسمانەکان و زەوییە.

٥ - دوایی پەیداکەری، یان: لە نەبوونەوە: داهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

بەڕێـــزان!

لـەم دەرسـەماندا هەشـت (٨) ئایەتی سـەرەتای سـووڕەتی (الكهف) دەتوێژینـەوە، ئایەتەکانی (١ - ٨) و ئـەو هەشـت (٨) ئایەتـە، وەك پێشـەکیی وان بـۆ کـۆی بـاس و بابەتـەکانی سـووڕەتی (الكهف) و، تێیـان دا حـەوت (٧) مەبەسـتی گرنـگ و سـەرەکیی، خراونـە ڕوو:

١)- دابەزاندنی قورئان لەلایەن خوای بەرزی مەزنی بێ وێنەوەیە، بۆ سەر باشترین بەندەی خۆی، کە موحەممەدە ﷺ.

٢)- وەسف و پێناسەی قورئـــان، بەوە کە: قورئان ڕێك و ڕاستە و لاریی و نـاڕێکیی تێدانیە و، سەرپەرشتیارە.

٣)- خستنە ڕووی ئامانجی نێردرانی قورئان، کە بریتیە لە ترساندنی بێبڕوایان لە سزای خوا ﷻ لە ڕۆژی دواییداو، لە تۆڵەی خوا ﷻ لە دنیادا، هەروەها موژدە پێدانی بڕواداران لە دنیادا، بە سەرکەوتن و بەختەوەریی و، لە دواڕۆژدا بە سەرفرازیی و ژیانی هەمیشەیی نێو بەهەشت.

٤)- ترساندنی لاف لێدەرانی ڕۆڵە بۆ خوا، بە نەزانیی و درۆ کردن، واتە: ئەوانەی ڕۆڵە پاڵدەدەنە لای خوا کە مەبەست هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانە، کە دەیانگوت: شەیتانەکان کوڕی خوان و فریشتەکانیش کچی خوان.

٥)- ئامۆژگاریی بۆ پێغەمبەر ﷺ، کە هێندە خەفەت نەخوات، لەسەر بڕوا نەهێنانی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بە قورئان.

٦)- ڕازێنرانەوەی ژیانی دنیا بۆ تێدا تاقیکردنەوەیە، تاقیکردنەوەی مرۆڤ و جینن.

٧)- خستنە ڕووی سەرەنجامی ژیانی دنیا، کە سەرەنجام سەر زەوی دەبێتە زەوییەکی تەخت، یاخود پەرێزێکی ڕووت، کە هیچ شتێکی لێ نامێنێ.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ الْكِتَابَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُ عِوَجًا ۜ (١) قَيِّمًا لِّيُنذِرَ بَأْسًا شَدِيدًا مِّن لَّدُنْهُ وَيُبَشِّرَ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا حَسَنًا (٢) مَّاكِثِينَ فِيهِ أَبَدًا (٣) وَيُنذِرَ الَّذِينَ قَالُوا اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا (٤) مَّا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ وَلَا لِآبَائِهِمْ ۚ كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ ۚ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا (٥) فَلَعَلَّكَ بَاخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَىٰ آثَارِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُوا بِهَٰذَا الْحَدِيثِ أَسَفًا (٦) إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا (٧) وَإِنَّا لَجَاعِلُونَ مَا عَلَيْهَا صَعِيدًا جُرُزًا (٨) ﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{تێکڕای ستایش بۆ ئەو خوایەی کە کتێبی دابەزاندۆتە سەر بەندەکەی و، هیچ نارێکیی و کەم و کوڕییەکی تێدا دانەناوە (١) (قورئان) ڕێك و ڕاست و سەرپەرشتیارە، بۆ ئەوەی (بێبڕوایان) لەلایەن خۆیەوە، لە سزا و ئازارێکی سەخت بترسێنێ و، مژدەش بدات بە بڕوادارانێك کە کردەوە باشەکان دەکەن، کە پاداشتێکی باشیان هەیە (٢) (لە ڕۆژی دواییدا) بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە (٣) ( هەروەها تاکو) ئەوانەش بترسێنێ کە دەڵێن: خوا ڕۆڵەی هەیە (٤) (لە حاڵێکدا) کە نەخۆیان نە باب و باپیرانیان هیچ زانیارییەکیان لەو بارەوە نیە، (ئەو قسەیە) قسەیەکی زۆر زلە لە زاریان دەردەچێ و، تەنیا درۆ دەکەن (٥) تۆش (ئەی موحەممەدا) نیزیکە خۆت بفەوتێنی بە هۆی خەفەت خواردنت لە دوایان، کە بڕوا بەو فەرموودەیە (واتە: قورئان) ناهێنن (٦) بە دڵنیاییەوە ئێمە ئەوەی لەسەر زەوییە، کردوومانەتە مایەی ڕازێنرانەوە بۆ ئەوان، تاکو تاقییان بکەینەوە: کامیان کردەوەی چاکترە؟ (٧) بە دڵنیاییش ئێمە هەرچی لەسەر زەوییە نایهێڵین و، دەیکەینە زەوییەکی ڕووتی سوور و سەقەتاڵە (٨)}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(عِوَجَا ): (العَوَجُ: مَا يُدْرَكُ بالبَصَرِ، والعِوَجُ مَا يُدْرَكُ بالفِكْرِ)، وشەی (عَوَج): واتە: لاریی، (عِوَج)یش هەر بە مانای لاریی دێ، واتە: لاریی و خواریی و ناڕێکیی، بەڵام (عَوَج) بۆ شتێك بەکاردەهێنرێ کە بە چاو ببینرێ، وەك: گۆچانێك و دارێك و دیوارێك و، شتێك کە بەرهەست بێ، بەڵام (عِوَج) بۆ شتێك بەکاردەهێنرێ، کە بە عەقڵ بزانرێ، بۆیە خوا فەرموویەتی: ﴿ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ۜ ﴾، واتە: هیچ ناڕێکیی و لاریی نەخستۆتە نێو قورئانەوە.

(قَيِّمًا ): (أي: ثَابتاً أو مُقَوِّماً لِأُمورِ مَعَاشِهِم وَمَعَادِهِم، وَقُرِئَ: قِيَماً)، وشەی (قَيِّم) واتە: چەسپاو، یاخود: ڕاگر، ڕاگر بۆ کاروباری ژیان و گوزەرانیان و دواڕۆژیشیان، وشەی (قَيِّمًا ) خوێنراویشەتەوە: (قِيَماً) ئەمیش هەردوو واتاکەی هەن.

( مَّٰكِثِينَ فِيهِ ): دەڵێ: (المَكْثُ: ثَبَاتٌ مَعَ انتِظَارٍ، مَكَثْتُ مَكْثاً ومُكْثاً)، (مَكْث): بریتیە لە چەسپاویی لەگەڵ چاوەڕێکردندا، دەگوترێ: (مَكَثْتُ مَكْثاً وَمَكَثْتُ مُكْثاً)، (مَكْث، مُكْث) هەردووکیان چاوگن، یانی: مانەوە، کەواتە: ( مَّٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدًا )، یانی: لەو ژیانەی ڕۆژی دواییدا و، لەو پاداشتەی خوادا دەمێننەوە بە هەمیشەیی.

(كَبُرَتْ ): واتە: زۆر گەورەیە، یان چەند گەورەیە، (أَصْلُهُ: الإِخْبَارُ عَنِ الشيءِ بِضَخَامَةِ جِسْمِهِ... وَهُوَ هُنَا مُسْتَعْمَلٌ فِي التَّعَجُّبِ مِنْ كِبَرِ هَذِهِ الكَلِمَةِ فِي الشَّنَاعَةِ، بدَلِيلِ نَصْبِ (كَلِمَةً) عَلَى التَّمييزِ)، واتە: وشەی (كَبُرَت) لە ئەصڵدا بریتیە لە هەواڵدان بە زەبەلاحیی شتێك، لە ڕووی جەستەوە، بەڵام لێرەدا بەکارهێنراوە: بۆ سەرسوڕمان لە گەورەیی ئەو وشەیە، لە ناڕێکیی دا، بە بەڵگەی ئەوە کە وشەی (كَلِمَة) وشەیەکی (منصوب)ە و حاڵەتی (تمییز)ی وەرگرتوە و (كَبُرَتْ كَلِمَةً) ئاوای لێ دێتەوە: (مَا أَكْبَرَ كَلِمَةً)، واتە: چەند گەورەیە ئەو قسەیە.

(بَٰخِعٌ ): واتە: بکوژ، (البَاخِع: قَاتِلُ نَفْسِهِ، مُهْلِك)، (باخِع) واتە: بکوژ، (بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ ) واتە: خەریك بوو خۆت بکوژی (مهلك).

ئایا لە چییەوە هاتوە؟ (البِخَاعُ: عِرْقٌ مستبطن في القفا) بریتیە لە دەمارێکی شێردراوە لە پشتەملی مرۆڤ دا و، ئەگەر بێت و ئەو دەمارە ببڕدرێ، مرۆڤ دەمرێ، لەوەوە هاتوە.

(أَسَفًا ): (الأسفُ: أشدُّ الحزنِ). (أسف) بریتیە لە زۆر خەفەت خواردن و زۆر دڵتەنگ بوون.

(صَعِيدًا): (الصَّعيدُ: التُّرابُ، وقالَ ثَعْلب: هُوَ وجه الأرض)، (صعید) بە گڵ و خۆڵ، لێك دراوەتەوە، بەڵام (ثعلب) گوتوویەتی: (صعید) بریتیە لە ڕووی زەوی، کە ئێمە وەك لە تەفسیری سوورەتی (المائدة)دا، کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا ﴿٦﴾ ﴾، ساغمان کردۆتەوە: ئەو واتایە ڕاستە کە (الصعید) یانی: ڕووی زەوی (وجه الأرض) نەك تەنیا گڵ، کە خوای زانا و توانا دەفەرموێ: ئێمە سەر زەوی دەکەینە (صَعِيدًا جُرُزًا ) بێگومان هەمووی گڵ نیە، بەڵام ڕووی زەوی (وجه الأرض): بەفر بێ، بەستەڵەك بێ، لم بێ، چیا بێ، چەو بێ، گیاو ڕووەك بێ، هەمووی دەگرێتەوە.

(جُرُزًا ): (أَرْضٌ جُرْزٌ وجُرُزٌ وجَرْزٌ وجَرَزٌ: أرضٌ لا نَبَاتَ فِيهَا) واتە: زەوییەك کە ڕووەکی لێ نیە، کە بە چەند شێوەیەك خوێنراوەتەوە: (جُرْزٌ وجُرُز وجَرْزٌ وجَرَزٌ).

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هۆی هاتنە خواری ئەو ڕستە قورئانییەی کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَسَفًا ﴿٦﴾ ﴾.

لەو بارەوە ئەم بەسەرهاتە هاتوە:

[عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: اجْتَمَعَ عُتْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ، وشَيْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ، وَأَبُو جَهْل بْنُ هِشَام، والنَّضْرُ بْنُ الحَارِث، وأَبُو البَخْتَرِي فِي نَفَرٍ مِنْ قُرَيْشٍ، وَكَانَ رَسُولُ اللّه ﷺ قَدْ كَبُرَ عَلَيْهِ مَا يَرَى مِنْ خِلاَفِ قَوْمِهِ إِيَّاهُ، وَإِنْكَارِهِم مَا جَاءَ بِهِ مِنَ النَّصِيحَةِ، فَأَحْزَنَهُ حُزْنًا شَدِيدًا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ ﴿٦﴾ ﴾][1].

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازیبێ) دەڵێ: هەر کام لە: عوتبەی کوڕی ڕەبیعەو، شەیبەی کوڕی ڕەبیعەو، ئەبوو جەهلی کوڕی هیشام و، نەزری کوڕی حارس و، ئەبوو لبوختووریی، لەگەڵ چەند کەسێکی دیکەش لە هۆزی قورەیش کۆبوونەوە، پێغەمبەر ﷺ

---

(١ ) الدر المنثور ج٥، ص٣٦٠، ونسبه لابن مردويه، و (الإستيعاب في بيان الأسباب) ج٢، ص٤٧٠.

زۆر لەسەر دڵی قورس بوو لەوە: کە گەلەکەی دەبینی سەرپێچیی لێ دەکەن و، نکووڵیی دەکەن لەو دڵسۆزییەی کە بۆی هێناون، ئنجا ئەوە بوو بە مایەی دڵتەنگ بوون و مەراق داگرتنی پێغەمبەر ﷺ کە ئەوانە گوێی بۆ ناگرن و پەیامی خوای لێ وەرناگرن، خوای بەرز و مەزنیش ئەو ئایەتەی دابەزاندە خوار، کە دەفەرموێ: تۆ خەریکی خۆت بفەوتێنی لە دوایان، لە خەفەتی ئەوەی بڕوا بەم فەرمایشتە ناهێنن! یانی: وامەکە!

## مانای گشتیی ئایەتەکان

ئەم هەشت ئایەتە، وەك لە پێناسەی ئەم دەرسەدا ئاماژەمان پێدا، حەوت مەبەستی گەورەو گرنگ، دەگرنە خۆیان.

سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ: (**بسم الله الرحمن الرحيم**)، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە: ئەم کارەم دەست پێ دەکەم، یان دەست پێکردنم بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندەیە، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندەش، واتە:

١ - ئەم کارە بۆ ڕازیی کردنی خوا دەکەم.

٢ - بە هەوڵ و توانای خوای پەروەردگار دەیکەم.

٣ - بە پێی شەرعی خوای پەروەردگار دەیکەم.

٤ - بە ناوی خوا دەستی پێدەکەم، ئنجا قورئان دەخوێنی، یان هەر کارێکی دیکە دەکەی، کە دەڵێی: (بسم الله الرحمن الرحيم)، دەبێ ئەو مەبەستانە لە دڵی خۆت بگری.

﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ﴾، ستایش هەمووی بۆ ئەو خوایەی کە کتێبی دابەزاندۆتە سەر بەندەکەی خۆی و، هیچ نارێکیی و لاریی تێنەخستوە.

هەرچی ستایشە بۆ خوایەك، کە کتێبی دابەزاندۆتە سەر بەندەکەی، کام کتێب؟ ئەو کتێبە کە قورئانە.

١ - پێی دەگوترێ: (كِتَاب) لەبەر ئەوەی نووسراوەتەوە.

٢ - پێشی دەگوترێ: قورئان لەبەر ئەوەی خوێنراوەتەوە و دەخوێنرێتەوە.

٣ - هەروەك پێشی گوتراوە: (ذِکر) لەبەر ئەوەی بیرخەرەوەو یاد خەرەوەی مرۆڤە بۆ ڕاستییەکان.

٤ - دیسان پێشی گوتراوە: (فرقان) لەبەر ئەوەی جیاکەرەوەیە بۆ هەق و ناهەق، ڕاست و چەوت، پیس و پاك، چاك و خراپ ... هتد.

مەبەستیش لە بەندەکەی (عَبْدِهِ) ڕوونە: مەبەست پێی ئەو بەندەیەتی کە لە هەموو بەندەکانی، لە ئادەمەوە تا کۆتا مرۆڤ لەم سەر زەوییە، لە هەموویان لەلای خوا بەڕێزتر و شیرینتر و خۆشەویستترە، کە موحەممەدە ﷺ.

دوایی دەفەرموێ: ﴿وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا﴾، هەروەها هیچ نارێکیی تێدا نەگێڕاوە، واتە: ئەم قورئانە هیچ نارێکیی و کەم و کوڕیی تێدا نیە، چ لە ڕووی بێژەیەوە، چ لە ڕووی واتەیەوە.

﴿قَيِّمًا﴾، هەروەها ڕێك و ڕاستە و چەسپاوە و، سەرپەرشتیار و ڕاگرە.

﴿لِّيُنذِرَ بَأْسًا شَدِيدًا مِّن لَّدُنْهُ﴾، ئنجا ئایا خوا بۆچی ناردوویەتە خوار؟! تاکو بترسێنێ و وریا بکاتەوە لە سزایەکی سەخت، کێ بترسێنێ؟ بێبڕوایان بە تایبەت و خەڵك بە گشتی بترسێنێ لە سزایەکی سەخت، ﴿مِّن لَّدُنْهُ﴾، لەلایەن خۆیەوە، ئەو سزا سەختەش، دەگونجێ مەبەست سزای دنیا بێ و، دەشگونجێ مەبەست سزای ڕۆژی دوایی بێ، یان هەردووکیان بن پێکەوە، بەڵام زیاتر وابێدەچێ: مەبەست سزای ڕۆژی دوایی بێ.

﴿وَيُبَشِّرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾، بۆیەش هاتوە تاکو مژدە بدات بەو بڕوادارانەی، کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، ﴿أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا حَسَنًا﴾، کە باشترین پاداشتیان هەیە، ﴿مَّٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدًا﴾، بە هەمیشەیی لە نێو ئەو پاداشتەدا دەمێننەوە، کە مەبەست: بەهەشتی خوایە.

﴿وَيُنذِرَ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا﴾، دیسان بۆ ئەوەش هاتوە: تاکو ئەوانەی گوتوویانە: خوا ڕۆڵەی گرتوە، یان ڕۆڵەی هەیە، ئنجا کوڕ، یان کچ، ئەوانەش بترسێنێ و وریایان بکاتەوە.

کاتێك بێبڕوایان ئەو قسەیەش دەکەن، ﴿مَّا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ وَلَا لِءَابَآئِهِمْ﴾، نە خۆیان زانیارییان بەو لاف لێدان و، بەو قسەیە هەیە، نە باب و باپیرانیشیان، هیچ جۆرە زانیارییەکیشیان نیە، بەڵکو هەر تفەنگ بە تاریکیی وەدەنێن، ﴿كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ

أَفْوَٰهِهِمْ ﴾، ئای! چەند وشەیەکی گەورەیە لە زاریان دەردەچێ! واتە: ئەو تۆمەتە کە پاڵی دەدەنە لای خوا، کە گوایە ڕۆڵەی هەیە، ئەو لاف لێدانە کە ڕۆڵە بۆ خوا بڕیار دەدەن، ئەوە گەورەترین وشەیە لە دەمیان دەردەچێ، واتە: تەنیا وشەیەکە کە بەزار دەیڵێن، بەڵام میصداقیەتی نیە لە سەر ئەرزی واقیع، حەقیقەتێکی نیە بەسەریدا بچەسپێ.

﴿ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا ﴾، ئەم (إن)ە (إن)ی لابەر (نافية)یە، واتە: (مَا يَقُولُونَ إلاَّ كَذِباً) واتە: تەنیا درۆ دەکەن و، ئەو قسەیان درۆیەکی ڕووتە و هیچ ڕاستی تێدا نیە.

ئنجا خوا ﷻ دەگوازێتەوە بۆ ئامۆژگاریی کردنی پێغەمبەر ﷺ لە قاڵبی گلەیی لێکردنێکی نەرمدا.

﴿ فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ ﴾، ڕەنگە، نیزیکە خۆت بفەوتێنی بە دوایاندا، (آثار) کۆی (أثر)ە یانی: شوێنەوار، لە دوایان، کە دەڕۆن و بە جێت دەهێڵن و بڕواناهێنن، خەریکی لە دوایان خۆت بفەوتێنی.

﴿ إِن لَّمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ ﴾، بە هۆی ئەوەوە کە بڕوایان بەو فەرمایشتە نیە، ﴿ أَسَفًا ﴾، واتە: بە خەفەتان و بە مەراقان، خەریکە خۆت بفەوتێنی.

ئەوە نەرمە گلەییە و ئامۆژگارییە، ئاڕاستەی پێغەمبەر ﷺ کراوە، واتە: تۆ ئەوەندە خەفەتیان لێ مەخۆ، کە بڕوا ناهێنن بەم فەرمایشتە موبارەکە، زێدەڕۆیی مەکە لە زۆر مەراق خواردن و خەفەت خواردندا، بۆ ئەوەی حاڵەتێکی نەرێنییت بۆ دروست نەبێ و، سەرەنجام: دڵداگیراو و دەم و چاو داگیراو بی، هەڵبەتە ئەمە وێڕای ئەوەی کە ئامۆژگارییە بۆ پێغەمبەر ﷺ و نەرمە گلەییەکە: هاو کات مەدحێکی گەورەشە بۆ پێغەمبەر ﷺ کە چەند دڵسۆز بووە بۆ ئەو خەڵکە و چەند بە تەنگیانەوە بووە و پەرۆشیی بوون.

دوایی خوا وەك دڵدانەوەیەك بۆ پێغەمبەر ﷺ، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا ﴾، ئێمە ئەوەی کە لەسەر زەوییە، گێڕاومانە بە جوانیی و ڕازێنرانەوە بۆی، ﴿ لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾، تاکو تاقییان بکەینەوە، کامەیان کردەوەی باشتر دەکات؟ کەواتە: کاتێك ئەو ئەهلی دنیایە دەبینی، بە دنیاکەی خۆیانەوە خافڵاون و، پێیەوە سەرقاڵن و، ئاوڕ لە تۆو لە پەیامەکەت نادەنەوە، پشتگوێیان بخە، چونکە ئەوەی کە لە دنیادا هەیە و، ئەوان پێیەوە خافڵاون و، پێی لە خۆبایی بوون، ڕازێنرانەوە و جوانییەکی ژیانی دنیایە، بۆ تاقیکردنەوەی ئەوان و واش پێدەچێ: ئەگەر ئەوان بەو شێوەیە بەردەوام بن، لە تاقیکردنەوەکەی خوا دەرناچن و، تووشی سزای خوا دەبن.

﴿ وَإِنَّا لَجَاعِلُونَ مَا عَلَيْهَا صَعِيدًا جُرُزًا ﴾، بە تەئكید ئێمە ئەوەی كە لەسەر زەوییە، دوایی دەیكەینە زەوییەكی ڕووتی سوور و سەقەتاڵە، واتە: هەرچی جوانیی لەسەر زەوی هەیە، چ ئەوشتانەی خوا ﷻ ڕاستەوخۆ خوڵقاندوونی، وەك: باخ و باخات و، دار و درەخت و میوە و، كانزا و، هەموو ئەو شتە جوانانە..هتد، چ ئەوانەی مرۆڤ دروستی كردوون، لە خانووبەرەو كۆشك و تەلار و كارگەو جادە و شەقام و... هتد، ئەوانە هیچیان ناهێڵین و زەوییەكە دەكەینە زەوییەكی ڕووت، وەك پەرژینێك كە كشتوكاڵی لێكرا بێ و، دوایی درواببێتەوەو هیچی لێ نەما بێ، دەیكەینە پەرژینێكی ڕووتی سوورو سەقەتاڵە.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**ستایش بۆ ئەو خوایەی کە کتێبی دابەزاندۆتە سەر بەندەکەی و، هیچ نارێکییەکی نەخستۆتێ، ڕێك و ڕاست و سەرپەرشتیارە، تاکو لەلایەن خۆیەوە: خەڵك لە سزایەکی سەخت بترسێنێ و، مژدەش بەو بڕوادارانە بدات، کە کردارە چاکەکان دەکەن، کە پاداشتێکی باشیان هەیە، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ۜ ﴿١﴾ قَيِّمًا لِّيُنذِرَ بَأْسًا شَدِيدًا مِّن لَّدُنْهُ وَيُبَشِّرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا حَسَنًا ﴿٢﴾ مَّٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدًا ﴿٣﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم سێ ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

**١)- ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَٰبَ﴾، چەمك و واتای وشەی: (الحمد)، (الحمدلله: أي: الثّناء عليه بالفَضيلَة، وَهُوَ أخَصُّ من المَدْح، وأعَمُّ مِنَ الشُّكر).**

**واتە: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾، واتە: ستایش بۆ خوا، مەدح و پێهەڵگوتن بۆ خوا، لە بەرانبەر ئەو سیفەتە بەرزانەدا کە هەیەتی، وشەی (حمد) تایبەتترە لە مەدح، بەڵام گشتییترە لە (شکر)، بابزانین چۆن؟**

**جاری وا هەیە مەدحی خواردنێك دەکەی کە خۆشە، مەدحی گوڵێك دەکەی، کە جوانە، کەواتە: چەمك و واتای مەدح فراوانترە، چونکە (حمد) تەنیا بۆ کەسێکی خاوەن ویست و خاوەن زانست و هەستە، بۆیە:واتای (حمد) لە واتای (مدح) تایبەتترە.**

**ئنجا بۆ وشەی: (حمد) لە کوردییدا، وشەی (ستایش)م پێ ڕاستە و بۆ وشەی: (مدح)یش پێهەڵگوتن و پەسندکردن، بەڵام لە ڕوویەکی دیکەوە: واتای وشەی (حمد) گشتییترە لە هی (شکر)، کە من بۆ: (شکر) لە کوردیی دا، وشەی (سوپاس) دادەنێم،**

چونكە (شكر) بریتیە لەوەی: سوپاسی كەسێك بكەی، كە لەوەوە چاكەیەك بۆ تۆ هاتوە، چاكەیەك لەگەڵ تۆدا كراوە، بەڵام (حمد) تۆ ستایشی كەسێك دەكەی لەبەر چاكیی و ڕازاوەیی بە خەسڵەتێك یان زیاتر لە خەسڵەتە بەرزەكان و، ئەوە ڕەچاو ناكەی كە ئایا: چاكە لەوەوە بۆ تۆ هاتوە، یان نا!

بۆ وێنە: ئێمە ستایشی (حاتم الطائي) دەكەین، لە كاتێكدا كە هیچ پشك و چاكەیەك لە سەخاوەتەكەی، بە ئێمە نەبڕاوە، بەڵام ستایشیشی دەكەین، لەبەر سەخاوەتمەندیەكەی.

ئنجا كە خوا دەفەرموێ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَٰبَ﴾، ستایش هەمووی بۆ ئەو خوایەی كە كتێبی دابەزاندۆتە سەر بەندەكەی، وەك پێشتریش گوتمان: بە سیاق و سەلیقە دیارە كە مەبەست لە: (عَبْدِهِ) بەندەكەی، موحەممەدە ﷺ و مەبەستیش لە: (ٱلْكِتَٰبَ) كتێبەكە، ئەو قورئانەیە كە بۆ پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ، سروش كراوە، تاكو ئەو كاتەی كە سوورەتی (الكهف)ی بۆ هاتوە، یاخود: ئەو كتێبەی كە خوا ﷻ دەزانێ هەمووی دادەبەزێنێتە سەری، ئەگەرنا تاكو ئەو كاتە، ئەگەر (الكهف) شەست و هەشتەمین سوورەت بێ، یاخود: حەفتاهەمین بێ، مانای وایە جارێ چل و چوار سوورەتی دیكە ماون، كە كۆی سەد و چواردە سوورەتەكەی قورئان پێك دێنن، یاخود: چل و شەش ماون.

٢)- ﴿وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا﴾، واتەی: هیچ نارێكیی و لاریی نەخستۆتێ.

ئەو نارێكیی و خوارو خێچییەش، هەندێ گوتوویانە: لە ڕووی بێژەوە و، هەندێ گوتوویانە: لە ڕووی واتاوە، بەڵام لە ڕاستییدا هەردووكیان دەگرێتەوە و قورئان: نە لە ڕووی بێژە (لفظ) و وشەكانیەوە و، نە لە ڕووی واتا (معنی)و مەبەستەوە، هیچ لاریی و نارێكیی تێدا نیە، یانی: قورئان شتێكی تێدا نیە، عاقڵێك بڵێ: بریا تێیدا نەبووایە، چ لە ڕووی بێژەیەوە، بۆ كەسانێك كە شارەزای زمانی عەرەبیین و، شارەزای ڕەوانبێژیین، بەڵكو قورئان لە لووتكەی زمان پاراویی (فصاحة) دایە و، چ لە ڕووی واتاكانیەوە، كە قورئان لە لووتكەی ڕەوانبێژیی (بلاغة) دایە، فەرمانی بە هیچ شتێك نەكردوە، عەقڵی سەلیم بڵێ: بریا فەرمانی پێ نەكردبایە و، هیچ شتێكی قەدەغە نەكردوە، عەقڵێكی سەلیم بڵێ: بریا قەدەغەی نەكردبایە.

٣)- ﴿قَيِّمًا﴾، (القَيِّم: صِفَةُ مُبَالَغَةٍ مِنَ القِيَامِ الْمَجَازِيِّ الَّذِي يُطْلَقُ عَلَى دَوَامِ تَعَهُّدِ الشيءِ، ومُلاَزَمَة صَلاَحِهِ)، واتە: (قَيِّم) سیفەتێكە زێدەڕۆیی تێدا كراوە و لە (قیام)ەوە هاتوە، (قیام) واتە: هەڵسانە پێ، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی مانا مەجازییەكەیەتی، كە كەسێك هەڵسێتە پێ، مانای وایە: ئاگای

لە شتێك دەبێ و، سەرپەرشتیی دەكات و ناهێڵێ تێكبچێ، كەواتە: قورئان لە خودی خۆیدا ڕاست و چەسپاوە و، سەرپەرشتیارو ڕاگریشە، بۆ ژیانی مرۆڤ.

٤)- ﴿لِّيُنذِرَ بَأْسًا شَدِيدًا مِّن لَّدُنْهُ﴾، ئایا قورئان بۆچی دابەزیوە؟ تاكو خوا لە لایەن خۆیەوە، خەڵك بەگشتی، یاخود: بێ بڕوایەكان بەتایبەت بترسێنێ، لە سزایەكی سەخت، كە لە لایەن خۆیەوە دەینێرێ.

(بَأْسًا شَدِيدًا): (عَذَابُ الدُّنيَا، أو عَذَابُ الأَخِرَة، أو كِلَاهُمَا) واتە: سزای دنیا، یان سزای دواڕۆژ، یان هەردووكیان.

لێرەدا كە دەفەرموێ: (لِّيُنذِرَ)، ئەو وشەیە: (فعل و فاعل)ە، بۆ ئەوەی بترسێنێ، كێ بترسێنێ؟ ﴿بَأْسًا﴾، دەبێتە بەركار (مفعول)ی دووەم، بەڵام بەركار (مفعول)ی یەكەمی، قرتێنراوە لەبەرئەوەی دەزانرێ، بەمجۆرە: (لينذر الناس بأساً شديداً)، یان: (لِيُنذِرَ الكُفَّار بَأسَاً شَدِيدَاً) یان (لينذر المشركين)، هەروەها دەشگونجێ: (لينذر) وەك (الفعل اللازم) مامەڵەی لەگەڵدا كرا بێ، كە بەركار (مفعول)ی ناوێ، چونكە مەبەستی سەرەكیی لێترسێنراوەكەیە، كە بریتیە لە سزای سەختی خوا، نەك ترسێنراوەكان، كە بریتین لە بێبڕوایەكان یاخود خەڵك بە گشتی.

مانای وشەی (بأس)یش: (البَأس: الشِدَةُ فِي الألَم) ئازارێكی سەخت، كە وشەی: (شديد) هێندەی دیكە، خەستی دەكاتەوە.

٥)- ﴿وَيُبَشِّرَ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ﴾، واتە: هەروەها ئەو بڕوادارانەی كە كردەوە باشەكان دەكەن، دڵخۆشیان بكات و موژدەیان پێ بدات، بە چی؟

٦)- ﴿أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا حَسَنًا﴾، بەوە كە: پاداشتێكی باشیان هەیە.

٧)- ﴿مَّاكِثِينَ فِيهِ أَبَدًا﴾، كە بە هەمیشەیی لەو پاداشتەدا دەمێننەوە.

ئەوەی لێرەدا جێی سەرنجە، ئەوەیە: خوا ﷻ كە باسی بڕواداران دەكات، دەفەرموێ: ﴿وَيُبَشِّرَ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ﴾، موژدە بدات بەو بڕوادارانەی، كە كردەوە باشەكان دەكەن، یانی: بڕوادارانێك بڕواداربن، كردەوەی باش دەكەن، (كۆزە چی تێدا بێ، ئەوەی لێ دەڕژێ!)، ئەگەر ئینسان عەقڵ و دڵەكەی بە نووری ئیمان ڕۆشن بووبێتەوە، دڵ و دەروونی بە هیدایەتی خوا ئاوەدان بووبێتەوە، بێگومان لەو دڵە پڕ نوورە، لەو دەروونە ئاوەدانە بە ئیمان، هەر كردەوەی باش و ڕەوشت و ئاكاری باش پەیدا دەبێ.

**مەسەلەی دووەم:**

**{هەروەها خوا قورئانی دابەزاندۆتە سەر بەندەکەی} تاکو لەوانە بترسێنێ کە گوتیان: خوا ڕۆڵەی بۆ خۆی داناوە، کە خۆیان و باب و باپیرانیان هیچ زانیارییان لەو بارەوە نیە، ئای چەند قسەیەکی زلە لە زاریان دەردەچێ! ئەوانە تەنیا درۆ دەکەن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيُنذِرَ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا ۝٤ مَّا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ وَلَا لِءَابَآئِهِمْ ۚ كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ ۚ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا ۝٥ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

**١)- ﴿ وَيُنذِرَ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا ﴾ هەروەها خوا قورئانی دابەزاندۆتە سەر بەندەکەی: تاکو ئەوانەی گوتیان: خوا ڕۆڵەی گرتوە، ڕۆڵەی هەیە، بترسێنێ، وریایان بکاتەوە، کە واز لەو ناماقووڵییە بێنن.**

وشەی (ولد) لە زمانی عەرەبییدا، بۆ نێر و مێ بەکاردێ، هەروەها بۆ تاك و كۆش بەکاردێ.

**٢)- ﴿ مَّا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ ﴾ واتە: هیچ زانیارییەکیان پێی نیە، واتە: هیچ بەشێك لە زانیارییان لەوبارەوە نیە، کە خوا ڕۆڵەی هەبێ.**

(مِنْ) بۆ بەشێك (تبعيض)ە، یانی: هیچ جۆرە زانیارییەك، هەر لە سەرەتای زانیارییەوە تاکو کۆتایی، هیچیان لەلا نیە، چونکە دەگونجا بگوترێ: (**مَا لَهُم بِهِ عِلْمٌ**)، بەڵام لێرەدا: ((**مِن)) لتأكيد النَّفي**)، (مِن) بۆ جەختکردنەوەی لابردنی زانیارییە لەواندا، بەو لاف لێدانەی کە دەیکەن، کە بریتیە لە پاڵدانی ڕۆڵە بۆ لای خوا، یانی: (**ما لهم بذلك القول شيءٌ مِنَ العِلم**) بەو قسەیە کە دەیکەن، هیچ بەشێك لە زانیارییان نیە، نە کەم نە زۆر.

**٣)- ﴿ وَلَا لِءَابَآئِهِمْ ﴾ واتە: هەروەها باب و باپیران و پێشینانیشیان، دیسان هیچ زانیارییان لەو بارەوە نیە، یانی: باب و باپیرانیان لەو بارەوە، هیچ بەڵگەیان بەدەستەوە نیە و، هیچ زانیاریی و بەرچاو ڕۆشنییەکیان نەبووە، کە ئەو بیرۆکەی ڕۆڵە پاڵدانە لای خوایان، لە مێشك و دڵی خۆیاندا جێ کردۆتەوە، ئەدی ئێوە، ئەی هاوبەش بۆ خوا دانەر و بێبڕوایەکان! بۆچی لاسایی ئەوانتان**

کردۆتەوە و، کوێرانە بە دوایان کەوتوون، کە ئەوان لە ڕووی زانیارییەوە، ئەو لافەیان لێ نەداوە و، ئەو تۆمەتەیان ئاڕاستەی خوای بەرزی بێ وێنە، نەکردوە!

٤)- ﴿كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ﴾، ئەمە دەگونجێ بۆ سەرسوڕمان بێ، یانی: (مَا أَكْبَرَ كَلِمَةً)، چەند وشەیەکی گەورەیە لە زاریان دەردەچێ!

دەشگونجێ تەنیا بۆ هەواڵ دان بێ، واتە: وشەیەکی گەورەیە لە زارایان دەردەچێ.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ﴾، کە بە شێوەی (الفعل المضارع) هێناویەتی، بۆ ئەوەیە وێنەکە بخاتە بەرچاوان، ئەمەش عادەتێکی بەردەوامی قورئانە، کە خوا ﷻ دەیەوێ ماناو مەبەستەکان، لە شێوەی دیمەنی زیندوودا، بخاتە بەرچاو، ئەویش بەوەی کە کرداری بەردەوام (الفعل المضارع) بەکاردێنێ.

شایانی باسە وشەی (أفواه) کۆی (فُوه)ە، چونکە وشەی (فَمْ) لە ئەصڵدا (فُوه)ە، کە لە (فَوَهَ)ـەوە هاتوە، دەگوترێ: (فَاهَ، فيه، فُوهُ)، بۆیە بە (أفْوَاه) کۆکراوەتەوە، واتە: زارەکان.

کە لێرەدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەوە هەر وشەیەکە بە زار دەیڵێن، یانی: ئەو وشەیە هیچ میصداقیەتێکی نیە و، هیچ (ما صَدَقْ)ێکی نیە لەسەر زەوی، لە دنیای واقیعدا، کە لەسەری بچەسپێ.

٥)- ﴿إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا﴾ واتە: ئەو قسەیە کە دەیکەن، تەنیا سیفەتی درۆی هەیە، تەنیا درۆیەکی ڕووتە و، هیچ بەشێك لە ڕاستیی تێدا نیە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**خوا ﷻ دەفەرموێ: ئـەی موحەممـەد! ڕەنگـە بەهـۆی زێـدە مـەراق خواردنتـەوە لـە دوایـان، کـە بـڕوا بـەم فەرمایشـتە ناهێنـن، خـۆت بفەوتێنـی!:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٞ نَّفۡسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمۡ إِن لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَسَفًا ﴿٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٞ نَّفۡسَكَ ﴾، واتە: نیزیکە فەوتێنەری خۆت بی، ڕەنگە خۆت بفەوتێنی.

(لعـلَّ، حقیقتُهـا: إنشـاء الرَّجـاءِ والتوقُّـع)، (لعـلَّ) حەقیقەتەکـەی بریتیـە لـە پەیداکـردنی ئومێـدو چاوەڕوانیـی، کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٞ نَّفۡسَكَ ﴾، نیزیکـە، ڕەنگـە، لەوانەیـە: فەوتێنـەری خـۆت بی، بـە هـۆی چییـەوە؟

٢)- ﴿ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمۡ ﴾، واتە: بە دوایاندا، (آثار: جمع أثر، وهو ما يُؤْثِرُه، أي: يُلقِيهِ الماشِي، أو الرَّاكِبُ على الأرض)، (أي: لعلَّك مُهْلِكٌ نَفْسَكَ لأَجْلِ إعْرَاضِهِم عَنْك)، واتە: وشەی (آثار) کۆی (أثر)ە، کە بە مانای شوێنەوار دێ، ئەویش ئەوەیە کە پێڕۆیەك، یان سوارێك بەسەر زەویدا دەڕوا، ئەو شوێنەوارەی بە جێی دەهێڵێ، پێی دەگوترێ: (آثار).

مەبەسـت ئەوەیـە: نیزیکـە فەوتێنـەری خـۆت بی، بـە هـۆی ئـەوەوە کـە پشـتت تێدەکـەن و، ڕووت لـێ وەردەگێـڕن و، بـڕوات پـێ ناهێنـن.

٣)- ﴿ إِن لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ ﴾، بە هۆی ئەوەوە کە بڕوایان بەم فەرمایشتە نەهێنا.

٤)- ﴿ أَسَفًا ﴾، بە هۆی خەفەت و مەراق خواردنی زۆرتەوە.

چونکـە وشـەی (أسَـف): (أشَـدُّ الحُـزْن)، واتـە: دڵتەنگییـەکی زۆر، مەراقێـکی زۆر، وشـەی (أسـفا) لێـرەدا دەبێتـە (مفعـول لَـهُ)، واتـە: بـە هـۆی خەفـت خواردنتـەوە، خەریـکی خـۆت بفەوتێنـی، دەشـگونجێ ئەمـە وێناکـردنی حاڵـی پێغەمبـەر ﷺ بـێ، لەگـەڵ ئـەو بێبڕوایانـەدا کـە بـڕوای پـێ ناهێنـن، بـە کەسـێك کـە کۆمەڵـە خەڵکێك بەجێـی دەهێڵـن، ئەویش بـە دوای شـوێنەوارەکانیاندا دەچـێ، هەرچەنـدە بـە دوایانـدا دەچـێ و بانگیـان دەکات، ناگەڕێنـەوە، پێغەمبەریـش ﷺ وا وێناکـراوە کـە بـە دوای ئەوانـەدا دەڕوا و، پشـتی تێدەکـەن و، بـە دوای شـوێن پێکانیانـدا دەچـێ و، دەیـەوێ بیانگێڕێتـەوە، بـۆ شـتێك کـە بەرژەوەندیـی ئـەوانی تێدایـە، بـەڵام بـە قسـەی ناگەڕێنـەوە و، ئەویـش لـە ئەنجامـی ئـەوەدا دڵتەنـگ و نارەحـەت دەبـێ.

**مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:**

**خوا ﷻ دەفەرموێ: ئێمە ئەوەی لەسەر زەوییە، گێڕاومانە بە مایەی ڕازاندنەوەی، تاکو تاقییان بکەینەوە، کامیان کردەوەی باشترە؟ دواییش ئەوەی لەسەر زەوییە، دەیکەینە خاکێکی ڕووتی پەڕتی ئاسا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ وَإِنَّا لَجَٰعِلُونَ مَا عَلَيْهَا صَعِيدًا جُرُزًا ﴿٨﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:**

١)- ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا ﴾، واتە: بە دڵنیایی ئێمە ئەوەی کە لەسەر زەوییە، کردوومانە بە مایەی ڕازێنرانەوە و جوانیی بۆ زەوی.

لە زۆر شوێنی قورئاندا ئاماژە بەوە کراوە، کە ئەوەی لەسەر زەوییە، مایەی جوانیی ژیانی دنیایە و، ڕازاندنەوەی زەوییە، بۆ وێنە:

خوا لە سوورەتی (آل عمران)دا، دەفەرموێ: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ ﴿١٤﴾ ﴾، کە لە بەرگی دووەمی ئەم تەفسیرەدا، بە درێژیی ئەو ئایەتەمان شیکردۆتەوە، ئنجا ئایا بۆچی خوا سەر زەوی ڕازاندۆتەوەو جوانی کردوە؟

٢)- ﴿ لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾ تاکو تاقییان بکەینەوە، کامیان کردەوەی باشترە؟ (البَلْو: الإِخْتِبارُ وَالتَّجْرِبَةُ)، (بلو) بریتیە لە تاقیکردنەوە و ئەزموونکردن.

٣)- ﴿ وَإِنَّا لَجَٰعِلُونَ مَا عَلَيْهَا ﴾، هەروەها ئێمە بە دڵنیاییەوە، ئەوەی کە لەسەر زەوییە، ڕاناوی (ها)ی سەر ﴿ مَا عَلَيْهَا ﴾، کە ڕاناوی مێینەیە، بۆ زەوی دەگەڕێتەوە، چونکە زەوی مێینەی مەجازییە، هەروەك ئاسمانیش مێینەی مەجازییە.

٤)- ﴿ صَعِيدًا جُرُزًا ﴾ (ئێمە ئەوەی کە لەسەر زەوییە دەیگێڕین بە) زەوییەکی ڕووتی بێ دەرامەت، بێ ڕووەك.

(جُرُز الأرض: الَّتِي لاَ نَبَاتَ فِيهَا)، زەوییەك كە هیچ ڕووەكێك و شیناوردێكی لەسەر نیە.

پێشتریش گوتمان: (جُـرُز) بـە: (جَـرْز) و (جُرْز)یـش خوێنراوەتـەوە، (جرز)یـش كۆیەكـەی (أجراز)ە، واتـە: ئـەو زەوییانـەی كـە هیـچ ڕووەكێكیـان لەسـەر نیـە، لـەو بارەشـەوە ئـەم دوو فەرموودەیـە دەهێنینـەوە:

یەكەم: لەمەیاندا، پێغەمبەر ﷺ باسی ئەوە دەكات، كە ژیانی دنیا بە ڕاستیی جوانەو ڕازاوەیە، بەڵام مرۆڤ دەبێ لێی وریا بێ و، فریوی پێ نەخواو، نەیكاتە ئامانج، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: [إِنَّ الدُّنْيَا خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، وإِنَّ اللَّهَ مُسْتَخْلِفُكُمْ فِيهَا، فَيَنْظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ] (أخرجه مسلم: ٢٧٤٢).

واتـە: بێگومـان دنیـا سـەوزەو شـیرینە، خـواش ئێـوەی تێـدا كردۆتـە جێنشـین، تەماشـا دەكات داخـۆ چـۆن كار دەكـەن؟!

ئـەوەش حەقیقەتێكـە و ژیانـی دنیـا: هـەم لـە ڕووی جوانییـەوە، جوانـە، چونكـە پێغەمبـەر دەفەرمـوێ: (خَـضِرة) سـەوزیش ڕەنگێـكی جـوان و بەرچـاوو دڵنشـینە، هەروەهـا دەفەرمـوێ: ژیـانی دنیـا شیرینیشـە، چونكـە تامـی شـیرین، لـە تامـەكانی دیكـە، بـە پێـی سروشـتی زۆربـەی مرۆڤـەكان، خۆشـترە، یـانی: دنیـا چـۆنی بڵێـی تـاوا خۆشـە و، جوانـە لـە ڕووە ماددییەكەیـەوە، بـەڵام خـوا ئێـوەی تێـدا كردۆتـە جێنشـین، داخـۆ چـی دەكـەن؟ ئایـا بـاوەشی پێـدا دەكـەن و، دەیكەنـە ئامانجـی خۆتـان؟ یـان بـە ئەنـدازەی مانەوەتـان تێـدا و، بـە پێـی ئـەو حیكمەتـەی كـە خـوا ژیـانی بـۆ هێناوەتـە دی، مامەڵـەی لەگەڵـدا دەكـەن!

دووەم: [عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: «أَخْوَفُ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ: مَا يُخْرِجُ اللهُ لَكُمْ مِنْ زَهْرَةِ الدُّنْيَا»، قَالُوا: وَمَا زَهْرَةُ الدُّنْيَا يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ؟ قَالَ: «بَرَكَاتُ الأَرْضِ»] (أخرجه البخاري: ٦٤٢٧، ومسلم: ١٠٥٢، وابن ماجه: ٣٩٩٥).

واتـە: ئەبـوو سـەعیدی خودریـی رضي الله عنه دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی: مەترسـییدارترین شـتێك كـە مـن مەترسـییم لەسـەرتان هەیـە، ئەوەیـە كـە خـوا لـە گوڵـی ژیـانی دنیـا بۆتـان دەردەهێنـێ، گوتیـان: گوڵـی دنیـا (زهـرة الدنیـا)، چیـە؟ فەرمـووی: پیـت و پێـزەكانی زەوی، [ئـەوەی كـە لـە زەوی پەیدادەبـێ، دەترسـم، بـە هـۆی ئـەوەوە، تـووشی لادان و، خـواو خەڵـك لـە بیرچوونـەوە و، دواڕۆژ پشتگوێخسـتن و، دنیـا لـە بـاوەش گرتـن، بـبن].

هەڵبەتـە مەترسییەكەی پێغەمبەریـش ﷺ لـە جێـی خـۆی دابـووە و، بـە كـردەوە: مسـوڵمانان و نامسـوڵمانان، مەگـەر كەسـێك پەیوەندییـەكی تونـدو تۆڵی لەگەڵ خـوای پـەروەردگاردا هەبـێ و، ڕۆژی

دوایی کردبێتە ئامانجی خۆی و، دنیا وەك خۆی بناسێ، ئەگەرنا هەر خەڵکەو لەسەر دنیا بەشەڕ دێن و تێکدەگیرێن، بەڵکو هەر خەڵکە بە هۆی دنیاوە، خوا و خەڵکی لە بیردەچێ و، دوارۆژ فەرامۆش دەکات و، سەرەنجام دنیایەکەی ژیانێکی زوو تێپەڕە و بەسەر دەچێ و، دوارۆژەکەشی لە دەستدەچێ و، دەستی لەبنی هەنبانەی خاڵییەوە دەردەچێ!

هەڵبەتە کە خوا ﷻ ئاوا باسی ژیانی دنیا دەکات، دەگونجێ زۆر ئامانج لەبەرچاو گیرابن، ئینسان تاکو لە فەرمایشتەکانی خوا ورد بێتەوە، نهێنیی بۆ دەردەکەون، بەڵام ئەوەی ئێمە لێی تێگەیشتبین، دوو ئامانج و مەبەستن:

١)- مەبەست دڵدانەوەی پێغەمبەر ﷺ و بڕوادارانە، کە ئێوە ئەو کافرانەی دنیا پەرست و دنیا ویستن و، دەیانبینن ئەو پەیامەی خواتان لێ وەرناگرن و، بایەخی پێ نادەن و، وەك شایستەیە بۆ پەیامی خوا، مامەڵەی لەگەڵدا ناکەن، خەمیان لێ مەخۆن! چونکە دنیا شتێك نیە و ئەم ژیانە دنیاییە، کە ئەوانە پێی هەڵخەڵەتاون، زۆر زوو تێپەڕە و، هەروا دەکەن، سەریان ئاوا دەبێ و، خۆیان لە قۆناغی بەرزەخ و، پاشان قیامەتدا دەبیننەوە.

٢- خوا حیکمەتی خۆی لە دروستکردنی گەردوون و مرۆڤدا دەردەخات، کە بریتیە لە تاقیکردنەوەی مرۆڤ و، خوا مرۆڤی لە دنیادا داناوە، تاقی بکاتەوە: داخۆ چۆن دەردەچێ؟ کە هەمان مەبەست لە سوورەتی (الملك)یشدا هاتوە، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾﴾، واتە: خوا ئەو کەسەیە کە ژیان و مردنی گێڕاون لە دنیادا، تاکو تاقیتان بکاتەوە کامەتان کردەوەی باشترە؟

هەروەها لە سوورەتی (هود)یشدا، هەمان مەبەست هاتوە: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۗ وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِنۢ بَعْدِ ٱلْمَوْتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَـٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾﴾.

واتە: هەروەها (خوا) ئەو کەسەیە ئاسمانەکان و زەوی بە شەش ڕۆژان (شەش قۆناغ) دروستکردوون و، بارەگایەکەشی - لەو حاڵەدا - لەسەر ئاو بوو، تاکو تاقییتان بکاتەوە: کامەتان کردەوە باشترە؟ ئەگەر بشڵێی: لە دوای مردن زیندووکراوەن، ئەوانەی بێبڕوان دەڵێن: ئەمە تەنیا جادوویەکی ئاشکرایە.

سُبْحَانَك اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان هـەژدە (١٨) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەكانی: (٩ - ٢٦) كـە بەسـەرهاتی هـاوەڵانی ئەشـكەوتیان تێـدا خراوەتـە ڕوو، سـەرەتا لـە چـوار (٤) ئایـەتی یەكـەم (٩ - ١٢)دا، ئاماژەیـەكی خێـرا بـە بەسـەرهاتەكەیان كـراوە، پاشـان لـە چـواردە (١٤) ئایـەتی كۆتاییـدا: (١٣ - ٢٦) درێـژەی بەسـەرهاتەكە خراوەتـە ڕوو.

شـایانی باسـە: خـوای كارزان ﷻ، چ لـەم بەسـەرهاتەی هـاوەڵانی ئەشـكەوت، چ لـە سـەرجەم بەسـەرهاتەكانی دیكـەدا، كـە لـە كتێبـی كۆتایـی خۆیـدا بۆمـان دەگێڕێتـەوە، تەنیـا شـوێنی دەرس و پەنـد لێوەرگرتـن لـە بەسـەرهاتەكاندا، بـاس دەكات و، بـاسی هێڵە گشتییەكانی بەسـەرهاتەكان دەكات، نـەك وردەكارییـەكان، بـۆ وێنـە: نـاوی شـوێنەكان و، نـاوی كەسـەكان و، قەبـارەو چۆنیـەتی كـەل و پەلـەكان، جێـگا و ڕێـگاكان و ... هتـد، ئەوانـە هیچیـان بـاس نـاكات، مەگـەر وردەكارییـەك كـە حیكمەتێـك، یاخـود زیاتـری پێـوە پەیوەسـت بـێ.

## پوختەی بەسەرهاتی هاوەڵانی ئەشكەوت

كۆمەڵـە گەنجێـكی خواپەرسـت و خـوا بەیەكگـر (عابـد وموحـد) لـە تـرسی كۆمەڵگایەكەیـان، كـە بیرۆكـەی بتپەرسـتییان تەبەننیـی كـردوە و هاوەڵیـان بـۆ خـوا پەیـدا كـردوون، پاشـان بەوەنـدەش وازناهێنـن كـە: كۆمەڵگایەكـە و باڵادەسـتانی كۆمەڵگایەكـە، بیرۆكـەی شـیرك و بتپەرسـتی تەبەننیـی بكـەن، بەڵكـو هـەر كەسـێكیش كـە ئـەو بیرۆكەیـە تەبەننیـی نـەكات، هەڕەشـەی مەرگـی لـێ دەكـەن، ئنجـا ئـەو كۆمەڵـە گەنجـەش، لـە تـرسی ئـەوە، پەنـا بـۆ دەشـت و كێـو دەبـەن و، دەچنـە ئەشـكەوتێكەوە، خـوای زانـاو توانـاش مـاوەی سێسـەدونۆ (٣٠٩) سـاڵ بـە سـاڵی كۆچیـی و (٣٠٠) سـاڵی خۆریـی، دەیانخەوێنـێ، پاشـان دوای ئـەو (٣٠٩) سـاڵ نوسـتنە، بێداریـان دەكاتـەوە.

ئنجـا لـە كاتی نـاردنی یەكێكیانـدا، بـۆ شـار بـۆ كڕینـی خـواردن، بـەو پـارە زیـوەی كـە پێیانـە و، هـی چەنـد سـەدەیەك لـەوەو پێشـە: ئاشـكرا دەبـن، كـە لـە تەفسـیرەكان و لـە

کتێبە مێژووییەکاندا دەڵێ: هاوەڵانی ئەشکەوت لە سەردەمی پادشا (دەقیانوس) یان (دۆکیۆس)دا، دەبن، کە یەکێك بووە لە ئیمپراتۆرەکانی ڕۆم.

سەرەنجام خەڵکەکە بۆیان دەردەکەوێ، کە ئەو گەنجانە، هەمان ئەو گەنجانەن، کە باب و باپیرانیان بۆیان باس کردوون، کە لە ڕۆژگاری زوودا شوێن بزر بوون، دوایی هیچ پەیسەریان نەکردوون! تا ئەوانەن، ئنجا دوای ئەوەی گەنجەکان بۆیان دەگێڕنەوە: کە ئێمە خەوتووین، خەڵکەکە بۆیان دەردەکەوێ، کە ئەوانە سێ سەدە زیاترە، خەوتوون.

لەو کاتیشدا: باسی زیندوو کرانەوە و سزا و پاداشتی خوا، مشت ومڕی گەرمی لەسەر دەبێ، وەك دوایی لە درێژەی بەسەرهاتەکەدا ئاماژەی پێ دەکەین، ئنجا ئەوە دەبێتە بەڵگەیەکی زۆر گەورە و پتەو لەسەر ئەوە کە ڕای ئەوانە ڕاستە و، ئایینی ئەوانە ڕاستە، کە دەڵێن: زیندوو بوونەوە و، سزا و پاداشت هەیە، چونکە خوایەك بتوانێ سێ سەد ونۆ (٣٠٩) ساڵ، ئەو گەنجانە بخەوێنێ لە ئەشکەوتێکدا، دەشتوانێ: چەند هەزار ساڵێکیش دوای ئەوەی مرۆڤەکان دەمرن و، کاتیان بەسەردا دەڕوات، زیندوویان بکاتەوە.

﴿أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُوا۟ مِنْ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا ﴿٩﴾ إِذْ أَوَى ٱلْفِتْيَةُ إِلَى ٱلْكَهْفِ فَقَالُوا۟ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ﴿١٠﴾ فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ فِى ٱلْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا ﴿١١﴾ ثُمَّ بَعَثْنَٰهُمْ لِنَعْلَمَ أَىُّ ٱلْحِزْبَيْنِ أَحْصَىٰ لِمَا لَبِثُوٓا۟ أَمَدًا ﴿١٢﴾ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُوا۟ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى ﴿١٣﴾ وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا۟ فَقَالُوا۟ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَن نَّدْعُوَا۟ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهًا ۖ لَّقَدْ قُلْنَآ إِذًا شَطَطًا ﴿١٤﴾ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمُنَا ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً ۖ لَّوْلَا يَأْتُونَ عَلَيْهِم بِسُلْطَٰنٍۭ بَيِّنٍ ۖ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴿١٥﴾ وَإِذِ ٱعْتَزَلْتُمُوهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ فَأْوُۥٓا۟ إِلَى ٱلْكَهْفِ يَنشُرْ لَكُمْ رَبُّكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ وَيُهَيِّئْ لَكُم مِّنْ أَمْرِكُم مِّرْفَقًا ﴿١٦﴾ وَتَرَى ٱلشَّمْسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهْفِهِمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقْرِضُهُمْ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ وَهُمْ فِى فَجْوَةٍ مِّنْهُ ۚ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ۗ مَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيًّا مُّرْشِدًا ﴿١٧﴾ وَتَحْسَبُهُمْ أَيْقَاظًا وَهُمْ رُقُودٌ ۚ وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِ ۖ وَكَلْبُهُم بَٰسِطٌ ذِرَاعَيْهِ بِٱلْوَصِيدِ ۚ لَوِ ٱطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ لَوَلَّيْتَ مِنْهُمْ فِرَارًا وَلَمُلِئْتَ مِنْهُمْ رُعْبًا ﴿١٨﴾

وَكَذَٰلِكَ بَعَثْنَٰهُمْ لِيَتَسَآءَلُوا۟ بَيْنَهُمْ ۚ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ ۖ قَالُوا۟ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ۚ قَالُوا۟ رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ فَٱبْعَثُوٓا۟ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَآ أَزْكَىٰ طَعَامًا فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ وَلْيَتَلَطَّفْ وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا ﴿١٩﴾ إِنَّهُمْ إِن يَظْهَرُوا۟ عَلَيْكُمْ يَرْجُمُوكُمْ أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِى مِلَّتِهِمْ وَلَن تُفْلِحُوٓا۟ إِذًا أَبَدًا ﴿٢٠﴾ وَكَذَٰلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ لِيَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ لَا رَيْبَ فِيهَآ إِذْ يَتَنَٰزَعُونَ بَيْنَهُمْ أَمْرَهُمْ ۖ فَقَالُوا۟ ٱبْنُوا۟ عَلَيْهِم بُنْيَٰنًا ۖ رَّبُّهُمْ أَعْلَمُ بِهِمْ ۚ قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُوا۟ عَلَىٰٓ أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا ﴿٢١﴾ سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٌ رَّابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ رَجْمًۢا بِٱلْغَيْبِ ۖ وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ ۚ قُل رَّبِّىٓ أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا قَلِيلٌ ۗ فَلَا تُمَارِ فِيهِمْ إِلَّا مِرَآءً ظَٰهِرًا وَلَا تَسْتَفْتِ فِيهِم مِّنْهُمْ أَحَدًا ﴿٢٢﴾ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَا۟ىْءٍ إِنِّى فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَىٰٓ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّى لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا ﴿٢٤﴾ وَلَبِثُوا۟ فِى كَهْفِهِمْ ثَلَٰثَ مِا۟ئَةٍ سِنِينَ وَٱزْدَادُوا۟ تِسْعًا ﴿٢٥﴾ قُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُوا۟ ۖ لَهُۥ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ أَبْصِرْ بِهِۦ وَأَسْمِعْ ۚ مَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِىٍّ وَلَا يُشْرِكُ فِى حُكْمِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{ئایا نیشانە سەرسوڕهێنەرەکانمت نەدیون؟} یان ئایا پێت وایە هاوەڵانی ئەشکەوت و ڕەقیم لە (ڕیزی پێشەوەی) نیشانە سەرسوڕهێنەرەکانمانن! ﴿٩﴾ کاتێک گەنجەکان پەنایان بۆ ئەشکەوتەکە برد و گوتیان: پەروەردگارمان! لە لایەن خۆتەوە بەزەیەکی تایبەتمان بدەیە و، لە کاروباریشماندا سەر ڕاستییمان بۆ برەخسێنە ﴿١٠﴾ ئێمەش ژمارەیەک لە ساڵان، گوێیەکانیانمان داخستن (خەومان لێخستن) ﴿١١﴾ دوایی بێدارمان کردنەوە {هەڵمان ستاندن}، تاکو بزانین: کام لە دوو کۆمەڵەکە، باشتر سەرژمێری ماوەی مانەوەکەیانیان کردوە؟ ﴿١٢﴾ ئێمە بە شێوەیەکی ڕاست و دروست هەواڵەکەیانت بۆ دەگێڕینەوە: ئەوانە گەنجانێک بوون، بڕوایان بە پەروەردگاریان هێنا بوو، ئێمەش ڕێی ڕاستگرتنمان

بۆیان زیاد کرد ﴿١٣﴾ هەروەها دڵیانمان بە هێز و پێز کرد، کاتێك هەڵسان گوتیان: پەروەردگارمان مشوورخۆری ئاسمانەکان و زەوییە، جگە لەوی هیچ کەس و شتێکی دیکە بە پەرستراو بانگ ناکەین، ئەگەرنا قسەیەکی دوور لە ڕاستییمان کردوە ﴿١٤﴾ ئا ئەوانە خەڵکەکەمانن، جگە لەو (خوا) پەرستراوانی دیکەیان گرتوون (ئنجا ئەگەر ڕاست دەکەن پەرستراون) با بەڵگەیەکی ئاشکرایان لەسەر بێنن! دەجا کێ لەو کەسە ستەمکارترە، کە درۆ بەخواوە هەڵدەبەستێ (هاوبەشی بۆ دادەنێ)! ﴿١٥﴾ (لە نێو خۆیاندا گوتیان:) ئێستا کە کەنارتان لە خەڵکەکە گرتوەو، وازتان لەو (پەرستراو)انە هێناوە کە لە جیاتی خوا دەیانپەرستن، پەنا بۆ ئەشکەوتێك بەرن (بە دڵنیایی) پەروەردگارتان لە بەزەیی خۆیتان بۆ بڵاودەکاتەوەو، هۆکارو پێداویستییش بۆ کاروبارتان دەڕەخسێنێ ﴿١٦﴾ (ئنجا ئەگەر تۆ لەو کاتەدا لەوێ بای!) خۆرت دەبینی لە کاتی هەڵاتنیدا، بەرەو لای ڕاستی ئەشکەوتەکەیان، خۆی لادەداو، کاتێکیش ئاوا دەبوو، بەرەو لای چەپ خۆی لێ لادەدان و، ئەوانیش لە بۆشاییەکەیدا بوون، ئەوە لە نیشانەکانی خوایە، هەر کەس خوا ڕاستە ڕێی بکات، هەر ئەو ڕێی ڕاستگرتوویەو، (خوا) هەر کەسێکیش گومڕا بکات، هیچ سەرپەرشتیارێکی بە ئامانج گەیەنەرت بۆی چنگ ناکەوێ ﴿١٧﴾ هەروەها (ئەگەر بینیباتن) پێت وابوو بێدارن، کەچی خەوتوو بوون و بە لای ڕاست و چەپدا، هەڵگێڕ و وەرگێڕمان دەکردن و، سەگەکەشیان لەلای ڕێسمان (و دەروازەی ئەشکەوت)ەکە هەردووك دەستی ڕاخستبوون، ئەگەر بەسەریاندا چووبای: بە ڕاکردنەوە پشتت تێیان دەکرد و، بە هۆیانەوە پڕ دەبووی لە بیم و ترس [ و سام دایدەگرتی] ﴿١٨﴾ هەر بەو شێوەیەش هەڵمانستاندن (بێدارمان کردنەوە) تاکو لە نێو خۆیاندا بکەونە پرسیار و باس و خواس، بێژەرێکیان گوتی: ئەرێ چەند (بە خەوتوویی) ماونەوە؟ گوتیان: ڕۆژێك یان بەشێك لە ڕۆژێك، گوتیان: پەروەردگارتان زاناترە بە ماوەی مانەوەتان (لە خەودا)، دەجا یەکێکتان بەم (دراوە) زیوەوە بنێرنە شار، با سەرنج بدات: کامیان (لە دووکانەکان) خواردنەکەی چاك و پاکترە، با بژیوێکتان لەوە بۆ بێنێ و، با پەنهانکارییش بکات و، وانەکات هیچ کەس پێتان بزانێ و هەستتان پێ بکات ﴿١٩﴾ چونکە ئەگەر پێتان بزانن و بتاندۆزنەوە، بەرد بارانتان دەکەن، یان دەتانگێڕنەوە نێو ئایینەکەیان و (ئەو کاتەش) هەرگیزا و هەرگیز، سەرفراز نابن ﴿٢٠﴾ بەو شێوەیەش وامانکرد خەڵکەکە بیاندۆزنەوە، (پێیان بزانن) تاکو بزانن: کە بەڵێنی خوا (بە زیندووکرانەوە) ڕاستە و، کاتی هاتنی سزا و پاداشت جێی دوو دڵیی نیە، ئیدی ئەوە بوو لە بارەیانەوە (کە چییان لێ بکەن؟) کەوتنە مشت و مڕەوە، گوتیان: خانوویەکیان لەسەر بکەن (لەسەر جەنازەکانیان)، پەروەردگاریان پێیان زاناترە،

(بەڵام) ئەوانەی بەسەر کاروباری خۆیاندا دەستڕۆیشتوو بوون، {زاڵ و باڵادەست بوون} گوتیان: بە دڵنیایی مزگەوتێکیان، {پەرستگایەکیان} لەسەر دروست دەکەین ﴿٢١﴾ (خەڵكێك) (لەبارەیانەوە) دەڵێن: (هاوەڵانی ئەشکەوت) سێ کەس بوون و، چوارەمیان سەگەکەیان بووە و، (هەندێکی دیکەیان) دەڵێن: پێنج کەس بوون و، شەشەمیان سەگەکەیان بوو (ئا ئەوە قسەی بێ بەڵگەیە) و بەرەو نادیار هاویشتنە، هەروەها (هەندێك) دەڵێن: حەوت کەس بوون و، هەشتەمیان سەگەکەیان بووە، بڵێ: پەروەردگارم بە ژمارەیان زاناترە، جگە لە کەمێك (لە زانایان) کەس نایانزانێ، تۆش جگە لە مشت و مڕێکی ڕووالەتیی مشت ومڕیان لە بارەوە مەکە و، لە بارەشیانەوە: لە هیچ کام لەوان (لە نامسوڵمانان) مەپرسە ﴿٢٢﴾ بۆ هیچ شتێکیش مەڵێ: من سبەینێ بکەرمی ﴿٢٣﴾ مەگەر (بڵێی:) ئەگەر خوا بیەوێ، هەر کاتیش لە یادت چوو، باسی پەروەردگارت بکە و بڵێ: ئومێد وایە پەروەردگارم بەرەو سەر ڕاستییەکی نیزیکتر لەوە، {لەوەی پێشوو} ڕاستە ڕێم بکات ﴿٢٤﴾ سێ سەد ساڵ (بەساڵی خۆریی) لە ئەشکەوتەکەیاندا (بە نووستوویی) مانەوەو، نۆ ساڵیشیان (بەساڵی مانگیی) زیاد کرد ﴿٢٥﴾ بڵێ: پەروەردگارم زاناترە بە ماوەی مانەوەیان، پەنهانی ئاسمانەکان و زەوی هەر هی ویە، ئای! چەندە بینەر و بیسەرە! (مرۆڤەکان) جگە لەوی هیچ سەرپەرشتیاریان نین و، هیچ کەسیش لە حوکمڕانیی و بڕیاریدا، ناکاتە هاوبەش ﴿٢٦﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَهَيِّئْ لَنَا): واتە: بۆمان بسازێنە و ئامادە بکە، (التَّهْيِئَةُ: الإِعْدَادُ والتَّحْضِير)، (تهيئة) بریتیە لە ئامادەکردن و سازکردن.

(رَشَدًا): (الرَّشَدُ وَالرُّشد: خِلَافُ الغَيِّ، يُستعملُ اسْتِعْمَالَ الهِدَايَة)، واتە: وشەی (رَشَد) و (رُشد)، {کە هەردووکیان چاوگن} پێچەوانەی (غَيّ)ن، کە واتە: بێ مرادیی و بە ئامانج نەگەیشتن، کەواتە: (رَشَد) و (رُشد)، واتە: بە ئامانج گەیشتن، جاری واش هەیە وشەی (رَشَد) و (رُشد) لە جیاتی (هداية) بەکاردەهێنرێ، بەڵام من پێم وایە کە (هُدَى) و (ضَلَال) پێچەوانەی یەکدین، هەروەك چۆن (رُشد) و (غَيّ) پێچەوانەی یەکدین، (هُدَى) واتە: ڕێنمایی کردن، (ضَلَال) واتە: گومڕابوون، (رُشد) واتە: بە ئامانج گەیشتن و سەر ڕاستیی، هەروەك (غَيّ) واتە: بێ مرادیی و بێ ئاکامیی.

( فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ ): واتە: گوێیەكانیانمان قورس كرد. (الضَّرْبُ: إِيْقَاعُ شَيءٍ عَلَى شَيءٍ، وَالضَّرْبُ عَلَى الأُذُنِ، اسْتُعِيرَ للنَّوم)، (ضرب) بریتیە لەوە كە شتێك بە شتێك دابدەی، بەڵام (الضَّرْبُ عَلَى الأُذُنِ) واتە: بە گوێ دادان، خوازراوەتەوە بۆ خەوتن، چونكە مرۆڤ لە ڕێی گوێیەوە خەبەری دەبێتەوە، كاتێ كە شتێك دەبیستێ، بە زۆریی وایە، بەوە بێدار دەبێتەوە، چونكە لە كاتی خەوتندا گوێ هەر كراوەیە، بەڵام چاوەكان داخراون.

(أَحْصَىٰ ): (الإِحْصَاءُ: التَّحْصِيلُ بالعَدَد) واتە: سەر ژمێركردن كە ژمارەی شتێك بزانی، (إحصاء) واتە: سەرژمێركردن، ئایا لە چییەوە هاتوە؟ (وَذَلِكَ مِنْ لَفْظِ الحَصَى، مِنْ حَيْثُ إِنَّهُمْ كَانُوا يَعْتَمِدُونَهُ بالعَدِّ، كَاعْتِمَادِنَا عَلَى الأَصَابِعِ) (إحصاء) لە وشەی (حصى)وە هاتوە، (حصى) واتە: دەنكە چەو و وردە بەرد، چونكە پشتیان بە وردە بەردان دەبەست، بۆ ژماردن، وەك چۆن ئێمە پشت بە پەنجان دەبەستین [یاخود بە شتی دیكە].

(لَبِثُوٓاْ ): (لَبِثَ بالمَكَانِ: أَقَامَ بِهِ مُلاَزِماً لَه)، (لَبِثَ بالمَكَانِ) واتە: لە شوێنەكە مایەوە و، شوێنەكەی چۆڵ نەكرد.

(أَمَدًا ): (الأَمَدُ: مُدَّةٌ لَهَا حَدٌّ مَجْهُولٌ إِذَا أُطْلِقَ، وَالفَرْقُ بَيْنَ الزَّمَانِ والأَمَدِ، أَنَّ الأَمَدَ يُقَالُ باعْتِبَارِ الغَايَةِ، وَالزَّمَانُ عَامٌّ فِي المَبْدَأِ وَالغَايَةِ)، واتە: وشەی (أَمَد) ماوەیەكە سنوورێكی نەزانراوی هەیە، كاتێك كە بە ڕەهایی دێ، جیاوازیی نێوان (زَمَان) و (أَمَد)یش ئەوەیە، كە (أمد) بە ڕەچاوكردنی نامانجی كاتەكە، كۆتایی كاتەكە، بەكاردێ، بەڵام (زَمَان) گشتییە، هەم بۆ سەرەتا و، هەم بۆ كۆتایی كات، بەكاردێ.

( وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ ): (رَبْطُ الفَرَسِ: شَدُّهُ بالمَكَانِ للحِفْظِ، رَبَطنَا عَلَى قُلُوبِهِم: قَوَّيْنَاهَا)، (ربط الفرس) واتە: كاتێك كە مرۆڤ ئەسپ، یاخود وڵاخ دەبەستێتەوە [بە سینگێكەوە یان بە شوێنێكەوە بۆ ئەوەی نەڕوات و] بۆ ئەوەی بیپارێزێ، (رَبَطنَا عَلَى قُلُوبِهِم) واتە: دڵیانمان گرێدا، واتە: دڵیانمان بەهێز كرد.

لێرەدا دڵی مرۆڤ چوێندراوە بە گۆزەیەك، یان دەفرێكەوە كە شتێكی شل، یان شتێكی تێدایە، مرۆڤ زارەكەی دەبەستێ، بۆ ئەوەی ئەو مادده شلەمەنییەی تێیدایە، نەڕژێ.

(شَطَطًا ): (الشَّطَطُ: الإِفْرَاطُ فِي البُعْدِ)، (شَطَط) زێدەڕۆییە لە دووركەوتنەوەدا، دەگوترێ: (شَطَّتِ الدَّارُ وأَشْطَطْتُ الدَّارَ)، (شَطَّتِ الدَّارُ) واتە: خانووەكە دوورە، ماڵەكە دوورە، بەڵام (أَشْطَطْتُ الدَّار) واتە: ماڵەكەم دوورخستەوە، خانووەكەم دوور خستەوە.

(فَأْوُۥٓاْ إِلَى ٱلْكَهْفِ): واتە: پەنا بۆ ئەشکەوت بەرن، (أَوَى إلى كَذا: انْضَمّ إِلَيْهِ، إلتَجَأَ إِلَيْهِ)، واتە: چوو بۆ ئەو شوێنە، پەنای پێبرد.

(مِّرْفَقًا): [(مِرْفَق) هاتوە و (مَرْفِق)یش هاتوە] (مَوصِلُ الذِّراعِ فِي العَضُدِ) (مرفق) ئەو جومگەیە کە باسك و قۆڵ پێکەوە دەبەستێ، کە بە هەمووشی دەگوترێ دەست (يد)، (وكذلك ما أرتفقت به وانتفعت)، هەروەها (المِرْفَق والمَرْفِق) هەردووکیان بۆ هەر شتێکی دیکە بەکاردێن، کە مرۆڤ لێی بەهرەمەند بێ و، بەکاری بێنێ و، پێداویستیی پێ جێبەجێ بکات.

(تَّزَاوَرُ): واتە: خۆی لادەدا، دەگوترێ: (ازوَرّ عَنِ الشَّيْءِ ازوِراراً: عَدَلَ عَنْهُ وانْحَرَفَ)، واتە: خۆی لە شتەکە لادا، بە لادان، یانی: خۆی لێ لادا و ڕاستەوخۆ ڕووی تێ نەکرد، کە خوێندراویشەتەوە: (إزوارّ) ئنجا (ازوارّ: ازوِراراً، و تَزاوَرَ: تَزاوُراً)، هەموویان بە مانای لادان و خۆلێ لادان، دێن.

(تَّقْرِضُهُمْ): (القَرْضُ: ضَرْبٌ مِنَ القَطْعِ وسُمِّيَ قَطْعُ المَكَانِ وَتَجَاوُزُهُ: قَرْضاً، تَّقْرِضُهُمْ : تجوزُهُم)، واتە: (قرض) جۆرێکە لە بڕین، بڕینی شوێنێك، واتە: پێدا ڕەتبوونی و هەڵبواردنی، وشەی (قرض)ی بۆ بەکارهێندراوە، کەواتە: (تَّقْرِضُهُمْ) واتە: (تَجوزُهُم)، لێیان ڕەت دەبێ و لێیان تێدەپەڕێ.

(فَجْوَةٍ): (فَجْوَة: سَاحَةٌ وَاسِعَة، والفَجْوَة: الفُرْجَة والمتَّسِعُ بَيْنَ الشَّيْئَيْنِ)، (فجوة) واتە: گۆڕەپانێکی فراوان و، بە کەلێنی فراوانی نێوان دوو شتانیش دەگوترێ، (وَهُمْ فِي فَجْوَةٍ) واتە: ئەوان لە بۆشایی و بە تاڵایی ئەشکەوتەکە دابوون، نەك لە بەردەم دەرگاکەی بن، یان زۆریش لە پشتەوەو لە بنەبانێ بن، کە تیشکی خۆر بە هیچ جۆرێك نەیانگاتێ و، یا بە هیچ جۆرێك نەیانگرێتەوە، بەکورتیی: وانەبووە لە دەرێ بن و، واش نەبووە زۆر لە پشتەوە بن، بەڵکو لە نێو بۆشایی ئەشکەوتەکەدا بوون.

(أَيْقَاظًا): واتە: بێداران، (رَجُلٌ يَقِظٌ و يَقُظٌ: مُتَيَقِّظٌ، حَذِرٌ) واتە: کەسێك کە وریا بێ و هۆشیار بێ، لە خۆی وریا بێ، (أَيْقَظَهُ مِنْ نَوْمِهِ: نَبَّهَهُ، فَهُوَ يَقْظَانُ وَالإِسْمُ: اليَقَظَة)، واتە: بێداری کردوە لە خەو، هەڵیستاند، (فَهُوَ يَقْظَان)، ناوی بێداریش: (يَقَظَة)یە.

(رُقُودٌ): (الرُّقَادُ: النَّوْمُ، رُقُود وَرُقَّد أي: نيام)، یانی: (رُقُود) کۆی (راقِد)ە، یانی: (نَائِم)، هەروەها وەك چۆن بە (رقود) هاتوە، بە: (رُقَّد)یش هاتوە، هەردووکیان کۆی (راقِد)ن، واتە: (نائم)، (الرَّقْدَةُ: النَّوْمَةُ) واتە: خەوتن.

(بِٱلْوَصِيدِ ): (الوَصِيدُ: الفِنَاءُ، وفِنَاءُ الدَّارِ: مَا امتَدَّ مِنْ جَوَانِبِهَا، والجَمْعُ أَفْنِيَة)، (وصيد) ئەوەیە كە درێژ دەبێتەوە لە دەوروبەری خانووەكە، بەروحەوشە، حەسار، بەڵام (وصید) مەبەست پێی ڕێسمانە، واتە: ئەگەر گریمان دەرگای لێ بووایە، بنی دەرگاكە پێی دەگوترێ: ڕێسمان و، سەرەكەی پێی دەگوترێ: شیپانە، سەگەكەیان لەو بەردەرگایە لەسەر چەنگان كەوتبوو، وەك حاڵەتی بێداریی و تێشككرتن.

(وَلْيَتَلَطَّفْ ): واتە: با پەنهانكاریی بكات، (اللُّطفُ: إذَا وصِفَ بِهِ الجِسْمُ، فَضِدُّ الجَثْلِ، وَهُوَ الثَّقِيلُ، وَيُعَبَّرُ بِهِ عَنِ الحَرَكَةِ الخَفِيفَةِ، وتَعَاطِي الأُمُورِ الدَّقِيقَة)، واتە: (لَطِيف) ئەگەر جیسمێكی پێ وەصف بكرێ، ئەوە دژی (جَثْل)ە، ئەویش، واتە: قورس و قەبە و گەورە، كەواتە: (لَطِيف) واتە: سووك و كەم قەبارە، بەڵام وشەی (لطیف) بە كاریش دەهێنرێ بۆ جووڵەیەكی سووك و، ئەنجامدانی كار بە شێوەیەكی پەنهان و بە لێزانیی و بە شێنەیی.

(وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا ): واتە: با وانەكات كەس پێتان بزانێ، (أَشْعَرَهُ) واتە: وایكرد هەستی پێ بكات، (مُشْعِر) هەستپێكەر كەسێكە وا بكات یەكێكی دیكە هەست بە شتێ بكات، (أَشْعَرَهُ فَشَعَرَ: أَدْرَاهُ فدری)، واتە: وایكرد كە بزانێ و ئەویش زانی.

(يَظْهَرُواْ عَلَيْكُمْ ): واتە: لێتان ئاگادار بن، دەگوترێ: (ظَهَرَ الشَّيء: تَبَيَّنَ، ظَهَرَ عَلَى فُلَان: غَلَبَهُ)، (ظَهَرَ الشَّيءُ) واتە: شتەكە دەركەوت، بەڵام: (ظَهَرَ عَلَى فُلَان) واتە: بەسەری دا زاڵ بوو، (أَظْهَرَه اللّه على عدوّه)، واتە: خوا بەسەر دوژمنەكەیدا زاڵی كرد، (يَظْهَرُواْ عَلَيْكُمْ ) واتە: پێتان بزانن، ئێوە بۆ ئەوان ئاشكرا بن.

(أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ ): واتە: وامانكرد بیاندۆزنەوە و پێیان بزانن، پەیان پێ ببەن، (عَثَرَ عَلَيْهِ: إطَّلَعَ، أَعْثَرَهُ عَلَيْهِ غَيْرَه: أَطْلَعَه عليه)، (عَثَرَ عَلَيْهِ) واتە: پێی زانی، بەڵام (أَعْثَرَهُ عَلَيْهِ غَيْرَه) واتە: غەیری خۆی وایكرد كە ئەو پێی بزانێ، ئەویش لە ئەصڵدا لەوەوە هاتووە: (عثر) واتە: هەڵەنكوت، كاتێ ئینسان لاقی لە شتێك گیر دەبێ، هەڵدەنكوێ، پێی دەگوترێ: (عَثَرَ). (عثرَتْ رِجلُهُ) واتە: پێی هەڵەنكوت، كاتێك مرۆڤ شتێك دەدۆزێتەوە، وەك تێی هەڵبنكوێ، وایە.

(رَجْمًا بِٱلْغَيْبِ ): (رجم) بریتیە لە هاویشتن، (بالغیب) واتە: بە پەنهانیی، واتە: هاویشتن بەرە و پەنهان و نادیار، لە كوردەوارییدا دەڵێن: تفەنگ بە تاریكییەوەنان، (الرَّجْمُ بالغَيْبِ: أَنْ يَتَكَلَّمَ الرَّجُلُ بالظَّنِّ)، ئەوەیە كە پیاوێك بە گومان و دوو دڵیی قسە بكات و، لە بارەی شتێكەوە كە زانیاریی لە بارەیەوە نیە، بدوێ.

(فَلَا تُمَارِ فِيهِمْ): واتە: وتوێژیان لەگەڵ مەکە لە بارەیانەوە، (ماراهُ مِرَاءً: جَادَلَهُ)، واتە: موناقشەی لەگەڵدا کرد، مشت و مڕی لەگەڵدا کرد.

## مانای گشتی ئایەتەکان

ئێمە ئەو هەژدە (١٨) ئایەتە بە خێرایی مانا دەکەین، چونکە دواییش بەسەرهاتی هاوەڵانی ئەشکەوت، لە سێ بڕگەدا دەخەینە ڕوو و، دواتریش لە مەسەلە گرنگەکاندا وردەکاریی بەسەرهاتەکەیان بە پێی ئایەتەکان دەخەینە ڕوو، پاشانیش پازدە (١٥) دەرس و پەند، کە لە بەسەرهاتی هاوەڵانی ئەشکەوت وەردەگیرێن، باس دەکەین، بۆیە هەڵوەستەی درێژ لەبەردەم مانای گشتی، ئەم هەژدە (١٨) ئایەتەدا ناکەین.

وەك پێشتر لە پێناسەی ئەو سوورەتەدا گوتمان: ئەمیش وەك هەموو سوورەتە مەککەییەکان تێیدا، باسی: بوونناسیی، خواناسیی و تەنیا خواپەرستیی، هەروەها بەرپەرچدانەوەی کوفر و هاوبەش بۆ خوادانان، ئنجا ڕۆژی دوایی و بەهەشت و دۆزەخ و سزا و پاداشتی خوا ﷻ بۆ مرۆڤەکان بەپێی کردەوەکانیان، هەروەها دواتر: بەسەرهاتی پێشووان، ئنجا: هەندێ ڕەوشت و ئاکاری بەرز دەکات، هەروەها: وەحیی و پێغەمبەرایەتیی، بە تایبەت لەم سوورەتەدا، کە هەم لە سەرەتاو لەگەڵ شوێنی دیکەیدا، قورئان و پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺ، هەموو ئەوانە، باس کراون.

خوای پەنهانزان دەفەرموێ: ﴿ أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُوا۟ مِنْ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا ﴾، یان ئایا تۆ پێت وایە کە هاوەڵانی ئەشکەوت و ڕەقیم، لە نیشانە هەرە سەرسوڕهێنەرەکانی ئێمەن؟ واتە: لە ڕیزی پێشەوەی نیشانە سەرسوڕهێنەرەکانی ئێمەن؟ یانی: وانیە! بەڵکو ئەگەر مرۆڤ بە چاوی عەقڵ و دڵ تەماشا بکات، نیشانەی سەرسوڕهێنەرەکانی خوا ﷻ، لە خۆی و دەوروبەر و بوونەوەردا، دەبینێ، وانیە ئەم بەسەرهاتی هاوەڵانی ئەشکەوت، ئەم سێ سەد و نۆ (٣٠٩) ساڵ خەو لێخستنەی خوای پەروەردگار بۆیان، لە هەموو نیشانەکان، سەرسوڕهێنەرتر بن، بەڵکو خوای تاك و پاك نیشانەی سەرسوڕهێنەری دیکەی زۆر زۆرن، بەڵام بۆ کەسێ کە بە چاوی عەقڵ و دڵ تێ بفکرێ.

﴿إِذْ أَوَى الْفِتْيَةُ إِلَى الْكَهْفِ فَقَالُوا رَبَّنَا آتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا﴾، کاتێ کە کۆمەڵە گەنجەکە پەنایان بردە بەر ئەشکەوت و گوتیان: پەروەردگارمان لە لایەن خۆتەوە بەزەییەکی تایبەتمان پێ ببەخشە و، لە کاروباری خۆماندا سەر ڕاستمان بکە، سەر ڕاستیی و بە ئامانج گەیشتنمان بۆ بڕەخسێنە، واتە: ئەو هۆکارانەمان بۆ بڕەخسێنە کە پێی بە ئاکام و مراد بگەین و، مەداری خۆمانیان پێ ساز بکەین.

﴿فَضَرَبْنَا عَلَىٰ آذَانِهِمْ فِي الْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا﴾، ئێمەش ساڵانێکی زۆر، یاخود ژمارەیەك لە ساڵان قورساییمان خستە سەر گوێیان، یاخود وامانکرد خەومان بەسەر گوێیاندا هێنا، ﴿ثُمَّ بَعَثْنَاهُمْ﴾، دوایی بێدارمان کردنەوە، دوای ئەو ساڵە زۆرانە، کە سێ سەد و نۆ (٣٠٩) ساڵی کۆچیی «مانگیی» یان سێ سەد (٣٠٠) ساڵی خۆریی، بوون.

﴿لِنَعْلَمَ أَيُّ الْحِزْبَيْنِ أَحْصَىٰ لِمَا لَبِثُوا أَمَدًا﴾، تاکو بزانین کام لە دوو کۆمەڵەکان، ماوەی مانەوەی ئەوانیان ژماردوە، یاخود ﴿أَحْصَىٰ﴾، لێرەدا بۆ (تفضيل)ە، واتە: کامیان باشتر و چاکتر سەرژمێری ماوەی مانەوەیانی لەخەودا کردوە؟

ئەم چوار ئایەتە، وەك دەسپێك و کورتەی بەسەرهاتەکەن، دواتر دێتە سەر گێڕانەوەی درێژەکەی و دەفەرموێ:

﴿نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِالْحَقِّ﴾، ئێمە بە شێوەیەکی ڕاست، هەواڵی ئەوانت بەسەردا دەخوێنینەوە، ﴿إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَاهُمْ هُدًى﴾، ئەوانە کۆمەڵە گەنجێك بوون، بڕوایان بە پەروەردگاریان هێنا بوو، ئێمەش سەر ڕاستییمان بۆ زیاد کردن، ﴿وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾، هەروەها دڵیانمان بەهێز کرد، دڵیانمان گرێدا، کە مەبەست پێی بەهێز کردنە، ﴿إِذْ قَامُوا فَقَالُوا رَبُّنَا رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾، کاتێ کە هەڵسان، یان بە کردەوە هەڵساون، یاخود: مەبەست پێی هەڵسانی مەعنەوییە، بە مانای: بڕیاریاندا، گوتیان: پەروەردگارمان پەروەردگاری ئاسمان و زەوییە، ﴿لَن نَّدْعُوَ مِن دُونِهِ إِلَٰهًا﴾، جگە لەو، کەس بە پەرستراو بانگ ناکەین، ﴿لَّقَدْ قُلْنَا إِذًا شَطَطًا﴾، ئەگەر وا بکەین کەواتە: ئێمە قسەیەکی دوورمان گوتوە، واتە: دوور لە هەق و ڕاستییمان گوتوە، ئەگەر جگە لە خوا بە ناوونیشانی پەرستراو، بانگ بکەین و لێی بپاڕێینەوە.

﴿هَٰؤُلَاءِ قَوْمُنَا اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ آلِهَةً﴾، ئا ئەوانە خەڵکەکەمانن، کۆمەڵگایەکەمانن، کە جگە لە خوایان، کردوە بە پەرستراو. ﴿لَّوْلَا يَأْتُونَ عَلَيْهِم بِسُلْطَانٍ بَيِّنٍ﴾،

ئەگەر ڕاست دەکەن، دە با بەڵگەیەکی ئاشکرایان لەسەر بێنن، کە ئەوشتانە شایستەی پەرستانن، ﴿ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴾، ئایا کێ ستەمکارترە، لە کەسێ کە درۆ بە خواوە هەڵدەبەستێ؟ کە مەبەست پێی هاوەڵ بۆ خوا دانانە، چونکە: هاوەڵ بۆ خوا دانان، درۆ هەڵبەستنە بە خواوە.

بێگومان دوای ئەوەی بەو شێوەیە ئیعلانیان کردوە، لەگەڵ خەڵکەکەیاندا تێکگیراون، بەڵام خوای بەرز، ئەوە هەمووی دەپێچێتەوە، چونکە ئەوە جێی مەبەست نیە کە ئەو وردەکارییانەی هەموو تێدا بن: چ مشت ومڕێکیان بووە؟ دوایی چۆن ناچار بوون بڕۆن؟ گرنگ ئەوەیە لە ئەنجامی ئەو بڕیارەیاندا، ناچار بوون، کە کۆمەڵگاکەیان بەجێبێڵن! چونکە: دەسەڵاتیان نەبووە کۆمەڵگایەکەیان بگۆڕن و، ئامادەش نەبوون ببنە بەشێك لە کۆمەڵگا لادەرەکەی خۆیان، بۆیە بە ناچاریی سەری خۆیان هەڵگرتوە و ڕۆیشتوون، ئنجا لە نێو خۆیاندا گوتیان: ﴿ وَإِذِ ٱعْتَزَلْتُمُوهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ ﴾، ئێستا کە کەنارتان لێیان گرتوە، واتە: دەتانەوێ خۆیان لێ دوور بگرن، ﴿ وَمَا يَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ ﴾، هەروەها شتانێکیش کە لە جیاتی خوا دەیانپەرستن، دەتانەوێ و بڕیارتان داوە: کەنار لەوانیش بگرن و، وازیان لێ بێنن ودەستبەرداریان بن.

﴿ فَأْوُۥٓا۟ إِلَى ٱلْكَهْفِ ﴾، کەواتە: پەنا بەرنە بەر ئەشکەوت، ئنجا ئایا ئەشکەوتێکی دیاریی کراو بووە؟ چونکە (ألْ)ی سەر (الكهف) بۆ ناساندن (تعريف)ە، ئنجا ئایا مەبەست پێی (عهد)ە، واتە: پەنا بەرنە بەر ئەشکەوتەکە، کە بۆ خۆیان زانیویانە ئەشکەوتەکە، کامەیە؟ یاخود (ألْ) بۆ (جنس)ە، یانی: پەنا بەرنە بەر هەر ئەشکەوتێك لە ئەشکەوتەکان، کە لێتان هەڵدەکەوێ؟ ﴿ يَنشُرْ لَكُمْ رَبُّكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ ﴾، زۆر بە دڵنیایی و جەزمەوە دەڵێن: پەروەردگارتان لە بەزەیی خۆی بۆتان بڵاو دەکاتەوە، واتە: بەزەیی خۆیتان بەسەردا پەخش دەکات، ﴿ وَيُهَيِّئْ لَكُم مِّنْ أَمْرِكُم مِّرْفَقًا ﴾، هەروەها لە کاروباری خۆشتاندا، پێداویستییەکانتان بۆ ساز دەکات، ئەو شتانەی کە پێویستتان پێیان هەیە، ئەو شتانەی پێیان ئاتاجن، دڵنیابن خوا پێویستییەکانتان بۆ ئامادە دەکات.

ئنجا یەکسەر خوا ﷻ ئەوە هەمووی دەپێچێتەوە کە: چۆن چوونەتە ئەشکەوتەکە و، دوایی چییان گوت و چیان کرد و، چۆن خەوتن؟! ڕاستەوخۆ دێتە سەر باسی حاڵ و باڵی نێو ئەشکەوتەکەیان و دەفەرموێ: ﴿ وَتَرَى ٱلشَّمْسَ إِذَا طَلَعَت ﴾، تۆ ئەگەر لەوێ بووایەی، خۆرت دەبینی، کاتێ کە هەڵدەهات لە کاتی خۆرهەڵاتدا، ﴿ تَّزَٰوَرُ عَن كَهْفِهِمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ ﴾، خۆی لە ئەشکەوتەکەیان لادەدا، بە لای ڕاستدا، زانایان دەڵێن:

وا پێدەچێ ئەو ئەشکەوتە ڕوو بە باشوور (جنوب) بوو بێ، بۆیە کە خۆر هەڵاتوە لە خۆرهەڵاتەوە بە لای ڕاستی ئەشکەوتەکەدا خۆی لاداوە، بۆ ئەوەی تیشکەکەی نەکەوێتە سەریان، ﴿ وَإِذَا غَرَبَت تَّقْرِضُهُمْ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ ﴾، هەروەها کاتێ کە ئاوا بووە، خۆر بە لای چەپدا خۆی لاداوە، بۆ ئەوەی دیسان ڕاستەوخۆ تیشکەکەی شاقوولیی نەکەوێتە سەریان، ﴿ وَهُمْ فِى فَجْوَةٍ مِّنْهُ ﴾، ئەوانیش لە نێو بەتاڵایی و بۆشایی ئەشکەوتەکە دابوون.

﴿ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ﴾، ئا ئەو شێوە ئامادەسازییەی کە: خۆر نە لە کاتی هەڵاتنیدا ڕاستەوخۆ لێیان بدات و، نە لە کاتی ئاوابوونیدا ڕاستەوخۆ لێیان بدات، بۆ ئەوەی کاریگەریی خراپی لەسەریان نەبێ، ئنجا ئەوانیش بکەونە نێو بەتاڵایی و بۆشایی ئەشکەوتەکەوە، ئا ئەوە لە نیشانەکانی خوایە، ﴿ مَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ﴾، هەر کەسێ خوا ڕاستە ڕێی بکات، هەر ئەوە ڕێ ڕاستکرتوو، ﴿ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيًّا مُّرْشِدًا ﴾، هەر کەسێکیش (خوا) گومڕای بکات، تۆ هیچ سەرپەرشتیارێکی بە ئامانج گەیەنەرت بۆی چنگ ناکەوێ.

﴿ وَتَحْسَبُهُمْ أَيْقَاظًا وَهُمْ رُقُودٌ ﴾، ئەگەر بینیباتن واتدەزانی کە بێدارن، لە حاڵێکدا کە خەوتوو بوون، ﴿ وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِ ﴾، ئێمەش هەڵگێڕ و وەرگێڕمان دەکردن، بە لای ڕاست و لای چەپدا.

زانایان لەو بارەوە، زۆر قسەیان کردوە، کە ئایا دەبێ ئەو هەڵگێڕو وەرگێڕە: بەیانیان و ئێواران بوو بێ؟ یان شەوو ڕۆژان چەند جاربوو بێ؟! هەندێکیان گوتوویانە: ساڵی یەك جار بووە!! کە ئەوە هەمووی تفەنگ بە تاریکییەوە نانە! گرنگ ئەوەیە خوا دەفەرموێ: هەڵگێڕ و وەرگێڕمان پێ دەکردن، ئنجا: شەوو ڕۆژان سێ چوار جار بووە، هەفتەی جارێك بووە، مانگی جارێك بووە، گرنگ ئەوەیە خوا ﷻ هەڵگێڕو وەرگێڕی کردوون، وایکردوە کە خۆیان ئەو کەلەکە و ئەو کەلەکە بکەن.

﴿ وَكَلْبُهُم بَٰسِطٌ ذِرَاعَيْهِ بِٱلْوَصِيدِ ﴾، سەگەکەشیان دەستەکانی خۆی ڕاخست بوون لە لای دەروازەی ئەشکەوتەکە، ﴿ لَوِ ٱطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ ﴾، ئەگەر تۆ یەکسەر بەسەریاندا چووبای، ﴿ لَوَلَّيْتَ مِنْهُمْ فِرَارًا ﴾، بە ڕاکردنەوە، پشتت تێیان دەکرد، ﴿ وَلَمُلِئْتَ مِنْهُمْ رُعْبًا ﴾، بە هۆیانەوە پڕ دەبووی لە ترس و سام و بیم و هەیبەت، دیمەنێکی زۆر بە سام بووە! شەش حەوت گەنجی پێگەیشتوو، کە هەندێ لە زانایان دەڵێن: ئەوانە وەزیر و

کار بەدەستیش بوون، واتە: کامڵ بوون، حەوت پیاو لەناێو ئەشکەوتێکدا بخەون، ئنجا سەگەکەشیان بەو شێوەیە لە حاڵەتێکی ئێشکگرتن دابێ، سام و هەیبەتی زۆریان هەیە.

﴿ وَكَذَٰلِكَ بَعَثْنَٰهُمْ لِيَتَسَآءَلُوا۟ بَيْنَهُمْ ﴾، بەو شێوەیە، یانی: وەك چۆن خەواندمانن بەو شێوە سەرسوڕهێنەرە، هەر بەو شێوەیەش بێدارمان کردنەوە. ﴿ لِيَتَسَآءَلُوا۟ بَيْنَهُمْ ﴾، تاکو لە نێو خۆیاندا پرسیار بکەن و، وتووێژو دیالۆگ بکەن.

﴿ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ ﴾، بێژەرێکیان گوتی: ئایا چەند ماونەوە؟ چەند ماونەوە لە خەودا؟ ﴿ قَالُوا۟ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ﴾، گوتیان: ڕۆژێ یان بەشێك لە ڕۆژێ، ماوینەوە. ﴿ قَالُوا۟ رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ ﴾، هەر بۆ خۆیان لە نێو خۆیاندا گوتیان: پەروەردگارتان زاناترە بە ماوەی مانەوەتان لە خەودا.

﴿ فَٱبْعَثُوٓا۟ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ ﴾، یەکێکتان بەم پارە زیوە بنێرن بۆ شار، ﴿ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَآ أَزْكَىٰ طَعَامًا ﴾، با سەرنج بدات: کام لە دووکانەکان، کام لە فرۆشیارەکان، خواردنەکەی پاکترو چاکترە، ﴿ فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ ﴾، با بژیوێکتان لەو (خواردنە کە بە پاکتر و چاکتری دەزانێ) بۆ بێنێ، ﴿ وَلْيَتَلَطَّفْ ﴾، هەروەها با پەنهانکاریی بکات، بە شێنەیی ڕەفتار بکات، ﴿ وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا ﴾، باوا نەکات هیچ کەس پێتان بزانێ، پەیتان پێ بەرێ، ﴿ إِنَّهُمْ إِن يَظْهَرُوا۟ عَلَيْكُمْ ﴾، چونکە ئەگەر ئەوانە پێتان بزانن و بتاندۆزنەوە، ﴿ يَرْجُمُوكُمْ أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِى مِلَّتِهِمْ ﴾، بەردبارانتان دەکەن، یاخود دەتانگێڕنەوە نێو ئاینەکەی خۆیان، نێو ڕێبازەکەی خۆیان، ﴿ وَلَن تُفْلِحُوٓا۟ إِذًا أَبَدًا ﴾، ئەگەر بگەڕێنەوە نێو ئایین و ڕێبازەکەشیان، هەرگیز سەرفراز نابن.

کەواتە: با ئەو کەسەی دەینێرن، بەشێوەیەکی وا بچێ، خواردنەکە بهێنێ و، مەداری ئێمە ساز بکات، بەڵام وانەکات: هیچ کەس هەستتان پێ بکات، ئەوان چووزانن سێ سەدونۆ (٣٠٩) ساڵ تێپەڕیوەو، سەردەمی دەقیانوس گۆڕاوەو، ڕۆژگارێکی دیکە هاتۆتە دی!

﴿ وَكَذَٰلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ ﴾، ئاوا بەو شێوەیە چۆنمان خەواندن و، چۆنمان بێدار کردنەوە، هەر بەو شێوەیەش: وامانکرد کە پێیان بزانن و، بە خەڵکەکەمان دۆزینەوە، ﴿ لِيَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ﴾، بۆ ئەوەی بزانن کە بەڵێنی خوا، بە زیندوو کردنەوەی مرۆڤەکان، ڕاستە، ﴿ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ لَا رَيْبَ فِيهَآ ﴾، هەروەها هاتنی ئەو کاتەی کە دنیای تێدا کۆتا دێ، (ئاخیر زەمان)، هەقە، هەروەها ئەو کاتەی لێپرسینەوە و سزاو پاداشتی تێدا دەکرێ، ئەویش هەقە، وشەی (الساعة) هەم بۆ ئاخیر زەمان [ئەو کاتەی کە دنیای

تیـدا کۆتـا دێ} بـەکاردێ، هـەم بـۆ هاتنـی هەڵسـانەوە (قیامـة)و زینـدوو کرانـەوە (بعـث) یـش بـەکاردێ، ئـا ئـەوە دوو دڵیـی تیـدا نیـە. ﴿ إِذْ يَتَنَـٰزَعُونَ بَيْنَهُمْ أَمْرَهُمْ ﴾، یـاد بکـەوە! کاتێ کـە لـە نێـو خۆیانـدا، لـە بارەیانـەوە مشـت ومڕیـان بـوو، ناکۆکییـان بـوو. ﴿ فَقَالُوا۟ ٱبْنُوا۟ عَلَيْهِم بُنْيَـٰنًا ﴾، گوتیـان: ژوورە خانوویەکیـان لەسـەر دروسـت بکـەن، دیـارە دوای ئـەوەی کـە گەنجـەکان دۆزرانـەوە، چوونـەوە نێـو ئەشـکەوت و دووبـارە خەوتوونـەوە، خـوای باڵادەسـتیش ئـەو جـارە مراندوونی، هەڵبەتـە دوای ئـەوەی بەسـەرهاتی خۆیـان گێڕاوەتـەوەو، خەڵکەکەیـان ئـاگادار کردۆتـەوە، ئنجـا کـە خەڵکەکـە زانییان بـە یەکجاریـی مـردوون، گوتوویانـە: خانوویەکیان لەسـەر دروسـت بکـەن، ﴿ رَّبُّهُمْ أَعْلَمُ بِهِمْ ﴾، پەروەردگاریـان پێیـان زاناتـرە.

﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُوا۟ عَلَىٰٓ أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا ﴾، ئەوانـەی کـە بەسـەر کاروبـاری خۆیانـدا زاڵ بـوو بـوون، یانی: حوکمـڕان و دەسترۆیشـتووەکان، گوتیان: پەرسـتگایەکیان لەسـەر دروسـت دەکەیـن، مزگەوتێـك لەسـەر شـوێنەکەیان دروسـت دەکەیـن، بـۆ ئـەوەی شـوێنەکەیان ون نەبـێ و، دەرس و پەنـدی لـێ وەربگیـرێ، بـۆ جیلـەکانی دوایـیـش کـە دێـن.

ئنجـا خـوا ﷻ دێتـە سـەر بـاسی ئـەوەی کە چـۆن مشـت ومڕیـان کـردوە لەسـەر ئـەوەی: ئایـا ژمارەیـان چەنـد بـووە؟ هەڵبەتـە جیلـەکانی دوایـی نەیانزانیـوە، بـەڵام ئـەو کاتـە دیـار بـووە، کـە چەنـد کـەس بـوون! ﴿ سَيَقُولُونَ ثَلَـٰثَةٌ رَّابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ ﴾، هەندێکیـان دەڵێـن: سـێ کـەس بـوون و چوارەمیـان سـەگەکەیان بـووە، ﴿ وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ ﴾، هەندێکی دیکەشـیان دەڵێـن: پێنـج بـوون و، شەشـەمیان سـەگەکە بـووە، ﴿ رَجْمًۢا بِٱلْغَيْبِ ﴾، ئـەوەش هەمـووی: تفەنـگ بـە تاریکییـەوە نانـە، قسـە کردنـە لـە نادیـار و، بەبـێ بەڵگـە قسـە کردنـە، ﴿ وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ ﴾، هەندێـکی دیکەشـیان دەڵێـن: حـەوت بـوون و هەشتەمیان سـەگەکەیان بـووە.

لێـرەدا خـوا نافەرمـوێ: تفەنـگ بـە تاریکییـەوە نـان، بۆیـە زۆر لـە زانایـان دەڵێن: ئـەو ڕایە بە هێزتـرە کـە دەڵـێ: حـەوت بـوون و، هەشـتەمیان سـەگەکەیان بـووە، ﴿ قُل رَّبِّىٓ أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِم ﴾، بڵـێ: پـەروەردگارم زاناتـرە بـە ژمارەیـان، ﴿ مَّا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا قَلِيلٌ ﴾، کەمێـك نەبـێ، {کەمێـك لـە زانایـان نەبـێ} ژمارەکەیـان نازانـن. عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباس (خـوا لـە خـۆی و بـاب ڕازی بێ)، گوتوویـەتی: مـن لـەو کەمـەم کـە دەزانـم: حـەوت بـوون و هەشـتەمیان سـەگەکەیان بووە، ﴿ فَلَا تُمَارِ فِيهِمْ إِلَّا مِرَآءً ظَـٰهِرًا ﴾، لـە بارەیانـەوە: وتووێـژ و شـەڕە قسـە و مشـت ومـڕ مەکـە، مەگـەر مشـت ومڕێـکی ڕووالەتیـی و ڕووکەشـیی، واتـە: زۆر مەچـۆ نێـو وردە کارییەکانـەوە، قـووڵ مەبـەوە، ﴿ وَلَا تَسْتَفْتِ فِيهِم مِّنْهُمْ أَحَدًا ﴾، لـە بارەیانـەوەش: پرسـیار لـە هیـچ

کەسیان مەکە، واتە: لە هیچ کەسی ڕۆژگاری خۆت، کە مەبەست پێی خاوەن کتێبەکانن، یان هاوبەش بۆ خوادانەرەکانن، یاخود خەڵکی دیکەی غەیری ئەوانیش، ﴿ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴾، هەروەها بۆ هیچ شتێك مەڵێ: من بەیانیی بکەری ئەو کارەم، مەگەر خوا بیەوێ، واتە: مەگەر بڵێی (إن شاءالله)، ئەگەرنا بە جەزمیی مەڵێ: من ئەو کارە دەکەم، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەی دا باسمان کرد، پێغەمبەر ﷺ - بە پێی ئەو گێڕدراوەیە - دوای ئەوەی کە پرسیاری لێ دەکەن، دەربارەی (هاوەڵانی ئەشکەوت و ذول قەرنەین و ڕووح)، دەفەرموێ: بەیانیی وەڵامتان دەدەمەوە، خوا ئامۆژگاریی پێغەمبەر ﷺ دەکات، کە لەمەودوا، بۆ هیچ کارێ مەڵێ: من بەیانیی ئەو کارە ئەنجام دەدەم، ﴿ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴾، ئەمە دوو مانای هەن:

أ - مەگەر خوا ویستبی، وا بڵێی و تازە تێپەڕیبێ.

ب - مەگەر بڵێی: ئەگەر خوا بیەوێ.

ئەگەر ئەوەی لەگەڵ نەڵێی: مەڵێ: بەیانیی فڵان کارە دەکەم.

﴿ وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ ﴾، هەروەها یادی پەروەردگارت بکە، هەر کاتێ لە بیرت چوو {بڵێی: ئەگەر خوا بیەوێ، یاخود هەر کاتێ غەفڵەت و بێ ئاگاییەکت بەسەردا هات لە بارەی خواوە} یادی خوا بکەوە و قەرەبووی بکەوە، ﴿ وَقُلْ عَسَىٰٓ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّى لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا ﴾، بشڵێ: نیزیکە پەروەردگارم بۆ سەر ڕاستانەتر لەمە، ڕێنماییم بکات و ڕێم پیشان بدات.

﴿ وَلَبِثُوا۟ فِى كَهْفِهِمْ ثَلَٰثَ مِا۟ئَةٍ سِنِينَ وَٱزْدَادُوا۟ تِسْعًا ﴾، لە ئەشکەوتەکەدا سێ سەد ساڵ مانەوە و نۆشیان زیاد کردن، واتە: سێ سەد و نۆ (٣٠٩) ساڵ مانەوە، بۆیەش وایفەرمووە، چونکە سێ سەد (٣٠٠) ساڵی خۆریی ماونەوە، کە دەکاتە سێ سەد و نۆ (٣٠٩) ساڵی مانگیی، چونکە هەر سەد ساڵی خۆریی، بە ساڵی مانگیی، سێ ساڵی دێنە سەرێ.

﴿ قُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُوا۟ ﴾، بڵێ: هەر خوا زاناترە، بە ماوەی مانەوەیان، ﴿ لَهُۥ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، نهێنیی ئاسمانەکان و زەوی، هەر هی ئەوە {لە گرەوی خوا دایە و تەنیا خوا دەیزانێ} ﴿ أَبْصِرْ بِهِۦ وَأَسْمِعْ ﴾، ئای! (خوا) چەند بینەر و، چەند بیسەرە! ﴿ مَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِىٍّ ﴾، (مرۆڤەکان) جگە لە خوا هیچ سەرپەرشتیار و هاوکارێکیان نیە، ﴿ وَلَا يُشْرِكُ فِى حُكْمِهِۦٓ أَحَدًا ﴾، هەروەها خوا لە بڕیار و حوکمی خۆیدا، هیچ کەس ناکاتە هاوبەش.

# بەسەرهاتی هاوەڵانی ئەشكەوت لە چەند بڕگەیەكدا

بەڕێـــزان!

بەسەرهاتی هاوەڵانی ئەشكەوت، لە سێ بڕگەدا، باس دەكەین:

١)- پوختەی بەسەرهاتی هاوەڵانی ئەشكەوت.

٢)- چەند زانیارییەكی مێژوویی.

٣)- دەرس و پەندی سەرەكیی، كە لەو بەسەرهاتە وەردەگیرێ.

## یەكەم: پوختەی بەسەرهاتی هاوەڵانی ئەشكەوت:

ئـەو بەسـەرهاتە هـی ڕۆژگاری پێـش ئیسـلامە، ئنجـا ئایـا ئـەو ڕووداو و ڕۆژگارە: پێـش پێغەمبـەر مووسـا ﷺ بـووە؟ یاخـود پێشـتریش بـووە، یـان: نەخێـر لـە دوای مووسـا ﷺ بـووە؟ یاخـود: لـە پێـش ڕۆژگاری پێغەمبـەر عیسـادا ﷺبـووە؟ یاخـود نەخێـر لـە دوای هاتنی عیسا ﷺ بـووە؟ ئـەو ڕایانـە هەموویـان، باسـكراون، بـەڵام ئـەو ڕایـەی كۆتاییـان، لـە هەموویـان بەهێزتـرە و، وا پێدەچـێ ئـەو ڕووداوە لـە كەسـانێك ڕوویـدا بـێ، كـە شـوێنكەوتەی عیسـا ﷺ بـوون و، كۆمەڵگایەكـەش، كۆمەڵـگای ڕۆمانـەكان بـوو بـێ، كـە بتپەرسـتبوون، ئـەو ڕایـە لـە هەموویـان بەهێزتـرە.

لـە ڕۆژگاری پێـش ئیسـلامدا، كۆمەڵگایـەك هەبـووە، حوكمـڕان و دەسـتەڵاتدارێكی بەسـەرەوە بەرپـرس بـووە، كـە - وەك لـە بڕگـەی دووەمـدا بـاس دەكەیـن - هەندێـك دەڵێـن: نـاوی (دۆكیـۆس) بـووە و، هەندێـك دەڵێـن: نـاوی (دەقیانـووس) بـووە، ئنجـا هەندێـك دەڵێن: سـاڵێك حوكمڕانیـی كـردوە و، هەندێـك دەڵێـن: زیاتـر و، بابایـەكی زۆر خوێنڕێـژ بـووە و، خـۆشی بـە پەرسـتراوو پـەروەردگار زانیـوە.

ئنجـا ئـەو كۆمەڵـە گەنجـەش - كـە وەك پێشـتر باسـمان كـرد - وا پێدەچـێ حـەوت كـەس بووبـن و ئـەو ڕایـە بەهێزتـرە، ئـەو كۆمەڵـە گەنجـە، كـە لـە ئایەتەكانـدا، خـوا ﷻ بـە (فتیة) نـاوی هێنـاون، وەك دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُوا۟ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى﴾، بـەڵام هەندێـك لـە زانایـان دەڵێـن: ئەمـە ئـەوە ناگەیەنـێ كـە: هـەر گەنجـی تـازە پێگەیشـتوو

بووبن، چونکە (فتیة) کۆی (فتی)یە، (فتی)ش وەك چۆن بە گەنج دەگوترێ، بە مرۆڤی جوامێریش دەگوترێ و، با کامڵیش بێ و تەمەنێکیشی هەبێ، چونکە بە پێی هەندێك لە زانیارییەکان دەڵێن: ئەوانە دەست و پێوەند و ستاف پادشا بوون و لە وەزیرەکان بوون، دواتر لە پادشا هەڵگەڕاونەوە، کە ئەو وردەکارییانە لە قورئاندا باس نەکراون.

دوای ئەوەی کە لەگەڵ پادشادا تێکدەگیرێن، دیارە دەبێ ئەو چاوەڕوانیی ئەوەی لێیان کرد بێ، کە بیپەرستن و بەندایەتیی بۆ بکەن و بە پیرۆزی بزانن و بۆی ملکەچ بن، ئەوانیش ئەوەیان ڕەفز کردوە، تێدی لەگەڵیدا تێکدەگیرێن و، تەماشاش دەکەن: دەرەقەتی کۆمەڵگایەکە نایەن و، ناشگونجێ لەو کۆمەڵگایەدا بمێننەوە! چونکە - وەك دوایی باسی دەکەین - ئەگەر مابانەوە، یان ئەوەتا بەرد بارانیان دەکردن، کە دەبێ پادشا هەڕەشەی بەرد بارانکردنی لێکردبن، یاخود دەبووایە: بگەڕێنەوە سەر ئایین و ڕێبازە چەوتەکەی ئەوان، کە بریتی بووە لە بتپەرستیی و پەرستنی جگە لە خوا ﷻ.

بێگومان ئەو گەنجانەش ئامادە نەبوون: بگەڕێنەوە سەر کوفر و بێبڕوایی، دوای ئەوەی خوا عەقڵ و دڵی ڕۆشن کردوونەوە.

لە لایەکی دیکەشەوە: ئامادە نەبوون خۆیان بدەنە بەر بەڵایەك کە لە توانایاندا نیە، وەك بەرد بارانکردن! بۆیە هیچ چاریان نەبووە، جگە لەوەی سەری خۆیان هەڵبگرن و، ئەو کۆمەڵگایە بەجێ بهێڵن و پشت لە ئاوەدانییان بکەن و، ڕوو لە چۆڵەوانییان بکەن، بۆ ئەوەی: ئایین و عەقیدەیان سەلامەت و پارێزراو بێ.

ئنجا کە دەڕۆن، ئایا ئەو سەگەیان چۆن ڕەگەڵ کەوتوە؟ هەندێك دەڵێن: لە پێشدا شەش کەس بوون، بە لای ئەو شوانەدا دەچن، کە ئەویش لێیان دەپرسێت: ئێوە کێن؟ یاخود: دەیانناسێ ئەگەر بەرپرسانی شارەکە بووبن، دوای ئەوەی کە ڕووداوەکەی بۆ باس دەکەن، ئەویش لەگەڵیان دەچێ و، سەگی ئەو شوانەکەش بە دوایان دەکەوێ و، دەبن بە حەوت کەس و، هەشتەمیان سەگەکەیانە، دوایی دەچنە ئەشکەوتێك.

ئنجا ئایا دەبێ ئەو ئەشکەوتە شوانەکە پێی زانیبێ؟ یاخود خۆیان دۆزیبیانەتەوە؟ لەوێدا ئەو ماوە درێژەی کە خوای پەنهانزان باسی کردوە، دەخەون (٣٠٠) ساڵی خۆریی و (٣٠٩) ساڵی مانگیی، واتە: ئەگەر بە جووڵەی خۆر حیسابی بکەین (٣٠٠) ساڵ بووە، چونکە لە کتێبەکانی خاوەن کتێبەکاندا، باسی (٣٠٠) ساڵ و، لە هەندێك لە ڕیوایەتەکاندا باسی: (٢٠٠) ساڵ دەکرێ، کە بە تەئکید ئەوە بەشێکە لەو لادان و دەستکاریی کردنەی

هاتۆتە نێویان، بێگومان ئەوەی کە خوا ﷻ دەیفەرموێ، هەر وایە: (٣٠٠) ساڵی خۆریی و (٣٠٩) ساڵی مانگیی ماونەتەوە.

ئنجا دوایی کە بێدار دەبنەوە، هەست بە برسیەتیی دەکەن و، لە بەینی خۆیان دا لێیان دەبێتە مشت و مڕ، هەروەك لە ئایەتەکەدا دیارە، یەکێکیان دەڵێ: بەشێك لە ڕۆژێك ماوینەوە، یاخود ڕۆژێك ماوینەوە، بەڵام سەرەنجام تەماشا دەکەن: هەمووی قسەکردنە لە نادیار، بۆیە دەڵێن: پەروەردگارتان زاناترە کە چەند ماونەتەوە؟

کەواتە: با واز لەوە بێنین کە ئامرازێکمان پێ نیە، بۆ ساغکردنەوەی، با بەدەم کاری خۆمانەوە، بچین، پارەی زیویان پێ دەبێ، دەڵێن: بەو پارەیە، یەکێکتان بچێ بۆ شار و، با تەماشا بکات: کام لە دووکانەکان خواردنەکەی چاکتر و پاکترە، بەشێکی لێ بهێنێ، بۆ ئەوەی وەك بژێوێك بە کاری بێنین، یەکێکیان دەنێرن و لەوێ لە لای یەکێك لە دووکاندارەکان، کە دەیەوێ خواردن و ئازووخە بکڕێ، پارەکە دەردێنێ، ئەو پارەیەش (٣٠٠) ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە و، ئێستا پادشایەکی دیکە هاتوە، بێگومان هەر پادشایەك هاتوە، دراو و سکەی بە ناوی خۆیەوە لێ داوە، دووکاندارەکە پێی دەڵێ: ئەم پارەیە زۆر کۆنە و، هی ئێستا نیە، دیارە تۆ خەزنەیەکت دۆزیوەتەوە؟ ئەویش دەڵێ: نەخێر ئەوە هی دوێنێیە، بە هەرحاڵ دەکەونە مشت و مڕ و دەڵێ: ئێمە دوێنێ چووین، دەڵێ: چۆن؟ دەڵێ: لە ترسی دەقیانووس هەڵاتین، ئەویش دەڵێ: دەقیانووسی چی؟ ئەوە سێ سەد ساڵ زیاترە دەقیانووس ڕۆژگاری وی نەماوە و، چەندان پادشای دیکە ڕۆیشتوون و، چەندانی دیکە هاتوون، ئێوە لە کوێوە هاتوون؟ بەهەر حاڵ خەڵکیان لێ کۆدەبێتەوە و، دواتریش وا دیارە حوکمڕانی ئەو ڕۆژگارە خوا پەرست بووە و، بتپەرست و دژی خوا بەیەکگرتن نەبووە.

کە بەو هەواڵە دەزانن، دیارە دەچێتە مەجلیسیان و دەبێ بۆی باسکردبن؟ ئنجا دەڵێن: ئەدی کوا لە کوێن؟ دەڵێ: لە ئەشکەوتین، پادشا و هەندێك لە بەرپرسان و لە خەڵکی دەچن و، لەوێ لەگەڵیان دادەنیشن، تەماشا دەکەن بابەتەکە ڕاستە، ئنجا دەبێ باس و خواسی خۆیان گێڕابێتەوە، بەڵام دوایی بە فەرمانی خوای پەروەدگار هەموویان دەچنەوە نێو ئەشکەوتەکە و گیان دەسپێرن، کە تەنیا بۆ ئەوە بووە، پێشانی ئەو خەڵکە بدرێ، کە ئەگەر خوا بتوانێ (٣٠٩) ساڵان چەند گەنجێك بخەوێنێ لە ئەشکەوتێکدا، دەشتوانێ دوای مردن ئەو خەڵکەش، زیندوو بکاتەوە.

کە دیارە دەبێ لەو ڕۆژگارەدا، مشت و مڕ لە بارەی زیندووبوونەوە و قیامەت هەبوو بێ، بە پێی ئایەتەکان وا دەردەکەوێ، ئنجا کە دەچنە نێو ئەشکەوتەکە و گیان دەسپێرن، خەڵکەکە دەبێتە مشت و مڕیان: کە ئایا هەر چاوە خانوویەك لەسەر شوێنەکەیان دروست بکەن؟ ئەو شوێنەی کە جەنازەکانیان لێیە، یان پەرستگایەك بنیات بنێن؟

کە هەندێك دەڵێن: خەڵکەکە دەرگای ئەشکەوتەکەیان گرتوە و، هەندێك دەڵێن: بە خاکیان سپاردوون و، هەندێك دەڵێن: هەر لێیان گەڕاون و گوتوویانە: با وەك خۆیان بن، بەڵام ئەوانەی حوکمڕان و دەسەڵاتدار و دەست ڕۆیشتوو بوون، گوتوویانە: نەخێر مزگەوتێك (پەرستگا) ێکیان لەسەر دروست دەکەین، واش پێدەچێ: قسەی ئەوان کە دەسەڵاتدار بوون، سەری گرتبێ ئەوە کورتەو پوختەی بەسەرهاتەکەیانە.

## دووەم: چەند زانیارییەکی مێژوویی:

### ١)- ئایا هاوەڵانی ئەشکەوت کێ بوون و ڕووداوەکەیان کەی بووە؟

لەوبارەوە کە ئایا کێ بوون؟ زانیارییەکی ڕوونمان لەبەر دەستدا نیە، بەڵام لە تەفسیرەکان و سەرچاوە مێژووییەکاندا دەڵێن: ئەوانە وەزیرەکانی پادشا بوون، یاخود بە لای کەمەوە ستاف حکوومەتەکەی بوون، ئەگەر نازناوی وەزیریشیان لەسەر نەبوو بێ، بەڵام هەندێکیان دەڵێن: تەنیا کۆمەڵە گەنجێکی خوا پەرست بوون.

بەڵام وا پێدەچێ: کەسانێکی دەسترۆیشتوو بوو بن، ئەوە زیاتر پێدەچێ، هەر بۆیەش دوایی ئەو پادشایەی کە دۆزیونیەوە، گرنگیی زۆری پێداون، هەروەها بۆ ئەوەش کە زیاتر ببنە پەند و دەرس، دەبێ ئەوانە کەسانێکی خاوەن دەستەڵات و پێگەی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی بوون، کە چی ئامادە بوون لەسەر خواو، لەسەر دینی خوا و، بۆ پاراستنی ئیمان و عەقیدەی خۆیان، هەموو شتێك بەجێ بهێڵن، ئەوە زیاتر دەرس و پەندی لێوەردەگیرێ، بۆیە ئەوە زیاتر بە عەقڵەوە دەنووسێ.

ئنجا دەربارەی کاتەکەی کەی بووە؟ وەك پێشتریش باسمان کرد: هەندێك دەڵێن: پێش مووسا ﷺ بووە و، هەندێك دەڵێن: لە سەردەمی عیسادا ﷺ بووە، هەندێکیش دەڵێن: لە دوای عیسا ﷺ بووە.

کە ئێمە ڕای سێیەممان زیاتر پێ ڕاستە و، وا پێدەچێ ئەوانە شوێنکەوتەی مەسیح ﷺ بوو بن و نەیارەکانیشیان ئەو ڕۆمییانە بووبن، کە بتپەرست بوون و هاوبەشیان بۆ خوا داناوە.

**٢)- ئەشکەوتەکەیان لە کوێ بووە؟!**

لەو بارەوە زۆر بیروڕا هەن:

**أ)- ڕای یەکەم دەڵێ: ئەو ئەشکەوتە لە شاری (ئەبسووس) بووە، لە ناوچەی (گرگوس) کە دەکەوێتە نێوان (حەڵەب) و وڵاتی (ئەرمینیا) و (ئەنتاکیا) کە لە (مەرعەش)ەوە نیزیکە لە وڵاتی (ئەرمینیا) و، لە ڕۆژگاری ئیمپڕاتۆر دەقیانووسدا بووە، کە لە دەوری ساڵی (٢٣٧)ی زایینییدا بۆ ماوەی ساڵێك حوکمی کردوە و، بابایەکی زۆر دەمارگیر بووە بۆ ئایینی ڕۆمانیی و، زۆریش ڕقی لە ئایینی نەصرانیی بووە، کاتی بێداربوونەوەشیان لە ماوەی حوکمڕانیی ئیمپڕاتۆر (پاوژوسیوش) بووە کە بە قەیسەری گچکەش ناسراوە. ئەمە خاوەنی (التحرير والتنوير) (محمد الطاهر بن عاشور) و ژمارەیەك لە تەفسیرەکان هێناویانە.**

**(الطبري)** لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ: ئەو دوو کەسە کە دوایی چوون سەیری ئەشکەوتەکەیان کردوە، هەردووکیان سەرۆکی شارەکە بوون، ناویان: (ئاریوس) و (ئەگیوس) بووە، دوایی لەگەڵ خەڵکی شارەکە و، ئەو گەنجەدا کە چووە بۆ شت کڕین، لەگەڵ خۆیاندا بردۆتەوە بۆ لای ئەشکەوتەکە و، لەگەڵ گەنجەکاندا دانیشتوون.

**ب)- ڕای دووەم: ئەوەیە کە لە خوارووی وڵاتی (تونس) ئەشکەوتێکی لێیە، ئەو ئەشکەوتە بووە.**

**ج)- ڕای سێیەم کە هی (إبن عطية)یە دەڵێ: ئەو ئەشکەوتە لە ئەندەلوس بووە،** لە لای شاری **(غرناطة)** لە نزیك گوندی **(لوشة)**، ئەو ئەشکەوتە کۆمەڵێك مردووی تێدان و ئێسقانی سەگێکیشی تێدایە، هەندێك لە لاشەی مرۆڤەکان، تەنیا ئێسك ماوە و، هەندێکیشیان تاکو ئێستاش گۆشتیان پێوە ماوە، **(إبن عطية)** کە یەکێکە لە توێژەرەوانی قورئان، دەڵێ: من لە ساڵی (٥٠٤)ی کۆچیی دا، چوومەتە ئەشکەوتەکە و جەنازەکەیان و ئێسقانی سەگەکەم بینین، کە لەوێ بوون.

**د)- ڕای چوارەم ئەوەیە کە ئەشکەوتێك هەیە لە وڵاتی (ئوردن) لە شاری (عەممان) کە من بۆ خۆم ئەوێم بینیوە، لە نیزیك گوندێکە بە ناوی (رجيب)ە، کە ئێستا مزگەوتێکی لەسەر دروست کراوەو ئێستا لە باکووری شاری (عمّان)ە، واتە لە جوغزی شارەکەدایە.**

هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەم ڕایە (ڕای چوارەم) لە هەموویان بەهێزترە و دروستترە، هەندێکیشیان دەڵێن: (ڕای یەکەم) کە دەبێ ئەو ئەشکەوتە لە تورکیا بێ.

بە هەر حاڵ ڕەنگە ڕای دیکەش هەبن لە بارەی شوێنی ئەو ئەشکەوتەوە، بەڵام خوا دیاریی نەکردوە و، پێغەمبەریش شوێنەکەی دیاریی نەکردوە، چونکە هیچ حیکمەتێك لە دیارییکردنیدا نیە.

**٣)- ئایا سەرچاوە نەصرانییەکان چی دەڵێن؟**

**(جمال الدین القاسمي)** لە کتێبەکەی خۆیدا **(محاسن التأویل)**، لە کتێبێکی نەصرانییەکانەوە بە ناوی **(الكنز الثمين في أخبار القِدّيسين)**، لە ژێر ناوونیشانی: **(فيما يخص السبعة القديسين الشهداء الذين من أفسس)**دا، هێناویەتی کە لە کتێبەکەدا دەڵێ:

**أ)- (هَؤلاءِ الشُّهَدَاء السبْعَةِ كَانُوا إخوة بالجسد، وأسماؤهم: مكسيميانوس، ومالخوس، ومرتينيانوس، وديونيسيوس، ويوحنا، وسارابيون، ثم قسطنطين)**[1]، واتە: ئەو حەوت شەهیدە کە هەر حەوتیان برا بوون (واتە: لە یەك دایك و باب بوون)، ناوەکانیشیان ئەوانەی سەرەوەن.

ب)- هەر لەو کتێبەدا دەڵێ: ئەوانە لە ساڵی (٢٥٢)ی زایینی، هەتا (٤٤٧)ی زایینی خەوتوون و، لە (٤٤٧/٨/٤)ی زایینی دا، بێدار بوونەتەوە، واتە (٢٠٠) ساڵ خەوتوون! بەڵام مادام خوا ﷻ لە دوا کتێبی خۆیدا کە یەك پیتی دەستکاریی نەکراوە، فەرموویەتی: (٣٠٩) ساڵی کۆچیی خەوتوون، کە نەیفەرمووە ساڵی کۆچیی، بەڵام بۆ گەلی عەرەب وا دەفەرموێ، کە پێشتر دەفەرموێ: ﴿ وَلَبِثُوا۟ فِى كَهْفِهِمْ ثَلَـٰثَ مِا۟ئَةٍ سِنِينَ ﴾، واتە: (٣٠٠) ساڵ بە حیسابی ڕۆمانییەکان و ئیغریقیی و یۆنانییەکان، کە بە خۆر ساڵەکانیان حیساب کردوە، ئنجا هەر ساڵێکی خۆریی یازدە ڕۆژی کەمترە لە ساڵی مانگیی **(قمري)**ی.

کەواتە: کە خوا دەفەرموێ: (٣٠٩) ساڵ، واتە: (٣٠٩) ساڵی مانگیی و (٣٠٠) ساڵی خۆریی، ئنجا بە دڵنیاییەوە هەر ئەوەی قورئان دەیفەرموێ، ڕاستە، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە لە سەرچاوەی مەسیحییەکانیشدا باسی ئەو حەوت کەسە کراوە و ناوەکانیشیان هاتوون، بەڵام لە بارەی ماوەی مانەوەیانەوە، کە دەڵێ: دووسەد (٢٠٠) ساڵ بووە، بەهەڵەدا چوون.

---

(١) محاسن التأویل ج١٥، ص ٣٤،٣٥.

ج)- ئنجا هەر لەو كتێبەدا هاتوە، دەڵێ: ئەوانە لە ئەنجامی چەوساندنەوەیان، لە لایەن یۆنانییەكانەوە، لە ڕۆژگاری پادشا (داكیوس)دا - كە هەندێكیان دەڵێن: (دەقیانووس) كە دیارە ئەو وشانە لە زمانێكەوە، بۆ زمانێكی دیكە دەگۆڕێن - لە ئەنجامی ئەوەدا ڕایان كردوە، هەر لەوێشدا دەڵێ: لە سەردەمی پادشا (ئاوذوسیوش)دا كە پێی گوتراوە: قەیسەری گچكە، لەوێدا بێدار بوونەتەوە، هەندێكیان دەڵێن: ناوی: (ئاوذوسیوش)ە و، هەندێكیشیان دەڵێن: (ئاوضوسیوش)ە، كە: ئەو پیتانە، لە زمانێكەوە بۆ زمانێكی دیكە دەگۆڕێن.

## سێیەم: دەرس و پەندی سەرەكیی ئەم بەسەرهاتە:

بێگومـان ئـەم بەسـەرهاتە دەرس و پەنـدی زۆری لێوەردەگیرێـن، كـە دوایـی تێمـە لـە پـازدە (١٥) خاڵانـدا دەیانخەینـە ڕوو، بـەڵام دەرس و پەنـدی سـەرەكیی كـە لـە بەسـەرهاتی هـاوەڵانی ئەشـكەوت، وەردەگیـرێ بریتیـە لـە تەسـلیم نەبـوون بـۆ كوفـر و سـتەم و خراپـە، ئەگـەر بـە ڕاكـردن و، بـە سـەری خـۆ هەڵگرتنیـش و، بـە جێهێشـتنی كـەس و كار و خـاك و خەڵـك و وڵات و نیشـتیمانیش، بـێ.

ئنجـا دەرس و پەنـدی هـەرە مـەزن كـە لـە بەسـەرهاتی هـاوەڵانی ئەشـكەوت، وەردەگیـرێ ئەوەیـە كـە كاتێكیـش ئـەم سـووڕەتە هاتۆتـە خـوار [ئـەم سـووڕەتە وەك گوتمـان: بـە پێـی هەنـدێ سـەرژمێر، ڕیزبەندیـی دابەزینـی (٦٨)ەمیـن، یاخـود (٧٠)یەمیـن سـووڕەتی مەككەیـە، كـە دابەزیـوە] لـەو كاتـەش دا مسـوڵمانان كۆچیـان كـردوە بـۆ حەبەشـە، دووجـاران كۆچیـان كـردوە و، دواتریـش زەمینەسـازیی بـووە بـۆ كۆچكـردن بـۆ (یەثرب) كـە دوایـی بـووە بـە (مدینة الرسـول) شـاری پێغەمبـەر ﷺ.

كەواتـە: ئـەی مسـوڵمانینە! ئێـوەش ئەگـەر كـە تەنگتـان پـێ هەڵچـنرا، لـە لایـەن كافـر و زاڵـە زاڵـەكانی مەككـەوە، تەسـلیمیان مەبـن و، مەبنـە بەشـێك لەواقیعـی: نەفامیـی و سـتەمكاریی و بێبڕوایـی و، بتپەرسـتیی و خراپەكاریـی، كۆمەڵگایەكـەی خۆتـان، بەڵكـو ئامادەبـن دەسـتبەرداریی هەمـوو شـتێك بـن و، وەك هـاوەڵانی ئەشـكەوت بكـەن.

هەروەهـا ئـەی مسـوڵمانان! لـە هـەر سـەردەمێكی دیكـەدا هـەن، هـەر كاتێـك تەنگتـان پـێ هەڵچـنرا و، ناچاركـران كـە: یـان دەسـتبەرداری ئایینەكەتـان بـن، یاخـود دەسـتبەرداری خـاك و خەڵـك و نیشـتیمان و مـاڵ و سـامان و بەرژەوەندیەكانتـان بـن، هەمـوو ئەوانـە وەلا بنێـن، لـە پێنـاوی ڕازیكـردنی خـوا و پاراسـتن و سـەلامەت بـوونی دیـن و عەقیدەتـان دا.

گەورەترین و گرنگترین پەند و ئامۆژگاریی کە لەم بەسەرهاتی هاوەڵانی ئەشکەوتە، وەربگیرێ، ئەوەیە.

زانایانیش لەو بارەوە زۆریان قسە کردوە، کە ئایا مسوڵمانان بۆیان هەیە: پەنا بەرنە بەر بەجێهێشتنی وڵاتی خۆیان، لە کاتێکدا لە وڵاتی خۆیاندا، کە کۆمەڵگای مسوڵمانیشن، بەڵام دووچاری ئاشووب و ناڕەحەتیی ببن، ئایا وڵاتی خۆیان بەجێ بهێڵن و کۆچ و کۆچبار بکەن؟ زانایان لەوبارەوە ڕاجیاییان هەیە، بەڵام زۆرینەیان دەڵێن: بەڵی کاتێك کە مرۆڤ ناچار کرا، دەستبەرداری ئایینەکەی بێ، یان دەیزانی کە تووشی لادان و گوناهـ دەبێ، پێویستە ئەو شوێنە بەجێ بهێڵێ.

با چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ بێنینەوە، لەو بارەوە:

١)- {إِذَا كَانَتِ الفِتْنَةُ فَأَخْفِ مَكَانَكَ وَكُفَّ لِسَانَكَ}. (أخرجه أبو داود: ٤٣٤٣، وقال الألباني: حسن صحيح).

واتە: هەر کاتێك ئاژاوە بوو، شوێنەکەی خۆت پەنهان بکە و، زمانی خۆت بگرە (واتە: بچۆ شوێنێك کە پێت نەزانن، بۆ ئەوەی تووشی ئازار نەبی، یاخود ناچار نەکرێی کە مەیلت بە لای ستەم و خراپەکارییدا بچێ).

٢)- {عن عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ! مَا النَّجَاةُ؟ قَالَ: أَمْسِكْ عَلَيْكَ لِسَانَكَ، وَلْيَسَعْكَ بَيْتُكَ، وَابْكِ عَلَى خَطِيئَتِكَ}. (أخرجه الترمذي: ٢٤٠٦، وَصَحَّحَهُ الألباني).

واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ بە پێغەمبەری خوا ﷺ، دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ، دەرباز بوون چۆنە؟ (واتە: لە کاتی ئاشووب و ئاژاوەدا، کە ناچار دەبین تووشی گوناهـ ببین) پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی: زمانی خۆت بگرە و، لە ماڵی خۆتدابە و، بۆ گوناهەکانی خۆت بگری {واتە: واز لە خەڵکی بێنە}.

٣)- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {يُوشِكُ أَنْ يَكُونَ خَيْرَ مَالِ الْمُسْلِمِ: غَنَمٌ يَتْبَعُ بِهَا شَعَفَ الجِبَالِ ، وَمَوَاقِعَ القَطْرِ، يَفِرُّ بِدِينِهِ مِنَ الفِتَنِ} (أخرجه وأحمد: ١١٢٧٢، وعبد بن حميد: ٩٩٣، والبخاري: ١٩، وأبو داود: ٤٢٦٧).

واتە: نیزیکە کە ڕۆژگارێك بێ، باشترین ماڵ و سامانی یەکێکتان مەڕێك بێ، بە دوای بکەوێ، بە چیا و چۆڵاندا و بە لووتکەی چیایاندا و، بەو شوێنانەدا کە بارانیان لێدەبارێ و، لەوەڕیان هەیە {بە دوای مەڕەکانی خۆیەوە بێ و، لە چنگ ئاژاوەکان ڕابکات و، ئایینی خۆی دەرباز بکات}.

هەڵبەتە ئەوە هەمووی لە کاتێکدا، کە مرۆڤ نەتوانێ واقیعەکە بگۆڕێ و بەرهەڵستیی بکات، بەڵام ئەگەر بتوانێ بەرهەڵستیی بکات و، واقیعەکە بگۆڕێ، بێگومان وا باشترە کە بمێنێتەوە لە نێو کۆمەڵگادا و بەرهەڵستیی خراپە بکات، مادام لە خۆی دڵنیا بێ کە تەسلیم نابێ و، دڵنیا بێ لەوەی کە دەتوانێ کاریگەریی چاکە لەسەر دەوروبەری خۆی بەجێ بهێڵێ، ئەوە ئەسڵە، بەڵام ڕاکردن و سەری خۆ کزکردن و گۆشەگیر بوون، ئەوە حاڵەتی دەگمەن و ڕیزپەڕە، بەڵگەشمان لەسەر ئەوە:

١ - هەڵوێستی پێغەمبەرە ﷺ، لە مەککەدا کە سێزدە (١٣) ساڵی ڕەبەق دەمێنێتەوە، بەڵێ هاوەڵانی کۆچ دەکەن، بەڵام ئەو کۆچ ناکات و، دوایی کە کۆچ دەکات بۆ ئەوەیە کە پێگەیەك و شوێنێك بدۆزێتەوە و لەوێدا جاڕی دەوڵەتی ئیسلامیی بدات و قەوارەیەکی سیاسیی ڕابگەیەنێ.

٢ - وێڕای هەڵوێستی کردەیی پێغەمبەر ﷺ، ئەم فەرموودەیەش هەیە لەو بارەوە، کە دەفەرموێ: **{إِنَّ الْمُؤْمِنَ الَّذِي يُخَالِطُ النَّاسَ وَيَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ، أَعْظَمُ أَجْرًا مِنَ الْمُؤْمِنِ الَّذِي لاَ يُخَالِطُ النَّاسَ، وَلاَ يَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ}، (أخرجه أحمد: ٥٠٢٢، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح رجاله ثقات، رجال الشيخين).**

واتە: ئەو بڕوادارەی کە لەگەڵ خەڵکدا تێکەڵ دەبێ و، لەسەر نارەحەت کردن و ئازار و خەمەکانیان خۆڕاگر دەبێ، باشترە لەو بڕوادارەی کە لەگەڵیان تێکەڵ نابێ و، مامەڵەیان لەگەڵ ناکات و، خۆڕاگریش نابێ لەسەر ئازار و نارەحەتییەکانیان.

هەڵبەتە لەو بارەوە فەرموودەی دیکەش هەن و، کۆمەڵێك ئایەتیش هەن کە دەکرێ بە بەڵگە بهێنرێنەوە لەو بوارەدا، بەڵام بەو فەرموودەیە ئیکتیفا دەکەین.

ئەمەش پوختەیەك بوو دەربارەی بەسەرهاتی هاوەڵانی ئەشکەوت.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ و بە هەر کەسێك کە قورئان دەخوێنێ، دەفەرموێ: یان ئایا پێت وایە: هاوەڵانی ئەشکەوت و ڕەقیم، لە ڕیزی پێشەوەی نیشانە سەرسوڕهێنەرەکانمان بوون! کاتێك کە گەنجەکان پەنایان بۆ ئەشکەوتەکە برد و، گوتیان: پەروەردگارمان! بەزەییەکی تایبەتمان پێ ببەخشە و، لە کارماندا سەرڕاستییمان بۆ بڕەخسێنە؟ ئێمەش ژمارەیەك لە ساڵان لە ئەشکەوتیدا خەواندمانن، پاشان بێدارمان کردنەوە، تاکو بزانین کام لە دوو کۆمەڵەکە چاکتر سەرژمێریی ماوەی مانەوەیانیان لە خەودا کردوە؟**

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَابَ الْكَهْفِ وَالرَّقِيمِ كَانُوا مِنْ آيَاتِنَا عَجَبًا ﴿٩﴾ إِذْ أَوَى الْفِتْيَةُ إِلَى الْكَهْفِ فَقَالُوا رَبَّنَا آتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ﴿١٠﴾ فَضَرَبْنَا عَلَىٰ آذَانِهِمْ فِي الْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا ﴿١١﴾ ثُمَّ بَعَثْنَاهُمْ لِنَعْلَمَ أَيُّ الْحِزْبَيْنِ أَحْصَىٰ لِمَا لَبِثُوا أَمَدًا ﴿١٢﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

**١)- ﴿ أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَابَ الْكَهْفِ وَالرَّقِيمِ ﴾، («أم» للإضراب الإنتقالي من غرض إلى غرض)، وشەی (أم) بۆ گواستنەوەیە لە مەبەستێکەوە بۆ مەبەستێکی دیکە، زانایانی شارەزای زمان دەڵێن: ( أَمْ حَسِبْتَ) دەبێتە: (بل أحسبت)، یانی: ( أَمْ) دەبێتە (بل) و دەشبێتە (أ) (همزة الإستفهام) وێکڕا، کەواتە: ﴿ أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَابَ الْكَهْفِ وَالرَّقِيمِ كَانُوا مِنْ آيَاتِنَا عَجَبًا ﴾ واتە: یان ئایا پێت وابوو، کە هاوەڵانی ئەشکەوت و ڕەقیم، لە نیشانە سەرسوڕهێنەرەکانمان بوون؟ ئنجا دەگونجێ (أ) لێرەدا بۆ پرسیارکردنی نکوولیلێکەرانە (الإستفهام الإنکاري) بێ، دەشگونجێ بۆ چەسپاندن (تقریر) بێ و، لە هەردووك حاڵانیش دا پێویستە شتێك مەزەنە (تقدیر) بکرێ کە بەسیاق و سەلیقە دەفامرێتەوە، بۆ وێنە: {ئایا نیشانە سەرسوڕهێنەرەکانمانت نەزانیون!}، یان ئایا پێت وایە هاوەڵانی ئەشکەوت و ڕەقیم {لە پێشەوەی} نیشانە سەرسوڕهێنەرەکانمان بوون؟!**

(أَصۡحَٰبَ ٱلۡكَهۡفِ)، واتە: هاوەڵانی ئەشكەوت، (**الرقيم: فعيل بمعنى مفعول، من الرَّقْم، وهو الكتابة**)، وشەی (**رقيم**) لێرەدا (**فعيل**)ی بە مانای (**مفعول**)ە، یانی: نووسراو، چونکە (**رَقْم**) واتە: نووسین.

**زانایان لەو بارەوە قسەی زۆریان کردوە، کە ئایا وشەی (رقيم) چی دەگەیەنێ؟**

**١ - هەندێکیان دەڵێن: (كان كتاباً مع أصحاب الكهف في كهفهم: أسماؤهم، دينهم، قصتهم..)، واتە: نووسراوێك بووە لەگەڵیان لە لەوحێکدا لە ئەشكەوتەكەدا دانراوە: ناوەكانیان، دینەكەیان، بەسەرهاتیان، ئەوانەی هەموو تێدا بوون.**

**٢ - ڕایەكی دیكە دەڵێ: وشەی (رقيم) ناوی ئەشكەوتەكە بووە.**

**٣ - هەندێكی دیكە دەڵێن: ناوی ئەو چیایە بووە كە ئەشكەوتەكەیانی لێ بووە.**

**٤ - هەندێكی دیكە دەڵێن: وشەی (رقيم) ناوی سەگەكەیان بووە.**

**ئەو ڕایانە هەموویان هەن.**

**بەڵام ئەو ڕایەی كە دەڵێ: (رقيم) وا پێدەچێ نووسراوێك بوو بێ، لە تەختێك دا، ناو ونیشان و تایبەتمەندییەكانی ئەو حەوت (٧) گەنجەی تێدا تۆمار كرابن، لە هەموویان لە ڕاستییەوە نیزیكترە.**

**٢)- ﴿كَانُواْ مِنۡ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا﴾، لە سەرسوڕهێنەرترینی نیشانەكانی ئێمە بوون؟! یانی: (أحسبت أن أصحاب الكهف والرقيم، كانوا أعجب آياتنا؟)، ئەگەر پێت وابێ، ڕاست نیە و ئەو پێ وابوونە لە جێگای خۆیدا نیە، چونكە هەموو نیشانەكانی ئێمە سەرسوڕهێنەرن و، بەسەرهاتی ئەوان تاكە بەڵگەو نیشانەی سەرسوڕهێنەری خوای پەروەردگار نیە و، لە ڕیزبەندیی پێشەوەی نیشانە سەرسوڕهێنەرەكانی پەروەردگاریشت دا نیە.**

**٣)- ﴿إِذۡ أَوَى ٱلۡفِتۡيَةُ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ﴾، یاد بكەوە! كاتێك كە گەنجەكان پەنایان برد بۆ ئەشكەوتەكە، دەشگونجێ: (إِذْ) ، (ظرف) بێ پاڵدرابێتە لای ڕستەی دوای خۆی، واتە: كاتێك كە گەنجەكان پەنایان بردە لای ئەشكەوتەكە، لەو كاتەدا:**

**٤)- ﴿فَقَالُواْ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةً﴾، گوتیان: ئەی پەروەردگارمان! لەلایەن خۆتەوە بەزەییەكی تایبەتمان پێ بدە.**

پسپۆڕانی زمان گوتوویانە: وشەی (الفتية: جمع قِلّة لـ(فتى) وهو الشاب المكتمل)، (فتية) کۆی (فتی)یە کە بریتیە لە گەنجێکی تەواو، ئنجا وەك پێشتریش باسمان کرد، بەڵێ (فتية) مانای کۆمەڵە گەنجێك دەگەیەنێ، بەڵام دەشگونجێ: مەبەست پێی کۆمەڵە جوامێرێك بێ، با کامڵ و بەتەمەنیش بن، بەڵام لە جوامێریی و گورج و گۆڵییدا، وەك گەنجان ڕەفتار بکەن، وەك چۆن گەنج بەتین و تاقەتە و، گورج و گۆڵ و ئازایە، واتە: مەرج نیە ئەوانە تەمەنیان کەم بوو بێ.

هەردووك ڕایەکان هەن، چونکە ئەگەر بە پێی ئەو ڕایە بێ کە: ئەوانە لە ستافی حوكمڕانیی دەقیانووس بوون و کەسانێکی کاربەدەست بوون، دیارە دەبێ کامڵ بووبن و تەمەنێکیان بووبێ.

ئەوانە یەکەمین کاریان کە چوونە نێو ئەشکەوتەکەوە، ئەوەبوو پاڕانەوەو گوتیان: پەروەردگارمان! لە لایەن خۆتەوە بەزەییەکی تایبەتمان پێ ببەخشە.

ئەوە لە ڕووی مەعنەوییەوە و لە ڕووی ماددییشەوە:

٥)- ﴿وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا﴾، هەروەها لە کاروباری خۆماندا، بە ئامانجمان بگەیەنە، یاخود هۆکارەکانی بە ئامانج گەیشتنمان بۆ برەخسێنە.

(الرَّشَد والرُّشْد: الخير وإصابة الحق والنفع والصلاح)، وشەی (رَشَد) و (رُشْد) واتە: چاکە و پێکانی هەق و، شتی سوود بەخش، یانی: لە کاروباری خۆماندا، ئەو هۆکارانەمان بۆ برەخسێنە، کە بە ئامانجمان دەگەیەنن، ئەوان هەم دوعای ڕەخسانی پێداویستیی مەعنەوییان کردوە، کە خوا ﷻ بە بەزەیی خۆی دایانپۆشێ، هەم دوعای دابینکردنی پێداویستییە ماددییەکانیشیان کردوە.

کە دەفەرمووێ: ﴿إِذْ أَوَى ٱلْفِتْيَةُ إِلَى ٱلْكَهْفِ فَقَالُوا۟﴾، لێرەدا پیتی (ف) بۆ بەدواداهاتن (تعقيب)ە، (دلَّت الفاء في جملة (فَقَالُوا۟) أنّهم لما أووا إلى الكهف بادروا إلى الدعاء)، ئەم (ف)یە کە لەسەر ڕستەی: (فقالوا رَبَّنا) یە، ئەو دەگەیەنێ هەر کە چوونەتە نێو ئەشکەوتەکە، یەکسەر لە پەروەردگاریان پاڕاونەوە.

ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە مرۆڤ دەبێ: لە تەنگانەو سەغڵەتییدا، یەکسەر پەنا بەرێتە بەر خوا ﷻ و هاواری تێ ببەستێ، بێگومان خواش بێ مرادی ناکات.

ئنجا ئەوان دوو شتیان لە خوا ﷻ داوا کردوون:

أ- ﴿ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً ﴾ لە لایەن خۆتەوە بەزەییەكی تایبەتی خۆتمان پێ ببەخشە.

ب- ﴿ وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ﴾: لە كاروبارماندا هۆكارەكانی بە ئامانج گەیشتنمان بۆ بڕەخسێنە، ئنجا خوای پەروەردگاریش: هەم لە ڕووی مەعنەوییەوە، بەزەیی پێیاندا هاتۆتەوە: ئەوەتا ناویان هاتوەتە نێو قورئانەوە و، بۆ هەموو بەشەر بوونەتە جێگای پەند و دەرس، جگە لە خەڵكی سەردەمی خۆیان و دوای خۆیان.

هەم لە ڕووی ماددییەوەش، سێ سەدو نۆ (٣٠٩) ساڵ، بێ ئەوەی فلسێك سەرف بكەن و، بێ ئەوەی بۆ خۆیان هیچ ئەرك بكێشن، خوا ﷻ خەوی لێخستوون و، هۆكارەكانی ژیان و بەردەوام بوون لە ژیانی نا ئاسایی دا، لەم ئەشكەوتە ڕەق و تەقەدا، بۆ ڕەخساندوون، كەواتە: هەردووك داوایەكەی كە لە خوای بەخشەریان كرد بوون، خوای میهرەبان زۆر بەزیادەوە: بۆی جێبەجێ كردوون.

٦)- ﴿ فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ فِى ٱلْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا ﴾، ئێمەش پەردەمان دا بەسەر گوێیەكانیان دادا، لە ئەشكەوتەكەدا، ژمارەیەك لە ساڵان.

پسپۆڕانی زمان گوتوویانە: (حُذِفَ مفعول ضربنا، لظهورها، أي: ضربنا على آذانهم غشاوة، أو حائلاً عن السمع)، واتە: بەركاری وشەی (ضربنا) فڕتێنراوە، چونكە ئاشكرایە، یانی: پەردەیەكمان بەسەر گوێیەكانیان دادا، یاخود شتێك كە ڕێگر بێ لەوەی گوێیەكانیان ببیستن، یانی: گوێیەكانیانمان داخستن لەوە كە ببیستن، لە نێو ئەشكەوتەكەدا.

كە دەفەرموێ: ﴿ سِنِينَ عَدَدًا ﴾، واتە: ژمارەیەك لە ساڵان، (عدداً من السنين) بەڵام حیكمەتی چییە كە لێرەدا خوا ﷻ وشەی (سِنِينَ)ی پێش خستوە؟!

أ - هەندێك لە زانایان گوتوویانە: حیكمەتی ئەوە: بەكەم (قليل) پێشاندانە، یانی: ساڵانێكی كەم، چونكە سێ سەد و نۆ (٣٠٩) ساڵ، بە لای خوای زانا وتواناوە ساڵانێكی زۆر كەمن!

ب - هەندێكی دیكەش دەڵێن: ﴿ سِنِينَ عَدَدًا ﴾، واتە: ژمارەیەكی زۆر، بە نسبەت ئێوەی مرۆڤەوە!

كە بێگومان هەردوو واتایەكەش ڕاستن.

أ- بە نسبەت خوای بەرز و مەزنەوە، ئەوە ماوەیەكی یەكجار كەمە، وەك لە سوورەتی (الحج)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾ ﴾، هەروەها لە

سوورەتی (المعارج)دا دەفەرموێ: ﴿ تَعْرُجُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴿٤﴾ ﴾، بەڵێ سێ سەد و نۆ (٣٠٩) ساڵ بە نسبەت خوای بێ وێنەوە: چاو تروکانێکە.

ب - بەڵام بە نسبەت ئێمەوە، سێ سەد و نۆ (٣٠٩) ساڵ بۆ خەوتن، هەر زۆر زۆرە! کەواتە: ئەو وشەیە لە یەك کاتدا هەردوو واتاکە دەگەیەنێ.

٧)- ﴿ ثُمَّ بَعَثْنَـٰهُمْ ﴾، دوایی بێدارمان کردنەوە، (أي أيقظناهم) بە خەبەرمان هێنان، لە خەو هەڵمانستاندن.

٨)- ﴿ لِنَعْلَمَ أَيُّ ٱلْحِزْبَيْنِ أَحْصَىٰ لِمَا لَبِثُوٓا۟ أَمَدًا ﴾، تاکو بزانین: کام لە دوو کۆمەڵەکان، ئەو ماوەیەی مانەوەیانی ژماردوە؟ دەگونجێ: (أَحْصَىٰ) کرداری ڕابردوو بێ، یانی: (أحصى أمَدَ لَبْثِهم)، یان: (أحصى المدة التي لَبِثوها) کامیان ژماردوویەتی و سەرژمێری کردوە؟

دەشگونجێ: (أَحْصَىٰ) ڕێژگەی هەڵبژاردن (صيغة التفضيل) بێ، (أَيُّهما أَضْبَطُ لما لَبِثوا أمداً) واتە: کامیان باشتر کۆنترۆڵی سەرژمێریی ئەو کاتەی کردوە، کە تێیدا لە خەودا ماونەتەوە؟

(الحزب: الجماعة التي توافقوا على شيئ واحد)، (حزب) کۆمەڵە خەڵکێکن لەسەر شتێك پێك دێن.

وەك گوتیشمان: وشەی (أَحْصَىٰ) دەگونجێ کرداری ڕابردوو بێ و، دەشگونجێ (إسم التَّفضيل) بێ، هەردوو واتاکانی هەن، بەڵام ئەوەی دووەمیان پێ دەچێ ڕاستتر بێ، یانی: کامیان باشتر ماوەکەی ژماردوە.

ئنجا ئایا کامیان (أيُّهما) مەبەست پێیان کێن؟ بە تەئکید مەبەست پێی ئەو دوو کۆمەڵە خەڵکەن، کە دوای بێدرابوونەوەیان کەوتوونە مشت و مڕەوە: هەندێکیان گوتوویانە: ئەوەندە ماوینەوە و، هەندێکی دیکەشیان گوتوویانە: ئەوەندە ماوینەوە، ئەو کاتەش وەك ئێستا نەبووە، کە مێژوو و کاتەکان زۆر بە وردیی بنووسرێن، هەر بۆیەش لە کتێبی نەصرانییەکاندا: ژمارەی: دووسەد (٢٠٠) ساڵ هاتوە و، هەندێکیان کەمتریشیان داناوە، و هەندێکی دیکەشیان دووسەدو پەنجا (٢٥٠) ساڵیان باس کردوە، کە من هەموویانم نەهێنا، بەڵام بێگومان تاکە ڕای ڕاست، ئەوەیە کە خوا ﷻ فەرموویەتی: کە سێ سەد ساڵ ماونەوە، ئەگەر بە ساڵی خۆریی حیسابی بکەین و، نۆ (٩) ساڵی دیکەشی چۆتە سەر، ئەگەر بە ساڵی مانگیی (قمري) حیسابی بکەین.

**مەسەلەی دووەم:**

**ئێمە ڕاست و دروست هەواڵەکەیانت بۆ باس دەکەین: ئەوانە چەند گەنجێك بوون، بڕوایان بە پەروەردگاریان هێنا و، ئێمەش سەرڕاستیمان بۆ زیادە کردن و، دڵیانمان بەهێز کرد، کاتێك هەڵسان گوتیان: پەروەردگارمان پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە، جگە لەو هیچ کەس و شتێکی دیکە بە پەرستراو بانگ ناکەین، ئەگەرنا قسەیەکی لە هەق دوورمان کردوە، ئا لەو خەڵکەشمان کە پەرستراوانی دیکەی جگە لەویان پەیدا کردوون، «ئەگەر ڕاستن» دەبووایە بەڵگەیەکی ئاشکرایان لەسەر بێنن، کێ لەو کەسەی درۆ بە خواوە هەڵدەبەستێ، ستەمکارترە؟:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِٱلْحَقِّ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُوا۟ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى ﴿١٣﴾ وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا۟ فَقَالُوا۟ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَن نَّدْعُوَا۟ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهًا لَّقَدْ قُلْنَآ إِذًا شَطَطًا ﴿١٤﴾ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمُنَا ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً لَّوْلَا يَأْتُونَ عَلَيْهِم بِسُلْطَٰنٍۭ بَيِّنٍ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴿١٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم سێ ئایەتە، لە دوازدە بڕگەدا:

**١)- ﴿ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِٱلْحَقِّ ﴾، دوای ئەوەی خوای تاك و پاك لە چوار (٤) ئایەتی پێشوودا، ئاماژە ئاسا: پوختە و گوشراوی هێڵە گشتییەکانی بەسەرهاتەکەی خستە ڕوو، ئنجا دێتە سەر وردەکارییەکانی و ئەوەی کە بە پێویستیی دەزانێ، کە جێی پەند و عیبرەتە، باسی دەکات.**

**دەفەرموێ: ئێمە بە شێوەیەکی ڕاست، هەواڵی ئەوانت بەسەردا دەخوێنینەوە.**

**بەسەر کێ دا؟ بێگومان بەسەر پێغەمبەردا ﷺ چونکە ئەم قورئانە هەمووی، پێشێ پێغەمبەری دوانەوە، لە دوای ئەویشەوە هەموو ئوممەتەکەی.**

**(القَصُّ: تتبُّع الأثر، والحق: الصِّدق، وهو من أنواع الحق)، (قص) واتە: بە دوای شوێنەوار کەوتن، (حق)یش لێرەدا بە مانای ڕاستیی دێ، کە ئەویش جۆرێکە لە جۆرەکانی هەق، بۆیەش بەسەرهات پێی دەگوترێ: (قِصة) چونکە کاتێك بەسەرهاتێك دەگێڕرێتەوە گێڕەرەوە (قاص) بە دوای شوێنەواری ڕووداوەکان و کارەکتەرەکانیان دا دەچێ.**

٢)- ﴿إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُواْ بِرَبِّهِمْ﴾، ئەوانە کۆمەڵە گەنجێك بوون، بڕوایان بە پەروەردگاریان هێنا بوو.

بە پێی ئەو ڕایەیان بێ، کە دەڵێ: ئەوانە گەنج بوون، ئەوە مانایەکەی ڕوونە، بەپێی ڕایەکەی دیکەش کە دەڵێ: مەبەست لە (فتوّة) جوامێریی و مەردایەتییە، ئەمە لەگەڵ کەوتنە تەمەن و کامڵبوون دا، دژ ناوەستێ، هەروەها بەپێی ئەو ڕایەش کە دەڵێ: ئەوانە بەرپرسانی دەوڵەت و لە دەوری پادشا بوون، ئەوەیش تێکناگیرێ لەگەڵ ئەوەدا کە لە تەمەنی گەنجیەتیی و لاویەتی دا بووبن و، تەمەنی گەنجیەتیی، تەمەنی گۆڕانکارییە، هەم بە نسبەت تاکەوە، هەم بە نسبەت کۆمەڵگاوە.

٣)- ﴿وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى﴾، هەروەها ئێمە بەرچاو ڕوونیی و سەر ڕاستییمان بۆ زیاد کردن.

لەبەر ئەوەی ئیمان پلە پلەیە و، هیدایەتیش قۆناغ قۆناغە: ڕێنمایی (هداية)ی گشتیی هەیە، کە خوا ﷻ بۆ هەموو لایەکی دەڕەخسێنێ و، ڕێنمایی (هداية)ی تایبەتییش هەیە، کە من ناوم لێناوە سەر ڕاستکردن یاخود ڕاستەڕێ کردن، کە ئەوەیان خوای پەروەردگار بە کەسانێکی دەبەخشێ، کە هیدایەتە گشتییەکەی قبووڵ دەکەن، ئنجا خوا ﷻ هیدایەتی تایبەتییشیان بۆ دەڕەخسێنێ.

٤)- ﴿وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾، واتە: هەروەها دڵیانمان گرێدا و بەهێزکرد، (الربط على القلوب مستعار لتثبيت الإيمان وعدم التردُّد فيه، وعُدِّي بـ (على) للمبالغة في الشدّ، لأن حرف الإستعلاء تفيدُ التمكُّن من الفعل)، وشەی (ربطنا) پێویستیی بە (على) ناکات بۆ خواستنی (مفعول به)، (ربطنا قلوبهم) واتە: دڵیانمان بەهێز کرد، بەڵام کە بە پیتی (على) بەرکار (مفعول به)ی خواستوە، ئەمە بۆ زێدەڕۆیی کردنە لە گرێدان دا، چونکە بە زیادکردنی پیتی (على) یانی: دڵیانمان زۆر مەحکەم کرد، کە لێرەدا دڵ، چوێنراوە بە دەفرێکەوە، یاخود مەشکەیەکەوە کە ئاو، یان ماددەیەکی شلەمەنیی تێدایە، کە ناتەوێ بڕژێ، زارەکەی دەبەستی، یانی: دڵیانمان وەك چۆن دەفرێك شتێکی تێدەکرێ و زارەکەی دەبەسترێ، بۆ ئەوەی لێی نەڕژێ، ئا بەو شێوەیە دڵیانمان بەهێز کرد، تاکو ئەو ئیمان تەقوایەی لە دڵیاندایە، بمێنێتەوە و زیاد ببێ و کەم نەبێ.

٥)- ﴿إِذْ قَامُواْ﴾، واتە: یادبکەوە! کاتێك کە هەڵسان، (إذ: ظَرْفٌ للربط)، واتە: ئەو دڵ پەیوەستکردن و دڵ بەهێزکردنەیان لە کاتێکدا بوو، کە هەڵسان، ئەم هەڵسانەش دەگونجێ مەبەست پێی هەڵسانی ڕواڵەتیی و کردەیی بێ و، دەشگونجێ خوازرابێتەوە بۆ ئیقدام کردن و ڕاپەڕینی مەعنەویی، واتە: بڕیاریاندا و عەزمیان جەزم کرد.

٦)- ﴿فَقَالُوا رَبُّنَا رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾، گوتیان: پەروەردگامان پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە. واتە: نە دەقیانووس و نە غەیری دەقیانووسیش، پەروەردگار و سەروەرو خاوەن و، پەرستراوی ئێمە نیە.

٧)- ﴿لَن نَّدْعُوَا مِن دُونِهِ إِلَٰهًا﴾، واتە: ئێمە جگە لەو (خوای پەروەردگاری گەردوون) پەرستراوێکی دیکە بانگ ناکەین.

٨)- ﴿لَّقَدْ قُلْنَا إِذًا شَطَطًا﴾، واتە: ئەگەر ئێمە جگە لە پەروەدگاری ئاسمانەکان و زەویی، شتێکی دیکە بانگ بکەین، بە ناوونیشانی پەرستراو، ئەوە ئێمە زۆر لە هەق دوور کەوتووینەتەوە.

(شطط) بریتیە لە زێدەڕۆیی و سەرپێچیی هەق و، لادان لە ڕاستیی، کە لە (شَطّ)ەوە وەرگیراوە، کە ئەویش بریتیە لە دوورکەوتنەوە لە نشینگە و نیشتمان.

٩)- ﴿هَٰؤُلَاءِ قَوْمُنَا اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ آلِهَةً﴾، ئا ئەوانە خەڵکەکەی ئێمەن.

ئەمە لێرەدا مەبەست پێی سەرسوڕماندن و ناقۆڵا ڕانواندنی کارەکەیانە: (تعجیب من حالهم وتفظیع لِصَنیعهم)، ئا ئەوانە خەڵکەکەمانن، چییان کردوە؟!

١٠)- ﴿اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ آلِهَةً﴾، واتە: جگە لەو (خوا) پەرستراوانی دیکەیان پەیدا کردوون، (الإتخاذ: الأخذ باهتمامٍ، أوالإختیار) (إتخاذ) بریتیە لە گرتنی شتێك بە بایەخ پێدانەوە، یاخود هەڵبژاردنی، واتە: پەرستراوی دیکەیان هەڵبژاردوون و، داناون بۆ خۆیان، جگە لە خوا.

١١)- ﴿لَّوْلَا يَأْتُونَ عَلَيْهِم بِسُلْطَانٍ بَيِّنٍ﴾، واتە: دەبووایە بەڵگەیەکی ئاشکرای ڕاست و دروستیان لەسەر بێنن.

یانی: ئەگەر ڕاست دەکەن: ئەوانە پەرستراون، دەبێ پەرستراو بەڵگەی لەسەر بێ.

(لولا حرف تحضیض)، (لولا) پیتێکە بۆ هاندان، (البیِّن: الواضح) واتە: ڕوون و ئاشکرا، بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا کە جێگەی مشت ومڕ نەبێ، چونکە بابەتی ئیمان و عەقیدە، وەك بابەتەکانی دیکە نیە، کە گومانی زاڵ (الظنُّ الرّاجح) تێیدا بە کەڵك بێ، بەڵکو دەبێ لەسەر زانیاریی و دڵنیایی بنیات بنرێ.

١٢)- ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا﴾، ئنجا ئایا کێ ستەمکارترە لە کەسێ کە درۆ بە خواوە هەڵدەبەستێ؟! ئەمە پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە، واتە: هیچ کەسێك لەو کەسە ستەمکارتر نیە کە درۆ بە خواوە هەڵدەبەستێ، درۆ بە خوا هەڵبەستنیش یانی: هاوبەش بۆ خوا

بڕیاردان، (وسُمِّي الشرك افتراءً، لأنه مخالِفٌ للواقع الحق)، واتە: شیرك بۆیە بە هەڵبەستن ناونراوە، چونکە پێچەوانەی واقیع و هەقە.

(القرطبي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ: (قال بن عطية: تعلَّقت الصوفيَّةُ في القيام والقول، بقوله: ﴿إِذْ قَامُواْ فَقَالُواْ﴾ قُلتُ: وهذا تَعلُّق غير صحيح، هؤلاء قاموا فذكروا الله على هدايته، وشكروهُ لِما أولاهم من نِعَمِه، ثم هاموا على وجوههم، منقطعين إلى ربهم، خائفين من قومهم، وهذه سنة الله في الرسل والأنبياء والفضلاء الأولياء، أين هذا من ضرب الأرض بالأقدام والرَّقص بالأكمام؟!) [١].

واتە: (إبن عطية) دەڵێ: {هەندێك لە}[٢] صۆفییەکان ئەوەیان بە بەڵگە هێناوەتەوە، بۆ هەڵسان لە کاتی زیکردا و، قسەکردن، کە دەفەرموێ: ﴿إِذْ قَامُواْ فَقَالُواْ﴾، واتە: کاتێك هاوەڵانی ئەشکەوت هەڵسان و گوتیان، (قرطبي) دەڵێ: ئەوە بەڵگە هێنانەوەیەکی نادروستە، چونکە هاوەڵانی ئەشکەوت، هەڵساون و یادی خوایان کردوە، کە ڕێنمایی کردوون و، سوپاسی خوایان کردوە، کە لە نیعمەتەکانی خۆی پێیداون، دوایی سەری خۆیان هەڵگرتوەو ڕۆیشتوون و، خۆیان بۆ پەروەردگاریان یەکلا کردۆتەوەو، لە ترسی خەڵکەکەیان، کە ئەوەیش عادەتی پێغەمبەران و دۆستانی خوا و چاکان بووە، ئنجا ئەوە لە کوێ و، پێ بە زەویدا کوتان و شایی کردن و هەڵپەڕین بە ئەنگوچکان لە کوێ؟! کاتی خۆی قۆڵی شۆڕیان هەبووە و زیکریان پێکردوە.

هەڵبەتە قسەکەی بەگشتی جوانە، بەڵام من لەگەڵ ئەوەدا نیم: لە بواری زیکردا زۆر سەختگیریی بکرێ و، هەر کەسێك یادی خوا بکات، هەر باشە، بەڵام بە ئەتکید یادی خوا کردنیش، دەبێ بە ڕێ و شوێنی شەرعیی بێ، بەڵام ئەوەش ڕاست نیە، کە هەندێ لە ئەهلی تەصەووف شتێك بکەن، لەسەر هەموویان حیساب بکرێ! دەبێ پۆلێن بکرێن و، ئەگەر هەندێك لە ئەهلی تەصەووفیش چەند هەڵەیەکیان هەن، نابێ شتەکانی دیکەشیان بە هەڵەدا بنرێن، بەڵکو با هەڵەکانیان وەك هەڵە ببینرێن و، چاکەکانیشیان بە چاکە تەماشا بکرێن، ئەوە ئینصافە و، دەبێ بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ هەر کەسێکدا بکرێ.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج١٠، ص٣٠٢.

(٢) ئەو بەگشتی گوتوویەتی، بەڵام ئەوە ڕاست نیە، بۆیە من وشەی: (هەندێك لە)م بۆ زیادکرد.

**مەسەلەی سێیەم:**

**هاوەڵانی ئەشکەوت لە نێو خۆیاندا ڕاوێژیان کرد و گوتیان: ئێستا کە کەنارتان لە خەڵکەکەتان گرتووەو، دووریتان لەو پەرستراوانەیان گرتوە، کە لە جیاتی خوا دەیانپەرستن، پەنا بۆ ئەشکەوت بەرن، بەدڵنیایی پەروەردگارتان لە بەزەیی خۆیتان بۆ پەخش دەکات و، هۆکار و پێداویستییەکانی کاروبارتان بۆ دەڕەخسێنێ:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِذِ ٱعۡتَزَلۡتُمُوهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ فَأۡوُۥٓاْ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ يَنشُرۡ لَكُمۡ رَبُّكُم مِّن رَّحۡمَتِهِۦ وَيُهَيِّئۡ لَكُم مِّنۡ أَمۡرِكُم مِّرۡفَقٗا ﴿١٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِذِ ٱعۡتَزَلۡتُمُوهُمۡ ﴾، واتە: ئێستاش کە ئێوە کەنارتان لێیان گرتوە و، وازتان لێیان هێناوە. بە تەئکید واتە: کەنارتان گرتوە لە خەڵك و کۆمەڵگایەکەی خۆتان، (الإِعْتِزَال: التَّبَاعُدُ والإِنْفِرَادُ عَنِ مُخَالَطَةُ الشَّيءِ)، واتە: (إعتزال) بریتیە: لە خۆ دوورگرتن و خۆ گۆشەگیر کردن لە تێکەڵیی لە شتێك.

٢)- ﴿ وَمَا يَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ ﴾، واتە: هەروەها کەنارتان گرتوەو دووریتان کردوە، لەو شتانەی کە: وێڕای خوا، دەیانپەرستن، یان: لە جیاتی خوا دەیانپەرستن، یان: لە خوار خواوە دەیانپەرستن، کە مەبەست پێی هەموو پەرستراوەکانیان بووە.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ ﴾، واتە: (وَاعْتَزَلْتُمْ مَا يَعْبُدُونَ إلاَّ اللَّه)، ئەم هەڵاواردنە (إلاَّ اللَّه)، (الإِسْتِثْنَاءُ مُنْقَطِعٌ، لِأَنَّ اللَّهَ لَمْ يَكُنْ يَعْبُدهُ القَوْمُ)، ئەمە جۆری هەڵاواردنی پچڕاوی، پێ دەڵێن، چونکە خوا ﷻ لە ڕیزی پەرستراوەکانی ئەواندا نەبووە، ئنجا هەر کاتێك هەڵاوێردراو (مُستثنى) جیاواز بوو لە لێ هەڵاوێردراو (مُستثنى منه)، پێی دەگوترێ: (الإستثناء المنقطع) هەڵاواردنی پچڕاو، بەڵام ئەگەر هەڵاوێردراو (مُستثنى)و لێ هەڵاوێردراو (مُستثنى منه) یەك جینس بوون، ئەوا پێی دەگوترێ: (الإستثناء المتصل) هەڵاواردنی پەیوەست.

٣)- ﴿ فَأۡوُۥٓاْ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ ﴾، پەنا بەرنە بەر ئەشکەوت.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَأۡوُۥٓاْ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ ﴾، (أي إلتجئوا) پەنابەرن، وشەی (ٱلۡكَهۡفِ) کە (ال)ی ناساندن (تعريف)ی لەسەرە، دەگونجێ مەبەستی پێی: (ال)ی (عَهد) بێ، واتە:

ئەشكەوتەكە، ئەو ئەشكەوتەی كە لە نێو خۆیان دا زانیویانە، كامە ئەشكەوتەیە و، لە چ شوێنێكە؟

دەشگونجێ مەبەست پێی (ال)ی (جنس) بێ، واتە: هەر ئەشكەوتێك لە ئەشكەوتان كە لێتان هەڵدەكەوێ، پەنای پێ بەرن و، خۆتانی تێدا مەڵاس بدەن.

٤)- ﴿ يَنشُرۡ لَكُمۡ رَبُّكُم مِّن رَّحۡمَتِهِۦ ﴾، ئەگەر واتان كرد، مسۆگەر پەروەردگارتان لە بەزەیی خۆی بۆتان بڵاو دەكاتەوە، (نشر الرحمة: تَوَفُّر تعلُّقها بالمرحومين)، بڵاوكردنەوەی بەزەیی، مەبەست پێی زۆر بوون و پەیوەست بوونی بەزەیی خوایە، بەوانە كە خوا بەزەییان لەگەڵدا دەنوێنێ، واتە: خوا ﷻ بەزەیی خۆی بۆ ئێوە زۆر دەكات، چونكە خوا ﷻ بە ئەندازەی پێویستی بەندەكانی: لەگەڵیاندا دەبێ و، هاوكاریان دەبێ و، كارسازیان دەبێ.

٥)- ﴿ وَيُهَيِّئۡ لَكُم مِّنۡ أَمۡرِكُم مِّرۡفَقٗا ﴾، واتە: هەروەها خوا لە كاروباری خۆتاندا، پێداویستییتان بۆ دەڕەخسێنێ، (مِرْفَق) خوێنراویشەتەوە: (مَرْفِق)، یانی: (ما يُرْتَفَقُ ويُنْتَفَعُ به)، هەر شتێك كە وەك پێداویستیی بەكاربهێنرێ و بەهرەی لێ وەربگیرێ.

ئەگەر لە یادمان بێ: لە سەرەتای دەستپێكی ئەم بەسەرهاتەوە، هاوەڵانی ئەشكەوت گوتیان: ﴿ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةٗ وَهَيِّئۡ لَنَا مِنۡ أَمۡرِنَا رَشَدٗا ۝١٠ ﴾، واتە: پەروەردگارمان! لە لایەن خۆتەوە بەزەییەكی تایبەتمان پێ بدە و، لە كاروباریشماندا، سەر ڕاستییمان بۆ بڕەخسێنە، كە مەبەست پێی هەردووك لایەنی ماددیی و مەعنەوییە.

لێرەش دیسان زۆر ئومێدەوارن بە بەزەیی و بەخششی خوای پەروەردگاریان و دەڵێن: ﴿ يَنشُرۡ لَكُمۡ رَبُّكُم مِّن رَّحۡمَتِهِۦ ﴾، واتە:

أ - پەروەردگارتان لە بەزەیی خۆی بۆتان بڵاو دەكاتەوە، ئەوە لە ڕووی مەعنەوییەوە.

ب - ﴿ وَيُهَيِّئۡ لَكُم مِّنۡ أَمۡرِكُم مِّرۡفَقٗا ﴾، لە كار وباریشتاندا پێداویستییەكانتان بۆ ساز دەكات، كە هەمان ئەو بە ئاكام گەیشتن و، سەر ڕاستییەیە كە لە ئایەتەكەی پێشوودا ئاماژەی پێدا، ئەمەش لە ڕووی ماددییەوە، یانی: لێرەش دیسان ئاماژە دەكرێتەوە، بە هەردووك لایەنی ماددیی و مەعنەویی.

**مەسەلەی چوارەم:**

**دیمەنەکەیان وابوو: خۆرت دەبینی لە کاتی هەڵهاتنیدا، بەرەو لای ڕاستی ئەشکەوتەکەیان خۆی لادەداو، لە کاتی ئاوابوونیشیدا بە لای چەپدا دەیبواردن و، ئەوانیش لە بۆشایی نێوەڕاستیدا بوون، ئەوەش لە نیشانەکانی خوا بوو، هەر کەس خوا ڕاستە ڕێی بکات، هەر ئەو ڕێی ڕاستگرتوویە و، هەر کەسیش گومڕا بکات، هیچ سەرپەرشتیارێکی بە ئامانج گەیەنەرت بۆی چنگ ناکەوێ، ئنجا ئەگەر دیتباتن هەرچەندە خەوتووبوون، بەڵام بە بێداریان تێدەگەیشتی و، بە لای ڕاست و بە لای چەپیشدا هەڵگێڕ و وەرگێڕمان دەکردن، سەگەکەشیان لە لای ڕێسمان، هەردوو دەستی ڕاخستبوون، ئەگەر بەسەریاندا چوو بای، بە ڕاکردن پشتت تێدەکردن و، بەهۆیانەوە ترس و سام دایدەگرتی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَتَرَى ٱلشَّمْسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهْفِهِمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقْرِضُهُمْ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ وَهُمْ فِى فَجْوَةٍ مِّنْهُ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ مَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيًّا مُّرْشِدًا ﴿١٧﴾ وَتَحْسَبُهُمْ أَيْقَاظًا وَهُمْ رُقُودٌ وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِ وَكَلْبُهُم بَٰسِطٌ ذِرَاعَيْهِ بِٱلْوَصِيدِ لَوِ ٱطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ لَوَلَّيْتَ مِنْهُمْ فِرَارًا وَلَمُلِئْتَ مِنْهُمْ رُعْبًا ﴿١٨﴾ ﴾.

**پێش ئەوەی دەست بکەین بە شیکردنەوەی بڕگەکانی ئەم دوو ئایەتە، دەڵێین: خوا ﷻ لێرەدا بۆ ئەوەی ئێمە بەرچاومان ڕوون بێ: چۆن پاڕانەوەکەی ئەوانی قبووڵ کردوە، کە گوتیان: [لە لایەن خۆتەوە بەزەییەکی تایبەتمان پێ ببەخشە و پێداویستیی کاروبارمان بۆ بڕەخسێنە] خواش ﷻ ئەو دوعایەی زۆر باش بۆ گیرا کردوون، ئنجا گیرابوونی ئەو دوعایەیان، سەرەتا لە شێوەی خەوتنیان لە نێو ئەشکەوتەکەدا وێنا دەکات، کە:**

**١ - خۆر شاقووڵیی و ڕاستەوخۆ لێی نەداون، بەجۆرێك کە زیانیان پێ بکەیەنێ.**

**٢ - لە زاری ئەشکەوتەکەدا نەخەوتوون، کە یەکسەر ببیترێن، بەڵکو لە نێو بۆشایی و بەتاڵاییەکەیدا بوون.**

**٣ - هەروەهاتاکو سەرماو باران و باسریشك لە زستاندا و، گەرمای هاوین، زیانیان پێ نەگەیەنێ.**

٤ - سەگەکەیان لە لای ڕێسمان و شوێنی دەرگای ئەشکەوتەکە لەسەر دەستەکانی پاڵ کەوتووە و خەوتوە، خوا ئەوەمان بۆ وێنا دەکات، تاکو وێنە و دیمەنی ئەوانمان لەبەر چاو بێ، بۆیەش بە: دەبینی ﴿ وَتَرَى ﴾، دەیهێنێ.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَتَرَى ٱلشَّمْسَ إِذَا طَلَعَت ﴾، دیمەنەکەیان وابوو، ئەگەر تۆ لەوێ بای: خۆرت دەبینی، کاتێك کە هەڵدەهات، لە کاتی خۆرهەڵاتندا:

٢)- ﴿ تَّزَٰوَرُ عَن كَهْفِهِمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ ﴾، خۆر بەرەو لای ڕاستی ئەشکەوتەکەدا، خۆی لادەدا، پێشتریش گوتمان: وا پێدەچێ ئەو ئەشکەوتە، ڕوو لە باشوور (جنوب) بووبێ، ڕۆژ کە هەڵهاتوە، یەکسەر بەرەو لای ڕاست خۆی سووڕاندوە، نەوەك شاقووڵیی (عمودي) لێیان بدات، بەڵام خۆر لە کاتی ئاوابوونیدا: بەرەو لای چەپی ئەشکەوتەکە خۆی سووڕاندوە، واتە: هەڵکەوتەی شوێنەکەیان وابووە: کە لە کاتی هەڵهاتن و ئاوابوونی خۆردا، تیشکەکەی ڕاستەوخۆ بەریان نەکەوێ، ﴿ تَّزَٰوَرُ عَن كَهْفِهِمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ ﴾، واتە: (تميل عن كهفهم) خۆی لا دەدا، (ذات اليمين: يعني إلى الجهة ذات اليمين) ئاوای لێ دێتەوە، بەرەو ئەو لایەی کە خاوەنی لای ڕاست بوو، چونکە (ذات) یانی: (صاحبة) خاوەن، (صاحبة اليمين: صفة لموصوف محذوف، أي: الجهة صاحبة اليمين)، واتە: ئەو لایەی کە خاوەنی لای ڕاست بووە.

(التَّـزاور مشـتق مـن الـزُّورِ وهـو المَيـل)، (تـزاور) لـە (زُور)ەوە هاتـوە، یـانی: لادان (میـل)، وشـەی (تزاور)یـش بـە سـێ شـێوە خوێنراوەتـەوە:

أ - (تَزَاوَرُ) (حفص) و هەندێکی دیکە بەو شێوەیەیان خوێندوەتەوە.

ب - (تَزَّاوَرُ) کە لە ئەصڵدا (تَتَزَاوَرُ)یە و (ت)ەکە، لە (ز)ەکەدا (دغم) کراوە.

ج - (تَزْوَرُّ) بەو شێوەیەش هەر خوێندراوەتەوە و، هەرسێکیان بە مانای: (تَمِيلُ) لای دەدا، دێن.

٣)- ﴿ وَإِذَا غَرَبَت تَّقْرِضُهُمْ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ ﴾، هەروەها کاتێك کە خۆر ئاوا دەبوو، بەرەو لای چەپی ئەشکەوتەکە خۆی دەبوارد، واتە: خۆی دە لای چەپ دەگرت، بە لای چەپدا مەیلی دەکرد، ئەوەش کاتێك دەبێ، کە بەرەو باشوور بووبێ، بەڵام دەشکونجێ دەرگای بەرەو باکوور بووبێ، کە زۆربەی زانایان دەڵێن: ئەو ئەشکەوتە بەرەو باکوور بووە! بەڵام ئەو کاتە بۆ مانای ئایەتەکە کە دەفەرموێ: ﴿ وَتَرَى ٱلشَّمْسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهْفِهِمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقْرِضُهُمْ

﴿ذَاتَ ٱلشِّمَالِ﴾ دەبێ بگوترێ: یانی: لە كاتی خۆر هەڵهاتن دا تیشكی خۆر، خۆی لەلای ڕاستی ئەشكەوتەكە لادەدا و لەلای ڕاستی نەدەدا، هەروەها لە كاتی ئاوابوونیشی دا خۆر: لەلای چەپی ئەشكەوتەكەی نەدەدا و دەیبواردن.

(**تقرضهم يعني: تقطعهم، أي لا تَطْلِعُ على كهفهم**)، واتە: ڕێك خۆرەكە لە ئەشكەوتەكەیانی نەدەدا، یانی: ڕاستەوخۆ لە جەستەی ئەوانی نەدەدا.

ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿ذَاتَ ٱلْيَمِينِ﴾، هەروەها: ﴿ذَاتَ ٱلشِّمَالِ﴾، پسپۆڕانی زمان گوتوویانە: (**التعريف في اليمين والشمال، عوضٌ عن المضاف إليه، أي يمين الكهف ويساره**)، یانی: (ال) ناساندن قەرەبووی پاڵ وە لادرا و (**مضاف إليه**)ە، یانی: لای ڕاست و چەپی ئەشكەوتەكە.

٤)- ﴿وَهُمْ فِى فَجْوَةٍ مِّنْهُ﴾، لە حاڵێكدا كە ئەوانیش لە نێو بۆشاییەكی ئەشكەوتەكەدا بوون، لە نێو بەتاڵاییەكی ئەشكەوتەكەدا بوون، واتە: لە زاری ئەشكەوتەكە نیزیك نەبوون، كە تیشكی خۆر ڕێك بكەوێتە سەریان و، زیانیان پێ بگەیەنێ، بەڵكو لە نێو قووڵایی و بۆشایی ئەشكەوتەكەدا بوون.

٥)- ﴿ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ﴾، ئا ئەوە لە نیشانەكانی خوایە، واتە: ئەو كارسازیی و ڕێكخستنی كاروبارەیان، لە نیشانەكانی خوایە، خوا ﷻ ئەوەی بۆ ڕێكخستبوون.

٦)- ﴿مَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ﴾، واتە: هەر كەسێك خوا ڕێنمایی بكات، هەر ئەو ڕێ ڕاستگرتوویە، هەرچەندە لە تەفسیرەكاندا تێبینیم نەكردوە، گوتبیان بەڵام لێرەدا دەبێ مەبەست لە هیدایەت، بەرژەوەندیی بۆ دابینكردن بێ، واتە: هەر كەسێك خوا ڕێنمایی بكات، بۆ بەرێ زانین و دابینكردنی بەرژەوەندییەكانی، بەس ئەو ڕێنمایی كراوە بۆ دابینكردنی بەرژەوەندییەكانی، نەك وەك شوێنەكانی دیكە، مەبەست پێی ڕێنمایی كردن و ڕێی ڕاستگرتنی مەعنەویی بێ، چونكە ئەو هیدایەتەی كە خوای بەرز ڕەخساندوویەتی بۆ هاوەڵانی ئەشكەوت، زیاتر مەبەست پێی ئەو كاروبار ڕێكخستنە بەرهەست و ماددییەیە، كە ژیانی ئەوان بە هۆیەوە بەردەوام بووە، لە حاڵێكیشدا كە خەوتوون.

٧)- ﴿وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيًّا مُّرْشِدًا﴾، هەر كەسیش خوا گومڕای بكات، تۆ سەرپەرشتیارێكی بە ئامانج گەیەنەرت، بۆی چنگ ناكەوێ.

(**المرشد: المُبَيِّن طريقَ الرُّشد والصواب**)، (مرشد) كەسێكە ڕێی ڕاست و سەر ڕاستیی ڕوون دەكاتەوە، بۆ كەسێك كە پێی نازانێ.

٨)- ﴿ وَتَحۡسَبُهُمۡ أَيۡقَاظٗا وَهُمۡ رُقُودٞ ﴾، تۆ بە بێداریان تێدەگەیشتی، لە حاڵێكدا كە ئەوان خەوتوو بوون.

**(أيقاظ: جمع يَقِظ وَيَقُظ)**، وشەی **(أيقاظ)** كۆی **(يَقِظ)** یان **(يَقُظ)**ە، هەردووكیان هاتوون، واتە: بێدار.

**(والرقود: جمع راقد)**، **(راقد)**یش یانی: **(نائم)** خەوتوو.

یانی: لە حاڵێكدا كە ئەوان خەوتوو بوون، تۆ ئەگەر بینیباتن، بە بێداریان تێ دەگەیشتی، چونكە چاویان كراوە بووە و خۆیان جووڵاندوە، وەك خوا ﷻ باسی دەكات.

٩)و١٠)- ﴿ وَنُقَلِّبُهُمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِۖ ﴾، واتە: هەڵگێرو وەرگێڕمان دەكردن بەرەو لای خاوەنی ڕاست و، بەرە و لای خاوەنی چەپدا. دەڵێ: **(والتقليب: تغيير وضع الشيء من ظاهره إلى باطنه)**، **(تقليب)** بریتیە: لە گۆڕینی حاڵەتی شتێك لە لای دەرێی بۆ لای نێوەوەی، یانی: پێشێ ئەگەر لەسەر لای ڕاست خەوتوون، ئنجا بەرەو لای چەپ ، ئنجا جارێكی دیكە بەرەو لای ڕاست، بۆ ئەوەی لەسەر یەك بار نەمێننەوە.

ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿ وَنُقَلِّبُهُمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِۖ ﴾، بەرەو لای ڕاست و لای چەپ، هەڵگێڕ و وەرگێڕمان پێدەكردن، ئەوە لێی وەردەگیرێ كە خەوتن بە پلەی یەك، وا باشە لەسەر لای ڕاست بێ، ئنجا ئەگەر ماندوو بووی، لەسەر لای چەپ، بەڵام لەسەر سك و لەسەر پشت، باش نیە و، لە ڕووی تەندروستییشەوە هەر وایە، هەر چەندە هەندێك كەس وا ڕاهاتوە: لەسەر پشت دەخەوێ و پرخە پرخێكی زۆری دێ، هەروەها هەندێك كەس وا ڕاهاتوە: لەسەر سك دەخەوێ، كە خۆی نارەحەت دەكات، بەڵام نووستنی تەندروست، ئەوەیە بە پلەی یەكەم لەسەر لای ڕاست بێ، ئەگەر ماندوو بوو، جار جار بكەوێتە سەر لای چەپ، ئایەتەكەش بە ڕوونی ئەوە دەگەیەنێ.

١١)- ﴿ وَكَلۡبُهُم بَٰسِطٞ ذِرَاعَيۡهِ بِٱلۡوَصِيدِۚ ﴾، سەگەكەشیان هەردوو دەستی خۆی ڕاخستبوون لە ڕێسمان.

**(وصيد)** ئەو شوێنەیە كە ئەگەر ئەو ئەشكەوتە دەرگایەكی هەبووایە، دەرگاكە لەوێ دادەنرا، كە پێی دەگوترێ: ڕێسمان و، سەرەوەی پێی دەگوترێ: شیپانە، بە عەرەبی بە ڕێسمان دەگوترێ: **(عتبة الباب)** و بەسەرێش - وەك بزانم - هەر دەڵێن: **(عتبة الباب)**، واتە: لای سەرێی دەرگا.

بەڵام جێی سەرنج ئەوەیە: لێرەدا باسی سەگەکە نەکراوە: خوا هەڵگێڕ و وەرگێڕی کرد بێ!

بۆچی؟ بۆ ئەوەی ئەو سەگە لەسەر یەك حاڵەت بمێنێتەوە، کە بریتیە لە تێشکە گرتن، ئەویش هەر لەو شوێنە تایبەتییەی خۆی کە ڕێسمان یاخود بەر دەرگای ئەشکەوتەکەیە، بۆیەش بەر دەروازەی ئەشکەوتەکە بە (وصید) ناوبراوە، هەر چەندە (وصید) بریتیە لە ڕێسمانی دەرگا، چونکە چوێنراوە بە دەرگایەك کە دابخرێ.

١٢)- ﴿لَوِ ٱطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ﴾، ئەگەر تۆ پێت زانیبان، یانی: بەسەریاندا چووبای، لێرەدا ڕووی دواندن لە کەسێکی دیاریی کراو نیە، واتە: ئەی هەر کەسێك! کە ئەم قورئانە دەخوێنێتەوە، یان ئەم بەسەرهاتەت بۆ دەگێڕدرێتەوە، ئەگەر تۆ بەسەریاندا چووبای و لێیان ئاگاداربوو بای و بینیباتن. (والإطّلاع: الإشراف على الشيء ورؤيته، من مكان مرتفع، لأنه افتعال من طلع: ارتقى الجَبَلَ)، (إطّلاع) بریتیە لە بەسەر شتێکدا ڕوانین و، بینینی لە شوێنێکی بەرزەوە، چونکە (إطّلاع) (إفتعال)ە، لە (طَلَعَ)ەوە، هاتوە، یانی: (ارتقى وعَلا) هەڵکشاو بەرز بۆوە، یانی: ئەگەر تۆ بەسەریاندا چووبای، تنجا کەسێك کە دەچێ و بە پێوەیە و، ئەوان خەوتوون، بێگومان ئەو بەسەریاندا دەڕوانێ.

١٣)- ﴿لَوَلَّيْتَ مِنْهُمْ فِرَارًا﴾، ئەو کاتە تۆ ڕات دەکرد و پشتت تێ دەکردن، بە ڕاکردنەوە، بە هۆی ترس لەوانەوە، پشتت تێدەکردن و ڕاشت دەکرد.

[فِرَاراً: منصوب على المفعول المطلق، لـ(لَوَلَّيتَ منهم)] وشەی: (فِرَارًا)، (منصوب) بووە وەك بەرکارێکی ڕەها (مفعول مطلق) بۆ (وَلَّيتَ)، یانی: بەپشت تێکردنەوە لە ترسیان ڕات دەکرد.

١٤)- ﴿وَلَمُلِئْتَ مِنْهُمْ رُعْبًا﴾، بە هۆیانەوە پڕ دەبووی لە ترس و سام، خوێنراویشەتەوە: (مُلِّئْتَ).

(رعب) و (خوف) و (خشية)، جیاوازییەکەیان ئەوەیە کە: (الرعب: الإنقطاع من امتلاء الخوف)، واتە: (رُعْب) بریتیە لەوەی مرۆڤ پەکی بکەوێ لە ئەنجامی ئەوەدا کە پڕ بووە لە ترس، بەڵام بە کوردیی ناڵێن: پڕ بووە لە ترس، بەڵکو دەڵێن: ترس و لەرز دایگرتوە، من وام مانا کردوە: ترس دایدەگرێ، یانی: هەموو جەستەی دەگرتەوە، دەگوترێ: (رَعَبْتُهُ فَرَعَبَ رُعباً فهو رَعِبٌ)، (رعبته): واتە: ترساندنم، ئەویش ترسا بە ترسان و ئەو ترساوە، ترس و لەرزی لێ نیشتوە، نەوەك هەر ترسێکی ئاسایی.

جیاوازیی نێوان: (خوف) و (خشية)ش ئەوەیە کە (خشية) ترسێکە، بە گەورە و مەزنگرتنی لێترساو (المخشي منه)ی ئاوێتە بوونی.

## قوڵە باسێک:

## ڕاگرتنی سەگ (إقتناء الكلب)

زانایـان لـەو بـارەوە زۆر قسـەیان کـردوە، بـە تایبـەتی (القرطبي) خـاوەنی تەفسـیری **(الجامع لأحكام القران)** کورتـەی ڕای زانایانیـش ئاوایـە:

١ - هەندێك لە زانایان دەڵێن: ڕاگرتنی سەگ قەدەغەیە.

٢ - هەندێکیان دەڵێن: ڕەوایە.

٣ - بەڵام ڕای هاوسەنگ لەو بارەوە ئەوەیە، کە سەگ ئەگەر بۆ مەبەستێکی پەسند، یاخود پێویست، یان بەلای کەمەوە، بۆ مەبەستێکی ڕەوا ڕابگیرێ، دروستە، بەڵام ئەگەر ڕاگرتنی سەگ، هیچ ئامانجێکی لە پشتەوە نەبێ، واتە: نە ئامانجێکی پێویست (واجب)، نە ئامانجێکی پەسند (مندوب) و، نە ڕەوا (مباح)، لەو کاتەدا ڕاگرتنیشی دروست نابێ.

چەنـد فەرمایشـتێکی پێغەمبەریـش ﷺ لـەو بـارەوە هاتـوون، بـۆ نموونـە یەکـێ لـە فەرمـوودەکان ئەوەیـە: **{مَـنِ اتَّخَـذَ كَلْبـاً، إلاَّ كَلْـبَ مَاشِـيَةٍ، أوْ صَيْـدٍ، أوْ زَرْعٍ، انْتُقِـصَ مِـنْ أجْـرِهِ كُلَّ يَـوْمٍ قِـيرَاطٌ}، (أخرجـه البخـاري: ٢٣٢٢، ومسـلم: ١٥٧٥).**

واتـە: هـەر کەسـێك سـەگێك ڕابگـرێ، سـەگێك پەیـدا بـکات، مەگـەر سـەگی ئـاژەڵ بـێ، (بـۆ ئێشـکگرتن لـە مـەڕ و بـزن و ڕەشـەوڵاخ و حوشـتر و ئەوانـە) یاخـود سـەگی ڕاو بـێ، یاخـود سـەگی ئێشـکگرتن لـە کشـتوکاڵ بـێ، (ڕاگرتنەکـەی بـۆ یەکـێ لـەم سـێ مەبەسـتانە نەبـێ) هەمـوو ڕۆژێـك لـە پاداشـتەکەی قیراتێـك کـەم دەبێتـەوە.

**(قیراط)** ئەندازەیـەك بـووە کـە زانایـان ئێسـتا دەڵێـن: **(قیراط)** بریتیـە لـە ئەنـدازەی سـێ دەنکـە جـۆ لـە زێـڕ، یاخـود چـوار دەنکـە گەنـم لـە زێـڕ، ئەندازەکـە وا دەنـراوە، گرنـگ ئەوەیـە ئەندازەیـەك لـە خێـر و پاداشـتی کـەم دەبێتـەوە.

ئنجـا ئایـا تەنیـا بـۆ ئـاژەڵ، یاخـود ڕاو، یان کشـتوکاڵ، ڕەوایـە، ئـەدی ئەگەر کەسـێك خاوەنی دوژمـن بـێ و لـە خـۆی بترسـێ؟ دەڵێـن: ئەویـش بەڕێـی چاکـتر **(بالطريـق الأَوْلـى)** قیـاس

دەکرێتە سەر ئەو حاڵەتانە، هەروەها هەر حاڵەتێکی دیکەی لەم شێوەیەش بێ، قیاس دەکرێتە سەری، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژگاری خۆیدا، کە ئەو قسەیەی فەرمووە، سەگ هەر بۆ ئەو مەبەستانە ڕاگیراوە، ئەگەرنا ئەگەر حاڵەتێکی دیکەی وەك ئەوان، یاخود لەوانیش گرنگتر هەبێ، ئەوە بێگومان قیاس دەکرێتە سەر ئەو سێ حاڵەتەی کە لە فەرمایشتەکەدا هاتوون، چونکە ئەو مەسەلەیە لە بابەتی هەڵسوکەوتەکانە و، تەماشای حیکمەت و نهێنیی فەرمایشت و حوکمەکە دەکرێ و، تەنیا تەماشای ڕواڵەتی ناکرێ، وەك کاروباری خواپەرستیی (عبادة) نیە، کە ئێمە پابەند بین بە ڕواڵەتی دەقەکەوە و، سەرنجی حیکمەتەکەی نەدەین.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**بەو شێوەیە بێدارمان کردنەوە، کە سەرەنجام لە نێو خۆیاندا بپرسن: بێژەرێکیان گوتی: چەندتان پێچووە؟ گوتیان: ڕۆژێك یان بەشێکی ڕۆژێکتان پێچووە (لە خەوتندا)؟ گوتیان: هەر پەروەردگارتان زاناترە کە چەندە ماونەوە، یەکێکتان بەم (دراوە) زیوەتانەوە بنێرنە شار، با سەرنج بدات: کام لە دووکان و فرۆشیارەکان، خواردنەکەی پاك و چاکترە، بژیوێکتان لێی بۆ بێنێ و، با پەنهانکارییش بکات و، وانەکات هیچ کەس هەستتان پێ بکات، چونکە بە دڵنیایی ئەگەر پێتان بزانن، یان بەرد بارانتان دەکەن، یان دەتانگێڕنەوە سەر ئایینەکەیان و، لەو کاتەش هەرگیز سەرفراز نابن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ بَعَثۡنَٰهُمۡ لِيَتَسَآءَلُواْ بَيۡنَهُمۡۚ قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ كَمۡ لَبِثۡتُمۡۖ قَالُواْ لَبِثۡنَا يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖۚ قَالُواْ رَبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثۡتُمۡ فَٱبۡعَثُوٓاْ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمۡ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلۡمَدِينَةِ فَلۡيَنظُرۡ أَيُّهَآ أَزۡكَىٰ طَعَامٗا فَلۡيَأۡتِكُم بِرِزۡقٖ مِّنۡهُ وَلۡيَتَلَطَّفۡ وَلَا يُشۡعِرَنَّ بِكُمۡ أَحَدًا ﴿١٩﴾ إِنَّهُمۡ إِن يَظۡهَرُواْ عَلَيۡكُمۡ يَرۡجُمُوكُمۡ أَوۡ يُعِيدُوكُمۡ فِي مِلَّتِهِمۡ وَلَن تُفۡلِحُوٓاْ إِذًا أَبَدٗا ﴿٢٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شازدە بڕگەدا:

**١)- ﴿ وَكَذَٰلِكَ بَعَثۡنَٰهُمۡ ﴾، هەر بەو شێوەیە بێدارمان کردنەوە و هەڵمان ستاندنەوە.**

**( وَكَذَٰلِكَ ) ئایا ئەمە ئاماژەیە بەچی؟ (الإشارة «كذلك» إلى الإنامة وكيفيّتها، أي: كما أنمناهم قروناً، بعثناهم، وجه الشَّبَه أن الإفاقة آية، مثل: الإنامة)**، واتە: ئەم ئاوا بەو جۆرە (كذلك)ە، ئاماژەیە بۆ خەواندن و چۆنیەتییەکەی، یانی: هەر وەك چۆن چەند سەدەیەك خەومان لێخستن، هەر بەو شێوەیەش، بێدارمان کردنەوە، ئنجا ڕووی وێچواندن **(وجه الشبه)**ەکە، ئەوەیە کە هەڵساندنەکەشیان هەر وەك خەواندنەکەیان، نیشانەی باڵا دەستیی خوای پەروەردگار بووە و، خوا بە شێوەیەکی موعجیزە ئاسا خەواندوونی و، هەر بە شێوەیەکی موعجیزە ئاساش، بێداری کردوونەتەوە.

**٢)- ﴿ لِيَتَسَآءَلُواْ بَيۡنَهُمۡ ﴾، ئەم (ل)ە، ﴿ لِيَتَسَآءَلُواْ ﴾ لامی سەرەنجام (لام العاقبة)ی پێدەڵێن و (لام التعليل) نیە، واتە: خوا ﷻ ئامانجی بێدار کردنەوەکەی ئەوە نەبووە، کە بێداریان بکاتەوە،**

تاکو لە نێو خۆیاندا پرسیار بکەن، بەڵام سەرەنجامەکەی وابووە کە: لە نێوان خۆیاندا، بکەونە باس و خواس و پرسیار و وەڵام.

ئنجا ئـەم (لام العاقبـة) یـان (لام المئـال)ە، لـە چەنـد شـوێنی قورئانـدا هاتـوە، بـۆ وێنـە: خـوای پـەروەردگار دەربـارەی بنەماڵـەی فیرعـەون کـە ئـەو تابووتـە، یـان ئـەو صندوقـە هەڵدەگرنـەوە، کـە مووسـا ﷺ مەلۆتکـەی تێدایـە، دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱلۡتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرۡعَوۡنَ لِيَكُونَ لَهُمۡ عَدُوّٗا وَحَزَنًاۗ ۝٨ ﴾القصـص، واتـە: بنەماڵـەی فیرعـەون هەڵیـان گرتـەوە، {تابووتەکەیـان هەڵگرتـەوە کـە مووسـای تێدایـە} تاکـو بۆیـان ببـێ بـە دوژمـن و مایـەی خەفەتباریـی.

بێگومـان هیـچ کەسـێك شـتێك نـاکات، کـە بـۆی ببێتـە دوژمـن و مایـەی خەفـەت و دڵتەنگیـی، بەڵکـو واتـە: سـەرەنجام ئـەو مەلۆتکەیـەی لـە نێـو ئـەو صندووقەدایـە، دەبێتـە دوژمنـی فیرعـەون و دار و دەسـتەکەی و، دەبێتـە مایـەی خەفـەت و دڵتەنگییـان.

بۆیـەش ئـەو پرسـیار لـە یەکـدی کـردن و، دیالـۆگ بـە یەکـەوە کردنەیـان، ناونـراوە: (تسـاؤل)، واتـە: پرسـیار لـە یەکـدی کـردن، کـە لـە ئەصڵـدا بریتـی بـووە، لـە وتوێـژ پێکـەوە کردنیـان، چونکـە هەردووکیـان:

أ - وتوێژ پێکەوە کردن و،

ب - پرسیار لە یەکدی کردنیش، قسەکردنن بۆ گەیشتنی هەر کامێکیان بەڕای ئەوی دیکەیان، تاکو سەرەنجام بۆیان ساغبێتەوە، ئەو ماوەیەی ماونەوە لە خەودا، چەند بووە.

٣)- ﴿ قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ ﴾، واتە: بێژەرێکیان گوتی:

٤)- ﴿ كَمۡ لَبِثۡتُمۡ ﴾، ماوەی چەند ماونەتەوە؟ واتە: ماوەی چەند لە خەودا ماونەتەوە؟

٥)- ﴿ قَالُواْ لَبِثۡنَا يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖ ﴾، گوتیان: ڕۆژێك، یاخود بەشێکی ڕۆژێك ماوینەوە، واتە: یەکێکیان گوتی: ڕۆژێك ماوینەوە و، یەکێکی دیکەیان گوتی: بەشێکی لە ڕۆژێك ماوینەوە، خوای کارزان کۆی قسەکەیانی پاڵداوەتەلای کۆمەڵەکە، لەوانەیە یەکێکی دیکەشیان زیاتر لەوە و، یەکێکی دیکەیان کەمتر لەوەی گوتبێ، گرنگ ئەوەیە کۆی ڕایەکانیان هاتۆتە سەر ئەوە: یان ڕۆژێکیان پێ چووە، یان بەشێك لە ڕۆژێك، ئەگەر یەکێکیان گوتبێتی پێنج سەعات، یەکێکی دیکەیان گوتبێتی حەوت سەعات، یەکی دیکە دوازدە سەعات، گرنگ ئەوەیە سەرەنجامەکەی هەر ئەوەیە کە گوتمان.

٦)- ﴿ قَالُوا۟ رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ ﴾، دوایی ڕایان زیاتر هاته سەر ئەوە کە گوتیان: پەروەردگارتان زاناترە بەو ماوەیەی کە ماونەوە لە خەودا، واتە: واز لەوە بێنن کە سەرتان لێی دەرناچێ، کە بریتیە لە زانینی نادیار، واز لەوە بێنن و، بچنە سەر بابەتێك کە پێویستییتان پێیەتی.

٧)- ﴿ فَٱبْعَثُوٓا۟ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَـٰذِهِۦٓ ﴾، یەکێکتان بەم زیوەتان، بنێرن واتە: یەکێکتان بەم دراوە زیوەتان، بنێرن بۆ شار، ئەم دراوە زیوەی وێدەن و، با بچێ بۆ شار، بۆ هێنانی خواردن و خۆراك (کە دوایی باسی دەکەین).

وشەی (وَرِق) خوێندراویشەتەوە: (وَرْق)، (الوَرِقُ، الوَرْقُ: القطعة المسكوكة من الفضة وهي الدراهم)، (وَرِق و وَرْق) بریتیە لە پارچە زیوێکی سکە ئاسا، پارچەدراوێك کە لە زیو درست کراوە.

کە کاتی خۆی بەزۆریی دراوی (فارس) زیوو، هی (ڕۆم) زێڕ بووە. بەڵام دواتر بە دراوی زیویان گوتوە: (درهم)، هەروەك بە دراوی زێڕیشیان گوتوە: (دینار)، ئنجا بۆ کوێی بنێرن؟

٨)- ﴿ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ ﴾، بۆ شارەکە، دیارە وشەی (المدینة) (ال)ی (تعریف)ی لەسەرە، کە لێرەدا مەبەست پێی (تعریف العهد)ە، واتە: بینێرن بۆ شارەکە، ئنجا بە پێی ئەو ڕیوایەتەی هێنامان، شاری (ئەفسووس) یان (ئەبسس) بووە، هەردووکیان گوتراون.

## قوڵە باسێك :

## حوکمی پارە پێکەوە کۆکردنەوە و شت کڕین بەهاوبەشیتیی:

لەوبارەوە کە ئایا: پارەکە تەنیا هی یەکێکیان بووە؟ یان هی هەندێکیان بووە؟ یان هەر کامیان هەندێکی پێ بووە؟ بەڵام یەکێکیان بنێرن لە جیاتی هەموویان خۆراك بکڕێ، ئا ئەمە زانایان دەڵێن: بەڵگەیە لەسەر وەکالەت (القرطبي) لە (الجامع لأحكام القرآن)دا دەڵێ:

(فِي هَـذِهِ الْبَعْثَةِ بِالْوَرِقِ دَلِيلٌ عَلَى الْوَكَالَةِ وَصِحَّتِهَا، وَالْوَكَالَةُ عَقْدُ نِيَابَةٍ، أَذِنَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ فِيهِ لِلْحَاجَةِ إِلَيْهِ، وَقِيَامِ الْمَصْلَحَةِ فِي ذَلِكَ، إِذْ لَيْسَ كُلُّ أَحَدٍ يَقْدِرُ عَلَى تَنَاوُلِ أُمُورِهِ إلا بمعونة من غيره، أو يترفه فَيَسْتَنِيبُ مَنْ يُرِيحُهُ، وَقَدِ اسْتَدَلَّ عُلَمَاؤُنَا عَلَى صِحَّتِهَا بِآيَاتٍ مِنَ الْكِتَابِ)[1].

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج١٠، ص٣١١.

واتـە: لـەم نـاردنی یەکێکیـان بـەو دراوە زیـوەوە بـۆ شـار، بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە کـە وەکالـەت شـتێکی ڕاسـت و دروسـتە، {واتـە: کەسـێك یەکێـك بکاتـە جێگـر و کارپـێ سـپێردراوی خـۆی، دروسـتە} وەکالەتیـش بریتیـە لـە گرێبەسـتی جێگرایەتیـی، کـە خـوا ﷻ مۆڵـەتی داوە لەبـەر پێویسـتیی و، لەبـەر هێنانـە دی بەرژەوەندیـی لـەو ڕێیـەوە.

هەڵبەتـە لـە تەفسـیرەکانی دیکەشـدا هاتـوە کـە وێـڕای ئـەو ئایەتـە، ئایـەتی ژمـارە (٦٠)ی سـوورەتی (التوبـە)ش کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلْعَٰمِلِينَ عَلَيْهَا ﴾، واتـە: ئەوانـەی کـە صەدەقـات و زەکات کۆدەکەنـەوە، بەڵگەیـە لەسـەر ڕەوایـی وەکالـەت، چونکـە کۆمەڵێـك خەڵـك لـە لایـەن دەوڵەتـەوە ڕادەسـپێردرێن، کـە ئـەو زەکاتـە کۆبکەنـەوە لـە جیـاتی دەوڵـەت.

هەروەهـا ئایـەتی ژمـارە (٩٣) لـە سـوورەتی (یوسـوف)یش، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ ٱذْهَبُوا۟ بِقَمِيصِى هَٰذَا فَأَلْقُوهُ عَلَىٰ وَجْهِ أَبِى يَأْتِ بَصِيرًا وَأْتُونِى بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٣﴾ ﴾، واتـە: ئـەم کراسـەم بـەرن بەسـەر ڕووی بابمـی دا بـدەن، دەبێتـەوە بینـەر (چـاوی چـاك دەبنـەوە) هەمـوو کـەس و کاریشـتان پێکـەوە بێنیـن، یوسـوف ﷺ ئەوانـە دەکاتـە وەکیـل و کارپـێ سـپێردراوی خـۆی کـە کراسـەکە بـەرن و... هتـد.

هەروەهـا وێـڕای ئـەو ئایەتانـە، ئـەم فەرموودەیـەش بەڵگەیـەکی ڕوون و ڕاشـکاوە، لـەو بـارەوە:

[عَـنْ جَابِـرِ بْـنِ عَبْـدِ اللَّـهِ، أَرَدْتُ الْخُـرُوجَ إِلَى خَيْبَرَ، فَأَتَيْـتُ رَسُـولَ اللَّـهِ ﷺ، وَقُلْـتُ لَـهُ: إِنِّي أَرَدْتُ الْخُرُوجَ إِلَى خَيْبَرَ، فَقَالَ: إِذَا أَتَيْتَ وَكِيلِي فَخُذْ مِنْهُ خَمْسَةَ عَشَرَ وَسْقًا، فَإِنِ ابْتَغَى مِنْكَ آيَةً، فَضَعْ يَدَكَ عَلَى تَرْقُوَتِهِ]، (أخرجـه أبـو داود: ٣٦٣٢).

واتـە: جابیـری کـوڕی عەبدوڵـڵا (خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ) دەڵـێ: ویسـتم بچـم بـۆ خەیبـەر هاتـم بـۆ لای پێغەمبـەر ﷺ پێـم گـوت: دەمـەوێ بچـم بـۆ خەیبـەر، فەرمـووی: کـە چـووی بـۆ لای وەکیلەکـەم پـازدە (١٥) وەسـق، دانەوێڵـەی لـێ وەربگـرە، {ئەندازەیەکـە لـە پێـوان} ئایـا ئـەو دانەوێڵەیـە جـۆ بـووە، گەنـم بـووە، یـان هەرچـی بـووە} ئەگـەر بەڵگـە و نیشـانەیەکی لـە تـۆ ویسـت، دەسـتت لەسـەر ئێسـقانەکانی مـلی دابنـێ، {وا دیـارە پێغەمبـەر ﷺ بـە وەکیلەکـەی فەرمـووە: هـەر کەسـێك بینێـرم، ئـەوە نیشـانەیەتی کـە دەسـت دەخاتـە سـەر ئێسـقانەکانی خـوار ملـت، واتـە: گەردنـت}، ئـەم فەرمودەیـەش بەڵگەیـە لـەو بـارەوە، بەڵام وێـڕای ئـەوە: هـەر لـەم ئایەتـە موبارەکـە، زانایـان شـتی دیکەشـیان لـێ وەرگرتـوە، بـۆ وێنـە:

(القرطبي) دەڵێ: {قَالَ ابْنُ خُوَيْزِ مَنْدَادٍ: تَضَمَّنَتْ هَـذِهِ الْآيَةُ: جَوَازَ الشَّرِكَةِ، لِأَنَّ الْوَرِقَ كَانَ لِجَمِيعِهِمْ، وَتَضَمَّنَتْ جَوَازَ الْوَكَالَةِ، لِأَنَّهُمْ بَعَثُوا مَنْ وَكَّلُوهُ بِالشِّرَاءِ، وَتَضَمَّنَتْ جَوَازَ أَكْلِ الرُّفَقَاءِ وَخَلْطِهِمْ طَعَامَهُمْ مَعًا، وَإِنْ كَانَ بَعْضُهُمْ أَكْثَرَ أَكْلًا مِنَ الْآخَرِ}[1].

دەڵێ: ئیبنو خوەیز مەنداد {یەكێكە لە زانایانی دیاری مەزهەبی مالیك} گوتوویەتی: ئەم ئایەتە ڕەوایی هاوبەشیەتیی دەگەیەنێ، چونكە دراوە زیوەكە هی هەموویان بووە، {كەواتە: دروستە كۆمەڵێك بە یەكەوە ئەندازەیەك پارە دابنێن، بۆ خەرجیی و مەسرەفی خۆیان} هەروەها ئەو ئایەتە ڕەوایی وەكالەت و كارپێ سپێردنیش دەگرێتە خۆی، چونكە یەكێكیان لە جیاتی هەموویان ناردوە، بۆ ئەوەی خواردنیان بۆ بكڕێ.

هەروەها ئەوەش دەگرێتە خۆی، كە دروستە كۆمەڵە هاوڕێیەك پێكەوە خواردن بخۆن و خواردنەكەیان تێكەڵ بكەن، هەرچەندە هەندێكیان لە هەندێكی دیكەشیان زیاتر بخۆن {بە تەئكید هەموویان وەك یەك ناخۆن، بەڵام لەبەر بەرژەوەندیی گشتی، دروستە}.

٩)- ﴿فَلْيَنظُرْ أَيُّهَآ أَزْكَىٰ طَعَامًا﴾، واتە: ئنجا با سەرنج بدات و تێوەرامێنێ، كە كامیان خواردنەكەی پاك و چاكترە! هەندێك لە تەفسیرەكان وایان لێكداوەتەوە: ﴿أَيُّهَآ أَزْكَىٰ طَعَامًا﴾، كام لە خواردنەكانتان چاك و پاكترە! بەڵام ئەگەر وابووایە دەیفەرموو: (أي الطعام أزكى) نەك: ﴿أَيُّهَآ أَزْكَىٰ طَعَامًا﴾ چونكە ئەمە یانی: (أي الدكاكين أو الباعة طعامُها أطيَبُ وأجود؟) واتە: كام لە دووكانەكان، كام لە فرۆشیارەكان، خواردنەكەی پاك و چاكترە!

(أَزْكَىٰ) ش (صيغة التفضيل)ی وشەی (زكى)یە، (زكى يزكو) بە مانای: گەشەی كرد، چاك بوو، پاك بوو، هەموو ئەو مانایانە دەگەیەنێ، كەواتە: لەو كاتە دژوارەش دا ئەوان لە چاكیی و پاكیی و حەڵاڵیی، خواردنەكەیانیان پێچاوەتەوە.

هەڵبەتە لێرەدا مەبەست تەنیا حەڵاڵیی خواردنەكە نیە، بەڵكو لەگەڵ ئەوەشدا، مەبەست پێی ئەوەیە: كام خواردن باشترە، لە ڕووی تەندروستییەوە بۆ جەستە؟ چونكە (أَزْكَىٰ) ئەوەش دەگرێتەوە، كەواتە: هەم لە ڕووی حەڵاڵیەوە خواردنێكی باش بێ، وەك حوكم، هەم لە ڕووی تەندروستییەوە خواردنەكە خواردنێكی باش بێ، خواردنێك بێ كە هەناوی ئینسانی پێ ڕابوەستێ، خواردنێك بێ كە بەسوود بێ و زیانی نەبێ.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج١٠، ص٣١٢.

١٠)- ﴿فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ﴾، واتە: [لەو بژێو و خواردنە کە چاك و پاکە] با بژێویێکتان لێی بۆ بهێنێ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ: ئەو کەسەی کە ڕایدەسپێرن، با ئەندازەیەکی کەم لەو خواردنە بهێنێ، بایی ئەوەندە کە بەشیان بکات، تاکو خواردنەکە خەسار نەبێ، زانایان گوتوویانە: (فيه إيماءٌ إلى القناعة)، ئاماژەی تێدایە بۆ قەناعەت و بەکەم ڕازیبوون، چونکە فەرموویەتی: ﴿فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ﴾، نەك هەرچی چنگی دەکەوێ بیهێنێ! بەڵکو ئەوەندە بێنێ کە پێویستییان پێیەتی و، پەکیان لەسەری کەوتوە.

١١)- ﴿وَلْيَتَلَطَّفْ﴾، واتە: با پەنهانکاریی بکات: (ليتصرّف بلُطفٍ وخفاء)، واتە: با پەنهانکاریی و بەشێوەیەکی لێزانانە، مامەڵە بکات.

وشەی: (لطيف) بۆ شتی سووك و ورد (خفيف ودقيق) بەکاردێ، بەڵام: (ويُعَبَّر باللُّطف عنِ الحركة الخفيفة وتَعاطي الأمور الدقيقة)، وشەی (لُطف) بە کاردەهێنرێ بۆ جووڵەیەکی سووك و، کارکردن بە شێوەیەکی لێزانانە و کارامانە.

١٢)- ﴿وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا﴾، با وانەکات کە هیچ کەس هەستتان پێ بکات،

(شعر بە) واتە: هەستی پێکرد، (أشْعَرَهُ بە) واتە: لایەنێکی دیکە وایکرد، کە ئەو بەرانبەرە هەست بکات بەو کەسە، (الإشعار: الإعلام) (إشعار) یانی: لێ ئاگادارکردنەوە و هەست پێکردن، واتە: با وانەکات هیچ کەس هەستتان پێ بکات.

١٣)- ﴿إِنَّهُمْ إِن يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ﴾، بە دڵنیاییەوە ئەوان ئەگەر پێتان بزانن و بتاندۆزنەوە و هەستتان پێ بکەن، (ظهر عليه: أي اطّلع) واتە: پێی زانی و لێی ئاگادار بوو.

ئەگەر پێتان بزانن:

١٤)- ﴿يَرْجُمُوكُمْ﴾، بەرد بارانتان دەکەن.

(الرجم: القتل برمي الحجارة على المرجوم حتى يموت)، واتە: (رجم) بریتیە لەوە کە کەسێك بەردی پێدا بدرێن، تاکو دەمرێ.

١٥)- ﴿أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِي مِلَّتِهِمْ﴾، یاخود دەتانگێڕنەوە نێو ئاین و ڕێبازی خۆیان، کە ئێوە لێی ڕاتانکردوە و کەنارتان گرتوە لێی.

١٦)- ﴿وَلَن تُفْلِحُوا إِذًا أَبَدًا﴾ [ئەگەر بشگەڕێنەوە نێو ئایین و ڕێبازەکەیان، کە ڕاتانکردوە لێی] لەوحاڵەدا هەرگیز سەرکەوتوو و سەرفراز نابن.

**(أبداً: ظرفٌ للمستقبل كُلّه)، (أبداً)، واتە: لە داهاتوودا تاکو کات بڕوا، ئێوە هەر سەرفرازییتان دەستناکەوێ، هەر بێ مراد و بێ ئاکام دەبن، ئەگەر بگەڕێنەوە سەر ئاینە پووچ و بەتاڵەکەی ئەوان.**

**ئەگەر سەرنج بدەن! نەیانگوتوە: ئەگەر بێت و بتانکوژن، سەرفراز نابن، بەڵکو سەرفرازنەبوونەکەیان بە هەڵگەڕانەوەیانەوە بەستۆتەوە: ﴿وَلَن تُفۡلِحُوٓاْ إِذًا أَبَدٗا﴾، (یعني إذا أعادوکم إلى مِلّتهم، لن تفلحوا أبداً)، ئەمما کوشتنیان لە پێناوی خوادا، پێیان وانەبووە کە پێچەوانەی سەرفرازیی بێ، بەڵکو کوژران لە پێناوی خوادا هۆکاری سەرفرازیی و سەربەرزییە، لە دنیاو لە دواڕۆژدا.**

**مەسەلەی شەشەم:**

**خـوا فەرموویـەتی: بـەو شـێوەیە خەڵکەکەمـان لێیـان ئـاگادار کـردەوە و پێیـان زانیـن، تاکـو بزانـن کـە بەڵێنـی خـوا «بـە زیندووکردنـەوە» ڕاسـتە و، کاتی هاتنـی ڕۆژی دوایـی جێـی دوو دڵیـی و گومـان نیـە، یادبکـەوە! کاتێـك لـە بارەیانـەوە مشـت و مڕیـان کـرد، گوتیـان: چـاوە خانوویەکیـان لەسـەر دروسـت بکـەن، {واتـە: لەسـەر ئـەو ئەشـکەوتەی کـە جەنازەکانیـانی تێدایـە} پەروەردگاریـان پێیـان زاناتـرە، ئەوانـەی باڵادەسـت و حوکمـڕان بـوون، گوتیـان: پەرسـتگایەکیان، مزگەوتێکیـان لەسـەر دروسـت دەکەیـن:**

خـوا ﷻ فەرموویـەتی: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ لِيَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ لَا رَيْبَ فِيهَآ إِذْ يَتَنَٰزَعُونَ بَيْنَهُمْ أَمْرَهُمْ ۖ فَقَالُوا۟ ٱبْنُوا۟ عَلَيْهِم بُنْيَٰنًا ۖ رَّبُّهُمْ أَعْلَمُ بِهِمْ ۚ قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُوا۟ عَلَىٰٓ أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا ﴿٢١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ ﴾، هەر بەو شێوەیەش وامان کرد: پێیان بزانن و بیاندۆزنەوە، (أي: أعثرنا الناس عليهم، أو أعثرنا قومهم عليهم)، خەڵکمان لێیان ئاگادار کردەوە، یاخود کۆمەڵگایەکەیانمان لێیان ئاگادار کردەوە.

(هـذا تشـبيهُ الإعثـار بالإنامـة والإفاقة)، ئەمـە چواندنی پێپێزانینە بـە خەوانـدن و بێدارکردنەوە، یـانی: وامانکـرد خەڵـك بیاندۆزێتـەوە، وەك چـۆن وامانکـرد، بخـەون و بێداربینـەوە، بـە شـێوەیەکی موعجیـزە ئاسـاش وامانکـرد: خەڵکیـش پێیـان بزانـێ و لێیـان ئـاگادار بێتـەوە.

(العثـور عـلى شيء: هـو الإطـلاع عليـه والظَّفـر بـه بعـد الطَّلَـبِ)، (العثـور عـلى شيء) پێزانینـی شـتێك بریتیـە لـە دۆزینـەوەی دوای بـەدوادا گـەڕانی.

٢)- ﴿ لِيَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ﴾، تاکو سەرەنجام بزانن، کە بەڵێنی خوا ڕاستە (ل) لە (ليعلموا)دا بۆ (تعليل)ە، دەشگونجێ بۆ سەرەنجام (عاقبة) بێ، واتە: ئامانج لە پێزانینی خەڵك دا دەرککردنی ڕاستێتی بەڵێنی خوا بوو، یان سەرەنجامەکە وای لێ هات، کە لە ئەنجامی دۆزینەوەی ئەواندا و لە ئەنجامی ئەوەدا، کە خەڵکەکە زانی، ئەو گەنجانە سێسەدونۆ (٣٠٩)

ساڵ لە ئەشکەوتەکەیاندا خەوتوون و، ئێستاش بێدار بوونەوە، لە ئەنجامی ئەوەدا دڵنیا دەبن: کە بەڵێنی خوا ڕاستە، کە دەفەرموێ: زیندووتان دەکەمەوە.

یاخود: بۆیە بێدارمان کردنەوە، تاکو خەڵك و کۆمەڵگایەکە، ئەو کاتە و، ئێستاش و، خەڵکی دوای ئێمەش، هەموو بزانن کە بەڵێنی خوا کە دەفەرموێ: زیندووتان دەکەمەوە، ڕاستە، واتە: هەم سەرەنجامەکەی وا دەردەچێ و، هەم ئەوە هۆکاری بێدارکردنەوەکەشیان بوو، بەڵێنی خواش، یانی: (وعد الله بإحياء الموتى للبعث)، بەڵێندانی خوا ﷻ کە مردووان زیندوو بکاتەوە بۆ لێپرسینەوە.

٣)- ﴿ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ لَا رَيْبَ فِيهَآ ﴾، [هەروەها بۆیە بێدارمان کردنەوە] تاکو بزانن کە ئاخیر زەمان (ساعة) کاتی تێدا کۆتایی هاتنی ئەم دنیایە، یاخود: کاتی تێدا زیندووکرانەوەی مرۆڤەکان، هیچ جێی دوو دڵیی نیە.

٤)- ﴿ إِذْ يَتَنَٰزَعُونَ بَيْنَهُمْ أَمْرَهُمْ ﴾، یاد بکەوە! کاتێك لە بەینی خۆیاندا، لەسەر حاڵی هاوەڵانی ئەشکەوت مشت و مڕیان بوو، ناکۆکییان بوو، (إِذْ : ظَرْفٌ لأَعثرنا)، واتە: کاتێك خەڵکمان لەوان ئاگادار کردەوە، کە لە نێو خۆیاندا کێشە و مشت و مڕیان بوو لەسەریان.

ئنجا باسی کێشە و مشت و مڕەکە دەکا و دەفەرموێ:

٥)- ﴿ فَقَالُواْ ٱبْنُواْ عَلَيْهِم بُنْيَٰنًا ﴾، گوتیان: چاوە خانوویەکیان، یاخود ژوورێکیان لەسەر دروست بکەن، (بُنيَان) واتە: خانوویەك، یان ژوورێك، بە کوردیی دەڵێن: چاوە خانوو، نەك ماڵێکی گەورە، بەڵکو ژوورێکیان لەسەر بکەن.

٦)- ﴿ رَّبُّهُمْ أَعْلَمُ بِهِمْ ﴾، پەروەردگاریان پێیان زاناترە.

ئەمە دەگونجێ قسەی خوای پەروەردگاربێ، دەشگونجێ قسەی خۆیان بێ، یانی: بینایەك چاوە خانوویەکیان لەسەر بکەن، با وەك شوێنەوارێك بمێنێ و، خەڵك دەرس و پەندیان لێ وەربگرن.

٧)- ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُواْ عَلَىٰٓ أَمْرِهِمْ ﴾، ئەوانەی کە بەسەر کاری خۆیاندا زاڵبوو بوون، باڵادەست و دەسترۆیشتوو بوون، گوتیان:

٨)- ﴿ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا ﴾ [گوتیان:] بەدڵنیایی مزگەوتێك، یاخود پەرستگایەکیان لەسەر دروست دەکەین.

ئەمە عادەتی نەصرانییەکان بووە، دوای ئەوەی کە لە بەرنامە و رێبازی مەسیح ﷺ لایانداوە، پەرستگایان لەسەر گۆڕەکان دروست کردووە، دەشگونجێ ئەمە لە ئاینی ئەو کاتی ئەواندا، ڕەوا بوو بێ، بەڵام زیاتر وا پێ دەچێ کە ئەمە عادەت و نەریتی نەصرانییەکان بێ، دوای لادانیان لە بەرنامە و رێبازی عیسا ﷺ.

ئەوەی کە تێبینی دەکرێ لێرەدا ئەوەیە: کە خوا ﷻ ئەوەی هەموو پێچاوەتەوە، کە:

١ - چۆن پێیان زانراوە؟

٢ - پاشان چۆن چوونەوە بۆ نێو ئەشکەوتەکە؟

٣ - دوایی چۆن بۆیان گێڕاونەوە؟

٤ - هەروەها ئەوە کە خەڵکەکە هەموویان دڵنیا بوون کە ئەو گەنجانە، هەمان ئەو گەنجانەن، کە باب و باپیرانیان بۆیان باس کردووە، کە (٣٠٠) ساڵ زیاتر لەمەو پێش، شاریان بەجێ هێشتووە، شوێن بزر بوون و، هەرچەندە پەیسەریان کردوە و بەدوایاندا گەڕاون و سۆراغیان نەکردوون؟

ئەوە هەمووی دەپێچرێتەوە و باس ناکرێ، بۆچی؟ چونکە ئەوە هەموو بە پێی سیاق و سەلیقەدا دیار و زانراوە و، ئەوەی زانراویش نیە زانینی پێویست نیە و، پەک لە سەری نەکەوتوە.

# کورتە باسێک لە بارەی
# دروستکردنی مزگەوتەوە لەسەر گۆڕ

ڕاستە شەرع و ڕای ڕاست ئەوەیە کە دروستکردنی مزگەوت لەسەر گۆڕ، حەرامە، ئێمە چەندان فەرموودەمان هەن، لەو بارەوە، واتە: گۆڕێك هەبێت و مزگەوتی لەسەر دروست بکەی، ئەوە قەدەغەیەو نەهی لێکراوە و حەرامە.

ژمارەیەك لەو فەرموودانە، بە نموونە دێنینەوە:

**١)- {عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ، وَأُمَّ سَلَمَةَ ذَكَرَتَا كَنِيسَةً رَأَيْنَهَا بِالحَبَشَةِ فِيهَا تَصَاوِيرُ، فَذَكَرَتَا لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «إِنَّ أُولَئِكَ إِذَا كَانَ فِيهِمُ الرَّجُلُ الصَّالِحُ، فَمَاتَ، بَنَوْا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِدًا، وَصَوَّرُوا فِيهِ تِلْكَ الصُّوَرَ، فَأُولَئِكَ شِرَارُ الخَلْقِ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ القِيَامَةِ}. (آخرجه البخاري: ٤٢٧، ومسلم: ٥٢٨).**

واتە: عائیشە دایكی ئیمانداران (خوا لێی ڕازی بێ) لە ئومم و حەبیبە و ئومم و سەلەمەوە (کە ئەوانیش هەردووکیان هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ بوون) دەگێڕێتەوە: باسی کڵێسایەکیان کردوە، کە لە حەبەشە بینیویانە، وێنە و نەخش و نیگار، یاخود پەیکەری تێدابوون {چونکە (تصاویر) هەرچەندە زیاتر بە نەخش و نیگار دەگوترێ، بەڵام دەشگونجێ بە پەیکەریش بگوترێ} ئەومیان بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کردوە، {ئومم و حەبیبە و ئومم و سەلەمە لەو کۆچکەرانە بوون، کە چوون بۆ حەبەشە و، بۆ پێغەمبەریان باس کردوە و گێڕاوەتەوەو، دایكمان عائیشەش گوێی لێبووە} پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوانە ئەگەر پیاوێکی چاك لە نێویاندا مردبایە، مزگەوتێکیان لەسەر گۆڕەکەی دروست دەکرد و، وێنەیان لەسەر گۆڕەکەی دەکێشان، یاخود پەیکەریان لەسەر دادەنان، ئەوانە خراپترینی خەڵکن لە لای خوا، لە ڕۆژی قیامەتدا.

**٢)- {أَنَّ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالاَ: لَمَّا نَزَلَ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ طَفِقَ يَطْرَحُ خَمِيصَةً لَهُ عَلَى وَجْهِهِ، فَإِذَا اغْتَمَّ بِهَا، كَشَفَهَا عَنْ وَجْهِهِ، فَقَالَ وَهُوَ كَذَلِكَ: «لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى اليَهُودِ وَالنَّصَارَى، اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ» يُحَذِّرُ مَا صَنَعُوا} (أخرجه البخاري: ٤٣٥، ٤٣٦، ومسلم: ٥٣١).**

واتــە: عائیشــە (خــوا لێــی ڕازی بــێ) و، عەبدوڵــڵای کــوڕی عەبباس (خــوا لــە خــۆی و بــابی ڕازی بــێ)، هەردووکیــان گێڕاویانەتــەوە، دەڵێــن: پێغەمبــەر ﷺ لــە نەخۆشــیی مەرگیــدا [کاتێك نەخۆشیی مەرگ بۆ پێغەمبەر ﷺ هات] (خمیصة)یەك[1] کە لەسەر دەم و چاوی بــوو، ئنجــا کاتێــك کــە پێــی تەنگــە نەفــەس دەبــوو، لەســەر دەم و چــاوی خــۆی لایدەبــردو، دەیفەرمــوو: نەفرینــی خــوا لەســەر جوولەکــە و نەصرانییــەکان، کــە گۆڕەکانــی پێغەمبەرەکانیان کردبــوون بــە مزگــەوت، مەبەســتی ئاگادارکردنــەوەو، ترســاندنی مســوڵمانان بــوو، لــەوەی کــە خــاوەن کتێبــەکان کردوویانــە، ئەوانیش وا نەکەن، ئەوانیش وا بکەن!

٣)- {عن جَابِرِ بنِ عبدِاللهِ رَضِيَ اللهُ عَنهمَا، أنَّهُ قال: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ يُجَصَّصَ القَبْرُ، وَأَنْ يُقْعَدَ عَلَيْهِ، وَأَنْ يُبْنَى عَلَيْهِ} (أخرجه مسلم: ٩٧٠، وأبوداود: ٣٢٢٦، والترمذي: ١٠٥٢، وابن ماجه: ١٥٦٣).

واتــە: جابیــری کــوڕی عەبدوڵــڵا (خــوا لــە خــۆی و بابــی ڕازی بــێ)، دەڵــێ: پێغەمبــەری خــوا ﷺ قەدەغــەی کــرد: گــۆڕ گەچکاریــی [بکــرێ و ســواغ و لەبــغ] بکــرێ و، دانیشــتنی لەســەر بکــرێ و، خانــووی لەســەر بکــرێ.

واتــە: نەهــی کــردوە لــە هــەر سێکیان، چ گەچکاریــی بکــرێ و برازێنرێتــەوە و، چ بیکــەن بــە شــوێنی دانیشــتن و، چ خانــووی لەســەر بکــرێ.

بــەڵام لــە فەرمــوودەی دیکــەدا هاتــوە کــە پێغەمبــەر ﷺ بــە لای گــۆڕی یەکێــك لــە هاوەڵانــدا ڕۆیشــت و، بــە یەکــێ لــە هــاوەڵانی گــوت: ئــەو بــەردە بێنــە، ئەویــش چــوو، بــەڵام کابــرا بەردەکەی بــۆ هەڵنەگیــرا، پێغەمبــەر ﷺ قۆڵــی هەڵکــرد و بــۆ خــۆی چــوو بەردەکــەی هێنــا و، وەك کێــلی گۆڕەکــە داینــا و فەرمــووی: بــۆ ئــەوەی گــۆڕی برایەکەمــی پــێ بناســمەوە، بۆیــە زانایــان دەڵێــن: بایــی ئەوەنــدە کــە گۆڕەکــە بناسرێتــەوە، دروســتە کێلێــك، یاخــود دوو کێــلی بــۆ بــکات، هەرچەنــدە لــە شــوێنی دیکــەدا هاتــوە کــە لەســەر نووســینیش قەدەغەیــە، بــەڵام بــە پێــی ئــەوە کــە پێغەمبــەر ﷺ فەرموویــەتی: {أَتَعَلَّمُ بِهَا قَبْرَ أَخِي}[2]، گــۆڕی برایەکەمــی پــێ بناســمەوە، ئنجــا ئەگــەر بــەردەکان هەمــوو وەك یــەك بــن، چــۆن بزانێــت کامەیــان هــی کام برایــە و، کامەیــان هــی کام برایــە؟ کەواتــە: دروســتە بایــی ئەوەنــدەش لەســەر بنــووسرێ، کــە

---

(1) (الخميصة: ثـوب أسـود لـه عَلَـمان، فـإن لم يكـن مُعلَـمًا فليـس بخميصـة) لسـان العـرب ج٤ ص٢١٩، پۆشـاكێكی ڕەشـی چوارگۆشـەیە، دوو خـەت و نیشـانەی تێـدان، ئەگـەر نەخـش و نیگاری تێـدا نەبـێ (خمیصـة) نیـە، وادیـارە وەك لێفـە و بەتـانی ئـەم ڕۆژگارە وابـووە، بەسـەر دەم و چاویـدا داداوە.

(2) أخرجه أبو داود: ٣٢٠٦، وحسنه الألباني.

بناسرێتەوە و تەنیا بۆ ناسینەوە، بەڵام بێگومان نەخش و نیگار و کەپر و خانوو لەسەر دروستکردنی، قەدەغەیە.

لێرەدا پێویستە ئەوەش بزانرێ: کە ئەگەر گۆڕێك هەبێ و، مزگەوتێکی لەسەر دروست بکرێ، ئەوە قەدەغەیە، بەڵام ئەدی ئەگەر مزگەوتێك هەبێ و، دوایی گۆڕێکی تێدا بە خاك بسپێردرێ، ئەوە حوکمەکەی چۆنە؟

بە تەئکید ئەوە حوکمەکەی جیایە، هەروەك مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ هەبووە و، دواییش هەر لە مزگەوتی خۆیدا، بە خاك سپێردراوە، هەروەها دوای وی ئەبوو بەکریش ﷺ و، دوای وی، عومەریش ﷺ، بە درێژایی ئەو هەموو ساڵانەش، کەسیش نەیگوتوە: ئەوە ناشەرعییە، چونکە ئەصڵ هەبوونی مزگەوتەکە بووە و، دوایی ئەو کەسەی لێ نێژراوە، هەڵبەتە ناشڵێم: شتێکی پەسندە، بە نسبەت پێغەمبەریشەوە، حاڵەتێکی تایبەت بووە، هەروەها بە نسبەت ئەبوو بەکرو عومەریشەوە ﷺ هەر وابووە، ئەگەرنا ناڵێم: شتێکی پەسندە، لە نێو مزگەوتدا، گۆڕ هەبێ و، خەڵك بە خاك بسپێردرێ، بەڵام لە زۆربەی شارەکانی مسوڵمانان دا ئەوە هەیە، لە گەڕەکی (**أعظمية**)ی بەغداد لە مزگەوتەکەدا، ئەبوو حەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێبێ)، لەوێ نێژراوە، هەروەها لە مزگەوتی (**شيخ عبدالقادر الجيلاني**)دا، گۆڕەکەی شێخ لەوێیە، هەروەها لە زۆر شوێنی دیکەدا، گەلێك لە کەسایەتییەکان و پیاوچاکان، لەو شوێنەی کە لێی بە خاك سپێردراون، لە تەنیشت ئەوەوە مزگەوتێ دروستکراوە و، مەرج نیە مزگەوتەکە لەسەر گۆڕەکەی ئەو دروستکرابێ، هەرچەندە لەو بارەوە، هەڵە و پەڵە و کەم و کوڕیی مسوڵمانان زۆرە، بەڵام مەبەستیشم ئەوەیە، کە ئەو بابەتە، دەبێ وەك خۆی و بە ئەندازەی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، نەك هەر مزگەوتێك گۆڕێکی تێدا بێ، تەرك بکرێ و نوێژی تێدا نەکرێ، بە تایبەت ئەگەر گۆڕەکە خرابێتە پشتی مزگەوتەوە و، نەکەوتبێتە لای قیبلە، بۆ ئەوەی دووربێ لەوەی کە خەڵکێکی سادە و نەزان، کڕنووشی بۆ ببەن، یاخود لە کاتی نوێژدا بیکەنە ڕووگەی خۆیان، بەهەر حاڵ هەر چۆن بێ، نابێ هەبوونی گۆڕ لە مزگەوتێکدا، بکرێتە بیانووی ئەوەی نوێژ لەو مزگەوتەدا نەکرێ، بەڵام نابێ مزگەوت لەسەر گۆڕ دروست بکرێ، بەڵام ئەگەر مزگەوتێك هەبێ و، دواتر گۆڕێکی تێدا لێبدرێ، نابێ هەبوونی ئەو گۆڕە، بکرێتە بیانووی ئەوەی کە واز لەو مزگەوتە بهێنرێ و، نوێژی تێدا نەکرێ.

**مەسەلەی حەوتەم:**

**خـوا دەفەرمـوێ: خەڵكێـك دەڵێـن: هـاوەڵانی ئەشـكەوت سـێ كـەس بـوون وچوارەمیـان سـەگەكەیان بـوو و، هەندێكیـان دەڵێـن: پێنـج كـەس بـوون وشەشـەمیان سـەگەكەیان بـوو - بە قسـە لـە نادیـار كـردن و بـەرەو نادیـار هاویشـتن وا دەڵێـن - هەروەهـا هەندێكیـان دەڵێـن: حـەوت كـەس بـوون و هەشـتەمیان سـەگەكەیان بـوو، بڵـێ: پـەروەردگارم بـە ژمارەیـان زاناتـرە، كەمێـك نەبـێ، نایانزانـن، تـۆش جگـە لـە مشـت و مڕێـكی ڕواڵەتیـی، یاخـود ئاشـكرا و بـێ پێـچ و پەنـا، مشـت و مڕیـان لـەو بـارەوە لەگـەڵ مەكـە و، لـە بارەشـیانەوە {لـە بـارەی هـاوەڵانی ئەشـكەوتەوە} پرسـیار لـە هیـچ كامێكیـان مەكـە {نـە لـە هاوبـەش بۆخـوا دانـەرەكان و، نـە لـە خـاوەن كتێبـەكان و، جگـە لەوانیش مەكـە} بـۆ هیـچ شـتێكیش مەڵـێ: سبەینێ دەیكـەم، مەگـەر بڵێـی: ئەگـەر خـوا بیـەوێ، هـەر كات لەبیریشـت چـوو، نـاوی پـەروەردگار بهێنـە و بڵـێ: نزیكـە پـەروەردگارم ڕاسـتەڕێم بـكات بـۆ سـەر ڕاسـتانەتر لـەوە:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٌ رَّابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ رَجْمًۢا بِٱلْغَيْبِ وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ قُل رَّبِّىٓ أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا قَلِيلٌ فَلَا تُمَارِ فِيهِمْ إِلَّا مِرَآءً ظَٰهِرًا وَلَا تَسْتَفْتِ فِيهِم مِّنْهُمْ أَحَدًا ﴿٢٢﴾ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَا۟ىْءٍ إِنِّى فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَىٰٓ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّى لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا ﴿٢٤﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم سێ ئایەتە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٌ رَّابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ ﴾، خوا ﷻ دێتە سەر باسی ئەو مشت و مڕەی، كە لە دوای هاوەڵانی ئەشكەوتەوە پەیدا بووە، هەڵبەتە نەك لە لای خەڵكی شارەكە، خەڵكی شارەكە زانیویانە چەندن، چونكە لەبەر چاوی خۆیان خەوتوونەوە و گیانیان سپاردوە و، جەنازەكانیشیان دیار بوون چەندن! بەڵكو جیلەكانی دواییان، یان لەوانەیە مەبەست پێی خەڵكی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ بێ، خوا دەفەرموێ: (هەندێكیان) دەڵێن: سێ كەس بوون و، چوارەمیان سەگەكەیان بووە.

٢)- ﴿ وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ رَجْمًۢا بِٱلْغَيْبِ ﴾، هەروەها (هەندێكیان) دەڵێن: پێنج كەس بوون و شەشەمیان سەگەكەیان بووە.

٣)- ﴿ رَجۡمَۢا بِٱلۡغَيۡبِ ﴾، بەڵام بەشێوازی: بەرەو نادیار هاویشتن، ئەو قسەیە دەكەن.

(الرَّجْمُ: الرَّمِيُ بِالْغَيْبِ)، (رجم) یانی: هاویشتن و فڕێدان بەرەو نادیار، شوێنێ كە لێتەوە دیار نیە، واتە: قسەی بێ بەڵگە، كوردەواریی خۆشمان دەڵێن: (تفەنگ بە تاریكاییەوە نان).

٤)- ﴿ وَيَقُولُونَ سَبۡعَةٞ وَثَامِنُهُمۡ كَلۡبُهُمۡۚ ﴾، هەروەها (بەشێكیان) دەڵێن: حەوت بوون و هەشتەمیان سەگەكەیان بووە.

ئەم (و)ەی سەر: (وَثَامِنُهُمۡ) هۆكارەكەی هەر ئەوەیە: كاتێ كە فەرموویەتی: سێ كەس بوون و، چوارەمیان سەگەكەیان بووە، (ثلاثة رابعهم كلبهم) لە دوای ئەویش قسەیەكی دیكە هەبووە كە دەڵێ: پێنج كەس بوون و، شەشەمیان سەگەكەیان بووە، ﴿ خَمۡسَةٞ سَادِسُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ ﴾، لە دوای ئەویش قسەیەك هەبووە كە دەڵێ: حەوت بوون و هەشتەمیان سەگەكەیان بووە، (سبعة وثامنهم كلبهم) بەڵام لە دوای حەوت و هەشتەكە، هیچی دیكە نەماوە تاكو باسی بكات، ئەو (و)ە بۆیە زیادكراوە، بەڵام هەندێكی دیكە گوتوویانە: (الواو فيها واو الحالِ)، واتە: حەوت بوون، لە حاڵێكدا كە هەشتەمیان سەگەكەیان بووە، هەندێكی دیكەش گوتوویانە: (الواو فيها واو الثمانية)، چەند بەڵگەیەكیان لەو بارەوە هێناون، كە دەڵێن: لەبەر ئەوەی: حەوت ژمارەیەكی تەواوە، لە دوای ئەوەوە هەر ژمارەیەك دێ، دەبێ (و)ی بۆ زیاد بكرێ، بەڵام ئەوە زانایانی دیكە لێیان هەڵوەشاندوونەوەو گوتوویانە: نەخێر، جاری وا هەیە حەوتیش باس كراوە و، هەشتەمیشی بە دوادا باسكراوە و (و)یشی نەخراوەتە بەین، بە هەرحاڵ ئەو وردەكارییە، بە پێویستیی نازانم كە بچمە نێوی، گرنگ ئەوەیە: (واو الثمانية) بەڵگەیەكی وای لەسەر نیە.

بەڵام جێی سەرنج ئەوەیە، كە خوا ﷻ دوای ئەو دوو قسەیەی كە یەكێكیان دەڵێ: ﴿ سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٞ رَّابِعُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ ﴾، دەڵێن: سێ بوون و چوارەمیان سەگەكەیان بووەو، قسەی دووەمیان دەڵێ: ﴿ وَيَقُولُونَ خَمۡسَةٞ سَادِسُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ ﴾، دەڵێن: پێنج بوون و شەشەمیان سەگەكەیان بووە، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ رَجۡمَۢا بِٱلۡغَيۡبِ ﴾، ئەوە بەرەو نادیار هاویشتن و تفەنگ بە تاریكییەوەنانە، بەڵام لە دوای ئەو قسەیان كە دەڵێن: ﴿ وَيَقُولُونَ سَبۡعَةٞ وَثَامِنُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ ﴾، دەڵێن: حەوت كەس بوون و، هەشتەمیان سەگەكەیان بووە، خوا ﷻ هیچی نەفەرمووە، بۆیە وا پێدەچێ كە ئەمە ڕای ڕاست بێ، وەك پێشتریش گوتمان.

٥)- ﴿ قُل رَّبِّيٓ أَعۡلَمُ بِعِدَّتِهِم ﴾، بلێ: پەروەردگارم زاناترە، بە ژمارە و حاڵ و باڵیان، واتە: زانیاریی تەواو تەنیا لەلای خوایە، ئەگەر نا مەبەست ئەوە نیە کە: زانیاریی خوا زیاترە لە زانیاریی خەڵك بەوان، بەڵکو واتە: زانیاریی تەواو تەنیا لەلای خوایە، و لێرەدا مەبەست لە (صیغة التفضیل) بەراورد کردنی زانیاریی خوا ﷻ نیە بە زانیاریی بەندەکانی، بەڵکو مەبەست پێی: تیرو تەواویی ئەو سیفەتەیە لە خوای بێ وێنەدا.

٦)- ﴿ مَّا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا قَلِيلٞ ﴾، واتە: کەمێك نەبێ، نایانزانن.

ئەوانیش ئەوانەن کە خوا ﷻ ئاگاداریان دەکاتەوە، لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباسەوە (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) گێردراوەتەوە کە گوتوویەتی: من لەو کەمەم، کە دەیزانن، واتە: خوای پەروەردگار ئاگاداری کردوومەتەوە، کە دەبێ بە ئیلهام بوو بێ، یاخود دەبێ بە جۆرێك لە هەڵهێنجانی ورد بووبێ، کە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) پێی ناسراو بووە.

٧)- ﴿ فَلَا تُمَارِ فِيهِمۡ إِلَّا مِرَآءٗ ظَٰهِرٗا ﴾، ئنجا تۆ ئەی موحەممەد! مشت و مڕیان لە بارەوە مەکە، مەگەر مشت و مڕێکی ئاشکرا بێ، واتە: زۆر مەچۆ نێو قووڵایی باس و خواسی هاوەڵانی ئەشکەوتەوە، بۆچی؟ چونکە زۆر لە ڕەهەندەکانی ئەو بەسەرهاتە، نادیارن و، خوای زانا و شارەزا وردەکارییەکانی باس نەکردوون.

کەواتە: قسە لێکردنی ئەو ڕەهەند و وردەکارییانە، سەر بۆ ئەوە دەکێشێ کە قسەیەك بکەی و نەیپێکی، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ فَلَا تُمَارِ فِيهِمۡ إِلَّا مِرَآءٗ ظَٰهِرٗا ﴾، واتە: مشت و مڕیان لە بارەوە مەکە، مەگەر مشت و مڕێکی ئاشکرا، واتە: مشت و مڕێك کە بەڵگەکەت ئاشکرا بێ، ئەوە مانایەکی.

یاخود مشت و مڕێکی ڕووکەشیی و ڕواڵەتیی، کە زۆر تێیدا قووڵ نەبیتەوە، ئەوەش مانای دووەمی.

٨)- ﴿ وَلَا تَسۡتَفۡتِ فِيهِم مِّنۡهُمۡ أَحَدٗا ﴾، هەروەها لە بارەیانەوە پرسیاریان لە کەسیان مەکە، لە کەسیان یانی: لە خەڵکی مەککە، یاخود لە خاوەن کتێبەکان، یاخود لە خەڵك بە گشتی، هەمووی دەگرێتەوە، لە بارەیانەوە پرسیار لە کەس مەکە، چونکە تەنیا خوا ﷻ لە بارەیانەوە زانیاریی تەواوی لەلایە.

٩)- ﴿ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴾، بۆ هیچ شتێکیش مەڵێ: من بەیانیی ئەنجامدەرمی،

١٠)- ﴿ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴾، مەگەر بڵێی: ئەگەر خوا بیەوێ.

ئەمەش دوو واتایان بۆ لێکداونەوە:

یەکەم: **(لا تَقُلْ سأفعل غداً، إلا أن يشاء الله لك قوله)**، واتە: بۆ هیچ شتێك مەڵێ: بەیانیی ئەو کارە دەکەم، مەگەر خوا ویستبێتی وا بڵێی، واتە: واتگوتبێ و وا بڵێی و لە یادت نەبێ، بڵێی: **(إن شاء الله)**.

دووەم: **(لا تَقُلْ سأفعَلُ ذالك غداً إلّا مُقْتَرِناً بقول: إن شاء الله)**، واتە: مەڵێ: من بەیانیی فلان شتە ئەنجام دەدەم و، ئەنجام دەری فلان کارە دەبم، مەگەر کاتێك کە وا دەڵێی بڵێی: ئەگەر خوا بیەوێ **(إن شاء الله)**.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىْءٍ ﴾، **(شيء: اسم متوغل في التنكير، يُفَسِّرُهُ المَقام، أي: الشيء الذي تُريد أن تفعله)**، واتە: (شت) ناوێکە زۆر ڕۆچووە لە نەزانراوییدا، بەڵام بە پێی مەقام ڕوون دەبێتەوە، ﴿ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىْءٍ ﴾، لێرەدا بە پێی مەقام و سیاقەکە دیارە، واتە: بۆ هەر شتێك کە دەتەوێ ئەنجامی بدەی، مەڵێ: بەیانیی ئەنجامدەرمی، مەگەر بڵێی: ئەگەر خوا بیەوێ.

١١)- ﴿ وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ ﴾، هەر کاتێك لە بیرت چوو، باسی پەروەردگارت بکە و ناوی بهێنە، ئەمەش چوار واتایان بۆ لێکداونەوە:

١- هەر کاتێك لە پەروەردگارت بێ ئاگا بووی، دوایی یادی بکە.

٢- هەر کاتێك ناوهێنان و یادکردنی پەروەردگارت لە بیرت چوو، دوایی ئەمر و نەهی و فەرمان و قەدەغەکراوەکانی خوا، یاد بکەوە.

٣- هەر کاتێك شتێکت لەبیرچوو، یادی خوا بکە، بۆ ئەوەی وە بیرت بهێنێتەوە.

٤- ئەگەر لە بیرت چوو بڵێی: ئەگەر خوا بیەوێ (إن شاء الله)، ئەوە یادی خوا بکە، بۆ ئەوەی ببێتە هۆی سڕینەوەی ئەو لە بیرچوونەوەیە.

پێشم وایە هەموویان کەم و زۆر، گونجاون.

١٢)- ﴿وَقُلْ عَسَىٰٓ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّي لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا﴾، واتە: بڵێ: نیزیکە (ڕەنگە) پەروەردگارم ڕێنماییم بکات بۆ سەر ڕاستتانەتر لەوە، واتە: سەر ڕاستتانەتر لەو هەڵوێستەی کە لە ڕابردوودا بووی، کە پێغەمبەر ﷺ کاتێك پرسیاری لێکرا، دەربارەی هاوەڵانی ئەشکەوت و، دەربارەی (ذوالقرنین) و، دەربارەی ڕووح، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەیانیی وەڵامتان دەدەمەوە و لە بیری چوو بڵێ: (إن شاء الله)، بۆیە خوا ﷻ - بە پێی ئەو ڕیوایەتانەی کە پێشتر هێنامانن - پازدە (١٥) ڕۆژان وەحیی بۆ نەنارد، تاکو بۆی ببێ بە دەرس و پەندێك و، جارێکی دیکە نەڵێ: فڵان کارە دەکەم، مەگەر بیبەستێتەوە بە ویستی خواوە ﷻ، هەروەها بۆ شوێنکەوتووانیشی ببێتە دەرس و پەند.

ئنجا کە دەفەرمووێ: ﴿وَقُلْ عَسَىٰٓ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّي لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا﴾، دەڵێ: (كلُّ هذا في نفسك: ادعوهُ وارجوه...)، هەموو ئەمە لە دڵی خۆتدا بڵێ: نیزیکە، یان: بەڵکو پەروەردگارم ڕێنماییم بکات بۆ شتێك کە سەر ڕاستیی زیاتری تێدابێ، لەوەی پێشوو.

کە دەفەرمووێ: ﴿لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا﴾، ئەم (هَٰذَا)یە دەگەڕێتەوە بۆ بەسەرهاتەکە، کە بریتیە لە: لە بیرچوونی گوتنی: (إن شاء الله)، واتە: لە داهاتوودا پەروەردگارم، ڕێنماییم بکات بۆ شتێك کە نزیکتر بێ لە سەر ڕاستیی، لەو هەڵوێستەی ئێستام کە بریتیە لە: لە بیرچوونی گوتنی: (إن شاء الله).

(القرطبي) لە تەفسیرەکەیدا لە (الغزنوي)ەوە هێناویەتی، دەڵێ: [فَأَمَّا الإِسْتِثْنَاءُ المُفِيدُ حُكْمًا فَلَا يَصِحُّ إِلَّا مُتَّصِلًا][1]، واتە: ئەوە کە (إن شاء الله) بکوترێ: لە ڕووی حوکمەوە، کە سوود بگەیەنێ بە حوکمەکە، تەنیا کاتێك سوود دەگەیەنێ، کە پێیەوە پەیوەست بێ، چونکە لەو بارەوە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: هەرکات بەڵێنت بە کەسێك دا، کەسێك گوتی: هاوکاریم بکە، یان فڵان شتەم بۆ بکە، کە تۆش گوتت بەڵێ و بە دوای دا گوتت: (إن شاء الله) ئەوە نابێتە بەڵێنێك لەسەرت فەرز بێ، جێ بەجێی بکەی، چونکە هەڵواردن (إستثناء)ت تێخستوە و گوتووتە: ئەگەر خوا بیەوێ (إن شاء الله)، بەڵام ئەگەر نەتگوت: (إن شاء الله)، ئەوە دەبێتە بەڵێن لەسەرت و، دەبێ جێ بەجێ بکەی و دەبێتە قەرز لەسەرت.

بەڵام هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەگەر ئەمڕۆ گوتت: بەڵێ، بەڵام بەیانیی گوتت: (إن شاء الله)، ئەوە هەر بە (إستثناء) دادەنرێ!

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج١٠، ص٣٢١.

بەڵکو هەندێکیان گوتوویانە: ئەگەر لە دوای ساڵێکیش وابڵێی، هەر بە (إستثناء) دادەنرێ! ئەم قسەیەش پاڵ دەدەنە لای (عبدالله ابن عباس) (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، (الغزنوي)یش دەڵێ: دەگونجێ بە (إستثناء) دابنرێ، بەو واتایەی کەفارەتێک بێ بۆ ئەوەی کاتی خۆی گوتووتە و بەڵێنت داوە، بەڵام لەو ڕووەوە کە حوکمەکەی بگۆڕێ، نەخێر، دەبێ پێیەوە پەیوەست بێ، ئەگەرنا تۆ ئەمڕۆ بەڵێنێکت داوەو دوای چوار ڕۆژی دیکە بڵێی: (إن شاء الله)، ئەوە حوکمەکە ناگۆڕێ و، ئەو بەڵێنەت لەسەر فەرزە.

بێگومان ئەو قسەیەش ڕاست و مەنتیقییە، ئەگەر نا هەر کەسێك ڕاست بۆوە و، بەڵێنێك بدات، ئنجا دوای ماوەیەك بڵێ: (إن شاء الله)، ئەوە بکاتە بیانوویەك، کە بە بەڵێنەکەیەوە پابەند نەبێ، بە تەئکید ئەوە بێ متمانەیی پەیدا دەکات و شتێکی نامەنتیقییشە.

**مەسەلەی هەشتەم و كۆتایی:**

**هاوەڵانی ئەشكەوت سێسەد (٣٠٠) ساڵ لە ئەشكەوتەكەیاندا بە نووستوویی مانەوە و، نۆ (٩)شیان زیاد كردن، بڵێ: خوا زاناترە بە ماوەی مانەوەیان، نهێنیی ئاسمانەكان و زەوی تەنیا هی ئەوە، ئای چەند بینەر و بیسەرە! جگە لەوی هیچ سەرپەرشتیاریان نین و، هیچ كەسیش لە كارو بڕیاری خۆیدا بەشدار ناكات:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَلَبِثُوا۟ فِى كَهْفِهِمْ ثَلَٰثَ مِا۟ئَةٍ سِنِينَ وَٱزْدَادُوا۟ تِسْعًا ﴿٢٥﴾ قُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُوا۟ ۖ لَهُۥ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ أَبْصِرْ بِهِۦ وَأَسْمِعْ ۚ مَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِىٍّ وَلَا يُشْرِكُ فِى حُكْمِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

**١)- ﴿ وَلَبِثُوا۟ فِى كَهْفِهِمْ ﴾، لە ئەشكەوتەكەیاندا مانەوە، یانی: بە خەوتوویی مانەوە.**

**٢)- ﴿ ثَلَٰثَ مِا۟ئَةٍ سِنِينَ وَٱزْدَادُوا۟ تِسْعًا ﴾، سێسەد (٣٠٠) ساڵ و نۆ (٩)شیان زیاد كردن، بۆچی خوای پەروەردگار یەكسەر نەیفەرمووە: (ثلاث مائة سنين وتسعاً)؟ بۆچی دەفەرمووێ: ﴿ وَٱزْدَادُوا۟ تِسْعًا ﴾؟ ئەمە بۆ ئەوەیە بزانرێ: ئەو سێسەد و نۆ (٣٠٩) ساڵە، مەبەست پێی ساڵی مانگییە (السنين القمرية)، كە لەگەڵ مێژووی عەرەبان و مسوڵماناندا گونجاوەو، وێڕای ئەوە ئاماژەشە بەوە كە: ئەو (٣٠٩)یە، بریتیە لە بارتەقای (٣٠٠) ساڵە خۆرییەكە (السنين الشمسية) كە مێژووی كۆمەڵگای هاوەڵانی ئەشكەوت، بە پێی ئەو حیسابە نووسراوە.**

**٣)- ﴿ قُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُوا۟ ﴾، بڵێ: خوا زاناترە بەو ماوەیەی، ماونەوە، لە خەودا ماونەوە.**

**٤)- ﴿ لَهُۥ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، نهێنیی ئاسمانەكان و زەوی، هەر هی ئەوە، واتە: هەرچی زانیارییە لە ئاسمانەكان و زەوی دا، كە لە خەڵك پەنهانە، لە هەردوو عالەمی سەرێ و خوارێدا، هەمووی بۆ خوا عەیان و ئاشكرایە، بۆ ئێمە نهێنییە، بەڵام بۆ خوا ﷻ ئاشكرایە.**

**٥)- ﴿ أَبْصِرْ بِهِۦ وَأَسْمِعْ ﴾، ئەم دوو وشەیە ڕێژگە (صيغة)ی سەرسوڕمان (تَعجُّب)ن، یانی: ئای چەند بینەرە و چەند بیسەرە! یانی: (ما أبصره وما أسمعه) تیاح چەند بینەرە و چەند بیسەرە! واتە: خوا ﷻ هەموو شتێك دەبینێ و هەموو شتێك دەبیستێ.**

٦)- ﴿مَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِيٍّ﴾، جگە لە خوا ﷻ هیچ سەرپەرشتیاریان نین، یاخود: لە بەرانبەر خوادا، هیچ کەس نیە سەرپەرشتیاریان بێ و، مشوورخۆریان بێ و، سزا و بەڵای خوایان لێ لابدات.

٧)- ﴿وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِۦٓ أَحَدًا﴾، (خوا) هیچ کەس لە حوکم و بڕیاری خۆیدا، ناکاتە هاوبەش.

ئەمەش بەرپەرچدانەوەی قسەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانە، کە پێیان وابوو بت و صەنەم و پەرستراوەکانیان هاوبەشی خوان: لە موڵکدا و، لە حوکمدا و، لە شیفا هێناندا و، لە زیان لێدان دا و، لە خێر گەیاندندا و، لەسەرخستن و ژێر خستن و، لە ساغکردن و نەخۆشکردندا!! خوا ﷻ دەفەرموێ: خوا هیچ کەس ناکاتە هاوبەش لە بڕیاری خۆیدا، بڕیار بەس بڕیاری خوایە، حوکم تەنیا حوکمی خوایە، دەسەڵات، هەمووی دەستەڵاتی خوایە ﷻ.

## دەرس و پەندەكانی
## بەسەرهاتی هاوەڵانی ئەشكەوت

بەڕێـــزان!

لـە كۆتایـی ئـەم دەرسـەماندا، بـا سـەرژمێرێكی دەرس و پەنـدەكانی بەسـەرهاتی هـاوەڵانی ئەشـكەوت بكەیـن، كـە مـن دوای سـەرنجدانی تەفسیرەكان و بیركردنـەوەی خۆشـم، ئـەم پازدە (١٥) دەرس و پەنـدەم لـێ وەرگرتـوون، پێشـتر باسـمان كـرد: كـە دەرس و پەنـدی سـەرەكیی لـە بەسـەرهاتی هـاوەڵانی ئەشـكەوت دا، ئەوەیـە كـە مسـوڵمانان، نابـێ مـل بـدەن بـۆ ستەم و دەسـتدرێژیی و خراپـە و، لـە كاتێكـدا بەرهەڵسـتیی كوفـر و سـتەم و خراپەیـان پـێ ناكـرێ، لـە كۆمەڵگاكەیانـدا، نابـێ مـلی بـۆ بـدەن و ببنـە بەشـێك لـەو واقیعـە تێكـدراو و خراپـەی، كـە سـتەمكاران و بێبڕوایـان و ملهـوڕان، بەسـەر كۆمەڵـگای دا دەسـەپێنن، بەڵكـو دەبـێ ئامادەبـن سـەری خۆیـان هەڵبگـرن، ڕوو لـە چۆڵاییـان بكـەن و، پشـت لـە ئاوەدانییـان بكـەن، كـەس و كار و نیشـتیمان و حـاڵ و مـاڵ و، خۆشـیی و لـەززەتی شارنشـینیی و مـاڵ نشـینیی، هەمـووی بەجـێ بهێڵـن، ئەگـەر پەنـا بـۆ ئەشـكەوتێك، یاخـود چیـا و چۆڵێـك ببـەن و، بـەرەو ژیـانی ئاوارەییـش بچـن، نابـێ مـل بـدەن بـۆ سـتەم و كوفـر، ئەمـە پەنـدە سـەرەكییەكە بـوو، بـەڵام وێـڕای ئـەوە، ئـەم دەرس پەندانـەش وەردەگیرێـن:

**١)- شكاندنی بتی لاسایی كردنەوەی كوێرانەی دەوروبەری لادەر:**

هـاوەڵانی ئەشـكەوت، ئـەو حـەوت گەنجـە، بەڕاسـتیی، زۆر ئـازا و ئـازاد بـوون، ئەوانـە سەرمەشـقی هەمـوو ئـەو گەنجانـەن كـە مـل نـادەن بـۆ دەوروبەرێـكی لادەرو، ئامـادە نیـن لاسـایی كوێرانـەی كار و كـردەوە و بیـر و ڕا و بۆچـوونی كۆمەڵـگای لادەریـان بكەنـەوە، بەڵكـو لەگەڵیـدا ڕووبـەڕوو دەبنـەوەو، بتـی لاسـایی كردنـەوەی كوێرانـە، دەشـكێنن.

**٢)- كۆچكردن و بەجێ هێشتنی ماڵ و حاڵ و نیشتیمان و ژیانی خۆش:**

وەك پێشـتر گوتمـان: گوایـە: ئەوانـە بەرپـرس و سـتافی حوكمڕانیـی، یاخـود وەزیـرانی پادشـا بـوون، یاخـود بەلایەنی كەمـەوە: پادشـازادە بـوون، لـە ژیانێـكی پـڕ عەیـش و نـۆش و، گوزەرانێـكی خۆشـدا بـوون، بـەڵام هەمـوو ئەوانەیـان وەلا نـاوە و پاڵیـان پێوەنـاوە، لـە پێنـاوی خـوادا.

کەواتە: ئینسان دەبێ خوا بە کەس نەدات و، ڕۆژی دوایی بە دنیا نەدا، دەبێ دنیا و ئەوەی لە دنیادا هەیە لە بەرانبەر خوا و ڕەزامەندیی خوادا، پێی شتێکی زۆر کەم بایەخ بێ و، ئامادە بێ بە ئاسانیی دەستبەرداری بێ، بەڵام بۆ هیچ شتێك دەستبەرداری خوا و ڕەزامەندیی خوا و، پاداشتی خوا و ژیانی ڕۆژی دوایی نەبێ.

**٣)- خۆپارێزیی پەنهانکاریی کە (تقیة)ی پێدەڵێن، شتێکی ڕەوایە و بگرە پێویستیشە:**

چونکە ئەوانە دوای ئەوەی کە ئەو نوێنەرە و ئەو وەکیلەیان دەنێرن، خواردنیان بۆ بهێنێ، پێی دەڵێن: ﴿وَلۡيَتَلَطَّفۡ وَلَا يُشۡعِرَنَّ بِكُمۡ أَحَدًا ١٩﴾، واتە: با پەنهانکاریی بکات و وا نەکات، هیچ کەس هەستتان پێ بکات، کەواتە: کارکردن بە شێوەیەکی پەنهان و خۆپارێزانە، بە شێوەیەکی وا، کە ئەوانەی لێت لە بۆسەدان و، خۆیان بۆ مەڵاس داوی، زەفەرت پێ نەبەن، ئەوە شتێکی ڕەوایە، بەڵکو پەسندە و، بەڵکو جاری وا هەیە پێویستیش دەبێ.

**٤)- لە بەرەو خواچوون و بەندایەتیی کردن بۆ خوادا، جیاوازیی لە نێوان وەزیر و شواندا نیە:**

بگرە سەگیش حورمەت پەیدا دەکات، لە کاتێکدا لەگەڵ کەسانێکدا دەبێ کە بەرەو خوا دەچن، چونکە بە پێی هەندێ لە گێڕدراوەکان، ئەو هاوەڵانی ئەشکەوتە شەش (٦) یان لە بەرپرس و کوڕانی حوکمڕانەکان بوون و، بە لای شوانێکدا تێپەڕ دەبن، شوانەکەش لەگەڵیاندا دەچێ، واتە: شوانێك و وەزیرێك و، پاشان سەگی شوانەکەش لەگەڵیاندا دەچێ، کە لەو بەسەرهاتەدا، خوا ﷻ چوار (٤) جاران ناوی سەگەکەی هێناوە، بێگومان سەگەکەیان بە هۆی ئەوانەوە، ئەو حورمەتەی پەیدا کردوە، کە خوا ﷻ چوار جار ناوی بهێنێ و، بەو شێوەیە بەسەر هاتەکەی لەگەڵ بەسەرهاتی هاوەڵانی ئەشکەوتدا بگێردرێتەوە.

**٥)- خوا ﷻ لە کاتی سەغڵەتییاندا زیاتر هاوکاریی بەندەکانی دەکات:**

تەماشا بکەن! چۆن خوا تەگبیری بۆ ئەو جوامێرانە کردوە! لەو ئەشکەوتە ڕەق و تەقەدا، هەموو هۆکارەکانی ژیانێکی سێسەد و نۆ (٣٠٩) ساڵەی بۆ فەراهەم هێناون، تەگبیرێکی بۆ کردوون کەس بۆ کەسی ناکات، هەر بۆیەش مرۆڤ ئەگەر پشت بە خوا ببەستێ، خوا پشت پێ بەستوان، زایە ناکات، بێگومان مرۆڤەکانیش ئەوانەی کە جوامێر بن، کەسێك بە تەمای کەسێك تێ بکەوێ، کەسێك هانا بۆ کەسێك بەرێ، لە

عورف و باودا هەیە دەڵێ: ئینسان دەبێ دەرکی هەبێ، کەسێك پەنات پێ بێنێ و بڵێ: هانام بۆ تۆ هێناوە! بەدڵنیایی پەنای دەدەی، وەك لە سیرەی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە، پیاوێکی هاوبەش بۆ خوادانەر پەنای بۆ (أم هانِء) خوشکی عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیب ﷺ هێنابوو، لە کاتی ئازادکردنی مەککەدا، عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیبیش ﷺ دەیویست لەبەر دەستی دەربهێنێ و، سزای بدات، (أم هانِء) یش چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەریش فەرمووی: (قَد أَجَرْنَا مَن أَجرتِ يا أمّ هانِء)[1]، ئەوەی تۆ پەنات داوە، ئێمەش پەنای دەدەین ئەی (أم هانِء)!

واتە: پێغەمبەریش ﷺ بە پێی ئەو پەندە، کە ئینسان دەبێ دەرکی هەبێ و پەنای هەبێ، ڕەفتاری کردوە، ئنجا ئایا خوای پەروەردگار، چۆن چۆنی دەبێ دەفریای کەسانێك بێ، کە پەنای پێ دەبەن و، تووشی سەغڵەتیی و ناڕەحەتیی دەبن، بە تەئکید بە جۆرێك پەنایان دەدات و، بە جۆرێك تەگبیریان بۆ دەکات، کە هیچ کەس بەو جۆرە پەنا نەدرابێ و، کەس تەگبیری وای بۆ نەکرابێ، وەك لە بەسەرهاتی هاوەڵانی ئەشکەوتدا بۆ ئێمە دیارە و، خوای کارزانیش کە ئەمە بۆ ئێمە دەگێڕێتەوە، یانی: وەك چۆن خوا ﷻ ئەوەی بۆ هاوەڵانی ئەشکەوت کرد، بۆ هەر کەسێکی دیکەشی دەکات، کە وەك ئەوان پشت بە خوا ببەستێ، ئەوە شتێکی جەڕبێنراو و ئەزموونکراوە.

٦)- هاوەڵایەتیی صالحان، مایەی سەربەرزیی و شانازییە:

هەرچەندە ئەوە پێشتریش ئاماژەی پێدرا: هەم حەوت (٧)ەمیان ئەگەر شوانەکە بوو بێ، شوانەکە چۆتە ڕیزی ئەوانەوەو، هەم ئەگەر هەر (٧)ەکەش بەیەکەوە بوو بن، گرنگ ئەوەیە ئەو سەگەی کە لەگەڵیاندا بووە، خوای کاربەجێ ناوی سەگەکەشی لەگەڵ ناوی ئەواندا، جووت کردوە.

٧)- پشت بە خوا بەستن، مایەی سەرفرازیی دنیا و قیامەتە:

خوا ﷻ دەفەرمویێ: ﴿إِذْ أَوَى ٱلْفِتْيَةُ إِلَى ٱلْكَهْفِ فَقَالُوا۟ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ﴿١٠﴾﴾، واتە: یادبکەوە! کاتێك گەنجەکان (جوامێرەکان) پەنایان بۆ ئەشکەوت برد و گوتیان: پەروەردگارمان! لە لایەن خۆتەوە بەزەییمان پێ بدە و، لە کار وبارماندا، بە ئامانج گەیاندن و، بە ئاکام گەیاندنمان، بۆ برەخسێنە.

---

(١) أخرجه البخاري: ٣٠٠٠، ومسلم: ٣٣٦.

تەماشا بکەن! چونکە ئەوانە پشتیان بە خوا بەست و، بە تەمای خوا تێکەوتن و، لە خوا پاڕانەوە، خوای پەروەردگار چۆن سەربەرزی کردن، لە دنیاو دواڕۆژداو، چۆن هەڵوێستەکەیان و بەسەرهاتەکەیانی خستە نێو دوا فەرمایشتی خۆیەوە، هەتا دنیا دنیایە، دەخوێنرێتەوە و دەگێڕدرێتەوە، بەهۆی پشت بە خوا بەستنەوە، هەم پەنا دران و، هەم سەربەرزکران.

**٨)- بەڵگە هێنانەوەی لۆژیکییانە لەگەڵ نەیاراندا:**

هاوەڵانی ئەشکەوت دەڵێن: ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ قَوۡمُنَا ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗۖ لَّوۡلَا يَأۡتُونَ عَلَيۡهِم بِسُلۡطَٰنِۭ بَيِّنٖۖ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا ١٥ ﴾، واتە: ئا ئەوانە گەلەکەمانن، جگە لە خوا، پەرستراوانێك دەپەرستن، ئەگەر ڕاست دەکەن (ئەوانە شایستەی پەرستنن) بۆچی بەڵگەیەکی ئاشکرایان لەسەر ناهێنن؟ کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە درۆ بۆ خوا هەڵدەبەستێ! کە مەبەست هاوبەش بۆ خوا دانانە.

کەواتە: هاوەڵانی ئەشکەوت، بە لۆژیکییانە گفتوگۆیان کردوە لەگەڵ نەیارەکانی خۆیاندا و، ڕەخنەی ئەوەیان لێیان هەبووە، کە بەڵگەیان بەدەستەوە نیە، لەسەر پەرستنی ئەو پەرستراوانەی، لە جیاتی خوا دەیانپەرستن.

**٩)- پاکیی و چاکیی بژیو، لە هەموو هەل و مەرجێکدا، پێویستە ڕەچاو بکرێ:**

ئەوانە کە لە ئەشکەوتێکی ڕەق و تەقدا گرفتار بوون، یەکێکیان بە پەنهانیی و بە دزیی دەنێرن و، مەترسیی مەرگیان هەیە، کە ئاشکرا بین، کە چی دەڵێن: ﴿ فَلۡيَنظُرۡ أَيُّهَآ أَزۡكَىٰ طَعَامٗا فَلۡيَأۡتِكُم بِرِزۡقٖ مِّنۡهُ ﴾، با سەرنج بدات! کام لە دووکانەکان و فرۆشیارەکان، خواردنەکەی پاك و چاکترە، با لەوە بژیوێکتان لێ بۆ بێنێ.

**١٠)- نووستن و مردن زۆر شێوەی یەکدی دەکەن:**

خوا ﷻ خەوەکەی هاوەڵانی ئەشکەوتی کردۆتە بەڵگەی زیندووبوونەوە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (النَّوْمُ أَخُو الْمَوْتِ)[1]، واتە: خەوتن برای مردنە، چونکە خاڵی هاوبەشیان زۆر پێکەوە هەن، وەك لە سوورەتی (الزمر)دا، خوا ﷻ ئاماژەی پێداوە و دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلۡأَنفُسَ حِينَ مَوۡتِهَا وَٱلَّتِي لَمۡ تَمُتۡ فِي مَنَامِهَاۖ فَيُمۡسِكُ ٱلَّتِي قَضَىٰ عَلَيۡهَا ٱلۡمَوۡتَ وَيُرۡسِلُ ٱلۡأُخۡرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ

---

(١) أخرجه البيهقي في شعب الإيمان: ٤٧٤٥، والديلمي: ٦٩٠٧.

يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾﴾، واتە: خوا ﷻ گیانەکان وەردەگرێ لە کاتی مردندا و، ئەوەی نەمرد بێ، لە کاتی خەوتندا، ئنجا ئەوەی کە مردنی بۆ بڕیار دابێ، دوای ئەوەی کە لە کاتی خەوتندا ڕووحەکەی وەرگرتوە، ڕووحەکە لەلای خۆی دەگرێ و نایگێڕێتەوە نێو جەستەکە و کۆتایی پێ دێ، (لە دنیادا دەمرێ و، لە بەرزەخ دا بێدار دەبێتەوە)، ئەوانەش کە کاتی مردنیان نەهاتوە، دەیانگێڕێتەوە، تاکو کاتێکی دیاریکراو، لەوەدا نیشانە هەن، بۆ کەسانێك بیر بکەنەوە.

کەواتە: مردن و نووستن خاڵی هاوبەشیان پێکەوە زۆرن.

بۆیەش خوا ﷻ لێرەدا دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ لِيَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ لَا رَيْبَ فِيهَآ﴾، واتە: بەو شێوەیەی کە خەواندمانن و، بەو شێوەیەی کە بێدارمان کردنەوە، هەر بەو شێوەیەش وامانکرد: خەڵك پێیان بزانن و بیاندۆزێتەوە، تاکو ئەو خەڵکە بزانن کە بەڵێنی خوا ڕاستە: مردووان زیندوو دەکاتەوەو، کاتی هاتنی لێپرسینەوە و سزا و پاداشتیش، ڕاستە و هیچ جێگای دوودڵیی نیە، واتە: مادام دوای سێسەدو نۆ (٣٠٩) ساڵ خەوتن، خوا ﷻ ئەوانەی خەبەر کردەوە، کەواتە دوای هەزاران ساڵ مردنیش، دەتوانێ ئەوان زیندوو بکاتەوە.

**١١)- گەنجان خێراتر هەق قبووڵ دەکەن و، ئازاترن و ئازادتریشن:**

گەنجان عەقڵ و دڵیان ئازادترە و بوێرییشیان زیاترە، و ئازاد و دەستکراوەتریشن بۆ وەرگرتنی هەق و، بۆ تووڕدانی ناهەق، لەبەر چی؟ لەبەر ئەوەی بابای گەنج، چارێ کۆت و پێوەندی عادەت و نەرێت و لاسایی کردنەوەی کوێرانەی پێشینان و، بەرژەوەندییە ناشەرعییەکان، دەست و پێ و عەقڵ و دڵیان نەبەستوە، بۆیە ئازاترە و ئازادترە.

**١٢)- بەوردیی و وێناکردنەوە: باسی حاڵ و باڵی هاوەڵانی ئەشکەوت لە کاتی خەوتنیان دا:**

خوا ﷻ بە وردیی باسی جووڵەی خۆر و، هەڵگێڕ و وەرگێڕکرانیان و، پاشان سەگەکەیان چۆن لەسەر چەنگان کەوتوە و، شوێنی خەوتنیان لە نێو بۆشایی و بەتاڵایی ئەشکەوتەکەدا، ئاوا بەوردەکاریی باس دەکات، کە ئەوە سێ حیکمەتی گەورەی تێدان:

١- مشوورخۆریی خوا ﷻ بۆ هاوەڵانی ئەشکەوت، ڕوون دەکاتەوە.

٢- ڕەچاوکردنی یاساکانی خوا لە سروشتدا، دەگەیەنێ، واتە: خوا ئاوا مشووری لێ خواردوون، ئەوان خەوتوون ئاگایان لە هیچ نیە، بەڵام خوا بە جۆرێك مشووری لێ خواردوون، ئەگەر بۆ

خۆیان مشووریان خواردبایە، تاوایان بۆ نەدەکرا: نان لە کوێ بێنن؟ چۆن بگوزەرێنن؟ چۆن دڵیان ناتۆقێ (٣٠٩) ساڵ لە ئەشکەوتێکی ڕەق و تەقدا؟ بەڵام خوای پەروەردگار وایکردوە: ئەم خەوە درێژە وایان زانیوە، ڕۆژێکە، یان بەشێکە لە ڕۆژێك!!

٣- ئەوەش دەگەیەنێ کە خوا ﷻ هاوکات لەگەڵ ئەوەی ئەم خەوتنە سێسەدو نۆ (٣٠٩) ساڵییە، موعجیزە بووە و یاسا دڕ بووە! بەڵام خوا ﷻ هەندێ لە یاساکانی سروشتیشی تێدا ڕەچاو کردوون:

أ - هەڵگێڕ و وەرگێڕیان.

ب - خۆر کە ڕاستەوخۆ لێیان نەدا.

ج - لە زاری ئەشکەوتەکەدا نەبن و، زۆریش لە قووڵایی ئەشکەوتەکەدا نەبن، کە هیچ هەواو و فێنکایەتییان نەگاتێ.

د - سەگەکەیان لە پێشیانەوە بێ، ئەمانە کۆمەڵێك یاسای گەردوونیین، خوا ﷻ ڕەچاوی کردوون.

**١٣)- کەوتنە مشت و مڕیان لەسەر ماوەی مانەوەیان لە خەودا، بەڵگەیە لەسەر نەگۆڕانی جەستەیان:**

ئەوە کە لە بەینی خۆیاندا دەکەونە مشت و مڕ، کە داخۆ چەند ماونەوە؟ چونکە هەندێك لە زانایان (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) هەر لە خۆوە هەندێ شتیان گوتوە، ئاخر (٣٠٩) ساڵ نینۆکی ئینسان درێژ بێ، زۆر زۆر درێژ دەبێ؟! هەروەها (٣٠٩) ساڵ مووی سەر و ڕیش و سمێڵیان بێ، زۆر زۆر درێژ دەبێ؟! چونکە مردووش جاری وا هەیە، نینۆکەکان و مووەکانی هەر درێژ دەبن، پێش ئەوەی جەستەکەی لە بەین بچێ، چ جای خەوتوو!

ئنجا هەندێك لە زانایان گوتوویانە: نینۆك و سەر و سمێڵیان زۆر زۆر درێژ بووە! بەڵام ئەگەر وابووایە، هاوەڵانی ئەشکەوت نەیاندەگوت: ڕۆژێك، یاخود بەشێك لە ڕۆژێك بە خەوتوویی ماوینەوە، ئەو کاتە دەیانگوت: ئەو نینۆکانە بە هەفتەیەك و دوو هەفتە، یان بە مانگێك و دوو مانگ، هێندە درێژ نابن؟! دیارە ئێمە زۆر ماوینەوە لە خەودا! بەڵام نا، ئەسڵەن کە کەوتوونە مشت و مڕەوە، لەسەر ماوەی مانەوەیان لە خەودا، بەڵگەیە لەسەر نەگۆڕانی جەستەیان، نینۆك و موویان و تەمەنیان هەر لە تەمەنی گەنجیەتیی دا ماونەوە، کەواتە: هەندێك لە یاساکانی خوا ﷻ لە سروشتدا، کاریان نەکردوە، کە بریتی بووە لە گەشەنەکردنی نینۆك و موویان و تەمەنیان و، هەروەها خانەکانی جەستەیان پیر

نەبوون و، مووەكانیان سپیی نەبوون، بەڵام هەندێك لە یاساكانی خوا ﷻ لە سروشتدا كاریان كردوە، كە بریتیە لە: هەڵگێڕ و وەرگێڕ پێكردنیان و، تیشكی خۆر بە شێوەیەك بێ كە ڕاستەوخۆ لێیان نەدا و... هتد.

ئنجا ئەمە وەك ئایەتی (٢٥٩)ی سوورەتی (البقرة)یە، كە خوا ﷻ تێیدا باسی كەسێك دەكات، كە هەندێ لە تەفسیرەكان دەڵێن: ئەو كەسە عوزەیر بووە، وەك لە بەرگی یەكەمی ئەم تەفسیرەدا بە درێژیی باسمان كردوە، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحْيِي هَٰذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا ۖ فَأَمَاتَهُ اللَّهُ مِائَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ ۖ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ ۖ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ۖ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِائَةَ عَامٍ فَانظُرْ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ ۖ وَانظُرْ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ آيَةً لِّلنَّاسِ ۖ وَانظُرْ إِلَى الْعِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا ۚ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (٢٥٩) ﴾.

(لێرەدا خوا ﷻ باسی ئەو كەسە دەكات و دەفەرموێ:) یان وەك ئەو كەسەی كە بە لای ئاوەدانییەكدا ڕەت بوو، كە سەر بانەكانی بەسەر دیوارەكانیدا ڕووخا بوون (لە دڵی خۆیدا) گوتی: چۆن دەبێ خوا ئەمە زیندوو بكاتەوە؟ [نەك لەبەر ئەوەی بڕوای پێ نەبوو، بەڵكو پێی جێگای سەرسوڕمان بوو] خواش ﷻ سەد (١٠٠) ساڵ مراندی، دواتر زیندووی كردەوەو، لێی پرسی: چەند ماویەوە؟ گوتی: ڕۆژێك یان كەمێك لە ڕۆژێك ماومەوە (خوا) فەرمووی: بەڵكو سەد (١٠٠) ساڵ ماویەوە! تەماشای خواردن و خواردنەوەت بكە، هیچ نەگۆڕاوە، [گوتراوە: بەرچنەیەك میوەی پێ بووە، ترێ یان هەنجیر یان هەر میوەیەكی دیكە بووبێ، لە جێی خۆی بووە و هیچ نەگۆڕاوە، بەڵام ئەو گوێدرێژەی كە پێی بووە، تۆپیوە و تەنیا ئێسقانەكانی ماونەوە] تەماشای لاشەی گوێدرێژەكەت بكە! چۆن ئێسقانەكان هەڵدەستێنینەوە و گوێدرێژەكە زیندوو دەكەینەوە، بۆ ئەوەی بتكەینە نیشانە بۆ خەڵكی، تەماشا بكە! چۆن ئێسقانەكان هەڵدەستێنینەوەو، دوایی دایدەپۆشینەوە بە گۆشت، دوای ئەوەی كە بۆی ڕوونبۆوە گوتی: من دەزانم كە خوا ﷻ لەسەر هەموو شتێك بە توانایە.

لەو بەسەر هاتەش دا: دیسان خواردن و خواردنەوەكەی ئەو پیاوە، هیچ نەگۆڕاوە، كەچی گوێدرێژەكەی تۆپیوەو، بۆ خۆشی مردوو بووە، یان نووستوو بووە، خوای زانا و توانا دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَاتَهُ اللَّهُ مِائَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ ﴾، خوا سەد ساڵ مراندی، بەڵام وا پێدەچێ، هی ئەویش دیسان هەر خەو بووبێ، بەڵام خەوەكەی وی، سەد ساڵ بووبێ و خەوێكی قووڵی مردن ئاسا بووە.

کەواتـە: لێـرەدا بۆمـان دەردەکـەوێ، کـە خـوا ﷻ جـاری وایـە، هەنـدێ لـە یاسـا سروشتییەکانی، لـە کار دەخـات، لـە هەمـان کاتیشـدا، هەندێـك لـە یاسـاکانی دیکـەی، هـەر کار دەکـەن، ئـەوە دەسـەڵاتی بـێ سـنووری خوایـە، کـە هەندێـك لـە یاسـاکانی کار بکـەن و، هەندێـك کار نەکـەن.

**١٤)- مرۆڤ بە هۆی سەرپەرشتیاری بە ئامانج گەیەنەرەوە نەبێ، ڕێ دەر ناکات:**

وەك خـوا دەفەرمـوێ: ﴿مَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيًّا مُّرْشِدًا ﴿١٧﴾﴾، واتـە: هـەر کەسـێك خـوا ڕێنمایـی بـکات، هـەر ئـەوە ڕێـی ڕاسـتگرتوو و، هـەر کەسێك خـوا گومـڕای بـکات، تـۆ هیـچ سەرپەرشـتیار و دۆسـت و یاوەرێـکی بـە ئامانـج گەیەنـەرت بـۆی چنـگ ناکـەوێ.

خـواش ﷻ لـە گۆتـرە، کـەس ناخاتـە سـەر ڕاسـتە ڕێ و، لـە گۆتـرەش کـەس گومـڕا نـاکات، ڕێنمایـی خـوا بـۆ هەمـوو لایەکـە، بـەڵام خسـتنە سـەر ڕاسـتە ڕێ، خـوا تایبـەتی دەکات بەوانـەوە کـە ڕێنمایـی خـوا قبـووڵ دەکـەن و، گومـڕا کردنیـش، خـوا بـە مـلی ئـەو کەسـانەی دادێنـێ، کـە ڕێنمایـی خـوا قبـووڵ ناکـەن.

**١٥)- مسوڵمان نابێ توانا و کاتی خۆی کە شتێکدا بەکاربێنێ، کە شوێنی خۆی نەبێ:**

بەڵـێ مسـوڵمان نابـێ خەریکـی شـتێك بـێ و ڕەنجـی بـۆ بـدات، لـە کاتێکـدا بزانـێ کـە تواناکـەی بەهـەدەر دەچـێ و، هیـچ دەسـتکەوتێکی نابـێ، هـەر بۆیـەش هـاوەڵانی ئەشـکەوت کـە بێـدار دەبنـەوە، یەکێکیـان دەڵـێ: چەنـد ماونـەوە؟ هەندێکیـان دەڵێـن: ڕۆژێـك، هەندێـکی دیکەیـان دەڵێـن: بەشـێکی ڕۆژێـك، دوایـی یەکسـەر دەڵێـن: ﴿قَالُوا۟ رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ فَٱبْعَثُوٓا۟ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَآ أَزْكَىٰ طَعَامًا فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ ﴿١٩﴾﴾، واتـە: پەروەردگارتـان زاناتـرە بـەوە کـە چەنـد ماونـەوە، [خەریـکی کارێك بن کـە پێویسـتییتان پێیـەتی] یەکێکتـان بـەو پـارە زیوەتانـەوە بنێـرن بـۆ شـار، بـا سـەرنج بـدات کام لـە فرۆشـیارو دووکانـەکان، خواردنەکـەی پـاك و چاکـترە! بـا بژیوێکتـان لـەو خواردنـە بـۆ بێنـێ.

واتـە: واز لـەوە بێنـن کـە زانیارییتـان پێـی نیـە و سـەرتان لێـی دەرناچـێ و، کاتی خۆتـان بەفیـڕۆ مـەدەن، بـە بـاس و خـواسی شـتێکەوە، کـە ئامـڕاز و هـۆکاری گەیشـتن بـە ئەنجامـی ئـەو بابەتـان لـە لا نیـە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# پێناسەی ئەم دەرسە

بەڕێزان!

لەم دەرسەماندا ئایەتەکانی: (٢٧ - ٣١) شی دەکەینەوە، ئەم پێنج (٥) ئایەتە کۆمەڵێك ڕێنمایی گەورە و گرنگیان تێدان، بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و دوای ئەویش سەرەتا بۆ هاوەڵانی بەڕێزو، پاشان بۆ شوێنکەوتووانی و، بۆ هەموو جیلەکانی ئوممەتی، هەموو ئەوانەی کە پەیڕەویی لە ڕێبازی پێغەمبەری کۆتایی دەکەن ﷺ.

هەروەها وێڕای ئەو ڕێنماییانە، سەرەنجامی شوومی بێبڕوایانی ستەمکاریش خراوەتە ڕوو، ئەویش لە دۆزەخدا خۆی دەبینێتەوە، کە بریتیە لە ئاگرێکی بڵێسەدار و، سزا و جەزرەبە، هەروەها سەرەنجامی خێر و سەربەرزانەی بڕوادارانیش، کە بریتیە لە شاد بوون بە بەهەشتە ڕازاوەکانی خوا و، ئەو نازو نیعمەتانەی تێیان دان.

﴿ وَٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَ ۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلْتَحَدًا ﴿٢٧﴾ وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِىِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ﴿٢٨﴾ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ۚ إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا ۚ وَإِن يَسْتَغِيثُوا۟ يُغَاثُوا۟ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ ۚ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٢٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا ﴿٣٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَيَلْبَسُونَ ثِيَابًا خُضْرًا مِّن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ ۚ نِعْمَ ٱلثَّوَابُ وَحَسُنَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٣١﴾ ﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{هەروەها ئەوەی لە کتێبی پەروەردگارت بۆت سروش کراوە، بیخوێنەوە و شوێنی بکەوە، هیچ گۆڕەرێك بۆ وشەکانی (خوا) نیە و، جگە لەوی هیچ پەنایەك نادۆزیتەوە ﴿٢٧﴾ هەروەها خۆت ڕاگرە لەگەڵ ئەوانەدا کە بەیانیان و ئێواران، لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە و، ڕوو ( و ڕەزامەندیی)ی وی دەخوازن و، چاوتیان لەسەر لامەدە، بەهۆی ئەوەوە کە جوانیی ژیانی دنیات بوێ و، بە قسەی کەسێکیش مەکە، کە دڵیمان لە یادی خۆمان بێ ئاگا کردوە و، شوێنی ئارەزووی کەوتوە و، حاڵی زایەبووە ( و سەری بە فەتارەت چووە) ﴿٢٨﴾ بشڵێ: هەق تەنیا لە پەروەردگارتانەوەیە، ئنجا کێ دەیەوێ با بڕوابێنێ و، کێش دەیەوێ با بێبڕوا بێ، ئێمە ئاگرێکمان بۆ ستەمکاران ئامادە کردوە، کە بڵێسە و دووکەڵی سەراپەردە ئاسای، دەوری داون و، ئەگەر داد و فیغانیش بکەن، ئاوێکی کوڵاوی وەك کانزای قاڵکراوەیان دەفریا دەخرێ، کە تینەکەی ڕووان دەبرژێنێ، ئەو خواردنەوەیە خراپترین خواردنەوەیەو، ئەو حاڵەش خراپترین حاڵەتی گوزەرانە ﴿٢٩﴾ مسۆگەر ئەوانەی بڕوایان هێناوەو، کردەوە باشەکانیان کردوون، ئێمە پاداشتی کەسێك کردەوەی چاك بكات، زایە ناکەین ﴿٣٠﴾ ئا ئەوانە باخ و بێستانی هەمیشەییان هەن، ڕووبار گەل بە ژێر (کۆشکەکان)یاندا دەڕۆن، لەوێدا بە بازنی زێڕین دەڕازێنرێنەوە و، پۆشاکی سەوز لە ئاوریشمی تەنك و ئەستوور دەپۆشن، لەوێدا لەسەر تەختان پاڵیانداوەتەوە، ئا ئەوە چاکترین پاداشتە و، جێگا و نشینگەیەکی هەرە پەسند و دڵگیرە ﴿٣١﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

( وَٱتْلُ ): واتە: بخوێنەوە، یاخود شوێنی بکەوە، (تَلاَهُ: تَبِعَهُ مُتَابَعَةً لَيْسَ بَيْنَهَا مَا لَيْسَ منها والتِّلاَوَةُ: تَخْتَصُّ باتِّبَاعِ كُتُبِ اللهِ المنزلة، تَارَةً بالقراءةِ، وَتَارَةً بالارْتِسَامِ لِمَا فِيهَا)، (تَلاَهُ)، واتە: شوێنی کەوت، شوێنکەوتنێك کە لە نێوانی ئەو شتانە کە بە دوایی یەکدییەوەن، شتێکی دیکەی نامۆ نەیەتە نێوان، وشەی (تلاوة)یش تایبەتە بە شوێنکەوتنی کتێبە دابەزێنراوەکانی خواوە ﷻ، جا چ بەوە کە بخوێندرێنەوە، چ بەوە کە پەیڕەوییان لێبکرێ و، پابەندیی بەوەوە بکرێ کە گرتوویانەتە خۆیان.

(مُلْتَحَدًا ): دەگونجێ چاوگ بێ، (أي: التجاءة أو مَوْضِع التجاء، والتَحَد إلى كَذَا: مَالَ)، واتە: مەیلی بە لای فلان شتەدا چوو، پەنای پێ برد، دەشگونجێ (مُلْتَحَدًا ): بە مانای پەناگە بێ، یانی: (مَلجَا).

(وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ ): چاوتیان لەسەر لامەدە، (العَدْوُ: التَجَاوزُ وَمُنَافَاةُ الإلتِئَامِ)، (عَدو) بریتیە لە لێ تێپەڕاندن، بواردن، پێچەوانەی پێکەوە گونجانە.

(فُرُطًا ): (أي: إفْرَاطاً وتضييعاً)، واتە: زێدەڕۆیی و بە زایەدان.

(سُرَادِقُهَا ): (فارسي معرب، بَيْتٌ مُسَرْدَق: مَجْعُولٌ عَلَى هَيْئة سرادِق)، وشەی (سُرادِق): وشەیەکی فارسییە بە عەرەبیی کراوە، لە سەراپەردەوە هاتوە، (بَيْتٌ مُسَرْدَق) ماڵێك لەسەر شێوەی سەراپەردە بێ، سەراپەردە بریتیە لەوە کە کاتی خۆی باو بووە، ئەو خانووە بێلایەکی هەبووە و پەردەیەکیان بەسەرداداوە، بۆ سێبەر، یان وەك نواییەك، ئەوە پێی گوتراوە: (سُرَادِق)، لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە بڵێسە و دووکەڵی ئەو ئاگرە، وەك سەراپەردە بەرزدەبێتەوە.

(كَٱلْمُهْلِ ): (المُهْلُ: دُرْدِيُّ الزَّيْتِ، المعْدِنُ المُذَاب، النُحَاس المُذَابُ، القَيْحُ وَالصَّدِيد)، (مُهل) بە چەند شێوەیەك ماناکراوە: تڵتی زەیت، زەیت کە قاڵ دەکرێتەوە تڵتەکەی بنەوەی، ئەوە پێی گوتراوە: (مُهل)، هەروەها کانزای تواوە، تنجا ئەو کانزایە مس بێ یان ئاسن بێ، هەروەها بە کێم و زووخاویش ماناکراوە.

(يَشْوِي ): (شَوَى اللَّحْمَ، يَشْوِيهِ شَيًّا)، واتە: گۆشتەکەی برژاند، دەیبرژێنێ بە برژاندن، کەواتە: (يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ ) واتە: دەم و چاویان دادەماڵێ و دەیبرژێنێ.

(مُرْتَفَقًا ): (مرتفق) هەر شتێکە کە بەهرەی لێوەربگیرێ، (المِرفَقَةُ: المِخَدَّةُ، وَتَمَرْفَق: أخَذَ المِرْفَقَةَ، مُرْتَفِقٌ: مُتَّكِيءٌ عَلَى مرفق يَدِهِ، وَالمرتفقُ: كُلُّ مَا يُرْتَفَقُ بِهِ وَيُنْتَفَعُ، كَذَا المِرْفَق، وَالجَمْعُ: مَرَافِق)، (مِرْفَقَة) واتە: سەرین، یان باڵنج ئەوەی کە ئینسان پاڵی پێوەدەدا، دەگوترێ: (تمرفق)، واتە: پاڵی بەسەرینەکەوەدا (مرتفق)، واتە: ئەو کەسەی کە پاڵی داوەتەوە لەسەر لاشانی و، لەسەر ئانیشکی، (مُرْتَفَقْ) هەر شتێکە سوودی لێوەربگیرێ و، بەهرەی لێ وەربگیرێ، هەر پێداویستییەك، هەروەها وشەی (مِرْفَق) کە بە (مَرفِق)یش هاتوە و کۆیەکەیان (مرافق) دیسان هەموو ئەو شتانە پێداویستیین و، مرۆڤ لێیان بەهرەمەندن.

(أَسَاوِرَ): (جَمْعُ سِوَار، أَصْلُهُ فَارِسِي: دِستوار)، (أَساوِر) كۆی (سِوَار) بازن بە كوردیی، ئەویش لە (دِستوار)ی فارسییەوە هاتوە، یان لە زمانێكی دیكەی تێكەڵ و هاوبەش لە نێوان فارسیی و كوردیی دا، كە بریتیە شتێك لە دەست دەكرێ، بازن یان دەستەوانە.

(سُندُسٍ): (الدِّيْبَاجُ الرقيقُ)، (سُندُس) واتە: ئاوریشمی تەنك، كە لە ژێر جلان لەبەر كراوە، وەك: فانیلە و ... هتد.

(وَإِسْتَبْرَقٍ): (الدِّيْبَاجُ الغَلِيظ)، (إستبرق) ئاوریشمی ئەستوورە، كە لەسەر جلان لەبەركراوە.

دەگونجێ هەردووكیان ئەصڵەكەیان فارسیی بێ، یاخود هیندیی بێ، بەڵام هاتوونە نێو زمانی عەرەبییەوە.

(مُّتَّكِـِٔينَ): واتە: پاڵیان داوەتەوە، (المُتَّكَأ: مَوْضِعُ الإتِّكَاءِ)، (مُتَّكَأ) ئەو شوێنەیە كە ئینسان پاڵی لێداوەتەوە (قَالَ الأَخْفَشُ: الْمَجْلِسُ) واتە: مەجلیس، شوێنی لێی دانیشتن، (إتَّكَأَ: إعْتَمَدَ) واتە: شانی وێدا و پاڵی وێدا.

(ٱلْأَرَآئِكِ): (جَمْعُ الأرِيْكَة: حَجَلَةٌ عَلَى سَرِيرٍ، جَمْعُهَا أَرَائِك)، (أَرِيْكَة) یانی: تەخت، (حَجَلة) بریتیە لە پەردەیەك كە بەسەر تەختێكیان داداوە، كە شوێنی پاڵدانەوە و پشوودان بووە، (أريكة) بە (أرائك) كۆ دەكرێتەوە، واتە: ئەو تەخت و شوێنانەی خەڵكێكی خۆشگوزەران و دەوڵەمەند، كە بۆ پشوو لە سەردان و شان دادان و حەسانەوە، دانراون.

## مانای گشتی ئایەتەكان

خوا ﷻ لەم چەند ئایەتەدا، ژمارەیەك ڕێنمایی و ئامۆژگاریی، بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەخاتە ڕوو، دەفەرموێ: ﴿ وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَ ﴾، واتە: ئەوەی لە كتێبی پەروەردگارت بۆت سروش كراوەو بۆت نێردراوە، بیخوێنەوە، یاخود شوێنی بكەوە، (تَلاَهُ: قَرأَهُ، وَتَلاَهُ: تَبِعَهُ)، یانی: خوێندیەوە، شوێنی كەوت، (تلاوة) بە ڕای هەندێ لە زانایان: تایبەتە بە خوێندنەوەی، یان شوێنكەوتنی وەحیی خوا و كتێبە دابەزێنراوەكانی خواوە ﷻ، ﴿ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ ﴾، گۆڕەر یان: بگۆڕ بۆ وشەكانی خوا نیە، واتە: هیچ كەس ناتوانێ بیانگۆڕی و دەستكاریان بكات.

(كَلِمات) یش كۆی (كلمة)یه‌، واته‌: وشه‌كان، ده‌گونجێ مه‌به‌ست پێی وشه‌كانی خوا بێ، كه‌ فه‌رمووئی، ده‌شگونجێ مه‌به‌ست پێی بڕیاره‌كانی خوا بێ، چونكه‌ خوا ﷻ بڕیاره‌كانی خۆی به‌ وشه‌ ناوبردوون، وه‌ك له‌ سووره‌تی (یس)دا ده‌فه‌رمووێ: ﴿ إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ ﴾، واته‌: هه‌ر كارێك خوا ویستی بیكات، پێی بفه‌رمووێ: ببه‌، ده‌بێ، واته‌: خوا به‌ (وشه‌) ته‌عبیری كردوه‌ له‌ بڕیاره‌كانی خۆی.

﴿ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدًا ﴾، هه‌روه‌ها تۆ جگه‌ له‌ خوا، په‌ناگه‌یه‌كی دیكه‌ت چنگ ناكه‌وێ، یاخود هیچ ده‌رباز بوونێك بۆ تۆ نیه‌، جگه‌ له‌ خوا، یاخود له‌ به‌رانبه‌ر خوادا، تۆ ده‌رباز بوونت نیه‌، وشه‌ی (مُلْتَحَد) ده‌گونجێ: أ - ناوی شوێن (اسم مكان) بێ، ب - ده‌شگونجێ چاوگ (مصدر) بێ، واته‌: ده‌رباز بوون.

ئه‌وه‌ش به‌رپه‌رچدانه‌وه‌ی قسه‌ی كافره‌كانه‌، كه‌ داوایان له‌ پێغه‌مبه‌ری خاته‌م ﷺ ده‌كرد: قورئان ده‌ستكاریی بكات و بیگۆڕێ، ئه‌و شوێنانه‌ی كه‌ به‌ دڵی ئه‌وان نین! خوا ﷻ ده‌فه‌رمووێ: تۆ ئه‌وه‌ی له‌ كتێبی خوا بۆت سروش كراوه‌، بیخوێنه‌وه‌و شوێنی بكه‌وه‌و، گۆڕه‌ر نیه‌ بۆ وشه‌كانی خوا، چونكه‌ وشه‌كانی خوا هه‌موویان له‌ شوێنی خۆیاندان و، له‌ سه‌دا سه‌د ڕاستن و دادگه‌رانه‌ن.

هه‌روه‌ها هیچ په‌ناگه‌یه‌كیشت نیه‌، یانی: ئه‌گه‌ر گریمان سه‌رپێچیی له‌ فه‌رمانی په‌روه‌ردگارت بكه‌ی، هیچ په‌ناگه‌یه‌كت نیه‌، په‌نای پێ ببه‌ی و هیچ ده‌رباز بوونێكت نیه‌.

﴿ وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥ ﴾، خۆشت ڕاگره‌ له‌گه‌ڵ ئه‌وانه‌دا كه‌ به‌یانیان و ئێواران له‌ په‌روه‌ردگاریان ده‌پاڕێنه‌وه‌ و، ڕووی خوایان ده‌وێ، واته‌: ڕه‌زامه‌ندیی خوا، یاخود: دیداری خوا، یان: ئه‌وه‌ كه‌ خوا ﷻ ڕوویان تێبكات و گرنگییان پێبدات، وه‌ك له‌ كورده‌واریی خۆماندا ده‌ڵێن: خوایه‌! ڕووی ڕه‌حمه‌تی خۆمان تێبكه‌، یان: ڕووی ڕه‌حمه‌تمان لێ وه‌رمه‌گێره‌، واته‌: هیچ مه‌به‌ستێكی دیكه‌یان نیه‌، جگه‌ له‌وه‌ی په‌روه‌ردگاریان له‌ خۆیان ڕازیی بكه‌ن و، ڕوویان تێبكات به‌ ڕه‌حمه‌ت و، پاداشتیان بداته‌وه‌.

﴿ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ ﴾، چاوه‌كانی خۆتیان له‌سه‌ر لامه‌ده‌ و، چاوتیان له‌سه‌ر هه‌ڵمه‌نگێوه‌، یانی: كه‌ به‌ كه‌م بایه‌خ ته‌ماشایان بكه‌ی، یان كه‌سانێكی دیكه‌ت له‌وان له‌لا مه‌به‌ستتر بێ، ﴿ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾، له‌ ئه‌نجامی ئه‌وه‌دا چاوتیان له‌سه‌ر

لابدەی، کە جوانیی ژیانی دنیات بوێ! ﴿ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا ﴾، هەروەها گوێڕایەڵیی کەسێك مەکە کە دڵیمان لە یادی خۆمان بێ ئاگا کردوە، ﴿ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا ﴾، کەوتۆتە شوێن ئارەزووی و، حاڵی وی تێپەڕیوە و کاروباری زێدەڕۆیی تێدایە و زایەبووە، واتە: کەسێکی وا شایستەی ئەوە نیە، تۆ گوێی بۆ بگری و بە قسەی بکەی و، بەهۆی ئەوەوە: چاو لە بڕوادارانێك لابدەی، کە بەیانیان و ئێواران لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوەو مەبەستیان ڕەزامەندیی خوایە.

﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡ ﴾، بڵێ: هەق لە پەروەردگارتانەوەیە، یانی: هەق تەنیا لە پەروەرگارتانەوە دەردەکەوێ، ﴿ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ ﴾، ئنجا کێ حەز دەکات با بڕوابێنێ و، کێش حەز دەکات، با بێبڕوا بێ، دنیا جێگای تاقیکردنەوەیە.

﴿ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمۡ سُرَادِقُهَا ﴾، بێگومان ئێمە بۆ ستەمکاران ئاگرێکمان ئامادەکردوە کە سەرا پەردەکەی دەوری داون.

وشەی (سُرَادِق) لێرەدا مەبەست پێی سەراپەردەی ڕواڵەتیی نیە، بەڵکو مەبەست: ئەو دووکەڵ و بڵێسەیەیە کە بەرزبۆتەوە، بۆ ئەو شوێنەی کە ئەوانی تێدان، کە وەك سەراپەردەی لێهاتوە و دەوری گرتوون، ﴿ وَإِن يَسۡتَغِيثُواْ يُغَاثُواْ بِمَآءٖ كَٱلۡمُهۡلِ ﴾، ئنجا ئەگەر داد و فیغان بکەن و هاواریش بکەن، داوای کۆمەکیی و یارمەتیی بکەن، ئاوێکی گەرمیان لە فریا دەخرێ و بە هاناوە دەبردرێ، کە وەك کانزای تواوەیە، یان: وەك تڵتی زەیت وایە، کە زۆر گەرمە، یان: وەك کێم و زووخاوێکی گەرم وایە ﴿ يَشۡوِي ٱلۡوُجُوهَ ﴾، ڕووەکان دەبرژێنێ و دایاندەماڵێ، واتە: هەر کە ئەو ئاوە لە خۆیان نزیك دەکەنەوە، بۆ ئەوەی بیخۆنەوە، دەم و چاویان دەبرژێنێ و پێستی دەم و چاویان دادەماڵێ.

﴿ بِئۡسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتۡ مُرۡتَفَقًا ﴾، ئەو خواردنەوەیە، خراپترین خواردنەوەیە و، ئەو حاڵەی ئەوانی تێدان، خراپترین حاڵە و، ئەو شوێنەی کە ئەوان بە حیساب دەبێ تێیدا پشوو بدەن و ئیسراحەتی تێدا بکەن، خراپترین شوێن و شێوەی پشوودانە.

ئەوە بەنسبەت بێبڕوایانی ستەمکارەوە، ئەوە سەرەنجامی شوومیانە.

ئنجا دێتە سەر باسی بڕواداران و دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجۡرَ مَنۡ أَحۡسَنَ عَمَلًا ﴾، بە دڵنیاییەوە: ئەوانەی بڕوایان هێناوە و کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، کەسێك کاری چاك بکات، ئێمە پاداشتەکەی زایە ناکەین.

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾، ئا ئەوانە چەند باخ و بێستانێكی هەمیشەییان هەن، واتە هەمیشە سەوزن و بەردەوام بەر و میوە دەردەكەن و، ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، واتە: ڕووبار بە ژێر كۆشكەكان و خانووبەرەكانیاندا دەڕۆن، ﴿ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ ﴾، لەوێدا دەڕازێنرێنەوە (لەو بەهەشتەدا) بە بازنی زێڕ.

(أَسَاوِر) كۆی (سِوَار)ە، واتە: بازن، ئەوەی لە دەست دەكرێ.

ئەو بازنانەش لە زێڕ دروست كراون و، لە شوێنی دیكە باسی گەوهەر (لؤلؤ) دەكات، واتە: لە گەوهەر دروست كراون: ﴿ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا ۖ وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴿٣٣﴾ ﴾ فاطر ﴿ وَيَلْبَسُونَ ثِيَابًا خُضْرًا ﴾، پۆشاكی سەوزیش دەپۆشن، ﴿ مِّن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ ﴾، لە ئاوریشمی تەنك و ئاوریشمی ئەستوور، تەنكەكە، لەسەر پێست لەبەر كراوە و، ئەستوورەكەش لەسەر پۆشاك، یانی: لەسەر پۆشاكی نێوەوە، ﴿ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ ﴾، لەسەر تەختان پاڵیان داوەتەوە.

(إتكاء) بریتیە لەوەی ئینسان پاڵبداتەوە، یانی: لەسەر تەنیشتی و لەسەر ئانیشكی پاڵبداتەوە.

(أَرَائِك)یش كۆی (أرِيكَة)یە، كە بریتیە لە تەختێك پەردەی بەسەرەوە بێ، (سَرِيرٌ عَلَيهِ حَجَلَة)، (حَجَلَة) بریتیە لە پەردەیەكی وەك گومبەز، بەسەر تەختەكەدا دەدرێ، ﴿ نِعْمَ ٱلثَّوَابُ وَحَسُنَتْ مُرْتَفَقًا ﴾، ئەو پاداشتە باشترین پاداشتەو، ئەو جێگا و ڕێگا و شوێنی تێدا پشوودانەش، باشترین شوێنی پشوودان و ئیسراحەتە.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**خوا ﷻ بە پێغەمبەری ﷺ فەرمووە: ئەوەی لە کتێبی پەروەردگارت بۆت سروش کراوە، بیخوێنەوە و شوێنی بکەوە، هیچ گۆڕەرێك بۆ وشەکانی (خوا) نیە و، جگە لەوی، هیچ پەناگەیەکت چنگ ناکەوێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدٗا ﴿٢٧﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَۖ ﴾، (و)ی بادانەوە (**عطف**) ئەم مەبەستە، دەگێڕێتەوە بۆ سەر مەبەستەکانی پێشێ، یانی: هەروەها سەرەڕای ئەوانەی پێشێ، ئەوەی لە کتێبی خواش بۆت سروش کراوە، بیخوێنەوە و شوێنی بکەوە.

(**التِّلَاوَةُ: هِيَ القِرَاءَةُ وَالإِتِّبَاع**)، (تِلَاوَة) بریتیە لە خوێندنەوە و شوێنکەوتن، کە لێرەدا مەبەست خوێندنەوەی کتێبی خوای پەروەردگارە، واتە: گرنگیی و بایەخ مەدە بە کافرەکان و، ڕق هەستانیان لە کتێبی خواو، ئەوەی بۆت سروش کراوە لە کتێبی خوا، تاکو ئەو کاتەی ئەم سوورەتە دابەزیوە [کە پێشتر گوتمان: (٦٨)ەمین یان (٧٠)یەمین سوورەتە] شوێن ئەوە بکەوە و بیخوێنەوەو پەیڕەویی لێبکەو، گوێ بەوانە مەدە، کە دژایەتیی قورئان دەکەن.

٢)- ﴿ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ ﴾، گۆڕەر نیە بۆ وشەکانی، (لا) لێرەدا: (**هِيَ النَّافِيَةُ للجِنْس**)، بۆیە ئەوەی دوای خۆی (**مَنْصوب**) دەکات، وەك: (**لا إله إلاّ الله**).

ئەم ڕستەیە لێرەدا دوو مانایان هەڵدەگرێ:

أ - مەبەست ئەوەیە هیچ کەس مۆڵەتی نیە، دەستکاریی وشەکان و فەرمانەکانی خوای پەروەردگار بکات، (**وَالمُرَادُ نَفِيُ الإِذْنِ فِي أَنْ يُبَدِّلَ أَحَدٌ كَلَامَ اللَّه**).

ب - دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ، ئەگەر بشویسترێ: وشەکانی خوا (قورئان) بگۆڕرێن و وشەیەك لە شوێن وشەیەکی دیکە دابنرێ، وەك دەستکاریی کردن و گۆڕین، هەر ناتوانرێ، بۆچی؟ چونکە خوای پەروەردگار، ئەو کۆتا کتێبەی خۆی پاراستوە لە دەستکاریی کردن و گۆڕان.

هەڵبەتە دەشگونجێ - وەك پێشتر گوتمان - مەبەست لە (کلمات) بڕیارەکانی خواو حوکمە قەدەرییەکانی و گەردوونییەکانی بێ، بەڵام بە پێی سیاق زیاتر وا پێدەچێ: مەبەست لە (کلمات) وشەکانی کتێبەکەی و، فەرمایشتەکەی بن.

٣)- ﴿ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلْتَحَدًا ﴾، تۆ جگە لە خوا پەناگەیەکی دیکەت چنگ ناکەوێ.

(المُلتَحَد: اسم مَكَانٍ مِيمِي: وَهُوَ مكان الإلتِحَاد، وهو الميلُ إلى جَانِبٍ، وصيغة الإفْتِعَال، لأن أصله تَكَلُّفُ الميل)، وشەی (ملتحد) ناوی شوێنە، واتە: شوێنی (إلتحاد) کە بریتیە لە (مَیْل)، واتە: شوێنێکت چەنگ ناکەوێ، کە بۆ لای بچی، بۆیەش لەسەر کێشی (إفتعال) هاتوە، چونکە لە ئەصڵدا (ملتحد) شوێنێکە ئینسان دەبێ خۆی تەزیەت بدات، تاکو دەیدۆزێتەوە.

واتە: هیچ شتێك تۆ لە سزای خوا پەنا نادات و ناتپارێزێ و چەپاڵەت نادات، ئەگەر دەستکاریی یەکێ لە وشەکانی خوا بکەی، ئنجا ئەم مەبەستە لە چەند شوێنێکی دیکەش لە قورئاندا هاتوە، کە ئەمە زیاتر بەرپەرچدانەوەی داوا و تەکلیفی کافرەکان بووە و داوایان لە پێغەمبەر ﷺ کردوە: دەستکاریی قورئان بکات، یاخود ئەو شوێنانەی بە دڵی ئەوان نین، بیانگۆڕێ، بۆ ئەوەی کە بە دڵی ئەوانە، وەك لە سوورەتی (الحاقة)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾، واتە: ئەگەر قسەی بەدەم ئێمەوە هەڵبەستبایە، قۆڵی ڕاستمان دەگرت، دوایی ڕەگی ملیمان دەبڕی و، هیچ کام لە ئێوەش نەتاندەتوانی بکەونە بەینەوە {کە نەهێڵن، ئێمە سزای بدەین}.

**مەسەلەی دووەم:**

**هەروەها لەگەڵ لەوانەدا کە بەیانیان و ئێواران لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە و، ڕوو و ڕەزامەندیی ویان دەوێ، ڕووی خۆت ڕابگرە و، چاوتیان لەسەر لامەدە، بە هۆی ویستنی جوانیی ژیانی دنیاوە و بە قسەی کەسێکیش مەکە، کە دڵیمان لە یادی خۆمان بێ ئاگا کردوە و، شوێنی ئارەزووی کەوتوە و کاری کراوە و، سەری بە فەتارەت چووە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ﴿٢٨﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم﴾، خۆت ڕابگرە، لەگەڵ ئەوانەدا کە لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ﴾، (أي: إحْبِسْهَا مَعَهُم حَبْسَ مُلَازَمَةٍ، وَضُمِّنَ مَعْنَى المُلَازَمَةِ، إذْ عُلِّقَ بِهِ ظَرْفُ «مع»)، واتە: خۆت ڕابگرە و خۆت بهێڵەوە بە شێوەیەك پەیوەست بێ، لێرەدا (اصبر) مانای لەگەڵدا بوون و لێ جیانەبوونەوەی خراوەتە نێو، چونکە (ظَرْف)ی لەگەڵ (مع)ی پێ هەڵواسراوە و پێوە پەیوەست کراوە.

٢)- ﴿بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ﴾، بەیانیان و ئێواران، خوێنراویشەتەوە: (بالغُدْوَةِ)، بەڵام زیاتر (بِٱلْغَدَوٰةِ) هاتوە، یانی: بەیانیان، (وَٱلْعَشِيِّ) واتە: ئێواران، بێگومان لێرەدا مەبەست ئەوەنیە کە تەنیا بەیانیان و ئێواران، لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە، بەڵام ئەو دوو کاتە، کاتێکی زۆر هەست بزوێنن و گەلێك سەرنج ڕاکێشن، چونکە بەیانیان هێمای پەیدابوونی بوون (وجود)ە کە دەست پێدەکات و، ئێوارانیش ڕەمزی کۆتایی پێهاتنە، واتە: لە بەیانییەوە تاکو ئێوارە و، لە ئێوارەوە تاکو بەیانیی لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە، واتە: هەمیشە و بەردەوام لێی دەپاڕێنەوە.

٣)- ﴿يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ﴾، ڕووی ئەویان دەوێ، دەگونجێ لێرەدا مەبەست ئەوەبێ کە دەیانەوێ: خوا ڕووی خۆیان پێشان بدات، خوا ببینن و بە دیداری شادبن، یاخود مەبەست لە (وَجْهَهُۥ) ڕەزامەندیی خوایە، دەگوترێ: ڕووی نەدایە، واتە: لێی ڕازی نەبوو، یان ڕووی لێ وەرگێرا، یانی: لێی توورە بوو، ئەو تەعبیرانە لە زمانی کوردیی و عەرەبیی و هەموو زمانەکانی دیکەشدا هەن.

یاخـود: (الوجـه: مَجَـازٌ في إقبَالِـهِ عـلى العبـد)، (وجـه) مەجـازە بـۆ ڕووتێکـردنی خـوا لـە بەندەکـەی، واتـە: دەیانـەوێ خـوا ﷻ ڕوویـان تـێ بـکات و گرنگییـان پێبـدات.

٤)- ﴿وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ﴾، دوو چاوی خۆتیان لەسەر لامەدە، لێرەدا (نهي العينين عن أن تعدوا عن الذين يدعون ربهم بالغداة والعشي، أي: أن تُجَاوِزاهم، وَالمَقْصُودُ: الإِهْمَالُ، وَضُمِّن فعل العَدْوِ معنى الإعراض، فعُدِّي بـ «عن»، عَدَاهُ: جَاوَزَه)، لێرەدا خوا ﷻ تەعبیرەکەی وا بەکارهێناوە ڕێگریی (نهي) لە چاوەکان دەکات، کە لەسەر ئەوان هەڵبنگوێن و، ئەوان ببوێرن، یانی: چاوەکان لەسەر ئەوان لابچن، با دوو چاوەکەت لەسەر ئەوان لانەچن، واتە: پشت گوێیان مەخە.

وشـەی (عَـدْو)ش بـە مانـای لـێ تێپەڕیـن و لادان، دێ: مانـای پشتگوێخـستنی خراوەتـە نێـو، بەهـۆی ئـەوەوە کـە: بـە (عـن) بـەرکاری خواسـتوە (عَـدَاهُ: جَـاوَزَه)، (عَـدَاهُ) واتـە: لێـی تێپـەڕی، بـەڵام کـە بـە (عـن) تەعـەددای کـردوە بـۆ (مفعـول بـە)، واتـە: پشـتگوێی خسـت، یـانی: وێـڕای مانـای خـۆی مانایـەکی دیکـەش دەبەخشـێ، بەهـۆی ئـەوەوە کـە بـە (عـن) بـەرکاری ویسـتوە، ئەویـش بریتیـە لـە: پشـتگوێ خسـتن.

٥)- ﴿تُرِيدُ زِينَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾، بە هۆی ئەوەوە کە جوانیی ژیانی دنیات دەوێ، واتە: با ویستنی جوانیی ژیانی دنیا، نەبێتە هۆی ئەوەی تۆ پشت لەو بڕوادارانە بکەی، کە لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە، بەیانیان و ئێواران و تەنیا ڕەزامەندیی پەروەردگاری خۆیانیان دەوێ.

٦)- ﴿وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَن ذِكْرِنَا﴾، بە قسەی کەسێك مەکە و گوێڕایەڵیی مەکە، کە دڵیمان لە یادی خۆمان بێ ئاگا کردوە.

واتـە: داواکارییەکانیـان گـوێ پێمـەدەو، وەڵامیـان مـەدەوە، (إغفـال) بریتیـە لـە پەیداکـردنی بێئاگایـی (إیجـاد الغفلـة)، بـەڵام بێگومـان خـوا ﷻ کـەس لـە خـۆوە بـێ ئـاگا نـاکات، یـانی: بـە پێـی یاسـایەك کـە خـوا لـە ژیـانی بەشـەردا دایـناوە: کەسـێك هـەر خەریـکی دنیایـەو، خەریـکی ڕابـواردن و تێرکـردنی غەریزەکانیـەتی و، ئـاوڕ لـە خـواو لـە ڕۆژی دوایـی ناداتـەوە، سـەرەنجام دڵـی مـۆر دەکـرێ و دڵـی ڕەش دەبـێ، وای لێـدێ: بـێ ئـاگا دەبـێ لـە خـوا.

٧)- ﴿وَاتَّبَعَ هَوَاهُ﴾، کەسێك کە کەوتۆتە شوێن ئارەزووی خۆی، واتە: لە ئەنجامی ئەوەدا کە لە خوا دوورکەوتۆتەوە، کەوتۆتە شوێن ئارەزووی، یاخود لە ئەنجامی شوێنکەوتنی ئارەزووی خۆیدا، لە یادی خوا بێ ئاگا بووە، ئەو دووانە هەردووکیان کاریگەرییان لەسەر یەکدی هەیە، هەر کەسێ لە یادی خوا بێ ئاگا بێ، ئارەزوو پەرستیی دێتە نێو دڵ و دەروونیەوە، لە جیاتی خواپەرستیی و، هەر کەسێکیش شوێن ئارەزووی بکەوێ، لە خوا دوور دەکەوێتەوە وە، خوا فەرامۆش دەکات.

٨- ﴿وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطًا﴾، کاری وی تێپەڕیوەو، زایە بووە، واتە: سەری بە فەتارەت چووە.

ئـەم ئایەتـە موبارەكـە، وەك ئایەتـەكانی: (٥٢ - ٥٥)ی سـووڕەتی (الأنعـام)ن، كـە ئێمـە لـە بەرگـی پێنجەمـی ئـەم تەفسـیرەدا، بـە تەفصیـڵ شـیمان كردوونـەوە:

﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَيْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٥٢﴾ وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓا۟ أَهَـٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿٥٣﴾ وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَـٰتِنَا فَقُلْ سَلَـٰمٌ عَلَيْكُمْ ۖ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ ۖ أَنَّهُۥ مَنْ عَمِلَ مِنكُمْ سُوٓءًۢا بِجَهَـٰلَةٍ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَصْلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْـَٔايَـٰتِ وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٥٥﴾ ﴾.

كەواتـە: وادیـارە سـەرەتا كافـرەكان داوای دەركـردنی بـڕواداره ڕەش و ڕووتەكانیـان كـردوه، دواتـر كـە پێغەمبـەر مـلی نـەداوه، بـە ئەوەنـده وازیـان هێنـاوه، كـە پشـتگوێ بخرێـن، چونكـە سـووڕەتی (الأنعـام) پێـش سـووڕەتی (الكهـف) دابەزیـوه، لـە سـووڕەتی (الأنعـام)دا كافـرەكان داوایـان لـە پێغەمبـەر ﷺ كـردوه، كـە ئـەو ڕەش و ڕووتانـە دەربـكات، وەك لـە هـۆی هاتنـەوه خوارەوەكـەی، لـە كاتی خۆیـدا، باسـمان كـردوه، بۆیـە خـوا لـە وەڵامـی ئەوانـەدا دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ﴾، ئەوانـە دەرمەكـە كـە بەیانیـان و ئێـواران، لـە پەروەردگاریـان دەپاڕێنـەوه و، ڕوو و ڕەزامەندیـی خوایـان دەوێ.

بێگومـان ڕەوشـتی پێغەمبـەر ﷺ لـەوه بەرزتـر بـووه، كـە لـە مەجلیسـی خـۆی دەریـان بـكات، بـەڵام بۆیـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: دەریـان مەكـە، چونكـە خـوای بـەرز ﷻ هەمـان وشـەی كافـرەكانی بـەكار هێناوەتـەوه، كـە گوتوویانـە: (أطـرد هـؤلاءِ) واتـە: ئەوانـە دەربكـە! بـەڵام لێرەدا [لـە سـووڕەتی (الكهـف)] دوای ئـەوەی نائومێـد بـوون لـەوەی پێغەمبـەر ﷺ ئـەو بـڕواداره ڕەش و ڕووتانـە، دەربـكات، لـە كـۆڕ و مەجلیسـەكانیدا، ئەوجـار داوای دەركردنیـان نەكـردوه، بەڵكـو بـەس داوایـان كـردوه: گرنگیـی و بایەخیـان پـێ نـەدات و، ڕوویـان لـێ وەربگێـڕێ، خـواش ﷻ ئامۆژگاریـی كـردوه، كـە: نەخێـر، ئەوەشـت بـۆ نیـە و، نابـێ ئـەوەش بكـەی و لـە خـۆی بوەشـێنیتەوه، ئنجـا ئامانـج لـەو ئایەتـە و، چـوار (٤) ئایەتـەكانی سـووڕەتی (الأنعـام): خسـتنە ڕووی ئـەو ڕاستییەیە: كـە ئیسـلام لەگـەڵ سـتەمدیدان و بەشـخوراواندایە و، دژی سـتەمكارانە و دژی ئەوانەیـە كـە لەسـەر حیسـابی كۆمەڵـگا و خەڵكانێـكی ڕەش و ڕووت، عەیـش و نـۆشی ناشـەرعییانە بـۆ خۆیـان ڕێـك دەخـەن، كـە ئـەو جـۆره كەسـانە، بـە هیـچ جۆرێـك نابـێ: ئەوانـەی خۆیـان بـە شـوێنكەوتەی پێغەمبـەر ﷺ دەزانـن، لێیـان نزیـك ببنـەوه، بـە لـێ نیزیـك بوونەوەیـەك كـە بـە قسـەیان بكـەن و، بكەونە ژێـر كاریگەریـان و، سـەرەنجام خەڵـكی ڕەش و ڕووت پشـتگوێ بخـەن و، بەبـێ بایـەخ تەماشـایان بكـەن.

**مەسەلەی سێیەم:**

**بڵێ: هەق لە پەروەردگارتانەوەیە، کێ دەیەوێ با بڕوابێنێ و، کێش دەیەوێ با بێبڕوابێ، ئێمە ئاگرێکمان بۆ ستەمکاران سازکردوە، کە بڵێسە و چڕە دووکەڵەکەی دەوری داون، وەك سەراپەردەو، ئەگەر هاوار بکەن، ئاوێکیان بە هاوارەوە دەبردرێ، وەك کانزای قاڵبووەوەیە، هێندە گەرمە کە ڕووەکانیان دەبرژێنێ و، ئەو خواردنەوەیە، خراپترین خواردنەوەیەو، ئەو جێیەش خراپترین جێیە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمۡ سُرَادِقُهَاۚ وَإِن يَسۡتَغِيثُواْ يُغَاثُواْ بِمَآءٖ كَٱلۡمُهۡلِ يَشۡوِي ٱلۡوُجُوهَۚ بِئۡسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتۡ مُرۡتَفَقًا ﴿٢٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡ ﴾، بڵێ: هەق لە پەروەردگارتانەوەیە.

لە ڕووی ڕێزمانییەوە:

أ - دەگونجێ (الحق) (خبر)ی (مبتدأ)یەکی قرتێنراو بێ، واتە: (وقل: هَذا الحقُّ، مِنْ ربِّكُم) بڵێ: ئا ئەم حەقە، لەپەروەردگارتانەوەیە.

ب - دیسان دەگونجێ (الحق) (مبتدأ) بێ و (من ربكم) (خبر)ەکەی بێ، واتە: (الحَقُّ كَائِنٌ من ربِّكُم)، واتە: هەق تەنیا لە پەروەردگارتانەوە هەیە.

یان: ئەم هەقە لە پەروەردگارتانەوەیە، کە لە قورئاندا بەرجەستە بووە.

٢)- ﴿ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن ﴾، ئنجا کێ دەیەوێ: با ئیمان بێنێ لە داهاتوودا، یان کەسێك بڕوای هێناوە، با بەردەوام بێ لەسەر بڕوایەکەی.

٣)- ﴿ وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ ﴾، کێش دەیەوێ، با بێبڕوا بێ، ئەگەر بڕواشی هێناوە، ئەگەر دەیەوێ، ڕێی لێنەگیراوە، هەڵگەڕێتەوە [1]، یاخود: ئەگەر کافریش بووە لە ڕابردوودا، با لەسەر کوفرەکەی بەردەوام بێ، هەردوو واتەکە دەبەخشێ.

---

(١) لە نامیلکەی: (حوکمی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام و هەڵسەنگاندنێك)دا، کە لە ئەسڵدا بەشێکی بابەتێکە لە کتێبی دووەمی (ئیسلام و دەوڵەتداریی) بە درێژیی باسی ئەو مەسەلەیەمان کردوە، هەروەها لە کتێبی دوازدەیەمی مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)دا، چاپی دووەمی/٢٠١٩ز.

٤)- ﴿إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا﴾، ئێمە ئامادەمان كردوە بۆ بێبڕوایانێكی ستەمكار، ئاگرێك، (التنوين في «نارًا» للتهويل وَالتَّعْظِيم) وشەی (نارًا) لە زمانی كوردیشدا دەڵێن: (ئاگرێك) یاخود (مارێك) ئەو تەنوینە كە دەچێتە سەری، بۆ نەناسراوكردن (تنكیر)ە، بەڵام یانی: زۆر زەبەلاح و بێ ڕەزا، كە ناگونجێ بزانرێ.

٥)- ﴿أَحَاطَ بِهِمۡ سُرَادِقُهَا﴾، [ئەو ئاگرە] سەراپەردەكەی دەوری داون.

(سرادق) لە سەراپەردەی فارسییەوە هاتوە، هەندێكیش گوتوویانە: (سرادق لە سَرأُطاق)[1]ەوە هاتوە، كە لێرەدا خوا: دووكەڵ و بڵێسەی ئەو ئاگرە دەچوێنێ بە سەراپەردە، كە وەختی خۆی پەردەیان بەسەر هەیوان و پێش دەرگای ماڵاندا داوە، بۆ سێبەر، یاخود وەك نوایەك، دۆزەخیش بڵێسەی ئاگرەكەی ئاوایە، وەك سەرا پەردەیەك دەوری داون.

٦)- ﴿وَإِن يَسۡتَغِيثُواْ﴾، ئەگەر هاوار بكەن و داوای یارمەتیی بكەن (الإِسْتِغَاثَةُ: طَلَبُ الغَوْثِ وَهُوَ الإِنقَاذُ مِنَ الشِّدَّة) (إِسْتِغَاثَة): بریتیە لە داواكردنی یارمەتیی، بۆ دەربازكران لە سەختیی و ناڕەحەتیی.

٧)- ﴿يُغَاثُواْ بِمَآءٖ كَٱلۡمُهۡلِ﴾، ئەگەر هاوار بكەن و داوای كۆمەكیی بكەن: ئاوێكیان دەفریا دەبردرێ، وەك كانزای تواوەیە، (مُهْل) یانی: كانزای تواوە، یان: تڵتی زەیت، زەیت كە قاڵ دەكرێتەوە، تڵتەكەی زۆر گەرمە، یاخود: كێم و زووخاو، یاخود: مسی تواوە (مُهْل) ئەوانە هەموویان دەگرێتەوە.

٨)- ﴿يَشۡوِي ٱلۡوُجُوهَ﴾، ڕووەكان دەبرژێنێ و دایاندەماڵێ، كاتێ بابای دۆزەخیی ئەو (مُهْل)ە لە خۆی نیزیك دەخاتەوە، بۆ ئەوەی بیخواتەوە، بە تینی گەرمایەكەی دەم و چاوی دادەماڵێ.

٩)- ﴿بِئۡسَ ٱلشَّرَابُ﴾، ئەو خواردنەوەیە، خراپترین خواردنەوەیە، (المخصوص بالذم مَحْذُوف، يَعْنِي بئس الشَّرَاب هَذَا الماءُ) ئەوەی تایبەت دەكرێ بە زەم، دەقرتێنرێ، چونكە بە سیاق و سەلیقە، دەزانرێ، واتە: ئەو ئاوە، خراپترین خواردنەوەیە.

١٠)- ﴿وَسَآءَتۡ مُرۡتَفَقًا﴾، هەروەها ئەو شوێنەی كە بە حساب بۆ پشوودانە، خراپترین شوێنە، كە بێگومان ئەوە جۆرێكە لە گاڵتە پێكردن.

وشەی (ساء)ش كاری (بئس) دەكات (بئس الشَّرَاب) یاخود: (ساء الشَّرَاب) هەمان مانا دەگەیەنن، وشەی (مُرۡتَفَقًا) (تمییز)ە، ئەوەش كە تایبەتكراوە بە زەم كردنەكە، قرتێنراوە، لەبەر ئەوەی پێویست نەكراوە و، سیاقەكە دەیگەیەنێ، شێوازی قرتێنران (حذف)یش لە قورئاندا، زۆر زۆرە، چونكە یەكێ لە هەرە ڕووە گرنگەكانی ڕەوانبێژیی، ئەوەیە كە قسە، وشەكانی كەم بن و، مانای زۆر بێ، ئەویش بەوە دەبێ كە: هەر وشەیەك پێویست نەكات، باسبكرێ بقرتێنرێ و لابرێ، بۆ ئەوەی وشەكان كەم ببنەوە و مانایان زیاتر بێ.

---

(١) سر أطاق : یانی: سەربانی ژوور.

**مەسەلەی چوارەم و كۆتایی:**

**بـە دڵنیایـی ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە و كـردەوە باشـەكان دەكـەن، ئێمـە پاداشـتی كەسێك كاری چـاك بـكات، زایـە ناكەیـن، ئەوانـە چەنـدان بـاخ و بێسـتانی هەمیشـەییان هـەن، كـە ڕووبـار بـە ژێـر كۆشـكەكانیاندا دەڕۆن، بـە بازنـەی زێڕیـن دەڕازێنرێنـەوە و، پۆشـاكی سـەوز لـە ئاوریشـمی تەنـك و ئەسـتوور دەپۆشـن، لەسـەر تەختـان پاڵیـان داوەتەوە، ئـەوە باشـترین پاداشـتەو، چاكتریـن جێـگاو شـوێنە:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجۡرَ مَنۡ أَحۡسَنَ عَمَلًا ﴿٣٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ وَيَلۡبَسُونَ ثِيَابًا خُضۡرٗا مِّن سُندُسٖ وَإِسۡتَبۡرَقٖ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِۚ نِعۡمَ ٱلثَّوَابُ وَحَسُنَتۡ مُرۡتَفَقٗا ﴿٣١﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾، خوا دەفەرموێ: بە دڵنیاییەوە ئەوانەی كە بڕوایان هێناوە و، كاری چاكە ئەنجام دەدەن.

لـە زۆر شـوێنی قورئـان دا ئـەم تەعبیـرە دووبـارە بۆتـەوە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەوانـەی كـە بڕوایـان هێنـاوە، بڕوایـان بەچـی هێنـاوە؟ خـوای زانـا وشـارەزا ئـەوەی قرتانـدوە، واتـە: بڕوایـان بـە هەمـوو ئـەو شـتانە هێنـاوە، كـە پێویسـتە ئیمانیان پـێ بهێنـدرێ، (**آمنوا بكل ما يجب الإيمان بە**)، یـانی: ئیمانیـان هێنـاوە بـە خـوا ﷻ، بـە كتێبـەكانی خـوا، بـە فریشـتەكانی خـوا، بـە پێغەمبـەران (**عليهـم الصلاة والسلام**)، بـە ڕۆژی دوایـی، بـە قـەدەر، هەروەهـا بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی دیكـە كـە پێویسـتە ئیمانیـان پـێ بهێنـرێ، ﴿ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾، (**الصالحات**) (**صفة موصوفٍ محذوف**)، واتـە: (**عملـوا الخصـال الصالحـات**) خەسـڵەتە چاكەكانیـان ئەنجامـداون، یـان: (**عملـوا الأعـمالَ الصالحـات**) كـردەوە باشـەكانیان ئەنجامـداون، ئنجـا ئـەو خەسـڵەت و كـردەوە چاكانـە، چ پەیوەندییـان بـە ئیمـان و عەقیـدەوە هەبـێ، چ پەیوەندییـان بەعیبادەتەكانـەوە هەبـێ، چ پەیوەندییـان بەلایـەنی ڕەوشـت و ئـاكارەوە هەبـێ، چ بـە ئەدەبـە كۆمەڵایەتییەكانـەوە هەبـێ و، چ پەیوەندییـان بـە ژیـان و گـوزەران و كارو كەسـابەتەوە،

هەبێ، بەلایەنی ئابوورییەوە هەبێ، چ بەلایەنی سیاسەتەوە هەبێ، هەموویان دەگرێتەوە، بێگومان ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ و، کردەوە باشەکانیشیان ئەنجامداون.

٢)- ﴿إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا﴾، بە دڵنیایی ئێمە کەسێك کرداری باش بکات، پاداشتەکەی زایە ناکەین.

ئەمەش لە زۆر شوێن دا خوای پەروەردگار فەرموویەتی، یان شێوەی ئەوەی فەرمووە، بۆ وێنە، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢٠﴾﴾التوبة، هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٧١﴾﴾آل عمران، لە گەلێك شوێن دا خوا ﷻ ئەوەی جەختکردۆتەوە، کە پاداشتی چاکەکاران و، پاداشتی بڕواداران خوا زایەی ناکات و، فەرامۆشی ناکات و، ڕەنج بە خەسار نابن.

٣)- ﴿أُولَٰٓئِكَ لَهُمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ﴾، واتە: ئا ئەوانە چەند باخ و بێستانێکی هەمیشەییان هەن.

(عَدَنَ بالبلد: توطَّنَهُ)، واتە: لەوێ نیشتەجێبووم، ﴿جَنَّٰتُ عَدْنٍ﴾، (جنّاتُ إقامةٍ)، چەند باخ و بێستان و گوڵ و گوڵزارێك کە هەمیشەیین، شوێنی تێدا نیشتەجێ بوونن بەردەوامن و لە بەین ناچن.

٤)- ﴿تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ﴾، واتە: ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن.

بەتەئکید مەبەست ئەوەیە کە ڕووبار بە ژێر کۆشکەکانیاندا دەڕۆن، ئەگەرنا ئینسان ئاوی بە ژێر دابێ، ئیسراحەت ناکات، دەگوترێ: ئاویان لە ژێر کرد، یانی: دەریان پەڕاند، بەڵام کە ئەوان لە نێو کۆشکەکاندان، ئاویش بە دامێن کۆشکەکاندا دەڕوات، هەروەها بە ژێر کۆشکەکان دا، دیسان مەبەست ئەوەنیە کە ڕووبارەکان بەبن بناغەی کۆشکەکاندا بڕۆن! بەڵکو یانی: بە دامێن و دەوروبەری کۆشکەکانیاندا، ئەو کانیی و سەرچاوانە دەڕۆن.

٥)- ﴿يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ﴾، دەڕازێنرێنەوە لەوێدا (لەو بەهەشتانەدا) بە بازنی لە زێڕ، (التَّحْلِيَةُ: التزيين والحِلْيةُ: الزِّينَة)، (تحلية) و (تزيين) ڕازاندنەوە، چونکە (حلية) واتە: خشڵێك و جوانییەك کە ئینسان پێی دەڕازێندرێتەوە، ئنجا یەکێك بۆی هەیە بڵێ: بۆچی خوا ﷻ لە قورئاندا بە زۆریی کە باسی پاداشتێکی خۆی بۆ بڕواداران دەکات، باسی باخ و گوڵ و گوڵزار و کانیی و ڕووبار و کۆشك و تەلاران دەکات؟ دەڵێین: خوا ﷻ بە پێی عەقڵی خۆمان ئێمە دەدوێنێ:

هەموو مرۆڤەكان كەیفیان بە سەوزایی و، بە باخ و گوڵ و گوڵزار دێ، كەیفیان بە كانیی و ڕووبار و كۆشك و تەلاری بەرز دێ، خوای پەروەردگاریش بە پێی سروشتی ئێمە، پاداشتی ئێمە دەداتەوە، و بە پێی عەقڵی ئێمە و، بەو موفرەدانەی كە ئێمە تێیان دەگەین، ئێمە دەدوێنێ، ئەگەرنا مەرج نیە ئەوەی كە لە بەهەشتدا هەبێ، هەروەك ئەوەبێ كە لەدنیادا هەیە، بەڵكو زۆر لەوە بەرزترە، وەك لە سوورەتی (البقرة)دا كە دەفەرموێ: ﴿ وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهٗا ﴾، واتە: ئەوەی كە بۆیان هێنرا، لە نازو نیعمەتی بەهەشت، وێچوو بوو، واتە: لە نیعمەتەكانی دنیا دەچوون، یاخود نیعمەتەكانی بەهەشتی وێك دەچوون.

عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) دەڵێ: ئەوەی كە خوا باسی دەكات لە نازو نیعمەتی بەهەشت لە چاو ئەوەی دنیا، تەنیا لە ناودا یەك دەگرنەوە، بەڵام لە نێوەڕۆكدا جیاوازییان ئاسمان و ڕێسمانە.

هەڵبەتە هەرواش مەنتیقییە: چونكە خوا ژیانێكی دنیا كە لە قەدەر شەست حەفتا (٦٠ - ٧٠) ساڵێك داناوە و، بۆ كافر و مسوڵمان داناوە و، بە زۆریی بێبڕوایان و ناحەزانی خواش، لە ژیانی دنیا بەهرەمەندن، چونكە ئەوان دەیكەن بە ئامانج و، تەنیا دنیاش شك دەبەن و، دوارۆژ نابینن، بۆیە هەموو ئیهتیمام و توانای خۆیانی بۆ یەكلایی دەكەنەوە!

ئنجا ئایا دنیایەك كە خوا ئاوا بەو شێوەیە وەك جێی تاقیكرانەوە دروستی كردوە، لە چاو بە هەشتێك و نازو نیعمەتی نێو بەهەشتێك، كە بۆ ژیانێكی هەتا هەتایی و تەنیا بۆ ئەوانەی كە دۆستی خوان و خۆشەویستی خوان دروستیكردوە، بێگومان دەبێ زۆر لە یەك جیا بن.

هەندێك لە خەڵكی عەلمانیی، یاخود ئەوانەی كە ناحەزی ئیسلامن، دەڵێن: لەبەر ئەوەی خوا ﷻ قورئانی سەرەتا بۆ گەلی عەرەب دابەزاندوەو، ئەوانیش لە بیابان بوون و، گرنگترین شت بەلایانەوە: كانیی و كانیاو ڕووبارو، باخ و باخات و بێستان بووە، بۆیە باسی ئەوشتانەی كردوە! دەڵێین: بەڵێ، لەسەرێكەوە ئەوە وایە و، بەتەئكید بۆ كەسێك بیابانشین بێ، گرنگترین شت بەلایەوە: كانیی و كانیاو سەرچاوەو ئاوەو، هەروەها سەوزایی و باخ و گوڵزارە، بەڵام ئەوە تەنیا بۆ ئەوان وانیە، بەڵكو بۆ هەموو مرۆڤەكان هەر وایە، بە بەڵگەی ئەوە كە هەموو مرۆڤەكان لە هەموو شوێنەكانی دنیادا، گرنگیی دەدەن بە سەوزایی و ڕووبار و جۆگاو كانیی و سەرچاوە، كەواتە: ئەوە شتێكی زگماك و خواڕسكە لە هەموو بەشەرداو، تەنیا تایبەت نیە بە عەرەبە بیابانشینەكانەوە.

٦)- ﴿ وَيَلۡبَسُونَ ثِيَابًا خُضۡرٗا ﴾، پۆشاكی سەوز دەپۆشن.

لەبەرئـەوەی ڕەنگــی ســەوز ڕەنگێــکی زۆر جــوان و دڵگیــرە، و ئەوانــەی شــارەزایی ڕەنگەکانیـان هەیـە، دەڵێـن: ڕەنگـی سـەوز و ڕەنگـی شـین، دوو ڕەنگـن لـە هەمـوو ڕەنگـەکان زیاتـر دڵـی ئینسـانیان پـێ دەپشـکوێ، بۆیـەش خـوا ﷻ ڕەنگـی سـەوزی زۆر کـردوە، دەریـا ڕەنگـی مەیلەوشـین و سـەوزە و، ئەگـەر تەماشـای دار و درەخـت و بـاخ و گوڵزاریـش بکەیـن، سـەوز دەنوێنـێ، ئاسـمانیش ڕەنگـی شـینە، بۆیـە خـوا ﷻ ئـەو دوو ڕەنگـەی لـە هەمـوو ڕەنگـەکان زیاتـر کـردوون، ئینسـان چ تەماشـای زەوی بـکات، چ سـەربەرز بکاتـەوە، لەسـەر زەوی سـەوزایی دەبینـێ و، لەسـەرێش ڕەنگـی شـین دەبینـێ.

٧)- ئنجا ئەو پۆشاکە سەوزەی لەبەری دەکەن: ﴿ مِّن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ ﴾، لە ئاوریشمی تەنك و ئەستوورە، دەگونجێ: ﴿ سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ ﴾، دوو وشەی هیندیی بن، بەڵام هەندێك دەڵێن: ئەوانیش وشەی فارسیین.

٨)- ﴿ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ ﴾، واتە: لە نێو ئەو بەهەشتەدا لەسەر تەختان پاڵیانداوەتەوە، (الإتكاء: جلسة الراحة)، دانیشتنی پشوودانە کە ئینسان لەسەر لا تەنیشتێك پاڵبداتەوە، شان دا بدات.

وشـەی (الأرآئك)یـش کـۆی (أريكة)ەیـە، (أريكـة)ش نـاوە بـۆ کـۆی تەخـت و (حَجَلـة)ە، کـە گومبەزێکـە لـە قوماشـێك بەسـەر ئـەو تەختـەدا دەدرێ، کـە لـە ماڵـدا هەیـەو ئافـرەت لەسـەری دادەنیشـێ، لـە کاتێـك دا میـوانی هەبـن، یاخـود لەسـەری پشـوو دەداو دەخـەوێ، نـەك هـەر ئافـرەت، بەڵکـو جـاری وایـە پیاویـش و منداڵیـش پشـووی لەسـەر دەدەن، یـان لەسـەری دەخـەون، دیـارە ئـەو کاتـە عادەتیـان وابـووە، قوببەیەکیشـیان بەسـەردا داوە و لـە زۆر شـوێنان ئێسـتاش ئـەوە هـەر هەیـە و، لـە هەندێـك شـوێن هاوینـان لـە تـرسی مێـش و مەگـەزو مێشـوولە بـەکاری دێنـن و پێـی دەڵێـن: پـەردە کوللـە.

٩)- ﴿ نِعْمَ ٱلثَّوَابُ ﴾، واتە: ئا ئەوە باشترین پاداشتە.

لێـرەدا تایبـەت کـراو بە مـدح (المخصـوص بالمـدح) قرتێـنراوە: (نِعْـمَ الثَّـوَابُ الجنَّـاتُ الْمَوْصُوفَةُ)، واتـە: باشـترین پاداشـت، ئـا ئـەو بەهەشـتانەن کە وەسـفکران.

١٠)- ﴿ وَحَسُنَتْ مُرْتَفَقًا ﴾، هەروەها ئەو بەهەشتانە، باشترین شوێنی تێدا پشوودانن، واتە: چاکترین نشینگەن و باشترین جێگاو ڕێگایەکن، کە مرۆڤ تیایاندا ژیان و گوزەرانی بەرێتە سەر.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان ئایەتەكانی: (٣٢ - ٤٤)، واتە: سێزدە (١٣) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئەو سێزدە ئایەتە هەمووی باسی وێنەیەكە، كە بریتیە لە وتووێژی نێوان دوو پیاوی پێكەوە هاوەڵ، كە یەكێكیان دەوڵەمەند و دوور لە خوا و لە خۆباییەو، یەكیشیان بڕوادارو كەم سامان و خۆ بەكەمزان و، دڵسۆزی هاوەڵەكەشیەتی.

كە سەرەنجام بابای بێبڕوای شانازیكەر بە سامانەكەیەوەو، خۆهەڵكێش بەسەر هاوەڵەكەیدا، ماڵ و سامانەكەی كە بریتیە لە دوو ڕەز و باخی ترێ و خورما و، كشتوكاڵ و ... هتد، لە دەست دەدات و دەستخەڕۆ و ڕەنجەڕۆ دەبێ، لەبەر ئەوەی بە پێی قسە و ئامۆژگاریی هاوەڵە دڵسۆزەكەی ڕەفتار ناكات، كە پێی دەڵێ: كاتێك كە دەچیە نێو باخەكەت دەبوو بڵێی: ﴿ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ ﴾، واتە: ئەوە خوا ویستوویەتی بەو شێوەیە بێ، دەستەڵات و توانا تەنیا بە خوایە، واتە: پێی لە خۆبایی مەبە و نیعمەتەكان بۆ خوا بگێڕەوە، ئنجا مرۆڤ ئەگەر نیعمەتەكانی بۆ خوا گێڕایەوە، پێیان لە خۆبایی نابێ، بەڵام ئەگەر نیعمەتەكانی بۆ خۆی گێڕانەوە، بە خۆی سەرسام دەبێ و، لە خوا بێ خەبەر دەبێ و، سەرەنجام بە پێی یاسای خوا مامەڵەی لەگەڵدا دەكرێ، چ لە دنیادا ئەو نازو نیعمەتەی كە خۆی پێوە هەڵدەكێشێ، لە دەستی بدات و، چ لە دواڕۆژدا، بۆی بێتە مایەی سزادان.

﴿ وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلًا رَّجُلَيْنِ جَعَلْنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيْنِ مِنْ أَعْنَـٰبٍ وَحَفَفْنَـٰهُمَا بِنَخْلٍ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمَا زَرْعًا ﴿٣٢﴾ كِلْتَا ٱلْجَنَّتَيْنِ ءَاتَتْ أُكُلَهَا وَلَمْ تَظْلِم مِّنْهُ شَيْـًٔا ۚ وَفَجَّرْنَا خِلَـٰلَهُمَا نَهَرًا ﴿٣٣﴾ وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٌ فَقَالَ لِصَـٰحِبِهِۦ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَنَا۠ أَكْثَرُ مِنكَ مَالًا وَأَعَزُّ نَفَرًا ﴿٣٤﴾ وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَـٰذِهِۦٓ أَبَدًا ﴿٣٥﴾ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّى لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا ﴿٣٦﴾ قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا ﴿٣٧﴾ لَّـٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴿٣٨﴾ وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٣٩﴾ فَعَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يُؤْتِيَنِ خَيْرًا مِّن جَنَّتِكَ وَيُرْسِلَ عَلَيْهَا حُسْبَانًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَتُصْبِحَ صَعِيدًا زَلَقًا ﴿٤٠﴾

أَوۡ يُصۡبِحَ مَآؤُهَا غَوۡرٗا فَلَن تَسۡتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبٗا ﴿٤١﴾ وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ فَأَصۡبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيۡهِ عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ فِيهَا وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُشۡرِكۡ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا ﴿٤٢﴾ وَلَمۡ تَكُن لَّهُۥ فِئَةٞ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا ﴿٤٣﴾ هُنَالِكَ ٱلۡوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلۡحَقِّۚ هُوَ خَيۡرٞ ثَوَابٗا وَخَيۡرٌ عُقۡبٗا ﴿٤٤﴾﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{هەروەها وێنەیەکیان بۆ بێنەوە: دوو پیاو، یەکیان دوو باخی ترێمان بۆ ڕەخساندبوون و، بە دارخورمایان تەنیبوومانن و، کشتوکاڵیشمان خستبووە نێوانیانەوە، ﴿٣٢﴾ هەر کام لە دوو باخەکە بە تەواویی بەر و میوەی خۆی دەرکردبوو و، هیچی لێ کەم نەکردبۆوە و، ڕووبارێکیشمان بە نێوانیاندا بەفڕکە بەڕێ کردبوو ﴿٣٣﴾ هەروەها بەرهەم و سامانێکی زۆری دیکەی هەبوو، (وێڕای ئەو دوو باخە)ئنجا لە کاتێکدا کە هاوەڵەکەی دەدواند، پێی گوت: من سامانم لە تۆ پترەو، لە ڕووی کەس و کاریشەوە باڵادەستترم، ﴿٣٤﴾ ئنجا لە کاتێکدا کە ستەمی لە خۆی کردبوو، چووە نێو باخەکەیەوە، گوتی: هەرگیز پێم وانیە ئەم (باخ)ە، لە نێو بچێ ﴿٣٥﴾ پێشم وانیە ئاخیر زەمانیش بێ و، ئەگەر گریمان بگێڕدرێمەوە لای پەروەردگاریشم، ئەوە لەوێش سەرەنجام و پاداشتی لەمەش چاکترم چنگ دەکەوێ! ﴿٣٦﴾ هاوەڵەکەی لە حاڵێکدا کە دەیدواند، پێی گوت: ئایا بەو کەسە بێبڕوای کە لە گڵ دروستی کردووی؟ پاشان لە نوتفە، دوایی کردووی بە پیاوێکی تێرو تەواو؟ (تۆ بەو شێوەیەی) ﴿٣٧﴾ بەڵام من هەر خوا پەروەردگارمەو، هیچ کەسیش ناکەمە هاوبەشی پەروەردگارم ﴿٣٨﴾ دەبووایەش کە دەچوویە نێو باخەکەتەوە، گوتبات: هەرچی خوا بیەوێ (هەر ئەوە دەبێ)، هێز هەر لە لای خواوەیە، ئنجا کەدەشمبینی من سامان و ڕۆڵەم لە تۆ کەمترن ﴿٣٩﴾ (نیزیکە) پەروەردگارم لە باخەکەی تۆ باشترم بداتێ و، بەڵایەکیش لەسەرێوە بنێرێتە سەر باخەکەت، ببێتە زەوییەکی ڕووتی خلیسك ﴿٤٠﴾ یان ئاوەکەی ڕۆبچێ و، هەرگیز نەتوانی بە دوایدا بچی (و بیهێنیەوەدەر) ﴿٤١﴾ سەرەنجامیش ئابڵووقەی ماڵ و سامانەکەی دراو لە بەین چوو، ئیدی (کابرای ساماندار) لە خەفەتان هەردووك دەستی خۆی تێك هەڵدەگوشین، {هەڵگێڕو وەرگێڕی دەکردن} ﴿٤٢﴾ لە مەراقی ئەو سامانەی کە لە باخەکەیدا خەرجی کردبوو، لە حاڵێکدا کە بەسەرێکدا ڕووخا بوو، دەشیگوت: ئەی خۆزگە هیچ کەسم نەکردبایە هاوبەشی پەروەردگارم، هیچ

دەستەیەکیشی نەبوو لە بەرانبەر خوادا پشتی بگرن و، خۆیشی سەرکەوتوو نەبوو (بۆ تۆڵە ستاندنەوە) ﴿٤٣﴾ لەو حاڵەدا دۆستایەتیی هەق، تەنیا هی خوایەو، پاداشتیشی باشترەو، سەرەنجامیشی (کە بۆ دۆستەکانی خۆی داینـاوە) چاکترە ﴿٤٤﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَحَفَفْنَٰهُمَا): واتە: دەورمان تەنیبوون، (حَفُّوا حَوْلَه: أَطَافُوا بِهِ وَاسْتَدَارُوا)، واتە: دەوریان داو بازنەیان لە دەور بەست، ئابڵووقەیاندا، (حَفَّهُ بالشَّيءِ، كَمَا يُحَفُّ الهَودَجُ)، (حَفَّهُ بالشَّيءِ) واتە: بە شتێك دەوری داوە، وەك چۆن کەژاوە (هَودَج) دەور دەدرێ {بە پەردەیەك، بۆ ئەوەی ئافرەت کە سواری دەبێ، دیار نەبێ، وەك ژوورێکی بچووك}.

عەرەب عادەتیان وابوو: بۆ ئافرەت لەسەر پشتی حوشتر (هَودَج) یان دروست دەکرد.

(زَرْعًا): (الزَّرْعُ: المصدرُ، يُعَبَّرُ بِهِ عَنِ الْمَزْرُوعِ، زَرَعَ الحَبَّ زَرْعًا وَزِرَاعَةً)، (زَرْع) لێرەدا چاوگە مەبەست پێی (مَزروع)ە، واتە: چێنراو، کە مەبەست (دێیەر)ە، چونکە کشتوکاڵ، ئنجا گەنم و جۆیە، یان سەوزەو میوەو تەرەیە، هەمووی پێ دەگوترێ: (زرعْ).

(ثَمَرٌ): (الثَّمَرُ: اسْمٌ لِكُلِّ مَا يُتَطَعَّمُ مِنْ أَحْمَالِ الشَّجَرِ، الوَاحِدَةُ: ثَمَرة، وَالجَمْعُ: الثِّمَار وَالثَّمَرَات، وَيُكَنَّى بالثَّمَرِ عن المَالِ المُسْتَفَادِ، ثَمَّرَ اللَّهُ مَالَهُ: أي كَثَّرَهُ). وشەی (ثَمَر) ناوە بۆ هەموو ئەوانەی کە لە بەری درەخت دەچنرێن و دەخورێن، تاکەکەی پێی دەگوترێ: (ثَمَرَة)، کە کۆیەکەی (ثِمَار) و (ثَمَرات)ە، واتە: بە (جمع التكسير) و (جمع المؤنث السالم) کۆدەکرێتەوە، هەروەها (ثَمَر) بەکاردەهێنرێ بۆ ماڵ و سامانێکی بەدەست هێنراو، دەگوترێ: (ثَمَّرَ اللَّهُ مَالَهُ) واتە: خوا ماڵ و سامانەکەی زۆر بکات.

(يُحَاوِرُهُۥ): واتە: دەیدواندو گفتو گۆی لەگەڵ دەکرد، (المُحَاوَرَةُ: المُرَادَّةُ فِي الكَلَامِ)، (حوار) و (محاورة) هەردووکیان بە مانای ئەوەن: یەکێك قسە بکات و ئەوی دیکە وەڵامی بداتەوە، واتە: یەکدی دواندن و گفتوگۆ، کە ئێستا لە جیاتی (حوار) ئەو وشە ئینگلیزییە بەکاردێ: (دیالۆگ)، لە زمانی عەرەبییدا هاتووە: (نَعوذُ باللَّهِ مِنَ الحَوْرِ بَعْدَ الكَوْرِ) واتە: پەنا بە خوا دەگرین لە گەڕانەوە، لە دوای چوونە پێش، واتە: کە دوایی هەڵبگەڕێینەوە.

(نَفَرًا ): (النَّفَرُ وَالنَّفِيرُ: عِدَّةُ رِجَالٍ، يُمْكِنُهُم النَّفر). (نَفَرْ) و (نَفِيرْ) هەردووکیان ژمارە پیاوانێکن دەتوانن ڕاپەڕن، هەڵسن، کاتێك کە یەکێکیان لێی دەقەومێ، ئەوانی دیکە بە هانایەوە بچن.

(تَبِيدَ ): (بَادَ الشَّيءُ: يَبِيدُ بَيَاداً: تَفَرَّق وَتَوَزَّعَ فِي البَيْدَاءِ، أي: المَفَازَة، وَجَمْعُ البَيْداءِ: بِيْد)، (بَادَ الشَّيءُ: يَبِيدُ بَيَاداً) واتە: ئەوە شتە پرژ بڵاوبوو، لەوەوە هاتوە، واتە: بە بیاباندا بڵاوبۆوە، (بَيْدَاء) واتە: بیابان، کە کۆیەکەی (بِيْد)ە.

(مُنقَلَبًا ): (المُنْقَلَبُ: المَكَانُ الَّذِي يَنْقَلِبُ إِلَيْهِ، أي: يَرْجِع)، (مُنْقَلَب) ئەو شوێنەیە کە ئینسان بۆی دەچێتەوە، واتە: پەنای پێ دەبات و بۆ لای دەگەڕێتەوە.

(حُسْبَانًا ): (مَصْدَرُ حَسِبَ كَالغُفْرَانِ، وَهُوَ هُنَا صِفَةٌ لِمَحْذُوفٍ، أي: هَلاَكاً مِنَ اللهِ مُقَدَّراً، وَقِيلَ: جَمْعُ حُسْبَانَة: أي صَاعِقَة، أو حُسْبَان هُوَ الجَرَاد، أو هُوَ السِّهَام الصِّغَار)، وشەی (حُسْبَاناً) زیاتر ئەو مانایە پێ دەچێ ڕاست بێ، کە دەڵێ: چاوگە وەك (حَسِبَ) کە چاوگی (حَسِبَ، يَحْسَبُ، حُسْبَاناً)، واتە: سزایەکی ئەندازەگیریی کراو، سزایەکی ژمێردراو، وەك (غُفْرَان) کە لە (غَفْر)ەوە هاتوە، ئەو کاتە (حُسْبَاناً) دەبێتە سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراو، واتە: لە بەینبردنێکی ئەندازەگیریی کراو لە لایەن خواوە، هەندێکیش گوتوویانە: (حُسْبَان) کۆی (حُسْبَانَة)یە، (حُسْبَانَة)ش بە مانای (صاعقة)ەیە، بلێسەیەك کە لە ئاسمان دێتە خوارەوە، هەندێکیش گوتوویانە: (حُسْبَان) واتە: کوللە، هەندێکیش گوتوویانە: (حُسْبَان) بە وردە تیران دەگوترێ، واتە: ئەو سزایە کە لای پەروەردگارەوە دێت وەك وردە تیران وان.

(صَعِيدًا): (الصَّعِيدُ: وَجْهُ الأَرْضِ) (صعيد) بریتیە لە ڕووی زەوی، هەندێکیش گوتوویانە: یانی: (التُّرَاب)، بەڵام ڕاستییەکەی وا نیە، وەك لە بەرگی چوارەمی ئەم تەفسیرە، تەفسیری سوورەتی (المائدة)دا بە تەفصیل باسمان کردوە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا ﴿٤٣﴾ ﴾، واتە: ڕوو بکەنە ڕووی پاکی زەوی، کە هەم گڵیش و، هەم هەموو ئەو شتانەش دەگرێتەوە کە لەسەر ڕووی زەویین، چ دارو بەرد بن، چ سەوزە گیا بێ، چ بەستەڵەك بێ، چ لم و گەچ و چەو بێ، هەرچییەك بێ.

(زَلَقًا): (الزَّلَقُ: مَصْدَرُ زَلَقَتِ الرِّجْلُ أي: زَلَّتْ عَلَى الأَرْضِ فَلَمْ تَسْتَقِرّ، أي: ذَاتُ زَلَقٍ).

(زلق) چاوگی (زَلَقَتِ الرِّجْلُ)ی، واتە: لاقەکە خلیسکا لەسەر زەوی و خۆی پێ ڕانەگیرا، کەواتە: (زَلَقًا) واتە: زەوییەکی خلیسك، زەوییەك هیچی لێ نەماوە و پێی لێ هەڵدەخلیسکێ.

(غَوْرًا): (مَصْدَرُ غَارَ المَاءُ، أي: سَاخَ فِي الأَرْضِ، وَوَصْفُهُ بِالمَصْدَرِ لِلمُبَالَغَةِ)، (غَوراً) چاوگە، چاوگی (غَارَ يَغُورُ غَوراً)ە، (غَارَ المَاءُ) واتە: بە زەویدا چووە خوارێ، ڕۆچوو، ئنجا کە ئاوەکە بە (غَوْر) وەسف کراوە، یانی: خودی ڕۆچوون، ئەوە بۆ زێدە ڕۆییە، بۆ وێنە: (زرع) واتە: کشتوکاڵ چاندن، بەڵام مەبەست پێی (مزروع) چێندراوە، کشتوکاڵێك کە چێنراوە، لێرەشدا (غَوْرًا) یانی: ڕۆچوون، بەڵام مەبەست پێی ئاوێکی ڕۆچوویە، ئاوێك کە ڕۆ براوەتە زەوییەوە.

(يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ): ئەمە مەبەست پێی پەشێمانییە، خوا ﷻ دەفەرموێ: هەردوو دەستی خۆی هەڵدەگێڕانەوە.

هەندێك گوتوویانە: دەستی بە یەکدادەدان، بە شێوەیەك لە شێوەکان: دەستەکانی بە یەکداداون، بە هەرحاڵ، خوا ﷻ تەعبیرێکی بەکارهێناوە، لەگەڵ کلتووری هەموو ئەو کۆمەڵ و گەلانەدا، بگونجێ کە بە شێوەی جیا جیاو جۆراو جۆر، دەستەکانیان بەکاردێنن بۆ دەربڕینی پەشێمانیی و داخ و حەسرەت، ئنجا کاتێك کە خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات ئەو کابرایە پەشێمانیی دەربڕیوە، بە تەعبیرێك ئەوەی وێنا (تصویر) کردوە لەگەڵ کلتووری هەموو کۆمەڵگاکاندا بگونجێ، چونکە زۆربەی کۆمەڵگاکان بۆ دەربڕینی پەشێمانیی و داخ و خەفەت و حەسرەت، جووڵە بە دەستەکانیان دەکەن بە شێوازی جۆراو جۆر، ئنجا ئەو تەعبیرە قورئانییە، هەموو شێوازەکان دەگرێتەوە، ئەوەم لە تەفسیرەکاندا نەبینیوە، بەڵام شتێکی زانراوە و مرۆڤ دەتوانێ هەڵیبهێنجێ.

(الْوَلَٰيَةُ): (الوَلاَيَةُ: مَصْدَرُ الوَلِيِّ إِذَا ثَبَتَ لَهُ الوَلاَءُ)، (وَلاَيَة) چاوگە لە (وليّ)ەوە هاتوە، هەر کەسێ کە دۆستایەتیی بۆ چەسپا بێ، واتە: هاوکاریی کردن و پشتگرتن و یارمەتییدان، لەو کاتەدا بەس هی خوایە.

(عُقْبًا): (أي العَاقِبَةُ، آخرة الأمر، وَهِيَ مَا يَرجُوهُ المَرْءُ مِنْ سَعيِهِ وَعَمَلِهِ)، (عاقبة) ئەوەیە کە مرۆڤ لە ئەنجامی کردو کۆششیدا بە هیوایەتی، ئەو سەرەنجامە تەنیا لەلای خوایە ﷻ.

## مانای گشتی ئایەتەکان

پرسیار کراوە: ئایا ئەمە ڕووداوێکی ڕاستەقینەیە، یاخود نموونەیەکە هێنراوەتەوە؟ وەك دوایی باسی دەکەین، ئەو ڕایە پێدەچێ ڕاستتر بێ، کە دەڵێ: کە ئەمە بەسەرهاتێکی واقیعییە، وتووێژێك بووەو بەسەرهاتێك بووە، ئنجا ئایا هەردووکیان برا بوون، یاخود دراوسێ بوون، گرنگ ئەوەیە پێکەوە هاوەڵ بوون و یەکدییان ناسیوە و، ئاشنای یەکدی بوون، بەڵام بێگومان ڕێباز و ڕێگا و شێوازی بیرکردنەوەیان، ئاسمان و ڕێسمانیان بەین بووەو لێك جیابوون.

بەڵێ ئەم وتووێژە: زیاتر وا پێدەچێ بەسەرهاتێکی واقیعیی بووبێ و ڕووی دابێ، دوو هاوەڵ بوو بن، چ برای یەکدی بوو بن، وەك لە هەندێك ڕیوایەتاندا هاتوە: برای باب و دایکی بوون، یاخود دوو ئاشنای یەکدی بووبن، ئاگایان لە حاڵ و باڵی یەکدی بووە، پێکەوە تێکەڵیان بووە: یەکێکیان ئەهلی دنیا بووە، ئەوی دیکەشیان ئەهلی دواڕۆژ بووە، یەکێکیان تەنیا دنیای بینیوە و، تەنیا بەرژەوەندییەکانی خۆی بینیوە و، تەنیا دیوە ماددیەکەی دنیای بینیوە، ئەوی دیکەشیان: وێڕای ئەوەی کە دیوە ڕواڵەتییەکەی دنیای دیوە، دیوە پەنهانەکەشی بینیوە، وێڕای خەڵك، خواشی بینیوە و، وێڕای دنیا، دواڕۆژیشی بینیوە.

ئاشکراشە کۆمەڵگای ئەو کاتە کە قورئانی تێدا هاتۆتە خوارێ و، ئێستاش و دوای ئێستاش هەر وایە: کەسانێك هەن تەنیا دنیا دەبینن، هەر بۆیە بە مستە ئاوێك دەکەونە مەلە، ئەگەر چوار عانەیان[1] هاتنە گیرفان و، باخەڵی خۆیان تۆزێك بە پڕیی بینی و، دەوروبەری خۆیان تۆزێك بە فەڕەباڵغیی بینی، بە هەق لەگەڵ کەس ناکەن و لووتیان دەچێتە ئاسمان، پێیان وایە ئەو وەزعەیان هەر بۆ بەردەوام دەبێ!

کەسانێکی دیکەش هەن: دنیا وەك خۆی دەبینن، کە شوێنی تێدا تاقیکردنەوەیەو، دواڕۆژیش وەك خۆی دەبینن و، دەزانن نازو نیعمەتەکانی دنیا، هی ئەوە نین ئینسان پێیان لە خۆبایی بێ، لەبەرئەوەی ژیانی دنیا ژیانێکی زوو تێپەڕە و، ناز و نیعمەتەکانی دنیاش کە خوا بە مرۆڤیان دەدات، دەبێ وەك خوازراو (عارية) و سپاردەیەك کە لەلایەتی، مامەڵە لەگەڵ نازو نیعمەتەکانی خوا بکات.

بۆیە خوا ﷻ بە پێغەمبەری ﷺ فەرمووە: ﴿ وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلًا ﴾، وێنەیەکیان بۆ بێنەوە، ئایا وێنەکە، بریتیە لەچی؟ ﴿ رَّجُلَيْنِ ﴾، دوو پیاو، ئیدی لێرە بەس فەرموویەتی: دوو پیاو،

---

(١) کاتی خۆی: عانەیەك پێنج فلس بوو، دینارێك هەزار (١٠٠٠) فلس بوو.

بەڵام نەیفەرمووە: ئایا ئەو دوو پیاوە بران، خزمن، چۆنن؟ گرنگ ئەوەیە ئەو دوو پیاوە جۆرێك لە پەیوەندیی و دراوسێیەتیی و هاوەڵایەتیی و ئاشنایەتییان، پێکەوە هەبووە.

ئنجا دێتە سەر باسی بەسەرهاتی ئەو دوو پیاوە و، سەرەتا باسی یەکەمیان دەکات و دەفەرمویّ: ﴿ جَعَلْنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيْنِ ﴾، بۆ یەکێکیان دوو باخمان ڕەخساند بوو.

(جنة) واتە: باخ و بێستان و گوڵ و گوڵزار و، شوێنێك میوەی تێدابێ و، هەموو پێداویستییەکانی ژیانی مرۆڤی لێوە چنگ بکەون.

ئنجا ئەو دوو باخانە ئاوا وەسف دەکات: ﴿ مِنْ أَعْنَابٍ ﴾، هەردوو باخەکان ڕەزی ترێ بوون، هەموو جۆرەکانی ترێ، ﴿ وَحَفَفْنَاهُمَا بِنَخْلٍ ﴾، ئەو ڕەز و باخی ترێیەمان تەنیبوو، بە دارخورما، واتە: لە دەوریان دارخورما هەبوو ﴿ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمَا زَرْعًا ﴾، لە نێوان دوو باخ و ڕەزەکەشدا کشتوکاڵمان ڕەخساند بوو، کشت وکاڵ واتە: دەغڵ و دان و دانەوێڵە، تەرەکار، سەوزە، هەموو ئەو شتانە کە وشەی (زرع) دەیانگرێتەوە.

﴿ كِلْتَا الْجَنَّتَيْنِ آتَتْ أُكُلَهَا ﴾، هەر کام لە دوو ڕەزو باخەکە، میوەی خۆی بە تەواویی بەخشیبو و، بەری دابوو، ﴿ وَلَمْ تَظْلِمْ مِنْهُ شَيْئًا ﴾، هیچی لێ کەم نەکرد بوّوە، هیچ لە بەروبوومی خۆی، کە عادەتە ڕەزێکی وا بیگرێ، هیچی لێ کەم نەکردبۆوە، ﴿ وَفَجَّرْنَا خِلَالَهُمَا نَهَرًا ﴾، ڕووبارێکیشمان بە نێو ئەو دوو باخەدا، بە فڕکە بەڕێ کرد بوو، واتە: ڕووبارێك بە خوڕەم و زۆر بە خوڕیی دەڕۆیی.

﴿ وَكَانَ لَهُ ثَمَرٌ ﴾، جگە لەو دوو ڕەزو باخە، ماڵ و سامانی دیکەشی هەبوو، هەندێکیش گوتوویانە: (ثمر) یانی: میوەی هەبوو، بەڵام پێشتر کە خوا ﷻ باسی ئەوەی کردوە: دوو باخەکە میوەی خۆیان داوەو، هیچیشیان لە میوەکە کەم نەکردوە، وا پێدەچێ لێرەدا مەبەست لە ﴿ ثَمَرٌ ﴾، ماڵ و سامان بێ، وەك لە زۆربەی تەفسیرەکانیشدا (ثمر) ئەو مانایەشی هاتوە، واتە: ماڵ و سامانی دیکەشی هەبوو، جگە لەو دوو ڕەزە، کە بەدارخورما دەور درابوون و، ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆیی و، کشت و کاڵیشیان لە نێواندا کرابوو. ﴿ فَقَالَ لِصَاحِبِهِ وَهُوَ يُحَاوِرُهُ ﴾، (ئەو کابرایە) بە هاوەڵەکەی خۆی گوت: لە کاتێکدا کە دەیدواند: ﴿ أَنَا أَكْثَرُ مِنْكَ مَالًا وَأَعَزُّ نَفَرًا ﴾، من سامانیشم لە تۆ زیاترە و خەڵکیشم لە تۆ پترە، واتە: لە تۆ باڵا دەستترم لە ڕووی خەڵکەوە و، لە تۆش ساماندارترم لە ڕووی ماڵ و سامانەوە، یانی: خۆی بەسەردا هەڵکێشا.

﴿ وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ ﴾، ئنجا چووه نێو باخ و ڕەزەکەیەوە، لە حاڵێکدا کە ستەمی لە خۆی کرد بوو، چونکە ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە، ستەم لە خۆکردنە، بەرلەوەی ستەم لە خەڵك کردن بێ.

﴿ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدًا ﴾، گوتی: پێم وانیە هەرگیز ئەم ڕەز و باخە، ئەم ماڵ و سامانە، بفەوتێ و لە بەینبچێ.

﴿ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً ﴾، هەروەها پێشم وانیە (ساعة)ش بێ، (ساعة) چ مەبەست پێی ئاخیر زەمان بێ، چ مەبەست پێی قیامەت و هاتنی ڕۆژی دوایی بێ، هەردووکیان دەگرێتەوە، واش پێدەچێ: زیاتر مەبەست پێی دووەمیان بێ، یانی: قیامەتیش نایەت، ﴿ وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّى ﴾، ئەگەر گریمان قیامەتیش هەبوو، من گێڕدرامەوە بۆ لای پەروەردگارم، ﴿ لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا ﴾، لەمەی کە هەمە، باشترم دەستدەکەوێ، لەوێش، واتە: لەو شوێنەی کە بۆی دەگێڕدرێمەوە، لەم سەروەت و سامانە و، لەم ڕەزو باخ و گوڵ و گوڵزارەش، کە هەمە، باشترم چنگ دەکەوێ! خەیاڵ و پلاوێکی سەیری کردوە!!

﴿ قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ ﴾، هاوەڵەکەی لە کاتێکدا کە دەیدواند، پێی گوت: ﴿ أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا ﴾، ئایا بێبڕوای بەرانبەر بە کەسێك کە تۆی لەگڵ هێناوەتە دی، دوایی لە تۆ و (نطفة)، دوایی تۆی لە شێوەی پیاوێکدا ڕێکخستوە؟

﴿ أَكَفَرْتَ ﴾، دەگونجێ مەبەست پێی: بێبڕوا بوون بێ و، دەشگونجێ مەبەست پێی: سپڵەیی بێ، واتە: ئایا تۆ سپڵەو بێ وەفا بووی بەرانبەر بە کەسێك کە تۆی لە گڵ هێناوەتە دی؟ کە مەبەست پێی ئادەمە ﷺ چونکە: باب و دایکی مرۆڤایەتیی ڕاستەوخۆ لە گڵ دروست بوون.

﴿ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ﴾، دوایی تۆ وەك وەچە (نَسْل)ی ئەوان لە تۆو دروست بووی، تۆش و باب و باپیرانیشت و، دوایی کردووی بە پیاوێك.

دەشگونجێ مەبەست لە: ﴿ خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ﴾، واتە: ئەو خواردن و شتانەی کە باب و دایکت خواردوویانە، هەر لە گڵ دروست بوون و لەو خاکەن، دوایی ئەو خواردن و خۆراکە، بۆتە خوێن و، خوێنەکەش نوتفەی لێ پەیدابووە و، دوایی تۆ بەو شێوەیە بووی بە پیاوێکی پڕ بە کراس!!

﴿ لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّي ﴾، بەڵام بە نسبەت منەوە: بەس خوا پەروەردگارمە، ﴿ وَلَآ أُشْرِكُ بِرَبِّيٓ أَحَدًا ﴾، هیچ کەس ناکەمە هاوبەشی پەروەردگارم، واتە: کە شتێك لەو شتانەی، تەنیا بە خوا دەکرێن، بیگێڕمەوە بۆ لای غەیری خوا، یان شتێك لەو شتانەی تەنیا بۆ خوا ئەنجام دەدرێن، ئەنجامی بدەم بۆ جگە لە خوا، چونکە شیرك ئەوەیە: یان کارێك کە تەنیا بە خوا دەکرێ، پاڵی بدەیە لای غەیری خوا، یان کارێك کە تەنیا بۆ خوا دەکرێ، بۆ جگە لە خوای ئەنجام بدەی.

﴿ وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ ﴾، دەبووایە کە دەچوویە نێو باخ و ڕەزەکەتەوە، گوتبات: ﴿ مَا شَآءَ ٱللَّهُ ﴾، واتە: ئەوە خوا ویستوویەتی بەو شێوەیە ببێ، یاخود: ﴿ مَا شَآءَ ٱللَّهُ ﴾، ئەوەی کە خوا بیەوێ، ئەوە دەبێ، ﴿ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ ﴾، هێز نیە مەگەر بە خوا، واتە: کە ئەو سەروەت و سامان و نیعمەتەم دەستکەوتوە، ئەوە خوا ویستوویەتی و، ئەوە بە تواناو دەسەڵاتی خوا، بۆ من ڕەخسێنراوە، دەبووایە، وات گوتبایە. ﴿ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالًا وَوَلَدًا ﴾، ئەگەر من دەبینی لە تۆ سامانم کەمترە و ڕۆڵەشم کەمترن.

﴿ فَعَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يُؤْتِيَنِ خَيْرًا مِّن جَنَّتِكَ ﴾، نیزیکە، لەوانەیە پەروەردگارم باشتر لە ڕەز و باخەکەی تۆم پێ بدات. ﴿ وَيُرْسِلَ عَلَيْهَا حُسْبَانًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾، لەسەرێوەش بەڵایەکی ئەندازەگیرییکراو، بنێرێتە سەر باخ و ڕەزەکەی تۆ، ﴿ فَتُصْبِحَ صَعِيدًا زَلَقًا ﴾، سەرەنجام: ببێتە زەوییەکی خلیسك، یانی: ببێتە زەوییەکی ڕووتەن، کە هیچی لێ نەمابێ، وەك هەر هیچ شتێکی لێ نەڕوێنرابێ و، لێ نەچێنرابێ و، هەرگیز نەمامێکی لێ نەنێژرابێ!! ببێتە زەوییەکی سوور و سەرقەتاڵە. ﴿ أَوْ يُصْبِحَ مَآؤُهَا غَوْرًا ﴾، یاخود (ئەگەر باخەکەش بەو شێوەیە لە بەین نەچێ و نەسووتێ و، بەڵایەکی لەسەرێوە بۆ دانەبەزێ) بە لای کەمەوە: ئاوەکەی ڕۆبچێت و بە ناخی زەویدا بچێتە خوار، ﴿ فَلَن تَسْتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبًا ﴾، دوایی هەرچەندە بە دوایدا بچێ، نەتوانی بیهێنیەوە، ئاوا بەو شێوەیە هاوەڵەکەی دڵسۆزانە هۆشداریی دایە.

﴿ وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ ﴾، نیدی هەر ئەوەندەیان زانی: سەروەت و سامانەکەی تابڵووقە درا، یانی: لە بەینچوو، چونکە کەسێك دوژمن ئابڵووقەی بدات، مانای وایە دەرفەتی دەرباز بوونی نیە، بۆیە وشەی: دەورەدان (إحاطة) بۆ لە بەین چوون بەکارهاتوە، ماڵ و سامانەکەی لەبەین چوو.

﴿ فَأَصْبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ فِيهَا ﴾، لە ناکام دا: وای لێهات کە لەپە دەستەکانی خۆی هەڵگێڕ و وەرگێڕ دەکردن، واتە: داخ و حەسرەتی دەخوارد و پەشێمانیی دەردەبڕی، بەهۆی ئەوەوە کە ماڵ و سامانێکی زۆری لەو باخ و ڕەزانەی خۆیدا، خەرج کرد بوو،

﴿ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا ﴾، لە حاڵێکدا کە ئەو ڕەز و باخە بەسەر کەپر و سابات و سەربانەکەیدا کەوتبوو.

بێگومان کاتێك کە بینایەك دەڕووخێ، پێشێ سەربانەکەی دەڕووخێ و، دوایی دیوارەکان بەسەر سەربانەکەدا، دەتەپن و دەڕووخێن، ئنجا ئەم تەعبیرە بەکارهێنراوە بۆ لە بەین چوونی شتێك بە تەواویی، واتە: بە تەواویی ڕەزو باخەکەی لەبەین چوو، ئەگەرنا مەرج نیە سەربانی بوو بێت و، دیواریشی بوو بێ، بەڵام ئەم تەعبیرە: ﴿ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا ﴾، واتە: (سَاقِطة عَلَى سُقُفِهَا) واتە: دیوارەکانی بەسەر سەربانەکەیدا ڕووخا بوون، ئەوە واتایەکی.

واتایەکی دیکەی: ﴿ خَاوِيَةٌ ﴾، (خالِيةٌ عَلَى عُرُوشِهَا)، واتە: تەنیا سەربانەکەی مابوو، ئەگەرنا هیچی لێ نەمابوو، واتە: هیچ کشتوکاڵی لێ نەمابوو، باخ و ڕەزەکەی، هەموو فەوتا بوو. ﴿ وَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِي لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّيٓ أَحَدًا ﴾، دەیگوت: هەی خۆزگە! هیچ کەسم نەکردبایە هاوبەشی پەروەردگارم! واتە: هەر خۆزگە و بریای بوو!

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ: ئەو کەسە هاوبەش بۆ خوا دانەر بووە، بەڵکو ئارەزووی خۆشی پەرستوە و، ئارەزووی خۆی هێناوەتە ڕیزی خوا ﷻ.

﴿ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ فِئَةٌ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، هیچ کۆمەڵێکی چنگ نەکەوتن، لەو کاتەدا لە بەرانبەر خوادا پشتی بگرن و سەری بخەن، ﴿ وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا ﴾، خۆیشی توانای سەرکەوتن و خۆسەرخستن و دەرباز بوونی نەبوو، یان توانای ئەوەی نەبوو: لە بەرانبەر ئەوەدا کە باخ و ڕەزەکەی و، ماڵ و سەروەت و سامانەکەی، لەبەین براوە، تۆڵە بستێنێتەوە ﴿ هُنَالِكَ ٱلْوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلْحَقِّ ﴾، لەو کات و شوێنەدا دۆستایەتیی و پشتگرتن و هاوکاریی کردن، تەنیا هی خوای هەقە.

یاخود: تەنیا بۆ خوا، هەق و چەسپاوە، چونکە بەو شێوەش خوێنراوەتەوە: ( هُنَالِكَ ٱلْوَلَٰيَةُ لِلَّهِ الحقُّ)، واتە: لەو کاتەدا دۆستایەتیی و پشتگرتن، تەنیا بۆ خوایە و بەس بۆ خوا چەسپاوە، هەردوو جۆرە خوێندنەوەکە هاتوون. ﴿ هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا وَخَيْرٌ عُقْبًا ﴾، خوا پاداشتیشی باشترە و، سەرەنجامێکیش کە لەلای خوایە، بۆ دۆستەکانی باشترە، لە سەرەنجامێك کە ئەوانەی ناحەزی خوان، چاوەڕێیان دەکات.

ئنجا لێرەدا مەبەست لە: ﴿ خَيْرٌ ﴾، مەرج نیە بۆ بەراورد کردن (مقارنة) بێ، بەڵکو یانی: سەرەنجامی چاك، تەنیا لەلای خوایە و، پاداشتی چاك تەنیا لەلای خوایە ﷻ.

## مەسەلە گرنگەكان

**مەسەلەی یەكەم:**

**خوا فەرموویەتی: وێنەیەكیان بۆ بێنەوە: دوو پیاو هەبوون، یەكیان دوو باخی ترێمان بۆ ڕەخساند بوون و، كە بە دارخورما دەوریانمان تەنیبوو و، كشتوكاڵمان لە نێوانیاندا دانا بوو، هەر كام لە دوو باخەكە، بە تەواویی بەریاندابوو و، هیچی كەم نەكردبوو و، ڕووباریشمان بە فڕكە بەنێویاندا بەردابۆوە:**

خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلٗا رَّجُلَيۡنِ جَعَلۡنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيۡنِ مِنۡ أَعۡنَٰبٖ وَحَفَفۡنَٰهُمَا بِنَخۡلٖ وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُمَا زَرۡعٗا ﴿٣٢﴾ كِلۡتَا ٱلۡجَنَّتَيۡنِ ءَاتَتۡ أُكُلَهَا وَلَمۡ تَظۡلِم مِّنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ وَفَجَّرۡنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرٗا ﴿٣٣﴾﴾.

### شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

**١)- ﴿وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلٗا﴾، واتە: وێنەیەكیان بۆ بێنەوە.**

**تاكو هەر كامیان لە حاڵی خۆیان تێبگەن: هەم بڕواداران بزانن، چ سەرەنجامێكی چاك چاوەڕێیانە، هەم بێبڕوایان و هاوبەش بۆ خوا دانەران و شانازیی كەران بە ماڵ و سامانی حەڕامەوە، ئەوانیش سەرەنجامی خۆیان بێتە بەرچاو، بەهۆی ئەو وێنەیەوە كە بۆیان دێنیەوە.**

**٢)- ﴿رَّجُلَيۡنِ﴾، (رَّجُلَيۡنِ) جێدار (بَدَل)ە بۆ: (مَّثَلٗا)، واتە: ئەو وێنەیە بریتیە لە دوو پیاو، پێشتر گوتمان: زیاتر وا پێدەچێ كە ئەوە ڕووداوێكی واقیعیی بوو بێ، نەك وێنەیەك بێ خوای بەرز و مەزن بیهێنێتەوە، بەڵام لەسەر ئەرزی واقیع ڕووی نەدابێ، چونكە زۆر عەقڵ دەیگرێ و زۆر پێدەچێ، كە ئەو وێنەیە زۆرجاران لە ژیانی بەشەردا، لە زۆر كۆمەڵگاكاندا، دووبارە بێتەوە، بۆیە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەو دوو پیاوانە دوو كەسی قوڕەیشیی بوون و برا بوون، یەكێكیان، دەوڵەمەندەكە، ناوی: (الأسود بن عبدالأشد بن عبدياليل) بووە، برایەكەشی ناوی: (أبو سلمة عبدالله بن عبدالأشد بن عبدياليل) بووە، واتە: برای باب و دایكیی بوون، بەڵام یەكەمیان دەوڵەمەندو**

ساماندار و، ئەوی دیکەشیان ڕەش و ڕووت، بەڵام بڕوادار بووە، هەندێکیش لە زانایان گوتوویانە: دوو برا بوون، لە گەلی جوولەکە، بە هەرحاڵ، هەر چۆنێك بێ، وێنەی ئەو دوو پیاوانە، هەمیشە لە کۆمەڵگاکانی بەشەردا هەیە.

٣)- ﴿ جَعَلْنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيْنِ مِنْ أَعْنَابٍ ﴾، بۆ یەکێکیان دوو ڕەزی ترێمان ڕەخساند بوون.

یانی: هۆکارەکانی سازکردنی دوو ڕەزی ترێمان بۆ ئاسان کرد بوون و، وامان بۆ ڕێکخستبوو: بتوانێ دوو ڕەزی ترێ دروست بکات و بێنێتە دی، ئەگەرنا خوا ﷻ فریشتەی نەناردوون تاکو ڕەزەکانی بۆ دابنێن!

٤)- ﴿ وَحَفَفْنَاهُمَا بِنَخْلٍ ﴾، ئەو دوو ڕەزی ترێیەمان، بە دارخورمایان دەورە دابوون، (وَحَفَفْنَاهُمَا) واتە: (أعْطَيْنَاهُمَا، حَفَّهُ بكَذَا: جَعَلَهُ حَافّاً بِهِ، أي: مُحِيطاً)، (حَفَّهُ بكَذَا) واتە: بەو شتە دەورەیدا، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَتَرَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ حَآفِّينَ مِنْ حَوْلِ ٱلْعَرْشِ... ﴿٧٥﴾ ﴾الزمر، واتە: فریشتەکان دەبینی دەوری عەرشی خوای پەروەردگاریان داوە، واتە: ڕەزەکە ڕەزی ترێ بووە، ڕەنگە هەموو یان زۆربەی جۆرەکانی ترێی تێدا بووبێ، بەدەوریشیەوە دارخورما هەبوون.

٥)- ﴿ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمَا زَرْعًا ﴾، کشتوکاڵیشمان خستبووە نێوان ئەو دوو ڕەزەوە. واتە: کارێکی وامان کردبوو، کە ئەو پیاوە لە نێوان ئەو دوو ڕەزەدا، کشتوکاڵ بکات، ئەو کشتوکاڵەش: دەگونجێ دانەوێڵە بوو بێ، وەك: (نیسك و نۆك و گەنم و جۆ و هەرزن و مەرەزە و ... هتد).

دەشگونجێ تەڕەکار بووبێ و، دەشگونجێ سەوزەی دیکە بووبێ، واتە: دوو ڕەزەکان دەوری کشت و کاڵەکەیان داوە و، دارخورمایەکانیش دەوری دوو ڕەزەکانیان داوە، دیمەنێکی زۆر جوانی هەبووە.

٦)- ﴿ كِلْتَا ٱلْجَنَّتَيْنِ ءَاتَتْ أُكُلَهَا ﴾، هەردوو ڕەزەکە میوەی خۆیان دەرکرد بوو، (أُكُل) خوێندراویشەتەوە: (أُكْل)، کە هەردووکیان مەبەست پێی میوەیە، یانی: بەر و میوەی خۆیان دەرکرد بوو.

(كِلْتَا: اسم مُفْرَدٌ دَالٌ عَلَى شَيْئَيْنِ، نَظِيرِ زَوْج)، وشەی (كِلْتَا) ناوێکی تاکە، دوو شتان دەگەیەنێ، وەك (زوج) جووت، (كِلْتَا)ش دوو شتان دەگەیەنێ، هەرچەندە بۆ خۆی ناوێکی تاکە، کە حاڵەتی مێینەکەی (كِلْتَا)و، حاڵەتی نێرینەکەی (كِلا)یە.

٧)- ﴿ وَلَمْ تَظْلِم مِّنْهُ شَيْئًا ﴾، واتە: (ولم تنقص) هەر کام لەو دوو ڕەزە، هیچ لە میوەکەی خۆی کەم نەکرد بۆوە، واتە: هیچ کامیان لەو ئەندازەیەی کە وێنەی خۆی دەیدا، لە بەروبوومەکەی، کەمی نەکرد بوو.

٨)- ﴿ وَفَجَّرْنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرًا ﴾، بە نێویاندا ڕووبارێکمان ڕەخساند بوو.

(فَجَّرْنَا) واتە: ڕووبارێک کە بەفڕکە بڕوا، ڕووبارێک کە بە خوڕ بڕوات، ڕووبارێکیشمان بەنێویاندا ڕەخساند بوو، بۆ ئەوەی چاک لەوبەر و ئەمبەرەوە، ئاوی ڕووبارەکە هەڵببەسترێ و، هەم دێبەرەکە و، هەم دارخورمایەکان و، هەم ئەو ڕەزو باخەی، پێ ئاو بدرێ.

هەڵبەتە وشەی (خِلاَل) کۆی (خَلَل)ە، (الخَلَلُ: الفُرْجَةُ بَيْنَ الشَّيْئَيْنِ، وَالجَمْعُ خِلاَلٌ، كَجَبَل وَجِبَال)، (خَلَلْ) بە کەلێن و بۆشایی نێوان دوو شتان دەگوترێ و، بە (خلال) کۆدەکرێتەوە، واتە: کەلێنەکانیان.

ئەگەر بەچاوی خەیاڵ تەماشای دیمەنی ئەو باخە بکەین کە خوا بۆ ئەو پیاوەی ڕەخساندوە، دیمەنێکی زۆر جوانە: دوو ڕەز بوون، ڕەزی ترێ، بە دارخورما دەورە دراون، لە نێوانانیاندا دێبەر و کشتوکاڵ هەبووە و، ڕووبارێکی گەورەش، یان شاجۆگەیەکی گەورە بە نێوانیاندا بە فڕکە ڕۆیشتوە! کە دیمەنێکی لەوە جوانتر نیە، بۆ ڕەز و باخ و دێبەرێک، کە مرۆڤ بیەوێ لێی بەهرەمەند بێ و، لە ژیانیدا لە بەروبومەکەی، بەهرە وەربگرێ.

**مەسەلەی دووەم:**

**ئەو کابرایە کە خوا وێڕای ڕەزو باخ و بێستان، توانای ماددیی زۆریشی پێ دابوو، ئنجا لە حاڵێکدا کە هاوەڵە هەژارەکەی دەدواند، گوتی: من سامانم لە تۆ زیاترە و، لە ڕووی کەس و کاریشەوە، لە تۆ باڵادەستترم، ئنجا لە حاڵێکدا کە ستەمکاری خۆی بوو، گوتی: پێم وانیە هەرگیز ئەم باخە لە بەین بچێ و، پێشم وانیە ئاخیر زەمان بەرپابێ و، ئەگەر گریمان بگێڕدرێمەوە لای پەروەردگاریشم، سەرەنجامێکی لەمە چاکترم چنگ دەکەوێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٌ فَقَالَ لِصَٰحِبِهِۦ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَنَا۠ أَكْثَرُ مِنكَ مَالًا وَأَعَزُّ نَفَرًا ﴿٣٤﴾ وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدًا ﴿٣٥﴾ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّى لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا ﴿٣٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم سێ ئایەتە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٌ ﴾، واتە: یەکێك لەو دوو پیاوە کە خوا لەبارەیانەوە فەرمووی: ﴿ وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلًا رَّجُلَيْنِ جَعَلْنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيْنِ ﴾، وێڕای ئەو دوو باخە (ثَمَرٌ) یشی هەبوو، (ثَمَرٌ)، ڕوونکەرەوانی قورئان هەندێکیان بە بەرو میوەیان لێکداوەتەوە، یانی: باخەکان بەر ومیوەی باشیان گرتبوو، بەڵام وەك پێشتریش گوتمان، پێناچێ ئەو مانایە ڕاست بێ، چونکە پێشتر خوا فەرمووی: ﴿ كِلْتَا ٱلْجَنَّتَيْنِ ءَاتَتْ أُكُلَهَا وَلَمْ تَظْلِم مِّنْهُ شَيْـًٔا ﴾، واتە: هەر کام لە دوو باخەکە، بەر و میوەی خۆی دەرکرد بو و، هیچی لێ کەم نەکرد بوو، کەواتە: لەوێ باسی بەر و میوەی باخەکانی کردوە، بۆیە: ﴿ وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٌ ﴾، یانی: وێڕای ئەو دوو باخە (ثَمَرٌ)، یشی هەبوو، (ثَمَرٌ)، وێڕای ئەوەی بە جینسی بەر و میوەی دار و درەختان دەگوترێ، کە تاکەکەی (ثَمَرة)یە و کۆیەکەی: (ثِمار وثَمرات)ە، وێڕای ئەوە بە ماڵ و سامانی زۆریش دەگوترێ، واتە: ماڵ و سامانێکی زۆری جۆرا و جۆر، بۆ وێنە: ئاژەڵی هەبوو، ماڵی نەقدینەی هەبوو، زەوی هەبووە، وڵاخە بەرزەی هەبوون، ئەو ماڵەی ئەو کاتە کە خەڵك هەیانبووە، لە هەموو جۆرەکانی سامان و ماڵی هەبووە، وشەی (ثَمر) یشی کە بە (نكرة) هێناوە، واتە: ماڵ و سامانێکی زۆر، کە بە ئاسانیی نازانرێ و دەرك ناکرێ.

(ثَمَرٌ)، خوێنراوەتەوەو (ثُمُر)یش، هەروەها بە: (ثُمْر)یش، وێڕای ئەوەی بە (ثَمَرٌ)، خوێنراوەتەوە، واتە: بە سێ جۆر خوێنراونەتەوە و هەرسێکیان ماناکەیان یەکە، یاخود مانایەکەیان، زۆر لێك نیزیکە.

٢)- ﴿فَقَالَ لِصَٰحِبِهِۦ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ﴾، بە هاوەڵەکەی خۆی گوت، لە کاتێکدا دەیدواند، واتە: لە کاتی وتووێژ و دواندنیدا پێی گوت.

(صاحب) وێڕای: خاوەن، بە مانای کەسێکیش دێ کە لەگەڵ کەسێکدا جۆرێك لە موناسەبەی هەیە، بۆ وێنە: دراوسێن لە ماڵدا، یان دراوسێن لە دووکاندا، یان جۆرێك لە ئاشنایەتیی و ڕەفاقەتیان هەیە، بە هۆی خزمایەتییەوە، یان بەهۆی برادەرایەتییەوە، گرنگ ئەوەیە (صاحب) بریتیە لە: (الْمُقَارِن فِي الذِّكْر) واتە: کەسێك کە لە کاتی باسکردندا بەراورد دەکرێ، هەروەها (صاحب) بە مانای کەسێکیش دێ، کە لەگەڵ کەسێکدا ناکۆکە (أي: المُخَاصِم) کەسێك لەگەڵ کەسێکدا مشت و مڕو شەڕە قسەی هەیە.

﴿وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ﴾، (الحِوَارُ وَالمُحَاوَرَةُ: مُرَاجَعَةُ الكَلَامِ بَيْنَ مُتَكَلِّمَيْنِ) (حوار ومحاورة) ئەوەیە کە قسە بێت و بچێ لە نێوان دوو کەس دا، کە پێکەوە دەئاخفن و دەدوێن.

تنجا ئایا بابای دەوڵەمەند لە کاتی دواندنیدا، چی بەهاوەڵە هەژارەکەی گوت؟:

٣)- ﴿أَنَا۠ أَكۡثَرُ مِنكَ مَالٗا﴾، واتە: من ماڵ و سامانم لەهی تۆ زیاترە.

٤)- ﴿وَأَعَزُّ نَفَرٗا﴾، هەروەها خەڵك و کەس و کاریشم لە هی تۆ زیاترن و باڵادەسترن، واتە: کەسەکانی دەوروبەری من، لە هی دەوروبەری تۆ، باڵادەسترن و، سامانیشم لە هی تۆ زیاترە، (أَعَزُّ: أي أَشَدُّ عِزَّة، وَالعِزَّةُ ضِدُّ الذلّ)، (أعز) یانی: زۆر بەهێز و باڵادەست (عزة)یش دژ و پێچەوانەی (ذل)ە، یانی: ملکەچیی و زەبوونیی و بێ دەستەڵاتیی.

(النَّفَرُ: عَشِيرَةُ الرَّجُلِ الَّذِينَ يَنْفِرونَ مَعَهُ) (نَفَرْ) ئەو خزم و کەسەی پیاون، کە لەگەڵیدا ڕادەپەڕن و دەردەچن، بۆ بەرگریی لێکردنی و لەسەر کردنەوەی.

کەواتە: بابای دەوڵەمەند خۆی بەسەر هاوەڵەکەیدا هەڵکێشاوە، لە دوو ڕووەوە:

أ - لە ڕووی ماڵ و سامانەوە.

ب - لە ڕووی خزم و کەسەوە.

٥)- ﴿وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ﴾، لە حاڵێکدا ستەمی لە خۆی کرد بوو، چووە نێو باخەکەیەوە.

ستەم لە خۆ کردنەکەی، ئەوە بوو کە هاوبەشی بۆ خوا دادەنا و بێبڕوا بو و، بڕوای بە ڕۆژی دوایی و زیندوو بوونەوە و لێپرسینەوە نەبوو، بەچاکە و نیعمەتەکانی خواش لە خۆی بایی بوو بوو، لە جیاتی ئەوەی سەری بەندایەتیی بۆ خوا دابنوێنێ و شوکرانە بژێر بێ، پێیان لە خۆبایی بو و، پێیان لە کەوڵی خۆی دەرچوو!

هەڵبەتە ﴿ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ ﴾ ئەوانە هەموویان دەگرێتەوە، واتە: هەم هاوبەش بۆ خوا دانەربوو، هەم بێبڕوابوو، بڕوای بە ڕۆژی دوایی نەبو و نکووڵیی لێدەکرد، هەم لە کەوڵی خۆشی دەرچوو بو و، لە خۆی بایی بوو بوو.

یەکێك بۆی هەیە، بڵێ: بۆچی پێشێ خوا ﷻ باسی دوو باخان دەکات: ﴿ جَنَّتَيْنِ ﴾، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ ﴾؟

زانایان گوتوویانە: (أُفْرِدَ الجَنَّةُ هُنَا، لأنَّهُمَا كَانَتَا مُتَدَاخِلَتَينِ) بۆیە لێرە تەنیا باسی یەك باخ کراوە، چونکە دوو باخەکان لە نێو یەکدا بوون، چونکە خوا ﷻ لەبارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿ وَحَفَفْنَٰهُمَا بِنَخْلٍ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمَا زَرْعًا ﴿٣٢﴾ وَفَجَّرْنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرًا ﴿٣٣﴾ ﴾، واتە: ئەگەر لە دوورەوە تەماشات کرد بانایە وەك یەك باخ دەهاتنە بەرچاو، چونکە باخەکە بەپلەی یەکەم ڕەزی ترێیە و، دەوروبەرەکەی بە دارخورمایان تەنراوە، پاشان لە نێوانیان دا: کشتوکاڵ و دانەوێڵە و سەوزایی و تەرەکار و، ڕووبارێکیش یاخود شاجۆگەیەکی گەورەش بەنێویاندا دەڕوا، بۆیە خوا ﷻ بە یەك باخی هێناوە.

دەشگونجێ بگوترێ: یەك باخ بووە، بەڵام دوو بەش بووە.

٦)- ﴿ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدًا ﴾، [کاتێك کە چووە نێو باخەکەیەوە لە حاڵێکدا ستەمی لە خۆی کردبو و] گوتی: پێم وانیە ئەمە هەرگیز لە بەینبچێ، یانی: ئەم باخە هەرگیز نافەوتێ، (بَادَ يَبِيدُ: هَلَكَ يَهْلِكُ، وَفَنِيَ يَفْنَى)، (بَادَ يَبِيدُ) واتە: لە بەینچوو، لە بەیندەچێ، (أَبَدًا: طُولُ المدَّةِ) (أبد) یانی: ماوەیەکی زۆر، ئەگەرنا زانیویەتی کاتێك هەر دێ، هەموو شتێك کۆتایی دێ، بەڵام مەبەستی ئەوە بووە، ماوەیەکی زۆر دەمێنێتەوە.

٧)- ﴿ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً ﴾، واتە: پێشم وانیە (ساعة) بێ.

(ساعة) یانی: کاتی دیاریکراو بۆ ڕووداوێك، ئەو کاتەی دیاریکراوە، ئنجا چ بۆ تێکچوونی ئەم گەردوونە، کە بە کوردیی پێی دەگوترێ: ئاخیر زەمان، کە (الساعة)ی پێ دەگوترێ، چ بۆ هاتنی ڕۆژی دوایی کە: (قیامة)ی پێ دەگوترێ، کە هەندێك جار

ئەگەر ئینسان ورد نەبێ: (قیامة) و (ساعة) تێكەڵ دەكات، كە لێرەدا لە یەك جیان و، لە قورئاندا هەر كامیان لە سیاقی خۆیدا بەكارهاتوە، هەرچەندە جاری وایە وشەی (ساعة)، (الیوم الآخر)یش دەگرێتەوە، واتە: ئەو كاتەی كە هەم گەردوونی تێدا تێكدەچێ و، هەم بازاڕی قیامەت و ڕۆژی دوای دێتە گۆڕێ، بەڵام بە زۆریی وایە (ساعة) یانی: ئەوكاتەی ئاخیر زەمانی تێدا دێ و گەردوونی تێكدەچێ و، (قیامة)ش ئەو كاتەی كە خەڵك تێیدا هەڵدەستنەوە و بازاڕی سزا و پاداشت دێتە گۆڕێ.

٨)- ﴿ وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّي ﴾، یانی: پێم وانیە ئاخیر زەمان بێت و ڕۆژێك لە ڕۆژان بەرپا بێ و، گریمان ئەگەر بشگێڕدرێمەوە بۆ لای پەروەردگارم.

ئەمە جۆرێك بووە لە گاڵتە پێكردنی هاوەڵەكەی، كە هاوەڵەكەی پێی گوتبوو ڕۆژی دوایی دێ و، لێپرسینەوە هەیە و سزا و پاداشت هەیە، ئەویش بە تەوسەوە گوتوویەتی: گریمان ئەگەر بشگێڕدرێمەوە بۆ لای پەروەردگارم، وەك تۆ دەڵێی، ئەی هاوەڵە هەژار و نەدارەكەم!

٩)- ﴿ لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا ﴾، بە دڵنیایی باشتر لە باخەكەم لە لای خوا، وەك شوێنی بۆ لا گەڕانەوە، دەبینم و وەدەست دەخەم.

(المُنقَلَبُ: المَكَانُ الَّذِي يَنْقَلِبُ أي: يَرْجِعُ إِلَيْهِ) واتە: ئەو شوێنەی كە بۆ لای دەگەڕێتەوە.

ئەمە لێرەدا وێڕای ئەوەی خوێنراوەتەوە: ﴿ لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا ﴾، (خَيْراً مِنهُمَا)ش خوێنراوەتەوە، واتە: باشتر لەو دوو باخە.

لێرەدا پێویستە هەڵوەستەیەك بكەین لە بەرانبەر ئەو وشەیە (رُدِدْتُ)دا: ﴿ وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّي ﴾، واتە: ئەگەر گێڕدرامەوە بۆ لای پەروەردگارم، كە هەمان مەبەست لە سوورەتی (فصلت) - ٥٠- ش دا هاتوە، بەڵام بە وشەی (رُجِعْت) خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِن بَعْدِ ضَرَّاءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ هَٰذَا لِي وَمَا أَظُنُّ السَّاعَةَ قَائِمَةً وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَىٰ رَبِّي إِنَّ لِي عِندَهُ لَلْحُسْنَىٰ ۚ فَلَنُنَبِّئَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِمَا عَمِلُوا وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٥٠﴾ ﴾.

واتە: ئەگەر ئێمە بەزەییەكمان لە خۆمانەوە بە مرۆڤ چێژت، دوای ناڕەحەتییەك كە تووشی بووە، زۆر بە داكۆكیی كردنەوە، دەڵێ: ئەم بەزەیی و بەخششە تەنیا تایبەتە بە منەوە، {یانی: هەر بۆ منە و خۆم چنگم كەوتوە} پێشم وانیە كە (ساعة) بەرپابێ و، ئەگەر گریمان گێڕدرامەوە بۆ لای پەروەردگاریشم، بە دڵنیاییەوە پاداشتی هەرە چاك بۆ من لە لای وی هەیە.

خـواش دەفەرمـوێ: ﴿ فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِمَا عَمِلُواْ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ۝٥٠ ﴾، واتـە: بەدڵنیایـی ئەوانـەی بێبـڕوان، هەواڵیـان بـەوەی کردوویانـە پێـدە دەیـن و، بـە دڵنیاییـەوە لـە ئـازار و سـزایەکی زەبـەلاح و گـەورە [قـورس و زەحمـەت] یـان پـێ دەچێژیـن.

ئنجـا ئایـا کـە لـە سـوورەتی (الكهف)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّى ﴾، و لێـرە لـە (فصلت)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَىٰ رَبِّىٓ ﴾، ئـەم جیاوازییـە بۆچـی؟!

(الخطيب الإسكافي) لـە کتێبەکـەی خـۆی دا[1] دەڵـێ: هۆکارەکـەی ئەوەیـە کـە لـە سـوورەتی (الكهف)دا بـاسی دوو باخـەکان کـراوە، بـاسی ئـەو هەمـوو نـاز و نیعمەتـە کـراوە، بێگومـان وشـەی (ردّ)یـش بـەکاردێ بـۆ گێڕانـەوە بـەرەو شـتێك کـە ئینسـان پێـی ناخۆشـبێ، کـە بـە دڵنیایـی مـرۆڤ پێـی ناخۆشـە، بـاخ و گـوڵ و گوڵـزار و موڵـك و مـاڵ و مەصڵەحـەت و ... هتـد هەمـووی بەجـێ بهێڵـێ و بەدەسـتی خاڵیـی بچێتـەوە بـەردەم پـەروەردگاری، بەتایبـەتی ئەگـەر بابایـەکی بێبـڕوا بـێ، بۆیـە لـەوێ دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّى ﴾، چونکـە (رُدَّ)، واتـە: گێڕدرایـەوە بـۆ شـوێنێك، یاخـود بـۆ حاڵەتێـك کـە پێـی ناخۆشـە.

بـەڵام لـە سـوورەتی (فصلت)دا بـاسی نـاز و نیعمـەت نەکـراوە، بەڵکـو بـاسی ئـەوە کـراوە: ئێمـە لـە کاتێکـدا بەزەیـی خۆمـان بـە مـرۆڤ چێـژت، دوای ناڕەحەتییـەك کـە تـووشی بـووە، دەڵـێ: ئەمـە تایبەتـە بـە منـەوەو، پێشـم وانیـە ئاخیـر زەمـان بەرپابـێ و، ئەگـەر گێڕدرامـەوە بـۆ لای پەروەردگاریشـم پاداشـتی هـەرە باشـم چنـگ دەکـەوێ.

بۆیـە وشـەی: ﴿ رُّجِعْتُ ﴾، لەوێـدا گونجـاوە و وشـەی: ﴿ رُّدِدتُّ ﴾، لـە سـوورەتی (الكهف)دا گونجـاوە.

سـبحان اللّـه! خـوای زانـا و شـارەزا و کاربەجـێ، هـەر شایسـتەی خۆیـەتی کـە ئـەو هەمـوو وردەکارییـەی لـە فەرمایشـتی خۆیـدا ڕەچـاو کـردوە!

---

(١) درة التنزيل وغرة التأويل، ص١٩٧.

**مەسەلەی سێیەم:**

**هاوەڵەکەی لە کاتی دواندنیدا پێی گوت: ئایا بەو کەسە بێبڕوای، کە لە گڵ دروستی کردووی و، دوایی لە نوتفە و، پاشان کردووی بە پیاوێکی تێر و تەواو؟ {تۆ بێبڕوای} بەڵام من هەر خوا پەروەردگارمە و، هیچ کەسیش ناکەمە هاوبەشی خاوەن و پەروەردگاری خۆم:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا ﴿٣٧﴾ لَّـٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴿٣٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

**١)- ﴿ قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ ﴾، هاوەڵەکەی {هاوەڵە هەژار و نەدار، بەڵام بە بڕوا و بە قەناعەتەکەی} لە حاڵێك کە سەرگەرمی دواندن و وتووێژ و مشت ومڕ لەگەڵدا کردنی بوو، پێی گوت:**

**٢)- ﴿ أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ﴾، ئایا بێبڕوای بەو کەسەی کە تۆی لە گڵ دروستکردووە.**

**ئەم (أ)، (همزة الإستفهام)ی سەر وشەی (كفرت)، (الإستفهام للتعجيبِ والإنكارِ، وَلَيْسَ عَلَى حَقِيْقَتِه)، پرسیارکردنەکە بۆ سەرسوڕماندن و نکوولیلێکردنە، نەك مەبەستی پرسیارکردن بێ و، ئەویش وەڵامی بداتەوە.**

**کە دەفەرموێ: ﴿ خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ﴾، ئەمە ئاماژەیە بە ئەصڵە یەکەمەکەی (نطفة)ە، چونکە (نطفة) لە خوێن دروست دەبێ و، خوێنیش لەو خۆراکە هەزمکراوەی کە مرۆڤ خواردوویەتی و، ئەویش لەو خواردنانە کە لە زەوی پەیدادەبن و سەرچاوەکەیان گڵە.**

**واتایەکی دیکەی: ﴿ أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ﴾، واتە: ئایا تۆ بێبڕوای بەو کەسەی کە باب و دایکی تۆی ڕاستەوخۆ لە گڵ {یان لە قوڕ} دروستکردون؟!**

**٣)- ﴿ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ﴾، دوایی وەچەی ئادەمی لە (نطفة) یانی: ئاوی پیاو و ئافرەت، دروستکردوە، هەرچەندە زۆرێك لە زانایان گوتوویانە: (النُّطفَةُ: مَاءُ الرَّجُلِ) نوتفە ئاوی پیاوە، بەڵام پێم وایە (نطفة) بریتیە لە کۆی ئاوی پیاو و ئافرەت، ئەویش (مُشْتَقَّةٌ مِنَ النُّطْفِ، وَهُوَ السَّيَلَانُ) لە (نَطْف)ەوە هاتوە، کە بریتیە لە ڕژانی شتێك.**

وشەی ﴿ أَكَفَرْتَ ﴾، دەگونجێ بە مانای: بێبڕوایی بێ.

ئایا بێبڕوای بەو کەسەی کە تۆی دروستکردوە لە (نطفة)؟ هەروەها دەشگونجێ بە مانای: سپڵەیی و ناسوپاسیی بێ.

ئایا بێ نمەك و سپڵەی، بەرانبەر بەوزاتەی تۆی لە تۆویلکە (نطفة) دروستکردوە؟!

٤)- ﴿ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا ﴾، واتە: ئنجا تۆی ڕێکخستوە لە شێوەی پیاوێکدا، یاخود تۆی کردوە بە پیاوێکی تێر و تەواو.

٥)- ﴿ لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّى ﴾، واتە: بەڵام هەر ئەو (خوا ﷻ) پەروەردگاری منە.

لێرەدا ﴿ لَّٰكِنَّا۠ ﴾، (مركّب من (لكن) و (أنا)) یانی: (لكن أنا هو اللّه ربي) واتە: ئەو بەدیهێنەرەی کە تۆش و منیشی لە گڵ و دوای لە (نطفة) دروستکردوە و، دوایی کردووینی بە پیاوێکی تێر و تەواو، من تەنیا ئەو خوایە، پەروەردگار و خاوەنمە.

لە ڕووی ڕێزمانییشەوە: ﴿ لَّٰكِنَّا۠ ﴾، دەبێتە نیهاد (مبتدأ)، ﴿ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّى ﴾، دەبێتە گوزارە (خَبَر)، ئنجا وەك چۆن خوێنراوەتەوە: ﴿ لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّى ﴾، خوێنراویشەتەوە: (لكن هو اللّه ربّي).

٦)- ﴿ وَلَآ أُشْرِكُ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴾، واتە: هیچ کەس ناکەمە، هاوبەشی پەروەردگارم.

یانی: کە تۆ هاوبەشان بۆ خوا دادەنێی، دروستکراوانی خوا، دێنیە ڕیزی خوا، بەڵکو شتەکان و شمەکەکان دێنیە ڕیزی خوا، من هیچ کەسێك لە خاوەن عەقڵ و ئیرادەکانیش، ئەگەر مرۆڤن، ئەگەر جیننن، ئەگەر فریشتەن، نایانهێنمە ڕیزی خوا.

**مەسەلەی چوارەم:**

**بەردەوام بوونی پیاوە بڕوادارە، نەدارەکە، لەسەر دوواندنی هاوەڵە دەوڵەمەندە لە خۆ باییە بێبڕوایەکەی و گوتنی: دەبووایە کاتێک دەچوویە نێو باخەکەتەوە، گوتبات: ئەمە خوا ویستوویەتی و، هێزیش تەنیا بە خوایە، کە دەشبینی من سامانم و ڕۆڵەم لە هی تۆ کەمترن، ڕەنگە، نیزیکە، پەروەردگارم لە باخەکەی تۆ باشترم پێبدات و، بەڵایەکیش لەسەرێوە بۆ باخەکەت بنێرێ، ببێتە زەوییەکی ڕووتی خلیسک، یان ئاوەکەی بە ناخی زەویدا ڕۆبچێ و، هەرگیز نەتوانی بە دوای دابچی و بیگێڕیەوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٣٩﴾ فَعَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يُؤْتِيَنِ خَيْرًا مِّن جَنَّتِكَ وَيُرْسِلَ عَلَيْهَا حُسْبَانًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَتُصْبِحَ صَعِيدًا زَلَقًا ﴿٤٠﴾ أَوْ يُصْبِحَ مَآؤُهَا غَوْرًا فَلَن تَسْتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبًا ﴿٤١﴾ ﴾

## شیکردنەوەی ئەم سێ ئایەتە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ ﴾، واتە: دەبووایە کاتێك دەچوویە نێو باخەکەتەوە.

ئەویش لێرەدا دیسان هەردوو باخەکەی، بە یەك باخ داناون، لەبەر ئەوەی دوو باخەکە تێکهەڵکێش بوون، (لَوْلَا)، لێرەدا بۆ سەرزەنشتکردنە،چونکە: (لَوْلَا)، دەگونجێ بۆ هاندان (**تحضيض**) بێ و، دەشگونجێ بە واتای: (**إمتناع لوجود**) بێ، وەك (**لولا محمد لجاء عمر**) ئەگەر موحەممەد نەبووایە، عومەر دەهات، بەڵام لێرەدا (لَوْلَا)، بۆ سەرزەنشتکردن و سەرکۆنەکردنە ﴿ وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ ﴾، واتە: دەبووایە کە دەچوویە نێو باخەکەتەوە.

٢)- ﴿ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ ﴾، گوتباتایە: ﴿ مَا شَآءَ ٱللَّهُ ﴾، لێرەدا (ما):

١ - (**موصولة**)یە و گوزارە (**خبر**)ی نیهاد (**مبتدأ**)ێکی قرتێنرا وە، کە حاڵی چوونە نێو باخەکە، دەیگەیەنێ، بەمجۆرە: (**أي هذه الجنةُ: ما شاء الله، أي: الأمْرُ الَّذِي شاءالله إعْطَاءَهُ إيَّاي**) واتە: ئا ئەم باخە، کە خوا ویستوویەتی، ئەو شتەیە کە خوا ویستوویەتی بیبەخشێ بە من.

٢ - دەشكونجێ (ما) (نكرة) بێ، ﴿ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ ﴾، بەمجۆرە: (هذا شيء شاءه الله لي) ئەمە ئەوەیە كە خوا ویستوویەتی بۆ من.

٣)- ﴿ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ ﴾، هێز نیە مەگەر بە خوا، یانی: هێز نیە بۆ دروستكردنی باخێكی وا، مەگەر بە خوا، یاخود: هێز نیە بۆ كەسێك كە ئەم باخەی هێناوەتە دی، مەگەر خوا هاوكاریی كردبێ، دەبوو وایە ئاوات گوتبایە: ﴿ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ ﴾، واتە: ئەم باخە ئەو شتەیە، كە خوا ویستوویەتی بۆ من بێ، یان ئەو باخە ئەوەیە كە خوا ویستوویەتی بیدات بە من، هێزیش نیە بۆ پەیداكردنی باخێكی وا، مەگەر بەخواو، ئەو كەسە پەیدای كردوە، بە هەوڵ و هێزێك پەیدای كردوە، كە خوا پێی داوە، دەبوو ئاوات گوتبایە.

لە جیاتی ئەوەی خۆتی پێوە هەڵكێشی و بڵێی: ئەو باخە لە بەین ناچێ و ئاخیر زەمان (الساعة)ش نایەت و، بڵێی: ئەگەر بشگێڕدرێمەوە بۆ لای خوا، هێندە لە خۆت رابببینی و، هێندە لە خۆت ڕازی بێ، پێت وابێ كە لەوێش لەگەڵ ئەو هەموو بێبڕوایی و سپڵەییەدا، خوا باشتر لە هی دنیات پێدەدا!! دوایی پێی دەڵێ:

٤)- ﴿ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالًا وَوَلَدًا ﴾، واتە: ئەگەر دەمبینی من لە تۆ سامان و ڕۆڵەم كەمترن، ئەم ﴿ أَنَا۠ ﴾یە، ڕاناوی جیاكردنەوە (ضمير الفصل)یە، ئەگەرنا دەیتوانی بفەرموێ: (إِن تَرَنِ أَقَلَّ مِنكَ مَالاً وَوَلَداً)، بەڵام ئەمە بۆ تەئكید كردنەوەیە:

ئەگەر تۆ من دەبینی، لە تۆ سامان و ڕۆڵەم كەمترن.

٥)- ﴿ فَعَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يُؤْتِيَنِ خَيْرًا مِّن جَنَّتِكَ ﴾، واتە: نیزیكە، یان ڕەنگە پەروەردگارم باشتر لە باخەكەی تۆم پێبدات، واتە: هەر لە ژیانی دنیادا، (عسى) بۆ ئومێدەوار بوونە و، بریتیە لە داواكردنی شتێك، نیزیك بێ پەیدابێ.

بەڵام ڕێشی تێدەچێ لێرەدا مەبەست پێی پاڕانەوە بێ بۆ خۆی و، تووككردن بێ لە هاوەڵە لە خۆباییەكەی.

٦)- ﴿ وَيُرْسِلَ عَلَيْهَا حُسْبَانًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾، واتە: نیزیكە پەروەردگارم بەڵایەك لەسەرێوە بنێرێتە سەر باخەكەی تۆ.

(حُسْبَاناً: مَصْدَرُ حَسِبَ، كَالغُفْرَانِ، وَهُوَ هُنَا صِفَةٌ لِموصُوفٍ مَحْذُوفٍ، أي: هَلَاكاً حسْبَاناً أي: مُقَدَّراً مِنَ اللّه).

(حُسْبَاناً)، چاوگە لە (حَسَب)ەوە هاتوە، وەك (غُفْرَان) لە (غَفَر)ەوە دێ، لێرەدا (حُسْبَاناً) سیفەتی وەسفكراوێكی قرتێنراوە، یانی: لە بەین چوونێكی ئەندازەگیریی كراو و حیسابكراو لە خواوە.

٧)- ﴿مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾، لە ئاسمانێوە، لە سەرێوە.

هەندێكیش گوتوویانە: وشەی: ﴿حُسْبَانًا﴾، كۆی (حُسْبَانَة)یە، ئنجا (حُسْبَانَة)ش بە چەند مانایەك دێ:

أ - بە مانای هەورە تریشقەیەك كە ئاگری تێدابێ و لە ئاسمانەوە بێ.

ب - بە مانای ناوی كوللەیە.

ج - ناوی تیری بچووكە، یانی: تیر بارانكردن.

واتە: ئەو (حُسبانة) لە ئاسمانەوە، لەسەرێوە، خوا بینێرێتە سەر باخەكەت.

٨)- ﴿فَتُصْبِحَ صَعِيدًا زَلَقًا﴾، واتە: سەرەنجام باخەكەت ببێتە زەوییەكی خلیسك، ﴿زَلَقًا﴾: خلیسك، ﴿صَعِيدًا﴾، ڕووی زەوی، (زَلَقا أي: ذَاتُ زَلَقٍ) واتە: خاوەن خلیسك، (زَلَق)یش چاوگ (مصدر)ی: (زَلَقَتِ الرِّجْلُ: زَلَّتْ وَاضْطَرَبَت)ە، (زَلَقَتِ الرِّجْلُ) واتە: پێیەكە خلیسكا و نەچەسپا، ئنجا (زَلَق) چاوگە، بەڵام كراوە بە وەصف بۆ زێدەڕۆیی تێداكردن، یانی: زەوییەكە، كە خاوەن خلیسكە.

٩)- ﴿أَوْ يُصْبِحَ مَآؤُهَا غَوْرًا﴾، یاخود ئەگەر باخەكەش ئاوا بە یەكجاریی لە بەین نەچێ و، زەوییەكەی ڕووت نەبێتەوە لە كشتوكاڵ و، نەبێتە زەوییەكی سووری سەقەتاڵەی وا، كە مرۆڤ لێی بخلیسكێ، هێندە لووس بێ، ئەگەر ئاواشی لێنەیەت، ئاوەكەی ڕۆبچێ و بچێتە خوار.

﴿غَوْرًا﴾، (غَـوْر: مَصْدَرُ غَارَ المَاءُ، إذَا سَاخَ فِي الأَرْضِ) (غَوْر) چاوگی (غَارَ)یە، ئەگەر ئاوەكە ڕۆچو و بە زەویدا و ونبوو.

١٠)- ﴿فَلَن تَسْتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبًا﴾، واتە: ئەو كاتە تۆ هەر نەتدەتوانی، ئاوەكە بێنیەوە و نەتدەتوانی هەر بەدواشی دا بچی.

لێرەدا ئەو هاوەڵە بڕوادارە بە قەناعەتە نەدارەی، ئامۆژگاریی زۆر باش و دڵسۆزانەی دەكات، واتە: بەر لەوەی كە ئەوەت بەسەربێ، واز لەو بیرە چەوتەت بێنە، چونكە ئەو بیركردنەوە چەوتەتە، كە ئەو هەڵسوكەوتە چەوت و لارەی تێدا بەدیهێناوی.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**سەرەنجام ماڵ و سامانەکەی فەوتا و، باخەکەی بەسەریەکدا ڕما، ئەویش لەسەر ئەو مەسرەفەی لە باخەکەی کردبوو، زۆر پەشێمان بوو، دەستەکانی هەڵگێڕ و وەرگێڕ دەکردن، دەستەکانی پێکدادەدان و، دەیگوت: خۆزگە هیچ کەسم نەکردبایە هاوبەشی خوا، هیچ کۆمەڵێکیشی نەبوو، پشتی بگرن لە بەرامبەر خواداو، خۆیشی هیچی پێ نەکرا، بۆ خۆسەرخستن و تۆڵەسەتاندنەوەو، لەو کات و شوێنەشدا تەنیا خوای هەق باڵادەست بوو، خوا پاداشتیشی باشترە و، سەرەنجامێك کە بۆ دۆستانیشی دایدەنێ چاکترە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ فَأَصْبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ فِيهَا وَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِى لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴿٤٢﴾ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ فِئَةٌ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا ﴿٤٣﴾ هُنَالِكَ ٱلْوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلْحَقِّ ۚ هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا وَخَيْرٌ عُقْبًا ﴿٤٤﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم سێ ئایەتە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ﴾، خوا ﷻ لێرەدا یەکسەر دیمەنی لە بەینچوونی سەروەت و سامان و باخ و ماڵ و موڵکەکەی دێنێتە پێش و، کورتی دەکاتەوە، ئەگەرنا مەرج نیە کە کابرای ساماندارى لە خۆبایی قسەکەی کردوە و، هاوەڵە هەژارەکەشی ئاوای وەڵامداوەتەوە، یەکسەر بەڵا هاتبێ، بەڵام خوا وای کورت دەکاتەوە وەك: یەکسەر دوای ئەو وتووێژ و مشت ومڕەیان پێکەوە، گومانی ئەو پیاوە بڕوادارە یەکسەر هاتبێتە دی! ﴿وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ﴾، ماڵ و سامانەکەی ئابڵووقەدرا، وشەی ﴿بِثَمَرِهِۦ﴾، بە تەئکید لێرەدا مەبەست پێی ماڵ و سامانە، بە هەمووی جۆرەکانیەوە، وێڕای باخەکەش، ئاژەڵی هەبووە، خانووبەرەی هەبووە، ماڵی نەقدینەی هەبووە، هەرچی هەیبووە، هەمووی ئابڵووقەدرا.

(الإحَاطَةُ: الأَخْذُ مِنْ كُلِّ جَانِبٍ، وَالمَعْنَى: أُتْلِفَ مَالُهُ)، (إحاطة) بریتیە لە گیران لە هەموو لایەکەوە یانی: ماڵ و سامانەکەی فەوتێنرا، چونکە: ئەگەر دوژمنێك، دوژمنەکەی خۆی ئابڵووقە بدات و، هەر چوار لایانی لێبگرێ، مانای وایە ڕێی هەڵاتن و دەربازبوونی نیە و، نازانێ لە چ لایەکەوە بەرگریی بکات؟ بۆیە ئەو تەعبیرە بەکارهێنراوە، بۆ لە بەین چوونی شتێك، وەك لە سوورەتی (یونس) - ٢٢ - دا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمْ أُحِيطَ

بِهِمْ ﴾، باسی كەسانێك دەكات، كە بە سواریی كەشتییەك بە دەریادا دەچن، دوای ئەوەی بایەكی توند هەڵدەكات و شەپۆلەكان دەوریان دەگرت، وادەزانن گەمارۆدراون و تازە ڕێی دەربازبوونیان نیە.

٢)- ﴿ فَأَصْبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ فِيهَا ﴾، دوای ئەوەی تێكڕای باخ و ماڵ و سامان و هەرچی هەیبوو، فەوتا: وای لێهات كە دوو لەپە دەستەكانی هەڵگێڕ و وەرگێڕ دەكردن، یان: بە یەكدی دا دەدان، یان سەرە و بنی دەكردن، لەسەر ئەو خەرجیی و مەسرەفەی، لە باخەكەیدا كرد بووی.

پسپۆڕان گوتوویانە: (تقليب الكَفَّيْنِ، حَرَكَةٌ يَفْعَلُهَا المُتَحَسِّرُ)، واتە: هەڵگێڕ و وەرگێڕ كردنی لەپە دەستەكان، كەسێكی خەفەتباری پەشێمان دەیكات، لێرەدا - وەك پێشتریش گوتمان - خوای كارزان و میهرەبان تەعبیرێكی بەكارهێناوە، كە لەگەڵ كلتووری هەموو ئەو كۆمەڵگا و گەلانەدا بگونجێ، كە بە جووڵەی لەپە دەستەكان تەعبیر دەكەن لە پەشێمانیی و خەفەت دەربڕین، لە دوای شتێك كە لە دەستیان چووە و، دەستیان خاڵیی ماوەتەوە و هیچیان بەدەستەوە نەماوە، یان: دەستیان لە هەموو پچڕاوە.

٣)- ﴿ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا ﴾، لە حاڵێكدا كە باخەكە، بەسەر سەربانەكانیدا كەوتبوو، ﴿ خَاوِيَةٌ ﴾، دەگونجێ بە مانای كەوتوو (ساقطة) بێ و، دەشگونجێ بە مانای خاڵیی (خالية) بێ، واتە: لە حاڵێكدا كە سەربانەكانی كەوتبوونە خوار و، باخەكەی بەتاڵ و حەتاڵ بوو بوو، بە بۆشیی مابۆوە و هیچی تێدا نەما بوو.

ئەم تەعبیرەش دیسان مەرج نیە: دیوارێك هەبێ و، سەربانێك هەبێ و، سەربانەكە بڕووخێ و دیوارەكەی بەسەردا بڕووخێ! بەڵكو ئەم تەعبیرەش بەكاردەهێندرێ بۆ لە بەین چوونی شتێك بە تەواویی، چونكە: ئاوەدانییەكان كە دەفەوتێن، پێشێ سەربانەكەیان دەڕووخێ، دواییش دیوارەكە بەسەر سەربانەكاندا دەڕووخێ و هیچی نامێنێ، ئنجا ئەم دیمەنە، خوای پەروەردگار كردوویەتی بە تەعبیرێك بۆ لە بەین چوونێكی تەواو، با دیوارێك و سەربانێكیش لە ئارادا نەبن.

٤)- ﴿ وَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِي لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّيٓ أَحَدًا ﴾، دەیگوت: ئەی خۆزگە! هیچ كەسم نەكردبایە هاوبەشی پەروەردگارم، ﴿ يَٰلَيْتَنِي ﴾، هەرچەندە خۆزگە خواستنە، بەڵام مەبەست پێی پەشێمانییە، پسپۆڕانی زمان گوتوویانە: (هَذَا التعبير تَنزِيلٌ للكَلِمَةِ مَنْزِلَةَ مَنْ يَعْقِلُ، أي: احضري فهَذَا أوَانكِ)، واتە: لێرەدا وشەی (لیت) هێنراوەتە شوێنی كەسێكەوە كە بفامێ، واتە: ئەی پەشێمانیی وەرە ئێستا كاتتە، ئێستا زۆر پەشێمانم، ئەی خەفەت و ناڕەحەتیی ئامادە بە.

٥)- ﴿ وَلَمۡ تَكُن لَّهُۥ فِئَةٞ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، واتە: كۆمەڵێكیشی نەبوون لە بەرانبەری خوادا، یان: لە جیاتی خوا، سەری بخەن و پشتی بگرن، ئەمە خوێنراویشەتەوە: (ولم يكن له فئة)، هەردووك شێوە خوێندنەوەكە هاتوون و، ئەو كاتەش وشەی ﴿ فِئَةٞ ﴾ دەبێ بە: كۆمەڵ (مجموع) دابنرێ، (ولم يكن له مجموعٌ، أو: جمعٌ ينصرونَه) كۆمەڵێكی نەبوون، سەری بخەن، ئەمەش بەرپەرچدانەوەی قسەی بابای بێبڕوایە: ﴿ وَأَعَزُّ نَفَرٗا ﴾، واتە: من كەس و كارم لە تۆ زیاترە، یانی: ئەو كەس و كارەی ئەو خۆی پێوە هەڵدەكێشان، هیچیان لە فریا و بە هانایەوە، نەهاتن، كە پشتی بگرن و سەری بخەن.

٦)- ﴿ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، لە بەرانبەر خوادا، یاخود: لە جیاتی خوا، كاتێك كە خوا پشتی بەردا، كەس نەبوو سەری بخات.

٧)- ﴿ وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا ﴾، لە خودی خۆشیدا توانای دەربازبوون و، سەركەوتنی نەبوو و، نەیتوانی خۆی سەربخات و دەرباز بكات.

٨)- ﴿ هُنَالِكَ ٱلۡوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلۡحَقِّ ﴾، تا لەو كاتەدا دۆستایەتیی و هاوكاریی، تەنیا بۆ خوای هەق بوو.

(وَلایة) بە مانای سەرخستن و هاوكاریی كردن دێ، ئەم وشەیە (الولاية)، خوێنراویشەتەوە: (الوِلاية) كە بە مانای سەرپەرشتیاریی و مشوورخواردن، دێ، واتە: لەو كاتەدا مشوورخۆریی و سەرپەرشتییكردن تەنیا هی خوای هەق بوو، وشەی ﴿ ٱلۡحَقِّ ﴾یش، وێڕای (الحقُّ) كە دەبێتە سیفەتی (أللهِ)، خوێنراویشەتەوە: (هُنالِك الوِلايةُ للهِ الحقُّ) واتە: سەرپەرشتییكردن، یان سەرخستن، لەو كاتەدا تەنیا بۆ خوا چەسپاو و هەق بوو و، كەسی دیكە ئەو توانایەی نەبوو، كە سەرپەرشتیی بكات و مشووری لێ بخوات، ئەگەر وشەكە ژێردار (مجرور) (الولايَةِ) بێ، یاخود: نە هاوكاریی بكات و سەری بخات، ئەگەر وشەكە بۆردار (مضموم) ﴿ ٱلۡوَلَٰيَةُ ﴾ بێ.

٩)- ﴿ هُوَ خَيۡرٞ ثَوَابٗا ﴾، خوا ﷻ پاداشتی باشترە.

لێرەدا ﴿ خَيۡرٞ ﴾ بە مانای (أخيَر) نیە، تاكو مەبەست ئەوە بێ، پاداشتی خوا باشترە لە هی خەڵكی دیكە، بەڵكو مەبەست موتڵەقی باشتر بوونی پاداشتی خوایە، نەك بە بەراورد لەگەڵ پاداشتی جگە لە خوادا.

١٠)- ﴿ وَخَيۡرٌ عُقۡبٗا ﴾، سەرەنجامەكەیشی باشترە.

سەرەنجامێك كە لەلای خوایە، بۆ دۆستانی: كەسانێك كە خۆشی دەوێن، ئەو سەرەنجامە كە لە لای خوایە، باشترە، دیسان ئەوەش لێرەدا مانای ئەوە نیە، سەرەنجامێك كە لەلای خوایە، باشترە لە سەرەنجامێك كە لە لای جگە لە خوایە، بەڵكو مەبەست ئەوەیە سەرەنجامێك كە لە لای خوایە، هەر ئەوە چاكە، هەروەك پاداشتێكیش كە لەلای خوایە، هەر ئەو چاكە.

﴿ عُقُبًا ﴾، خوێنراوەتەوەش: (عُقْباً)، (عُقُباً) و (عُقْباً) هەردووكیان یەك واتایان هەیە.

بەڵێ بەڕێزان! بەو شێوەیە خوا ﷻ ئەو بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە و، وەك پەندێك و نموونەیەك باسی دەكات، وەك لەسەرەتاوە فەرمووی:

﴿ وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلًا رَّجُلَيْنِ ﴾ لەبەر ئەوەی بەراستیی دەرس و پەندی لێوەردەگیرێ و جێگای عیبرەتە بۆ كەسێك كە پەند وەربگرێ و، لە شتانەوە ڕابمێنێ.

سُبْحَانَكَ اللّهُمْ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان حـەوت (٧) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (٤٥ - ٥١)، تـەوەری سـەرەکییان: بـاسی ژیـانی دنیـا و سـەرەنجامەکەی، پاشـان بـاسی هـەر کام لـە ئاخیـر زەمـان و قیامەتـە، بـە تێکهەڵکێشیی، ئنجـا بـاسی نیشـاندانی کـردەوەکانی تاوانبـاران بـە ئامادەکردنـەوە، واتـە: کردەوەکانیـان ئامـادە دەبـن لەبـەر چاویـان، دواییـش ئاماژەیـەکی کـورت بـە بەسـەرهاتی ئـادەم و ئیبلیـس کـراوە.

لـە کۆتاییشـدا بـاسی ئـەو ڕاستییە کـراوە، کـە خـوای بـاڵا دەسـت، هیـچ کـەسی لـە دروسـتکردنی ئاسـمانەکان و زەوی و، تەنانـەت خۆیشـیان ئـاگادار نەکـردوە، یـانی: پـرسی بـە هیـچ کامیـان نەکـردوە و، هیـچ کامیـان ئامـادەش نەبـوون، لـەو کاتـەدا، کـە خـوا ئـەم گەردوونـەی هێناوەتـە دی.

﴿ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ فَأَصۡبَحَ هَشِيمٗا تَذۡرُوهُ ٱلرِّيَٰحُۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقۡتَدِرًا ﴿٤٥﴾ ٱلۡمَالُ وَٱلۡبَنُونَ زِينَةُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابٗا وَخَيۡرٌ أَمَلٗا ﴿٤٦﴾ وَيَوۡمَ نُسَيِّرُ ٱلۡجِبَالَ وَتَرَى ٱلۡأَرۡضَ بَارِزَةٗ وَحَشَرۡنَٰهُمۡ فَلَمۡ نُغَادِرۡ مِنۡهُمۡ أَحَدٗا ﴿٤٧﴾ وَعُرِضُواْ عَلَىٰ رَبِّكَ صَفّٗا لَّقَدۡ جِئۡتُمُونَا كَمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةِۭۚ بَلۡ زَعَمۡتُمۡ أَلَّن نَّجۡعَلَ لَكُم مَّوۡعِدٗا ﴿٤٨﴾ وَوُضِعَ ٱلۡكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلۡمُجۡرِمِينَ مُشۡفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيۡلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلۡكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةٗ وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحۡصَىٰهَاۚ وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرٗاۗ وَلَا يَظۡلِمُ رَبُّكَ أَحَدٗا ﴿٤٩﴾ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلۡجِنِّ فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِۦٓۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِي وَهُمۡ لَكُمۡ عَدُوُّۢۚ بِئۡسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلٗا ﴿٥٠﴾ ۞مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ خَلۡقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَا خَلۡقَ أَنفُسِهِمۡ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلۡمُضِلِّينَ عَضُدٗا ﴿٥١﴾ ﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەكان

[هەروەها وێنەی ژیانی دنیایان بۆ بێنەوە: وەك ئاوێكە لەسەرێوە دامانبەزاندوە، ئیدی یەكسەر ڕووەكی زەوی ئاوێتەی بووە، (پاشان) بۆتە پووشێكی تێكشكاو، كە با ڕایدەماڵێ و، خواش بەسەر هەموو شتێكدا تواناداره ﴿٤٥﴾ سامان و كوڕان، جوانیی ژیانی دنیان و، (كردەوە) باشە ماوەكان، لە لای پەروەردگارت، پاداشتیان چاكترەو، ئومێد بەخشترن ﴿٤٦﴾ ڕۆژێكیش كە چیایەكان دەڕۆێنین و، زەوی بە ڕوون و ڕاشكاویی بێ پەردەو لەمپەر دەبینی و، كۆیان دەكەینەوە، هیچ كامێكیان لێ نابوێرین (ئەو ڕۆژە: ڕۆژێكی سەخت و تووشە) ﴿٤٧﴾ (بەندەكان) بەڕیزیش لەسەر پەروەردگارت ڕادەنوێنرێن (پێیان دەڵێین:) وەك یەكەمجار دروستمان كردبوون، ئاوا هاتنەوە لامان، بەڵكو پێتان وابوو: بەڵێنگەتان بۆ دانانێین ﴿٤٨﴾ ئنجا كتێب (لیستی كردەوان) دانرا و، تاوانباران دەبینی: ترس و لەرزیان هەیە لەوەی تێیدایە، دەڵێن: ئەی هاوار بۆ ئێمە! ئەم كتێبە چییە؟! هیچ بچووك و گەورەیەكی جێ نەهێشتوە كە سەرژمێری نەكردبێ و، ئەوەی كە كردبوویان بە ئامادەیی بینییان و، پەروەردگاریشت ستەم لە هیچ كەس ناكات ﴿٤٩﴾ یادیش بكەوە! كاتێك بە فریشتانمان فەرموو: كڕنووش (ی ڕێزگرتن) بۆ ئادەم ببەن، یەكسەر كڕنووشیان برد، جگە لە ئیبلیس كە لە جینن بوو، لە فەرمانی پەروەردگاری دەرچوو، ئنجا ئایا خۆی و وەچەكەی لە جیاتی من، بە دۆست دەگرن، لە حاڵێكدا كە دوژمنیشتانن؟ (ئیبلیس) خراپترین جێگرەوە(ی خوا)یە بۆ ستەمكاران ﴿٥٠﴾ ئەوانم (بە مەبەستی هاوكاریی) ئامادەی دروستكردنی ئاسمانەكان و زەوی و، دروستكردنی خۆیشیان نەكردوە و، ناشگونجێ من گومڕاكەران بكەمە پشتیوان و هاوكار ﴿٥١﴾].

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(هَشِيمًا): (الهَشْمُ: كَسْرُ الشيءِ الرِّخْوِ، كَالنَّبَاتِ، هَشْمَ العَظْمَ، وَهَشْمَ الخُبْزَ)، (هَشیم) واتە: تێكشكێنراو، (هَشْم) بریتیە لە شتێكی نەرم كە تێك بشكێنرێ و، بهاڕدرێ و، ورد بكرێ، هەروەها بۆ شتی ڕەقیش بەكاردێ، (هَشْمَ العَظْم) ئێسقانەكەی شكاند، (هَشْمَ الخُبْز) نانەكەی ورد كرد.

(تَذۡرُوهُ ٱلرِّيَـٰحُ): واتە: با ڕایدەماڵێ و ڕایدەدات و پرژو بڵاوی دەکاتەوە، (ذَرَتْهُ الرِّيحُ، تَذْرُوهُ وتَذْرِيهِ) واتە: بایەکە ڕایماڵی، یاخود پرژو بڵاوی کردەوە، (تَذْرُوهُ وتَذْرِيهِ) ئەمە بە شێوەی کاری ڕانەبردووە و، بە هەردوو شێوە هاتوە.

(أَمَلًا): (الأَمَلُ: الرَّجَاءُ، أَمَلَ خَيْرَهُ، يَأْمُلُ أَمَلاً، وأَمَّلَهُ: جَعَلَهُ آمِلاً)، (أَمَل) بریتیە لە ئومێد و هیوا، (أَمَلَ خَيْرَه) واتە: بە تەمای چاکەی ئەو بوو، پێی ئومێدەوار بوو، (يَأْمُلُ أَمَلاً) ئەمە بە شێوەی کاری ڕانەبردووەکەیەتی، (وأَمَّلَهُ) واتە: هیواداری کرد، تەماداری کرد.

(نُسَيِّرُ ٱلۡجِبَالَ): چیاکان دڕۆینین و دەیانجووڵێنین، (سَيَّرَهُ: أَخْرَجَهُ وأَجْلاهُ: حَرَّكَهَا)، کەواتە: (نُسَيِّرُ ٱلۡجِبَالَ) واتە: (نُحَرِّكُهَا ونُزِيلُهَا)، (سَيَّرَه) واتە: وەدەریخست و دەربەدەری کردو، لە شوێنی خۆی لایبرد، کەواتە: (نُسَيِّرُ ٱلۡجِبَالَ) یانی: چیایەکان دەجووڵێنین، لادەبەین.

(فَلَمۡ نُغَادِرۡ مِنۡهُمۡ أَحَدًا): هیچ کاممان لێیان بەجێ نەهێشتن، دەگوترێ: (غَادَرَ المَكَانَ: تَرَكَهُ)، واتە: شوێنەکەی بەجێهێشتوە، یانی: لەوێ هەموویان کۆدەکەینەوە و هیچ کامیان لێ نابوێرین.

(وَعُرِضُواْ): (عَرَضَ الشَّيءَ: أَظْهَرَهُ)، واتە: شتەکەی دەرخست ڕاینواند، (وَعُرِضُواْ عَلَىٰ رَبِّكَ) واتە: (أُبْرِزُوا)، واتە: بۆ پەروەردگارت ڕانوێنران و ئاشکرا کران.

(مُشۡفِقِينَ): (أَشْفَقَ مِنهُ أي: حَذِرَهُ) واتە: لێی ترساو بیمی لێی هەبوو، (مُشۡفِقِينَ) واتە: بە ترس و لەرزان، خاوەن بیمان (أَشْفَقَ عَلَيْهِ فَهُوَ مُشْفِقٌ، وَشَفِيقٌ)، (أَشْفَقَ عَلَيْهِ) واتە: ترسی لێی هەبوو، بۆی بە پەرۆشەوە بوو، (فَهُوَ مُشْفِقٌ) ئەو بۆی بە تەنگەوەیە، ترسی بۆی هەیە، بە خەمیەوەیە.

(مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ): واتە: ئامادەم نەکردبوون، (شَهِدَ، شُهُوداً فَهُوَ شَاهِدٌ أي: حَضَرَ)، (شَهِدَ) واتە: ئامادە بوو، هەروەك چۆن (شَهِدَ) بە مانای بینین دێ، بە مانای ئامادە بوونیش دێ، (قومٌ شهود) واتە: کەسانێك یان کۆمەڵێك کە ئامادە بوون.

کەواتە (مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ) واتە: ئامادەم نەکردبوون، یاخود ئاگادارم نەکردبوون.

(عَضُدًا): (العَضُدُ: السَّاعِدُ، وَهُوَ مِنَ المِرْفَقِ إلى الكَتِفِ)، (عَضُدًا) واتە: قۆڵ، (وَعَضَدَهُ: أَعَانَهُ)، هاوکاریی کرد، کەواتە: کە خوا ﷻ دەفەرموێ: (وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلۡمُضِلِّينَ عَضُدًا) واتە: ناگونجێ من گومڕاکەران بکەمە هاوکار، پرسیان پێ بکەم و، ئاگاداریان بکەم، لە کردەوەکانی خۆم.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خـوا ﷻ دوای هێنانـەوەی وێنـەی دوو پیـاوە سـاماندار و نەدارەکـە، کـە یەکەمیـان: بێبـڕوا و هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرو دووەمیـان: خـوا بەیەکگـرو بـڕوادار، بـوو، دوای ئـەو وێنەیـە و وتوویـژی نێوانیـان و، دوای ئـەوەی: سـەرەنجامی لـە خۆبایـی بـوونی بابـای بێبـڕوای سـامانداری خسـتەڕوو، کـە هۆشـدارییەکی گرنگـە، خـوا ﷻ داویـەتی بـە کافـرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبـەر ﷺ، بـە تایبـەت لـە هـۆزی قوڕەیـش، هەروەهـا لـە شـوێنەکانی دیکـە، لـە تائیـف و لـەو شـوێنانە کـە خۆیـان بـە سـەروەت و سـامانەوە هەڵدەکێشـا، بەسـەر هـەژار و نەدارەکانـدا، بەڵکـو هۆشـدارییە بـۆ ئەوانیـش و بـۆ هەمـوو مرۆڤایەتیـی، هەمـوو ئەوانـەی خۆیان بە سـەروەت و سـامانەوە هەڵدەکێشـن و، پێـی لـە خۆبایـی دەبـن، پێـی لـە کەوڵـی خۆیـان دەردەچـن، هۆشـداریی دانـە بـۆ هەموویـان، هەروەهـا دڵدانەوەشـە بـۆ بـڕواداران کـە: پێتـان وانەبـێ ئـەو سـاماندار و لـە خۆبایـی بووانـە، هەتـا سـەر کارەکەیـان بـەردەوام دەبـێ، وەك خۆشـمان دەبینیـن: بـەردەوام ئەوانـەی لـە خۆبایـی دەبـن و لـە کەوڵـی خۆیـان دەردەچـن، ئەوانـەی کـە لـە خەڵـك و خـوا عاسـێ دەبـن، چـۆن دوایـی لووتیـان لـە عـەرزێ دەچەقـێ و، فـڕێ دەدرێنـە زبڵـدانی مێـژووەوە و، ئـەو خەڵکـەش کـە دەچەوسـێنرێنەوە و بەشـخوراو دەکرێـن و، بـێ مـاف دەکرێـن، ئەوانیـش چـۆن دەبنـە جێنشـینی ئـەو خـۆ بـە پـەروەردگار زان و، خـۆ بـە پەرسـتراو زانانـەی، هـەژار و نـەدارەکان بـێ بـەش دەکـەن و، دەچەوسـێننەوە، ئـەوە یاسـایەکی خوایـە و بـەردەوام لـە گەڕدایـە.

بەڵێ: دوای ئەو وێنە هێنانەوەیە:

خـوا ﷻ وێنەیـەکی دیکـە دێنێتـەوە و، دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾، وێنـەی ژیـانی دنیایـان بـۆ بێنـەوە، بـە چـی؟! ﴿ كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾، وەك ئاوێـك لـە سـەرێوە دامانبەزانـدوە، جـاری دیکـەش باسـمان کـردوە: خـوا دەفەرمـوێ: (مـاء) ئـاو، نـا فەرمـوێ: بـاران (مطـر)،! چونکـە ئـەوەی کـە لـە سـەرێ دادەبـەزێ، تەنیـا بـاران نیـە، بەڵکـو: تەرزەیـە، بەفـرە، بارانـە، ئاونگـە، شـەونمە! ﴿ ٱلسَّمَآءِ ﴾یـش بـە مانـای سـەرێیە، ئـەوە هیـچ گومـانی تێـدا نیـە، ئەگەرنـا بـە مانـای ئاسـمان نیـە، بـە مانـا زاراوەییەکـەی، کـە حـەوت ئاسـمانن، چونکـە ئێمـە نازانیـن هـەر سـنووری ئاسـمانی یەکەمیـش تاکـو کوێیـە، تاکـو ئێسـتا

کە زانیاریی گەردووونناسیی، زۆر بەرەو پێشەوە چووە و، بە دووربین و تەلیسکۆبەکان، بە ملیۆنان و بگرە ملیاران کەهکەشان و، هەزاران گەلە کاهکەشان دەبینن، بەڵام تاکو ئێستا سنووری ئاسمانی یەکەمیش دیار نیە.

﴿ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ ﴾، دوای ئەوەی کە ئەو ئاوەمان لە سەرێوە دابەزاند، ڕووەکی زەوی و شیناوردی زەوی لەگەڵی تێکەڵ بوو، هەمیشە کەم تێکەڵ بە زۆر دەبێ: دار و درەختە، ئەگەر دانەوێڵەیە، ئەگەر گیاو باخ و بێستان و گوڵ و گوڵزارە، هەرچی ڕووەك ﴿ نَبَاتُ ﴾ە، و لەسەر زەوی دەڕوێ، دەنك و تۆوەکەی تێکەڵ دەبێ لەگەڵ ئاوداو ئاوێتە دەبێ، چونکە ئاوەکە زۆرترە و، کەم لەگەڵ زۆردا تێکەڵ دەبێ.

ئەوە واتایەکی.

یاخود: ﴿ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ ﴾، واتە: بەهۆی ئەو ئاوەوە، ڕووەکەکانی زەوی دەڕوێن و تێکەڵ بە یەکدەبن و، پێکدا دەچن، واتە: ئەگەر دار و درەختە سەریان تێك دەئاڵێن، ئەگەر شیناوردە، ئەگەر دانەوێڵەیە، تێکەڵ بە یەکدی دەبن.

ئەوە قۆناغێك:

﴿ فَأَصۡبَحَ هَشِيمٗا تَذۡرُوهُ ٱلرِّيَٰحُ ﴾، ئنجا دوای ئەوەی، ئەو دار و درەخت و شیناورد و ڕووەکانە، کە لە زەوی دا ڕواون و بە هەموو جۆرەکانیانەوە، دوای ئەوەی لەگەڵ ئاودا ئاوێتە بوون، یاخود پێکەوە تێکەڵ بوون، دوای ئەوە: هەر ئەوەندە دەبینی: دەبێتە پووش و پەڵاشێکی تێکشکاو، کە بایەکان ڕای دەماڵن و، پرژو بڵاوی دەکەنەوە.

﴿ هَشِيمٗا ﴾، (فعیل)ی بە مانای (مفعول)ە، واتە: تێکشکێنراو، ﴿ تَذۡرُوهُ ٱلرِّيَٰحُ ﴾، یانی (تُفَرِّقُهُ) بایەکان ڕای دەماڵن و بڵاوی دەکەنەوە، ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقۡتَدِرًا ﴾، خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، یانی: وەك چۆن: ئاوێك لە سەرێوە دادەبارێ و، ڕووەکی سەر زەوی پێ دەڕوێ و، پێکەوە تێکەڵ و ئاوێتە دەبێ و، پێکدا دەچێ، بەڵام دوایی هەر هێندە دەبینی، زەرد هەڵدەگەڕێ، دوایی وشك دەبێ و دەبێتە پووش و پەڵاشێکی وشك و، با دێ ڕایدەماڵێ، ژیانی دنیاش هەر بەو شێوەیە: هەرکەس کە تۆ دەیبینی لەم سەر زەوییە، خۆی با دەدات، کاتێك دێ، ڕادەقەنێ، هەر کەس کە دەیبینی خۆی با دەدا، بەسەر بەندەکاندا و، بەم سەر زەوییەدا فیزو کەشخە دەکات و خۆی ڕادەوەشێنێ و، بە خۆی و، بە دەوروبەری خۆی سەرسام دەبێ، بەهێز و دەستەڵاتی سەرسام دەبێ و، بە

سەروەت و سامانی بەحەرامیی وەسەر یەكنراوی، سەرسام دەبێ، چونكە بە زۆری وایە: ئەوانەی بە ماڵ و سامانی خۆیان بوغرا دەبن و، سەرسام دەبن و، لە كەوڵی خۆیان دەردەچن، ئەوانەن كە بە ستەم و، بە شێوازی حەرام سەروەت و سامانیان پێكەوە ناوە، ئەگەرنا ئەوەی بە ئارەقەی نێو چەوان و، لە ڕێی حەڵاڵەوە سەروەت و سامان پێكەوە بنێ، نە پێی لە خۆبایی دەبێ، نە بۆ خراپەش بە كاری دێنێ، زۆرێك لەوانە دەبینی: بەینێك دێ و دەچێ و خۆی بادەدا، بەڵام دوایی ڕادەقەنێ، وەك ئەو قانگە لۆشك و پووش و پەڵاشەی، كە كاتێك بووە خۆی ڕاوەشاندوە، لەشێوەی گیا و گوڵ و دار و درەخت دا، پێكداچووە، بەڵام دوایی تەماشا دەكەی: وشك هەڵدەگەڕێ:

دار و درەخت گەڵاكانی زەرد هەڵدەگەڕێن و، دەكەونە خوار، دوایی ڕەقەڵ دەبن و با ڕایاندە ماڵێ، هەروەها ڕووەك و دانەوێڵە، ئەگەر بدوورێتەوە، یان نەدوورێتەوە، سەرەنجام كاتێك دێ زەرد دەبێ و وشك هەڵدەگەڕێ، دوایی با ڕایدەدات!! ئنجا مرۆڤەكانیش هەر بەو شێوەیەن و ژیانی دنیاش، هەروایە و دەشوبهێتە ئەو ئاوەوە كە لەسەرێوە دێتە خوار و ڕووەكی زەوی پێی دەڕوێ و، دوایی گەشەی پێدەكات و گەورە دەبێ، دوایی زەرد دەبێ و وشك هەڵدەگەڕێ و، دەبێتە پووش و پەڵاشێك و با ڕایدەماڵێ، خواش لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، واتە: ئەوە بە پێی یاسای خوایە و، ژیانی مرۆڤیش دەشوبهێتە ئەو حاڵەوە، كە باسكرا.

ئنجا دەفەرمووێ: ﴿ ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، سامان و كوڕان جوانیی ژیانی دنیان، واتە: ژیانی دنیا لە ڕووە ماددییەكەیەوە: بە ماڵ و سامانەوە و جوانە و جوانی دەكات، هەروەها كوڕان و خزم و كەس و قەڕەباڵغیی، ژیانی دنیا جوان دەكەن، ﴿ وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ ﴾، بەڵام كردەوە ماوە باشەكان، ئەوانەی دەمێننەوە و باشن، واتە: ئەو كردەوە چاكانەی كە دەمێننەوە، ﴿ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا ﴾، لەلای پەروەردگارت، پاداشتیان باشترە، ﴿ وَخَيْرٌ أَمَلًا ﴾، زیاتریش جێگای ئومێد و هیوان، لێرەشدا دیسان (خَيْرٌ)، بە مانای (أخير) نیە، باشتر، كە بەراوردی پێ بكرێ، لەگەڵ ماڵ و سامانی دنیادا، بەڵكو یانی: بە موتڵەقیی كردەوە باشەكان كە دەمێننەوە، پاداشتیان لەلای خوا، هەرە باشەو بەرەهایی باشترن، تەنیا ئەوان جێگای ئومێد و هیوا و دڵ پێ خۆشبوونن.

﴿ وَيَوْمَ نُسَيِّرُ ٱلْجِبَالَ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ بَارِزَةً وَحَشَرْنَٰهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَدًا ﴾، ئەو ڕۆژەش كە چیاییەكان دەڕۆێنین، دەجووڵێنین و لایان دەبەین، زەوییش دەبینی: هاتۆتە گۆڕێ و

ئاشکرا بووە، وەك گۆڕەپانێك، خەڵكەكەمان هەموو تێدا كۆكردۆتەوە و، هیچ كامیان واز لێناهێنین و لێناگەڕێین كە كۆنەكرێنەوە، یانی: هیچ كامیان نابوێرین.

﴿ وَعُرِضُواْ عَلَىٰ رَبِّكَ صَفًّا ﴾، واتە: ڕیز ڕیز لەسەر پەروەردگارت ڕادەنوێندرێن، ئنجا بیهێنە بەرچاوی خۆت لە ئادەم و حەووا (علیهما السلام) دایك و بابی مرۆڤایەتیی، تاكو دوا مرۆڤ كە هەر خوا دەزانێ تاكو چەندی دیكەش ژیان لەسەر ئەم زەوییە بەردەوام دەبێ! هەموو ئەوانە ملیاران بەشەر و جند، كۆبكرێنەوە و ڕیزبكرێن، وەك لە تەفسیری سوورەتی (إبراهیم)دا باسمانكرد، لە گۆڕەپانێكدا كە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: وەك نانێكی سپی وایە، هیچ گوناحێكی لەسەر نەكراوە، واتە: زەوییەكی تازەیە، تەخت و گۆڕ و لەبارە، هیچ بەرز و نزمیی و كەند و لەندی تێدا نیە، ڕێك و تەختە، بیهێنە بەرچاوی خۆت! عەقڵ و خەیاڵ دەستە وسان دەبن بتوانن ئیستیعابی بكەن، كە ئەگەر بێت و هەموو ئەو مرۆڤانەی خوا خوڵقاندوونی و دەیانخوڵقێنێ، لەسەر زەوییان دابنێ، ئەم زەوییەی خۆمان، لە حاڵێكدا كە دەریایەكانیش ببنە خاك، ڕەنگە یەكی پانتایی سانتیمەتر دووجایەكیان بەر نەكەوێ، ئنجا ئایا وەڵامی ئەو پرسیارە لە كوێ دایە؟! لە سوورەتی (إبراهیم) دایە، كە خوا دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ ﴾، واتە: ئەو ڕۆژەی كە نە زەوی ئەو زەوییە دەمێنێ و، نە ئاسمانەكانیش ئەو ئاسمانانە دەمێنن و، هەموویان بۆ خوای تاكی مل پێكەچكەر دێنە گۆڕێ، واتە: بازاڕێكی دیكە و حاڵەتێكی دیكەیە، خوای باڵادەست سازی دەكات، وەك فەرمایشتەكەی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ[1]: [سەر زەوییەك كە دەكرێتە شوێن و گۆڕەپانی لێ كۆكردنەوەی مرۆڤەكان، (هەروەها جینیش) وەك نانێكی سپی وایە، گوناهێكی لەسەر نەكراوە] كەواتە: گۆڕەپانەكە ئەم زەوییە نیە و، حاڵەتێكی دیكە و شوێنێكی دیكەو شێوەیەكی دیكەی جیاواز لەهی ئێستامان دێتە گۆڕێ.

﴿ لَّقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍۭ ﴾، (پێیان دەگوترێ:) هاتن بۆ لامان، وەك چۆن یەكەمجار دروستمان كردبوون، واتە: بە سەڵت و قوڵتیی، بێ ئەوەی كە خزم و خەڵكت لەگەڵ بێ، حیمایەت لەگەڵ بێ، حیزب و دەست و پێوەندت لەگەڵ دابێ و، ماڵ و

---

(١) «يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى أَرْضٍ بَيْضَاءَ عَفْرَاءَ كَقُرْصَةِ نَقِيٍّ لَيْسَ فِيهَا مَعْلَمٌ لأَحَدٍ» رَوَاهُ الْبُخَارِي: ٦١٥٦، وَمُسْلِم: ٧٢٣٣، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، واتە: لە ڕۆژی دوایی خەڵك لەسەر زەویەكی سپی كۆدەكرێنەوە، وەكو نانێكی سپی وایە، گوناهی لەسەر نەكراوە، وە هیچ كەسێك هیچ نیشانەیەكی نیە كە جیای بكاتەوە لەوانی تر.

سامانت لەگەڵدا بێ، بەڵکو بە دەستی خاڵیی، بە پێی پێخواس، بەسەری ڕووت ... هتد، ﴿ بَلْ زَعَمْتُمْ أَلَّن نَّجْعَلَ لَكُم مَّوْعِدًا ﴾، بەڵکو ئێوە پێتان وابوو کە بەڵێنگەیەکتان بۆ دانانێین، پێتان وابوو کە ڕۆژێک نایەت، وەک ئەمڕۆ کۆتان بکەینەوە، بۆ لێپرسینەوە و سزا و پاداشت، پێتان وابوو: وەک بەرزەکی بانان بۆی دەردەچن! بەڵام ئەوە شایستەی خوا نیە، وەک خوا لە سوورەتی (المؤمنون)دا دەفەرمووێ:

﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ ﴾.

واتە: ئایا پێتان وایە بە گاڵتە دروستمان کردوون و، بۆ لای ئێمە ناگێڕدرێنەوە؟! بەرزیی بۆ خوای حوکمڕانی هەق [یانی: خوا زۆر لەوە بەرزترە، ئەو حوکمڕانە هەقە، ئەو خاوەنە ڕەهایەی هەموو شتێك [خوا ﷻ] زۆر لەوە بەرزترە کە خەڵك بخوڵقێنێ و چ ئەوەی چاکە دەکات و، چ ئەوەی خراپە دەکات، دواییش لێیان نەپێچێتەوە، خوا زۆر لەوە بەرزترە، یانی: کاربەجێی خوا و بەزەیی و میهرەبانیی و باڵادەستیی خوا، ئەوەی لێناوەشێتەوە.

﴿ وَوُضِعَ الْكِتَابُ ﴾، واتە: کتێب دانرا، ﴿ الْكِتَابُ ﴾، واتە: نووسراو، لیستی کردەوەکان، ئنجا ئایا ئەو کتێبە یەك لیستی سەرەکییە، وەك زانایان دەڵێن، یاخود هەر کەسێك لیستی خۆی هەیە، وەك لە سوورەتی (الإسراء)دا هاتوە: ﴿ اقْرَأْ كِتَابَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴿١٤﴾ ﴾، واتە: نووسراوەکەی خۆت بخوێنەوە، هەردووکیان گونجاون: چ یەك لیستی گەورە هەبێ، هەرچی کردەوە و هەڵسوکەوتی مرۆڤەکانە تێیدا تۆمارکرابن، چ هەر کەسێکیش لیستێکی تایبەتیی خۆی هەبێ.

﴿ فَتَرَى الْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ ﴾، تاوانباران دەبینی: ترس و لەرزیانە لەوەی کە تێیدایە، لەو نووسراوو کتێب و لیستەدایە، ﴿ وَيَقُولُونَ يَا وَيْلَتَنَا ﴾، دەڵێن: هەی هاوار بۆ ئێمە! وشەی: (ويلة) (مؤنث)ی (وَيْل)ە و (تأنيث) کراوە بۆ زێدەڕۆیی تێدا کردن، واتە: ئەی بەڵا و هاوار و ناڕەحەتیی بۆ ئێمە! وەرە ئێستا کاتیەتی.

﴿ مَالِ هَٰذَا الْكِتَابِ ﴾، ئەم نووسراوە چییەتی! ﴿ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّا أَحْصَاهَا ﴾ [سەریان سوڕدەمێنێ] هیچ بچووکێك و گەورەیەك نابوێرێ، مەگەر هەمووی سەرژمێر کردوە، ئەوە چییە؟! هیچ شتێکی ون نەکردوە و هەموو شتێکی تێدا تۆمار کراوە! ﴿ وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِرًا ﴾، ئنجا نەك هەر ئەوەندە کە کردەوەکان نووسرابن و تۆمارکرابن، بگرە ئەوەی کە کردوویانە، بە ئامادەیی بینییان لەلای خۆیان بە دەنگ و

وێنەوە، بە شێوەی فۆتۆکۆپی کراو، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ، ﴿ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴾، پەروەردگاریشت ستەم لە کەس ناکات.

ئنجا دێتە سەر باسی ئادەم ﷺ و ئیبلیس، نەفرینی خوای لێبی، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُواْ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ﴾، یادیش بکەوە! کاتێك بە فریشتانمان فەرمووز کڕنووش بۆ ئادەم بەرن - واتە: کڕنووشی ڕێزگرتن و سڵاوی لێبکەن، ئادەم دروستکراوێکە خوا دروستی کردوە، وەك جێنشینێکی خۆی دەیەوێ لەسەر زەوی دایبنێ، سڵاوی لێبکەن، سڵاوی ڕێزگرتن - هەموویان کڕنووشیان بۆ برد، [کڕنووشی ڕێزگرتن] جگە لە ئیبلیس.

ئایا ئیبلیس بۆچی لەگەڵ فریشتەکان بووە؟! دیارە ئیبلیس لە فریشتان نەبووە، بەڵام ئەویش بەندەیەکی ئەوەندە بۆ خوا صوڵحاو بووە، شایستەی ئەوە بووە، لە ڕیزی فریشتان دابێ، بەڵام لە جۆرێکی دیکە و دروستکراوێکی دیکە بووە، چونکە ئەگەر فریشتە بووایە، فریشتەکان خوا لە سووڕەتی (التحریم)دا دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴿٦﴾ ﴾، واتە: هەرچی خوا فەرمانیان پێ بکات، سەرپێچیی لێناکەن و، چی پێیان بفەرموێ، جێبەجێی دەکەن.

کەواتە: ئیبلیس کە توانیویەتی سەرپێچیی لە فەرمانی خوا بکات، لە جۆرێکی دیکە و، لە سروشتێکی دیکەیە، جیا لە هی فریشتان، ﴿ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ ﴾، ئیبلیس لە جینن بوو، ئەمە دەقە لەسەر ئەوە کە ئیبلیس لە فریشتان جیایە و ئەو لە جینن بووە، یانی: دروستکراوێکی دیکە بووە، کە پێی دەگوترێ: جینن، واش پێدەچێ: وەك چۆن ئادەم بابی مرۆڤانە، ئیبلیسیش بابی جینن بێ (أبو الجن)، جینیش لە پێش مرۆڤدا دروستکراون، هەم ئێرە دەیگەیەنێ، هەم ئەو ئایەتەی سووڕەتی (الحجر) کە کاتی خۆی تەفسیرمان کرد: ﴿ وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ ﴾، واتە: جینمان پێشتر لە بڵێسەی ئاگرێکی کونکەر دروستکرد بوو.

(الجانّ) زۆرێك لە زانایان بە: (أبو الجن) بابی جینن، مانایان کردوە، ئنجا لە فەرمودەی پێغەمبەریشدا ﷺ هاتوە کە فریشتەکان لە ڕووناکیی (نور) دروستکراون[1]،

---

(١) (خُلِقَتِ الْمَلَائِكَةُ مِنْ نُورٍ، وَخُلِقَ الْجَانُّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ، وَخُلِقَ آدَمُ مِمَّا وُصِفَ لَكُمْ) أخرجه أحمد: ٢٥٢٣٥، ومسلم: ٢٩٩٦.

بەڵام جینن بە ئیبلیسیشەوە، کە باپیرانە، بە دەقی ئایەت لە بڵێسەی ئاگر دروست بوون.

﴿ فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِۦٓۗ ﴾، واتە: ئیبلیس لە فەرمانی پەروەردگاری دەرچوو، یاخیی بوو. ﴿ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِي ﴾، ئنجا ئایا خۆی و وەچەکەی لە جیاتی من بە دۆست دەگرن و دەیانکەنە جێگرەوەی من، ئایا ئەوانە دەکەنە سەرپەرشتیار و دۆستی خۆتان ﴿ وَهُمۡ لَكُمۡ عَدُوُّۢۚ ﴾، لە حاڵێکدا کە دوژمنیشن بۆ ئێوە؟! ﴿ بِئۡسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلٗا ﴾، خراپترین جێگرەوە، ئیبلیس و وەچەکەیی بۆ ستەمکاران.

لە کۆتایی دا، خوا باسی ڕاستییەکی مەزن دەکات و، دەفەرموێ: ﴿ مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ خَلۡقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَا خَلۡقَ أَنفُسِهِمۡ ﴾، من نە لە دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی و، نە لە دروستکرانی خۆیشیان دا، ئەوانم ئاگادار نەکردۆتەوە و، ئەوانم لەو کاتەدا، ئامادە نەکردوە، یاخود پرسم پێیان نەکردوە، نە بۆ دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی، نە بۆ دروستکرانی خۆشیان، ﴿ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلۡمُضِلِّينَ عَضُدٗا ﴾، هەروەها من ئەوانەی کە گومڕا کەرن، سەرلێشوێنن، بۆم ناگونجێ و شایستەم نیە، بیانکەمە هاوکار و پشتیوان، واتە: چ لە دروستکرانی مرۆڤان و جینن دا، چ لە دروستکرانی زەوی و ئاسمانەکاندا، ئەوانە هیچ پشك و بەشێکیان نەبووە، نەك هەر هاوکارم نەبوون، بەڵکو ئاگاداریش نەبوون و، لەو کاتەدا هەر ئامادەش نەبوون.

یاخود: پرسیان پێنەکراوە و ئاگادار نەکراونەوە، کە ئەوە خوا ﷻ کەردوونێك دروست دەکات و، لە نێویدا مرۆڤ هەیە و، جینن هەیە و، فریشتەکان هەن، کەواتە: با لە کەوڵی خۆیان دەرنەچن و، بزانن تاکو کوێ بڕ دەکەن و، پێیان وانەبێ: هێندە گەورەن، ئاگاداری سەرەتا و سەرەنجامی دروستکراوەکانی خوای پەروەردگار بن!!

## مەسەلە گرنگەكان

**مەسەلەی یەكەم:**

**هەروەها وێنەی ژیانی دنیایان بۆ بێنەوە، وەك ئاوێكە كە لەسەرێوە دامانبەزاندوە، یەكسەر ڕووەكی زەوی ئاوێتەی بووە، پاشان بۆتە پووشێكی وردو خاش، كە با ڕایدەدا و پرژ و بڵاوی دەكات و، خواش تواناداره بەسەر هەموو شتێكدا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ فَأَصْبَحَ هَشِيمًا تَذْرُوهُ ٱلرِّيَٰحُ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقْتَدِرًا ﴿٤٥﴾ ﴾.

**شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە شەش، بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، وێنەی ژیانی دنیایان بۆ بێنەوە: بیخە بەرچاویان، كە ژیانی دنیا چۆن دەست پێدەكات و چۆن كۆتایی دێ.

٢)- ﴿ كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾ [وێنەی ژیانی دنیا] وەك ئاوێكە كە لەسەرێوە ناردوومانەتە خوار و، دامانبەزاندوە، لە شێوەی باران و بەفر و تەرزەدا.

٣)- ﴿ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ ﴾، بەو ئاوە كە لەسەرێوە دامانبەزاندوە، شینلورد و ڕووەكی زەوی، لە گەڵیدا تێكەڵ بوو، یان بەهۆیەوە پێكداچوو، لێرەدا وشەی: ﴿ نَبَاتُ ﴾، هەم دار و درەخت دەگرێتەوە، هەم دانەوێڵە دەگرێتەوە، هەم تەرەكار دەگرێتەوە، هەم گیا و گوڵ دەگرێتەوە، هەم لەوەڕ و زەمەند دەگرێتەوە، هەم هەرچی لەسەر زەوی دەڕوێ، دەیگرێتەوە. واتە: ڕووەكی زەوی، لەگەڵ ئاوەكەدا ئاوێتە بوو، كە ئەمە وەك پێشتر باسم كرد: ئیعجازێكی زانستییشی تێدایە، چونكە بێگومان زۆربەی پێكهاتەی ڕووەك بە هەموو جۆرەكانیەوە، ئاوە.

كەواتە: ئەوە دەنكە تۆوەكەیە، یاخود دەنكە دانەوێڵەكەیە، یان ناوكە دەنكی نەمامی درەختەكەیە، تێكەڵ بە ئاوەكە دەبێ، چونكە: كەم تێكەڵ بە زۆر دەبێ، ئەوە واتایەكی.

واتایەكی دیكەی: ﴿ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ ﴾، واتە: بە هۆی ئەو ئاوەوە، ڕووەكی زەوی، ئاوێتەی یەكدی بو وە، پێكداچوو، بوو بە جەنگەڵی چڕو پڕ، چونكە دار و

درەختە، دانەوێڵەیە، سەوزەیە، کە لە دوورەوە دەبینی، هەمووی سەری تێك ئاڵقاوە و پێکداچووە، پێکەوە تێکەڵ و تاوێتە بوو.

٤)- ﴿ فَأَصۡبَحَ هَشِيمٗا ﴾، لێرەدا خوا ﷻ قۆناغەکانی دیکە دەپێچێتەوە، کە وەك لە سوورەتی (الحديد) و لە سوورەتی (الزمر)دا هاتوە، خوا بە چەند قۆناغێکی دیکە دەیهێنێ، بەڵام لێرە ئەو قۆناغانە دەپێچێتەوە، چونکە عیبرەت لێرەدا ئەوەیە کە ژیانی دنیا زۆر زوو تێپەڕە، بۆیە خوا ئەو قۆناغانە لێرەدا دەپێچێتەوە، بەڵام لە شوێنی دیکە، کە خوا باسی قۆناغەکان دەکات، بۆ ئەوەیە کە: سروشتی ژیانی دنیا بخاتە ڕوو، کە بەو قۆناغانەدا دێ، بەڵام لێرەدا خوا ﷻ دەیەوێ ئەوەمان لێ حاڵیی بکات، کە ژیانی دنیا زۆر زوو تێپەڕە، بۆیە قۆناغەکان دەپێچێتەوە، تاکو زوو تێپەڕییەکەی ژیانی دنیا، بە هۆی وێچوێنراو (مشبّه به)ەکەیەوە، کە ئەو ئاوەیە: دابەزێنراوە لە سەرێوە و، ڕووەك و شیناوردی پێ ڕواوە، کەچی هەر ئەوەندە دەزانی: دەبێتە پووش و پەڵاشێك و، با ڕایدەماڵێ، تاکو ئەوە جوانتر بەرجەستە ببێ، ئەگەرنا تەماشا بکەین لە سوورەتی (الزمر)دا، خوا ﷻ ئاوا باس دەکات:

﴿ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَسَلَكَهُۥ يَنَٰبِيعَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ثُمَّ يُخۡرِجُ بِهِۦ زَرۡعٗا مُّخۡتَلِفًا أَلۡوَٰنُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصۡفَرّٗا ثُمَّ يَجۡعَلُهُۥ حُطَٰمًاۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٢١ ﴾.

واتە: ئایا سەرنج نادەی! خوا لە سەرێوە ئاوێکی دابەزاندوە، دوایی خستوویەتە نێو سەرچاوەکانی زەوییەوە، دوایی کشتوکاڵێکی پێ دەردێنێ کە ڕەنگەکانی جیا جیان، دوایی پێدەگات و گەشە دەکات و کامڵ دەبێ، دوایی دەیبینی زەرد هەڵگەڕاوە، پاشان دەیکاتە پووش و پەڵاشێکی تێکشکێنراو، بێگومان لەوەدا بیرخەرەوە هەیە بۆ خاوەن عەقڵان.

لێرەدا قۆناغەکان وردتر باس دەکات، چونکە لێرەدا مەبەست ئەوەیە، سروشتی ژیانی دنیا بخرێتە ڕوو، هەروەها لە سوورەتی (الحديد)دا، خوا ﷻ قۆناغەکانی ژیانی دنیا لێرەش وردتر باس دەکات و دەفەرموێ:

﴿ ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞ وَزِينَةٞ وَتَفَاخُرُۢ بَيۡنَكُمۡ وَتَكَاثُرٞ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِۖ كَمَثَلِ غَيۡثٍ أَعۡجَبَ ٱلۡكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصۡفَرّٗا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمٗاۖ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٞ شَدِيدٞ وَمَغۡفِرَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٞۚ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ٢٠ ﴾.

واتە: بزانن! کە ژیانی دنیا تەنیا یارییە و، خافڵانە و، جوانییە و، خۆ بەسەر یەکدا هەڵکێشانە لە نێو خۆتاندا و، زۆر کردنی سامان و ڕۆڵان، وەك ئاوێکی دەفریاهاتوو [کە خوا دایدەبەزێنێ لە حاڵێکدا کە خەڵك داوای دەکەن و پەکیان لەسەری کەوتوە] ڕووەکەکەی

جوتیار و کشتوکاڵکەرەکان سەرسام دەکات، دوایی پێدەگات و گەشە دەکات و کامڵ دەبێ، دوایی دەبینی زەرد هەڵگەڕاوە، پاشان دەبێتە پووش و پەڵاشێکی تێکشکێنراو و، لە دوارۆژیش دا سزایەکی سەخت و لێبوردن و ڕەزامەندییەك لە خواوە هەیە و، ژیانی دنیاش تەنیا ڕابواردنێکی فریودەرە.

بەڵام لێرە - لە سووڕەتی (الكهف) دا - وەك گوتمان: زۆرێك لە قۆناغەکان پێچراونەوە، بۆ ئەوەی یەکسەر بێتە سەر باسی ئەوە کە چۆن ژیانی دنیا زوو کۆتایی دێ؟ بۆ کەسێك کە بە چاوی عەقڵ و دڵ تەماشای بکات و، تەنیا ڕواڵەتەکەی نەبینێ.

﴿ فَأَصْبَحَ هَشِيمًا ﴾، دوایی دەبێتە پووش و پەڵاشێکی تێکشکێنراو، (**الهَشِيمُ عَلَى وَزْنِ فَعِيلٍ بِمَعْنَى مَفْعُول أي: مُحَطَّماً وَالهَشْمُ: الكَسْرُ وَالتَّفْتِيت**)، واتە: (**هشیم**) لەسەر کێشی (**فعیل**)ە، بەڵام بە مانای (**مفعول**)ە، واتە: تێکشکێنراو و هاڕدراو و وردکراو، چونکە (**هشیم**)، واتە: شکاندن و وردکردن.

٥)- ﴿ تَذْرُوهُ الرِّيَاحُ ﴾، بایەکان ڕایدەماڵن، ﴿ الرِّيَاحُ ﴾، کۆی (ریح)ە، بایەکان ڕایدەدەن و پرژ و بڵاوی دەکەنەوە، (**والذُّرو: الرَّمي فـي الهَوَاء**) (ذَرو) فڕێدانە بە نێو هەوادا و، پرژ و بڵاوکردنەوەیە.

٦)- ﴿ وَكَانَ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ مُّقْتَدِرًا ﴾، خواش لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، ئەوە بنچینەیە لە زمانی عەرەبییدا: (**زِيَادَةُ المبْنَى تَدلُّ عَلَى زِيَادَةِ المعْنَى**) واتە: زۆرایی بێژە، زێدەیی واتا دەگەیەنێ، ئەگەر بفەرمویێ: (قدیر) و (قادر) یانی: بە توانا، بەڵام (مُقتَدر)، واتە: (**قَادِرٌ كَامِل القُدْرَة**) واتە: زۆر بە توانایە، چونکە بێژەکەی زیاترە، ماناکەشی بەهێزترە.

**مەسەلەی دووەم:**

**سامان و کوڕان: جوانیی ژیانی دنیان، بەڵام کردەوە چاکە ماوەکان، لە لای پەروەردگارت پاداشتیان چاکتر و ئومێدەوارکەرترن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱلْبَـٰقِيَـٰتُ ٱلصَّـٰلِحَـٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، سامان و کوڕان جوانیی ژیانی دنیان.

لە سوورەتی (آل عمران)یشدا خوا دەفەرموێ:

﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَـٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَـٰمِ وَٱلْحَرْثِ ۗ ذَٰلِكَ مَتَـٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ ﴿١٤﴾ ﴾.

کە لە شوێنی خۆی، بە تەفصیل مانای ئەو ئایەتەمان کردووە، شیمان کردوەتەوە، جێی سەرنج ئەوەیە کە خوا لێرە و لە چەند شوێنێکی دیکەدا باسی کوڕان ﴿ وَٱلْبَنُونَ ﴾ دەکات و باسی کچان ناکات، ئایا حیکمەتی ئەوە چییە؟!

پێم وایە حیکمەتەکەی دوو شتە:

**یەکەم:** وەچەی مرۆڤ لە پشتێوە زیاتر بەردەوام دەبێ، هەڵبەتە لە ڕێی بەرێشەوە هەر وایە، بەڵام ڕەچەڵەك (نَسَبْ) عورف و نەریتی زۆربەی کۆمەڵگاکان وایە، کە لە ڕێی کوڕانەوە بەردەوام دەبێ.

**دووەم:** پیاوان زیاتر بۆ جەنگ و بۆ ڕووبەڕووبوونەوە و، کاتی مەترسیی، بەکاردێن و ئەوان زیاتر ئەو کەلێنە دەگرن، ئەگەرنا لە ڕووی شەریعەتەوە، بێگومان نێر و مێ خوا دایناون و، نێرایەتیی و مێیایەتیی سەنگی مەحەك نین، بەڵکو لە نێو نێران و مێیناندا، ئەوانە باشترن کە پارێزکارترن، وەك خوای دادگەر لە سوورەتی (الحجرات)دا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ

﴿وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾﴾، كه‌واته: كێ پارێزكارتر بێ، ئه‌وه له‌لای خوا ڕێز و حورمه‌تی زیاتره، له نێر و مێ و نه‌ته‌وه و هۆزه‌كان....

٢)- ﴿وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ﴾، كرده‌وه چاكه ماوه‌كان:

﴿وَٱلْبَٰقِيَٰتُ﴾، كۆی (باقية)یه یانی: شتێكی چاك كه ده‌مێنێته‌وه، ﴿ٱلصَّٰلِحَٰتُ﴾یش كۆی (صالحة)یه و ئه‌ویش به مانای سیفه‌تێكی باشه.

(الباقيات الصالحات): (صفتان جرتا على موصوف محذوف، أي: الأعمال الصالحات، والباقيات التي لا زوال لخيرها، وهو ثوابها الخالد)، واته: ﴿وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ﴾، دوو سیفه‌تن بۆ وه‌سفكراوێكی قرتێنراو، كه سیاق ده‌یگه‌یه‌نێ، واته: كرده‌وه باشه‌كان، ماوه‌وه‌كان كه خێرو چاكه‌یان لاناچێ كه پاداشته نه‌بڕاوه‌كه‌یانه، ئه‌وانه‌ی شه‌ریعه‌ت به باشیان بزانێ و جێی ڕه‌زامه‌ندیی خوا و، به‌رژه‌وه‌ندیی و سوودیان بن، كرده‌وه باشه‌كانیش ئه‌وانه‌ن:

ئه‌دی ماوه‌كان (الباقيات) یانی چی؟! واته: ئه‌وانه‌ی كه پاداشته‌كه‌یان ده‌مێنێته‌وه، نه‌ك وه‌ك كارو به‌رهه‌می دنیایی ماددیی، كه هه‌ر ئه‌و كاته‌یه لێی به‌هره‌مه‌ند ده‌بی و دوایی ده‌ڕوا، به‌ڵام كرده‌وه باشه‌كان، پاداشته‌كه‌یان ده‌مێنێنه‌وه.

٣)- ﴿خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا﴾، پاداشتیان له‌لای په‌روه‌ردگارت باشتره، یانی: پاداشتی ئه‌وان هه‌ره باشه.

٤)- ﴿وَخَيْرٌ أَمَلًا﴾، هه‌روه‌ها ئومێده‌واركه‌رترن، یاخود: به‌س ئه‌وان جێگای ئومێدن، چونكه هیوادار بوون ته‌نیا به پاداشتی كرده‌وه چاكه‌كانه، چونكه كه‌سێك كه ئومێده‌واره به پاداشتی كرده‌وه باشه‌كانی، به هیوایه كه خوا ﷻ گفت و به‌ڵێنی خۆی بۆ بێنێته دی و، خوای په‌روه‌ردگاریش به‌ڵێنی ڕاسته، كه‌واته: ته‌نیا ئه‌وه جێگای ئومێد و هیوا و دڵ پێخۆشبوونه.

لێره‌دا فه‌رمووده‌یه‌كی پێغه‌مبه‌ر ﷺ دێنین، كه ده‌فه‌رموێ:

{مَنْ كَانَتِ الآخِرَةُ هَمَّهُ، جَعَلَ اللَّهُ غِنَاهُ فِي قَلْبِهِ، وَجَمَعَ لَهُ شَمْلَهُ، وَأَتَتْهُ الدُّنْيَا وَهِيَ رَاغِمَةٌ، وَمَنْ كَانَتِ الدُّنْيَا هَمَّهُ، جَعَلَ اللَّهُ فَقْرَهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ، وَفَرَّقَ عَلَيْهِ شَمْلَهُ، وَلَمْ يَأْتِهِ مِنَ الدُّنْيَا إِلاَّ مَا قُدِّرَ لَهُ}( أخرجه التِّرْمِذِي: ٢٤٦٥، عَنْ أَنَسٍ، وَصَحَّحَهُ الألباني).

واته: هه‌ر كه‌سێك ڕۆژی دوایی بكاته جێی مه‌به‌ست و بایه‌خی، خوا ﷻ بێ نیازیی ده‌خاته نێو دڵی و، كاروباری بۆ كۆده‌كاته‌وه و، دنیاش به ملكه‌چیی دێته به‌ر ده‌ستی،

بەڵام هەر کەسێك دنیا بکاتە جێی هیوا و ئاوات و بایەخ پێدانی، خوا هەژارییەکەی دەخاتە نێو چاویی، (هەمیشە هەست بە هەژاریی و ئاتاجیی دەکات) و کاروباری لێ بڵاو دەکات و، لە دنیاش دا تەنیا ئەوەندەی بۆ دێ، کە بۆی بڕیاردراوە.

لێرەدا زانایان چەند نوکتەیەکی ڕەوانبێژیی و زمانەوانییان هێناون، ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین:

یەك: ﴿ وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ ﴾، بۆچی خوا ئەو ناوەی لێناون؟! دەڵێ: (**الأعمالُ الَّتِي تَبْقَى ثمراتُها الأخروية من الإعتقادات وَالأَخْلَاق وَالعِبَادَاتِ ومخْتلفِ الطَّاعَاتِ، خَيْرٌ فِي الجَزَاءِ وَالفَائِدَة، وَخيرٌ لما يتعلّق بهَا مِنَ الأَمَل**)، واتە: ئەو کردەوە باشانەی کە بەرهەمە دوارِۆژییەکانیان دەمێننەوە، ئنجا چ پەیوەندییان بە ئیمان و عەقیدەوە بێ، چ پەیوەندییان بە پەرستشەکانەوە بێ، یان پەیوەندییان بە ڕەوشت و ئاکارەکانەوە بێ، چ پەیوەندییان بە جۆرەکانی فەرمانبەرییەوە هەبێ، ئەوانە بێگومان پاداشتیان زیاترە و، لە ڕووی پاداشت و سوودیشەوە، باشترن و، لەو ڕووەوە کە ئینسان پێیان ئومێدەوار بێ و پێیان دڵخۆش بێ، ئەوانە باشترن.

دوو: ئەوە کە خوا ﷻ سامان پێش کوڕان دەخات، لەبەر ئەوەیە کە بە هۆی سامانەوە، ئینسان دەگونجێ هاوسەرگیریش بکات و، کوڕ و کچیشی پەیدابن، ئنجا سامان بەبێ کوڕانیش سوود دەگەیەنێ، بەڵام کوڕان و کچان، ئەگەر ماڵ و سامانت نەبێ، زۆرجار لەسەرت دەبنە بار!

سێ: خوای پەروەردگار وشەی: ﴿ زِينَةُ ﴾ی بە تاك هێناوە: ﴿ ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، لە حاڵێکدا کە پاڵدراوەتە لای دووانیش، هەم لای سامان و هەم لای کوڕان، لەبەر چی؟! لەبەر ئەوەی لە ئەصڵدا: وشەی (زينة) چاوگە و بەکارهێنراوە بۆ بەرکار (**مفعول به**) واتە: ڕازێندراوە (مُزَيَّن) وەك ئەوەی خودی ڕازاندنەوەکە بێ.

چوار: خوا ﷻ لێرەدا مانەوەی کردەوە باشەکانی، وا داناوە: کە شتێکە جێی دڵنیاییە و، لێی بوونەوە و جێگای مشت ومڕ نیە، ئەمیش بۆ ئاگادار کردنەوەیە لەوە کە مانەوەی پاداشتی کردەوە باشەکان، شتێکی جێی دڵنیاییە و پێویست بە ڕوونکردنەوە ناکات، بۆیە یەکسەر دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ ﴾، واتە: مشت و مڕ هەڵناگرێ، کە پاداشتی کردەوە باشەکان، دەمێنێتەوە.

پێنج: وشەی ﴿ خَيْرٌ ﴾، کە دووبارە بۆتەوە: ﴿ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا ﴾، بۆیە دووبارە بۆتەوە، تاکو بزانرێ: کە کردەوە چاکەکان: لە ڕووی پاداشتەوە باشترن و، لە ڕووی پێ ئومێدەواربوون و دڵ پێخۆشبوونیشەوە باشترن، لە هەردووك ڕووەکانەوە باشترن، بۆیە ئەگەر بەس یەکجار هێنابای، تەنیا ڕوویەکی دەگرتەوە.

شەش: وشەی ﴿ وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ ﴾، گشتگیرە بۆ هەموو ئەو کردەوانەی کە چاکن، هەر بۆیە هەندێ لە زانایان کە گوتوویانە:

أ - مەبەست ئەو زیکرانەیە: (سبحان الله، والحمد لله، ولا إله إلا الله، والله أكبر).

ب - هەندێکی دیکەیان گوتوویانە: مەبەست پێنج نوێژە فەڕزەکانن.

ج - هەندێکی دیکەش گوتوویانە: مەبەست پێ پێنج پایەکانی ئیسلامن.

لە ڕاستییدا ئەوە هەڵهێنجانی ئەوان بووە، ئەگەرنا: ﴿ وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ ﴾، واتە: هەموو ئەو کردەوە باشانەی کە پاداشتەکەیان دەمێنێتەوە، چ پەیوەندییان بە لایەنی ئیمان و عەقیدەوە هەبێ، چ پەیوەندییان بە لایەنی پەرستشەکانەوە هەبێ، چ بە لایەنی ڕەوشت و ئاکارەوە هەبێ، یان بە لایەنی حەڵاڵ و حەڕامەوە هەبێ و، بە هەر لایەن و ڕەهەندێکی ژیانەوە هەبێ.

**مەسەلەی سێیەم:**

**یاد بکەوە! ئەو ڕۆژەی چیایەکان دەڕۆێنین، دەجووڵێنین و، زەوی بە دەرکەوتوویی دەبینی و، کۆیان دەکەینەوە و کەسیان لێ نابوێرین و، بەڕیز لەسەر پەروەردگارت ڕادەنوێنرێن، دەگوترێ: وەك چۆن یەکەمجار دروستمان کرد بوون، هاتنەوە لامان، بەڵکو پێتان وابوو بەڵێنگەتان بۆ دانانێین (بۆ زیندووکرانەوە)، نووسراو (لیستی کردەوان)یش ڕۆنرا، ئنجا تاوانبارانیش دەبینی ترس و بیمیان لەوە هەیە کە تێیدایە و، دەڵێن: ئەی هاوار بۆ ئێمە، ئەمە چییە! ورد و درشتی نەبواردوە و هەمووی سەرژمێر کردوە و، لەوەی کردبوویان بە ئامادەیی دیتیان و، پەروەردگاریشت ستەم لە هیچکەس ناکات:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ نُسَيِّرُ ٱلْجِبَالَ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ بَارِزَةً وَحَشَرْنَٰهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَدًا ﴿٤٧﴾ وَعُرِضُوا۟ عَلَىٰ رَبِّكَ صَفًّا لَّقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍۭ ۚ بَلْ زَعَمْتُمْ أَلَّن نَّجْعَلَ لَكُم مَّوْعِدًا ﴿٤٨﴾ وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلْكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحْصَىٰهَا ۚ وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟ حَاضِرًا ۗ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴿٤٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَيَوْمَ نُسَيِّرُ ٱلْجِبَالَ ﴾، ئەو ڕۆژە کە چیاییەکان دەڕۆێنین، لایان دەبەین.

﴿ نُسَيِّرُ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (تُسَيَّرُ الجبَالُ) ئەو کاتە (الجبال) (مرفوع) دەبێ کە (نائب الفاعل)ە، ئەو ڕۆژە کە چیایەکان دەڕۆێنرێن و دەجووڵێنرێن و لادەبرێن، (تَسْيِيرُ الجبَالُ: نَقْلُها وإزالَتُها) (تسْيير الجبال): گواستنەوەو لابردنیانە، کە لە سوورەتی (المرسلات) و، لە سوورەتی (**الواقعة**)شدا، خوا ئاماژەی بە لابردن و جووڵاندن و ڕۆیاندنی چیاییەکان کردوە.

أ - لە سوورەتی (المرسلات)دا دەفەرموێ: ﴿ وَسُيِّرَتِ ٱلْجِبَالُ فَكَانَتْ سَرَابًا ﴾، چیایەکان ڕۆێنران و جووڵێنران و لابران، بوون بە تراویلکە، واتە: بوونە تۆز و گەرد.

ب- لە سوورەتی (**الواقعة**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَبُسَّتِ ٱلْجِبَالُ بَسًّا ﴿٥﴾ فَكَانَتْ هَبَآءً مُّنۢبَثًّا ﴿٦﴾ ﴾، واتە: چیاییەکان لێك هەڵوەشێنران و لێك هەڵتەکێنران و، بوونە تۆز و گەردی بڵاوبووەوە.

ج- لە سوورەتی (القارعة)ش دا دەفەرموێ: ﴿ وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ٱلْمَنفُوشِ ۝٥ ﴾، واتە: چیایەکان وەك خوریی شکنراوە[1] یان لێدێ، یان: خوریی ڕەنگاو ڕەنگ.

٢)- ﴿ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ بَارِزَةً ﴾، زەوی دەبینی: ئاشکرایە و دەرکەوتوە.

(بـارزة: ظاهـرة) مەبەسـت پێـی ڕوو و پانتایەکەیـەتی کـە دەرکەوتـوە و، هیچـی لەسـەر پەنهـان نابـێ و ناشـاردرێتەوە.

٣)- ﴿ وَحَشَرْنَٰهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَدًا ﴾، [ئەو ڕۆژە کە ڕۆژی دواییە] هەموویان خڕدەکەینەوە، هیچ کەسیان لێ نابوێرین، هیچ کەسیان لێ تەرك ناکەین و وازی ناهێنین.

(المغـادرة: إبقـاء شيء، وتركـه مـن تَعَلُّق الفعـل بـه)، (مغـادرة) بریتیـە لە هێشـتنەوەی شـتێك و وازلێهێنـانی لـەوەی کردەوەیـەك پێـوەی پەیوەسـت بـێ، واتـە: لێـی گەڕێـی، یـانی: لـە هیچیـان ناگەڕێیـن، یاخـود هیچیـان لـێ نابوێریـن، کـە کـۆی نەکەینـەوە، هەموویـان کـۆ دەکەینـەوە.

٤)- ﴿ وَعُرِضُوا۟ عَلَىٰ رَبِّكَ صَفًّا ﴾، واتە: بە ڕیز لەسەر پەروەردگارت ڕانوێنران، (عرض الشيء: إحضاره ليُرى حالُهُ، ومنه: استعراضُ الجيش)، (عَرْض) بریتیە لە ڕانواندن و خستنە ڕووی شتێك تاکو بزاندرێ، وەك دەگوترێ: (إستعراض الجيش) یانی: ڕانوێنرانی سوپا و پێشاندرانی.

(الزمخشري) دەڵـێ: (شُـبِّهَتْ حالُهـم بحـال الجنـد المعروضيـن علـى السـلطان، مصطفِّين ظاهريـن). واتـە: حاڵیـان چوێـنراوە بـە حاڵـی سـەربازانی سـوپایەکەوە، کـە بـۆ دەسـتەڵاتدار ڕادەنوێنرێـن و دەهێنرێنـە گـۆڕێ، ڕیـز ڕیـز دەخرێنـە گـۆڕێ.

٥)- ﴿ لَّقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍۭ ﴾، (پێمان گوتن): بەدڵنیایی هاتنەوە بۆ لامان، وەك چۆن یەکەمجار دروستمان کردبوون، یانی: یەکەمجار کە دروستمان کردبوون، نە هیچتان لەگەڵ خۆتان هێنابوو، لەسکی دایکتان دەرتان نەهێنا بوو، نە سەروەت و سامان و نە خزم و کەس، نە قەوم، نە دەوروبەر، نە جل و بەرگ، ئێستاش ئاوا بە سەڵت و قوڵتیی، بە ڕووت و قووتیی هاتوونەوە بۆ لامان، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: [يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلًا] (أخرجه مسلم: ٢٨٥٩، والنسائي: ٢٠٨٤، وابن ماجه: ٤٢٧٦، عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها)، واتە: خەڵك لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا کۆدەکرێنەوە، بە پێخواسیی و، بە ڕووتیی و، بە خەتەنە نەکراویی، (واتە: چوون لە دایکی خۆیان بوون، ئاوا).

٦)- ﴿ بَلْ زَعَمْتُمْ أَلَّن نَّجْعَلَ لَكُم مَّوْعِدًا ﴾، واتە: بەڵکو ئێوە پێتان وابوو، کە ئێمە هیچ بەڵێنگەتان بۆ دانائێین.

---

(١) شکنراوە: شیکراوە.

(**الموعد: وقت الوعد أو مكانه**)، (**موعد**) بە مانای كاتی بەڵێنە، یاخود شوێنی بەڵێنە، كە ئەگەر بڵێین: بەڵێنگە، هەردووكیان دەگرێتەوە.

هەڵبەتە من ئەو وشەیەم داناوە و خۆم دامتاشیوە[1]، بەڵام پێم وایە شتێكی باشە بۆ (**موعد**) بەڵێنگە، واتە: كات و شوێنی بەڵێن.

لێرەدا ﴿ بَلْ ﴾، (**للإضراب الإنتقالي وليس الإبطالي**) واتە: بۆ ئەوە نیە كە بفەرمووێ: ئەوەی پێشێ وانیە و، ئەمەیان وایە، بەڵكو بۆ گواستنەوەیە لە مەبەستێكەوە، بۆ مەبەستێكی دیكە.

**٧)- ﴿ وَوُضِعَ ٱلْكِتَـٰبُ ﴾**، واتە: كتێب دانرا، لێرەدا (كتاب) یان مەبەست پێ جینسی كتێبە، واتە: هەموو نووسراوەكان دانران، یانی: لیستی كردەوەكانی هەر كەسێك بە تەنیا، یاخود مەبەست پێی لیستێكی گشتییە، كە كردەوە و هەڵسوكەوتی سەرجەم بەندەكانی تێدا تۆماركراون.

**٨)- ﴿ فَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ ﴾**، تاوانباران دەبینی ترس و لەرزیانە لەوەی كە تێیدا تۆماركراوە، چونكە وەك گوتراوە: {دەروێش بۆ خۆی دەزانێ چی لە كەشكۆڵێ دایە!} ئەوانەش دەزانن لە دنیادا چییان كردوە و، چۆنیان كردوە و، چییان لەسەر تۆماركراوە! بۆیە ترس و لەرزیانە لەوەی تابڕوویان بچێ، لەوەی تاوانبار بكرێن و سزا بدرێن.

**٩)- ﴿ وَيَقُولُونَ يَـٰوَيْلَتَنَا ﴾**، دەشڵێن ئەی هاوار بۆ تێمە! (ویلة)، (**تأنيث الويلة للمبالغة، وهو سوء الحال**)، لە ئەسڵ دا (وێل)ە، بەڵام كردنی بەمێینە (وَيلة) بۆ زێدەڕۆییەلە حاڵ خراپیی دا، هەندێكیش (ویل) یان بە جۆرێك لە سزا داناوە، بەڵكو هەندێك گوتوویانە: (ویل) شیوێكە لە شیوەكانی دۆزەخ، بەڵام نا، ئەوە تەعبیرێكە لە زمانی عەرەبییدا بۆ حاڵ و باڵ خراپیی و مەینەتیی: (**ويلتنا: أي ياهلكتنا وحسرتنا! تعالي هذه أوانك**) واتە: ئەی فەوتان و داخ و خەفەت بۆ تێمە، وەرە، ئێستا كاتتە!

**١٠)- ﴿ مَالِ هَـٰذَا ٱلْكِتَـٰبِ ﴾**، واتە: ئەو نووسراوە چییەتی؟ ئەم تەعبیرە بۆ سەرسوڕماندن (**تعجيب**)ە، یانی: كتێب و لیست و تۆمارێكی یەكجار وردە!

**١١)- ﴿ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحْصَىٰهَا ﴾**، واتە: هیچ بچووك و گەورەیەك نابوێرێ و مەگەر سەرژمێری كردوون.

---

(١) ناشڵێم پێشتریش نەبووە، بەڵام لە یادم نیە بینیبێم.

﴿مَالِ هَٰذَا ٱلۡكِتَٰبِ﴾، دەڵێ: (ما: اسم استفهام: أي شيء، أي: ما ثبت لهذا الكتاب؟) واتە: ئەوە ئەم کتێبە چییە! ئەم نووسراوە چییەتی؟ لێرەدا مەبەست پێی سەرسوڕمانە، واتە: چەند جێی سەرسووڕمانە ئەو نووسراوە! چونکە هیچ بچووک و گەورەیەکی نەبواردوە، (لا يغادر: لا يترك)، هیچ بچووک و گەورەیەکی نەبواردوە، مەگەر سەرژمێری کردوە، بچووك و گەورەش دوو سیفەتن بۆ وەسفکراوێك کە قرتێنراوە، چونکە مەقام و سیاقەکە دەیگەیەنێ، واتە: هیچ کردەوەیەکی بچووکی خراپ و، کردەوەیەکی گەورەی خراپی، نەبواردوە ئەو نووسراوە، مەگەر هەمووی سەرژمێر کردوە، بۆیەش هی بچووکی پێشخستوە، چونکە کردەوەی خراپی بچووك کە تۆمار بکرێ و نەبوێردرێ، زیاتر جێی سەرسوڕمانە لە هی گەورە.

١٢)- ﴿وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرًا﴾، واتە: ئەوەی کە کردبوویان بە ئامادەیی بینییان، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە کردەوەکان لەوێ دەبەرجەستێترێن، بەرجەستە دەکرێن، ئنجا ئەگەر مرۆڤ بتوانێ وەك جاری دیکەش گوتوومانە: کامێرای شێردراوە و پەنهان دابنێ و، بە دەنگ و وێنەوە، هەڵسوکەوتەکانی خەڵك تۆمار بکات، دەبێ خوا ﷻ چ ئامێرێکی پێشکەوتووی دابێتە دەست ئەو فریشتانە؟! چۆن کردەوەکانی مرۆڤەکان، بەڵکو هی جندیش بە دەنگ و وێنەوە تۆمار بکەن!

١٣)- ﴿وَلَا يَظۡلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا﴾، پەروەردگارت ستەم لە هیچ کەس ناکات، واتە: شتێکیان لەسەر نانووسرێ کە نەیانکردبێ، هەروەها خوا ترساندوونی و، ئاگاداری کردوونەوە، پاشان بە دادگەرانەش نەبێ سزا نادرێن، هەموو ئەو واتایانە و، غەیری ئەو واتایانەش دەگەیەنێ.

**مەسەلەی چوارەم:**

**یادیش بکەنەوە! کاتێك بە فریشتانمان فەرمووو: کڕنووشی ڕێزلێگرتن بۆ ئادەم بەرن، جگە لە ئیبلیس، تێکڕا کڕنووشیان برد، ئەو لە جینن بوو، لە فەرمانی پەروەردگاری دەرچوو، ئنجا ئایا خۆی و وەچەکەی، کە دوژمنتانن لە جیاتی من، بە دۆست دەگرن؟ ئەوان خراپترین جێگرەوەن بۆ ستەمکاران:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ ۚ بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ ﴾، واتە: یاد بکەوە! کاتێك بە فریشتەکانمان فەرمووو کڕنووش بۆ ئادەم ببەن.

وەك زۆرجاری دیکە گوتوومانە: مەبەست لە کرنووش، کڕنووشی ڕێزلێگرتنە.

شایانی باسە: ئێمە بەسەرهاتی ئادەم و حەووا، دایك و بابی مرۆڤایەتیی لە لایەك و، ئیبلیس لە لایەکی دیکەوە، ئەو بەسەرهاتەمان لە سەرەتای سوورەتی (الأعراف)دا، بە درێژیی باس کردوە، بۆیە لێرەو لە هەر شوێنێکی دیکە تووشی بین، بە خێرایی بەسەریدا ڕەت دەبین.

٢)- ﴿ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ ﴾، فریشتەکان هەموویان کڕنووشیان برد، جگە لە ئیبلیس.

لێرەدا ئەو پرسیارە دەکرێ: کاتێك خوا فەرمانی بە فریشتان کردوە، کڕنووش بۆ ئادەم ببەن، بۆچی دەبێ ئیبلیسیشی گرتبێتەوە؟! وەڵامەکەی هەر ئەوەیە: کە ئیبلیسیش هەرچەندە لە جۆری فریشتان نەبووە، ڕەگەز و توخمێکی دیکەی هەبووە، بەڵام دیارە لەو کاتەدا لە ڕیزی ئەواندا بووە و، لە ئاستی ئەواندا بووە، بەڵکو هەندێك دەڵێن: مامۆستای فریشتان بووە، کە بەبێ بەڵگە قسەی وا ناچەسپێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە تاکو ئەو ڕاددەیەش، زانایان باسی پێگە و پایەی بەرزی ئیبلیسیان کردوە، بەر لەوەی ئەو بێ فەرمانییەی خوا بکات و، خوای دادگەر ئاوا لێی توووڕە بێ و نەفرینی لێبکات.

٣)- ﴿كَانَ مِنَ ٱلۡجِنِّ﴾ [هەموو فریشتەكان كڕنووشیان برد، جگە لە ئیبلیس] ئیبلیس لە جینن بوو، لە لەهجەی موكریانییدا بە (جن) دەڵێن: (جند)، هەندێك (جِنّ) بە (پەریی) لێكدەدەنەوە لە زمانی كوردییدا، بەڵام ئەگەر هەر بگوترێ: (جِنّ) یان (جند) زانراوترە و چەمكەكەی خەڵك پێی ئاشناترە، ئەوەندە هەیە ئەگەر بویسترێ وشەی (جِنّ)ی عەرەبیی بە كوردیی گۆ بكرێ، دەبێ بگوترێ: (جینن)، شایانی باسە: جاری وایە وشەی [پەریی] بۆ حۆرییش بەكارهێنراوە، دەڵێن: ئەو ئافرەتە دەڵێی پەرییە، واتە: زۆر جوانە، كەواتە: وشەی (پەریی) ڕێك نایەتەوە كە بكرێتە واتا بۆ (جِنّ).

هەڵبەتـە (جِنّ)یـش جیـان لـە فریشـتان، خـوا لـە سـوورەتی (الحجـر)دا دەفەرمـوێ: ﴿وَٱلۡجَآنَّ خَلَقۡنَٰهُ مِن قَبۡلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ٢٧﴾، واتـە: پێـش دروسـتكردنی ئـادەم، جانـمان لـە بڵێسـەی ئاگـر دروسـتكردبوو، یاخـود: لـە ئاگرێـك كـە ئەوەنـدە گـەرم و سـووتێنەرە، دەچێتـە نێـو كەلێـن و كونـەكانی جەسـتەوە.

ئنجـا (الجَـآنّ) چ مەبەسـت خـودی (جِـنّ) بـێ، چ مەبەسـت بـابی (جِـنّ) (أبـو الجِـنّ) بـێ، كـە ئیبلیسـە هەرچـۆن بـێ، (جِـنّ) لە ئاگـر دروسـتكراون.

٤)- ﴿فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِۦٓ﴾، لە فەرمانی پەروەردگاری دەرچوو.

(فِسْـق) بـە مانـای دەرچوونـە، دەگوتـرێ: (فَسَـقَتِ الفَـأْرَة مِـنْ جُحْرِهَـا)، واتـە: مشـكەكە لـە كونەكـەی چـووە دەرێ، یـان: (فَسَـقَتِ الرُّطَبَـةُ) واتـە: هێشـووە خورمایەكـە لـە كیفەكـەی هاتـە دەرێ، كەواتـە: ﴿فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِۦٓ﴾، واتـە: لـە فەرمـانی پـەروەردگاری دەرچـوو، فەرمـانی پـەروەردگاری بـوارد و جێبەجێـی نەكـرد.

٥)- ﴿أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِي﴾، ئایا خۆی و وەچەكەی لە جیاتی من بە دۆست دەگرن؟ ﴿أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ﴾ (الإستفهام للإنكار والتوبيخ) ئەم پرسیار كردنە، بۆ نكووڵیلێكردن و سەرزەنشتكردنە.

﴿وَذُرِّيَّتَهُۥٓ﴾، یـانی: وەچەكـەی، ڕۆڵـەكانی، ئەمـە ئـەوە دەگەیەنـێ كـە هەرچـی (جِـنّ)ە، بـە كافـر و مسـوڵمانەوە، كـە كافـرەكان (شـیاطین) یـان پـێ دەڵێـن و، مسـوڵمانەكانیان هـەر وشـەی (جِـنّ) یـان بـۆ بەكاردێـنرێ، (جِـنّ) هەموویـان بـە پێـی ئـەم ئایەتـە وەچـەی ئیبلیسـن، هـەروەك چـۆن مرۆڤـەكان، وەچـەی (ئـادەم و حـەووا)ن، بـەڵام بـاسی هاوسـەری ئیبلیـس نەكـراوە، كێیـە؟ وەك بـاسی هاوسـەری ئـادەم كـراوە، كـە دایكـمان (حەووا)یـە، بـەڵام لـە قورئـان دا نـاوی نەهێـنراوە.

٦)- ﴿وَهُمۡ لَكُمۡ عَدُوُّۢ﴾، (ئایا خۆی و وەچەكەی لە جیاتی من بە دۆست دەگرن)، لە حالێكدا كە ئەوان دوژمنتانن؟

﴿عَدُوُّۢ﴾، دوژمن، لە زمانی عەرەبییدا هەم بۆ تاك بەكاردێ و، هەم بۆ كۆش، لە سوورەتی (الممتحنة)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمۡ أَوۡلِيَآءَ تُلۡقُونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ وَقَدۡ كَفَرُواْ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلۡحَقِّ يُخۡرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمۡ أَن تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ رَبِّكُمۡ إِن كُنتُمۡ خَرَجۡتُمۡ جِهَٰدٗا فِي سَبِيلِي وَٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِيۚ تُسِرُّونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ وَأَنَا۠ أَعۡلَمُ بِمَآ أَخۡفَيۡتُمۡ وَمَآ أَعۡلَنتُمۡۚ وَمَن يَفۡعَلۡهُ مِنكُمۡ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ١﴾،

﴿أَوۡلِيَآءَ﴾، كۆی (وليّ)یە، یانی: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! دوژمنی من و دوژمنی خۆتان مەكەنە دۆستتان و بە دۆستیان مەگرن.

وەك دەبینن: وشەی: ﴿عَدُوُّۢ﴾، بۆ كۆ (جمع) بەكارهێنراوە، وەك چۆن بۆ تاكیش بەكاردێ.

٧)- ﴿بِئۡسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلٗا﴾، مانایەكەی ئاوای لێدێتەوە: (بِئْسَ البَدَلُ إِبْلِيسُ وَذُرِّيَّتُهُ عَنِ اللهِ تَعَالَى لِلْمُشْرِكِينَ) واتە: ئیبلیس و وەچەكەی خراپترین جێگرەوەی خوان ﷻ، بۆ هاوبەش بۆ خوا دانەرە ستەمكارەكان، واتە: ئەگەر كەسێك دۆستایەتیی ئیبلیس و، وەچەكەی بكاتە جێگرەوەی دۆستایەتیی خوا ﷻ و، بەندە بۆ خوا صوڵحاوەكان، ئەوە خراپترین جێدار و جێگرەوەی بۆ خوا ﷻ داناوە.

**مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:**

**خوا فەرموویەتی: من لە کاتی دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و، دروستکردنی خۆشیاندا ئەوانم، (مەبەست ئیبلیس و وەچەکەیەتی، یاخود هاوبەش بۆ خوا دانەرە ستەمکارەکانە) ئامادە نەکردوە و، ناشگونجێ گومڕاکەران بکەمە هاوکاری خۆم:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ خَلۡقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَا خَلۡقَ أَنفُسِهِمۡ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلۡمُضِلِّينَ عَضُدٗا ﴿٥١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿ مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ خَلۡقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَا خَلۡقَ أَنفُسِهِمۡ ﴾، ئەوانم ئامادە نەکردوە بۆ دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و، دروستکردنی خۆشیان.

ئامادەم نەکردوون، واتە: هاوکارییم لێ وەرنەگرتوون.

واتایەکی دیکەی: ئەوانم ئاگادار نەکردوون لە دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی و، دروستکرانی خۆشیان.

﴿ أَشۡهَدتُّهُمۡ ﴾، (الإِشْهَادُ: جَعْلُ الغَيْرِ شَاهِداً أي: حَاضِراً وَهُوَ هُنَا إِحْضَارٌ خَاصٌ، أي إِحْضَارُ مُشَارَكَةٍ فِي العَمَلِ)، (إِشْهَاد) ئەوەیە کە تۆ ئەوی دیکە بکەیە شایەد، واتە: ئامادەی بکەی، کە لێرەدا مەبەست ئامادەکردنێکی تایبەتە، یانی: ئامادەی بکەی بۆ ئەوەی یارمەتی لێوەربگری.

٢)- ﴿ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلۡمُضِلِّينَ عَضُدٗا ﴾، هەروەها ناشگونجێ سەرلێشێوێنەران بکەمە هاوکار و یارمەتییدەری خۆم.

ئەم ڕستەیە: ﴿ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلۡمُضِلِّينَ عَضُدٗا ﴾، خوێنراویشەتەوە: (وَمَا كُنْتَ مُتَّخِذَ ٱلۡمُضِلِّينَ عَضُدًا) واتە: تۆ بۆت نیە و ناگونجێ کە سەرلێشێوێنەران، بکەیە هاوکار و پشتیان پێ ببەستی.

## چوار سەرنجدانی گرنگ لەم ئایەتە: الكهف (٥١):

**یەكەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ خَلۡقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَا خَلۡقَ أَنفُسِهِمۡ ﴾، سێ واتای هەن:

١)- (مَا أحْضَرْتُهُم لِلْمُعَاوَنَةِ فِي خَلْقِ الكَوْن ولاخلق أنفسهم) ئامادەم نەكردوون بۆ هاوكاریی كردنم لە كاتی دروستكردنی گەردوون و هی خۆشیاندا.

٢)- (لَمْ يكونوا موجودين حينذاك لذا لَيْسَ لَدَيْهِم عِلْمٌ بِهِ) ئەو كاتە ئامادە نەبوون و بوونیان نەبوو، تاكو زانیارییان پێی هەبێ، بۆیە زانیارییان نیە، بە سەرەتای گەردوون و بوون، هەروەها بە هی خۆشیان.

٣)- واتایەكی دیكەی: [ما استشرتهم في خلق السموات والأرض وخلق أنفسهم] ڕاوێژم پێ نەكردوون و پرسم پێ نەكردوون، كە ئایا ئەم گەردوونە دروست بكەم! ئایا ئێوە دروست بكەم، دروست نەكەم!

شتێك نەبێ چۆن پرسی پێ دەكرێ!!

مـن وای تێدەگـەم: لێرەدا مەبەسـت ئەوەیـە: كـە مـرۆڤ زۆر لـە كەوڵـی خـۆی دەرنەچـێ و، لە خـۆی بایـی نەبـێ و، خـۆی پـێ شـتێكی گـەورە نەبـێ، بەڵكـو ئەنـدازەی خـۆی بزانـێ و، قەبـارە و ئاسـتی خـۆی بزانـێ! جـاری وا بـووە شـەرە قسـە و وتووێـژم بـووە لەگـەڵ كەسـانێكی مولحیـد دا، هەبـووە گوتوویـەتی: خـوا بۆچـی منـی دروسـتكردوە، بۆچـی پـرسی پـێ نەكـردووم؟ ئەگـەر پـرسی پێكردبـام دەمگـوت: دروسـتم مەكـە، بـەڵام تـازە دروسـتی كـردووم و بـە ناچاریـی منـی هێناوەتـە ئێـرە!

كـە بێگومـان ئـەو قسـانە هەموویـان لـە عەقڵێكـەوە سـەرچاوە دەگـرن، خـۆی نەناسـیوە، ئەگەرنـا مـرۆڤ زۆر لـەوە بچووكـترە بـەو شـێوەیە مامەڵـە لەگـەڵ خـوادا بـكات و ڕەخنـە لـە خـوا بگـرێ، وەك خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (الأنبيـاء)دا دەفەرمـوێ: ﴿ لَا يُسۡـَٔلُ عَمَّا يَفۡعَلُ وَهُمۡ يُسۡـَٔلُونَ ٢٣ ﴾، واتـە: خـوا پرسـیاری لـێ ناكـرێ، لـەوەی دەیـكات و ئـەوان لێیـان دەپـرسرێ، ئنجـا ئایـا بۆچـی خـوا پرسـیاری لـێ ناكـرێ و بۆچـی ڕەخنـەی لـێ ناگیـرێ؟!

**یەك:** چونكە خوا هەموو كارەكانی بەو پەڕی حیكمەت و زانست بنیات ناون، ئنجا كەسێك پرسیاری لێدەكرێ و، ڕەخنەی لێدەگیرێ، كە ڕێی تێبچێ كارێكی بێجێ بكات، بەڵام كەسێك

كارەكانی لە لووتكەی زانیاریی و چاكیی و كارزانیی دابن، ناگونجێ ڕەخنەی لێبگیرێ و پرسیاری ناڕاستە بكرێ.

**دوو:** پایە و مەقامیی خوا زۆر بەرزترە لەوەی بەو شێوەیە وێنا بكرێ، كە مرۆڤ بۆی هەبێ ڕەخنەی لێبگرێ و بڵێ: پرسم پێ بكە! شتێك نەبووبێ، چۆن پرسی پێ بكات؟!

**دووەم:** كە دەفەرموێ: ﴿وَلَا خَلْقَ أَنفُسِهِمْ﴾، واتە: هەندێكیان لە كاتی دروستكردنی هەندێكیاندا ئامادە نەبوون و هاوكار نەبوون، یاخود ئەمیش هەر مانای ئەوەیە: ڕاوێژم پێنەكردن و ئامادەم نەكردوون، لە كاتێكدا كە دروستم كردوون، بۆیە ئاگایان لە سەرەتای پەیدابوونی خۆیان و، لە سەرەتای پەیدابوونی گەردوونیش نیە.

**سێیەم:** پێویستە بزانین كە ئیمان دوو جۆرە: ١ - بڕوای ساغكردنەوە و لێكۆڵینەوە ٢ - بڕوای بەڕاست دانان (**إيمانٌ تحقيقيٌ، وإيمانٌ تصديقيٌ**):

١ - (**الإيمان التحقيقي**) ئیمانێكە لەسەر بناغەی لێكۆڵینەوە بنیات دەنرێ، وەك: ئیمان بە بوونی خوا ﷻ و، بە ڕاستیی پێغەمبەر ﷺ و، بە موعجیزە بوونی قورئان، ئەو شتانەی كە عەقڵ دەتوانێ بەڵگەیان لەسەر بهێنێتەوە و دەتوانێ دەركیان بكات و تێیان بگات.

٢ - (**الإيمان التصديقي**)یش ئەوەیە كە تۆ دوای ئەوەی دەزانی: خوا هەیە و بە عەقڵ، بوونی خوات سەلماندوە و، ڕاستیی پێغەمبەرت ﷺ سەلماندوە و، ڕاستیی قورئانت سەلماندوە، ئنجا هەرچی ئەو خوا پەروەردگارە و، ئەو پێغەمبەرە ﷺ سەرداره و، ئەو قورئانە دەستە وسانكەر (**مُعْجِز**)ە، هەواڵی پێدەدەن، دەبێ بەڕاستی بزانی، چونكە: مادام خوا هەق بێ و، پێغەمبەر ﷺ ڕاست بێ و، قورئان فەرمایشتی خوا بێ، كەواتە: هەرچی ئەوان فەرموویانە، ڕێت لە خۆت گرتوە، كە تێیدا بكەویە دوو دڵیی و گومان، یاخود نكووڵیی لێبكەی.

ئنجا ئەوەی كە ئینسان ناتوانێ تێیدا بگاتە ساغكردنەوە (**تحقيق**) دەبێ لەسەر بناغەی بە ڕاست زانین (**تصديق**) بنیاتی بنێ، بۆ وێنە: ئەوە كە خوا ئەزەلییە و، بێ سەرەتایە و، ئەبەدییە و بێ كۆتاییە و، ئەم گەردوونە سەرەتایەكی هەیە و، ئەم ژیانە دنیاییەی ئێمە، كۆتایی هەیە و، پاشان هاتنی زیندووبوونەوە و، هاتنی قۆناغی بەرزەخ، دوایی هاتنی قیامەت و هەڵسانەوە و، بەهەشت و دۆزەخ و، پردی سەر پشتی دۆزەخ (**صِراط**) و، سزای دوای گۆڕ و، نیعمەتی دوای گۆڕ و مردن و... هتد هەموو ئەوانە، دەبێ لەسەر بناغەی بە ڕاست زانین، ئیمانیان پێ بێنین، ئەگەرنا بڵێی: دەبێ بەشێوازی

زانستی ئەزموونیی (العلم التجريبي) لێی بکۆڵمەوە، ئاشکرایە ئامرازی ئەو لێکۆڵینەوەیەت نیە و، ئەو شتانە ناکەونە جوغزی زانیاریی وەدەستهێنراو لە ڕێی ئەزموونەوە یانی: پێنج هەستەکان و عەقڵ[1].

چوارەم: بێگومان لێکۆڵینەوەی زانستیی پێویستە، وەك بۆ وێنە: بەسەرهاتەکەی ئیبراهیم ﷺ دەیگەیەنێ، کە لە سوورەتی (البقرة)دا هاتوە:

﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن ۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي ۖ قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ ٱلطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ ٱجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ٱدْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا ۚ وَٱعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦٠﴾ ﴾.

واتە: یادبکەوە! کاتێك ئیبراهیم گوتی: پەروەردگارم! پیشانم بدە، چۆن مردووان زیندوو دەکەیەوە! فەرمووی: ئایا بڕوات نەهێناوە؟ گوتی: با، بەڵام بۆ ئەوەی دڵم ئارامبگرێ، [دڵم زیاتر ئارامبگرێ و دابسەکنێ، دوای ئەوەی زانیاریی و دڵنیاکەر (عیلم الیقین)م هەیە بەوە کە تۆ مردووان زیندوودەکەیەوە، دەمەوێ: دیتنی دڵنیاکەر (عين اليقين)یشم هەبێ، بە چاوی سەریش ببینم] [خوا ﷻ] فەرمووی: چوار باڵندان بگرە و پارچە پارچەیان بکە و هەر پارچە و فڕێبدە سەرکێوێك و، دوایی بانگیان بکە، بە ڕاکردن دێن بۆ لات، بشزانە کە خوا زاڵی کارزانە.

کەواتە: مرۆڤ پێویستە هەتا پێی دەکرێ زانیاریی و زانستی خۆی زێدە بکات، تاکو بڕوای پتەوترو دڵی ئارامگرتووتر بێ، چونکە بناغەی ئیمان زانیاریی (علم)ە و بە زانیاریی زیاد دەکات.

ئنجا بە نسبەت ئێمەوە: سەرەتای گەردوون و، کۆتایی گەردوون و، سەرەتای پەیدابوونی مرۆڤ، نادیارن، بەڵێ دەزانین یەکەم دوو مرۆڤ، ئادەم و حەووا بوون ﷺ، ئنجا کە لەوبارەوە بیردۆزەی داروێنیی و بیردۆزەی دیکەش هەن، بەڵام بۆ دەرککردنی ئەوانە، دەبێ بگەڕێینەوە بۆ تەصدیق، بەڵام، چی لە تواناماندا هەیە، با تەحقیقی لێ بکەین و لێبکۆڵینەوە، بەڵام کە ئامراز و هۆکارەکانی گەیشتنە بنبەست و لێکۆڵینەوەمان، بۆ دەستە بەر نەبوو، نابێ پەکی کاری خۆمان بخەین، بەڵکو دەگەڕێینەوە بۆ لای کتێبی بەهێز و پێزی خوا و، پێغەمبەری خوا ﷺ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

(١) تفسير النابلسي، ج٥ ص٣٢١، بە دەستکارییەوە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان هەشت ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٥٢ - ٥٩)، لەو هەشت ئایەتەدا، خوای بەرزی مەزن، حەوت ڕاستیی گەورە و گرنگ دەخاتە ڕوو:

١)- سەرەنجامی شوومی کافران لە ڕۆژی دوایی دا.

٢)- باسی قورئان کە مەبەستەکانی بە شێوازی جۆراو جۆر، تێدا خراونە ڕوو، بۆ ئەوەی خەڵك بڕوا بێنن و، هیچ پاساو و بیانووی بڕوا نەهێنانیان نەبێ و، لە هەموو دەروازەو دەرگاکانەوە، لێیان بچێتە ژوورێ و، ڕاستییەکان بخاتە عەقڵ و دڵیانەوە.

٣)- باسی هۆکاری سەرەکیی، بێبڕوابوونی خەڵکی بێبڕوا.

٤)- باسی ئامانج و ئەرکی نێردرانی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) و، هەڵوێستی نەیارانیان لە بەرانبەریاندا.

٥)- باسی گەورەیی تاوانی پشتهەڵکەران لە پەیامی خوا و، سزادانی خوا بۆیان، بەوە کە عەقڵ و گوێیان قفڵ بن و، ڕاستییەکان نەچنە نێو عەقڵ و دڵیانەوە.

٦)- باسی لێبوردەیی و بەزەیی خواو، پەلەنەکردنی لە سزادانی خراپەکاران و تاوانبارانداو، هەتا کاتی خۆی دێ.

٧)- باسی یاسای خوا لە سزادانی وڵات و ئاوەدانییەکاندا، کە بریتیە لە فەوتێنرانیان و، سەر بە فەتارەت بردنیان بەهۆی ستەمەوە، بەڵام بەپێی سیستەمی دادگەرانەی خوا ﷻ.

﴿ وَيَوْمَ يَقُولُ نَادُوا۟ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُمْ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُم مَّوْبِقًا ﴿٥٢﴾ وَرَءَا ٱلْمُجْرِمُونَ ٱلنَّارَ فَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمْ يَجِدُوا۟ عَنْهَا مَصْرِفًا ﴿٥٣﴾ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِى هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لِلنَّاسِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَىْءٍ جَدَلًا ﴿٥٤﴾ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓا۟ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰ وَيَسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّهُمْ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمْ سُنَّةُ ٱلْأَوَّلِينَ أَوْ يَأْتِيَهُمُ ٱلْعَذَابُ قُبُلًا ﴿٥٥﴾ وَمَا نُرْسِلُ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ۚ وَيُجَٰدِلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟

بِٱلْبَٰطِلِ لِيُدْحِضُوا۟ بِهِ ٱلْحَقَّ ۖ وَٱتَّخَذُوٓا۟ ءَايَٰتِى وَمَآ أُنذِرُوا۟ هُزُوًا ﴿٥٦﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ فَأَعْرَضَ عَنْهَا وَنَسِىَ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ ۚ إِنَّا جَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ۖ وَإِن تَدْعُهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ فَلَن يَهْتَدُوٓا۟ إِذًا أَبَدًا ﴿٥٧﴾ وَرَبُّكَ ٱلْغَفُورُ ذُو ٱلرَّحْمَةِ ۖ لَوْ يُؤَاخِذُهُم بِمَا كَسَبُوا۟ لَعَجَّلَ لَهُمُ ٱلْعَذَابَ ۚ بَل لَّهُم مَّوْعِدٌ لَّن يَجِدُوا۟ مِن دُونِهِۦ مَوْئِلًا ﴿٥٨﴾ وَتِلْكَ ٱلْقُرَىٰٓ أَهْلَكْنَٰهُمْ لَمَّا ظَلَمُوا۟ وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِم مَّوْعِدًا ﴿٥٩﴾ ﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

[هەروەهـا ئـەو ڕۆژە (زۆر بێـڕەزا و سـەختە) کـە (خـوا) دەفەرمـوێ: بانگـی ئـەو هاوبەشـانەم بکـەن کـە پێتـان وابـوو (هاوبەشـمن)، ئەوانیـش بانگیانکـردن، کەچـی وەڵامیـان نەدانـەوە و، ئێمـەش فەوتێنگایەکـمان خسـتە نێوانیـان ﴿٥٢﴾ تاوانبارانیـش ئاگـری دۆزەخیـان بینـی و، زانییـان کـە دەیکەونەتـێ[1] و، هیـچ چـارەو دەرەتانیشـیان لـە چنگـی نەبـوو ﴿٥٣﴾ مسـۆگەریش: لـەم قورئانـەدا بـە شـێوازی جـۆراو جـۆر لـە هەمـوو پەنـد و وێنەیەکـمان بـۆ خەڵـکی باسـکردوون و، مرۆڤیـش لـە هەمـوو شـتێك بـە مشـت ومڕتـرە ﴿٥٤﴾ ئـەوەش کـە ڕێـی لـە خەڵـکی گـرت (کاتێـك کـە ڕێنماییـان بـۆ هـات) کـە بـڕوا بێنـن و، داوای لێبـوردن لـە پەروەردگاریـان بکـەن، هـەر ئەوەبـوو کـە (چـاوەڕێ بـوون) یاسـای بەسـەر پێشـوواندا چەسـپاویان بـۆ بـێ (و بەسـەردا بچەسـپێ)یان سـزا و ئازاریـان لـووت و بـزووت بـۆ بـێ ﴿٥٥﴾ ڕەوانـە کراوانیشـمان تەنیـا بـە مـوژدەدەر و ترسـێنەر نـاردوون و، ئەوانـەی بێبڕواشـن بـە ناهـەق شـەڕە قسـە (مشـت و مـڕ) دەکـەن، تاکـو هەقـی پـێ بفەوتێنـن و، گاڵتـەش بـە نیشـانەکانم و ئـەو (پەیـام)ە دەکـەن، کـە پێـی ترسـێنراون ﴿٥٦﴾ ئنجـا ئایـا کـێ لـە کەسـێك سـتەمکارترە، کـە ئایەتـەکانی پـەروەردگاری خراونـەوە یـاد، کەچـی ڕووی لێوەرگێـڕاون و، ئـەوەشی لەبیرچـووە کـە (کردوویـەتی و) دوو دەسـتەکانی پێشـیان خسـتوە (بـۆ قیامەتـێ)؟! ئێمـە پەردەمـان خسـتوونە سـەر دڵیـان تاکـو ڕێگیربـن، تێبگـەن و، قورساییشـمان خسـتۆتە گوێیەکانیانـەوە (تاکـو نەبیتسـن) بۆیـەش هەرچەنـدە بـەرەو ڕێنمایـی بانگیـان بکـەی، هەرگیـز ڕێـی ڕاسـت ناگـرن ﴿٥٧﴾ پەروەردگاریشـت لێبـوردەی خـاوەن بەزەییـە، ئەگـەر بـە هـۆی ئـەو (خراپیـان)ەوە کـە وەدەسـتیان هێنـاون، گرتبـانی و سـزای دابـان، بـە پەلـە سـزای

---

(١) دەیکەونەتێ : دەکەونەنێوی.

دەدان، بەڵام بەڵێنگەیەکیان هەیە، هیچ دەرەتانیان بۆ لێی دەربازبوونی نیە ﴿٥٨﴾ ئەو ئاوەدانییانەشمان کاتێک فەوتاندوون، کە ستەمیان کردوە و، بەڵێنگەشمان بۆ لە نێو بردنیان دانا بوو ﴿٥٩﴾﴾.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(مَّوۡبِقٗا ): (وَبَقَ، يَبِقُ، وَبْقَاً، وَمَوبقاً، وَأَوبَقَهُ كَذَا، إذَا تَثَبَّتَ فَهَلَكَ، الموبِقُ: مَكَانُ الوبُوقِ، مَوبِقَ يعني المهلك)، (وَبَقَ، يَبِقُ، وَبْقَاً، ومَوبقاً) واتە: فەوتا، دەفەوتێ، فەوتێندران، (أوبَقَهُ كَذَا) واتە: ئەو شتە فەوتاندی و، وای لێکرد: سست بێ و بە جێ بمێنێ و بفەوتێ، (مَوْبِق) واتە: شوێنی تێدا سەر بەفەتارەت چوونە، (مَوبِقَ) شوێنی فەوتێندران، بۆیە من بە فەوتێنگا[1]، واتە: شوێنێك کە خەڵکی تێدا دەفەوتێنرێ، تەفسیرم کردوە.

(مَصۡرِفٗا ): (المَصْرِفُ، الإنْصِرَافُ، وَمَكَانُ الصَّرْفِ)، (مَصْرِف) دەگونجێ چاوگ بێ، واتە: لادان، یان دەرباز بوون، دەشگونجێ ناوی شوێن بێ، واتە: شوێنی بەرەو لادان، شوێنی بۆ دەرباز بوون.

(قُبُلٗا ): (قُبُلاً: أي عياناً) واتە: ڕووبەڕوو، کە من بە لووت و بزووت مانام کردوە، (وَالقُبُلُ جَمْعُ القَبيلِ: وهو الجِيْلُ وَالجَمَاعَةُ، وقُبُلْ: المقَدَّمُ)، (قُبُلاً) واتە: ڕووبەڕوو، (قُبُلْ) کۆی (قبيل)ە، کە بە مانای پشتێك، یان کۆمەڵێك دێ، هەروەها (قُبُل) بە مانای شتێك دێ کە پێشخرابێ.

(لِيُدۡحِضُواْ بِهِ ٱلۡحَقَّ): بۆ ئەوەی هەقی پێ بفەوتێنن، هەقی پێ لەبەین بەرن، هەقی پێ پووچەڵ بکەنەوە. (أدْحَضَهُ: دَفَعَهُ، وَزَحْزَحَهُ، وَأَزْلَقَهُ) واتە: پاڵی پێوەناو لایبردو خلیسکاندی، (وأدْحَضَ الحُجَّةَ: أبْطَلَهَا) بەڵگەکەی پووچەڵ کردەوە.

(هُزُوٗا): (مهزوءاً به) واتە: گاڵتە پێکراو، (هَزِأ بِهِ، يَعني: سَخِرَ) واتە: گاڵتەی پێ کرد.

(أَكِنَّةً ): (أكِنَةَ جَمْعُ كِنانٌ، وَهُوَ الغِطَاء) واتە: (أكِنَة) کۆی (كِنانٌ)ە، یانی: پەردە، شتێك کە شتێك داپۆشێت، (أكنان جمع الكِنْ) واتە: پەناگە، پەنایەك کە شتێکی تێدا حەشار دەدرێ و پەنا دەدرێ.

---

(١) نەمدیوە پێشتر ئەو وشەیە بەکارهاتبێ، بەڵام مەرجەیش نیە نەبووبێ.

(وَقْرَاً): واتە: قورسایی، (وَقِرَتْ أُذُنَهُ وَقْرَاً) گوێی قورس بوو، شتێکی چووەتێ و نابیستێ.

(مَوْبِقًا ): (وَئَـلَ فُلاَنٌ يَئِـلُ وَئْـلاً ووئُـولاً أي: لَجَـأَ وخَلَـصَ، وَئَـلَ إلى اللَّـهِ: رَجَـعَ وَلَجـأَ)، پەنـای پێـبرد و دەربـاز بـوو، (وَئَـل إلى اللَّـه) پەنـای بـۆ خـوا بـرد، گەڕایـەوە بـۆ لای خـوا.

(لِمَهْلِكِهِم): واتـە: بـۆ کاتـی فەوتاندنەکەیـان، یاخـود بـۆ فەوتاندنەکەیـان، (هَلَـكَ، يَهْلِـكُ، هَـلاَكَاً، وهُلُـوكاً، وَمَهْلِـكاً، وَتَـهلكَةً: مَـاتَ: فَهُـوَ هَالِـكٌ)، (لِمَهلِكِهِـم) بـۆ فەوتاندنەکەیـان، (هَـلاَكَاً، وهُلُـوكاً، وَمَهلِـكاً، وَتَـهلِكَةً) هەمـوو ئەوانـە چاوگـن، واتـە: فەوتـا، دەفەوتـێ بـە فەوتـان (مَـاتَ: فَهُـوَ هَالِـكٌ) مـرد ئنجـا ئـەو فەوتـاوە.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـەم هەشـت ئایەتـەدا: حـەوت ڕاسـتیی گـەورە و مـەزن دەخاتـە ڕوو، کـە لـە پێناسـەی ئـەم دەرسـەدا باسـمان کـردن، سـەرەتا دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَوْمَ يَقُولُ نَادُوا۟ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ ﴾، واتـە: ئـەو ڕۆژە کـە (خـوا ﷻ) دەفەرمـوێ: ئـەو هاوبەشـانەم کـە پێتـان وابـوو، خەیاڵتـان وابـوو، هاوبـەشی منـن، بانگیـان بکـەن، بـە تەئکیـد بـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان، دەفەرمـوێ، ئـەوان گومانیـان وابـووە، خەیاڵیـان وابـووە خـوا هاوبـەشی هـەن، واتـە: بـە هاوبـەش دانـەرەکان دەفەرمـوێ: ئـەو هاوبەشـانەم کـە لـە خەیـاڵ و وەهمـی ئێـوەدا هەبـوون، ئەگەرنـا لـە دنیـای واقیعـدا، خـوا هاوبـەشی نیـن، یـانی: کـە ئێـوە پێتـان وابـوو هاوبەشـن، بانگیـان بکـەن.

یانی: ئەو ڕۆژە، ڕۆژێکی زۆر سەخت و ترسناکە، زۆر بێڕەزایە.

﴿ فَدَعَوْهُمْ ﴾، یەکسـەر بانگیـان کـردن، ﴿ فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُمْ ﴾، بـەڵام پەرسـتراوەکان وەڵامیـان نەدانـەوە، ﴿ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُم مَّوْبِقًا ﴾، ئێمـەش فەوتێنگایەکـمان خسـتە بەینیانـەوە، واتـە: کەندەڵانێـك، یاخـود چاڵێکـمان خستە بەینیانـەوە، یاخـود مەبەسـت دۆزەخـە، دۆزەخ لـە بەینیـان دابـوو، کـە خەڵـکی تێـدا دەفەوتـێ.

یـان خـوا ﷻ چاڵێـك، کەنداڵێـکی گـەورە دەخاتـە بەینـی بتپەرستەکان و ئەوانـەوە کـە پەرستوویانن و کردوویانـن بـە هاوبـەشی خـوا، ئـەوان لـەو بـەر و ئـەوان لەمبـەر، هەرچەنـدە بانگیـان دەکـەن، وەڵامیـان نادەنـەوە و هـەر دەنگیشیان نایانگاتـێ و ئەگـەر دەنگیشـیان بیانگاتـێ، وەڵامیـان نادەنـەوە.

﴿ وَرَءَا ٱلْمُجْرِمُونَ ٱلنَّارَ ﴾، تاوانبارەکان ئاگریان بینی، ئاگری دۆزەخیان دی، ﴿ فَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا ﴾، پێیان وابوو دەیچنەتێ، گومانیان وابوو، یاخود: ﴿ فَظَنُّوٓاْ ﴾، یانی: (إستيقنوا، علموا) واتە: دڵنیابوون و زانییان، کە دەیچنەتێ، چونکە وشەی (ظن) بەپێی ئەو سیاقە کە تێیدا دێ، ماناکەی دیاریی دەکرێ، جاری وایە بە مانای دوو دڵییە و، جاری وایە بە مانای گومانێکی زاڵە و، جاری واشە بە مانای زانیاریی تەواوە.

ئنجا لێرەدا ئەگەر بە مانای گومانی زاڵ بێ، ئەوە بەتەوسەوە خوای کارزان دەفەرموێ: وەك چۆن لە دنیادا گومان و خەیاڵیان وابووە: خوا هاوبەشی هەن، لە قیامەتیش بۆ چوون و خەیاڵیان وادەبێ کە دەچنە نێو ئاگر! بە تەوسەوە پێیان دەفەرموێ، ئەگەرنا لە ڕاستییدا دڵنیابوون کە تازە دەیچنەتێ، ﴿ وَلَمْ يَجِدُواْ عَنْهَا مَصْرِفًا ﴾، واتە: هیچ پەناگەیەکیشیان لەو ئاگرە چنگ نەکەوت، کە پەنای پێ ببەن و لێی دەربازبن.

(مَصْرِف)، واتە: شوێنێك کە ئینسان لێی دەرباز بێ، شوێنێك ئینسان بۆی بچێ و بۆی ببێتە پەناگەی دەربازبوون.

لێرەدا ڕەنگە پرسیارێك دروست ببێ: ئایا ئەوانە بۆچی لە دنیادا بێبڕوا بوون؟! ئایا دەبێ خوا ﷻ ئاگاداری نەکردبنەوە و، هۆشداریی نەدابنێ؟ بۆچی تووشی ئەو چارەنووسە تاڵە بوون؟!

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لِلنَّاسِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ﴾، بەدڵنیایی ئێمە لەم قورئانەدا، بۆ خەڵك بە شێوەی جۆراوجۆر، هەموو وێنەیەکمان خستۆتە ڕوو، واتە: هەموو وێنەیەکمان بە شێوەی جۆراوجۆر و بە دەربڕینی جیا جیا، لە قورئاندا بۆ خەڵك باسکرد بوو، هەموو وێنەیەك و هەموو پەندێك، ﴿ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا ﴾، بەڵام مرۆڤ لە هەموو شتێك زیاتر مشت ومڕ و شەڕە قسە دەکات.

(جَدَل) بریتییە: لە شەڕە قسەو، دەمە دەمێیەك کە مرۆڤ ئامانجی نەبێ تێیدا بگاتە هەق و ئەنجام، بەڵکو تەنیا مەبەستی ئەوەبێ قسەی بەرانبەرەکەی ڕەت بکاتەوە.

ئنجا لێرەدا پرسیارێکی دیکە دروست دەبێ: باشە مادام خوا ﷻ لە قورئاندا بۆ خەڵك هەموو پەند و وێنەیەکی جۆرا و جۆری بۆ خەڵك خستۆتە ڕوو، بۆچی بڕوایان نەهێناوە؟!

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤۡمِنُوٓاْ إِذۡ جَآءَهُمُ ٱلۡهُدَىٰ ﴾، واتە: هیچ شتێك ڕێی لە خەڵك نەگرت، [بە تەئكید مەبەست خەڵكی بێبڕوایە] كە بڕوا بێنن، لە كاتێكدا ڕێنماییان بۆ هات، ﴿ وَيَسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّهُمۡ ﴾، هەروەها هیچ شتێك ڕێی لێ نەگرتن، داوای لێبوردن لە پەروەردگاریان بكەن، ﴿ إِلَّآ أَن تَأۡتِيَهُمۡ سُنَّةُ ٱلۡأَوَّلِينَ أَوۡ يَأۡتِيَهُمُ ٱلۡعَذَابُ قُبُلٗا ﴾، مەگەر ئەوە كە:

**یەكەم:** یاسای پێشووانیان بەسەردا بچەسپێ.

**دووەم:** یاخود: سزاو ئازاریان ڕووبەڕوو بێ، یان: سزاو ئازاریان لووت و بزووت و كتوپڕ بۆ بێ، واتە: هەر چاوەڕێی ئەوە بوون و، ئەوە ڕێی لێگرتن: بڕوابێنن كە پێیان وابوو، ئەوەی بەسەر پێشووان هاتوە، بەسەر وان نایەت و، پێیان وابوو سزای خوایان بۆ نایەت، چاوەڕێی یەكێ لەو دوو شتانەیان دەكرد، ئەوە ڕێی لێگرتن كە بڕوا بێنن.

واتە: ئەوە ڕێی لێگرتن كە پابەندبن بە بەرنامەی خواوە و، ملكەچی بەرنامەی خوا بن، كە:

١ - گومانیان هەبووە لەوەدا، كە یاسای خوا، بەسەر ئەوانیشدا بچەسپێ، وەك بەسەر گەلانی پێشوودا چەسپاوە.

٢- یاخود: سزاو بەڵای خوایان بۆ بێ ڕووبەڕوو، دەشگونجێ مەبەست لێرەدا لە: (عذاب) سزای دۆزەخ بێ، كە سزای دۆزەخیان ڕووبەڕوو بێتەوە.

﴿ وَمَا نُرۡسِلُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ﴾، ئێمەش ڕەوانەكراوان، ڕەوان ناكەین، مەگەر كە مژدەدەر و ترسێنەر بن، ﴿ وَيُجَٰدِلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِٱلۡبَٰطِلِ ﴾، واتە: ئەوانەی بێبڕواشن، بە ناهەق مشت و مڕ و شەڕە قسە دەكەن، یاخود: پەنا دەبەنە بەر ناهەق، بۆ ئەوەی مشت و مڕ و شەڕە قسەی پێ بكەن ﴿ لِيُدۡحِضُواْ بِهِ ٱلۡحَقَّ ﴾، بۆ ئەوەی هەقی پێ بەرپەرچ بدەنەوە، هەقی پێ بفەوتێنن، هەقی پێ لابەرن و پووچەڵ بكەنەوە، ﴿ وَٱتَّخَذُوٓاْ ءَايَٰتِي وَمَآ أُنذِرُواْ هُزُوٗا ﴾، لە حاڵێك دا كە: نیشانەكانی من و ئەوەی كە پێی وریاكراونەوە و پێی ترسێنراون، بە گاڵتەیان گرتوە.

﴿ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ﴾، ئایا كێ ستەمكارترە لە كەسێك كە ئایەتەكانی پەروەردگاری بیرخرابنەوە یانی: نیشانەكانی پەروەردگاری، یان ڕستەكانی فەرمایشتی پەروەردگاری، بیرخرابنەوە، ﴿ فَأَعۡرَضَ عَنۡهَا ﴾، كەچی پشتی تێكردبن و لاملی تێكردبن، ﴿ وَنَسِيَ مَا قَدَّمَتۡ يَدَاهُ ﴾، ئەوەشی لەبیر چووبێتەوە كە دوو دەستەكانی پێشیان خستوە، كە چ گوناهو تاوان و خراپەیەكی ئەنجام داوە و، پێشی خستوە بۆ ڕۆژی دوایی خۆی! واتە: هیچ كەس لەو كەسە ستەمكارتر نیە.

﴿ إِنَّا جَعَلۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ أَكِنَّةً أَن يَفۡقَهُوهُ ﴾، ئێمە لەسەر دڵیان پەردەمان داناون، کە تێی بگەن، واتە: بۆ ئەوەی تێی نەگەن، پەردەمان خستوونە سەر دڵەکانیان، ﴿ وَفِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَقۡرٗا ﴾، هەروەها قورساییمان خستۆتە گوێیەکانیانەوە.

بێگومان خوا پەردەی نەخستۆتە سەر دڵیان، بەو واتایە، کە دڵیان خرابێتە نێو کیف و توورەکەیەك و هیدایەتی خوای پێ نەگات، یاخود قوڕقوشم و قورساییەك لە گوێیاندا هەبێ، کە گوێیان هیچ نەبیستێ! بەڵکو یانی: ئەوانە بە پێی یاسای خوا، کە هەر کەسێ پشتی لە هیدایەتی خوا کرد و، گوێی بۆ نەگرت و، دڵی نەدایە، دوایی ئەو کۆئەندامانەی دەرککردن و، دیتن و، بیستنی لە کار دەکەون و، وەك ئەوە وایە پەردە بەسەر چاوی هەڵکشابێ و دڵی خرابێتە نێو کیف و توورەکەیەکەوە و، قوڕقوشم لە گوێی کرابێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن تَدۡعُهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ ﴾، هەر چەندە بانگیان بکەی بەرەو ڕێنمایی خوا، ﴿ فَلَن يَهۡتَدُوٓاْ إِذًا أَبَدٗا ﴾، هەرگیز ناتوانن ڕاستەڕێ بن و ئەو ڕێنماییەی خوا وەربگرن و قبووڵی بکەن! کە بەدڵنیایی خۆیان وایان بە خۆیان کردوە و، ڕێی گەڕانەوەیان لە خۆیان گرتوە و، لە ئەنجامی ئەو هەموو گوناهو تاوان و خراپەیەدا، هەستەوەرەکانی خۆیان لە کار خستوون.

﴿ وَرَبُّكَ ٱلۡغَفُورُ ذُو ٱلرَّحۡمَةِۖ ﴾، پەروەردگاریشت لێبووردەی خاوەن بەزەییە، ﴿ لَوۡ يُؤَاخِذُهُم بِمَا كَسَبُواْ لَعَجَّلَ لَهُمُ ٱلۡعَذَابَۚ ﴾، ئەگەر بەهۆی ئەوەوە کە بەدەستیان هێناوە، گرتبانی، سزای بۆ پێش دەخستن، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر لێبووردەیە و، زۆر خاوەن بەزەییە، زوو سزایان نادات، بەهۆی کردەوە خراپەکانیانەوە و، پەلە نەکات لە سزا دانیان، ﴿ بَل لَّهُم مَّوۡعِدٞ ﴾، بەڵکو ئەوان بەڵێنگەیەکیان هەیە و، کات و شوێنێکیان هەیە، بۆیان دیاریی کراوە، ﴿ لَّن يَجِدُواْ مِن دُونِهِۦ مَوۡئِلٗا ﴾، کە لەو بەڵێنگەیە، هیچ شوێنی خۆ بۆ لادان و، هیچ شوێنی خۆ لێ دەربازکردنیان، نییە و، هەر دەبێ تووشی ئەو بەڵێن و چارەنووسە بن و، دەبێ بەرەو ئەو سەرەنجامە بڕۆن، کە بریتییە لە ڕۆژی دوایی.

ئنجا خوا ﷻ باسی یەکێ لە یاساکانی خۆی دەکات لە ژیانی مرۆڤدا و، دەفەرموێ: ﴿ وَتِلۡكَ ٱلۡقُرَىٰٓ أَهۡلَكۡنَٰهُمۡ لَمَّا ظَلَمُواْ ﴾، ئەو ئاوەدانییانەش کە فەوتاندومانن، دوای ئەوە بووە کە ستەمیان کردوە، ﴿ وَجَعَلۡنَا لِمَهۡلِكِهِم مَّوۡعِدٗا ﴾، بۆ فەوتانەکەشیان، بەڵێنگەیەکمان داناوە، کات و شوێنێکمان دیاریی کردوون، کە ئەو کات و شوێنە، یاخود: ئەو بەڵێنگەیە، مسۆگەرە دێتە دی و، هیچ ئەگەری نەهاتنەدی نییە و، با جارێکی دیکەش بەوەهم و خەیاڵی پووچ دڵی خۆیان خۆش نەکەن و، هێندەی دیکە خۆیان دەسخەڕۆ نەکەن و. خەیاڵپڵاو نەکەن، چونکە: (کەس بە خەیاڵ نەبووە بە ماڵ)!!.

## مەسەلە گرنگەكان

**مەسەلەی یەكەم:**

**ئەو ڕۆژەش (ڕۆژێكی ترسناك بێرەزایە) كە خوا بە جگە لە خوا پەرستەكان دەفەرمووێ: بانگی ئەو هاوبەشانەم بكەن، كە پێتان وابوو هاوبەشمن، ئەوانیش بانگیان كردن، بەڵام وەڵامیان نەدانەوە و، ئێمەش فەوتێنگایەكمان خستە نێوانیان و، تاوانبارانیش ئاگر «ی دۆزەخ»یان دی و، زانییان كە دەچنە نێوی و، هیچ دەرەتانی لێ دەربازبوونیشیان، چنگ نەكەوت:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَيَوْمَ يَقُولُ نَادُوا۟ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُمْ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُم مَّوْبِقًا ﴿٥٢﴾ وَرَءَا ٱلْمُجْرِمُونَ ٱلنَّارَ فَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمْ يَجِدُوا۟ عَنْهَا مَصْرِفًا ﴿٥٣﴾ ﴾.

### شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ وَيَوْمَ يَقُولُ نَادُوا۟ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ ﴾، ئەو ڕۆژە كە خوا دەفەرمووێ: ئەو هاوبەشانەم بانگ بكەن، كە پێتان وابوو، (هاوبەشن) ﴿ وَيَوْمَ يَقُولُ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (يَوْمَ نَقُولُ) ئەو ڕۆژە كە دەڵێین، (النِّدَاءُ: طَلَبُ الإِقْبَالِ لِلشَّفَاعَةِ وَالنُّصْرَةِ)، بانگكردن داواكردنی بە دەمەوە هاتنە، بۆ تكاكردن و سەرخستن.

كە دەفەرمووێ: ﴿ زَعَمْتُمْ ﴾، (أي: زعمتموهم شُركائي) پێتان وابوو كە هاوبەشی منن، كە ئەمە گاڵتە پێكردن و، بە تەوس و توانجەوە قسە كردنی خوای دادگەرە، لەگەڵیان، واتە: ئێوە پێتان وابوو و، وا حاڵیی بوو بوون، كە ئەوانە هاوبەشی منن، ئەگەرنا: كوا خوا هاوبەشی هەن؟! وەك پەندی پێشینان دەڵێ: (بەس خوا خوایە، جگە لەوی، هەموو كا و بایە)، هەموویان دروستكراون و، خوا بوونی پێ بەخشیون، بۆ كاتێكی دیاریكراو.

٢)- ﴿ فَدَعَوْهُمْ ﴾، یەكسەر بانگیانكردن، خوا كە لەوێ دەفەرمووێ: بانگیان بكەن! یەكسەر بانگیان كردن، چونكە لەوێ كەس سەرپێچیی لە فەرمانی خوا ناكات.

٣)- ﴿ فَلَمْ يَسْتَجِيبُواْ لَهُمْ ﴾، بەڵام وەڵامیان نەدانەوە، ئەمە دوو واتای هەن:

أ- دەگونجێ هەر وەڵامیان نەدابنەوە، کە بانگیان کردوون.

ب- دەشگونجێ قسە و باسیان پێکەوە بووبێ، بەڵام وەڵامیان نەداونەوە بۆ جێبەجێ کردنی داواکارییەکەیان، کە بریتیە لەوەی هاوکارییان بکەن و، سەریان بخەن و، دەربازیان بکەن.

کە لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە ئەم دوو واتایەیان بۆ لێکدابنەوە و هەر گوتوویانە: وەڵامیان نەدانەوە، بەڵام وەك گوتم: دەگونجێ بەقسە وەڵامیان دابنەوە و، قسەیان لەگەڵ کردبن، بەڵام: ﴿ فَلَمْ يَسْتَجِيبُواْ لَهُمْ ﴾، یانی: وەڵامیان نەدانەوە کە داواکارییەکەیان بۆ جێبەجێ بکەن، ئنجا کەسێك داواکاریی داواکەرێك جێبەجێ نەکات، وەك ئەوە وایە، هەر جوابی نەدابێتەوە، یا قسەشی لەگەڵدا کردبێ.

٤)- ﴿ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُم مَّوْبِقًا ﴾، فەوتێنگایەکمان خستە نێوانیانەوە.

﴿ مَّوْبِقًا ﴾: خۆم ئەو وشەیەم بە کوردیی بۆ داناوە: (فەوتێنگا) ئەو شوێنەی کە خەڵکی تێدا دەفەوتێ و، دەبێتە شوێنی مەرگ و لە بەین چوون و، سەر تێدا بە فەتارەت چوونیان.

٥)- ﴿ وَرَءَا ٱلْمُجْرِمُونَ ٱلنَّارَ ﴾، تاوانبارانیش ئاگریان دی، ئاگری دۆزەخیان دی، واش پێدەچێ ئەو فەوتێنگایە، هەر ئاگرەکەی دۆزەخ بێ، ئنجا بەو پێیە بێ: ﴿ وَرَءَا ٱلْمُجْرِمُونَ ٱلنَّارَ ﴾، لە زمانی عەرەبییدا پێی دەگوترێ: (عطف بيان) بادانەوە بۆ ڕوونکردنەوەی چەمك و واتا و نێوەڕۆکی، ئەو فەوتێنگایەی کە بریتیە لە ئاگری دۆزەخ، تاوانباران ئەو فەوتێنگایەیان بینی، کە بریتیە لە ئاگری دۆزەخ.

٦)- ﴿ فَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا ﴾، پێیان وابوو کە دەیچنە نێو.

ئەم (ظَنّ)ە: أ - دەگونجێ مەبەست گومان بێ، کە لێرەدا ئەوە بە توانج و تەوسەوە، قسە پێ گوتنیانە، واتە: وەك چۆن لە ژیانی دنیادا گومانیان وابوو ئەو پەرستراوانە هاوبەشی خوان، لەوێش گومانیان وابووە دەیچنەتێ!

ب - دەشگونجێ (ظن) لێرەدا بە مانای دڵنیایی و زانیاریی تەواو بێ، واتە: دڵنیابوون کە دەیچنە نێو.

٧)- ﴿وَلَمۡ يَجِدُواْ عَنۡهَا مَصۡرِفٗا ﴾، هیچ پەناگەو شوێنی دەربازبوونیان لەو فەوتێنگایە، لەو ئاگری دۆزەخە، چنگ نەکەوت.

(المَصْرِفُ: مَكَانُ الصَّرْفِ أي: التَخَلُّصُ والمجَاوَزَةُ)، واتە: (مَصْرِف) شوێنی (صَرْف)ە، واتە: لادان، دەربازبوون، قوتاربوون، واتە: شوێنێکیان دەست نەکەوت، کە پەنای پێ بەرن و، لێی دەرباز بن.

کەواتە: ﴿مَصۡرِفٗا ﴾: (مَعْدِلاً) شوێنێك کە بۆی لادەن و، پەنای پێ بەرن و، تێیدا خاتر جەم بن، کە لەو فەوتێنگایە، لەو چوونە نێو ئاگری دۆزەخە، قوتار و دەرباز بوون.

**مەسەلەی دووەم:**

**بە دڵنیایی لە هەموو پەندێکمان لەم قورئانەدا بۆ خەڵکی، بە شێوەی جۆراو جۆر، باسکردوە و، مرۆڤیش لە هەموو شتێك بە مشت و مڕترە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لِلنَّاسِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا ﴿٥٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لِلنَّاسِ ﴾، بە دڵنیایی لەم قورئانەدا بۆ خەڵکی، بە شێوەی جۆراو جۆر، باسمان کردوە، چی باس کردوە؟!:

٢)- ﴿ مِن كُلِّ مَثَلٍ ﴾، لە هەموو وێنەیەك، لە هەموو پەندێك، بۆمان باسکردوون، بە شێوەی جۆراو جۆر: ﴿ صَرَّفْنَا ﴾، یانی: (نَوَّعْنا)، (تَصْرِيف) یانی: (تَنْوِيع)، جۆرا و جۆرکردن، گۆڕین لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێك.

ئێستاش با بەراوردێکی نێوان ئەم ئایەتە و، ئایەتی (٨٩)ی (الإسراء) بکەین:

لە سوورەتی: (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ فَأَبَىٰٓ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴿٨٩﴾ ﴾، لە سوورەتی (الإسراء)دا، ﴿ لِلنَّاسِ ﴾ پێشخراوە، بەڵام لێرە: ﴿ فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ ﴾ پێشخراوە، ئنجا ئایا هۆی چییە لێرەدا: ﴿ فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ ﴾ پێش خراوە، بەڵام لەوێ (الإسراء - ٨٩) (للناس) پێشخراوە؟

چونکە: لە پێشتر بوون (أولوية) لێرەدا بۆ باسی قورئانە، بەڵام لەوێ لە پێشتر بوون (أولوية) بۆ باسی خەڵك بووە، هیچ گومانیشی تێدا نیە: ئەو وردەکارییانە تەنیا لە فەرمایشتی خوادا چنگ دەکەون.

کە دەفەرموێ: ﴿ مِن كُلِّ مَثَلٍ ﴾، ((المَثَلُ: جُمْلَةٌ مِنَ القَوْلِ مُقْتطَعَة مِنْ كَلَامٍ، أو مُرْسَلَة بذَاتِهَا، تُنْقَلُ ممَّنْ وَرَدَ فيه إلى مُشَابِهِه بدُونِ تغيير، مثل: (فِي الصَّيْفِ ضَيَّعتِ اللَّبَن) وَ(الرَّائِدُ لاَ يَكْذِبُ أَهْلَه))[١].

---

(١) المعجم الوسيط، ص٨٥٤.

واتـە: (مَثَل) ڕستەیەكە لـە قسـە، كـە لـە قسـەیەك دادەبـڕدرێ، یاخـود هـەر سـەربەخۆ، قسـەیەكە دەكـرێ، لـەو ڕووداوەی كـە تێیـدا هاتـوە، دەگوازرێتـەوە بەسـەر هاووێنەكەیـدا، دەچەسـپێنرێ، بەبـێ ئـەوەی دەسـتكاریی بكـرێ، وەك: (فِي الصَّيْـفِ ضَيَّعـتِ اللَّـبَن) واتـە: لـە هاوینێـدا شـیرەكەت لـە دەسـتدا، ئـەوە بەسـەرهاتێكی هەیـە، یاخـود: (الرَّائِـدُ لاَ يَكْـذِبُ أَهْلَـه) واتـە: سەرمەشـق [ئـەوە كەسـەی پێـش خەڵكەكـەی خـۆی كەوتـوە] درۆیـان لەگـەڵ نـاكات، هەروەهـا گەلێـك پەنـدی دیكـە هـەن، چ لـە زمـانی عەرەبیـی و كوردیـی دا، چ لـە ئینگلیزیـی و هیندیـی دا و، چ لـە هەمـوو زمانـەكانی دنیـادا.

پەندی یەكەم: (فِي الصَّيْفِ ضَيَّعتِ اللَّبَن):

گێڕراوەتـەوە: ئافرەتێـك، پیاوێـك داوای لێكـردوە شـووی پێبـكات، ئەویـش شـووی پێنەكـردوە، دوایـی پیاوەكـە دەوڵەمەنـد بـووە و، ئافرەتەكـەش نـەدار بـووە، ئافرەتەكـە چـووە داوای هاوكاریـی لێكـردوە، پیاوەكـەش بـە ئافرەتەكـەی گوتـوە: (فِي الصَّيْفِ ضَيَّعتِ اللَّبَن) واتـە: لـە هاوینێـدا شـیرەكەت زایـە كـرد، وا پێدەچـێ ئـەو پیـاوە لـە وەرزی هاوینـدا بووبـێ، كـە داخوازیـی ئـەو ئافرەتـەی كـردوە و، ئەویـش ئامـادە نەبـووە شـووی پێبـكات، واتـە: ئەگـەر داواكارییەكـەی كـە هاوینـێ ئاڕاسـتەم كـردی، بـۆت جێبەجـێ كردبـام، ئێسـتا هاوكاریـم دەكـردی و لـە خزمـەت دا دەبـووم!

پەندی دووەم: (الرَّائِدُ لاَ يَكْذِبُ أَهْلَهُ):

دیـارە كەسـێك بـووە لـە پێـش خەڵكەكـەی خۆیـەوە، لـە پێـش هۆزەكـەی خۆیـەوە ڕۆیشـتوە و، شـتێكی بـەدی كـردوە، مەترسییەك دوژمنێـكی بـەدی كـردوە، بـەڵام ئـەوان گوێیـان بـۆ نەگرتـوە، دوایـی تـووشی ئـەو گرفـت و بەڵایـە بـوون، كـە ئـەو لەبارەیـەوە هۆشـداریی داونـێ، دوایـی پێـی گوتـوون: (الرَّائِـدُ لاَ يَكْـذِبُ أَهْلَـهُ) واتـە: كەسـێك پێـش گەلەكـەی خـۆی بكـەوێ، درۆیـان لەگـەڵ نـاكا، بـەڵام ئێـوە متمانەتـان بـە مـن نەبـوو، بۆیـە بـەو دەردەچـوون!

٣)- ﴿ وَكَانَ ٱلْإِنسَـٰنُ أَكْثَرَ شَىْءٍ جَدَلًا ﴾، مرۆڤیش لە هەموو شتێك زیاتر مشت و مڕ دەكات.

وشـەی: (شَيء: اسـمٌ مُفْـرَدٌ مُتوغِّـلٌ فِي العُمُـوم)، واتـە: ناوێـكی تاكـە، زۆر گشـتییە و، هەمـوو شـتێك دەگرێتـەوە.

(واســم التفضيـلِ هُنَـا، مَسْـلُوبُ المُفَاضَلَـةِ، مِثْـل: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَىَّ مِمَّا يَدْعُونَنِىٓ إِلَيْهِ ۖ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّى كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلْجَـٰهِلِينَ ﴿٣٣﴾ ﴾).

لێرەدا ناوی هەڵبژاردن (اسم التفضیل) مەبەست پێی بەراوردکاریی نیە، تاکو بڵێی: مرۆڤ لە فڵان ناژەڵ، یان لە فڵان بوونەدار (کائن) زیاتر مشت و مڕ دەکات، بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە، کە زۆر مشت و مڕ و شەڕە قسە دەکات، وەك قسەکەی: یوسوف ﷺ کاتێ خۆی: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِيٓ إِلَيْهِ ۖ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٣٣﴾ ﴾.

واتە: گوتی: خوایە! زیندان (گرتووخانە)م لەلا خۆشەویسترە لەوەی کە منی بۆ بانگ دەکەن.

بێگومان مەبەست ئەوە نەبووە کە گرتووخانەی لەلا خۆشەویستربێ لە زینا! بەڵکو مەبەستی ئەوە بوو: ئامادەم بچمە گرتووخانەوە، بەڵام ئامادە نیم ئەوەی ئەوان دەیڵێن جێبەجێی بکەم، کە بریتیە لە داوێن پیسی.

## دوو فەرموودە لەبارەی مشت ومڕ (جدال)٥٥٥:

دەربارەی وشەی مشت و مڕ و شەڕە قسە کردنی مرۆڤ، ئەم دوو فەرموودەیە دەهێنین:

فەرموودەی یەکەمیان:

{رَوَى أَنَسٌ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: يُؤْتَى بِالرَّجُلِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنَ الْكُفَّارِ، فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ: مَا صَنَعْتَ فِيمَا أَرْسَلْتُ إِلَيْكَ؟ فَيَقُولُ: رَبِّ آمَنْتُ بِكَ، وَصَدَّقْتُ بِرُسُلِكَ، وَعَمِلْتُ بِكِتَابِكَ، فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ: هَذِهِ صَحِيفَتُكَ لَيْسَ فِيهَا شَيءٌ مِنْ ذَلِكَ؟ فَيَقُولُ: يَا رَبِّ! إِنِّي لاَ أَقْبَلُ مَا فِي هَذِهِ الصَّحِيفَةِ، فَيُقَالُ لَهُ: هَذِهِ الْمَلاَئِكَةُ الْحَفَظَةُ يَشْهَدُونَ عَلَيْكَ، فَيَقُولُ: وَلاَ أَقْبَلُهُمْ يَا رَبِّ! وَكَيْفَ أَقْبَلُهُمْ وَلاَ هُمْ مِنْ عِنْدِي، وَلَا مِنْ جِهَتِي، فَيَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى: هَذَا اللَّوْحُ الْمَحْفُوظُ، أُمُّ الْكِتَابِ قَدْ شَهِدَ بِذَلِكَ، فَقَالَ: يَا رَبِّ أَلَمْ تُجِرْنِي مِنَ الظُّلْمِ؟ قَالَ: بَلَى، فَقَالَ: يَا رَبِّ! لاَ أَقْبَلُ إِلاَّ شَاهِداً عَلَيَّ مِنْ نَفْسِي، فَيَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى: الآنَ نَبْعَثُ عَلَيْكَ شَاهِدًا مِنْ نَفْسِكَ، فَيَتَفَكَّرُ مَنْ ذَا الَّذِي يَشْهَدُ عَلَيْهِ مِنْ نَفْسِهِ؟ فَيُخْتَمُ عَلَى فِيهِ، ثُمَّ تَنْطِقُ جَوَارِحُهُ بِالشِّرْكِ، ثُمَّ يُخَلَّى بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْكَلَامِ، فَيَدْخُلُ النَّارَ، وَإِنَّ بَعْضَهُ لَيَلْعَنُ بَعْضًا يَقُولُ لِأَعْضَائِهِ: لَعَنَكُنَّ اللَّهُ، فَعَنْكُنَّ كُنْتُ أُنَاضِلُ، فَتَقُولُ أَعْضَاؤُهُ: لَعَنَكَ اللَّهُ، أَفَتَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ تَعَالَى يُكْتَمُ حَدِيثًا؟ فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا ﴿٥٤﴾ ﴾ } (أخرجه مسلم: ٢٩٦٩، وابن حبان: ٧٣٥٨، والحاكم: ٧٨٧٨، أبو يعلى: ٣٩٧٥).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پیاوێك لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا، لە کافرەکان، دەهێنرێ، خوا پێی دەفەرموێ: لەوەدا کە بۆ لای تۆ ڕەوانم کرد، چیت کرد؟! دەڵێ: پەروەردگارم: بڕوام بە تۆ هێنا و، پێغەمبەرانی تۆم بە

ڕاست دانان و، کاریشم بە کتێبەکەت کرد، خوا دەفەرموێ: ئەوە لیستی کردەوەکانتە، هیچ شتێك لەوەی کە تۆ دەیڵێی، تێیدا نیە!! دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! من ئەوەی کە لەو لیستەدا نووسراوە، قبووڵی ناکەم، پێی دەگوترێ: ئەوە فریشتە پارێزەرەکانن، شایەدییت لەسەر دەدەن، دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! ئەوانیش قبووڵ ناکەم، ئنجا چۆن قبووڵیان بکەم کە لە من نین و، لە لای منەوە نین، خوا دەفەرموێ: ئەوە (اللّوح المحفوظ، أمُّ الکتاب) شایەدیی بەوە دەدا، {واتە: ئەو دروستکراوەی خوا کە هەموو زانیارییەکانی تێدا تۆمار کردوون}، دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! ئایا تۆ پەنام نادەی کە ستەمم لێ بکەی؟! دەفەرموێ: با، دەڵێ: پەروەردگارم! من هیچ شایەدێك قبووڵ ناکەم، مەگەر لە خۆم بێ، خوای بەرز دەفەرموێ: باشە ئێستا شایەدێکت بۆ دەنێرین لە خۆت، بیردەکاتەوە: دەبێ کێ بێ لە خۆی شایەدیی لەسەر بدات!! ئیدی مۆر بەسەر زاریەوە دەنرێ، دوایی ئەندامەکانی دێنە گۆ و قسە دەکەن بە شیرك {و شایەدیی دەدەن کە ئەهلی شیرك بوون} دوایی وازی لێ دەهێنرێ کە قسە بکات {زاری دەکرێتەوە} سەرەنجام دوای ئەوەی ئەندامەکانی شایەدیی لەسەر دەدەن دەچێتە نێو ئاگرەوە و، هەندێك لە ئەندامەکانی نەفرین لە هەندێکیان دەکەن، بە ئەندامەکانی خۆی دەڵێ: نەفرینی خواتان لێبێ، من بەرگریم لە ئێوە دەکرد، کە ئێوە نەسووتێن! ئەندامەکانیشی پێی دەڵێن: نەفرینی خوات لێبێ، پێت وابوو کە دەگونجێ شتێك یان قسەیەك لە خوای بەرز بشاردرێتەوە؟ تا ئەوە قسەی خوای بەرزە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَكَانَ ٱلْإِنسَـٰنُ أَكْثَرَ شَىْءٍ جَدَلًا ﴾، واتە: مرۆڤ لە هەموو شتێك زیاتر مشت و مڕ و شەڕە قسە دەکات.

فەرموودەی دووەم:

{**عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى عَلِيٍّ وَفَاطِمَةَ، وَهُمَا نَائِمَانِ، فَقَالَ: «أَلَا تُصَلُّونَ؟»؟ فَقَالَ عَلِيٌّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّمَا أَنْفُسُنَا بِيَدِ اللَّهِ، فَإِذَا شَاءَ أَنْ يَبْعَثَهَا، بَعَثَهَا، فَانْصَرَفَ عَنْهُمْ، وَهُوَ يَقُولُ: ﴿ وَكَانَ ٱلْإِنسَـٰنُ أَكْثَرَ شَىْءٍ جَدَلًا ﴾**}، (أخرجه البخاري: ١١٢٧، مسلم: ٧٧٥، وَابن ماجه: ١١٨٧، وابن حبان: ٢٥٦٦).

واتە: عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ شەو هاتە لای عەلی و فاتیمە، لە کاتێکدا خەوتبوون، فەرمووی: هەڵناستن نوێژێ بکەن، (واتە: هەڵناسن شەو نوێژان بکەن؟!) عەلی گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ڕووحەکانمان بە دەست خوان، ئەگەر ویستی هەڵمانسێنێ، هەڵمان دەستێنێ، پێغەمبەری خواش ﷺ ڕۆیشت {دەستی لە ڕانی

خوّی دەدا، وەك سەرسوڕمان)[1] دەیفەرموو: ﴿ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَىْءٍ جَدَلًا ﴾، مرۆڤ لە هەموو شتێك زیاتر مشت و مڕ و شەڕە قسە دەكات.

**مەسەلەی سێیەم:**

**هیچ شتێكیش ڕێی لە خەڵكی بێبڕوا نەگرت، كاتێك ڕێنماییان بۆ هات، بڕوا بێنن و داوای لێبوردن لە پەروەردگاریان بكەن، جگە لەوە كە یاسای پێشینانیان بۆ بێ و بەسەردا بچەسپێ، یان سزای ڕووبەڕوویان بۆ بێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓا۟ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰ وَيَسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّهُمْ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمْ سُنَّةُ ٱلْأَوَّلِينَ أَوْ يَأْتِيَهُمُ ٱلْعَذَابُ قُبُلًا ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓا۟ ﴾، هیچ شتێك ڕێی لە خەڵك نەگرت بڕوا بێنن، كە دەفەرموێ: هیچ شتێك ڕێی لێنەگرتن كە بڕوا بێنن، یانی: بڕوایان نەهێناوە، بۆیە لێرەدا (أل)ی ﴿ ٱلنَّاسَ ﴾، بۆ (عَهْدَ)ە، واتە: خەڵكێكی دیاریكراو، كە بریتین لە خەڵكێكی بێبڕوا، هیچ شتێك ڕێی لە خەڵكی بێبڕوا نەگرت، بڕوا بێنن.

﴿ أَن يُؤْمِنُوٓا۟ ﴾، یانی: (مِنْ أنْ يُؤمِنُوا) كە بڕوا بێنن، بڕوا بە چی بێنن؟ بڕوا بە خوا ﷻ بێنن وەك تاكە پەستراو و بەدیهێنەر و پەروەردگار و، بڕوا بە پێغەمبەران (عليهم الصلاة وسلام) بێنن، بڕوا بە كتێبەكانی خوا بێنن،...هتد.

٢)- ﴿ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰ ﴾، كاتێك كە ڕێنماییان بۆ هات، كەواتە: بڕوا نەهێنانەكەیان، هۆكارەكەی بەڕێ نەزانین و نەبوونی شارەزایی و ڕێنمایی، نەبووەو هۆكارێكی دیكەی هەبووە.

٣)- ﴿ وَيَسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّهُمْ ﴾، هەروەها (هیچ شتێك ڕێی لێنەگرتن) كە داوای لێبوردن لە پەروەردگاریان بكەن.

لێرەدا دوو حاڵەتی باس كردووە، كە دەبوو خەڵك بیانبوونایە، بەڵام نیانن:

---

(١) ئەمە لەڕیوایەتی دیكەدا هاتوە.

**یەكەم: بڕواهێنان.**

**دووەم: داوای لێبوردن لە خوا كردن، چونكە خەڵك بە گشتی دوو حاڵەتیان هەن:**

**١/ یان هیدایەتی خوایان وەرگرتوە، بەڵام گوناهو تاوانیان هەیە.**

**٢/ یاخود ئەصڵەن هیدایەتی خوایان وەرنەگرتوە.**

ئنجا ئەگەر هیدایەتی خوایان وەرنەگرتبێ، دەبێ پێشێ هیدایەتی خوا وەربگرن، ئەگەر وەریشیان گرتبێ و، هەڵە و كەم و كوڕییان هەبێ، دەبێ داوای لێبوردن لە پەروەردگاریان بكەن، بۆ كەم و كوڕییەكانیان.

هیچ شتێك ڕێی لێنەگرتن، جگە لەچی؟!.

٤)- ﴿ إِلَّآ أَن تَأۡتِيَهُمۡ سُنَّةُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾، مەگەر ئەوە كە یاسای پێشینانیان بۆبێ، واتە: جێ بەجێ بوونی یاسای خوا لە پێشینانیاندا.

(أي: انْتِظَارَ أَنْ تَأْتِيهِم سُنَّةُ الأَوَّلِيْن)، واتە: مەگەر چاوەڕوانیی ئەوەیان كرد: یاسای خوا، كە لە پێشینانی ئەواندا جێبەجێ بووە و ڕابردوە، ئەو یاسایە بۆ ئەوانیش بێ و، بەسەر ئەوانیشدا بچەسپێ، كە بریتیە لەوەی خوا لەبەینیان بەرێ و سەریان بە فەتارەت بدات.

٥)- ﴿ أَوۡ يَأۡتِيَهُمُ ٱلۡعَذَابُ قُبُلٗا ﴾، یان چاوەڕوانیی ئەوە: كە سزای خوایان ڕووبەڕوو و، لووت و بزووت بۆ بێ، ﴿ قُبُلٗا ﴾، (قُبُلاً: جَمْعُ قَبِيل)، سزای خوایان بەش بەش بۆ بێ.

یاخود: ﴿ قُبُلٗا ﴾، بە مانای (ظَاهِرًا) دێ، واتە: بە ئاشكرا و بە ڕواڵەتیی بۆیان بێ، بە بەر چاویانەوە بۆیان بێ، خوێنراویشەتەوە: (قِبَلاً) ئەویش بە هەمان شێوە: هەم بە مانای: بەش بەش بۆیان بێ و، هەم بە مانای: بەبەر چاویانەوە بۆیان بێ، یاخود كتوپڕ لووت و بزووت بۆیان بێ، دێ.

كەواتە: هۆكاری بڕوا نەهێنانیان بریتی بووە لە چاوەڕێ كردنیان بۆ هاتنە دی یاسای خوا، كە لە بەینیان بەرێ، یاخود هاتنی سزا و ئازاری خوا كە ڕووبەڕوو بۆیان بێ، ئنجا دەگونجێ ئەو ئازار و سزایەی خوا، مەبەست پێی بەڵایەكی دنیایی بێ، یاخود: سزای ڕۆژی دوایی بێ.

**مەسەلەی چوارەم:**

**پێغەمبەرانیش تەنیا بە موژدەدەر و ترسێنەر دەنێرین و، ئەوانەی بێبڕواشن مشت و مڕی بە ناهەق دەکەن، تاکو هەقی پێ لابەرن و گاڵتەش بە ئایەتەکانمان و، ئەو (پەیام)ەش دەکەن کە پێی ترسێنراون:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَا نُرْسِلُ الْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَيُجَادِلُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِالْبَاطِلِ لِيُدْحِضُوا بِهِ الْحَقَّ وَاتَّخَذُوا آيَاتِي وَمَا أُنذِرُوا هُزُوًا ﴿٥٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمَا نُرْسِلُ الْمُرْسَلِينَ ﴾، ئێمە ڕەوانەکراوانمان، نانێرین، یانی: ئێمە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) - کە لە لایەن خواوە ڕەوانەکراون - لە هیچ حاڵاندا، نانێرین.

٢)- ﴿ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ﴾، مەگەر موژدەدەر و ترسێنەر بن، تەنیا بۆ دڵخۆشکردن و، موژدە پێدانی ئەوانەی کە ئیمان بە خوا دێنن و، فەرمانبەریی بۆ خوا دەکەن و، ترساندن و هەڕەشە لێکردن و وریاکردنەوەی ئەوانە کە ئامادە نین، بەدەم بانگەوازی پێغەمبەرانەوە (علیهم الصلاة والسلام) بچن و، ئیمان بە خوا بێنن و فەرمانبەریی بۆ بکەن، تەنیا بۆ ئەوە دەیاننێرین.

٣)- ﴿ وَيُجَادِلُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِالْبَاطِلِ ﴾، ئەوانەش کە بێبڕوان بە ناهەق مشت ومڕ و شەڕە قسە دەکەن، (جدال)، واتە: ناکۆکیی و مشت و مڕ و شەڕە قسە، چونکە (جدال) لە (جَدالة) وە هاتوە، یانی: زەوی، وەك چۆن دوو کەس کە زۆران (ملانە) دەگرن، هەرکامیان هەوڵدەدات بەرانبەرەکەی بخاتە سەر زەوی و بەسەریدا زاڵبێ و بیبەزێنێ، شەڕە قسەش هەروایە.

ئنجا ئایا بێبڕوایان بۆچی مشت و مڕ و شەڕە قسە دەکەن؟

٤)- ﴿ لِيُدْحِضُوا بِهِ الْحَقَّ ﴾، تاکو بەو ناهەقیە، هەق بەرپەرچ بدەنەوە و لایبدەن و نەیهێڵن.

٥)- ﴿ وَاتَّخَذُوا آيَاتِي وَمَا أُنذِرُوا هُزُوًا ﴾، ئەوانە: نیشانەکانی من و ئەوەی پێی ترسێنراون، بە گاڵتەیان گرتوون، ﴿ هُزُوًا ﴾، خوێنراویشەتەوە: (هُزْءاً) (الهُزُو والهُزْءُ: مَصْدَرُ هَزَأَ أي: اتَّخَذُوا ذَلِكَ مُسْتَهْزَءاً بِهِ)، واتە: ئەو نیشانانەی من و، ئەو ترساندن و وریاکردنەوەی منیان کردە گاڵتە پێکراوو، گاڵتەیان پێکرد، لە جیاتی بڕوای پێ بێنن، گاڵتەیان پێکرد، لە جیاتی ڕێزی بگرن، بە کەم و سووك تەماشایان کرد.

﴿ وَمَآ أُنذِرُواْ ﴾، ئـەو (ما)یـە (مصدریـة) و ﴿ وَمَآ أُنذِرُواْ ﴾، هەمـووی پێکـەوە دەبێـتە (وإنذارَهـم) ترسـێنرانەکەیان و ورياکردنەوەکەیـان لەگـەڵ نیشـانەکانی مـن، کردنـە گاڵتـە پێکراو.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**ئایا کـێ لـەو کەسـە ستەمکارترە، کـە ئایەتـەکانی پـەروەردگاری دەخرێنـەوە یـاد، کەچـی پشـتگوێیان دەخـات و، ئـەوەی دوو دەسـتەکانی پێشـیان خسـتوە {لـە تـاوان و خراپـە} لـە بیـری دەکات، ئێمـە پەردەمـان خسـتوونە سـەر دڵیـان و، ڕێیـان گرتـوە کـە تێبگـەن و، قورسـاییمان خسـتۆتە گوێیانـەوە (تاکـو نەبیسـتن)، بۆیـەش هەرچەنـدە بـەرەو ڕێنمایـی بانگیـان بکـەی، هەرگیـز ڕێ ڕاسـتگرتوو نابـن:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ فَأَعۡرَضَ عَنۡهَا وَنَسِيَ مَا قَدَّمَتۡ يَدَاهُۚ إِنَّا جَعَلۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ أَكِنَّةً أَن يَفۡقَهُوهُ وَفِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَقۡرٗاۖ وَإِن تَدۡعُهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ فَلَن يَهۡتَدُوٓاْ إِذًا أَبَدٗا ۝٥٧ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ﴾، ئایا کێ ستەمکارترە لە کەسێك، کە ئایەتەکانی پەروەردگاری بیرخرابنەوە، یانی: {بۆی خوێنرابنەوە و، بەسەردا خوێنرابنەوە و فێری کرابن و، خرابنە بەرچاوی} (أي لا أَحدٌ أظْلَمَ مِنْ هؤلاء المتحدَّث عَنْهُم)، هیچ کەس ستەمکارتر نیە لەوانەی کە قسەیان لە بارەوە دەکرێ، کە ئایەتەکانی خوایان خرابنەوە یاد، ئنجا: یان فێری کراون، یان بەسەریدا خوێنراونەوە، یان پێیان ئاشناکراوە، بە شێوەیەك لە شێوەکان.

٢)- ﴿ فَأَعۡرَضَ عَنۡهَا ﴾، واتە: کەچی ئەو پشتی تێکردوون، (أي: وَلَّى مُبدِياً عُرْضَهُ، أي: نَاحِيَتَهُ وجانبَهُ)، (عُرْض) واتە: تەنیشت، کەلەکە، (أَعْرَضَ عنها) واتە: کەلەکەو پشتی تێکردن و ڕووی لێ وەرگێڕان چونکە کەسێك ڕوو لە شتێك وەربسووڕێنێ: لە کاتی سووڕانەوەی دا کەلەکەی تێدەکات، دوایی پشتی دەکەوێتە ئەو شتەی کە قبووڵی ناکات.

٣)- ﴿ وَنَسِيَ مَا قَدَّمَتۡ يَدَاهُ ﴾، هەروەها ئەوەی لە بیرچوو، کە دوو دەستەکانی پێشیان خستوە.

لێرەدا (لە بیرچوون) (نسیان) بەکارهێنراوە بۆ چاوپۆشیی لێکردن و پشتگوێخستن، یانی: هەر چەندە تاوان و خراپەی کردوە، بەڵام نادیدەی گرتوە و بە هەندی نەگرتوە، لە جیاتی پەشێمانیی و داوای لێبوردن کردن!

٤)- ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً ﴾، واتە: ئێمە لەسەر دڵەکانیان پەردەمان داناون.

(أكنة) کۆی (كِنَان)ە، واتە: پەردە، یان کیف و توورەکە، دیارە پەردە بخرێتە سەر شتێك دایدەپۆشێ و، کیف و توورەکەش هەرچی تێیان بکرێ، ون دەبێ و حەشار دەدرێ.

٥)- ﴿ أَن يَفْقَهُوهُ ﴾، یانی: (مِنْ أَنْ يَفْقَهُوهُ؟) بۆ ئەوەی کە تێی نەگەن، (ضُمِّنَ أَكِنَّة معنى الحائل والمانع)، بەوە دەزانین: وشەی: (أَكِنَّةً)، مانای پەردە و پەرچی خراوەتە نێو، یانی: پەردەکانمان گێڕاون بە پەرچ و ڕێگر، لە نێوان ئەوان و تێگەیشتنی ئایەتەکانی خوادا، چونکە ڕستەی: (أَنْ يَفْقَهُوهُ) زیاد کراوە.

٦)- ﴿ وَفِيٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ﴾، هەروەها (وقر)یشمان خستۆتە گوێیەکانیانەوە، (الوَقْرُ: ثِقَلُ السَّمْعِ المانع من وُصُولِ الصَّوتِ إلى الصِّمَاخِ)، (وَقْر) بریتیە لەو قورساییەی کە ڕێگرە لەوەی دەنگ بگاتە پەردەی گوێ، تاکو ئەو دەنگە نەقڵ بکات و بۆ مێشك و لەوێش شی بکرێتەوە و، نێوەڕۆکەکەی بزانرێ، کە ئەو دەنگە چ واتا و مەبەستێکی گرتۆتە نێو خۆی!

٧)- ﴿ وَإِن تَدْعُهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ ﴾، هەرچەندە تۆ بانگیان بکەی بەرەو ڕێنمایی، واتە: خۆتیان پێوە ماندوو بکەی و ڕەنجیان لەگەڵ بکێشی.

٨)- ﴿ فَلَن يَهْتَدُوٓا۟ إِذًا أَبَدًا ﴾، [بە هۆی ئەوەوە] هەرگیز ڕێی ڕاستگرتوو نابن.

لە ڕستەی: ﴿ فَلَن يَهْتَدُوٓا۟ إِذًا أَبَدًا ﴾دا، سێ جەختکەرەوە (ثلاثة مؤكدات) هەن:

١)- (لن) کە بۆ (تأكيد وتأبيد)ە، واتە: هەرگیز ئەو شتە نابێ.

٢)- (إذا) (إِذًا: حَرْفُ الجَزَاءِ المُفِيدِ تَسَبُّبَ الجَزَاءِ عَلَى الشَّرْطِ)، (إذًا) پیتی پاداشتە و ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو بەرانبەر (جزاء)ە بەهۆی ئەو مەرجەوە بووە، واتە: مادام وایان کردبێ، ئەو سزایەیان دەبێ.

٣)- (أَبَدًا)، کە بۆ دەرگا کردنەوەیە بەرەو ئایندەیەکی دوورو درێژ، واتە: هەرگیز.

**نوكتەیەكی ڕەوانبێژیی:**

لێرەدا نوكتەیەكی ڕەوانبێژیی هەیە كە (**الخطیب الإسكافي**) لە كتێبەكەی خۆی (**دُرّة التنزیل وغُرّة تأویل**)دا[1]، هێناویەتی ئەویش ئەوەیە، كە خوا ﷻ لە سوورەتی (**السجدة**) - ٢١، ٢٢ - دا، هەر ئەم مەبەستە كە لێرە دەفەرمووێ: ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ فَأَعْرَضَ عَنْهَا ﴾، بە (ف) هێناویەتی، لەوێ بە جۆرێكی دیكە ئەو تەعبیرە هاتووە، كە دەفەرمووێ:

﴿ ... وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ الْعَذَابِ الْأَدْنَىٰ دُونَ الْعَذَابِ الْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢١﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَا ۚ إِنَّا مِنَ الْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾.

واتە: ... پێیان دەچێژین سزای كەمتر پێش سزای گەورەتر، بەڵكو بگەڕێنەوە [سزای كەمتر یانی: ئەو بەڵاو گرفتارییانەی كە لە دنیادا بەسەر خەڵك دێن، وەك هۆشداریی خوا] كێش ستەمكارترە لە كەسێك كە ئایەتەكانی پەروەردگاری دەخرێنەوە یاد، كەچی دوایی پشتیان تێدەكات، [پشتگوێیان دەخات] بێگومان ئێمە تۆڵە لە تاوانباران دەستێنین.

نوكتە ڕەوانبێژییەكەش ئەوەیە كە:

لە سوورەتی (**الكهف**) - ٥٧ - دا، دەفەرمووێ: ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ فَأَعْرَضَ عَنْهَا ﴾، واتە: كێ ستەمكارترە لە كەسێك كە ئایەتەكانی پەروەردگاری دەخرێنەوە یاد و، یەكسەر پشتیان تێدەكات، بە (**فاء التعقیب**) هاتووە، یانی: یەكسەر بەدوای ئەوەدا، كە ئایەتەكانی بیردەخرێنەوە، پشتیان تێدەكات.

بەڵام لە سوورەتی (**السجدة**)دا دەفەرمووێ: ﴿ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَا ۚ إِنَّا مِنَ الْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾، دوایی پشتیان تێدەكات، بۆچی لە (**الكهف**)دا بە (ف) هاتووە، بەڵام لە (**السجدة**)دا بە (ثم) هاتووە؟!

(**الإسكافي**) دەڵێ: (**السَّبَبُ أن آیة الكَهفِ تَتَحَدَّثُ عَنِ الدُّنیا، لكن آیة السجدةِ تَتَحَدَّثُ عَنِ الآخرة، والفاصل بین الدنیا والقیامة، یُناسبُها ثمَّ الذي للتراخي**) واتە: هۆیەكەی ئەوەیە، كە ئایەتەكەی سوورەتی (**الكهف**) دەربارەی ژیانی دنیا قسە دەكات، كە دەفەرمووێ:

---

(١) ص١٩٨.

﴿ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ فَأَعۡرَضَ عَنۡهَا ﴾، یانی: هەر لە دنیادا پشتیان تێدەکات و یەکسەر دوای ئەوەی ئایەتەکانی خراونە یاد، پشتیان تێدەکات، بەڵام ئایەتەکەی سوورەتی (السجدة) لە بارەی قیامەتەوەیەو قسە لە دواڕۆژ دەکات، ئنجا لە بەر ئەوەی دنیا و قیامەت نێوان (فاصل) یان کەوتۆتە بەین، وشەی (ثم) کە بۆ بەدوادا هاتنی بەکاوەخۆ (تراخي)یە، بۆوێ گونجاوە.

بەڵێ ئایەتەکەی (السجدة) لە سیاقی باسی قیامەت دا هاتوە، چونکە لە ئایەتی (١٢)دا هاتوە: ﴿ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلۡمُجۡرِمُونَ نَاكِسُواْ رُءُوسِهِمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ رَبَّنَآ أَبۡصَرۡنَا وَسَمِعۡنَا فَٱرۡجِعۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ ١٢ ﴾، واتە: ئەگەر ببینی تاوانباران سەریان شۆڕکردوە لە لای پەروەردگاریان، (لە قیامەت) دەڵێن: پەروەردگارمان! دیتمان و بیستمان بمانگێرەوە کردەوەی باش بکەین ئێمە (ئێستا) لە بڕوا پتەوانین.

ئنجا لەو سیاقەدا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ثُمَّ أَعۡرَضَ عَنۡهَآ إِنَّا مِنَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ مُنتَقِمُونَ ٢٢ ﴾، کەواتە: لە قیامەتی خوا دەفەرموێ: کێ ستەمکارترە لە کەسێك کە ئایەتەکانی پەروەردگاری خراونەتەوە بیر، دوایی پشتی تێکردوون، چونکە خرانەوە بیری ئایەتەکان، لە دنیادا بووە، هەروەها پشت تێکردنیان، بەڵام مادام لێرە لە قیامەتێ ئەو هەواڵە دەگێڕێتەوە، بە (ثم) دەیهێنێ، (ثم)ش بۆ کاوەخۆ (تراخي)یەو بێگومان نێوان (فاصل)یش، کەوتۆتە بەینی دنیا و دواڕۆژەوە.

**مەسەلەی شەشەم:**

**پەروەردگاریشت لێبوردەی خاوەن بەزەییە، ئەگەر بەوەی کردوویانە، سزای دابانایە ئازاری پەلەی بۆ دەهێنان، بەڵام بەپەلە سزایان نادات، بەڵکو بەڵێنگەیان هەیە، هیچ دەرەتانی خۆ لێ لادانیان بۆی نیە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَرَبُّكَ ٱلۡغَفُورُ ذُو ٱلرَّحۡمَةِۖ لَوۡ يُؤَاخِذُهُم بِمَا كَسَبُواْ لَعَجَّلَ لَهُمُ ٱلۡعَذَابَۚ بَل لَّهُم مَّوۡعِدٞ لَّن يَجِدُواْ مِن دُونِهِۦ مَوۡئِلٗا ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَرَبُّكَ ٱلۡغَفُورُ ذُو ٱلرَّحۡمَةِ ﴾، پەروەردگارت لێبوردەیەو خاوەن بەزەییە.

دەیتوانی بفەرموێ: (وَرَبُّكَ الغَفُورُ الرَّحِيم) وەك لە شوێنەکانی دیکەدا هاتووە، بەڵام لێرەدا: ﴿ ذُو ٱلرَّحۡمَةِ ﴾، خاوەنی بەزەییە، ئەمە زێدەڕۆیی زیاتری تێدایە و خستنە ڕووی زیاتری بەزەیی خوای تێدا هەیە، واتە: خاوەنی هەموو ڕەحمەت و بەزەیی و سۆز و پەرۆشێکە بۆ بەندەکانی، بۆیە پەلە ناکات لە سزادانیان لە دنیادا، کەواتە: پەلەنەکردنی لە سزادانی بەندەکانی دا، بەرهەمی ئەو هەموو بەزەیی و پەرۆش و میهرەبانییەیەتی.

٢)- ﴿ لَوۡ يُؤَاخِذُهُم بِمَا كَسَبُواْ لَعَجَّلَ لَهُمُ ٱلۡعَذَابَ ﴾، ئەگەر بیانگرێ بەوەی کە کردوویانە، واتە: ئەگەر گرتبانی و سزای دابان بەهۆی کردەوەکانیانە کە وەدەستیان هێناون، شایستە بوون، لەبەرئەوەی بێبڕوایی و سەرپێچییان وەدەست هێناوە، شایستەی ئەوە بوون کە بە پەلە سزایان بدا، بەڵام بە هۆی ئەوەوە کە خوا لێبوردەیە و، خاوەنی بەزەیی هەموویەتی، بۆیە مۆڵەتیان دەدا.

٣)- ﴿ بَل لَّهُم مَّوۡعِدٞ ﴾، ئێستا سزایان نادات، بەڵکو بەڵێنگەیەکیان هەیە، (المَوْعِدُ: وَقْتُ الوَعْدِ وَمَكَانُ الوَعْدِ) پێشتر گوتوومانە: (مَوْعِد) واتە: کاتی بەڵێن، یاخود شوێنی بەڵێن، بۆیە من بە کوردیی دەڵێم: بەڵێنگە، کە هەم بۆ کات و هەم بۆ شوێنەکەش بەکاردێ، ئەوانە بەڵێنگەیەکیان هەیە.

٤)- ﴿ لَّن يَجِدُواْ مِن دُونِهِۦ مَوۡئِلٗا ﴾، واتە: هەرگیز پەنا و شوێنێکی خۆ بۆ لادانیان، لێی نیە، هیچ دەرەتانیان لێی نیە، هیچ چارەیان نیە و ئەو بەڵێنگەیە هەر بۆیان دێ.

(مَوْئِل)، (مَفْعِلٌ مِنْ وَأَل: لَجَأ، فَهُوَ اسْمُ مَكَانٍ بِمَعْنَى المَلْجَأ) واتە: (موئل) (مَفْعِل)ە، لە (وَأَل) یانی: (لجأ): پەنای پێ برد، کەواتە: ناوی شوێنە، یانی: پەناگە، شوێنێك کە ئینسان بۆی لابدات و پەنای پێ بەرێ، هانای بۆ بەرێ.

**مەسەلەی حەوتەم:**

**ئـەو ئاوەدانییانەشـمان دوای ئـەوە فەوتانـدن، کـە سـتەمیان کـردن، بەڵێنگەشـمان بـۆ فەوتاندنیـان دانـا بـوو:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَتِلْكَ ٱلْقُرَىٰٓ أَهْلَكْنَٰهُمْ لَمَّا ظَلَمُوا۟ وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِم مَّوْعِدًا ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَتِلْكَ ٱلْقُرَىٰٓ ﴾، واتە: ئا ئەو ئاوەدانییانە، وشەی (تلك) ئاماژەیە بۆ شتێك کە لە زەیندا دیارییکراوە، (تل) ئاماژەکەیە و (ك)ەکە کە پێوەی پەیوەستکراوە، مەبەست پێی دوێنراوێکی دیارییکراو نیە، بەڵکو هەمووی بەیەکەوە دەبێتە ناوی ئاماژە (اسم الإِشَارَة)، ئنجا ئەو (ك)ە، بە پێی ئەوە کە لەگەڵ حاڵەتی دوێنراودا دەگونجێ، گۆڕانی بەسەردا دێ: (تلك، تلكم، تلكما، تلكن) بەو شێوەیە بەپێی حاڵەتی دوێنراوەکان (ك)ەکە، گۆڕانی بەسەردا دێ، (وَتِلْكَ ٱلْقُرَىٰٓ)، واتە: ئا ئەو شار و ئاوەدانییانە، کە لە زیهندان، کە لەم سووڕەتە و لە سووڕەتەکانی دیکەدا ئاماژەیان پێکراوە، کە لە بەین براون.

ئنجا چۆن لە بەین براون؟.

٢)- ﴿ أَهْلَكْنَٰهُمْ لَمَّا ظَلَمُوا۟ ﴾، دوای ئەوەی ستەمیان کرد، لە بەینمان بردن و فەوتاندمانن، کەواتە: (الظُّلمُ مُبيدُ الأُمَم والقُرَى)، واتە: ستەم، فەوتێنەری گەلان و ئاوەدانییەکان.

کە دەفەرموێ: ﴿ لَمَّا ظَلَمُوا۟ ﴾، (ظلم) لە قورئاندا بە چەند مانایەك هاتوە:

١) هەم بە مانای سنوور بەزاندن هاتوە.

٢) هەم بە مانای دانانی شتێك لە شوێنێك دا کە هی خۆی نەبێ، هاتوە: (وضع الشيءِ في غير موضعهِ المناسب).

٣) هەم بە مانای دەستدرێژیی کردن بۆ هەقی ئەوانی دیکە هاتوە.

٤) هەم بە مانای کوفر هاتوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٥٤﴾ ﴾البقرة.

٥) هەم بە مانای شیرك هاتوە، وەك خوا لەسەر زاری لوقمان دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ ﴾لقمان.

٦) هەم بە مانای هەر گوناهو تاوانێك هاتوە كە ئینسان لە زاتی خۆیدا دەیكات، وەك هاوەڵان گوتیان: (وَأَیُّنَا لَمْ یَظْلِمْ نَفْسَه)، واتە: كام لە ئێمە ستەمی لە خۆی نەكردوە، هەروەها خوا كە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١١٠﴾ ﴾النساء، واتە: هەر كەسێ خراپەیەك بكات، یان ستەم لە خۆی بكات {واتە: لە بەینی خۆی و خوادا، خراپە بكات، كە ئەوە ستەمە لە خۆی دەكات، یاخود خراپەكارییەك بكات، كە زیانی بۆ بەرانبەرەكەی هەبێ} دوایی داوای لێبوردن لە خوا بكات، دەبینێ خوا لێبوردەی بەبەزەییە.

كەواتە: وشەی (ظُلْم) چەندان واتای جۆراوجۆر دەگرێتە خۆی، هەر لە شیرك و كوفرەوە بگرە، هەتا گوناهو تاوان و دەستدرێژیی بۆ ماف ئەوانی دیكە، ئنجا وشەی (ظلم) دەبێ لە هەر شوێنە، بە پێی سیاقەكەی تەماشای بكەین، كام مانای لە گەڵی گونجاوترە، ئەویانی لەگەڵ دادەنێین.

لێرەش: ﴿ أَهْلَكْنَـٰهُمْ لَمَّا ظَلَمُوا۟ ﴾، بە پێی سیاقی ئایەتەكان دەردەكەوێ: كە ئەو ستەمە لەوەدا بەرجەستە بووە، كە ئەوانە بانگەوازی خوایان ڕەتكردۆتەوە، بڕوایان بە كتێبەكانی خوا نەهێناوە و، ئایەتەكانی خوایان پشتگوێ خستوە و، پێغەمبەرانی خوایان بە درۆ داناوە و، هاوبەشیان بۆ خوا داناوە و، بڕوایان بە ڕۆژی دوای نەبووە، لێرەدا (ظُلْم)، ئەوە چەمك و واتایەكەیەتی.

بێگومانیش ئینسان ئەگەر بڕوای بە خوا نەبوو، بڕوای بە ڕۆژی دوای نەبوو، بڕوای بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، نەبوو، بڕوای بە ئایەتەكانی خوا نەبوو، ئەو كاتە ڕێی لە بەردەمدا تەخت و ناچووغ دەبێ، بۆ هەموو جۆرە سنوور شكێنیی و، ماف پێشێلكردنێكی ئەوانی دیكە و، غەدر و خیانەت و ناپاكیی و خراپەكاریی.

٣)- ﴿ وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِم مَّوْعِدًا ﴾، بۆ فەوتانەكەشیان بەڵێنگەمان دانابوو.

﴿ لِمَهْلِكِهِم ﴾، خوێنراویشەتەوە: (مُهْلَك ومَهلَكَ)یش و، هەرسێكیشیان مانایان یەكە، یان لێك نیزیكە: (مُهْلَك مصدر من میمیٌ مِنْ أَهْلَك) واتە: چاوگێكی میمییە لە كاری (أَهْلَكَ)ەوە هاتوە، (أَهْلَكَهُ فهو مُهْلَك) واتە: فەوتاندی ئەو فەوتێنراوە، (مَهْلِك)یش (اسم الزمان)ە، شوێنی فەوتان، (مَهْلَك)یش چاوگی میمییە لە (هَلَك)ەوە هاتوە، (هَلَكَ، یَهْلِكُ، مَهْلَكًا)، (مَهْلَك) واتە: فەوتاندن.

كەواتە: ئەگەر بفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِم مَّوْعِدًا ﴾، یانی: بۆ كاتی فەوتانەكەیان و، ئەگەر بفەرموێ: (لِمُهْلَكِهِم) یانی: بۆ فەوتاندنەكەیان و، ئەگەر بفەرموێ: (مُهلَكِهِم) واتە: دیسان بە مانای فەوتاندن دێ، بەڵام یەكیان لە: (أَهْلَكَ)یە و ئەوی دیكە لە: (هَلَكَ)یە.

تنجا ئەوە كە ستەم، مایەی وێران بوونە، مایەی سەر بە فەتارەت چوونی كۆمەڵگاكانە، ئەوە یاسایەكی خوایە لە ژیانی مرۆڤدا و، لە گەلێك شوێنی قورئاندا، خوا ئەو ڕاستییەی خستۆتە ڕوو، بۆ وێنە:

١- لە سوورەتی (الأنبياء)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴿١١﴾ ﴾.

واتە: زۆر ئاوەدانییمان فەوتاندن، كە ستەمكار بوون، دوای وانیش كۆمەڵێكی دیكەمان پێكەیاندن.

٢- لە سوورەتی (القصص)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾.

واتە: ئێمە فەوتێنەری ئاوەدانییەكان نین، مەگەر خەڵكەكەیان ستەمكاربن، یانی: ئەگەر ستەمكاربن، شایستەی ئەوەن، بیانفەوتێنین.

٣- لێرەش دەفەرموێ: ﴿ وَتِلْكَ ٱلْقُرَىٰٓ أَهْلَكْنَٰهُمْ لَمَّا ظَلَمُوا۟ وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِم مَّوْعِدًا ﴾ الكهف.

واتە: ئەو ئاوەدانییانە كاتێك فەوتاندمانن كە ستەمیان كرد، ستەمیش هەموو ئەو مانایانەی هەن، كە پێشتر ئاماژەمان پێدان.

خوا ﷻ دەیەوێ پێمان بفەرموێ: كە ئەم ژیانی دنیایەی ئێوە لەم سەر زەوییە بە پێی سیستەمێكی دادگەرانەی خوا بەڕێوە دەچێ، كە هەڵە قبووڵ ناكات، هەر بۆیە كاتێ ئاوەدانییەكان ستەم دەكەن، بە هۆی ستەمەوە، بە تایبەتی ستەم لە مافەكانی یەكدیی و، پێشێلكردنی مافی یەكدیی، شیرازەی كۆمەڵگا تێكدەچێ و، شایستەی ئەوە دەبێ: لە بەین بچێ، بۆیەش زانایانی ئیسلام گوتوویانە: (قد يدوم الملكُ مع الكفر، ولا يدومُ مع الظلم) واتە: جاری وایە حكومڕانیی بەردەوام دەبێ لەگەڵ كوفردا، بەڵام لەگەڵ ستەمدا بەردەوام نابێ، چونكە بە كوفر و ئیمان، خەڵك دەتوانن پێكەوە بژین، بەڵام لە كاتێكدا كۆمەڵێكیان دەبنە ستەمكار و، زۆربەی خەڵكەكەش دەبێتە ستەملێكراو و ستەمدیدە و چەوسێنراوە، لەو حاڵەتەدا شیرازەی كۆمەڵگا تێكدەچێ و، شایستەیی ئەوەی نامێنێ بەردەوام بێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان بیسـت و سـێ (٢٣) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەكانی: (٦٠ - ٨٢). لـەو (٢٣) ئایەتـەدا خـوا ﷻ بەسـەرهاتی مووسـا ﷺ و گەنجـە هاوەڵەكـەی و، ئـەو بەنـدە چاكەیـەی كـە خـوا زانیاریـی تایبـەتی فێركـردوە، گێڕاوەتـەوە.

پوختـەی ئـەو بەسـەرهاتەش ئەوەیـە، كـە مووسـا ﷺ بڕیـار دەدات بـە مەبەسـتی دۆزینـەوەی ئـەو بەنـدە چاكـەی خـوا، كـە زانیاریـی تایبـەتی پێـداوە، ئەگـەر ماوەیـەكی زۆریـش ڕۆیشـتوە، خـۆی بگەیەنێتـە شـوێنی بـە یەكگەیشـتنی دوو ئـاوەكان، (جەمسـەری دوو دەریایـەكان)، كـە خـوا ﷻ ئـاگاداری كردۆتـەوە: ئـەو پیـاوە ساڵحـە لەوێیـە، سـەرەنجام لەگـەڵ ئـەو بەنـدە چاكەیـەی خـوادا بـە یـەك دەگـەن و، مووسـا داوای هاوەڵایەتیـی لـێ دەكات، تاكـو لـەوەی خـوا فێـری كـردوە، شـارەزای بـكات، ئەویـش دوای ئـەوەی مەرجـی لەگـەڵ دادەنـێ، كـە بـۆ هیـچ شـتێك پرسـیاری لـێ نـەكات، تاكـو خـۆی هەواڵـی پێـدەدات، ئامادەیـی هاوەڵایەتیـی كـردنی مووسـا، دەردەبـڕێ، بـەڵام مووسـا سـێ جـاران، ناتوانـێ لـە بەرانبـەر هەندێـك لـە هەڵـس وكەوتەكانیـدا بـێ دەنـگ بـێ، كـە:

**یەكێكیان:** تێكدانی كەشتییەكە كە سواریی بوون.

**دووەمیان:** كوشتنی منداڵێكی نابالغ.

**سێیەمیان:** ڕاستكردنەوەی دیوارێكە لە ئاوەدانییەكدا كە ئامادە نەبوون میوانداریيان لێبكەن، كە بە بێ بەرانبەر، دیوارەكە ڕاست دەكاتەوە.

مووسـا ﷺ هـەر سـێ جـاران پرسـیاری لێـدەكات، پرسـیاری ڕەخنەگرانـە، سـەرەنجام لـە یـەك جیـا دەبنـەوە، بـەڵام حیكمـەت و دیـوی پەنهـانی هـەر سـێ كارەكـەی خـۆی (كـە مووسـا ڕەخنـەی لێیـان گرتـوە)، بـۆی ڕوون دەكاتـەوە.

﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ لَآ أَبْرَحُ حَتَّىٰٓ أَبْلُغَ مَجْمَعَ ٱلْبَحْرَيْنِ أَوْ أَمْضِىَ حُقُبًا ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا بَلَغَا مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا فَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ سَرَبًا ﴿٦١﴾ فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَىٰهُ

ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدۡ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبٗا ﴿٦٢﴾ قَالَ أَرَءَيۡتَ إِذۡ أَوَيۡنَآ إِلَى ٱلصَّخۡرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ
ٱلۡحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيۡطَٰنُ أَنۡ أَذۡكُرَهُۥۚ وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِي ٱلۡبَحۡرِ عَجَبٗا ﴿٦٣﴾ قَالَ ذَٰلِكَ مَا
كُنَّا نَبۡغِۚ فَٱرۡتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصٗا ﴿٦٤﴾ فَوَجَدَا عَبۡدٗا مِّنۡ عِبَادِنَآ ءَاتَيۡنَٰهُ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا
وَعَلَّمۡنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلۡمٗا ﴿٦٥﴾ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلۡ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمۡتَ رُشۡدٗا ﴿٦٦﴾
قَالَ إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا ﴿٦٧﴾ وَكَيۡفَ تَصۡبِرُ عَلَىٰ مَا لَمۡ تُحِطۡ بِهِۦ خُبۡرٗا ﴿٦٨﴾ قَالَ سَتَجِدُنِيٓ
إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرٗا وَلَآ أَعۡصِي لَكَ أَمۡرٗا ﴿٦٩﴾ قَالَ فَإِنِ ٱتَّبَعۡتَنِي فَلَا تَسۡـَٔلۡنِي عَن شَيۡءٍ حَتَّىٰٓ
أُحۡدِثَ لَكَ مِنۡهُ ذِكۡرٗا ﴿٧٠﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا رَكِبَا فِي ٱلسَّفِينَةِ خَرَقَهَاۖ قَالَ أَخَرَقۡتَهَا لِتُغۡرِقَ أَهۡلَهَا
لَقَدۡ جِئۡتَ شَيۡـًٔا إِمۡرٗا ﴿٧١﴾ قَالَ أَلَمۡ أَقُلۡ إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا ﴿٧٢﴾ قَالَ لَا تُؤَاخِذۡنِي بِمَا
نَسِيتُ وَلَا تُرۡهِقۡنِي مِنۡ أَمۡرِي عُسۡرٗا ﴿٧٣﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا لَقِيَا غُلَٰمٗا فَقَتَلَهُۥ قَالَ أَقَتَلۡتَ نَفۡسٗا زَكِيَّةَۢ
بِغَيۡرِ نَفۡسٖ لَّقَدۡ جِئۡتَ شَيۡـٔٗا نُّكۡرٗا ﴿٧٤﴾ ۞ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا ﴿٧٥﴾ قَالَ
إِن سَأَلۡتُكَ عَن شَيۡءِۭ بَعۡدَهَا فَلَا تُصَٰحِبۡنِيۖ قَدۡ بَلَغۡتَ مِن لَّدُنِّي عُذۡرٗا ﴿٧٦﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَيَآ أَهۡلَ
قَرۡيَةٍ ٱسۡتَطۡعَمَآ أَهۡلَهَا فَأَبَوۡاْ أَن يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارٗا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ فَأَقَامَهُۥۖ قَالَ لَوۡ
شِئۡتَ لَتَّخَذۡتَ عَلَيۡهِ أَجۡرٗا ﴿٧٧﴾ قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيۡنِي وَبَيۡنِكَۚ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأۡوِيلِ مَا لَمۡ تَسۡتَطِع عَّلَيۡهِ
صَبۡرًا ﴿٧٨﴾ أَمَّا ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتۡ لِمَسَٰكِينَ يَعۡمَلُونَ فِي ٱلۡبَحۡرِ فَأَرَدتُّ أَنۡ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٞ
يَأۡخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصۡبٗا ﴿٧٩﴾ وَأَمَّا ٱلۡغُلَٰمُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤۡمِنَيۡنِ فَخَشِينَآ أَن يُرۡهِقَهُمَا طُغۡيَٰنٗا
وَكُفۡرٗا ﴿٨٠﴾ فَأَرَدۡنَآ أَن يُبۡدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيۡرٗا مِّنۡهُ زَكَوٰةٗ وَأَقۡرَبَ رُحۡمٗا ﴿٨١﴾ وَأَمَّا ٱلۡجِدَارُ فَكَانَ
لِغُلَٰمَيۡنِ يَتِيمَيۡنِ فِي ٱلۡمَدِينَةِ وَكَانَ تَحۡتَهُۥ كَنزٞ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحٗا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبۡلُغَآ
أَشُدَّهُمَا وَيَسۡتَخۡرِجَا كَنزَهُمَا رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۚ وَمَا فَعَلۡتُهُۥ عَنۡ أَمۡرِيۚ ذَٰلِكَ تَأۡوِيلُ مَا لَمۡ تَسۡطِع
عَّلَيۡهِ صَبۡرٗا ﴿٨٢﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

[هەروەها یاد بکەوە! کە مووسا بە لاوە (بەردەستە)کەی خۆی گوت: واز لە ڕۆیشتن ناهێنم و بەردەوام دەبم، هەتا دەگەمە جەمسەری دوو دەریایەکە - یان ماوەیەکی زۆر دەڕۆم - ﴿٦٠﴾ ئنجا کاتێك گەیشتنە جەمسەری نێوانیان، ماسییەکەیانیان لەبیرچوو، ئیدی (ماسییەکە) هەڵبزۆقیە نێو دەریاو ڕێی پەنهانی خۆی گرتەبەر ﴿٦١﴾ کاتێك تێپەڕین (لەوێ ڕەت بوون)، مووسا بە لاوەکەی خۆی گوت: نیوڕۆژەکەمان بێنە (بیخۆین)، بەڕاستیی لەم گەشتەماندا ماندوو بووین ﴿٦٢﴾ (لاوەکەی) گوتی: ئەو کاتەت لە یادە کە (بۆ پشوودان) چووینە لای گا بەردەکە، من لەوێ ماسییەکەم لە بیرچوو و، تەنیا شەیتانیش لە بیری بردمەوە، کە باسی بکەم، بە جۆرێکی سەرسوڕهێنەریش ڕێی خۆی لە دەریاکەدا گرتەبەر ﴿٦٣﴾ (مووسا) گوتی: ئەو (شوێن)ە، ئەوە بوو کە لێی دەگەڕاین، ئیدی بە شوێنی خۆیاندا پشکنەرانە گەڕانەوە ﴿٦٤﴾ بەندەیەك لە بەندەکانمانیان دۆزیەوە، کە لە لایەن خۆمانەوە بەزەییەکی تایبەتمان پێدا بوو، زانیارییەکی دانستەشمان لەلای خۆمانەوە فێر کرد بوو ﴿٦٥﴾ مووسا پێی گوت: ئایا دەکرێ شوێنت بکەوم، تاکو لەو (زانیاریی) ەی فێری کراوی زانیارییەکی بە ئامانج گەیەنەرانەم فێر بکەی! ﴿٦٦﴾ گوتی: بە دڵنیایی ناتوانی لەگەڵم هەڵکەی (خۆڕاگربی) ﴿٦٧﴾ ئنجا چۆنیش لەسەر شتێك خۆڕاگر دەبی، کە پێی شارەزا نەبی! ﴿٦٨﴾ (مووسا) گوتی: ئەگەر خوا بیەوێ خۆڕاگرم دەبینی و، سەرپێچیی هیچ فەرمانێکت ناکەم ﴿٦٩﴾ (بەندەکە) گوتی: ئنجا ئەگەر هەر لەسەر داوایەکەت سووری و شوێنم کەوتی، لە بارەی هیچ شتێکەوە پرسیارم لێ مەکە، تاکو خۆم لەو بارەیەوە بۆت دەدوێم ﴿٧٠﴾ ئیدی ڕۆیشتن، هەتا سواریی کەشتییەك بوون، یەکسەر ئەو پیاوە کونی کرد، (مووسا) گوتی: ئایا چۆن کونت کرد، کە سەرەنجام خەڵکەکەی بخنکێنی؟ بە ڕاستیی شتێکی خراپ و ناقۆڵات کرد! ﴿٧١﴾ (بەندەکە) گوتی: ئەدی پێم نەگوتی: ناتوانی لەگەڵم خۆڕاگر بی؟ ﴿٧٢﴾ (مووسا) گوتی: بە هۆی لە بیرچوونەوەوە لێم مەگرە و، بارگرانییەکم مەخە سەر (سەغڵەتم بکات) ﴿٧٣﴾ ئیدی ڕۆیشتن هەتا تووشی کوڕیژگەیەك بوون، یەکسەر کوشتی (مووسا) گوتی: چۆن کەسێکی پاك و چاکت کوشت، بێ ئەوەی کەسێکی کوشتبێ؟ بە دڵنیایی شتێکی زۆر خراپت کرد! ﴿٧٤﴾ گوتی: ئەدی بە تۆم نەگوت: بە دڵنیایی لەگەڵ مندا مەدارناکەی (خۆت ڕاناگری!)، (مووسا) گوتی: ئەگەر

دوای ئەمجارە لە بارەی هەر شتێکەوە پرسیارم لێکردی (بۆچی کردووتە)؟ هاوەڵێتییم مەکە، بە دڵنیایی لەلای منەوە گەیشتوویە بەڵگەو پاساو (بۆ هاوەڵایەتیی نەکردنم) ﴿٧٦﴾ دیسان ڕۆیشتن، هەتا چوونە لای خەڵکی ئاوەدانییەك، ئنجا داوای خواردنیان لە خەڵکەکەی کرد، کەچی ئامادە نەبوون میواندارییان بکەن (بیانکەنە میوان)، ئنجا دیوارێکیان تێدا بینی خەریك بوو بڕووخێ، ئەو (بەندەیە)ش ڕاستی کردەوە، (مووسا) گوتی: ئەگەر ویستبات: کرێت لەسەری وەردەگرت ﴿٧٧﴾ (بەندەکە) گوتی: ئەمە لێك جیایی نێوان من و تۆیە، ئێستاش هەواڵی نهێنیی و سەرەنجامی ئەوەت پێدەدەم کە نەتتوانی خۆتی لەسەر ڕابگری (دان بەخۆت دابگری) ﴿٧٨﴾ هەرچی کەشتییەکەیە: هی چەند نەدارێك بوو لە دەریادا کاریان دەکرد، بۆیەش ویستم عەیبداریی بکەم (تاکو بەرچاو نەبێ)، چونکە لە پشتیانەوە پادشایەك هەبوو، دەستی بەسەر هەر کەشتییەك (ی نوێ و بەرچاو) دادەگرت ﴿٧٩﴾ هەرچی مێر منداڵەکەش بوو، باب و دایکی بڕواردار بوون، ترساین کە گیرۆدەی یاخیبوون و بێ بڕواییان بکات ﴿٨٠﴾ ئنجا ویستمان پەروەردگاریان بۆیان بگۆڕێ بە یەکێکی لە ڕووی چاکییەوە باشتر و، لە ڕووی بەزەییەوە نزیکتر ﴿٨١﴾ هەرچی دیوارەکەش بوو، هی دوو کوڕیژگەی هەتیوو بوو لە شارەکەداو، خەزنەیەکیشیان لە ژێریدا بوو (شێررا بۆوە)، ئنجا پەروەردگارت ویستی بگەنە حاڵەتی هێز و پێزیان و خەزنەکەیان دەربێنن، ئەمەش بەزەییەك بوو لە پەروەردگارتەوە، ئەوەشم لەخۆمەوە نەکرد، (بەڵکو بە فەرمانی خوا بوو)، ئەوەش حیکمەت و هەواڵی ئەوە بوو، کە نەتتوانی لەسەری خۆڕاگری و بێ دەنگ بی ﴿٨٢﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(لَآ أَبۡرَحُ): (أي لا أترُكُ)، واز ناهێنم، (البَرَاحُ: المَكَانُ المُتَّسِعُ الظَّاهِرُ، بَرِحَ: ذَهَبَ فِي البَرَاحِ، مَا بَرِحَ: ثَبَتَ فِي البَرَاحِ، لا أَبْرَحُ: مِثْلُ لا أَزَالُ، خُصَّ بِالإِثْبَاتِ، لأَنَّ بَرِحَ وَزَالَ اقْتَضَيَا مَعنَى النَّفْيِ وَ«لا» لِلنَّفْيِ، وَالنَّفْيَانُ يَحصُلُ مِن إجتِمَاعِهِما إثبَاتٌ)، (بَرَاح): بە شوێنێکی فراوانی ئاشکرا دەگوترێ، (بَرِحَ): واتە: چووە نێو ئەو شوێنە فراوانەوە، (مَا بَرِحَ): واتە: لەو شوێنە فراوانەدا مایەوە، (لا أَبرَحُ): وەك: (لا أَزَالُ)، یانی بەردەوام دەبم، تایبەت کراوە بە چەسپاندنی شتێکەوە، چونکە (بَرِحَ وَزَالَ): هەردووکیان مانای نەفی دەگەیەنن، ئنجا (لا)ش هەر مانای نەفی دەگەیەنێ، ئنجا لە دوو نەفییان، کە پێکەوە کۆ دەبنەوە (إثبَات) دێتە دی.

کەواتـە: بـۆ مانـای (لَآ أَبۡـرَحُ): دەتـوانی بڵێـی: (لا أتـرُكُ)، واتـە: واز ناهێنـم لـە ڕۆیشـتن، دەشـتوانی بڵێـی: بـەردەوام دەبـم لەسـەر ڕۆیشـتن، چونکـە ئەگـەر وازی لـە ڕۆیشـتن نەهێنـا، واتـە: بەردەوامـە لەسـەر ڕۆیشـتن.

(مَجۡـمَعَ ٱلۡبَحۡـرَيۡنِ): واتـە: شـوێنی پێـك گەیشـتنی دوو دەریایـەکان، یـانی: جەمسـەری دوو دەریایـەکان، (جەمسـەر) بریتیـە: لـە بەیەکگەیشـتنی دوو شـتان.

(حُقُبًا): (الزَمَـنُ الطَّویـل، وَالجَمـعُ أحْقَـاب، وَالحِقْبَـةُ: جَمْعُهَـا حِقَـب، مُـدَّةٌ مِـنَ الزَّمَـانِ مُبْهَمَـةٌ)، (حُقُبًا): واتـە: ماوەیـەکی زۆر درێـژ، کـۆی (حُقُـب)، (أحْقَـاب)ە و، کـۆی (حِقْبَـة)، یـان (حُقْبَـة)، (حِقَـبَ)ە، کـە بریتیـە: لـە ماوەیـەکی نەزانـراو لـە کات.

(سَرَبًا): (السَّرَبُ: الذَهَـابُ فِي حُـدُورٍ، وَسَرَبُ: الْمَكَانُ الْمُنحَـدِر)، (سَرَبُ) بریتیـە لـە شـۆڕ بوونەوە، هەروەهـا (سَرَب) بـە شـوێنێکی لێـژ دەگوتـرێ، بۆیـە مـن بـۆ ئـەم وشـەیەم ئـاوا مانـا کـردوە: (هەڵبزۆقیـە نێـو دەریایەکـە)، چونکـە ماسـییەکە خـۆی هەڵـداوە و لێـژ بۆتـەوە.

(غَدَآءَنَا): (الغَـدَاءُ: طَعَـامٌ يُتَنَـاوَلُ فِي الغَـدَاةِ: أوَّلِ النَّهَـارِ)، (غَـدَاء)، خواردنێکـە کـە لە سـەرەتای ڕۆژەوە دەخـورێ، لـە بەیانیـان دا، بـەڵام ئێسـتا کـراوە بـە خـواردنی نیـوەڕۆ، کـە لـە ئەسـڵ دا (غَـدَاء)، بـەو خواردنەیـان گوتـوە: کـە لەسـەرەتای ڕۆژەوە دەخـورێ، وەك (عَشاء)یشـیان بـەو خواردنـە گوتـوە: کـە لـە کۆتایـی ڕۆژدا دەخـورێ، لـە ئێـوارەدا.

(نَصَبًا): (النُّصْبُ وَالنَّصَبُ: التَّعَبُ)، (نُصْب) و (نَصَبْ) هەردووکیان بە مانای ماندوو بوونن.

(ٱلصَّخۡرَةِ): (الصَّخـرُ: الحَجَـرُ الصُّلـبُ)، بەردێـکی ڕەقـی پتـەو، بـەڵام مـن (صَخْـرَة)م، بـە گابـەرد لێکداوەتـەوە، واتـە: بەردێـکی گـەورە، ئـەوە نیـە تەنیـا بـەرد بـێ، بەڵکـو: بەردێـکی وابـێ، لـە شـێوەی ئەشـکەوتێك، پەنایـەك، بەردێـکی زل کـە سـێبەری هەبـێ، مـرۆڤ بتوانـێ لـە سـێبەریدا، یـان لـە پەنایـدا پشـوو بـدات.

(قَصَصًا): (القَـصُّ: تَتَبُّـعُ الأثَـرِ، وَالقَصَـصُ: الأثَـرُ، وَالقَصَـصُ: الأخْبَـارُ المُتَتَبَّعَـةُ)، (قَـصّ)، بـە مانـای پشـکنین دێ، بـە دوای شـوێنەواردا گـەڕان و، بـە دوای شـوێن پـێ کەوتـن، (قَصَص)یـش بـە مانـای شـوێن پـێ، دێ، یـان شـوێنەوار، هەروەهـا (قَصَـص) دیسـان بـەو هەواڵانـە دەگوتـرێ: کـە شـوێنیان دەکەوتـرێ و، مـرۆڤ بـە دوایانـدا دەچـێ.

(خَرَقَهَا): (الخَـرْقُ: قَطْـعُ الـشَّيءِ عَـلَى سَـبِيلِ الفَسَـادِ)، (خَـرْق)، بریتیـە لـە بڕینـی شـتێك بەشێوەی تێکـدان، (مِـن غَـيرِ تَدبُـرٍ وَلا تَفَكُّـر، وَهُـوَ ضِـدُّ الخَلْـق)، بەبـێ بیرلێکردنـەوەو تێوەڕامان،

کە پێچەوانەی (خَلق)ە، (خَلق)، بریتیە: لە دروستکردنی شتێك بە ئەندازەگیرییەوە، (خَرْق)یش بریتیە: لە تێکدانی، بەڵام (خَرق)، بە پێی سیاقەکە ماناشی دەگۆڕێ، کە لێرەدا بە مانای کونکردنی کەشتییەکە دێ.

(إِمْرًا): (أي: مُنكَراً، أَمِرَ الأَمرُ، أي: كَبُرَ وَكَثُرَ، كَقَولِهِم: إستَفحَلَ الأَمرُ)، واتە: کارێکی ناقۆڵا (خراپ)، دەگوترێ: (أَمِرَ الأَمرُ أي: كَبُرَ وَكَثُرَ)، واتە: کارێکی گەورەو زۆر، وەك دەگوترێ: (إستَفحلَ لأمرُ)، کارەکە زۆر بێڕەزا بوو، (لە سنوور دەرچوو).

(تُرْهِقْنِي): (رَهِقَهُ الأَمرُ: غَشِيَهُ بِقَهرٍ، رَهَقْتُهُ وَأَرهَقْتُهُ)، (رَهِقَهُ الأَمرُ)، واتە: ئەو کارەی هاتە سەر، بە شێوەیەك کە نارەحەتی بکات، ئەو کارەی پەڕیە سەر (نارەحەتی کرد)، دەگوترێ: (رَهَقْتُهُ وَأَرهَقْتُهُ)، هەردووکیان بە یەك واتان، واتە: ئەو کارەم خستە سەری، کە پێی نارەحەت دەبێ.

(عُسْرًا): (العُسرُ: نَقِيضُ اليُسرِ)، (عُسْر): پێچەوانەی (يُسْر)ە، (عُسْر): واتە: سەغڵەتیی، (يُسْر)، واتە: ئاسانیی، (عَسَّرَنِيَ الرَّجُلُ، يَعْنِي: طَلَبَنِي بِشَيءٍ حِينَ العُسْرَةِ)، (عَسَّرَنِيَ الرَّجُلُ)، پیاوەکە منی خستە سەغڵەتییەوە، داوای شتێکی لێکردم لە کاتێکدا کە کاتی تەنگ دەستییم بوو، (کاتی نەتوانینم بوو).

(نُّكْرًا): (النُّكْرُ: الدَّهَاءُ، وَالأَمرُ الصَّعبُ الَّذِي لا يُعْرَفُ)، (نُكْر)، بریتیە لە بەڵایەکی گەورە و، کارێکی قورس کە نەزانرێ چۆن لێی دەربازبی.

(عُذْرًا): (العُذْرُ: تَحَرِّي الإِنْسَانِ مَا يَمحُو بِهِ ذُنُوبَهُ، فَكُلُّ تَوْبَةٍ عُذْرٌ، وَلَيْسَ كُلُّ عُذْرٍ تَوْبَةً، وَاعتَذَرْتُ إِلَيْهِ: أَتَيْتُ بِعُذْرٍ، وَعَذَرتُهُ: قَبِلْتُ عُذْرَهُ)، (عُذْر): بریتیە لە خەفتانی مرۆڤ لە شتێك کە گوناهەکانی خۆی پێ بسڕێتەوە، بۆیە هەموو تەوبەیەك بە پۆزش لە قەڵەم دەدرێ، بەڵام هەموو عوزرێك بریتی نیە لە گەڕانەوەو تەوبە، (إعتَذَرْتُ إِلَيهِ)، واتە: پۆزشم بۆ هێنایەوە، بەڵام (عَذَرتُهُ)، پۆزشەکەیم لێ قبووڵ کرد.

(عُذر) لە کوردییدا پۆزشی بۆ بەکاردەهێنێنن، عوزری بۆ هێنایەوە، واتە: پۆزشی بۆ هێنایەوە، (وَعَذَرتُهُ)، واتە: پۆزشەکەیم وەرگرت.

(فِرَاقُ): (الفِرَاقُ، المُفَارَقَةُ)، (فِراق) و (مُفارَقة)، هەردووکیان بە مانای لێك جیابوونەوە، یاخود جیابوونەوەی کەسێك لە شتێك، ﴿ وَظَنَّ أَنَّهُ ٱلْفِرَاقُ ﴿٢٨﴾ ﴾القيامة، ئەو کەسەی کە لەسەرە مەرگ دایە، دەزانێت کە ڕووحی لە جەستەی جیا دەبێتەوە، یاخود خۆی دنیا بەجێ دێڵێ.

(كَنزٌ لَّهُمَا): واتە: خەزنەیەكی خۆیان، (الكَنزُ: جَعْلُ المَالِ بَعْضَهُ عَلَى بَعْضٍ، وَحِفْظُهُ)، (كنز) بریتیە: لەوە كە ماڵ و سامان هەندێكی لەسەر هەندێكی پەزمەندەو كەڵەكە بكرێ و، بپارێزرێ، (كَنزٌ): بە كوردیی خەزنەی پێ دەڵێین.

(أَشُدَّهُمَا): یانی: (قُوَّتِهِمَا)، بگەنە حاڵەتی تێگەیشتن و پێگەیشتن، یان حاڵەتی كامڵ بوون، یان حاڵەتی تین و توانایان.

(أَمْرِي): (أَي: شَأنِي وَحَالِي)، حاڵ و باڵی من، كۆی (أمر)، (أُمور)ە، (أُمُورُكُم)، واتە: حاڵ و باڵتان، بەڵام (أمر)، حاڵەتێكی دیكەی هەیە كە بریتیە: لەوەی چاوگی (أَمَرتُهُ)، بێ، (أَمَرتُهُ أَمْرًا)، فەرمانم پێكرد، (إِذَا كَلَّفتَهُ أَنْ يَفعَلَ شَيْئًا)، كاتێ كە داوای لێدەكەی ئەركێك ئەنجام بدات، ئەوەیان: (لا يُجْمَعُ وَهُوَ لَفظٌ لِلأَفعَالِ وَالأَقوَالِ كُلِّهَا، مثل: ﴿... وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ ٱلْأَمْرُ كُلُّهُۥ... ﴿١٢٣﴾﴾هود)، ئەو ئەمرەی كە مانای فەرمانە، (أَمَرتُهُ أمراً)، ئەمە كۆناكرێتەوە، بەڵكو بێژەیەكە هەم بۆ كردەوەكە، هەم بۆ تێكڕای كردەوەو قسەكان بەكاردەهێندرێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿... وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ ٱلْأَمْرُ كُلُّهُۥ... ﴿١٢٣﴾﴾هود، فەرمان هەمووی بۆ لای وی دەگێڕدرێتەوە، بەڵام ئەمری بە مانای (شأن) و (حال) بە (أُمور)، كۆدەكرێتەوە.

## پێنج دەقی سوننەت و دوو زانیاریی گرنگ لەبارەی بەسەرهاتی مووسا و خضرەوە

بەڕێزان! بەر لەوەی بێینە سەر مانای گشتی، ئەو بەسەرهاتەی مووسا ﷺ لەگەڵ (خَضِر)دا، پێویستە چەند دەقێك بێنین، وەك ڕێخۆشكردن، كە دوایی هەم مانا گشتییەكە و، هەم مەسەلە گرنگەكانی ئاسانتر دەبن و، ماناو مەبەستی ئەو بەسەرهاتە ڕۆشنتر دەبێتەوە، بەڵام پێویستە پێش ئەوە بڵێین: كە بەسەرهاتی مووساو (خَضِر) ﷺ، لە پەیمانی كۆندا، هەروەها لە پەیمانی نوێشدا بوونی نیە، واتە: لەوەدا كە پێی دەگوترێ: (الكِتابُ المُقَدَّس)، بە هەردوو پەیمانی كۆن و نوێیەوە، ئەو بەسەرهاتە بوونی نیە.

هەڵبەتە گەلێ شتی دیكەش نەهاتوە، یان وازی لێهێنراوە، یاخود هەر نەیانزانیوە، یاخود لەو بەشەیە كە خوا دەفەرموێ: ﴿وَنَسُواْ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ... ﴿١٣﴾﴾ المائدة، بەشێك لەوەی پێی ئامۆژگاریی كرا بوون، لە بیریان چوو، یاخود لەو جۆرەیە كە دەستكاریی كراوەو گۆڕدراوە.

ئەو دەقانەی سوننەتیش كە دەیانهێنین پێنج دەقن و، یەكەمیان گرنگترینیانەو تیشكێكی باش دەخاتە سەر ئەو بەسەرهاتەی، مووسا و ئەو بەندە چاكەی ناوی لە قورئان دا نەهاتوە، بەڵام لە سوننەت ناوی (خَضِر)ی لێنراوە:

١- [عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ: إِنَّ نَوْفًا الْبِكَالِيَّ يَزْعُمُ أَنَّ مُوسَى صَاحِبَ الْخَضِرِ لَيْسَ مُوسَى صَاحِبَ بَنِي إِسْرَائِيلَ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: كَذَبَ عَدُوُّ اللَّهِ، حَدَّثَنَا أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: «إِنَّ مُوسَى قَامَ خَطِيبًا فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ، فَسُئِلَ: أَيُّ النَّاسِ أَعْلَمُ؟ فَقَالَ: أَنَا، فَعَتَبَ اللَّهُ عَلَيْهِ إِذْ لَمْ يَرُدَّ الْعِلْمَ إِلَيْهِ، فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ: إِنَّ لِي عَبْدًا بِمَجْمَعِ الْبَحْرَيْنِ هُوَ أَعْلَمُ مِنْكَ، قَالَ مُوسَى: يَا رَبِّ فَكَيْفَ لِي بِهِ؟ قَالَ: تَأْخُذُ مَعَكَ حُوتًا فَتَجْعَلُهُ فِي مِكْتَلٍ، فَحَيْثُمَا فَقَدْتَ الْحُوتَ، فَهُوَ ثَمَّ، فَأَخَذَ حُوتًا فَجَعَلَهُ فِي مِكْتَلٍ.

ثُمَّ انْطَلَقَ وَانْطَلَقَ مَعَهُ فَتَاهُ يُوشَعُ بْنُ نُونٍ، حَتَّى أَتَيَا الصَّخْرَةَ وضعا رؤوسهما فَنَامَا، وَاضْطَرَبَ الْحُوتُ فِي الْمِكْتَلِ فَخَرَجَ مِنْهُ، فَسَقَطَ فِي الْبَحْرِ، فَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ سَرَبًا، وَأَمْسَكَ اللَّهُ عَنِ الْحُوتِ جِرْيَةَ الْمَاءِ، فَصَارَ عَلَيْهِ مِثْلَ الطَّاقِ، فَلَمَّا اسْتَيْقَظَ نَسِيَ صَاحِبُهُ أَنْ يُخْبِرَهُ بِالْحُوتِ، فَانْطَلَقَا بَقِيَّةَ يَوْمِهِمَا وَلَيْلَتِهِمَا، حَتَّى إِذَا كَانَا مِنَ الْغَدِ، قَالَ مُوسَى لِفَتَاهُ: آتِنَا غَدَاءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِنْ سَفَرِنَا هَذَا نَصَبًا قَالَ: وَلَمْ يَجِدْ مُوسَى النَّصَبَ حَتَّى جَاوَزَ الْمَكَانَ الَّذِي أَمَرَهُ اللَّهُ بِهِ، فَقَالَ لَهُ فَتَاهُ:

أَرَأَيْتَ إِذْ أَوَيْنَا إِلَى الصَّخْرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ وَمَا أَنْسَانِيهُ إِلَّا الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ وَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ عَجَباً، قَالَ: فَكَانَ لِلْحُوتِ سَرَبًا، وَلِمُوسَى وَفَتَاهُ عَجَبًا، فَقَالَ مُوسَى: ذَلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ فَارْتَدَّا عَلَى آثَارِهِمَا قَصَصاً.

قَالَ سُفْيَانُ: يَزْعُمُ نَاسٌ أَنَّ تِلْكَ الصَّخْرَةَ عِنْدَهَا عَيْنُ الْحَيَاةِ لَا يُصِيبُ مَاؤُهَا مَيْتًا إِلَّا عَاشَ، قَالَ: وَكَانَ الْحُوتُ قَدْ أُكِلَ مِنْهُ، فَلَمَّا قُطِّرَ عَلَيْهِ الْمَاءُ عَاشَ، قَالَ: فَرَجَعَا يَقُصَّانِ آثَرَهُمَا حَتَّى انْتَهَيَا إِلَى الصَّخْرَةِ، فَإِذَا رَجُلٌ مُسَجًّى بِثَوْبٍ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِ مُوسَى، فَقَالَ الْخَضِرُ: وَأَنَّى بِأَرْضِكَ السَّلَامُ؟ قَالَ: أَنَا مُوسَى، قَالَ: مُوسَى بَنِي إِسْرَائِيلَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: أَتَيْتُكَ لِتُعَلِّمَنِي مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا، قَالَ: إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا، يَا مُوسَى! إِنِّي عَلَى عِلْمٍ مِنَ اللَّهِ عَلَّمَنِيهِ لَا تَعْلَمُهُ أَنْتَ، وَأَنْتَ عَلَى عِلْمٍ مِنَ اللَّهِ عَلَّمَكَ اللَّهُ لَا أَعْلَمُهُ، قَالَ مُوسَى: سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ صَابِرًا وَلَا أَعْصِي لَكَ أَمْرًا، فَقَالَ له الخضر: فَإِنِ اتَّبَعْتَنِي فَلَا تَسْأَلْنِي عَنْ شَيْءٍ حَتَّى أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْراً، فَانْطَلَقَا يَمْشِيَانِ عَلَى سَاحِلِ الْبَحْرِ، فَمَرَّتْ بِهِمَا سَفِينَةٌ فَكَلَّمُوهُمْ أَنْ يَحْمِلُوهُمْ، فَعَرَفُوا الْخَضِرَ فَحَمَلُوهُ بِغَيْرِ نَوْلٍ، فَلَمَّا رَكِبَا فِي السَّفِينَةِ لَمْ يَفْجَأْ إِلَّا وَالْخَضِرُ قَدْ قَلَعَ لَوْحًا مِنْ أَلْوَاحِ السَّفِينَةِ بِالْقَدُومِ، فَقَالَ لَهُ مُوسَى: قَوْمٌ حَمَلُونَا بِغَيْرِ نَوْلٍ، عَمَدْتَ إِلَى سَفِينَتِهِمْ فَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا، لَقَدْ جِئْتَ شَيْئاً إِمْراً؟ قَالَ: أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْراً، قَالَ: لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلَا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْراً. قَالَ: وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فَكَانَتِ الْأُولَى مِنْ مُوسَى نِسْيَانًا.

قَالَ: وَجَاءَ عُصْفُورٌ فَوَقَعَ عَلَى حَرْفِ السَّفِينَةِ فَنَقَرَ فِي الْبَحْرِ نَقْرَةً، فَقَالَ لَهُ الْخَضِرُ: مَا نَقَصَ عِلْمِي وَعِلْمُكَ مِنْ عِلْمِ اللَّهِ إِلَّا مِثْلَ مَا نَقَصَ هَذَا الْعُصْفُورُ الَّذِي وَقَعَ عَلَى حَرْفِ السَّفِينَةِ مِنْ هَذَا الْبَحْرِ.

ثُمَّ خَرَجَا مِنَ السَّفِينَةِ فَبَيْنَمَا هُمَا يَمْشِيَانِ عَلَى السَّاحِلِ إِذْ أَبْصَرَ الْخَضِرُ غُلَامًا يَلْعَبُ مَعَ الغلمان، فأخذ الخضر رأسه، فَاقْتَلَعَهُ بِيَدِهِ فَقَتَلَهُ، فَقَالَ مُوسَى: أَقَتَلْتَ نَفْساً زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ لَقَدْ جِئْتَ شَيْئاً نُكْراً؟ قَالَ: أَلَمْ أَقُلْ لَكَ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْراً، قَالَ: وَهَذِهِ أَشَدُّ مِنَ الْأُولَى، قَالَ إِنْ سَأَلْتُكَ عَنْ شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلَا تُصَاحِبْنِي قَدْ بَلَغْتَ مِنْ لَدُنِّي عُذْراً.

فَانْطَلَقَا حَتَّى إذا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا فَأَبَوْا أَنْ يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِداراً يُرِيدُ أَنْ يَنْقَضَّ فَأَقَامَهُ، قال: مَائِل، فَقَالَ الْخَضِرُ بِيَدِهِ هَكَذَا فَأَقَامَهُ، فَقَالَ مُوسَى: قَوْمٌ آتَيْنَاهُمْ فَلَمْ يُطْعِمُونَا وَلَمْ يُضَيِّفُونَا، لَوْ شِئْتَ لَاتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْراً، قَالَ: هَذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِعْ عَلَيْهِ صَبْراً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: وَدِدْنَا أَنَّ مُوسَى كَانَ صَبَرَ حَتَّى يَقُصَّ اللَّهُ عَلَيْنَا مِنْ خَبَرِهِمَا} (أخرجه البخاري: ٧٤، ومسلم: ٢٣٨٠، والترمذي: ٣١٤٩، والطبري: ٢٣٢٠٨ و ٢٣٢٠٩، فتح القدير ج٣، ص٣٦٥ و ٣٦٦).

واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر (کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین)، دەڵێ: بە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسم گوت: (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، نەوفولیکالیی، {ئەویش یەکێك بووە لە زانایانی تابیعین و واپێدەچێ لە زانایانی جوولەکە بوو بێ}، پێی وایە کە مووسای هاوەڵی (خَضِر)، جیایە لە مووسای کە هاوەڵی بەنی ئیسرائیل (گەلی جوولەکە) بوو، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس گوتی: ئەو دوژمنەی خوا بە هەڵەدا چووە، {ئەوان وشەی (كَذَبَ)یان بە مانای (أَخطَأَ)، واتە: بە هەڵەدا چووە بەکارهێناوە، ئنجا ئەو بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە و، دەڵێ} ئوبەی کوڕی کەعب بۆی باسکردین کە گوێی لە پێغەمبەری خوا بووە ﷺ دەیفەرموو: ڕۆژێك مووسا وتاریدا لە نێو گەلی بەنی ئیسرائیلدا، پرسیاری لێکرا: چ کەسێك لە هەموو کەس زاناترە؟ گوتی: من، خوا ﷻ لەسەر ئەوە سەرزەنشتی کرد، کە بۆچی زانیاریی بۆ لای ئەو نەگێڕایەوە، {مەبەستی ئەوە نەبووە بڵێ: من لە خوا زاناترم، بەڵام وەك ئەدەب و ڕێز بەرانبەر بە خوا، دەبوو گوتبای: خوای پەروەردگار و لە نێو بەندەکانیشیدا من}، خوا سروشی بۆ کرد: من بەندەیەکم هەیە لە جەمسەری دوو دەریایەکان لە تۆ زاناترە، {واتە: لەو شوێنەی کە دوو دەریاکە لێی پێك دەگەن، کە بە تەئکید بۆ مووسا عليه السلام زانراو و بووە، ئەو دوو دەریایە کوێن؟ کە وەك دوایی باسی دەکەین: دوو ڕووبارن}، مووسا عليه السلام گوتی: پەروەردگارم! ئەو بەندەیەی تۆ چۆن بدۆزمەوە؟ خوا فەرمووی: ماسییەك لەگەڵ خۆت هەڵدەگری و دەیخەیە (مەکتەلەوە) {مەکتەل شتیان تێکردوە، یانی: پرێسکە، یان:خورجێن، یان: توورەکە}، لە هەر شوێنێك ماسییەکەت ون کرد، ئەو بەندەیەی من لەوێیە، ماسییەکی هەڵگرت و خستیە نێو مەکتەلەوە {خستییە نێو ئەو توورەکەو پرێسکەیەوە پێی بوو} دوایی ڕۆیشت و، لاوەکەیشی لەگەڵیشیدا چوو {ئەو گەنجەی خزمەتی دەکرد و بەردەستی بوو، یوشەعی کوڕی نوون}، ڕۆیشتن هەتاکو گەیشتنە لای گابەردێك، {دیارە شوێنێکی زانراو بووە}، لەوێ سەرخەوێکیان شکاند {دیارە ماندوو بوون}، ماسییەکەش هەڵبزۆقی لەنێو توورەکە کە هاتە دەرێ و، کەوتەوە نێو دەریا و، بەنێو دەریاکەدا، ڕێی خۆی گرتەبەر {یان ڕێیەکی پەنهانیی گرتەبەر} خواش ﷻ ئەو ئاوەی کە ماسییەکەی پێدا ڕۆیشت، وەك نەفەقێك هێشتیەوەو، {ئاوەکە وێك نەکەوتەوە} وەك موعجیزەیەك بۆ مووسا عليه السلام و نیشانەیەکیش کە دوایی پێی بزاننەوە، ئاوەکەی بەو شێوەیە هێشتەوە، کاتێ مووسا خەبەری بۆوە، هاوەڵەکەی (واتە: ئەو گەنجە بەردەستەی لە خزمەتیدا بوو)، لەبیری چوو هەواڵی ماسییەکەی پێ بدات، {ئەگەرنا یوشەع ئاگای لێ بووە، کە ماسییەکە ڕۆیشتوە} ئیدی ئەو ڕۆژە {کە ڕەنگە کاتی نیوەڕۆ بوو بێ، سەرخەوێکیان شکاند بێ}، ئەوەی کە مابۆوە لە ڕۆژەکە و شەوەکەشی

هەر ڕۆیشتن، هەتا سبەینێ، لە سبەینێدا مووسا بە بەردەستەکەی خۆی [بە گەنجەکەی] گوت: نیوڕۆژەکەمان بۆ بێنە ئەو خواردنەی کە هەڵمانگرتوە بیخۆین، بێگومان لەم سەفەرەماندا تووشی ماندوێتیی بووین، مووسا ﷺ هەستی بە ماندووێتیی نەکرد، تاکو لەو شوێنە ڕەت بوو کە (خوا) فەرمانی پێکرد بوو، گەنجە بەردەستەکەی پێی گوت: لە یادتە ئەو کاتەی چووینە لای گابەردەکە من ماسییەکەم، لەوێ لەبیر چوو، هەر شەیتانیش لەبیری بردمەوە، کە بۆتی باسبکەم و، ماسییەکە لەوێ ڕێگەی خۆی لە دەریادا گرتەبەر، [هەڵبزۆقیە نێو دەریایەکە، دەبێ وەک موعجیزەیەک بۆ مووسا زیندوو بووبێتەوە، یاخود هەر نیوە زیندوو بووە کە خستوویانەتە نێو توورەکەکەوە] ئەو شێوە ڕۆیشتنەش بۆ ماسییەکە وەك نەفەقێکی لێهات و، بۆ مووساو گەنجەکەشی شتێکی جێی سەرسووڕمان بوو، [دوایی کە بە شوێنی خۆیاندا گەڕاونەوە، تەماشا دەکەن، ئاوەکە ئەو شوێنەی ماسییەکە پێیدا ڕۆیشتوە، وەك بەستبێ، وەك تاقێکی لێهاتوە] مووسا ﷺ گوتی: ئەوە بوو کە ئێمە لێی دەگەڕاین، بۆیە بە شوێنەواری خۆیاندا پشکنەرانە گەڕانەوە.

[لێرە سوفیان قسەیەك دەکات، سوفیانیش یەکێکە لە گێڕەرەوەکانی ئەو فەرموودەیە، ئەوە قسەی خۆیەتی، نەك فەرمایشتی پێغەمبەر بێ ﷺ کە ئەوە پێی دەگوترێ: (مُدرَج)، واتە: خستوویەتە نێو دەقەکەوە]، سوفیان گوتی: خەڵکێك پێیان وایە کە لە لای ئەو گابەردە، کانیاوی ژیان (ماء الحیاة) هەیە، ئاوەکەی بە هەر مردووێك بکەوێ، زیندوو دەبێتەوە و، ئەو ماسییەش چەند دڵۆپەیەکی ئەو سەرچاوەی پێکەوت و زیندوو بۆوە. [ئەمە قسەی سوفیانی کوڕی عویەینەیە و مەبەستیشی لە خەڵك یان (وهب بن مُنَبه) یان (كعب الأحبار)ە، بەڵام ئەوە فەرمایشتی پێغەمبەر نیە ﷺ، ئنجا دێتەوەسەر بەسەرهاتەکە].

دەڵێ: ئنجا گەڕانەوە بە شوێن پێی خۆیاندا، شوێن پێی خۆیانیان دەپشکنی [بۆ ئەوەی بزانن بە کوێدا هاتوون! بەوێدا بچنەوە] هەتا گەیشتنەوە لای گابەردەکە، تەماشایان کرد: لەوێ پیاوێك بە پۆشاکێك خۆی داپۆشیوە [خەوتووە] مووسا ﷺ سڵاوی لێکرد، (خَضِر)یش گوتی: کوا لێرە سەلام هەیە؟ [واتە: خەڵکی ئێرە سەلام لە یەکدی ناکەن، وا دیارە شوێنێك بووە کە خەڵکی نامسوڵمانی لێ بووە، یاخود سەلام مەبەست پێی ئاشتیی و سەلامەتییە] مووسا گوتی: من مووسام، گوتی: مووسای بەنی ئیسرائیل؟ گوتی: بەڵێ، هاتووم تاکو لەوەی کە خوا فێری کردووی، زانیارییەکی بە ئامانج گەیەنەرم فێر بکەی، ئەویش پێی گوت: بە دڵنیایی تۆ لەگەڵ مندا مەدار ناکەی (خۆت ڕاناگری)، ئەی مووسا! من زانیارییەکم هەیە خوا فێری کردووم، تۆ نایزانی، تۆش زانیارییەکت

هەیە، خوا فێری کردووی، من نایزانم، مووسا ﷺ گوتی: ئەگەر خوا بیەوێ دەمبینی کە خۆڕاگر دەبم و، هیچ بێ فەرمانییشت ناکەم، (سەرپێچیی لە هیچ فەرمانێکت ناکەم).

(خَضِر) پێی گوت: باشە ئەگەر شوێنم دەکەوی لە بارەی هیچ شتێکەوە، پرسیارم لێ مەکە، تاکو خۆم بۆت دەدوێم، (بۆت ڕوون دەکەمەوە).

ڕۆیشتن لەسەر کەناری دەریایەکە کەشتییەك بەلایاندا تێپەڕی، قسەیان لەگەڵدا کردن، کە هەڵیانگرن، ئەوانیش (خَضِر)یان ناسی، {دیارە شوێنی نیشتەجێ بوونی هەر ئەوێ بووە}، بەبێ کرێ هەڵیان گرتن {(نَوْل) بەو کرێیە دەگوترێ، کە دەدرێ بە بابای کەشتییوان} کاتێ کە سواری کەشتییەکە بوون، کتوپڕ (خَضِر) یەکێك لە تەختەکانی کەشتییەکەی بە تەورێك شکاند (هەڵی قەند)، {دیارە لایەکی کەشتییەکە بووە بەشێوەیەك کە وابێتە بەرچاو کەشتییەکی خراپ و تێکدراوە} مووسا ﷺ پێی گوت: کۆمەڵە خەڵکێك تێمەیان بە بێ کرێ هەڵگرتوە، کەچی تۆ کەشتییەکەیانت کون کرد، کە سەرەنجام خەڵکەکەی بخنکێن! بەڕاستیی کارێکی ناقۆڵاو خراپت کرد؟

(خَضِر) پێی گوت: ئەدی پێم نەگوتی: ناتوانی لەگەڵ مندا خۆت ڕابگری؟ مووسا ﷺ گوتی: بە هۆی شتێکەوە کە لەبیرم چوو، لێم مەگرە و، لە کاری خۆمدا زۆر بارگرانییم مەخە سەر شان، {زۆر سەغڵەتم مەکە} دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەم یەکەمجارە لە مووساوە بە هۆی لەبیر چوونەوە بوو {لە بیری چوو کە مەرجی لەگەڵدا گرتوە، کە نابێ لە هیچ شتێك لێی بپرسێ}.

دەڵێ: لەو کاتەدا چۆلەکەیەك هات لەسەر قەراغی کەشتییەکە نیشت و، دەندووکێکی لە ئاوی دەریادا، (خَضِر) پێی گوت: زانیاریی من و زانیاریی تۆ، بە ئەندازەی ئەو ئاوەیە کە ئەو چۆلەکەیە لە ئاوی دەریا هەڵیگرت و، تەنیا ئەوەندەی لە زانیاریی خوا کەم کردۆتەوە، {واتە: زانیاریی من و تۆ لە چاو زانیاریی خوا، بە ئەندازەی ئەو ئاوەیە کە بەدەندووکی ئەو چۆلەکەوە هاتوە، لە چاو ئاوی دەریا}، دوایی لە کەشتییەکە هاتنە خوار، لە کاتێکدا کە لە کەناری دەریادا دەڕۆیشتن: (خَضِر) کوڕیژگەیەکی دی لەگەڵ مێرمنداڵەکانی دیکەدا یاریی دەکرد، (خَضِر) یەکسەر سەری گرت و سەری هەڵقەند {بە دەستی خۆی کوشتی}، مووسا ﷺ پێی گوت: چۆن نەفسێکی پاك، بەبێ ئەوەی کەسێکی کوشتبێ، کوشتت؟ بەڕاستیی کارێکی زۆر خراپ و ناقۆڵات کرد، ئەویش گوێ: ئەدی پێم نەگوتی: ناتوانی خۆت لەگەڵ مندا مەرزەم بکەی {خۆت ڕابگری}؟ پێغەمبەر دەفەرموێ

ﷺ ئەوەیان لە جاری یەکەم توندتر بوو {واتە: (خَضِر) گلەیی و سەرزەنشتییەکەی بۆ مووسا توندتر بوو} ئنجا مووسا ﷺ گوتی: ئەگەر لەمەودوا لە بارەی هەر شتێکەوە، لێم پرسی، هاوەڵایەتیم مەکە، چونکە لە لای منەوە گەیشتوویە بەڵگەو پاساو کە هاوەڵایەتیم نەکەی.

دەڵێ: ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە شوێنێ، چوونە لای خەڵکی ئاوەدانییەك، داوای خواردنیان لێکردن، بەڵام ئەوان ڕازی نەبوون، نەك هەر خواردنیان پێ بدەن، بەڵکو تەنانەت فەرمووشیان بکەن {واتە: میوانداریان بکەن} بەڵام دیوارێکیان بینی، خەریکی ڕووخانێ بوو {دیوارێکی لار} ئیدی (خَضِر) بە دەستی ئاماژەیەکی بۆ کردو ڕاستی کردەوە، {لە شوێنی دیکەدا هاتوە لە گێڕراوەی دیکەدا، کە دانیشتوەو دیوارەکەی هەڵوەشاندۆتەوەو، دووبارە دروستی کردۆتەوە}[1] مووسا ﷺ بە ڕەخنە گرتنەوە گوتی: خەڵکێك کە ئێمە هاتین بۆ لایان و ئامادە نەبوون، خواردنمان بدەنێ و بمانکەنە میوانی خۆیان، تۆش ئەو دیوارەیان بۆ چاك دەکەیەوە! دەتتوانی لە بەرانبەر چاککردنەوەی دیوارەکەدا، کرێیان لێوەربگری!

(خَضِر) پێی گوت: لێرە لێك جیابوونەوەی من و تۆیە، لەمەودوا هەواڵ و سەرەنجام و حیکمەتی ئەوەی کە نەتتوانی لە بەرانبەری دا خۆت ڕابگری، پێت ڕادەگەیەنم، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {وَدِدنَا أَنَّ موسى كَانَ صَبرَ حَتَّى يَقُصَّ اللَّهُ عَلَينَا مِن خَبَرِهِمَا}، حەزمان دەکرد مووسا خۆی ڕاگرتبایە، تاکو خوا ﷻ شتی دیکەش لە هەواڵی سەرسوڕهێنەری ئەوانمان بۆ بگێڕێتەوە.

٢)- ئایا ئەو بەندە چاکە بۆچی ناوی لێنراوە (خَضِر)؟

{عَن أَبِي هُرَيرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّمَا سُمِّيَ الخَضِرَ، لأَنَّهُ جَلَسَ عَلى فَروَةٍ بَيضَاءَ، فَإِذَا هِيَ تَهتَزُّ مِن خَلفِهِ خَضرَاءَ} (أخرجه البخاري: ٣٤٠٢).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە ﷺ کە فەرموویەتی: (خَضِر) بۆیە ناوی لێنراوە (خَضِر)؟ {بە کوردیی هەر دەڵێن: خدر، کە هەر لە (خَضِر)ەوە هاتوە}، چونکە لەسەر فەروەیەکی سپی دانیشت {لە سەر کەوڵە ئاژەڵێکی سپی دانیشت}، یەکسەر کە هەڵسا، لە پشتیەوە سەوزی دەکردەوە، سەوز بوو بوو.

ئایا هەر ئەوجارە شوێنەکەی سەوز هەڵگەڕاوە، یان بەردەوام وابووەو لەسەر هەر شوێنێك دانیشتبایە، ئەو شوێنە سەوز دەبوو؟ هەردووك ئەگەری هەن و، وادیارە (خَضِر)،

---

(١) دواتر ئەو ڕیوایەتەش دێنین.

نازناوی بووە، واتە: ئەو کەسەی کە وەسف کراوە بە سەوزیی، بێگومان سەوزییش ڕەمز و هێمای پیت و پێز و بەرەکەتە، ئەگەرنا واپێدەچێ ناوێکی دیکەی هەبووبێ.

**٣)- ئەو فەرموودەیەی کە پێشتریش بە ڕیوایەتێکی دیکە هێنامان: {عَنْ أُبَيِّ بنِ كَعبٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: رَحْمَةُ اللهِ عَلَيْنَا وَعَلَى مُوسَى، لَوْ صَبَرَ لَقَصَّ اللهُ عَلَيْنَا، مِنْ خَبَرِهِ وَلَكِن قَالَ: إِنْ سَأَلْتُكَ عَن شَيْءٍ بَعدَهَا فَلاَ تُصَاحِبْنِي} (أخرجه مسلم: ٢٣٨٠، والترمذي: ٣١٤٩، النسائي في تفسيره: (٣٢٧ و ٣٢٨)، (الطبري): ٢٣٢٠٩.**

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەزەیی خوا لەسەر ئێمەو لەسەر مووساش بێ، ئەگەر خۆی ڕاگرتبایە، خوا هەواڵی سەرسوڕهێنەری زیاتری (خَضِر)ی بۆ ئێمە دەگێڕایەوە، بەڵام مووسا گوتی: ئەگەر لەمەودوا لە بارەی هەر شتێکەوە پرسیارم لێکردی، هاوەڵایەتییم مەکە.

٤)- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **{الغُلامُ الَّذِي قَتَلَ الخَضِرُ، طُبِعَ يَومَ طُبِعَ كَافِراً، وَلَو أَدرَكَ لأَرهَقَ أَبَوَيهِ طُغيَاناً وَكُفراً} (أخرجه مسلم: ٢٦٦١، وأبو داود: ٤٧٠٥ و ٤٧٠٦، والترمذي: ٣١٥٠، عَن أُبَي بنِ كَعبٍ ﷺ).**

واتە: ئەو مێرمنداڵەی کە (خَضِر) کوشتی، ئەو هەر لەسەرەتاوە لەسەر کوفر سروشتێنرا بوو، ئەگەر باڵغ بووبایە، باب و دایکیشی تووشی سەرکێشیی و کوفر دەکردن.

**٥)- {عَن أُبَيِّ بنِ كَعبٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ قَرَأَ: ﴿فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ ﴿٧٧﴾﴾ الكهف، ثُمَّ قَالَ: فَهَدَمَهُ، ثُمَّ قَعَدَ يَبنِيهِ} (آخرجه ابنُ الأَنبَارِي فِي المَصَاحِف، وابنُ المُردَوَيه.**

هەروەها ئەم بێژەیە لەو فەرموودەیەدا، کە ئیبنو عەبباس لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە هێناویەتی و بوخاریی و موسلیم هێناویانە، لەوێشدا هاتووە.

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی کە خوێندەوە: ﴿فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ ...﴾ الكهف، دوایی فەرمووی: دیوارەکەی ڕووخاند {ئەو دیوارە لارەی کە خەریک بوو بڕووخێ، ڕووخاندی} دوایی دانیشت، دووبارە دروستی کردەوە.

لێرەدا بەو شێوەیە هاتووە، بەڵام لە ڕیوایەتی دیکەدا کە پێشترهێنامان دەفەرموێ: بەدەستی ئاماژەی بۆ کردو دیوارەکە ڕاست بۆوە، وەک کەرامەتێک ئەگەر یەکێک بووبێت لە دۆستانی خوا، یاخود وەک موعجیزەیەک ئەگەر یەکێک بووبێ لە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) ئەو ڕایەش هەیە.

## دوو زانیاریی دیكە، لەبارەی مووسا و خضرەوە :

**یەكەم:** یوشەعی كوڕی نوون، یەكێكە لەو دوازدە (١٢) كەسەی كە مووسا ﷺ كاتی خۆی ناردنی تاكو زانیاریی دەربارەی سەر زەمینی كەنعان - كە لە لای حەڵەب و حەبڕوونە - چل (٤٠) ڕۆژیان پێچوو، هەروەها یەكێك بوو لەو دوو كەسەش كە بەنی ئیسرائیلیان هاندا: بچنە نێو سەر زەمینی كەنعانەوە، كە لە سوورەتی (المائدة)دا هاتوە: ﴿ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمَا ٱدْخُلُوا۟ عَلَيْهِمُ ٱلْبَابَ فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ فَإِنَّكُمْ غَٰلِبُونَ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾المائدة.

واتە: یەكێ لە دوو پیاوەكان، لەوانەی ترسی خوایان هەبوو، (نەك ترسی دوژمنانیان)، گوتیان: كت و پڕ لێیان بچنە نێو دەروازەی شارەكەوە و، ئەگەر ئێوە كت و پڕ لێیان بچنە ژوور، بەسەریاندا زاڵ دەبن و، پشتیش بە خوا ببەستن، ئەگەر بڕوادارن.

{یوشەعی كوڕی نوون} لە دەوری ساڵی (١٤٦٣)ی پێش زایین لە دایك بووە و، لە دەوری ساڵی (١٣٥٣)ی پێش زایین دا، كۆچیی دوایی كردوە، واتە: تەمەنی سەدو دە (١١٠) ساڵ بووە، (محمد الطاهر بن عاشور) خاوەنی (التحرير والتنوير)[1] ئەو زانیارییەی هێناوە.

**دووەم:** (محمد الطاهر بن عاشور) ڕایەكی جوان دێنێ، كە هەندێك لە زانایانی دیكەش گوتوویانە، دەڵێ: (**وَمَجْمَعُ الْبَحْرَيْنِ لاَ يَنْبَغِي أَنْ يُخْتَلَفَ فِي أَنَّهُ، مَكَانٌ مِنْ أَرْضِ فِلَسْطِينَ، وَالأَظْهَرُ أَنَّهُ مَصَبُّ نَهْرِ الأُرْدُنِّ فِي بُحَيْرَةِ طَبَرِيَّةَ، فَإِنَّهُ النَّهْرُ الْعَظِيمُ الَّذِي يَمُرُّ بِجَانِبِ الأَرْضِ الَّتِي نَزَلَ بِهَا مُوسَى «عَلَيْهِ السَّلامُ» وَقَوْمُهُ، وَكَانَتْ تُسَمَّى عِنْدَ الإِسْرَائِيلِيِّينَ بَحْرَ الْجَلِيلِ**)[2].

واتە: (**مَجْمَعُ الْبَحْرَيْنِ**) نابێ ڕاجیایی لەو بارەوە هەبێ، كە جەمسەری دوو دەریایەكان (شوێنی بە یەكگەیشتنی دوو دەریایەكان)، شوێنێكە لەسەر زەمینی فەڵەستین، واش زیاتر پێدەچێ: ئەو شوێنە بێ كە ڕووباری ئوردنی دەچێتە نێو، لە دەریاچەی تەبەرییە، چونكە ئەوێ ئەو ڕووبارە گەورەیە {خوا ﷻ لە قورئاندا ڕووباری گەورەشی بە (بحر) ناو بردوە} كە بە لای ئەو سەر زەمینەدا دەڕوا، كە مووساو قەومەكەی لێی بوون، كاتێ كە لە میسرەوە هاتوون، مووساو قەومەكەی لەو سەر زەمینە نیشتەجێ بوون، ئەو كاتە ئیسرائیلییەكان پێیان دەگوت: (**بَحْر الجَلِيل**) {واتە: بە دەریاچەی تەبەرییەیان دەگوت: (**بَحْر الجَلِيل**)، واتە: دەریای جەلیل}.

---

(١) ج١٥، ص٣٦٠.

(٢) ج١٥، ص٣٦٢.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ ئاوا دەست پێدەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ ﴾، هەروەها یاد بکەوە ئەی موحەممەد ﷺ! یان هەر کەسێك کە قورئان دەخوێنێ، چی یاد بکاتەوە؟ کاتێ مووسا بە بەردەستە لاوەکەی خۆی گوت:

(فَتَى) وەك چۆن بە گەنج دەگوترێ، لە ڕووی تەمەنەوە بە بەردەست و خزمەتکارو هەر کەسێك کە هاوەڵی مرۆڤەو، لەبەر دەستی دایەو، هاوکاریی دەکات و خزمەتی دەکات، بەوەش دەگوترێ، بۆیە من ئاوام لێکداوەتەوە:

بە لاوە بەردەستەکەی خۆی گوت: کە گوتراوە: یوشەعی کوڕی نوون، بووە، چی پێ گوت؟

﴿ لَآ أَبْرَحُ حَتَّىٰٓ أَبْلُغَ مَجْمَعَ ٱلْبَحْرَيْنِ أَوْ أَمْضِىَ حُقُبًا ﴾، وازناهێنم لە ڕۆیشتن، یاخود بەردەوام دەبم لەسەر ڕۆیشتن، تاکو دەگەمە جەمسەری دوو دەریایەکان، واتە: شوێنی پێکگەیشتنی دوو ئاوە زۆرەکان.

یاخود: ماوەیەکی زۆر دەڕۆم، عەزمم جەزم کردوە کە بگەمە ئەو شوێنە، یان دەبێ بگەمە ئەو شوێنە، یان زۆر بڕۆم.

ئنجا ئێمە پێشتر کە فەرمایشتەکانمان هێنا، ئێستا دەزانین بۆچی مووسا عليه السلام وایگوتوە؟ لەبەر ئەوەی خوا پێی فەرمووە و ئاگاداری کردۆتەوە کە لەوێ بەندەیەکم هەیە، لەو شوێنە، دەتوانی بیبینی کە زانیارییەکی لەلایە، تۆ لەلات نیە، کەواتە، مووسا عليه السلام بۆ بەدوای زانستدا گەڕان، عەزمی جەزم کردوە کە یان: دەبێ ماوەیەکی زۆر بڕوات، یان دەبێ بگاتە ئەو شوێنە.

﴿ فَلَمَّا بَلَغَا مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا فَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ سَرَبًا ﴾، کاتێك گەیشتنە جەمسەری نێوانیان، ماسییەکەیانیان لە بیرچوو و، ماسییەکە ڕێی خۆی لە نێو دەریادا گرتە بەر، ڕێیەکی پەنهان، یاخود سەرەو ژێر بۆوە، هەڵبزۆقیە نێو دەریاو، ئەو شوێنەش کە پێیدا ڕۆیشتوە، خوای پەروەردگار وەك موعجیزەیەك (شتێکی یاسادڕ) هێشتوویەتەوە، وەك کونێك، وەك نەفەقێك هێشتوویەتەوەو، ئاوەکەی وێك نەکەوتۆتەوە.

﴿ فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَىٰهُ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا ﴾، کاتێـك لـەو شـوێنە ڕەت بـوون، وەك پێشـتر لـە فەرموودەکـەدا هێنامـان: لـە نیزیـك ئـەو شـوێنە گابەردێـکی لێبـووە، پشـوویەکیان لـەوێ داوە سـەرخەوێکیان شـکاندوە، لـەو کاتـەدا ماسـییەکە لـەو توورەکـەو شـتەی کـە مووسـا ﷺ تێیخسـتوە و، خـواش بـۆی کـردوە بـە نیشـانە، کـە لـە هـەر شـوێنێك، ئـەو ماسـییە زینـدوو بـۆوە، یـان لـە هـەر شـوێنێك ماسـییەکە نەمـا، ئـەو بەندەیـەی مـن لـەو شـوێنەیە، بـۆی کـردوون بـە نیشـانە.

بـەڵام دیـارە یوشـەع لـە بیـری چـووە، بـە مووسـا ﷺ بڵـێ: ئـەوە لـەو شـوێنە ماسـییەکە بەرهەڵـدا بـووەو ڕۆیـی و هەڵبزۆقیـە نێـو دەریـا، ئنجـا کـە لـە بیـری چـووە، لـەوێ تێپەڕیـون و ڕۆیشـتوون، (وەك لـە فەرموودەکـەدا هاتـوە)، ئـەوەی لـەو ڕۆژە مابـۆوە، هەمـووی ڕۆیشـتن و، شـەوەکەشی هـەر ڕۆیشـتن، بەیانیـش هـەر ڕۆیشـتن، ئنجا کاتێـك لێی تێپەڕیـون و ماوەیـەکی چاك ڕۆیشـتوون، مووسـا بـە لاوە بەردەسـتەکەی خـۆی گـوت: ﴿ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا ﴾، ئـەو خواردنـەی کە داماننابوو، لـە بەیانیـی دا بیخۆیـن، بۆمـان بێنـە، بـا خواردنەکەمـان بخۆیـن، ﴿ لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبًا ﴾، بـە دڵنیایـی ئێمـە لـەم سـەفەرەماندا، تـووشی ماندوویـەتی بوویـن، ئنجا ئایا خواردنەکە هـەر ماسـییەکە بـووە، کـە بیبرژێنـن؟! واپێدەچـێ خواردنەکـە شـتێکی دیکـە بووبـێ، ڕەنگـە دوێنێـش کـە هاتـوون، لێیـان خواردبـێ، ئنجـا ئایـا نـان و پەنیـر بـووە، نـانی ڕووت بـووە، هەرچـی بـووە، بـەڵام ماسـییەکەیان پێبـووە وەك نیشـانەیەك، لە هەر شـوێنێك ماسـییەکە ون بوو نەمـا، زینـدوو بـۆوە، ئـەوە نیشـانەیە کـە ئـەو بەنـدە چاکەیـەی خـوا لەوێیە، لـە فەرمایشـتەکەدا هاتـوە، دەفەرمـوێ: هەسـتیان بـە ماندوویەتیـی و برسـیەتیی نەکـرد، تاکـو لـەو شـوێنە تێپەڕیـن، کـە لـەو شـوێنە تێپەڕیـن، ئنجـا هەسـتیان بـە ماندوویەتیـی و برسـیەتیی کـردوە.

﴿ قَالَ أَرَءَيْتَ إِذْ أَوَيْنَآ إِلَى ٱلصَّخْرَةِ ﴾، لاوە بەردەسـتەکەی پێـی گـوت: لـە یادتـە، کاتێـك پەنامـان بـردە لای گابەردەکـەو لـەوێ پشـووێکمان دا و سـەرخەوێکمان شـکاند، ﴿ فَإِنِّى نَسِيتُ ٱلْحُوتَ ﴾، مـن ماسـییەکەم لـەوێ لـە بیرچـوو، یـانی: ماسـییەکە لـەوێ ڕۆیشـت، بـەڵام مـن لەبیـرم چـوو پێـت بڵێـم ﴿ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ ﴾، تەنیـا شـەیتانیش لـە بیـری بردمـەوە، کـە بـۆی باسـکەم، واتـە: ڕۆیشـتنەکەیت بـۆ باسـکەم، کـە ڕۆیشـتۆتە نێـو دەریـا و هەڵبزۆقیـوە و زینـدوو بۆتـەوە، ﴿ وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ عَجَبًا ﴾، ڕێـی خـۆی گرتـە بـەر لـە نێـو دەریـادا، بـە شـێوەیەکی سەرسـوڕهێنەر، سەرسـوڕهێنەرییەکەی ئـەوە بـووە، کـە ئـەو شـوێنەی (ئـەو ئـاوەی) ماسـییەکە پێیداڕۆیشـتوە، وەك نەفەقێـك، تونێلێـك ماوەتـەوەو، ئاوەکـە وێـك نەکەوتۆتـەوە.

﴿ قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبۡغِ ﴾، مووسا عليه السلام گوتی: ئەوە (واتە: ئەو شوێنە)، ئەوەیە کە ئێمە لێی دەگەڕێین، بەدوایدا دەگەڕێین، ﴿ فَٱرۡتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصٗا ﴾، ئنجا بە شوێنەوارەکانی خۆیاندا پشکنەرانە گەڕانەوە، بە کوێدا هاتن، لەوێوە گەڕانەوە.

﴿ فَوَجَدَا عَبۡدٗا مِّنۡ عِبَادِنَآ ﴾، بەندەیەك لە بەندەکانی ئێمەیان بینی، ﴿ ءَاتَيۡنَٰهُ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا وَعَلَّمۡنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلۡمٗا ﴾، کە لە لایەن خۆمانەوە بەزەییەکی تایبەتمان پێدا بوو و، لە لایەن خۆمانەوە زانیارییەکی دانستەمان فێرکرد بوو، واتە: بەبێ ئەوەی خۆی هەوڵی بۆ دابێ، خوا بە تایبەت ئەو زانستەی فێر کرد بوو.

﴿ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلۡ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمۡتَ رُشۡدٗا ﴾، مووسا عليه السلام پێی گوت: ئایا دەگونجێ شوێنت بکەوم، (ڕێم دەدەی، مۆڵەتم دەدەی) لەگەڵت بم و ببمە هاوەڵت؟ تاکو بەشێك لەوەی کە فێری کراوی، زانیاریی بە ئامانج گەیەنەرم فێر بکەی؟ واتە: مەرج نیە هەرچی تۆ دەیزانی، هەموویم فێربکەی، بەڵام بەشێکم فێربکەی، کە مایەی بە ئامانج گەیشتنم و مایەی سەر ڕاستییم بێ، ﴿ قَالَ إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا ﴾، گوتی: بە دڵنیایی تۆ ناتوانی لەگەڵم دا مەدار بکەی و خۆڕاگر و دانبە خۆداگر بی.

﴿ وَكَيۡفَ تَصۡبِرُ عَلَىٰ مَا لَمۡ تُحِطۡ بِهِۦ خُبۡرٗا ﴾، ئنجا چۆن دەتوانی خۆ ڕابگری و دان بە خۆتدا بگری، لە بەرانبەر شتێك دا کە پێی شارەزانی؟ واتە: بەڕواڵەت پێچەوانەی ئەوەیە کە تۆ دەیزانی، پێچەوانەی ئەو شەریعەتەیە کە خوا بۆ تۆی ناردوە، ﴿ قَالَ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرٗا ﴾، گوتی: ئەگەر خوا بیەوێ خۆڕاگرم دەبینی، دەمبینی خۆ ڕاگر دەبم، ﴿ وَلَآ أَعۡصِي لَكَ أَمۡرٗا ﴾، سەرپێچیی، هیچ فەرمانێکی تۆ ناکەم.

﴿ قَالَ فَإِنِ ٱتَّبَعۡتَنِي فَلَا تَسۡـَٔلۡنِي عَن شَيۡءٍ حَتَّىٰٓ أُحۡدِثَ لَكَ مِنۡهُ ذِكۡرٗا ﴾، گوتی: ئنجا ئەگەر هەر لەگەڵم دێی و شوێنم دەکەوی، دەتەوێ هاوەڵایەتییم بکەی، مەرجێکم هەیە: لە بارەی هیچ شتێکەوە لێم مەپرسە، واتە: ڕەخنەم لێ مەگرە، یان پرسیارم لێ مەکە، تاکو خۆم لە بارەیەوە هەواڵت پێ دەدەم و بۆت باس دەکەم.

دیارە مووساش مەرجەکەی قبووڵ کردوە.

﴿ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا رَكِبَا فِي ٱلسَّفِينَةِ خَرَقَهَاۖ قَالَ أَخَرَقۡتَهَا لِتُغۡرِقَ أَهۡلَهَا لَقَدۡ جِئۡتَ شَيۡـًٔا إِمۡرٗا ﴾، ڕۆیشتن، هەتا کاتێك کە سواری کەشتییەك بوون، کەشتییەکەی کون کرد، هەندێ لە تەختەکانی شکاندن.

﴿ قَالَ أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا ﴾، (مووسا) گوتی: ئایا کەشتییەکەت کون کردو تێکتدا، تاکو سەرەنجام ئەو تێکدانەی تۆ، ببێتە هۆی خنکاندنی خەڵکەکەی، سوار بووەکانی؟! ﴿ لَقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا إِمْرًا ﴾، بەڕاستیی کارێکی ناقۆڵاو خراپت کرد.

﴿ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴾، (خضر) پێی گوت: ئەدی پێم نەگوتی: بە دڵنیایی تۆ ناتوانی لەگەڵ مندا خۆڕاگر بی، ناتوانی خۆت مەرزەم بکەی و پرسیار نەکەی و ڕەخنە نەگری؟ ﴿ قَالَ لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ ﴾، (مووسا) گوتی: بە هۆی لە بیرچوونەوەوە، لێم مەگرە، واتە: لێپرسینەوەم لەگەڵ دا مەکە، سەرکۆنەم مەکە، ﴿ وَلَا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا ﴾، لە حاڵ و کاری خۆشم دا، سەغڵەتییم مەخە سەر، کە نەتوانم بەردەوام بم لەگەڵت دا، زۆر سەرکۆنەو سەر زەنشتم مەکە. ﴿ فَانطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا لَقِيَا غُلَٰمًا فَقَتَلَهُۥ ﴾، دووبارە ڕۆیشتن هەتا کاتێک کە بە مێر منداڵێک {کوڕیژگەیەک، منداڵێکی نابالغ} گەیشتن، یەکسەر (خضر) کوشتی.

﴿ قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةًۢ بِغَيْرِ نَفْسٍ ﴾، (مووسا) گوتی: ئایا نەفسێکی پاکت کوشت {کە جارێ نەگەیشتۆتە سنووری ئەرك کەوتنە سەر شان، سنووری تەکلیف، تاکو گوناح بکات و لەسەری بنووسرێ، مانای وایە پاکە}.

﴿ بِغَيْرِ نَفْسٍ ﴾، بێ ئەوەش کە کەسێکی کوشتبێ، بەبێ تۆڵە، چۆن کوشتت؟ ﴿ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا نُّكْرًا ﴾، بە دڵنیایی کارێکی زۆر ناقۆڵاو خراپت کرد.

﴿ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴾، (خضر) گوتی: ئەدی بە تۆم نەگوت: کە ناتوانی لەگەڵ مندا خۆت ڕابگری و، ناتوانی دان بە خۆت دابگری؟ ﴿ قَالَ إِن سَأَلْتُكَ عَن شَيْءٍۭ بَعْدَهَا فَلَا تُصَٰحِبْنِي ﴾، (مووسا) گوتی: ئەگەر لەمەودوا لە بارەی هەر شتێکەوە پرسیارم لێکردی، هاوەڵایەتییم مەکە، ﴿ قَدْ بَلَغْتَ مِن لَّدُنِّي عُذْرًا ﴾، بەڕاستیی لە لایەن منەوە گەیشتووی بە پاساو، واتە: پۆزشت هەیە، بەڵگەو پاساوت هەیە کە چیدیکە هاوەڵایەتییم نەکەی، چونکە دەبێتە سێ جار کە مووسا ﷺ کە مەرجەکەی دەشکێنێ.

﴿ فَانطَلَقَا ﴾، دیسان ڕۆشتن، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَيَآ أَهْلَ قَرْيَةٍ ٱسْتَطْعَمَآ أَهْلَهَا ﴾، هەتا چوونە لای خەڵکی ئاوەدانییەک، داوای خواردنیان لە خەڵکەکەی کرد ﴿ فَأَبَوْاْ أَن يُضَيِّفُوهُمَا ﴾، بەڵام خەڵکەکە ئامادە نەبوون بیانکەنە میوان، واتە: ئامادە نەبوون هەر فەرمووشیان لێبکەن، چ جای خواردنیان پێ بدەن! جاری وایە کەسێك فەرمووو لە کەسێك دەکات، پشوویێك بدات، ئاوێك بخواتەوە، بەڵام پۆزشی بۆ دێنێتەوە، دەڵێ: خواردنمان نیە، یان

خواردنمـان ئامـادە نیـە، بـەڵام ئـەوان هـەر فەرمووشـیان لـێ نەکـردن، هـەر نەیانکردنـە میوانیـش، ﴿ فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ فَأَقَامَهُۥ ﴾، کەچـی دیوارێکیـان تێـدا بینـی، کـە دەیەویسـت بڕووخـێ، واتـە: لار بـوو بـۆوە، ﴿ فَأَقَامَهُۥ ﴾، یەکسـەر ئـەو بەنـدە چاکـە (خـضر) ئـەو دیـوارەی ڕاسـت کـردەوە.

ئنجـا ئایـا بـە ئامـاژەی دەسـتی ڕاسـتی کـردەوە، وەك کەرامەتێـك، یاخـود وەك لـە ڕیوایـەتی دیکـەدا هاتـوە، دانیشـت دیوارەکـەی ڕووخانـد و دووبـارە بـە شـێوەیەکی ڕاسـت و دروسـت، بەبـێ لاریـی دروسـتی کـردەوە؟! هـەردووك لای گونجـاون.

﴿ قَالَ لَوْ شِئْتَ لَتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا ﴾، (مووسـا ﷺ) پێـی گـوت: ئەگـەر ویسـتبات دەتتـوانی کرێـی لـە بەرانبـەردا داوا بکـەی، وەك لـە فەرموودەکـەدا هاتـوە گوتـی: خەڵکێـك کـە ئامـادە نەبـوون پـاروە نانێکمـان بدەنـێ و، فەرمووشـان لـێ بکـەن، چـۆن دیوارەکەیـان بـۆ ڕاسـت دەکەیـەوە بەبـێ کـرێ؟ واتـە: شایسـتەی ئـەوە نیـن، ئەگەرنـا مووسـا ﷺ بـۆ خـۆشی - وەك دوایـی بـاسی دەکەیـن - بەبـێ کـرێ و پاداشـت، هاوکاریـی خەڵـکی کـردوە، بـەڵام لێـرەدا مەبەسـتی ئـەوە بـووە: ئـەو خەڵکـە شایسـتەی ئـەوە نیـن، یـان لەبـەر ئـەوەی پێویسـتیان بـە کرێیەکـە بـووە، بـۆ ئـەوەی پـاروە نانێـکی پـێ وەدەسـت بێنـن، ژەمـە نانێـکی پـێ بخـۆن.

﴿ قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ ﴾، (بەنـدە صاڵحەکـە) پێـی گـوت: ئێـرە لێـك جیابوونـەوەی مـن و تۆیـە، ﴿ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴾، لەمـەودوا مانـا و سـەرەنجامی ئـەوەی کـە تـۆ نەتتـوانی لـە بەرانبـەری دا خـۆت ڕابگـری، هەواڵەکەیـت پـێ دەدەم، واتـە: حیکمەتەکەیـت بـۆ ڕوون دەکەمـەوە:

﴿ أَمَّا ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَٰكِينَ يَعْمَلُونَ فِى ٱلْبَحْرِ ﴾، هەرچـی کەشـتییەکە بـوو، هـی کۆمەڵێـك خەڵـکی نـەدار بـوو، لـە دەریـادا کاریـان دەکـرد، (واتـە: کرێکاریـان دەکـرد)، بـەو کەشـتییە خەڵکیـان سـوار دەکـرد و، شـتیان بـار دەکـرد، کرێیـان لـە خەڵـك وەردەگـرت، ﴿ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا ﴾، ئنجـا ویسـتم: ئـەو کەشـتییە عەیبـدار بکـەم، کـەم و کوڕیـی تێـدا پەیـدا بکـەم، لەبـەر چـی؟ ﴿ وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا ﴾، چونکـە لـە پشـتیانەوە پادشـایەك هەبـوو، هەمـوو کەشـتییەکی داگیـر دەکـرد.

لێـرەدا هەرچەنـدە نەیفەرمـووە: (كُلَّ سَفِينَةٍ جَدِيدَةٍ)، هـەر کەشـتییەکی نـوێ، یـان: (كُلَّ سَفِينَةٍ صَالِحَةٍ)، هـەر کەشـتییەکی بـاش، بـەڵام بـەوە کـە پێشـێ دەفەرمـوێ: ﴿ فَأَرَدتُّ أَنْ

أَعِيبَهَا ﴾، ویستم عەیبداری بکەم، کەواتە: پادشایەکە، کەشتی عەیبدار و کەم و کوڕیی تێدا هەبووی، نەویستوە، گوتوویەتی: کەشتیی چاك و ساغ و نوێم بۆ بێنن، ئنجا ئەگەر ئەو کەشتیەم عەیبدار نەکردبایە، ئەو نەدارانە (ئەو خەڵکە نەدارە)، کەشتیەکەیان لە دەست دەچوو، بەڵام کەشتیەکەیان بە عەیبەوە بۆ بمێنێتەوە، باشترە لەوەی لەدەستیان بچێ و، عەیبەکەشی بە ئاسانیی چاك دەبێتەوە.

﴿ وَأَمَّا ٱلْغُلَٰمُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ ﴾، بەڵام هەرچی کوڕیژگەکە (مێر منداڵەکە)ش بوو، باب و دایکی بڕوادار بوون، ﴿ فَخَشِينَآ أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا ﴾، ترساین کە سەرکێشیی کوفریان بخاتە سەرشان، وەختێ کە گەورە دەبێ: ناچاریان بکاو واداریان بکات، بەوەی لە خوا یاخیی بن و بێبڕوا دەربچن، ﴿ فَأَرَدْنَآ أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَوٰةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا ﴾، بۆیە ویستمان: پەروەردگاریان بۆیان بگۆڕێ بە یەکێکی لە ڕووی پاکییەوە: باشتر و، لە ڕووی بەزەییەوە: نیزیکتر، واتە: بە منداڵێکی باشتریان بۆ بگۆڕێ.

﴿ وَأَمَّا ٱلْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَٰمَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِى ٱلْمَدِينَةِ ﴾،هەرچی دیوارەکەش بوو، هی دوو مێر منداڵ (دوو کوڕیژگە)ی هەتیو بوو لە شارەکەدا و، خەزنەیەکیان هەبوو، لەبن دیوارەکە، ئنجا ئەگەر دیوارەکە ڕووخابایە، خەزنەکەیان دەردەکەوت، ئەوانەش دوو منداڵی نابالغی بێ دەستەڵات بوون، ئنجا خەڵکەکەش ئەو خەڵکە بێ، کە ئامادەنین پاروە نانێك بدەن بە میوانی ڕێبوار!! مانای وایە ئەوانە، لە ماڵی هەتیوانیش نافکرن! ﴿ وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحًا ﴾، ئنجا ئەوانە کاتی خۆی بابیان پیاوێکی باش بووە و ئێستا نەماوە، بۆیە فەرموویەتی: (يَتِيمَيْنِ)، یانی: بابیان نەماوە، ئنجا کە کاتی خۆی بابیان پیاوێکی باش بووە، لەبەر باشیی بابیان، خوا ڕەحمی بە دوو منداڵە نەباڵغەکەشی کردوە و ماڵەکەی بۆ پاراستوون، ﴿ فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبْلُغَآ أَشُدَّهُمَا ﴾، ئنجا پەروەردگارت ویستی بگەنە حاڵەتی تین و تاقەت و پێگەیشتن و تێگەیشتن، واتە: بچنە نێو قۆناغی پیاوەتییەوە و لە قۆناغی منداڵیی هەڵبڕن[1]، ﴿ وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا ﴾ ئەو کاتەش خەزنەکەی خۆیان دەربێنن، ماڵە پەنهان کراوەکەی خۆیان لە بن دیوارەکەدا دەربێنن و، ئنجا کە بوونە پیاو دەشتوانن بەرگریی لە ماڵەکەی خۆیان بکەن، ﴿ رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ﴾، ئەوەش بەزەییەك بوو لە لایەن پەروەردگارتەوە، بەو دوو کوڕیژگەو بەو بابە چاکەشیان، ﴿ وَمَا فَعَلْتُهُۥ عَنْ أَمْرِى ﴾،

---

(١) هەڵبڕن : تێپەڕن، ڕەتبن.

ئـەم کارەشـم کـە دیوارەکـەم ڕاسـت کـردەوە، دەشـگونجێ مەبەسـت هەمـوو هەرسـێ کارەکان بـێ، هـەر لـە خـۆوە و لـە لایـەن خۆمـەوە، نەکـردن، یـانی: لـە گوێـرە ئـەو کارەو کارەکانی دیکەشـم نەکـردوون، بەڵکـو بـە فەرمـانی خـوا کردمـن و، خـوا ﷻ دڵنیـای کـردم کـە دەبێ وابکـەم، خێـر لەوەدایـە. ﴿ذَٰلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا﴾، ئـەوەش سـەرەنجام و حیکمـەتی ئـەوە بـوو، کـە تـۆ نەتتـوانی لـە بەرانبـەری دا خـۆت مـەرزەم بکـەی و، خـۆت ڕابگری!

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**یاد بکەوە! کاتێك مووسا بە لاوەکەی خۆی گوت: لەسەر ڕۆیشتن بەردەوام دەبم، تاکو دەگەمە جەمسەری دوو دەریایەکان، یان ڕۆژگارێکی زۆر دەڕۆم، ئنجا کاتێك گەیشتنە جەمسەری نێوانیان، ماسییەکەیانیان لە بیرچوو و، بەهەڵبزۆقین خۆی سەرەوژێر کردە نێو دەریاوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ لَآ أَبْرَحُ حَتَّىٰٓ أَبْلُغَ مَجْمَعَ ٱلْبَحْرَيْنِ أَوْ أَمْضِيَ حُقُبًا ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا بَلَغَا مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا فَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ سَرَبًا ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

**١)- ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ ﴾، یاد بکەوە! کاتێ مووسا بە گەنجە بەردەستەکەی خۆی، گوت، واتە: بەو کەسەی کە لەگەڵیدابوو لەبەر دەستیدابوو و خزمەتی دەکرد. (الفَتَى: الذَّكَرُ الشَّابُ، والأُنثَى: الفَتَاة، وَاستُعمِلَ هُنَا مَجَازاً فِي الخَادِمِ وَالتَابِعِ، وَهُوَ يُوشَعُ بنُ نون مِنْ سِبطِ أَفرَايم).**

(فَتى) واتە: نێرینەی گەنج و، مێینەی گەنج پێی دەگوترێ: (فَتَاة)، بەڵام لێرەدا وشەی (فَتى) بەکارهێنراوە بە مەجاز بۆ خزمەتکار و هاوەڵ و بەردەست، کە مەبەست پێی {یوشەعی کوڕی نوون}ە، لە هۆزی ئەفرایم، چی پێگوت؟

**٢)- ﴿ لَآ أَبْرَحُ ﴾، واتە: واز ناهێنم لە ڕۆیشتن، یاخود بەردەوام دەبم لەسەر ڕۆیشتن، هەردووکیان یەك مانایان هەیە، چونکە: (بَرِحَ، يَبْرَحُ)، یانی: (زَالَ، يَزُولُ)، ڕۆیشت، لاچوو، لادەچێ، ﴿ لَآ أَبْرَحُ ﴾، واتە: (لاناچم)، واتە: لاناچم لەسەر ڕێگا بڕین، یاخود (لا أَترُكُ)، واز ناهێنم لە ڕۆیشتن (لا أَكُفُّ عَنِ السَّيرِ)، بۆچی واز ناهێنێ؟.**

**٣)- ﴿ حَتَّىٰٓ أَبْلُغَ مَجْمَعَ ٱلْبَحْرَيْنِ ﴾، هەتاکو دەگەمە جەمسەری دوو دەریایەکان، واتە: دوو ئاوە زۆرەکان، لە کوێ پێك دەگەنەوە، تاکو دەگەمە وێ. ﴿ مَجْمَعَ ٱلْبَحْرَيْنِ ﴾، (مَكَانَ**

اجتِمَاعِهِمَا)، شوێنی کۆبوونەوەیان و بەیەکگەیشتنیان، کە وەك پێشتر باسمان کرد، واپێدەچێ: (مَصَبُّ نَهرِ الأُردُن فِي بُحَيرَةُ الطَّبَرِيَّة)، ڕژێنگەی ڕووباری ئوردون بێ لە دەریاچەی تەبەرییەدا، ئەو شوێنەی کە ڕووباری ئوردون تێیدا دەگاتە نێو دەریاچەی تەبەرییە، کە کاتی خۆی بەنی ئیسرائیل پێیان گوتوە: (بَحرُ الجَلِيل).

٤)- ﴿أَوْ أَمْضِيَ حُقُبًا﴾، یاخود کاتێکی زۆر دەڕۆم، (المُضِيُّ: الذَّهَابُ وَالسَّيرُ، وَالحُقُبُ: الزَّمَنُ الطَّوِيل)، (مُضِي) بە مانای ڕۆیشتن و ڕێکردن دێ و، (حُقُب)یش، یانی: زەمانێکی درێژ، کاتێکی زۆر.

٥)- ﴿فَلَمَّا بَلَغَا مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا﴾، کاتێ گەیشتنە جەمسەری نێوانیان، واتە: شوێنی بەیەکگەیشتنی نێوانیان، (أي بَلَغَا: مَحَلاً يَجمَعُ بَيْنَ البَحْرَيْنِ، (وَبَيْنَ) اسمٌ لِمَكَانٍ مُتَوَسِّطِ شَيْئَيْنِ)، کاتێ کە گەیشتنە نێوانی دوو دەریایەکان (شوێنی لێ پێکگەیشتنیان)، وشەی (بَيْن) یش ناوە بۆ نێوەڕاستی دووشتان.

٦)- ﴿نَسِيَا حُوتَهُمَا﴾، لەوێ ماسییەکەیانیان لەبیر چوو.

٧)- ﴿فَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ سَرَبًا﴾، ماسییەکەیان لەو تووروەکەو دەفرە کە تێیدا بووە، ڕێی خۆی بە پەنهانیی لە نێو دەریادا گرتە بەر، (سَرَب) یانی: وەك تونێلێك ئەو شوێنەی کە ماسییەکەی پێدا ڕۆیی بە نێو ئاوەکەدا، وێك نەکەوتبۆوە.

یاخود: لەوێ هەڵبزۆقیە نێو دەریا و سەرەو ژێر بۆ نێو ئاوەکە، چوو، چونکە (سَرَب)، وێڕای (نفق) بە مانای (المَكَانُ المُنحَدِر)، شوێنی لێژیش و بە مانای (ڕۆیشتن بەرەو لێژیی)یش دێ.

لێرەدا لە بیرچوونەکەی پاڵداوەتە لای هەردووکیان (نسيا) هەرچەندە یوشەع لە بیری چووە، بەڵام کە پێکەوە بوون مانای وایە هەردووکیان لە بیریان چووە، ئەگەرنا لەبەر چاوی یوشەع، بووە، وەك دوایی بۆ مووسا عليه السلامی دەگێڕێتەوە، هەڵبزۆقیوەتە نێو دەریاکە، بەڵام ئەو لە بیری چووە، بۆ مووسا عليه السلامی باس بکات، ئیدی لەو شوێنە ماسییەکەیان لە دەست زایە دەبێ و فەرامۆشی دەکەن، لەحاڵێك دا کە هەر ئەویش ئامرازی هێنانەدی ئامانجەکەی مووسا عليه السلام بووە، کە دۆزینەوەی بەندە صاڵحەکەیە.

**مەسەلەی دووەم:**

**ئنجا کاتێك لێی تێپەڕین و لەو شوێنە ڕەتبوون، بەلاوە بەردەستەکەی خۆی گوت: لەم سەفەرەماندا باش ماندوو بووین، نیوڕۆژەکەمان {خواردنەکەی ڕۆژمان} بۆ بێنە، با بیخۆین! گوتی: لە یادتە! کاتێ بۆ پشوودان چووینە لای گابەردەکە؟ لەوێ ماسییەکەم لە بیرچوو و، تەنیا شەیتانیش لە بیری بردمەوە کە باسی بکەم و، بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر هەڵبزۆقیە نێو دەریا و، ڕێی خۆی گرتەبەر، (مووسا) گوتی: ئەو (شوێن)ە، ئەوە بوو کە لێی دەگەڕاین، ئیدی بە شوێن خۆیاندا پشکنەرانە گەڕانەوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَىٰهُ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبًا ﴿٦٢﴾ قَالَ أَرَءَيْتَ إِذْ أَوَيْنَآ إِلَى ٱلصَّخْرَةِ فَإِنِّى نَسِيتُ ٱلْحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ ۚ وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ عَجَبًا ﴿٦٣﴾ قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ ۚ فَٱرْتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصًا ﴿٦٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

**١)- ﴿ فَلَمَّا جَاوَزَا ﴾، یانی: (جَاوَزَا مَجمَعَ البَحْرَينِ)، کاتێك تێپەڕین، واتە: لە جەمسەری دوو دەریایەکە تێپەڕین، ئاشکرایە: ﴿ جَاوَزَا ﴾، (فِعل وفاعِل)ن و بەرکار (مَفعُول بِه)ەکەی قرتێندراوە، چونکە زانراوە، یانی: (جَاوَزَا مَجمَعَ البَحرَينِ)، یان (جَاوَزَا ذَلِكَ المَكَان)، لەو شوێنە تێپەڕین، لەوشۆێنە ڕەتبوون.**

**٢)- ﴿ قَالَ لِفَتَىٰهُ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا ﴾، بە لاوە بەردەستەکەی کە خزمەتی دەکرد، گوت: نیو ڕۆژەکەمان بێنە.**

**(الغَدَاء: طَعَامُ النَّهَارِ مُشْتَقٌّ مِنْ كَلِمَةِ (الغَدوَةِ) لأَنَّهُ يُؤْكَلُ فِي وَقتِ الغَدوَة، وَضِدُّهَا العَشَاءُ، هُوَ طَعَامُ العَشِيِّ)، (غَدَاء) بە خواردنی ڕۆژ دەگوترێ، چونکە لە وشەی (غَدوَة)وە، یانی: بەیانیی، وەرگیراوە، چونکە ئەو خواردنە لە کاتی بەیانیی دا {پێش نیوەڕۆ} دەخورێ و پێچەوانەکەشی (العَشَاء)ە، کە خواردنی ئێوارەیە، یان خواردنی شەو، کاتی خۆی عادەتیان وابووە دوو ژەمیان خواردوون: ڕۆژێ ژەمێك و، شەوێ ژەمێك.**

٣)- ﴿ لَقَدۡ لَقِینَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبࣰا ﴾، بە ڕاستیی لەم سەفەرەماندا تووشی ماندوویەتیی بووین، (نَصَب) واتە: ماندوویەتیی و شەكەتیی.

٤)- ﴿ قَالَ أَرَءَیۡتَ إِذۡ أَوَیۡنَاۤ إِلَى ٱلصَّخۡرَةِ ﴾، گوتی: لە یادتە! كاتێ كە پەنامان بردە لای گابەردەكە؟ ئەو بەردە گەورەیەی كە پشوومان لە سێبەرەكەی دا و، سەرخەوێكمان لەلا شكاند، لەوێ ماسییەكەم لەبیرچوو، یانی: لە بیرم چوو بیپارێزم و ئاگام لێبێ.

(أل)ی ﴿ ٱلصَّخۡرَةِ ﴾، بۆ ناساندن (تعریف) و مەبەست پێی: (عهد)ە، یانی: گابەردەكەی كە خۆمان دەزانین، لە یادتە؟

٥)- ﴿ فَإِنِّی نَسِیتُ ٱلۡحُوتَ ﴾، من لێی بێ ئاگا بووم و لە بیرم چوو، [بۆیە بەهەڵبزۆقین چووە نێو دەریا].

٦)- ﴿ وَمَاۤ أَنسَىٰنِیهُ إِلَّا ٱلشَّیۡطَٰنُ ﴾، ئەوەی لە بیریشی بردمەوە، بۆتی باس بكەم، تەنیا شەیتان بوو.

﴿ وَمَاۤ أَنسَىٰنِیهُ ﴾، ئەوە جۆرێك لە خوێندنەوەیەتی، هەروەها خوێندراویشەتەوە: (وَمَا أنسَانِیهِ إلاَّ الشَّیطَانُ)، هەردووكیان یەك واتایان هەیە، بێگومان ئەم لەبیرچوونەوە (نسیان) یە، جیایە لە لەبیرچوونەوەی پێشێ، هی پێشێ لە بیریان چوو یانی: (ماسییەكەیان لەبیرچوو)، فەرامۆشیان كرد، یانی: لەبیریان چوو، ئاگایان لێی بێ و بیپارێزن، بەڵام ئەمەیان لە بیرچوونەوەیە، لە بیرچوونی باسكردنە، لە بیرم چوو باسی بكەم، واتە: ئەوەی پێشێ لەبیرچوونی زەینیی و دڵییە، بەڵام ئەمەیان لە بیرچوونی زمانییە.

٧)- ﴿ أَنۡ أَذۡكُرَهُۥ ﴾، (هَذَا بَدَلُ اشْتِمَالٍ مِنْ ضَمِیرِ أَنسَانِیهِ لا مِنَ الحُوتِ) واتە: ڕاناوی (ە) سەر: ﴿ أَنۡ أَذۡكُرَهُۥ ﴾ مەبەست ماسییەكە نیە و، ڕاناوەكەی بۆ ماسییەكە ناچێتەوە، بەڵكو بۆ: ﴿ أَنسَىٰنِیهُ ﴾، دەچێتەوە، یانی: (باسكردنەكەی)م لەبیرچوو، (أي: مَا أنسَانِي أن أذكُرَهُ لَكَ إلاَّ الشَّیطَان)، هیچ شتێك لە بیری نەبردمەوە كە بۆتی باس بكەم، ماسییەكە چۆن ڕۆیی! مەگەر شەیتان.

هەڵبەتە ئەوەش هەڵهێنجانی (یوشەعی كوڕی نوون) خۆی بووە، چونكە زانیویەتی كە شەیتان لەگەڵ هەموو شتێكی خراپ دایە و، ئەوانیش ئەو زێدە ماندوو بوونەی مووساو یوشەع: كە ڕۆژەكە هەمووی ڕۆیشتوون و، بە شەوەكەشیەوە، دوایی دیسان ڕۆژی دواتریش تۆزێك ڕۆیشتوون، تاكو ماندوو و برسیی بوون، كە ئەوە هەمووی لە زیادیی بووە، بێگومان شەیتانیش هەمیشە لە زیانی مرۆڤ دەخەفتێ و پێی خۆش بووە زیاتر ماندوو بن.

٨)- ﴿ وَاتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ عَجَبًا ﴾، زۆر بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر، ڕێی خۆی لە دەریادا گرتە بەر، ﴿ عَجَبًا ﴾، (أي: أعجب لَهُ عَجَبًا، فَهُوَ مَفعُولٌ مُطْلَق)، ڕێی خۆی گرتەبەر بە شێوەیەك کە دەبێ سەرت لێی سوڕ بمێنێ، شێوە سەرسوڕهێنەرەکەش ئەوەیە، وەك لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: ئەو شوێنەی کە پێی داڕۆیشتوە، وەك تاقێك و تونێلێك، ئاوەکەی وێك نەکەوتۆتەوە، وەك بەستبێتی، بۆ ئەوەی دوایی کە مووسا ﷺ و یوشەع هاتنەوە، شوێنەکەی دیار بێ، کە بەو شوێنەدا ڕۆیشتوە.

٩)- ﴿ قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ ﴾،(مووسا) گوتی: ئا ئەمە ئەوە بوو کە لێی دەگەڕاین، ئەوە بوو کە بۆی دەگەڕاین و داوامان دەکرد.

﴿ ذَٰلِكَ ﴾، (إشارَة إلى مَا تَضَمَّنَهُ خَبَرُ الفَتَى مِن فَقدِ الحُوتِ، وَمَعنَى كَونِهِ المُبتَغى: أنَّهُ وَسِيلَةُ المبتغَى، الَّذِي هُوَ لِقَاءُ العَبدُ الصَّالِحِ فِي ذَلِكَ المَكَان)، گوتی: ئەوە ئەوە بوو کە لێی دەگەڕاین، کە ئاماژەیە بۆ هەواڵی گەنجەکە، کە ماسییەکە لە کوێ ون بووە و لە کوێ لە بیریان چووە؟! کە دەڵێ: ئەوە ئەو شتە بوو کە لێی دەگەڕاین، واتە: ئامرازی ئەو ئامانجە بوو کە بۆی دەگەڕاین، کە بریتی بوو لە بە دیدار گەیشتنی ئەو بەندە چاکە لەو شوێنە.

چونکە خوا ﷻ هەواڵی پێدابوو، کە لەو شوێنە ئەو بەندەیەی من، دەبینن.

١٠)- ﴿ فَارْتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصًا ﴾، ئیدی پشکنەرانەو سۆراغکەرانە گەڕانەوە بە شوێن پێیەکانی خۆیاندا.

(قَصَص)، بریتیە لە: (تَتَبُّعُ الأثَر)، شوێنکەوتن و پشکنینی شوێنەوار، یانی: بە شوێن پێی خۆیاندا گەڕانەوە بەرەو دوا، لە کوێوە هاتبوون، بەوێدا چوونەوە، (الإرتِدَادُ مُطَاوِعُ الرَّدِّ، كَأنَّ رَادّاً رَدَّهُمَا، وَإنَّمَا رَدَّتُهُمَا إرَادَتُهُمَا، أي رَجَعاً عَلَى آثَارِ سَيرِ هِمَا فِي طَرِيقِهِما الَّذِي أتَيَا مِنهُ)، (إرتِدَادُ) لە (ردّ)ەوە هاتوە، وەك گێڕرەوەیەك گێڕابنیەوە، هەرچەندە ئەوان بە ویستی خۆیان گەڕاونەوە، واتە: بە شوێن پێیەکانی خۆیاندا کەلێیەوە هاتبوون، گەڕانەوە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**کاتێك گەڕانەوە: بەندەیەك لە بەندەکانمانیان بینی، کە لە لایەن خۆمانەوە بەزەییەکی تایبەتمان پێ دابوو و، زانیارییەکی دانستەو تایبەتیشمان فێرکرد بوو لە لایەن خۆمانەوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَآ ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَآ ﴾، بەندەیەك لە بەندەکانی ئێمەیان لێ هەڵکەوت، بەندەیەك لە بەندەکانی ئێمەیان، لەوێ دۆزیەوە.

ئاشکرایە مەبەست پێی ئەو کەسەیە کە پێغەمبەرمان بە (خَضِر)، ناوی هێناوە، کە پاڵیشدراوەتە لای خوای بەرز، پاڵدانی ڕێزو حورمەتە، ئەگەرنا هەموو بەندەکان هەر بەندەی خوان، بەڵام ئەو بەندەیەکی تایبەتیی خوا بووە.

٢)- ﴿ ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا ﴾، لە لایەنی خۆمانەوە بەزەییەکی تایبەتمان لەگەڵ نواند بوو.

(عِندَ: ظَرفُ مَكَانٍ لِلشَيءِ الحَاضِرِ، تَقُولُ عِندِي مُصحَفٌ)، (عند) ناوی شوێنە بۆ شتێك کە لە لات ئامادەبێ، بۆ نموونە دەڵێی: موصحەفێکم لەلایە.

٣)- ﴿ وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴾، لە لایەن خۆشمانەوە، زانستێکی دانستەمان فێرکرد بوو، [لَدُن: **ظَرفٌ زَمَانِيٌّ وَمَكَانِيٌّ غَيرُ مُتَمَكِّنٍ، بِمَنزِلَةِ (عِند)، إلاَّ أَنَّهُ أَقرَبُ مَكَاناً مِن عِندَ، وَأَخَصُّ مِنهُ، فَإنَّ (عِند) تَقَعُ عَلَى المَكَانِ وَغَيرِهِ، لكن (لَدُن) لا يُستَعمَلُ إلاَّ فِي الحَاضِرِ بِخِلافِ عِندَ، وَالعِلمُ اللَّدُنِّي: عِلمٌ رَبَّانِيٌّ يَصِلُ لِصَاحِبِهِ عَن طَرِيقِ الإلهَامِ**][1].

واتە: وشەی (لَدُنْ) هەم ناوی شوێنە، هەم ناوی کاتە و (لَدُنْ) وەك (عِندَ) وایە، بەڵام ئەگەر بڵێی: (لَدَيَّ)، نزیکترە وەك بڵێی: (عِندِي) و تایبەتتریشە، چونکە (عند) بۆ شوێن و کات و، جگە لەوانیش بەکاردێ، بەڵام (لَدُنْ) تەنیا بۆ ئەو شتە کە لێت نیزیکەو، لەبەر دەستت دایە، بەکاردێ، بەڵام (عِندَ) مەرج نیە تەنیا بۆ ئەو شتە بێ، کە لە لات بێ.

---

(١) المُعجَمُ الوَسِط، ص٨٢٢.

تنجا زانیاریی (لَدُنّي)یش زانیارییەكی پەروەردگارە، كە لە ڕێی خورپەو خرانە نێو دڵەوە، دەگاتە خاوەنەكەی.

ئنجا ئایا ئەو بەندەیە كێ بووە؟ بەپێ ی فەرموودەكەی پێغەمبەر ﷺ كە لە صەحیحی بوخاریی و موسلیم دا هاتوە: (خَضِر) بووە و دەقی فەرموودەكەشمان پێشتر هێنا.

**مەسەلەی چوارەم:**

**مووسا پێی گوت: ئایا ڕێم دەدەی شوێنت بكەوم، تاكو لەو زانستەی فێری كراوی، زانیارییەكی بە ئامانج گەیەنەرم فێر بكەی؟ گوتی: بە دڵنیایی تۆ ناتوانی لەگەڵمدا مەدار بكەی و خۆت ڕابگری، ئنجا چۆن دەتوانی لەسەر شتێك خۆت مەرزەم بكەی كە پێی شارەزانی! (مووسا) گوتی: ئەگەر خوا بیەوێ خۆڕاگرم دەبینی و، سەرپێچیی هیچ فەرمانێكت ناكەم، گوتی: ئەگەر شوێنم كەوتی: لە بارەی هیچ شتێكەوە پرسیارم لێ مەكە (وەك ڕخنە گرتن)، تاكو خۆم لە بارەیەوە بۆت باس دەكەم:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلۡ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمۡتَ رُشۡدٗا ﴿٦٦﴾ قَالَ إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا ﴿٦٧﴾ وَكَيۡفَ تَصۡبِرُ عَلَىٰ مَا لَمۡ تُحِطۡ بِهِۦ خُبۡرٗا ﴿٦٨﴾ قَالَ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرٗا وَلَآ أَعۡصِي لَكَ أَمۡرٗا ﴿٦٩﴾ قَالَ فَإِنِ ٱتَّبَعۡتَنِي فَلَا تَسۡـَٔلۡنِي عَن شَيۡءٍ حَتَّىٰٓ أُحۡدِثَ لَكَ مِنۡهُ ذِكۡرٗا ﴿٧٠﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ ﴾، دوای ئەوەی مووساو بەردەستەكەی، ئەو بەندە تایبەتەی خوای پەروەردگاریان بینی، كە خوا هەم بەزەیی تایبەتی پێدا بوو، هەم زانیارییەكی دانستەی فێر كرد بوو لەلایەن خۆیەوە، مووسا ؑ وەك پێشكەش كردنی داواكاریی پێی گوت:

٢)- ﴿ هَلۡ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمۡتَ رُشۡدٗا ﴾، ئایا ڕێم دەدەی شوێنت بكەوم [هاوەڵایەتییت بكەم]، تاكو لەوەی فێری كراوی، بەشێكیم فێر بكەی لە زانیارییەكی بە ئامانج گەیەنەر؟!

﴿ رُشْدًا ﴾، خوێنراویشەتەوە (رَشَداً)، کە هەردووکیان یەك واتایان هەیە.

ئـەم تەعبیـرە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ ﴾، (أَفْعَـلُ کَـذَا عَـلَى کَـذَا)، شـەرعزانان گوتوویانـە: (مِـن صِيَـغِ الإلْتِزَامِ وَالتَّعَاقُـدِ)، ئەمـە لـە صیغـەکانی پابەندیـی و گرێبەسـت پێکـەوە کردنـە، واتـە: بـا پەیـمان پێکـەوە ببەسـتین کـە مـن شـوێنت بکـەوم، تـۆش لـەوەی کـە خـوا فێـری کـردووی، زانیارییەکـی بـە ئامانـج گەیەنـەرم فێربکـەی.

٣)- ﴿ قَالَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا ﴾، گوتی: بە دڵنیایی تۆ ناتوانی لەگەڵمدا خۆڕاگربی، لەگەڵمدا پشوو درێژ بی و خۆت مەرزەم بکەی و، مەدار بکەی.

لێـرەدا دوو ئامـرازی جەختکردنـەوە (تأکیـد) بەکارهێـنراون: ﴿ إِنَّكَ ﴾، ﴿ لَن تَسْتَطِيعَ ﴾، پیتـی (إنَّ) لەگـەڵ پیتـی: (لَـن)، (إنَّ) بـۆ جەختکردنەوەیـە و (لَن)یش هەر بـۆ جەختکردنەوەیە، یـانی: بـە دڵنیایـی تـۆ هەرگیـز ناتـوانی لەگـەڵ منـدا خۆڕاگـربی، ئەمـە ئـاگادار کردنـەوەی ئـەو بەنـدە چاکـە بـووە بـۆ مووسـا ﷺ کـە هـەر لـە سـەرەتاوە بـەر چـاوی ڕوون بـێ و، عەزمـی خـۆی جـەزم بـکات لەسـەر خۆڕاگریـی.

٤)- ﴿ وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا ﴾، واتە: ئنجا چۆن دەتوانی خۆت ڕابگری، لەسەر شتێك کە پێی شارەزا نی؟

(کَیـفَ: لِلإسـتِفهَام الإنـکَارِيِّ فِي مَعنـَى النَّفـيِ)، (کیـف) بـۆ پرسـیار کـردنی نکووڵیلێکەرانەیـەو لابـردن (نفـي) دەگەیەنـێ، یـانی: چـۆن خـۆڕا دەگـری؟ واتـە: ناتـوانی خۆڕابگـری لەسـەر شـتێك کـە پێـی شـارەزانی، واتـە: تـۆ شـتێك کـە زانیارییـت دەورەی وی نـەداوە، ناتـوانی لەسـەری خۆڕاگـر بی و خـۆت مـەرزەم بکـەی و، لـە بەرانبەریـدا ڕەخنـە نەگـری و بێدەنـگ بـێ!

٥)- ﴿ قَالَ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا ﴾، (مووسا) گوتی: ئەگەر خوا بیەوێ خۆڕاگرم دەبینی.

بێگومـان ئەمـە ماناکـەی بەهێزتـرە لـەوە کـە فەرمووبـای: (سَـأَصبِرُ)، چونکـە ئـەم تەعبیـرە ئـەوە دەگەیەنـێ کـە: تـۆ مـن خۆڕاگـر دەبینـی، نـەك هـەر خـۆڕا دەگـرم، بەڵکـو خۆڕاگـرم دەبینـی، کـە ئەمـە مانـای بەهێزتـرە لـە تەعبیـری خـۆم ڕادەگـرم، چونکـە خۆڕاگرتـن، ڕەنگـە جارێـك بـێ، دوو بـێ، بـەڵام خۆڕاگریـی، کـە بـە (إسـمِ الفَاعِـل) هێناویـەتی، مانـای خۆڕاگرتنـی تێـدا چەسـپاو و ڕیشـەدار و بـەردەوام دەگەیەنـێ.

٦)- ﴿ وَلَآ أَعْصِى لَكَ أَمْرًا ﴾، بەدڵنیایی سەرپێچیی لە هیچ فەرمانێکت ناکەم.

٧)- ﴿ قَالَ فَإِنِ اتَّبَعْتَنِي ﴾، (بەندە چاكەكە) گوتی: دەجا ئەگەر هەر سووری لەوەی شوێنم بكەوی، هەركات شوێنم كەوتی (واتە: هاوەڵایەتیت كردم).

٨)- ﴿ فَلَا تَسْأَلْنِي عَن شَيْءٍ ﴾، لە بارەی هیچ شتێكەوە لێم مەپرسە.

ئەمەش بە سێ جۆر خوێنراوەتەوە:

أ- ﴿ فَلَا تَسْأَلْنِي عَن شَيْءٍ ﴾.

ب- هەروەها خوێندراویشەتەوە: (فَلا تَسألَنِّي عَنْ شَيءٍ).

ج- دیسان خوێنراویشەتەوە: (فَلاَ تَسألِنِي عَن شَيءٍ)، واتە: بەژێر (كسرة)ی (ل)ەكەی.

كە هەموویان یەك واتایان هەیە، واتە: لە بارەی هیچ شتێكەوە لێم مەپرسە (لێپرسینی ڕەخنەگرتن)، نەك لێپرسین بەرەهایی، كە ئەوەش بەسیاق و سەلیقە دەزانرێ، بۆیە بە پێویست نەزانراوە باسبكرێ، چ جۆرە پرسیاركردنێكە؟

٩)- ﴿ حَتَّىٰ أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا ﴾، تاكو خۆم لە بارەیەوە بۆت باس دەكەم، تاكو خۆم بۆت دەدوێم، (إِحْدَاثُ الذِّكْرِ: إِنْشَاؤُهُ وَإِبْرَازُهُ)، واتە: بۆت دەدوێم و باس و خواسیت بۆ دەخەمە ڕوو.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**ئنجا مووسا و خضر بەڕێكەوتن، تاكو كاتێك سواری كەشتییەك بوون، كونی كرد، (مووسا) گوتی: بۆچی كونت كرد، كە سەرەنجام خەڵكەكەی بخنكێنی! بە دڵنیایی شتێكی خراپ و دزێوت كرد، گوتی: ئەدی نەمگوت: مسۆگەر ناتوانی لەگەڵم هەڵبكەی؟ گوتی: بە هۆی لەبیر چوونەوەوە لێم مەگرەو لەكارمدا سەغڵەتیم مەخە سەر:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا رَكِبَا فِى ٱلسَّفِينَةِ خَرَقَهَا ۖ قَالَ أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا إِمْرًا ﴿٧١﴾ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا ﴿٧٢﴾ قَالَ لَا تُؤَاخِذْنِى بِمَا نَسِيتُ وَلَا تُرْهِقْنِى مِنْ أَمْرِى عُسْرًا ﴿٧٣﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ فَٱنطَلَقَا ﴾، هەردووكیان بەخێرایی ڕۆیشتن، (الإنْطِلاقُ: الذَّهَابُ والمَشي، مُشتَقٌّ مِنَ الإِطْلاَقِ، وَهُوَ ضِدُّ التَّقييدِ)، (إطْلاَق)، واتە: بەردان، (دەست ئاوەڵاكردن)، كە (إنطِلاقُ) لەوەوە هاتوە، پێچەوانەی (تَقيِد)ە، (تَقييد)، یانی: بەستنەوە، (إطلاق)، یانی: بەردان، بەڕەڵا كردن.

٢)- ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا رَكِبَا فِى ٱلسَّفِينَةِ خَرَقَهَا ﴾، تاكو كاتێك كە سواری كەشتییەكە بوون، دڕی، كونی كرد، (حَتَّى: غَايَةٌ للإنطِلاقِ، أي: إلى أن رَكِبَا في السَّفِينَةِ)، هەتا كاتێك كە سواری كەشتییەكە بوون، یەكسەر كەشتییەكەی كون كرد، یانی: كە سوار بوون، یەكسەر دەستی كردوە بە تێكدانی ئەو كەشتییەو دڕینی و كونكردنی، بەڵام بەشێوەیەكی وا نا، كە كەشتییەكە نغرۆ بێ، بەڵكو بە شێوەیەكی وا كە نا بەرچاو و عەیبدار بێ و تەماعی تێنەكرێ.

پسپۆڕانی زمان گوتوویانە:

أ- (التَعريفُ فِي السَّفِينَةِ، تَعرِيفُ العَهدِ الذِّهنِي)، كە دەفەرموێ: ﴿ رَكِبَا فِى ٱلسَّفِينَةِ ﴾، یانی: كەشتییەكە، ناساندنەكە بۆ شتێكی زانراوی زەینییە.

ب- (إِذَا)، لە: (حتى إذا ركبا في السفينة) (ظَرفٌ لِلزَّمَانِ المَاضِي أي: فَبِمُجَرَّدُ رُكُوبِهِما خرَقَهَا) (إذا)، بۆ كاتی ڕابردوویە، یانی: كاتێك كە سواری كەشتییەكە بوون، یەكسەر كەشتییەكەی كون كرد.

٣)- ﴿ قَالَ أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا ﴾، گوتی: ئایا کەشتییەکەت کون کرد، تاکو خەڵکەکەی بخنکێنی؟ کەشتیی ئەگەر بێت و ئاوی بچێتە نێو، ئەوانەی کە سواریی بوون دەخنکێن، دیارە ئەویش لە شوێنێکەوە کونی کردوە، کە ئاوی بچێتە نێو، بەڵام خەڵکەکەی - یاخود مووسا ﷺ بە پێی ڕیوایەتێك - چاکیان کردۆتەوە، یان دەبێ کون کردنەکەی وانەبووبێ کە ئاوی بێتە نێوو خەڵکەکە بخنکێ، بەڵام مووسا ﷺ وای هاتۆتە بەر چاو، هەموو ئەگەرەکان هەن.

هەروەهـا ئەمـە خوێنراویشـەتەوە: (لِيُغـرَقَ أهلُهـا)، بـۆ ئـەوەی خەڵکەکـەی بخنکێـن، ڕسـتەی: ﴿ لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا ﴾، (لتُغـرِق) (فعـل وفاعِـل) و (أهلهـا) (مفعـول بـه) دەبـن، بـەڵام (لِيُغـرَقَ أهلُهـا)، (أهلهـا) دەبێتـە (نائـب الفاعـل).

٤)- ﴿ لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا إِمْرًا ﴾، بە ڕاستیی کارێکی خراپ و ناقۆڵات کرد.

٥)- ﴿ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴾، گوتی: ئەدی پێم نەگوتی: ناتوانی لەگەڵ مندا خۆت ڕابگری، واتە: ناتوانی لە هاوەڵایەتیی مندا خۆڕاگر بی، نەك لابردن (نفي)ی خۆڕاگریی (صبر) لە مووسا ﷺ بکات، بە ڕەهایی! نا، یانی: لە هاوەڵایەتیی و لە ڕەفاقەتی مندا، ناتوانی خۆڕاگر بی.

٦)- ﴿ قَالَ لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ ﴾، گوتی: بە هۆی لە بیرچونەوەوە لێم مەگرە، لە سەرمی حیساب مەکە.

لـە ئەنجامـی ئـەوەدا کـە مووسـا شـتێکی ناشـەرعیی بینیـوە، بەپێـی ئـەو شـەریعەتەی خـوا کـە فێـری مووسـا ﷺ ی کـردوە، ڕەفتارەکـەی لەگـەڵ ڕواڵـەتی شـەرع دا تێککیـراوە، بۆیـە خۆی ڕانەگرتـوەو مەرجەکـەی لەبیرچۆتـەوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ ﴾، وەك لـە فەرمایشـتەکەی پێغەمبەریشـدا ﷺ هاتـوە کـە فەرموویـەتی: یەکەمیـان بەهـۆی لـە بیرچوونـەوەوە بـوو، لـە لایـەن مووسـاوە.

(المُؤاخَـذَةُ: مُفَاعَلَـةٌ مِـنَ الأَخـذِ)، (مؤاخـذة) لەسـەرکێشی (مفاعلة)یـەو لـە (أخـذ)ەوە هاتـوە بـەڵام: (هِـيَ هُنَـا للمُبَالَغَـةِ، لأنَّهَـا مِـنَ جَانِـبِ واحِـد)، بـەڵام لێـرەدا بـۆ زێدەڕۆیـی کردنـە، چونکـە تەنیـا لـە تەرەفێکەوەیـە، لـە حاڵێـك دا کـە (مفاعلـة) بـۆ بەشـداریی لایەنێـك زیاتـرە.

٧)- ﴿ وَلَا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا ﴾، لە کار و حاڵی خۆمدا، قورسایی و زەحمەتم مەخە سەر شان.

(عُسر)، بریتیە لە قورسیی و سەختیی و، پێچەوانەی (یُسْر)ە، واتە: ئاسانیی.

(الإرْهَاق: تَعدِيَةُ رَهِقَ، إذَا غَشِيَ وَلَحِقَ)، ﴿وَلَا تُرۡهِقۡنِي﴾، واتە: قورسیی و زەحمەتیی و سەغڵەتکردنێکم مەخەسەر لە حاڵ و کاری خۆمدا، کە بۆم دەرنەبردرێ.

کە دەفەرموێ: ﴿رَكِبَا فِي ٱلسَّفِينَةِ﴾، (ضُمِّنَ الرُّكُوبَ، مَعنَى الدُّخُولِ)، (رَكِبَ السَّفِينَةَ) سواری کەشتییەکە بوون، بەڵام: ﴿رَكِبَا فِي ٱلسَّفِينَةِ﴾، مادام ﴿رَكِبَا﴾، بە (فِي)، بەرکاری خواستوە، وێڕای سواربوون، مانای چوونە نێویش دەگەیەنێ، چونکە کەشتی حاڵەتی وایە، وەك ژوورێکە دەچیە نێوی، سواری دەبی، بەڵام دەچیە نێویشی، ئنجا بەهۆی پیتی (فِي) یەوە ﴿رَكِبَا فِي ٱلسَّفِينَةِ﴾ ئەو مانایەشی هەڵگرتوە، ئەگەرنا (رکب) بۆ خۆی بەرکار دەخوازێ و پێویستیی بە پیت (حرف) نیە بۆ بەکار خواستن، بەڵام ئەوکاتە: (رکبا السفینة)ە {سواری کەشتییەکە بوون} دەگەیەنێ و، مانای چوونە ژووری ناگەیەنێ!

**مەسەلەی شەشەم:**

**دیسان ڕۆیشتن، هەتا کاتێك گەیشتنە کوڕیژگەیەك، یەکسەر (خضر) کوشتی، (مووسا) گوتی: ئایا کەسێکی پاکت کوشت، بێ ئەوەی کەسی کوشتبێ؟ بە ڕاستیی کەتنێکی زلت کرد (پیاوە چاکەکە) گوتی: ئەدی بە تۆم نەگوت: بە دڵنیایی ناتوانی لە هاوەڵایەتیی کردنمدا خۆڕاگریی بکەی! (مووسا) گوتی: ئەگەر دوای ئەوە لە بارەی هەر شتێکەوە لێم پرسی و ڕەخنەم لێگرتی، هاوەڵایەتییم مەکە، چونکە بۆ هاوڕێیەتیی نەکردنم، بەڵگەو پاساوت هەیە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَانطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا لَقِيَا غُلَٰمًا فَقَتَلَهُۥ قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةًۢ بِغَيْرِ نَفْسٍ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا نُّكْرًا ﴿٧٤﴾ ۞ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا ﴿٧٥﴾ قَالَ إِن سَأَلْتُكَ عَن شَىْءٍۭ بَعْدَهَا فَلَا تُصَٰحِبْنِى قَدْ بَلَغْتَ مِن لَّدُنِّى عُذْرًا ﴿٧٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ فَانطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا لَقِيَا غُلَٰمًا فَقَتَلَهُۥ ﴾، ئنجا ڕۆیشتن هەتا کاتێك گەیشتنە کوڕیژگەیەك (منداڵێکی نابالغ)، یەکسەر پیاوە چاکەکە، ئەوی کوشت.

٢)- ﴿ قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةًۢ بِغَيْرِ نَفْسٍ ﴾، (مووسا) گوتی: ئایا کەسێکی پاکت کوشت، بێ ئەوەی کەسی کوشتبێ؟ (زَكِيَّةً: طَاهِرَةً مِنْ مُوجِبَاتِ القَتْلِ، لأنَّهَا لَمْ تَقْتُلْ نَفْساً)، واتە: پاکە لە پاساوەکانی کوژران، چونکە کەسی نەکوشتوە.

٣)- ﴿ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا نُّكْرًا ﴾، بە ڕاستیی شتێکی زۆر خراپ، کەتنێکی گەورەت کرد.

(نُكْراً أي: مُنكَراً، وَالأَمْرُ الصَّعْبُ الَّذِي لا يُعرَف)، (نُّكْرًا): کارێکی نامۆ و حاڵێکی سەخت و قورس کە نەناسراو بێ، یانی: عەقڵ و زەکماك پێی ئاشنانەبن.

٤)- ﴿ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا ﴾، (پیاوە چاکەکە) گوتی: ئایا پێم نەگوتی: ناتوانی لەگەڵ مندا خۆڕاگریی بکەیە پیشە؟ ناتوانی خۆت مەرزەم بکەی؟ لێرەدا وشەی (لَّكَ)ی بۆ زیاد کردوە، ﴿ أَلَمْ أَقُل لَّكَ ﴾، واتە: گلەیی و سەرزەنشتەکەی خەستتر کردۆتەوە، چونکە کاتێ خۆی ئامۆژگارییەکەی وەرنەگرت، کە پێی گوت: تۆ خۆت ڕاناگری و ناتوانی خۆت مەرزەم بکەی، پاشان ئەوە بۆ جاری دووەمیش مەرجەکەی شکاند.

٥)- ﴿ قَالَ إِن سَأَلْتُكَ عَن شَيْءٍ بَعْدَهَا ﴾، (مووسا) گوتی: ئەگەر لەمەودوا، {دوای ئەم جاری دووەمە} لە بارەی شتێکەوە پرسیارم لێکردی و ڕەخنەم لێگرتی:

٦)- ﴿ فَلَا تُصَاحِبْنِي ﴾، هاوەڵایەتییم مەکە.

٧)- ﴿ قَدْ بَلَغْتَ مِن لَّدُنِّي عُذْرًا ﴾، یانی: (وَجَدْتَ مِن جِهَتِي عُذْراً)، تۆ لە لای منەوە پۆزشت هەیە، بەڵگەو پاساوت هەیە، کە هاوەڵایەتییم نەکەی، چونکە جار لە دوای جار، پۆزشم بۆ تۆ هێنایەوە و تۆش پۆزشەکەت قبووڵ کردم، ئنجا کە بوو بە سێ، تازە تۆ بەڵگەت بەدەستەوەیە، بۆ ئەوەی لەمەودوا هاوەڵایەتییم نەکەی.

**مەسەلەی حەوتەم:**

**دیسان ڕۆیشتن، هەتا کاتێك چوونە لای خەڵکی ئاوەدانییەك، داوای خواردنیان لە خەڵکەکەی کرد، بەڵام لاملییان کرد، کە میوانداریان بکەن، کەچی دیوارێکیان لەوێدا دی، خەریکی ڕووخان بوو، (پیاوە چاکەکە) ڕاستی کردەوە، (مووسا) گوتی: دەتتوانی کرێی لەسەر وەربگری! گوتی: ئەوە لێکترازانی نێوان من و تۆیە، بەڵام هەواڵی (حیکمەت و ئەنجامی) ئەو شتانەت پێ دەدەم کە نەتتوانی لە بەرانبەریاندا دان بە خۆتدا بگری و خۆت ڕابگری:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَانطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَيَآ أَهْلَ قَرْيَةٍ ٱسْتَطْعَمَآ أَهْلَهَا فَأَبَوْاْ أَن يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ فَأَقَامَهُۥ ۖ قَالَ لَوْ شِئْتَ لَتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا ﴿٧٧﴾ قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِى وَبَيْنِكَ ۚ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴿٧٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ فَانطَلَقَا ﴾، دووبارە ڕۆیشتن، دەستیان کردەوە بە ڕێکردن و ڕۆیشتن.

٢)- ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَيَآ أَهْلَ قَرْيَةٍ ٱسْتَطْعَمَآ أَهْلَهَا ﴾، تاکو کاتێ چوونە لای خەڵکی ئاوەدانییەك، ئەم (إِذَآ)یە، بۆ کت وپڕیی (مفاجأة)یە، یانی: کە چوونە نێوی، یەکسەر داوای خواردنیان لە خەڵکەکە کرد، ﴿ ٱسْتَطْعَمَآ أَهْلَهَا ﴾، (الإِسْتِطْعَامُ: طَلَبُ الطَّعَام)، داوای خواردن کردنە، یانی: داوایان کردوە کە پاروە نانێکیان بدەنێ، ڕێبوارن.

٣)- ﴿ فَأَبَوْاْ أَن يُضَيِّفُوهُمَا ﴾، کەچی خەڵکەکە لاملییان کرد، بیانکەنە میوان و، میوانداریان بکەن، دەگوترێ: (ضَيَّفَهُ وَأَضَافَهُ، فَهُوَ مُضَيِّفٌ وَمُضِيفٌ، وَالمُقَابِلُ: ضَائِفٌ وَمُتَضَيِّفٌ)، (ضَيَّفَهُ وَأَضَافَهُ)، واتە: کردیە میوان، (فَهُوَ مُضَيِّفٌ وَمُضِيف)، ئەو خانە خوێ و خاوەن میوانە، بەڵام میوان پێی دەگوترێ: (ضَائِفٌ وَمُتَضَيِّف)، کەواتە: خەڵکەکە ئامادە نەبوون نەك هەر خواردنیان پێ بدەن، بەڵکو فەرمووشیان لێ بکەن و، بیانکەنە میوانیش!

٤)- ﴿ فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ فَأَقَامَهُۥ ﴾، دیوارێکیان تێدا بینی، دەیویست بڕووخێ.

هەڵبەتە دیوار، ویستی نیە تاکو بیەوێ بڕووخێ، یان نا! بەڵام یانی: دیوارەکە لاربوو بوو و خەریکی ڕووخانێ بوو، لێرەدا خوای بەرز و زانا دیوارەکەی وەك کائینێکی خاوەن

ئیرادەو عەقڵ و هەست، وێنا کردوە کە بیەوێت بڕووخێ، واتە: خەریك دەبوو بڕووخێ، مەیلی کردبوو خوار بوو بۆوە، ﴿ فَأَقَامَهُۥ ﴾، بەڵام ئەو دیوارەکەی ڕاست کردەوە، یانی: بەندە صاڵحەکە، ئنجا کە دیوارەکەی ڕاست کردۆتەوە، دوو ڕیوایەت هاتوون:

**یەکێکیان** دەڵێ: بە ئاماژەی دەستی، ئاماژەی بۆ کردوە و ڕاست بۆتەوە، وەك کەرامەتێك.

**دووەمیان** دەڵێ: دانیشتوە و ڕووخاندوویەتی، چونکە لار بووە، دوایی دووبارە دیوارەکەی بنیات ناوەتەوە.

٥- ﴿ قَالَ لَوْ شِئْتَ لَتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا ﴾، [مووسا دووبارە ڕەخنەی لێ گرت و وەك ڕەخنە لێ گرتن] پێی گوت: دەتتوانی ئەگەر ویستبات، کرێت لە بەرانبەردا وەرگرتبایە، ﴿ لَتَّخَذْتَ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (لَتَخَذْتَ)، واتە: بەبێ گیرە (شدة).

لێرەدا لۆمەکردنەکەی پرسیار بووە لە هۆکاری ئەوە کە بۆچی مەرجی لەگەڵ نەگرتوون، دیوارەکەیان بۆ ڕاست بکاتەوە، لە حاڵێکدا کە پێویستیی بە کرێیەکەی هەیە؟! ئەگەرنا گلەییەکە لەسەر خودی دیوار ڕاستکردنەوەکە نەبووە، بە بەلاش، چونکە ئەوە کاری خێرە و، مووساش ﷺ ڕەوشتی لەوە بەرزتر بووە، کە لەسەر کاری خێر لۆمەی ئەو بەندە چاکە بکات، کە بۆ خۆشی کاتی خۆی کاری خێری کردوە، وەك لە سوورەتی (القصص)دا هاتوە: ﴿ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِ قَالَ مَا خَطْبُكُمَا قَالَتَا لَا نَسْقِى حَتَّىٰ يُصْدِرَ ٱلرِّعَآءُ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ ﴿٢٣﴾ فَسَقَىٰ لَهُمَا ...﴿٢٤﴾ ﴾، باسی دوو ئافرەتەکەیە، کە ئاژەڵەکەیان بۆ ئاو دەدات بە بەلاش، بەڵام مەبەستی ئەوە بووە: ئەو خەڵکە شایستەی ئەوە نین، تۆ بە خۆڕایی و بەلاش، ئەو دیوارەیان بۆ چاك بکەیەوە، لە کاتێك دا کە ئامادە نەبوون پاروە نانێکمان بدەنێ و، دیارە خۆشیان پێویستییان بە کرێیەکەی (کرێی ئەو دیوار چاککردنەوەیە) هەبووە: ژەمە نانێکی پێ دابین بکەن.

٦)- ﴿ قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِى وَبَيْنِكَ ﴾، گوتی: ئا ئەوە، ئێرە (ئەم حاڵە) لێك جیابوونەوەی من و تۆیە (واتە: لێرە گرێبەستی هاوەڵایەتیی نێوانمان، کۆتایی هات)، سێ جاران مەرجەکەت شکاند.

٧)- ﴿ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴾، هەواڵت پێ دەدەم بە سەرەنجام و حیکمەتی ئەوەی کە نەتتوانی لە بەرانبەریدا خۆت مەرزەم کەی و خۆت ڕابگری، چونکە پێشتر گوتی: ﴿ حَتَّىٰٓ أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا ﴾، پرسیارم لێ مەکە، تاکو خۆم لە بارەیەوە بۆت باس دەکەم، ئنجا ئەوە لێرەدا بەڵێنەکەی خۆی دێنێتە دی، گوتی: ئەوە سەرەنجام و حیکمەتی ئەوەیە کە تۆ نەتتوانی لە بەرانبەریدا خۆت ڕابگری، کە تێکدانی کەشتییەکەیەو، کوشتنی مێرد منداڵەکەیەو، چاککردنەوەی دیوارەکەیە، بەبێ کرێ، ئێستا پێت دەڵێم: حیکمەتەکەی چی بوو، سەرەنجامەکەی چۆن بوو؟

**مەسەلەی هەشتەم:**

**هەرچی کەشتییەکەیە، هی چەند نەدارێك بوو، کە لە دەریادا کاریان دەکرد، ئنجا ویستم عەیبداری بکەم، چونکە لە پشتیانەوە پادشایەك هەبوو، هەر کەشتییەکی چاك و بەرچاوی زەوت دەکرد، هەرچی کوڕیژگەکەش بوو، باب و دایکێکی بڕواداری هەبوون، ترساین: سەرکێشیی و کوفریان بە مل دا بێنێ، ئنجا ویستمان پەروەردگاریان بۆیان بگۆڕێ بە کوڕێکی (منداڵێك)ی چاکتر و بە بەزەییتر، هەرچی دیوارەکەشە، هی دوو کوڕیژگەی هەتیوو بوو لە شارەکەدا و، لە ژێری دا خەزنەیەکیان هەبوو، بابیشیان کاتی خۆی مرۆڤی چاك بوو، پەروەردگاریشت ویستی بگەنە حاڵەتی پێگەیشتن و هێز و، خەزنەکەیان دەربێنن، ئەوەش بەزەییەك بوو لە پەروەردگارتەوە، ئەوەم لە خۆمەوە نەکرد، ئەوەش حیکمەت و سەرەنجامی ئەوە بوو، کە خۆت لە بەرانبەردا ڕانەگرت:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَمَّا ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَٰكِينَ يَعْمَلُونَ فِى ٱلْبَحْرِ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا ﴿٧٩﴾ وَأَمَّا ٱلْغُلَٰمُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَآ أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا ﴿٨٠﴾ فَأَرَدْنَآ أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَوٰةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا ﴿٨١﴾ وَأَمَّا ٱلْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَٰمَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِى ٱلْمَدِينَةِ وَكَانَ تَحْتَهُۥ كَنزٌ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحًا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبْلُغَآ أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۚ وَمَا فَعَلْتُهُۥ عَنْ أَمْرِى ۚ ذَٰلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴿٨٢﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:**

١)- ﴿ أَمَّا ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَٰكِينَ يَعْمَلُونَ فِى ٱلْبَحْرِ ﴾، واتە: هەرچی کەشتییەکە بوو، ئەو کەشتییەی کە بەندە صاڵحەکە کونی کرد و هەندێکی لێ خراپ کرد، هی چەند نەدارێك بوو، کە لە دەریادا کاریان دەکرد، واتە: هی چەند کەسێك بوو، ماڵ و سامانێکی وایان نەبوو، بە هۆی کارکردنەوە لە دەریادا بژێوێکیان پەیدا دەکرد و، خۆیان پێ دەژیاند.

﴿ يَعْمَلُونَ فِى ٱلْبَحْرِ ﴾، (أي: هُم عَمَلَةٌ يُؤاجِرُونَ سَفِينَتَهُم للعَمَلِ أو الصَّيدِ)، ئەوانە چەند کرێکارێك بوون ئەو کەشتییەیان هەبووە، کەشتییەکەی خۆیانیان بەکرێداوە، بۆ شت

لێ بارکردن خەڵك سوارکردن و گواستنەوە، یاخود بۆ ڕاوکردن، کەواتە: کەسانێکی ئاوا شایستەترن بەوەی ئاگات لە ماڵ و سامانیان بێت، چونکە هەر ئەوەیان هەیە پێی بژین و، وەك بابایەکی دەوڵەمەند نین کە پەکی پێ نەکەوێ، چەندان کەشتیی هەبن، یان لانی کەم جگە لەوە، کەشتییەکی دیکەی هەبێ، ئەوان بەس ئەو کەشتییەیان هەبووە، بەکاریان هێناوە بۆ پەیداکردنی بژێوێك بۆ خۆیان و ماڵ و منداڵیان.

٢)- ﴿ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا ﴾، ویستم عەیبداری بکەم، کەم و کوڕیی تێدا پەیدابکەم.

﴿ فَأَرَدتُّ ﴾ یانی: بە ئەنقەست ویستم وای لێ بکەم، ﴿ أَنْ أَعِيبَهَا ﴾ واتە: عەیبدارکردن و کەم و کوڕیی تێدا پەیداکردنی کەشتییەکەم، مەبەست بوو، بۆچی؟! حیکمەتی تێدایە و دوایی دێ:

٣)- ﴿ وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا ﴾، چونکە لە پشتیانەوە پادشایەك هەبوو، هەموو کەشتییەکی داگیر دەکرد (زەوتی دەکرد)، تێمە بە هۆی ڕستەی پێشەوە، کە دەڵێ: ﴿ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا ﴾، ویستم عەیبداریی بکەم، کەم و کوڕیی تێدا پەیدا بکەم، لێرە دەزانین کە: ﴿ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ ﴾، مەبەستی هەموو کەشتییەك نیە بە چاك و خراپەوە، بەڵکو یانی: هەموو کەشتییەکی چاك! (**كُلُّ سَفِيْنَة صَالِحَة، أو جَدِيدَة**)، هەر کەشتییەکی باش، هەر کەشتییەکی تازە و بەرچلو، بۆچی؟! چونکە دەڵێ: من کەشتییەکەم عەیبدارکرد، کەم و کوڕییم تێدا پەیداکرد، بۆ ئەوەی سەلامەت بێت لەو پادشایەی هەموو کەشتییەکی چاك و بەرچاوی زەوت دەکرد، ئنجا ئەگەر ئەوپادشایە کەشتی چاك و خراپی زەوت کردبان، عەیبدار کردنی کەشتییەکە، بێ سوود دەبوو!

وشەی: (وَرَآءَهُم)، لە: ﴿ وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٌ ﴾ دا، توێژەرەوانی قورئان زۆر مشت و مڕیان لەو بارەوە کردوە کە، ئەوانە مادام ڕووە و پێش ڕۆیشتبن، دەبووایە گوتبای: (**أمَامَهُم**) لە پێشیانەوە، بۆچی دەڵێ: (وَرَآءَهُم)؟! هەندێکیان گوتوویانە: وشەی (**وراء**)، هەم بە مانای (**خَلف**)دێ، هەم بە مانای (**أمَام و قُدَّام**)یش دێ، واتە: لەو وشانەیە کە دوو واتا دەگەیەنێ، وەك (عَسْعَس) هەم بە مانای هات (**أقبَل**) دێ، هەم بە مانای: ڕۆیشت (**أدْبَر**)، ﴿ وَالَّيْلِ إِذَا عَسْعَسَ ﴿١٧﴾ ﴾التكوير، (**أي: أقبَل أو أدْبَر**) شەوگار کە دێ، یان دەڕوات.

بەڵام من پێم وایە پێویست بەوە ناکات:

أ- چونکە: ﴿ وَكَانَ وَرَآءَهُم ﴾ لە پشتیانەوە، کەسێك بەکەسێك، دەڵێ: لە پشتەوە دوژمن هەیە، واتە: مەترسییەکت بۆ دێ، چونکە دوژمن ئەگەر لە پێشتەوە بێت، دەیبینی، بەڵام لە پشتەوە، تەعبیرە لەوەی کە تۆ نایبینیی، واتە: لە نەخافڵ بەسەرت دادەدا.

ب- دەشتوانین بڵێین: لەسەری چوونیان دا، پادشایەکە بەرچاوی نەکەوتوە، یاخود بەر پەلی نەکەوتوە و، لەسەری گەڕانەوەیان دا کە دەکاتە پشتەوەیان، چونکە ئەولایەی کە لێوەی هاتوون لە پشتیانەوەیە.

کەواتـە: پێویسـت نـاکات بڵێیـن: (خَلْـف) بـە مانـای پێشـەوەش دێ و، بـە مانـای پشـتیش دێ، چونکـە لـە زمـانی عەرەبیـی دا چەنـد وشـەیەکی کـەم هـەن، بـەو شـێوەیە بـن، ئنجـا پشـت (خَلْـف) هەیـە و، پێـش (أمـام) هەیـە و، بـەردەم (قُدّام) هەیـە، هـەر کامیـان واتـای تایبـەتی خـۆی هەیـە.

(الغصْـبُ: أخْـذُ الـشَّيءِ ظُلْـماً) (غَصْـب) بریتیـە لـە دەسـت بەسـەر داگرتنـی شـتێك بـە سـتەم، بـە کوردیـی: (زەوتکـردن)، بـە نسـبەت کەشـتییەکەوە، ئـەوە حیکمـەتی تێکـدان و کونکردنەکـەی بـوو.

٤)- ﴿ وَأَمَّا ٱلۡغُلَٰمُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤۡمِنَيۡنِ ﴾، هەرچی کوڕیژگەکەشە، باب و دایکی بڕوادار بوون.

٥)- ﴿ فَخَشِينَآ أَن يُرۡهِقَهُمَا طُغۡيَٰنٗا وَكُفۡرٗا ﴾، ترساین: سەرکێشیی و کوفریان بە مل دا بێنێ، (أرْهَقَه) واتە: (حَمَّلَهُ إيَّاه) خستیە سەر شانی، بە ملی دا هێنا، چونکە (رَهِقَ)، یانی: (عَلا، صَعِد) بەرز بۆوە، سەرکەوت، پێهەڵچوو (أرهَقَه)ش، یانی: بە ملیان دابێنێ و بەسەریان دا بێنێ و، ناچاریان بکات بۆ سەرکێشیی و کوفر.

﴿ فَخَشِينَآ ﴾ ترسـاین، لێـرەدا مەبەسـت پێـی: گریمانـە بـۆ دانـان چاوەڕوانیـی کـردن (توقُّـع)ە، بـەڵام بێگومـان ئـەو لەوبـارەوە دڵنیـا بـووە، ئەگەرنـا هـەر بـە گومـان و گریمانـە، ناچێ کەسێك بکـوژێ! بەڵکـو دیـارە خـوا ﷻ دڵنیـای کردۆتـەوە، کـە ئەگـەر ئـەو مێـر منداڵە بمێنـێ، ئـەو بـاب و دایکـەی کافـر دەکات و خـۆشی کافـر دەبـێ.

ئنجـا بـۆ ئـەوەی: خـۆشی نەگاتـە ئـەو قۆناغـەی کوفـری لەسـەر حیسـاب بکـرێ و، بـاب و دایکیـشی تـووشی کوفـر نـەکات، وەك جێـدار (بـدل)ی ئەویـش خـوا ﷻ منداڵێـکی باشـتریان بەقسـمەت بـکات، بۆیـە خـوا ﷻ مۆڵـەتی داوە لـە بەینـی بـەرێ، چونکـە بـە لەبەرچاوگرتنـی بەرژەوەندیـی ڕاسـتەقینەی ئاینـدە، بـۆ کوڕەکـەش و بـاب و دایکیـشی، وابـاش بـووە.

٦)- ﴿ فَأَرَدۡنَآ أَن يُبۡدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيۡرٗا مِّنۡهُ زَكَوٰةٗ وَأَقۡرَبَ رُحۡمٗا ﴾، ویستمان کە پەروەردگاریان بەمنداڵێکی لەو پاکتر و چاکترو بە بەزەییتر، بۆ یان بگۆڕێ.

﴿ وَأَقْرَبَ رُحْمًا ﴾، ئەوەی پێیان دەدات، لەمە نزیكتر بێت لە بەزەییەوە، یان لە باب و دایكییەوە نزیكتر بێت لە ڕووی بەزەییەوە.

(الرُّحْم: الرَّحْمَةُ وَهِيَ الرِقَّة وَالتعَطُّف)، (رحم) بریتیە لە دڵ نەرمیی و سۆز و پەرۆش، (يُبْدِلَهُما) خوێنراویشەتەوە: (فَأَرَدْنَا أَنْ يُبَدِّلَهُمَا) كە هەردووكیان یەك واتایان هەیە، واتە: خوا بۆیان بگۆڕێ، ئەو منداڵە لابەرێ و، یەكێ دیكەیان بۆ بێنێ، كە لە ڕووی پاكیی و چاكییەوە، باشتر بێ و، لە ڕووی ڕەحم و بەزەییشەوە نیزیكتر بێ.

دەمێنێتەوە (دیوارەكە)، بۆچی ئەو دیوارەی ڕاست كردەوە؟!

٧- ﴿ وَأَمَّا الْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَامَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِي الْمَدِينَةِ ﴾، هەرچی دیوارەكەشە: هی دوو كوڕیژگەی هەتیو بوو لە شارەكەدا، دوو كوڕی نەباڵغ، كە بابیان نەماوە و، لەو شارەش دان، كە ئامادە نەبوون دوو ڕێبوار بەخێر بێنن و فەرموویان لێ بكەن و، خواردنیان پێ بدەن! یانی: خەڵكێكی باش نەبوون، مانای وایە ماڵی هەتیویش دەخۆن، بە زۆرییش وایە: كەسێك چاكەیەكت تێدابینی، بزانە چاكەی دیكەی هەن و، خراپەشت تێدا بینی، بزانە خراپەی دیكەشی هەن، خەڵكی ئەو شارە، چونكە ئاوا لەگەڵ میوان دا مامەڵەیانكردوە، دیارە لەگەڵ ماڵی هەتیویش دا، هەر بەو شێوەیە مامەڵە دەكەن، واتە: لە خواردنی لە ماڵی هەتیویش نەفكریون!

٨- ﴿ وَكَانَ أَبُوهُمَا صَالِحًا ﴾، ئنجا بابیشیان كاتی خۆی پیاوێكی چاك بووە، خوا پەرست بووە، چاكەكار بووە.

وەك عەرەب دەڵێن: (وَمِنْ أجلِ عينٍ، ألفُ عينٍ تكْرَم) لەبەر چاوێك ڕێز لە هەزار چاو دەگیرێ، كوردەواریی خۆشمان دەڵێن: لە پەنای گوڵەگەنمێكدا، سەد گوڵە جۆش ئاوێ دەخۆنەوە، خوا ﷻ بە هۆی ئەوەوە كە ئەو بابەیان پیاوی باش و خواپەرست و چاكەكار بووە، خواپەرست و خەڵك دۆست بووە، ئاگاداریی كوڕەكانیشی بۆ كردوە، مشووری لێ خواردوون.

كەواتە: چاكیی باب و دایك، دەبێتە هۆی ئەوە كە منداڵەكانیان لەو چاكییەیان بەهرەمەندبن، هەروەك بە پێچەوانەشەوە: خراپیی باب و دایك، دەبێتە هۆی ئەوەی، منداڵەكانیشیان لێیان زەرەرمەندبن، هەر نەبێ چاو لە ڕەفتار و ئاكاری خراپیان دەكەن، هەر نەبێ ناو و سومعە و ناوبانگی بەدیان، دەبێتە هۆی ناشیرینكردنی ئەوانیش (منداڵەكان)، كەواتە: مرۆڤ دەبێ لە خۆی وریا بێ، چاكەكەی بەس بۆ خۆی نیە و، خراپەكەشی تەنیا بۆ خۆی نیە.

٩)- ﴿ فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبْلُغَآ أَشُدَّهُمَا ﴾، پەروەردگارت ویستی ئەوانە بگەنە حاڵەتی تین و تاقەتی خۆیان.

(أَشُدَّ) یانی: حاڵەتی تین و تاقەت، یان حاڵەتی تێگەیشتن و پێگەیشتن.

١٠)- ﴿ وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا ﴾، دوایی خەزنەکەیان دەربێنن، ئەو ماڵەی لە ژێر دیوارەکەدا شاردراوەتەوە، دەریبێنن، وەختێ دەگەنە حاڵەتی تین و تاقەت و، بەرگرییان بۆ لە خۆیان و ماڵ و سامانەکەیان دەکرێ، بەڵام منداڵی هەتیوی بێ پەڕ و باڵ و نابالغ، نە بەرگرییان بۆ لە خۆیان دەکرێ، نە لە ماڵ و سامانەکەشیان.

١١)- ﴿ رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ﴾، ئەوەشم ئەنجامدا، بە هۆی بەزەییەك لە پەروەردگارتەوە، یاخود ئەو مشوورخۆرییە کە خوا ﷻ بۆ ئەو دوو منداڵە نابالغەی کرد، بە هۆی چاکیی بابیانەوە، ئەوە بەزەییەك بوو لە پەروەردگارتەوە، بەرانبەر بە بابیان و بە خۆشیان.

١٢)- ﴿ وَمَا فَعَلْتُهُۥ عَنْ أَمْرِي ﴾، ئەوەی کردیشم لە لایەن خۆمەوە نەمکرد، بەڵکو بە فەرمانی خوا کردم.

پێشێ گوتی: ﴿ فَأَرَادَ رَبُّكَ ﴾ پەروەردگارت ویستی.

دواتر گوتی: ﴿ فَأَرَدْنَآ أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا ﴾ ویستمان کە پەروەردگاریان بۆیان بگۆڕێ، ویستی خۆی لەگەڵ ویستی خوادا ﷻ پێکەوە باس دەکات.

ڕستەی: ﴿ وَمَا فَعَلْتُهُۥ عَنْ أَمْرِي ﴾، دەگونجێ بۆ هەر سێکیان بچێتەوە و، دەشگونجێ تەنیا بۆهی سێیەم بچێتەوە، بەڵام وا ڕاسترە کە بۆ هەرسێکیان بچێتەوە، کەواتە: ئەو سێ کارەی کە تۆ ڕەخنەت لێگرتن و، خۆت پێ مەرزەم نەکرا کە لەبەرانبەریان دا بێ دەنگ بی، هیچیانم لە خۆمەوە و بە هەوای نەفس نەکردوون، بەڵکو بە فەرمانی خوا، کە لە ڕێی ئیلهام و خستنە دڵەوە، خوا ﷻ ئاگاداری کردووم و، کردوومن.

ئەوە بەپێی ڕای ئەوانە کە دەڵێن: ئەو بەندە چاکە (خضر) یەکێك بووە لە دۆستانی خوا (أولیاء الله).

هەندێکیشیان کە دەڵێن: پێغەمبەر بووە، یانی: خوای پەروەردگار وەحیی بۆ ناردوە.

١٣)- ﴿ ذَٰلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴾، ئەوەش حیکمەت و سەرەنجامی ئەوە کە تۆ نەتتوانی خۆت لە بەرانبەریدا ڕابگری، یان خۆت لەسەری ڕابگری و، خۆت مەرزەم بکەی.

وشەی (تَأْوِيلُ) بە مانای سەرەنجامی شت دێ، بەڵام بە مانای: لێكدانەوەش دێ و بە مانای حیكمەتیش دێ و، بە مانای ئامانجیش، دێ.

جێی سەرنج ئەوەیە: كە ئەوەی پێشتیان فەرمووی: ﴿سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا﴾ واتە: هەواڵت پێ دەدەم بە سەرەنجامی (حیكمەتی) ئەوەی كە نەتتوانی لە بەرانبەری خۆت ڕابگری، لەوێ فەرموویەتی: ﴿تَسْتَطِع﴾، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ﴿مَا لَمْ تَسْطِع﴾! چونكە ﴿تَسْتَطِع﴾ دیارە مادام پیتەكانی زیاترن: قورسترە، دیارە بەرلەوەی مرۆڤ حیكمەتی شتێكی بۆ دەربكەوێ، خۆڕاگریی لە بەرانبەریدا و، بێ دەنگیی لە بەرانبەریدا، قورسترە، بۆیە ﴿تَسْتَطِع﴾ی هێناوە، بەڵام دوای ڕوونكردنەوەی حیكمەتەكەی، بێگومان ئاسانە، ئینسان خۆڕابگرێ، بۆیە فەرموویەتی: ﴿مَا لَمْ تَسْطِع﴾ واتە: پیتێكی لێ كەمكردۆتەوە، كە لەسەر زمان ئاسانتر دێ، چونكە دوای ئەوە كە ئینسان لە حیكمەت و نهێنیی شتێك تێدەگات، بێگومان خۆڕاگریی و خۆ مەرزەم كردن لە بەرانبەریدا و، ڕەخنە لێ نەگرتنی، ئاسانتر دەبێ.

# دەرس و پەندو حوكمە شەرعییەكانی بەسەرهاتی مووسا و (خَضِر)

بەڕێـزان! سـەرجەم پەنجـا و دوو (٥٢) حیكمـەت و دەرس و پەنـدم هێنـاون، كـە هەندێكیـان حوكمـی شـەرعیین، ئەویـش لـە كۆمەڵێـك لـە تەفسـیرەكان بەهـرەم وەرگرتـوە، بـە تایبـەت تەفسیری: (تیسیر الكریـم الرحمـن فـي تفسـیر الكلام المنـان)ی (عبدالرحمـن بـن نـاصر السـعدي)[1]، هەروەهـا (محاسـن تأویـل)ی (جـمال الدیـن القاسـمي)[2] هەندێكیشـیان بـۆ خـۆم هەڵمهێنجـاون:

١)- دەبێ مرۆڤ بە زانیاریی خۆی سەرسام نەبێ، چونكە: وەك لە فەرموودەكەی صەحیحی بوخاریی و موسلیم دا، هێنامان، كاتێ مووسا ﷺ پرسیاری لێ دەكرێ: كێ لە هەموو كەس زاناترە؟ دەڵێ: من!

ئـا ئـەوە جۆرێـك بـووە لـە سەرسـام بـوون بـە زانیاریـی خـۆی، بۆیـەش خـوا ﷻ فەرموویـەتی: بەندەیەكـم هەیـە كـە لـە تـۆ زاناتـرە، زانیارییـەكی لەلایـە كـە تـۆ لـەلات نیـە، مووسـا ﷺیـش داوا دەكات ئـەو بەندەیـەی خـۆی پێشـان بـدات، ئەویـش دەفەرمـوێ: بـڕۆ لـەو شـوێنەی كـە دوو ئـاوە زۆرەكان (دەریایـەكان)، تێیـدا پێكدەگـەن، جەمسـەری ئـەو دوو دەریایـە، لـەوێ ئـەو بەنـدە چاكـەم دەبینـی، نیشـانەش ئەوەیـە، كـە تـۆ ماسـییەك لەگـەڵ خـۆت بـەرە و ... هتـد، وەك لـە بەسـەرهاتەكەدا باسـمانكرد، كەواتـە: یەكـەم دەرس و پەنـد، ئەوەیـە كـە ئینسـان بـە زانیاریـی خـۆی سەرسـام نەبـێ.

٢)- زانست پایەی زۆر بەرزەو، بە دوای زانستدا گەڕان، كارێكی زۆر گەورە و گرنگە، ئەوەتا مووسا ﷺ لەگەڵ ئەو گەنجە بەردەستەی كە لە خزمەتی دابووە (یوشەعی كوڕی نوون)، نان و توێشووی سەفەر دەپێچنەوە و دەڕۆن، دەڵێ: هەرچەند ماوەیەكی زۆر بڕۆم، یان دەبێ بگەمە جەمسەری دوو دەریایەكان، یان دەبێ ماوەیەكی زۆر بڕۆم، بە مەبەستی ئەوەی ئەو بەندە چاكەی خوای لێ هەڵكەوێ و زانیاریی لێوە فێربێ!

---

(١) ص ٤٨٣ - ٤٨٥.

(٢) ج٧ ص ٦٨ - ٦٩.

٣)- وەدەستهێنانی زانست، لە فێرکردنی گرنگترە و، کۆکردنەوەی هەردووکیشیان باشترە، بێگومان مووسا ﷺ زانیاریی هەبووە و، خوای پەروەردگار لە شەریعەتی خۆی دا شارەزای کردوە، بەڵکو لە سەردەمی خۆی دا، لە هەموو بەندەکانی خوا شارەزاتر بووە، لە ئایین و بەرنامەی خوادا، بەڵام دانەنیشتوە بڵێ: با لە نێو بەنی ئیسرائیلدا دابنیشم، فێریان بکەم، کە پێویستیشیان پێی بووە، بەردەوام لەگەڵیان بێت، بەڵکو نان و توێشووی دەست داوەتێ، بۆ ئەوەی بچێ زانیاریی دیکە کۆبکاتەوە، هەڵبەتە ئەگەر ئینسان، هەم زانیاریی کۆبکاتەوە و، هەم خەڵك فێری زانیاریی بکات، باشترە، کە هەموو پێغەمبەرانیش هەر وابوون، لە ڕیزی پێشەوەشیان مووسا ﷺ.

کەواتە: ئینسان نابێ بەوەندە زانیارییەی کە هەیەتی، قەناعەت بکات، بەڵکو دەبێ هەوڵبدات، هەمیشە لێی زیاد بکات، وەك خوای زانا وشارەزاش بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا ﴿١١٤﴾ ﴾طه، واتە: بڵێ: پەروەردگار زانیاریم بۆ زیاد بکە، خوا کە وای بە پێغەمبەر ﷺ فەرمووە، هەر چەندە لە سوورەتی (طه)دا، ئەو فەرمانەی پێکردوە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ تا کۆتایی تەمەنیشی، بێگومان ئەو فەرمانەی خوای جێبەجێ کردوەو، هەمیشە لە پەروەردگاری پاڕاوەتەوە: زانیاریی بۆ زیاد بکات.

٤)- دروستە مرۆڤ هاوکار و بەردەستێکی هەبێ، لە سەفەر و لە کاتی نیشتەجێ بوونیشی دا، کە هاوکاری بێ، هەندێك لە کارەکانی بۆ ئاسان بکات، بۆیەش مووسا ﷺ ئەو گەنجەی لەگەڵ خۆی بردوە، کە مەرجیش نیە گەنجیش بووبێ، چونکە وشەی (فتى) بە مانای خزمەتکار و هاوکار و بەردەستیش بەکاردێ، با تەمەنیشی هەبێ، هەروەك پێغەمبەر ﷺ کە کاتێ خۆی کۆیلە هەبوون، فەرموویەتی: یەکێك لە ئێوە با نەڵێ: (عَبْدِي وَأَمَتِي)، با بڵێ: (فتايَ وفتاتي)[1] با نەڵێ: کۆیلەکەم و کەنیزەکەکەم، بەڵکو با بڵێ: کوڕە گەنجەکەم و، کچە گەنجەکەم.

٥)- وا باشە بابای ڕێبوار، ئامانجی خۆی لە سەفەرەکەی، بۆ هاوەڵەکەی بخاتە ڕوو، ئەگەر ڕێگرێك نەبێ، واتە: مادام ڕێگرێك نەبێ وا باشە، بۆی ڕوونبکاتەوە، تاکو ئەو هاوکارەشی بەرچاوی ڕوون بێ و، عەزم و ئیرادەی خۆی باشتر بخاتە گەڕ، بە بەڵگەی قسەی مووسا ﷺ: ﴿ وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ لَآ أَبۡرَحُ حَتَّىٰٓ أَبۡلُغَ مَجۡمَعَ ٱلۡبَحۡرَيۡنِ أَوۡ أَمۡضِيَ حُقُبٗا ﴾الكهف، واتە: یادبکەوە! کاتێك مووسا بە بەردەستە گەنجەکەی خۆی گوت: وازناهێنم لە ڕێکردن و ڕۆیشتن، تاکو دەگەمە جەمسەری دوو دەریایەکە، یاخود ماوەیەکی زۆر دەڕۆم.

---

(١) (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: لاَ يَقُلْ أَحَدُكُمْ أَطْعِمْ رَبَّكَ، وَضِّئْ رَبَّكَ، اسْقِ رَبَّكَ وَلْيَقُلْ سَيِّدِي، مَوْلاَيَ وَلاَ يَقُلْ أَحَدُكُمْ عَبْدِي، أَمَتِي، وَلْيَقُلْ فَتَايَ وَفَتَاتِي وَغُلاَمِي) أخرجه البخاري في: ٤٩ كتاب العتق: ١٧ باب كراهية التطاول على الرقيق.

بەڵێ بۆ ئەوەی هاوەڵی سەفەریشت عەزمی خۆی جەزم بكات و، بزانێ كە ماوەیەكی زۆر دەڕۆی، لە قەدەر وی، خۆی ئامادە دەكات، هەم لە ڕووی ماددیی و، هەم لە ڕووی مەعنەوییەوە.

٦)- توێشوو هەڵگرتن، پێچەوانەی پشت بەستن بە خوا نیە، هەروەها ڕەچاوكردنی هۆكارەكان و دابینكردنی ئامرازان، پێچەوانەی پشت بە خوا بەستن نیە، ئەوەتا: مووسا ﷺ لەگەڵ یوشەع دا خواردنیان پێ بووە، ﴿ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا ﴾، یانی: خواردنەكەی نیو ڕۆژمان بۆ بێنە، با بیخۆین، كەواتە: دیارە توێشوو و خواردنیان پێ بووە.

٧)- هەرچەندە هەموو شت بە قەدەرو نەخشە و ئەندازەگیریی خوایە، بەڵام پێویستە هەمیشە خراپە پاڵ بدرێتە لای شەیتان، چونكە بێگومان شەیتان بۆ مرۆڤ لە بۆسەدایە: تووشی خراپە و هەڵە و كەم و كوڕیی بكات، هەر بۆیەش ئەو بەردەستەی مووسا ﷺ (یوشەعی كوڕی نوون) دوای ئەوەی ماسییەكە دەچێتەوە نێو دەریاو، هەڵدەبزۆقێتە نێو ئاو و، ئەویش لە بیری دەچێ بە مووسا ﷺ بڵێ: ماسییەكەمان چۆتەوە نێو دەریا! دوایی دەڵێ: ﴿ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ ﴾، واتە: تەنیا شەیتان لە بیری بردمەوە، باسی بكەم، ئەوەی پاڵداوەتە لای شەیتان، كە لە بیری چووە بۆ مووسا ﷺی باس بكات، كە ئەگەر لە بیری نەچووبایە و بۆ مووسا ﷺی باس بكردایە، ئەو ڕێیە زیادەی كە بڕیویانە، لە دوای گابەردەكە، كە پشوویان لەبن داوە و، جەمسەری دوو دەریایەكە بووە، هەموویان لە كۆڵ دەبۆوە، هەمیشە شەیتان لە كەمین دایە، بۆ ئەوەی مرۆڤ تووشی زەحمەت و ناڕەحەتیی و زیان بكات.

٨)- هەواڵدانی مرۆڤ لەو شتانەی سروشتیین، وەك برسیەتیی و ماندوویەتیی، شتێكی ڕەوایە، مووسا ﷺ دەڵێ: ﴿ لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبًا ﴾ واتە: بەڕاستیی لەم سەفەرەماندا ماندووبووین، ئەگەر ئینسان ماندوو بێ، ئەگەر سەری بئێشێ، ئەگەر برسیی بێ، ئەگەر تینووی بێ، باسكردنی، شتێكی ئاساییە، بەڵكو مووسا ﷺ دەڵێ: ﴿ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبًا ﴾ واتە: خواردنەكەی پێشنیوەڕۆمان بێنە بابیخۆین، بەڕاستیی لەم سەفەرەماندا ماندوو بووین، لێرەدا مووسا ﷺ هەم باسی برسیەتیی كردوە، چونكە كە دەڵێ: خواردنەكەمان بۆ بێنە، دیارە برسیی بووە، هەم باسی ماندوویەتییشی كردوە.

٩)- وا باشە هاوەڵ و هاوكاری مرۆڤ، ژیر و هۆشیار بێ، نەك هەر بار بێ، واتە: ئینسان كەسێك بكات بە هاوەڵی خۆی، ئەگەر بۆ سەفەرێك چوو، ئەگەر بۆ كارێك چوو، كەسێك لەگەڵ خۆی بەرێ و لەگەڵ خۆی دا بیكاتە هاوكار و دەستبارگر و بەردەستی، كە ژیر و هۆشیار بێ، نەك هەر بەسەریەوە ئەرك و بار بێ.

١٠)- وا باشە مرۆڤ لەگەڵ هاوكار و بەردەستەكەی دا پێكەوە نان بخۆن و، خۆی جیا نەكاتەوە لەو كەسەی كە لەگەڵی دا هاوكارە و بەردەستیەتی و پێكەوەن، بەڵكو بەیەكەوە نان بخۆن، كە هەر ئەوە شتێكی مەنتیقییە و، هەر ئەوە شتێكە لەگەڵ سروشتی ساغدا بگونجێ، نەك لەبەرئەوەی، ئەو لەبەر دەستیەتی و هاوكارییەتی، ئەم شتێك بخوات و ئەو شتێكی دیكە بخوات.

١١)- هاوكاریی و یارمەتیی خوا بۆ بەندە، بە ئەندازەی هەڵسانیەتی بە ئەركی سەرشانی، چونكە مووسا و بەردەستەكەی، پاش لە بیرچوونی ماسییەكەیان و ڕەت بوونیان، ئنجا هەستیان بە ماندوویەتیی كردوە، وەك لە فەرموودەكەش دا ئاماژەی پێكراوە، واتە: تاكو بەرەو ئەو شوێنە چوون، كە ئەركەكەیان جێبەجێ بكەن، كە بریتی بووە لە گەیشتن بەو زانایە، بۆ ئەوەی مووسا ﷺ زانیاریی لێوە فێربێت، هەتا ئەوێ هەستیان بە برسییەتیی و ماندوویەتیی نەكردوە، بەڵام كە لەوێ ڕەت بوون، ئنجا هەستیان بە برسییەتیی و ماندوویەتیی كردوە، چونكە تاكو ئەوێ، چوون بۆ ئەنجامدانی ئەركێكی شەرعیی، بەڵام لەوێ بەولاوە، لە ئامانجەكەیان دووركەوتوونەتەوە، كەواتە: بە ئەندازەی ئەوەی كە مرۆڤ ڕوو لە خوایە، خوای پەروەردگاریش ڕووی تێدەكات و، بە ئەندازەی ئەوە كە دەیەوێ ئامانجێكی شەرعیی بێنێـە دی، خوای بەخشەریش یاوەر و هاوكاری دەبێ.

١٢)- ئەو بەندە چاكەی كە تووشی بوون، پێغەمبەر نەبووە، چونكە خوا ﷻ هەر بە (عَبۡدٗا) باسی كردوە.

پاشان باسی ڕەحمەت و عیلمی، بۆی كردوە، نەك باسی پێغەمبەرایەتیی و ڕەوانەكراوێتیی (النبوّة والرّسالة)، دەفەرموێ: ﴿ عَبۡدٗا مِّنۡ عِبَادِنَآ ءَاتَيۡنَٰهُ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا وَعَلَّمۡنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلۡمٗا ﴾، واتە: بەندەیەك لە بەندەكانمان (بەندەیەكی دانستە لە بەندەكانمان) لە لای خۆمانەوە بەزەییمان پێدابوو و، بە شێوەی تایبەت زانیارییمان لە لایەن خۆمانەوە فێر كرد بوو.

ئنجا ئەگەر پلەی پێغەمبەرایەتیی و پلەی ڕەوانەكراوێتیی هەبووایە، خوا ﷻ دەیفەرموو: (نبیاً من أنبیائنا) یاخود (عبداً من عِبادنا آتیناه النبوّة أو الرّسالة)، بەڵام مادام دەفەرموێ: بەزەیی خۆمامان پێ بەخشیبوو، بەزەیی خواش تەنیا پێغەمبەرایەتیی نیە، هەروەها كە دەفەرموێ: لەلای خۆمانەوە زانیاریی تایبەتمان پێ دابوو، زانیاریی تایبەتیش تەنیا بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) نەدراوە، بەڵكو دۆستانی خواش (وەك دواتر باسی دەكەین)، دەگونجێ زانیاریی تایبەتییان پێ بدرێ، لە ڕێی ئیلهام و خستنە نێو

دڵەوە، یاخود لە ڕێی بینینی خەونەوە، دیارە ئێمە دواتریش هەر باسی خضر دەکەین و، ئەو ڕایەمان لەلا بەهێزترە، کە یەکێك بووە لە دۆستانی خوا، نەك پێغەمبەران.

١٣)- زانیاریی دوو جۆرە، هەر یەك جۆر نیە: ١- زانیارییەکی بەدەستهێنراو (علم كسْبيٌ)، ٢- زانیارییەکی بەخشراو (علم وهبيٌ)، بە بەڵگەی ئەوە کە مووسا ﷺ دەچێ زانیارییەك بەدەست بێنێ، چونکە دواتر دەڵێ: ﴿ هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴾ ئایا شوێنت بکەوم، بۆ ئەوەی لەو زانیارییەی کە فێرت کراوە، بەشێکی سەرڕاستکەری فێری من بکەی؟ ئنجا ئەمە زانیاریی بەدەستهێنراو و (کسبي)ی پێدەڵێن، بەڵام ئەوەی ئەو بەندە چاکەیە (خضر) زانیارییەکی بەخشراو (وهبي) بووە، چونکە خوا ﷻ زۆر بە ڕوونیی دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴾ واتە: لەلایەن خۆمانەوە زانیارییەکی تایبەتمان پێدابوو، بەبێ ئەوەی کە بچێ بۆ لای هیچ کەس بخوێنێ و، گوێ بگرێ و فێرببێ، خوا یەکسەر ئەو زانیارییەی خستۆتە عەقڵ و دڵیەوە.

١٤)- زانیاریی تایبەت (العلم اللّدُنّي)، ئەو زانیارییەی کە خوا بە تایبەت دەیبەخشێ، لە بەندایەتیی کردن بۆ خوا و، خۆساغکردنەوە بۆ خواوە، هەڵدەقوڵێ، واتە: ئینسان بە هۆی بەندایەتیی بۆ خوا و خۆساغ کردنەوە بۆ خوا و، بە هۆی فەرمانبەرییە وە بۆ خوا، دەگونجێ خوا ﷻ هەر کەسە لە قەدەر خۆی، لە زانیاریی تایبەتیی پێ بدات، چونکە دەفەرموێ: ﴿ عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَآ ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴾، کەواتە: بە هۆی بەندایەتیی بۆ خواوە، شایستەی ئەوە بووە کە: خوا زانیاریی تایبەتیی پێ ببەخشێ.

١٥)- پێویستە قوتابی لەگەڵ مامۆستادا زۆر بە ئەدەب و بەڕێزو حورمەت بێت، تەماشا دەکەین مووسا ﷺ چەندە بە ئەدەب و بەڕێزەوە (خضر) دەدوێنێ، دەڵێ: ﴿ هَلْ أَتَّبِعُكَ ﴾ ئایا شوێنت بکەوم؟ یانی: ئایا مۆڵەتم دەدەی لە خزمەتتدا بم؟ مۆڵەتم دەدەی هاوەڵایەتییت بکەم؟ ﴿ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴾، بۆ ئەوەی لەوەی فێری کراوی، بەشێکی فێری من بکەی؟ لێرەدا مووسا ﷺ زانیاریی ئەو بەندە چاکە، بە زۆر دادەنێ، بەڵام ئەوەی خۆی لێی فێردەبێ، بەکەم، دەڵێ: بەشێکیم پێ بدە، ﴿ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴾، واتە: لەو هەموو زانیارییەی کە تۆ فێری بووی، بەشێکی کە مایەی بە ئامانج گەیشتنی منە، فێری منی بکەی!

١٦)- فێربوونی کەسێك کە پلەی بەرزترە، لە کەسێك کە پلەی نزمترە، شتێکی ڕەوایە، فێربوونی (فاضل) لە (مفضول) یان (أفضل) لە (مفضول)، کەسێ، با پێگە و پلەشی بەرزتربێ لە لای خوا، یان لە ڕووی کۆمەڵایەتی و سیاسیی، یان شەرعییەوە، بۆی هەیە لە کەسێکی دیکەوە، کە لە خوار خۆیەتی، چ بە ئیعتیباری لای خوا، چ بە ئیعتیباری دنیا، زانیاریی لێوە فێربێ، ئەوەتا مووسا ﷺ

یەكێكە لە پێنج پێغەمبەرە مەزنەكان، كە خوای پەروەردگار پێكەوە باسیكردوون، هەم لە سوورەتی (الشورى)دا، هەم لە سوورەتی (الأحزاب)دا، كە هەندێك لە زانایان دەڵێن: پێغەمبەرانی (أولوا العزم): ﴿ فَٱصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ ﴿٣٥﴾ ﴾الأحقاف، دەڵێن: نازناوی (أولوا العزم) هەر بۆ ئەو پێنجەیە، بەڵام من ئەوەم پێ هەڵەیە، وەك لە مەوسووعە[1] عەرەبییەكەی خۆم، لەو كتێبەدا كە باسی پێغەمبەرانم كردوە، ڕوونم كردۆتەوە كە ئەوڕایە ڕاست نیە، بەڵكو هەموو پێغەمبەران خاوەن (عزم) بوون، بەڵام دیارە پلەپلەییان لە بەین دا هەبووە، لە ڕووی عەزم و ئیرادەی پتەوەوە، گرنگ ئەوەیە مووسا ﵇ پێغەمبەرێكی پایە بەرز بووە، بەڵام (خضر) كە بە پێی ڕای بەهێزتر، یەكێك بووە لە دۆستانی خواو هەمیشەش هەموو پێغەمبەران، لە هەموو دۆستانی خوا گەورەترن و، پلەیان بەرزترە، كەچی ئامادە بووە زانیاریی لێوە وەربگرێ!

١٧)- كەسێك كە لە كەسێكەوە فێری زانیاریی دەبێت، دەبێ لە بەرانبەریدا خۆی بە كەمبگرێ، مووسا ﵇ وای كردوە: ﴿ هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴾، ئایا شوێنت بكەوم؟ (ئایا ئامادەی هاوەڵایەتییت بكەم؟) فێرم بكەی لەوەی فێری كراوی (بە شێوەی تایبەت)، زانیارییەك من بە ئامانج بگەیەنێ.

(رُشْد) و(رَشَد) زانیارییەكە مایەی بە ئامانج گەیشتنی مرۆڤ بێ، كەواتە: ئەوە خۆ بە كەمگرتنێكی زۆری تێدا دەدرەوشێتەوە بۆ مووسا ﵇ لە بەرانبەر ئەو بەندە چاكەدا، كە دەیەوێ جۆرێك لەو زانستەی، ئەو لەلایەتی و مووسا ﵇ لە لای نیە، لێی وەربگرێ.

١٨)- دەبێ ئینسان هەمیشە زانست و نیعمەت و چاكەكان، بۆ لای خوا ﷻ بگێڕێتەوە، ئەو دەڵێ: ﴿ هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ ﴾ یانی:(مِمَّا عَلَّمَكَ الله) ئەوەی خوا فێری كردووی و لە لای خواوە فێری كراوی، بە شێوەی تایبەت، بەڵێ چاكەكان هەموویان دەبێ بۆ لای خوا بگێڕدرێنەوە، هەڵبەتە خراپە و زیانەكانیش هەموویان بە قەدەر و ویستی خوان، بەڵام بێگومان خوا لە خێر و چاكە ڕازییە و، لە شەڕ و زیان ناڕازییە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ وَإِن تَشْكُرُواْ يَرْضَهُ لَكُمْ ﴿٧﴾ ﴾الزمر، واتە: خوا ڕازیی نیە بەندەكانی بێبڕوا و سپڵەبن، بەڵام ئەگەر سوپاسگوزاریی بكەن، بۆتان پەسند دەكات و پێی چاكە.

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: {وَالخَيْرُ كُلُّهُ فِي يَدَيْكَ وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ} (أخرجه مسلم: ١٨٤٨)، واتە: (ئەی خوایە!) خێر هەمووی لە لایەن تۆوەیە، بەڵام خراپە و زیان ناگەڕێتەوە بۆ لای تۆ.

---

(١) موسوعة: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) الكتاب السادس: الإيمان برسل الله تعالى وأنبيائه، ط٢٠١٨/٢ م.

چونکە خوا ﷻ لەگەڵ هیچ شتێکی خراپدا نیە بۆ بەندەکانی.

**١٩)- زانیاریی بە سوود، ئەوەیە کە مرۆڤ بە ئامانج بگەیەنێ و، ببێتە هۆی ئەوەی کاری پێ بکات،** مووسا ﷺ دەفەرموێ: ﴿ هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴾ (رُشد) سەرڕاستییەو (رشید)، یانی: بابای سەر ڕاست و بە ئاکام گەیشتوو و بە ئامانج گەیشتوو، پێچەوانەی: (غيّ) و (غاوي)، (غيّ) بێمرادیی و بێ ئاکامییەو، (غاوي)یش واتە: کەسێ بە ئامانج نەگەیشتبێت و بێمراد و بێ ئاکام بوو بێ، کەواتە: زانیاریی بە سوود، ئەوەیە مرۆڤ بە ئامانج بگەیەنێ.

**٢٠)- بەبێ خۆڕاگریی و پشوو درێژیی، زانست وە دەست نایەت،** هەر کەسێ بیەوێ زانست وە دەست بێنێ، دەبێ پشوو درێژو خۆڕاگر بێ، چونکە بەندە چاکەکە بە مووسا ﷺ دەڵێ: ﴿ قَالَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴿٦٧﴾ وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا ﴾، واتە: تۆ ناتوانی لەگەڵ مندا خۆڕاگربی، (لەگەڵم مەدار بکەی)، ئەمەش یانی: بەبێ خۆڕاگریی زانیاریی وە دەست نایەت، بۆیەش زانایان گوتوویانە: (العِلمُ لاَ يُعطيك بَعْضَهُ، حَتّى تُعْطِيَهُ كُلَّكَ)، زانیاریی هەندێکت ناداتێ، تاکو هەموو خۆتی نەدەیتێ.

یانی: دەبێ تەواو خۆتی بۆ یەکلایی بکەیەوە، ئنجا بەشێك لە زانیاریی وە دەست دێنی.

**٢١)- شارەزایی و ئاشنایی مرۆڤ، هۆکاری خۆڕاگرییەتی، بە پێچەوانەوەش: نا ئاشنایی و نا شارەزایی مرۆڤ، دەبێتە هۆی خۆ ڕانەگریی و خۆ پێ مەرزەم نەکرانی،** بە بەڵگەی ئەوەی ئەو بەندە چاکە بە مووسا دەڵێ: ﴿ وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا ﴾ واتە: چۆن دەتوانی خۆت مەرزەم بکەی، لە بەرانبەر کارێك دا کە من دەیکەم و، تۆش پێی شارەزانی، واتە: لە دیوە پەنهانەکەی شارەزانی، بە پێی ڕواڵەتەکەی، ناشەرعییە، بەڵام دیوە پەنهانەکەی، حیکمەت و نهێنیی خوای کاربەجێی تێدایە و، بەرژەوەندیی تێدایە.

یانی: هەرچەندە ڕواڵەتەکەی نابەرچاوە، بەڵام نێوەڕۆکەکەی زۆر تێر و تەواوە.

کەواتە: خۆڕاگریی، بەرهەمی شارەزایی و ئاشنایی مرۆڤە بە شتەکان، خۆڕانەگریی و ڕەخنەگرتنیشی لێیان، بە هۆی نائاشنایی و، نابەرچاو ڕوونییەوەیەتی، بۆیەش دۆستانی خوا، کە هەر دیوی دەرێ و ڕواڵەتی شتەکانیان نەبینیوە و، دیوی پەنهانیشیان دیوە، لە خەڵکی دیکە خۆڕاگرتر بوون، هەروەها بەس دنیایان نەبینیوە و، دواڕۆژیشیان بینیوە، تەنیا دیوی بەرچاوی شتانیان نەبینیوە، بەڵکو دیوە پەنهان و شێرراوە کەشیانیان، دیوە.

٢٢)- شێنەیی و پەلەنەکردن لە حوکمداندا، هەتا ئەو مەسەلەیە هاتۆتە پێش، ڕووندەبێتەوە، مووسا ﷺ ئەگەر پەلەی نەکردبایە و بە شێنەیی مامەڵەی کردبایە، وەك پێغەمبەر (محمد) ﷺ وای بۆ خواستوە و فەرموویەتی: پێمان خۆشبوو مووسا خۆی ڕاگرتبایە، پەلەی نەکردبایە و دانی بە خۆیدا گرتبایەو، خۆی مەرزەم کردبایە، لە بەرانبەر ئەو ڕەفتارانەی (خضر)دا، کە بە ڕواڵەت نا شەرعیی و ناڕێك بوون، بۆ ئەوەی زیاتر نهێنییەکانی خوای پەروەردگارمان کە لە کار و شتە ڕواڵەتییەکان دا هەن، بۆ دەربکەون، کەواتە: دەبێ ئینسان هەوڵبدات پەلە نەکات لە حوکمداندا و، دان بە خۆیدابگرێ، دواییش کە شتەکەی بۆ ڕوون دەبێتەوە، ئەو کاتە دەتوانێ کە لەسەر بناغەی بەرچاو ڕوونیی و زانست، هەڵسوکەوتێکی ڕاستتر ئەنجام بدات.

٢٣)- بەستنەوەی کارەکان بە ویستی خواوە، ئەوەتا مووسا ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قَالَ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا ﴾، واتە: ئەگەر خوا بیەوێ، بە خۆڕاگرم دەبینی (بە خۆڕاگر منت لێ هەڵدەکەوێ)، یانی: خۆڕاگر دەبم لەسەر ئەو کارانەی دەیانکەی، خۆڕاگرییەکەی بە ویستی خوای پەروەردگارەوە، بەستۆتەوە.

دەڵێم: ڕەنگە لە بەرەکەتی گوتنی: ﴿ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ﴾ەوە، سێ جاران توانیبی مەداربکات، لەگەڵ ئەو بەندە چاکەدا، هەرچەندە هەر سێ جاران، مەرجەکەی شکاندوە، یەکەمجار بەهۆی لە بیرچوونەوە بووە و، دواتریش پاساو و پۆزشێکی باشی بۆ هێناوەتەوە و، هەر لە سەرەتاوە بەینی لەگەڵی تێك نەداوە!

٢٤)- عەزم جەزمکردن لەسەر شتێك، وەك کردنی ئەو شتە نیە، جاری وا هەیە ئینسان عەزم لەسەر شتێك جەزم دەکات و، پێی وایە کە بۆی دەکرێ، بەڵام مەرج نیە بۆی بکرێ، بە بەڵگەی ئەوە کە مووسا ﷺ دەڵێ: ﴿ قَالَ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا وَلَآ أَعۡصِي لَكَ أَمۡرًا ﴾، واتە: بە دڵنیایی خۆڕاگرم دەبینی و هیچ بێ فەرمانییەکت ناکەم، عەزمی ئاوا جەزم کردوە، بەڵام دواییش، وا دەرنەچووە، کەواتە: جاری وایە، ئینسان لە لای خۆیەوە پێی وایە ویستی خۆی لەسەر شتێك چەسپاندوە، بەڵام لە کرداردا، مەرج نیە وای بۆ بکرێ! بۆیەش پێشینان دەڵێن: (قسەی بەر ئاگردان و ئینی یەکانە، وەك یەك نین)، واتە: خەڵکێك لەبەر ئاگردان دابنیشێ و یەکیان بڵێ: ئەگەر شێرێکم بۆ بێ، وا دەکەم! ئەوی دیکە بڵێ: یەکانە (ئێرەی بەراز)م بۆ بێ، وادەکەم، قسەی بەرئاگردان و قسەی خۆش کە دەکرێ، لەگەڵ ئەوەدا کە ئینسان، بەکردەوە ڕووبەڕوو دەبێتەوە، وەك یەك نین، هەروەها لەو بارەوە، پێشینان گوتوویانە: (بێڵی قوڕێ، بە دەست خەڵکەوە سووکە)، کەسێك دەبینی بە بێڵ، قوڕێ فڕێدەدا، کەسێك لەولاوە تەماشای بکات، ڕەنگە بڵێ:

بۆچی وا بە قورسی دەستی دەداتێ؟! بەڵام نەخێر، بێڵی قوڕ، بە دەست خەڵکەوە سووکە، ئەگەر تۆ دەستی بدەیتێ، ڕەنگە بێڵەکەت هەر لێ عاسێ بێ، لە نێو قوڕەکەدا و، هەر بۆت نەیەتەوە دەرێ!!

٢٥)- مامۆستا بۆی هەیە، ڕێی پرسیارکردن لە قوتابییەکە بگرێ، لەبەر حیکمەتێ کە بۆ خۆی دەیزانێ، ئەوەتا: ئەو بەندە چاکە (خضر) بە مووسا ﷺ دەڵێ: ﴿ فَلَا تَسْـَٔلْنِي عَن شَيْءٍ حَتَّىٰٓ أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا ﴾، واتە: لە بارەی هیچ شتێکەوە، پرسیارم لێ مەکە [ڕەخنەم لێ مەگرە] تاکو خۆم لە بارەیەوە بۆت دەدوێم، هەتا خۆم لە بارەیەوە بۆت نەدوێم، لە خۆتەوە، قسەی لێ مەکە.

٢٦)- کەسێ بە شتێك ئاشنا نەبێ، قبووڵی ناکات و ڕەفزی دەکات، وەك گوتراوە: (النَّاسُ أعداءُ ما جهلوا)، خەڵك دوژمنی شتێکن، کە پێی نا ئاشنان، مووسا ﷺ لە سۆنگەی ئەوەوە: ئەو کردەوانەی کە ئەو بەندە چاکە ئەنجامی داون، بە دیوە پەنهانەکەیان ئاشنا نەبووە، دیوە حەشاردراوەکەی نەبینیون، ڕەخنەی لێ گرتوون، کە ئەگەر وەك (خضر)، دیوە پەنهانەکەی بینیبان، لە لای ئاسایی دەبوون، کەواتە: ڕاستە ئینسان کە بەشتێك ئاشنا نەبوو، دژایەتیی دەکات، زۆر جاری وایە، کەسانێك کە دژایەتیی هەق دەکەن، لەبەر ئەوەیە کە نایناسن، هەڵبەتە جاری واش هەیە، بە تایبەت ئەوانەی کە حوکمڕان و دەستەڵاتدارن، دژایەتیی هەق دەکەن، لەبەر ئەوەی چاکی دەناسن، دەزانن ئەگەر ئەو هەقە بچەسپێ، بازاڕی ئەوان تێك دەچێ، بەڵام زۆر لە خەڵکی گشتیی، دژایەتیی هەق دەکەن، لەبەر ئەوەی پێی ئاشنانین و، نازانن ئەو هەقە بەرژەوەندییەکانی ئەوان دابین دەکات، مافە زەوتکراوەکانیان بۆ دەگێڕێتەوە! بۆیەش دوژمنانی ئیسلام و دوژمنانی پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاةُ وَالسَّلام) هەمیشە پەنایان بردۆتە بەر چەواشەکاریی، چاوبەستی خەڵك و چاوپێچکیان خستوونە سەرچاو، چونکە زانیویانە: ئەگەر ئەوانە بە هەق ئاشنا بن، لەو ناهەقەی ئەوان هەڵدەگەڕێنەوە! بۆ وێنە: لە سووڕەتی (فصلت)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَسْمَعُوا۟ لِهَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَٱلْغَوْا۟ فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی بێبڕوان گوتیان: گوێ بۆ ئەم قورئانە مەگرن و (لغو)ی تێدا بکەن، غەڵبە غەڵبی تێدا بکەن، دەنگە دەنگی تێدابکەن، ﴿ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴾ بەڵکو بەسەریدا زاڵبن، واتە: مەهێڵن ئەو قورئانە بگاتە گوێی خەڵك، بە دەنگێکی زوڵاڵ و، لە کەش و هەوایەکی ئارام و هێمن دا، با پێیان نەگات، بۆ ئەوەی بەسەریدا زاڵبن، غەڵبەغەڵبی تێدا بکەن و خەڵك چەواشە بکەن، چاوپێچ بخەنە سەر چاوی خەڵك، بۆ ئەوەی نەیبینن.

٢٧)- مامۆستا بۆی هەیە مەرج لەسەر قوتابییەکەی دابنێ و بڵێ: باشە ئامادەم دەرست پێ بڵێم، ئامادەم بتکەمە قوتابی خۆم، بەڵام ئەو مەرجە و، ئەم مەرجەم هەیە، یان ئەم چەند

مەرجەم هەن، بۆ وێنە: چاك بخوێنی، ئاوابكە و، ئاوا برۆیی! بە بەڵگەی ئەوە كە (خضر) مەرج لەسەر مووسا ﷺ دادەنێ، دوای ئەوەی سوور دەبێت كە هاوەڵایەتیی بكات و، ببێتە قوتابیی ئەو و زانیاریی لێوە فێربێ، (خضر) دەڵێ: ﴿فَإِنِ اتَّبَعْتَنِي فَلَا تَسْأَلْنِي عَن شَيْءٍ حَتَّىٰ أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا﴾، واتە: ئەگەر [هەر سووری لەسەر ئەوەی شوێنم بكەوی و] شوێنم كەوتی [و بووی بە قوتابییم تاكو زانیارییم لێ فێر بی] هیچ شتێكم لێ مەپرسە تاكو خۆم بۆت ڕوون دەكەمەوە.

مەرجی لەسەر دادەنێ.

٢٨)- ڕەوایە مرۆڤ سواری كەشتی بێ، یان سواری بەلەم بێ، یان سواری هەر ئامرازێك بێ كە لە دەریادا هاموشۆی پێ دەكرێ، بە بەڵگەی: ﴿حَتَّىٰ إِذَا رَكِبَا فِي السَّفِينَةِ﴾، واتە: هەتا كاتێك سواری كەشتییەكە بوون[١].

٢٩)- بابای لە بیرچوو، لێی ناگیرێ، ئەوەتا: مووسا ﷺ بۆ یەكەمجار ڕەخنەی لێدەگرێ، بەڵام لەبەر ئەوەی بەهۆی لە بیرچوونەوەوەیە، دەڵێ: ﴿لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ﴾، واتە: لێم مەگرە بەهۆی لە بیرچوونەوەوە، واتە: لەسەر ئەوە لێپرسینەوەم لەگەڵدا مەكە و، لەسەر ئەوە سزام مەدە، سزادانەكەش بریتی بوو لەوەی ڕەفاقەتی نەكات و، لێك جیاببنەوە، كە ئەوەش هەر حوكمێكی شەرعییە: ﴿رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا ﴿٢٨٦﴾﴾البقرة، واتە: پەروەردگارمان! لێمان مەگرە، ئەگەر لە بیرمان چوو، یان ئەگەر هەڵەمان كرد.

٣٠)- حوكم بە ڕواڵەت دەكرێ (يُحكم بالظاهر)، ئێمە حوكم بە ڕواڵەتی شتەكان دەكەین، نەك بە دیوی پەنهانیان، هەر بۆیەش مووسا ﷺ هەر سێ جارەكە، لە هەرسێ ڕەفتار و كارەكەی (خضر)، كە بەپێی ڕواڵەتی شەریعەتی مووسا ﷺ و بە پێی ڕواڵەتی شەریعەتی ئێمەش، خراپ بوون، ڕەخنەی گرتووەو، ڕێگریی كردوە لەو ناشەرعیی و خراپەیەی ئەو پیاوە باشە ئەنجامی داوە، بەڵام دیوە پەنهانەكەی ئەو كردەوانە، بەرژەوەندیی گەورە گەورە بوون، كە بۆ مووسا ﷺ نادیار بوون.

كەواتە: هەر كەسێك شتێكی بینی، كە بە ڕواڵەت ناشەرعیی بوو، بۆی هەیە ڕەخنەی لێ بگرێ.

---

(١) (رَكِبَا السَّفِينَةَ) (ركب) پێویستیی بە (في) ناكات بۆ ئەوەی تەعەددای پێ بكات بۆ بەركار (مفعول)، (رَكِبَا: الفعل الفاعل، والسفينة: المفعول به)، بەڵام (ركبا) لێرەدا بە (في) بەركاری پێ خوازراوە، تاكو (ركبا) مانای چوونە نێویشی، بخرێتە نێو، (لِكَي يُضَمَّنَ مَعْنَى الدُّخُول)، واتە: سواری بوون و چوونە نێویشی، كەشتی كاتی خۆشی وابووەو ئێستاش هەر وایە، هەمووی قات قاتە، خەڵك وەك چۆن سواری دەبێ، دەچێتە نێویشی، دەچێتە یەكێك لە قاتەكانەوە، یان یەكێ لە ژوورەكانی قاتەكان.

**٣١)**-زیانی گەورە بە هی بچووك لا دەبردرێ، (يُدْفَعُ الشرُّ العظيم، بالحقير) هەمیشە دەبێ: زیانی گەورە لابیردرێ، بە هۆی تەحەممولكردنی زیانی بچووكەوە، بۆیەش: ئەو بەندە چاكە (خضر) كەشتییەكە خراپ دەكات، كون دەكات، كە ئەوە زیانێكی بچووكە، بۆ ئەوەی خاوەنانی ئەو كەشتییە، كە كۆمەڵە نەدارێكن، كار و كاسبییان لەسەر ئەو كەشتییەیە، كەشتییەكەیان لە دەست نەچێ، كەشتییەكەیان خراپ ببێت (تۆزێك كون ببێ)، كە دواتر خۆیان چاكی دەكەنەوە، زیانی ئەوە زۆر كەمترە لەوەی: كەشتییەكەیان یەكجاریی زەوت بكرێ، لە لایەن ئەو پادشا ستەمكارەوە، كە هەر كەشتییەكی تازەو بەرچاوو باشی زەوت دەكرد.

**٣٢)**- لەبەر هێنانەدی بەرژەوەندیی و چاكە، دروستە تەصەڕروف لە ماڵی غەیردا بكرێ، بە هەر شێوەیەك كە بەرژەوەندیی و چاكەی، ئەو خاوەن ماڵە دابین بكات، واتە: بەبێ مۆڵەت لێ وەرگرتنیشی، دروستە دەست وەربدەیە ماڵی كەسێك، كە خۆشی لەوێ نیە، یان لەوێیە، بەڵام بۆ خۆی نازانێ، مادام تۆ دڵنیای كە بەرژەوەندیی سامانەكەی وی لەوەدایە و، بۆ ئەو واچاكە، دروستە دەستكاریی بكەی، بەڵام ئەوە نابێ بە گومان و گریمانە بێ، دەبێ دڵنیابی بەرژەوەندییەكەی لەوەدایە، بۆ وێنە: كەسێك دەیەوێ شتێكی خۆی بفرۆشێ، بە هەرزان قیمەت، تۆش دەزانی: كە نرخی ئەو شتە زۆر لەوە زیاترە، بۆت هەیە، ڕێی لێبگری و بڵێی: ناهێڵم، بەڵام ئەوەش لە حاڵەتی یەكدی ناسین و، پێك ئاشنابوون و لە یەكدی ڕابینین دا، ئەوە دەكرێ، هەروەها بۆت هەیە بڵێی: لێی گەڕێ من بۆت دەفرۆشم! ئەو حوكمەش لە ڕەفتاری بەندە چاكەكە وەردەگیرێ، كە بەبێ مۆڵەتی خاوەنەكانی، كەشتییەكەی لێ كون كردن و نابەرچاوی كرد، تاكو تەماعی دەست بەسەرداگیرانی تێ نەكرێ!

**٣٣)**- ئاسانیی و سەماحەت ڕەچاو كردن لە هەڵسوكەوت لەگەڵ خەڵكیدا، پێویستە، بە بەڵگەی ئەوەكە: مووسا ﷺ كە بۆ یەكەمجار مەرجەكەی دەشكێنێ، پاساو دێنێتەوە، كە بەهۆی لەبیرچوونەوە بووە، دواتر پێی دەڵێ: ﴿ وَلَا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا ﴾، واتە: لە كار و حاڵی خۆمدا، زەحمەت مەخە سەرشانم! یانی: باوا نەبێ كە بۆم تەحەممول نەكرێ، كەواتە: سیفەتێكی بەرز و پەسندە: مرۆڤ ئاسانیی و سەماحەت ڕەچاو بكات لە هەڵسوكەوت دا و، باری شانی خەڵكە قورس نەكات و، وایان لێ نەكات سەغڵەت بێن.

**٣٤)**- كاركردن لە دەریادا شتێكی ڕەوایە، وەك چۆن دروستە سواری كەشتیی و بەلەم و هاووێنەیان ببین، كە هامووشۆیان پێ دەكرێ لە دەریادا، كاركردنیش لە دەریادا، بۆ بژیویی پەیداكردن، شتێكی ڕەوایە، بەبەڵگەی ئەوەكە: خوا ﷻ بۆ خاوەنانی كەشتییەكە، دەفەرموێ: ﴿ أَمَّا ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتْ

﴿لِمَسَٰكِينَ يَعۡمَلُونَ فِي ٱلۡبَحۡرِ﴾، کەشتییەکە هی چەند نەدارێك بوو، کە کاریان دەکرد لە دەریادا، یانی: بژێویان پەیدا دەکرد لە دەریادا، ئنجا: ڕاویان کردوە، باریان هەڵگرتوە بە کەشتییەکە، خەڵکیان سوارکردوە و پەڕاندوّتەوە، هەروەها ئێستاش: گەوهەر و مرواریی دەردێنن، جۆرە ئاژەڵەکانی دیکەی دەریا دەردێنن،...هتد، هەموو جۆرە کارکردنێك لە دەریادا، کاری ڕەوا بۆ بژێو پەیداکردن، دروستە.

٣٥)- نەدار (مسکین) کەسێکە، شتێکی هەیە، بەڵام بەشی ناکات، وەك كاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (التوبة)دا، لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٦٠﴾، لەوێدا خستومانەتە ڕوو، کە: هەژار (فقیر) کەسێکە، هیچی نیە، بەڵام نەدار (مسكين) کەسێکە، شتێکی هەیە، بەڵام بەشی ناکات، بەبەڵگەی چی؟! بە بەڵگەی ئەوە کە لێرەدا، دەفەرموێ: ﴿أَمَّا ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتۡ لِمَسَٰكِينَ يَعۡمَلُونَ فِي ٱلۡبَحۡرِ فَأَرَدتُّ أَنۡ أَعِيبَهَا﴾، کەشتییەکە هی چەند نەدارێك بوو کە کاریان دەکرد لە دەریادا، واتە: کۆمەڵە خەڵکێك بوون، هەریەکەیان پشکێکی لەو کەشتییەدا هەبووە، لەگەڵ ئەوەشدا، خوا بە: {مَسَاكِين}ی ناو بردوون، لەبەر ئەوەی، ئەو بژێوەی، بەهۆی ئەو کەشتییەوە پەیدایان کردوە، بەشی نەکردوون.

٣٦)- کوشتن گەورەترین گوناهە، هەڵبەتە لە دوای شیرك و کوفر و نیفاق، بەبەڵگەی ئەوە کە خوا ﷻ لەسەر زمانی مووسا ﷺ ڕەخنە لە: (خضر) دەگرێ و دەڵێ: ﴿أَقَتَلۡتَ نَفۡسٗا زَكِيَّةَۢ بِغَيۡرِ نَفۡسٖ﴾، واتە: ئایا نەفسێکی پاك کوشت، بێ ئەوەی نەفسێکی کوشتبێ؟!

کەواتە: شتێك کە مرۆڤی لەسەر بکوژرێ، بریتیە لە کوشتن، کەوا بێ: کوشتن گەورەترین تاوانە، ئنجا ئەو هەڕەشەیەش کە خوا ﷻ بۆ کەسانێك کە بە ئەنقەست کەسێك دەکوژن، ئەو هەڕەشە و سزایەی بۆ ئەوە باسی کردوە، بۆ هیچ شتێکی دیکەی باس نەکردوە، وەك لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنٗا مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدٗا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمٗا ٩٣﴾، وەك لە شوێنی خۆی، لە بەرگی سێیەمی ئەم تەفسیرەماندا، بە تەفصیل لە بارەی ئەو ئایەتەوە دواوین.

٣٧)- کوشتنەوە، بە هۆی تۆڵەکردنەوەوە، بە کوشتن لە قەڵەم نادرێ، واتە: کوشتنە، بەڵام کوشتنێکی خراپ نیە، یانی: کەسێك کە وەك تۆڵە دەکوژرێ، لەبەر ئەوەی نەفەرێکی کوشتوە، ئەو کوشتنەی ئەو

بە خراپ لە قەڵەم نادرێ، بەبەڵگەی ئەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةًۢ بِغَيْرِ نَفْسٍ ﴾، کەواتە: ئەگەر کەسێك لە بەرانبەر نەفسێکدا بکوژرێ، ئەوە جێی ڕەخنە و سەرزەنشت نیە، بەڵکو کارێکی باشە و خراپ نیە.

٣٨)- بابای ڕێبوار و غەریب، دروستە داوای خواردن و میوانداریی بکات، لە شوێنێك کە پەکی کەوتوە و لێی دەقەومێ، دروستە داوا لە خەڵك بکات، وەك لە کوردەواریی خۆماندا هەیە: کە لادەدەیە شوێنێك و پێیان ئاشنانی و یەکەم جارتە، بەڵام ڕێبواری: سەلام دەکەی و دەڵێی: میوانان ڕادەگرن؟ ئنجا ئەگەر نەجابەتیان هەبێ، دەڵێن: فەرموو فەرموو، لە خزمەتداین، وەك لە خوا بە زیاد بێ، من لە ژیانی خۆمدا، تاکو گوتبم: میوانان ڕادەگرن! فەرموویان لێکردووین، هەڵبەتە جاری واش هەیە، خەڵکێکی وەك مووسا و (خضر) لێیان هەڵکەوتبوون، هەن و دەڵێن: نەخێر، گرنگ ئەوەیە دروستە بابای غەریب، ڕێبوار، داوای خواردن و میوانداریی بکات، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا ﷻ دەربارەی مووسا و بەندە چاکەکە، دەفەرموێ: ﴿ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا ﴾، داوای خواردنیان لە خەڵکەکەی کرد، کەواتە: داوای خواردن کردن دروستە، لە کاتێکدا: ڕێبواری و پەکت کەوتوە و هیچ دەرەتانت نیە.

٣٩)- دروستە لە بەرانبەر کاردا، داوای کرێ بکرێ، بە بەڵگەی ئەوە کە مووسا عليه السلام بە (خضر) دەڵێ: ﴿ لَوْ شِئْتَ لَتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا ﴾، واتە: ئەگەر ویستبات، داوای کرێت دەکرد، واتە: وا باشبوو داوای کرێ بکەی، لە بەرانبەر چاککردنی ئەو دیوارەدا، کەواتە: ئەصڵ ئەوەیە ئینسان لە بەرانبەر کارێکدا کە دەیکات، دروستە داوای کرێ و پاداشت بکات، یانی: هەر کارێك ئەنجام دەدرێ، بۆ کەسێك، ئەو کەسە کە کارەکەی ئەنجام داوە، شایستەی کرێ و پاداشتە، ئنجا ئەگەر دوایی خۆی خۆبەخشانە ئەنجامی دەدات و هیچی ناوێ، ئەوە شتێکی دیکەیە، وەك چۆن مووسا عليه السلام کاتی خۆی ئاژەڵەکانی بۆ دوو ئافرەتان ئاودان، کە لە سوورەتی (القصص)دا هاتوە: ﴿ فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّى لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَىَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: ئاژەڵەکانی بۆ ئاوەدان، دوایی چووە سێبەرێك و گوتیشی پەروەردگارم! من پێویستیم بە هەر خێر و چاکەیەك هەیە، کە بۆم دادەبەزێنی.

کەواتە: زۆری برسیی بووە و زۆریشی پێویست بەکرێ و پاداشت بووە، بەڵام کارەکەی کارێکی خۆبەخشانە بووە و، بەزەیی بەو دوو ئافرەتەدا هاتوە و، ئاژەڵەکەی بۆ ئاوداون، هەروەها ئەو بەندە چاکەش کە لەگەڵ مووسا بووە، دیوارەکەی ڕاست کردۆتەوە، بەبێ بەرانبەر.

٤٠)- بەندەی باش، خوا وەچەکەی بۆ دەپارێزێ، وەك خوا ﷻ دەربارەی دوو هەتیوەکە، دەفەرموێ: ﴿ وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحًا ﴾، واتە: بابیان پیاوی چاك بوو.

تنجا لەبەر ئەوەی بابیان پیاوی چاك بووە، خوا ﷻ ئەو بەندە چاکەیە (خضر)ی بۆ وا لێکردوون، ئەو بەرژەوەندییەیان بۆ بپارێزێ، کە بریتی بووە، لە ماڵ و سامانەکەیان کە لە ژێر دیوارەکەدا شێردراوەتەوە، دیوارەکەش مەیلی کردوە بە لای ڕووخاندا و خەریك بووە بڕووخێ، کە ئەگەر ڕووخابایە، ماڵەکەیان دەردەکەوت و خەڵکی شارەکەش زۆر چەتوون و ناڕێك بوون، ماڵەکەیان لێ زەوت دەکردن، بۆیە (خضر) دیوارەکەی بۆ چاککردوونەوە، تاکو دوایی خۆیان زانیویانە، کە بابیان ئەو پارە و سامان و خەزنەیەی، لە ژێر ئەو دیوارەدا بۆ شاردوونەوە، وادیارە وەسیەتی بۆ کردوون، بەڵام ئەگەر دیوارەکە ڕووخابایە، ئەوان جارێ توانای ئەوەیان نەبووە ماڵەکەیان بپارێزن، بۆیە (خضر) دیوارەکەی بۆ چاك کردوونەوە، تاکو دوایی کە خۆیان گەورە بوون، بە ئیسراحەت پارەکەیان دەردێنن و، دەشتوانن بەرگریی لە خۆشیان و ماڵ و سامانەکەشیان بکەن.

٤١)- کارکردن بۆ مرۆڤی صالح، باشترە لە کارکردن بۆ خەڵکی دیکە، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحًا ﴾، واتە: بابیان پیاوی چاك بوو، کەواتە: ئەگەر ئینسان کار بکات بۆ ئینسانی باش و صالح، لە خەڵکی دیکە باشترە و، ئەوە بەرەکەتی زیاترە و جێی باشتر دەگرێ.

٤٢)- ماڵ زەوتکردن قەدەغەیە، بەبەڵگەی ئەوەکە لە باسی کەشتییەکەدا، دەفەرموێ: ﴿ وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا ﴾، لە پشتیانەوە پادشایەك هەبوو، کە هەر کەشتییەکی بەرچاو و چاکی، زەوت دەکرد.

کە دیارە ئەوەش زوڵم بووە، تنجا بۆ ئەوەی ئەو زوڵمەیان لێ نەکرێ، (خضر) هەڵساوە: بەشێك لە کەشتییەکەی لێ خراپ کردوون، بۆ ئەوەی نا بەرچاو بێ و تەماعی تێنەکرێ، کە ئەو زیانەی بەو کەشتییەی گەیاندوە، زیانێکی بچووك بووە، بۆ ئەوەی لە زیانی گەورەتر ئەو کەشتییە بپارێزرێ و، خاوەنەکانی تووشی زیانی گەورەتر نەبن، ئەو نەدارانەی کە کار و ژیانیان بەو کەشتییەوە بەند بووە، کەواتە: ئەو تەگبیرە حەکیمانەیەی (خضر) لەپێناوی ئەوەدا بووە، کە کەشتییەکە لە زەوتکران (غَصْب) دووربخاتەوە.

٤٣)- دروستە ماڵ لە ژێر زەویدا بشاردرێتەوە: ﴿ وَكَانَ تَحْتَهُۥ كَنزٌ لَّهُمَا ﴾، بەڵێ، بەپێی ئەم ڕستە قورئانییە کەسێك ماڵ و سامانێکی هەیە، لێی دەترسێ، دروستە لە ژێر زەویدا بیشارێتەوە.

٤٤)- دەبێ مرۆڤ لە کاتی دەربڕیندا، تەوپەڕی ئەدەب و ڕێز بەرانبەر بە خوا ﷻ بەکار بێنێ، تەماشا بکەن! ئەو بەندە چاکە (خضر) وای کردوە، بۆ وێنە:

أ- دەڵێ: ﴿ فَأَرَدتُّ أَنۡ أَعِيبَهَا ﴾، واتە: ویستم عەیبداریی بکەم، عەیبەکە دەداتە پاڵ خۆی.

ب- بەڵام بۆ ئەوی دیکە دەڵێ: ﴿ فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبۡلُغَآ أَشُدَّهُمَا وَيَسۡتَخۡرِجَا كَنزَهُمَا رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَ ﴾، واتە: پەروەردگارت ویستی ئەو دوو مێرد منداڵە بگەنە حاڵەتی گەنجێتیی و تین و تاقەت. بۆ عەیبدار کردن پاڵی دەداتە لای خۆی، بەڵام بۆ گەیشتن بە حاڵەتی باڵغ بوون، پاڵی داوەتە لای خوای پەروەردگار کە بەرژەوەندییان لەوەدایە، تاکو بتوانن ماڵەکەیان بپارێزن.

ئنجا ئەمە لە هەموو قورئاندا، ڕەچاو کراوە، بۆ وێنە:

أ- ئیبراهیم ﷺ لە سوورەتی (الشعراء)دا دەڵێ: ﴿ وَإِذَا مَرِضۡتُ فَهُوَ يَشۡفِينِ ۝٨٠ ﴾، واتە: کاتێك کە نەخۆش بووم، بەس ئەو (خوا) چاکم دەکاتەوە.

نەخۆشییەکەی خۆی پاڵدەداتە لای خۆی، کە بۆ خۆی نەخۆش دەبێ، بەڵام شیفایەکە پاڵدەداتە لای خوا، خوا چاکی دەکاتەوە.

ب- هەروەها جندیش ئەو ئەدەب و ڕێزەیان بۆ خوای بەرز، ڕەچاو کردوە: ﴿ وَأَنَّا لَا نَدۡرِيٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ أَرَادَ بِهِمۡ رَبُّهُمۡ رَشَدٗا ۝١٠ ﴾الجن، واتە: ئێمە نازانین: ئایا خەڵکی سەر زەوی خراپەی بۆ ڕەچاو کراوە [خراپەی بۆ ویستراوە] یاخود پەروەردگاریان بە ئامانج گەیشتن و سەر ڕاستیی بۆیان ویستوە؟!

٤٥)- نابێ هاوڕێ لە هاوڕێ جیابێتەوە، تاکو بێ بەڵگەو پاساوی دەکات، ئەوەتا مووسا ﷺ دەڵێ: ﴿ قَدۡ بَلَغۡتَ مِن لَّدُنِّي عُذۡرٗا ﴾، واتە: بەڕاستیی تۆ بەنسبەت منەوە گەیشتووی بە پاسا وو بەڵگە، کە هاوەڵایەتییم نەکەی، چونکە سێ جاران مەرجی شکاندوە، کەواتە: ڕەفیق و هاوەڵ نابێ لێك جیاببنەوە، تاکو بەڵگە و پاساوێکی بەهێزیان نەبێت، کوردەواریی خۆشمان دەڵێن: (دۆست بگرە بە چایەك، مەیدە بە دنیایەك)، ئینسان نابێ هەروا بە ئاسانیی دەستبەرداری، ڕەفیق و دۆستی خۆی بێ، باشترین کەس ئەوەیە کە بۆ ڕەفیق و هاوەڵەکانی باشتربێ، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، پرسیاری لێکراوە: دوو کەس دەگەنە یەکدی، کامیان سڵاو لەوی دیکە بکات؟! فەرموویەتی: (أَوْلاهُما باللهِ)[1] واتە: ئەوەیان لە خواوە نزیکترە، ئەو دەبێ پێشێ سڵاو بکات.

واتە: کێ بۆ ڕەفیقی خۆی باشتربێ، ئەو لە لای خوا چاکترە.

---

(١) أخرجه الترمذي: ٢٦٩٤، وقال: حسن.

٤٦)- دەبێ مرۆڤ دان بە واقیعدا بنێ و، واقیع چۆنە، ئاوا بیسەلمێنێ و بیبینێ و دانی پێدابنێ، وەك كوردەواریی دەڵێن: (لە هەقێ ئاو ڕادەوەستێ) ئینسان نابێ لە هەقێ لابدا، مووسا ﷺ جاری یەكەمیان: دەڵێ: لێم مەگرە كە لەبیرم چوو، جاری دووەمیان: دەڵێ: ئەگەر جارێكی دیكە ڕەخنەم لێ گرتی، هاوەڵاتییم مەكە، جاری سێیەم: پێویست ناكات مووسا بۆ خۆی و بڵێ، چونكە جاری پێشوو گوتوویەتی: ئەگەر ئەم جارە پرسیارم لێكردی و ڕەخنەم لێگرتی، هاوەڵایەتییم مەكە، بۆیە مووسا ﷺ كاتێك بەندە چاكەكە، دەڵێ: ﴿ قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ ﴾، ئا ئەوە لێك جیابوونەوەی من و تۆیە، مووسا ﷺ بێ دەنگ دەبێ، چونكە دەزانێ: كە ئەوە هەقە و، پێشتر ڕێی لە خۆی بڕیوە، كە داوای درێژە پێدانی ئەو هاوەڵایەتییە بكات، كە ئەو ناتوانێ خۆی مەرزەم بكات و تێیدا مەدار بكات.

٤٧)- ئازاردانی دایك و باب، مایەی تەمەن كورتییە، بەڵگەشمان ئەوەیە كە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا ٱلْغُلَٰمُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَآ أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا ﴾، مێرد منداڵەكە باب و دایكی بڕوادار بوون، ترساین، كە {ئەگەر گەورە بێ} تووشی سەركێشیی و، كوفریان بكات، سەركێشیی و كوفریان بە ملدا بێنێ.

كەواتە: لەبەر ئەوەی ئەو منداڵە باش نەبووە بۆ دایك و بابی و، ئەگەری ئەوەی هەبووە، كە تووشی كوفر و خراپەیان بكات، بۆیە خوا ﷻ تەمەنی كورت كردوە و، مۆڵەتی داوە: كە ئەو بەندە چاكەی لەگەڵ مووسا دایە ﷺ (خضر) بیفەوتێنێ، تاكو خوای بەخشەر بۆیان بگۆڕێ بە منداڵێكی پاكتر و چاكتر و بە ڕەحمتر.

٤٨)- تەبایی و گونجایی هۆی بەردەوامیی هاوڕێیەتییە، بە پێچەوانەوەش: هەر ڕاستە، بێگومان ڕەفیق و دۆست و برادەران، كاتێك دەتوانن پێكەوە بەردەوام بن، كە پێكەوە تەبا و گونجا وبن و، ئەگەر پێكەوە نەگونجان و تەبا نەبوون، لێك جیادەبنەوە، هەر بۆیەش مووسا نەیتوانی لەگەڵ (خضر) دا مەدار بكات، لەبەر ئەوەی مووسا كە ڕواڵەتی شتەكانی (خضر)ی دەبینی، پێی ناشەرعیی و هەڵە بوون و، ڕەخنەی لێ دەگرتن، ئەویش بە دیوێكی دیكەدا تەماشای كارەكانی دەكرد و پەنهانیانی دەبینی، واتە: یەكێكیان: ڕواڵەتی شتەكانی پێ ناشەرعیی بوو و، ڕەخنەی لێ دەگرت و، ئەوی دیكەش: پەنهانی كارەكانی دەبینی و بەرژەوەندییە گەورەكانی دەبینی، بۆیە لەبەر ئەوەی بۆ چوون و تێفكرینیان جیابوو بۆ شتەكان، نەیان دەتوانی پێكەوە مەدار بكەن، واتە: مادام پێكەوە تەبا و گونجاو نەبوون، بەردەوامیی هاوڕێیەتییشیان مەحاڵ بوو.

٤٩)- دەبێ مرۆڤی مسوڵمان دڵنیابێ كە قەدەرەكانی خوا، دیوی پەنهانیان هەیە و، زۆرجار (مِحْنة) دەبێتە (مِنْحة) واتە: بەڵا دەبێتە خەڵات، یانی: زۆرجاران میحنەت، مینحەی تێدایە،

زۆرجاران شتێك تۆ بە بەڵای تێدەگەی، بەڵام خەڵاتە، هەربۆیە كوردەواریی خۆمان كەسێك كە نەخۆش دەبێ، دەڵێن: (نەخۆشیی خەڵاتی خوایە) یان دەڵێن: (خوا بەسەری كردۆتەوە) واتە: خوا لێی پێچاوەتەوە.

٥٠)- ژمارەی سێ (٣) یاخود كەرەتی سێ، كاتێك كە دووبارە دەبێتەوە، ئیعتیباری پێدەكرێ، ئەوەتا ئەو بەندە چاكە، كە بۆ جاری سێیەم، مووسا ﷺ مەرجەكەی دەشكێنێ، خوا حافیزیی لێدەكات و دەڵێ: ﴿ قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ ﴾، كەواتە: سێ، كە دووبارە دەبێتەوە، ئیعتیباری پێدەكرێ، كوردەواریی خۆشمان دەڵێن: (شەرتی پیاوان سێ جارە).

٥١)- مەرج (شَرْط) پێویستە پابەندیی پێوە بكرێ، زانایان گوتوویانە: (المشْرُوطُ شَرْطاً كَالمشْروعِ شَرْعَاً)، واتە: مەرجێك كە بە مەرج گیراوە، وەك بنەمایەكی شەرعییە كە دانراوە، یانی: مووسا ﷺ كە ئەو بەندە چاكە، لەسەری بە مەرج دەگرێ: لێی نەپرسێ، تاكو خۆی لە بارەیەوە بۆی دەدوێ، كە سێ جاران مەرجەكەی بۆ نابردرێتە سەر و دەیشكێنێ و، ناتوانێ پێیەوە پابەند بێ، بۆیە مووسا ﷺ هەر بۆ خۆی لێی دەسەلمێنێ، كە بۆی هەیە چیدیكە هاوەڵایەتیی نەكات و لێی جیاببێتەوە.

٥٢)- زانا و مامۆستا دەبێ بە حەوسەڵە بێ، سینگ فراوان بێ، لێبوردە بێ، ئەوەتا (خضر) كە لەگەڵ مووسادا بووە و، مامۆستای مووسا بووە لەو زانیارییە پەنهانەدا: چەندە بە نەرمیی و لە باریی هاوەڵایەتیی كردوە: جاری یەكەم بەس ئەوەندە دەڵێ: ﴿ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴾، ئایا نەمگوت: ناتوانی لەگەڵم خۆڕاگربی؟ بۆ جاری دووەم گلەییەكەی لێی توندتر دەكات: ﴿ أَلَمْ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴾، واتە: ئایا بەتۆم نەگوت: كە ناتوانی لەگەڵ مندا خۆڕاگر بی؟

بەڵام بۆ جاری سێیەم تەنانەت گلەییش دووبارە ناكاتەوە و دەڵێ: ﴿ قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ ﴾، واتە: ئەمە {ئیترە} لێك جیابوونەوەی من و تۆیە.

مامۆستا لەگەڵ قوتابییدا، هەروەها كەسێك كە كەسێكی لەبەر دەرستە، یاخود كەسێك، كە كەسێك شتێكی لێ فێردەبێ، پێویستە بە حەوسەڵە و بە سەبر بێ، بەڵێ دەبێ سەرزەنشت و لێپرسینەوە هەبێ، بەڵام دەگونجێ بە شێوازێكی بەرز و نەرم بێ و، قوتابییەكە، ئەوەش دەرسێكی دیكە بێ، كە لە مامۆستایەكەیەوە فێری دەبێ.

## کورتە باسێک لەبارەی:
## (خضر) و زانیاریی پەنهانەوە

بەڕێزان! لەم کورتە باسەدا دوو مەسەلەی گرنگ و هەستیار، بەکورتیی و گوشراویی دەخەینە ڕوو:

### مەسەلەی یەکەم: ((خضر)):

لە بارەی (خضر)ەوە کە کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (خدر) و هەندێک دەڵێن: (خدری زیندە) کە وەك ڕوونی دەکەینەوە: لە ڕاستییدا ئەو بەندە چاکە، کە بە (خدری زیندە) ناوبراوە، زیندوو نیە، هەرچەندە لەو بارەوەش قسەی جیاجیا هەن:

خاوەنی (**محاسن التأويل**)، (**جمال الدين القاسمي**) (ڕەحمەتی خوای لێبێ)، کۆمەڵێک قسە دێنێ، کە پێم وایە ئەوەی کە لە تەفسیرەکاندا هاتوە، ئەوەی جێی مەبەستە هەمووی جێ کردۆتەوە، بۆیە منیش ئەوەی ئەو هێناویەتی و کۆی کردۆتەوە، پوختەیەك لە دەقەکەی دێنم.

لە بارەی (خضر)ەوە دەڵێ:

(**إختَلَفَ أهلُ العِلمِ في نَسَبِ الخضر، وَفي كونهِ نَبيَّاً، وَفي طُولِ عُمرِهِ، وَبَقَاءِ حَيَاتِهِ، عَلَى أقوالٍ كَثِيرَةٍ**)، واتە: زانایان ڕاجیاییان هەیە، دەربارەی ڕەچەڵەکی (خضر) و، لەوبارەوە کە ئایا پێغەمبەر بووە؟ هەروەها دەربارەی تەمەنی درێژی، کە ئایا لە ئێستا لە ژیاندایە و ئایا ئێستا ماوە؟ ڕاجیایەکانیش دابەش بوو ون بۆ چەند ڕایەکی زۆر.

١- دوایی وەك نموونە، قسەیەکی (نەوەویی) دێنێ و دەڵێ:

(**قَالَ النَّووي في (التهذيب): قَالَ الأكثرُون: هُوَ حَيٌّ موجودٌ بَيْنَ أظهُرِنَا، وَذَلِكَ مُتَّفَقٌ عليهِ بَيْنَ الصوفية وأهل الصلاح والمعرفة، وحكاياتهم في رؤيته، والإجتماع به، والأخذ عنه، وسؤاله، ووجودهِ في المواضع الشريفة، أكثر من أن تُحصَى، وَأشهَر مِنْ أنْ تُذكَر**).

نەوەویی لە کتێبی: (**التهذيب**)دا دەڵێ: زۆربەی زانایان گوتوویانە: (خضر) زیندووە و لە نێوماندایە و، ئەوەش یەك دەنگیی لەسەرە لە نێوان ئەهلی تەصەووف و ئەهلی

صەلاح و مەعریفەت دا. {ئەوانەی چاکن و: زیاتر کار دەکەن لە ڕووی تەزکییەوە} بەسەرهاتەکانیشیان سەبارەت بە بینینی و، لەگەڵدا کۆبوونەوەی و، زانیاریی لێوەرگرتنی و، پرسیار لێکردنی، هەروەها هەبوونی لە شوێنە موبارەکەکان دا، {وەنگە مەبەستی پێ مەککە و مەدینە و قودس و ئەوانە بێ} لەوە زیاترە کە سەر ژمێربکرێ و، لەوەش باوترە کە باس بکرێ.

٢)- ئنجا ڕای بوخاریی دێنێ:

(وقال البخاري وطائفة من أهل الحديث: إنه مات)، واتە: بوخاریی و کۆمەڵێك لە فەرمووودەناسانیش گوتوویانە: مردوە.

٣)- پاشان ڕای (الحافظ أبو الخطاب) دێنێ:

(وقال الحافظ أبو الخطاب بن دحية: وأما رواية اجتماعِهِ مَعَ النبيّ ﷺ وتعزيته لأهل البيتِ، فلا يصحُّ من طرقها شيء، ولا يثبت اجتماعه مع أحد من الأنبياءِ، إلاَّ مَعَ موسى).

واتە: (الحافظ أبو الخطاب بن دحية) دەڵێ: ئەو ڕیوایەتە کە گوایە: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کۆبۆتەوە و دوایی هاتوە سەرەخۆشیی کردوە لە بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ بە بۆنەی کۆچی دوایی پێغەمبەرەوە ﷺ، هیچ کام لە ڕێیەکانی ڕاست نین و، نەچەسپاوە، کە ئەو بەندە چاکە، کە لەگەڵ هیچ کام لە پێغەمبەراندا کۆبووبێتەوە و هیچ کام لە پێغەمبەرانی بینیبێ، جگە لە مووسا ؊.

واتە: (خضر) تەنیا لەگەڵ مووسادا کۆبۆتەوە و بینیویەتی، ئەویش مووسا چووە بۆ لای، بۆ ئەوەی ئەو زانیارییە تایبەتییەی لێ وەربگرێ.

٤)- دوایی (جمال الدين القاسمي) ڕای خۆی دەخاتەڕوو:

(وتمسّك من قال بتعميره، بقصة عين الحياة، واستند إلى ما وقع من ذكرها في صحيح البخاريّ وجامع الترمذيّ، ولكن لم يثبت ذلك مرفوعاً).

واتە: ئەوانەی کە گوتوویانە: تەمەن درێژکراوە و ماوە و هەیە، بەسەرهاتی سەرچاوەی ژیان (عين الحياة) بە بەڵگە هێناوەتەوە و، پشتیان بەوە بەستوە کە لەو بارەوە، باسکراوە، لە صەحیحی بوخاریی و سونەنی تیرموذیی دا، بەڵام هیچ کام لەوانە بە بەرزکرانەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ نەچەسپاون، {واتە: فەرموودەی (مرفوع) نین، بەڵکو ڕای هەندێك لە

زانایانن، ئنجا: هاوەڵە، تابیعییە، هەر کەسێکی دیکەیە، گرنگ ئەوەیە پێغەمبەر ﷺ شتی وای نەفەرمووە}.

٥)- ئنجا ڕای (أبو حيان التوحيدي) دێنێ:

(وقال أبو حَيَّان فِي «تفسيره»: الجمهور على أن الخضر مات)، واتە: ئەبوو حەییان لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ: ڕای زۆربەی زانایان وایە کە (خضر) مردوە.

٦)- ئنجا ڕای (ابن تيمية) دێنێ:

{وقال تقيّ الدين ابن تيمية عليه الرحمة والرضوان في بعض فتاويه.... وكذلك الذين يرون الخضر أحياناً، هو جِنيٌّ رأوه، وقد رآه غير واحدٍ مِمَّن أعرفه، وقال: (إنَّني الخضر) وكان ذلك جِنيّاً لبَّس على المسلمين الذين رأوه، وإلّا فالخضر الذي كان مع موسى عليه السلام مات، ولو كان حيّاً على عهد رسول الله ﷺ، لوجب عليه أن يأتي إلى النبيّ ﷺ ويؤمن به ويجاهد معه، فإن الله فرض على كل نبيّ أدرك محمداً، أن يؤمن به ويجاهد معه)[1].

واتە: (تقيّ الدين ابن تيمية) لە هەندێ لە فەتواکانی خۆیدا گوتوویەتی، هەروەها ئەوانەی کە هەندێ جار پێیان وایە: (خضر)یان بینیوە، ئەوە جندێکە دیتوویانە، زیاد لە یەکێك لەوانەی من دەیانناسم، ئەوەیان بینیوە، ئنجا کە ئەوە یان بینیوە، گوتوویەتی: من (خضر)م، بەڵام لە ڕاستییدا: جندێك بووە، سەری لە و مسوڵمانانە شێواندوە کە بینیویانە، ئەگەرنا ئەو (خضر)ەی کە لە سەردەمی مووسا پێغەمبەردا بووە عليه السلام، مردوە و، ئەگەر گریمان لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ مابایە، لە سەری پێویست بوو، بێتە خزمەت پێغەمبەر ﷺو بڕوای پێبێنێ و، لەگەڵیدا بچێ بۆ جەنگ و تێکۆشان.

٧)- بەندەش دەڵێ:

دەگونجێ زۆر بەڵگەی دیکەش لەو بارەوە کە(خضر) بووونی نەماوە، بهێنینەوە، بۆ نموونە:

١ - ﴿ وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾ الأنبياء، واتە: لە پێش تۆش دا (ئەی موحەممەد!) هیچ مرۆڤێکمان هەرماو نەکردوە (نەهێشتۆتەوە لە ژیان دا) ئایا کە تۆ مردی ئەوان هەرماو دەبن؟!

٢ - ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ: {لاَ تَأْتِي مِائَةُ سَنَةٍ، وَعَلَى الأَرْضِ نَفْسٌ مَنْفُوسَةٌ الْيَوْمَ} (أخرجه مسلم: ٢٢٣٨، والترمذي: ٢٢٥٠، وابن حبان: ٢٩٨٧عن جابر بن عبدالله).

---

(١) محاسن التأويل ، ج٧، ص (٧٦ تا ٧٨).

واتـە: سـەد سـاڵ تێناپـەڕێ، کـە لەسـەر زەوی، هیـچ کام لـەو مرۆڤانـەی ئێسـتا هـەن، یەکێکیـان بمێنـێ.

واتـە: ئـەو جیلـە کـە لـە ڕۆژگاری پێغەمبـەر ﷺ دابـوون، دوای سـەد (١٠٠) سـاڵ {ئنجـا ئایا سـەد ساڵەکە بـە دیارییکراویـی، یاخـود سـەد سـاڵ، شـتێك کەمـتر، شـتێك زیاتـر} هیچیـان نامێنـن.

ئەمـەش ئـەوە دەگەیەنـێ کـە هیـچ مرۆڤێـك لەسـەر زەوی نەمـاوە، لـە سـەردەمی پێغەمبـەردا ﷺ دوای سـەد (١٠٠) سـاڵ کـە تێپەڕیـوە و گـوزەراوە.

## بەسەرهاتێکی خۆش :

لێرەدا بـۆ مەسـەلەی ئـەوە کـە هەنـدێ خەڵـك جـاری وایـە جینییـەك دەبینـێ، وا دەزانێ: (خـضر) {خـدری زیندە}یـە، منیـش قوڵـە نەزیلەیـەك بگێڕمـەوە، باشـە:

کاتێ خـۆی - لـە سـاڵانی: ١٩٨٦ - ١٩٨٧ ز دا - لـە دێیـەك مـەلا بـووم، ئـەو کاتـە لـە ڕژێـم قاچـاغ بـووم، لـە گونـدی {گەڵـووی ماخـۆ بزنـان} زۆر کـەس هاموشـۆی منیـان دەکـرد، دۆسـت و بـرا و ئاشـنا، لـە هەولێـر و سـلێمانیی و پشـدەر و بیتوێـن و لـە زۆر لـە شـوێنی دیکـەوە، عـەرەب و کـورد و تورکـمان دەهاتـن، ئـەوەی کـە لـە ڕژێـم قاچـاغ دەبـو و خـۆی لـەلای ئێمـە حەشـار دەدا و، هەبـوو لـە ماڵـی ئێمـە دەمایـەوە و، هەبـوو بەڕێـمان دەکـرد بـۆ ئـەو دیـو (ئێـران) هەروەهـا هـی وابـوو لـەو دیـوەوە دەهاتـەوە، ئنجـا جارێکیـان برادەرێکـم هاتبـوو، کـەشی زسـتان بـو و، سـەرما بـوو، ئەویـش باڵتـۆی لەبـەر بـوو، باڵتۆکـەی کڵاوی هەبـوو، خۆشـیی ڕیشـێکی هەبـوو کڵاوەکـەی داخسـتبوو، تەنیـا ڕیـشی و تۆزێـك لـەدەم و چـاوی دیـار بـوو، لـە دەشـتی لای گونـدی (دووگۆمـان) گەیشـتبووە شـوانێك، لـە نێـو خەڵـکی عەوامیـش دا بـاوە: خـدری زینـدە هەیـە، ئەویـش کـە خـۆی بـۆی گێڕامـەوە گـوتی: بەئامـاژە بانگـی شـوانەکەم کـرد، بـە بـێ قسـەکردن، شـوانەکەش بـە لامـەوە هـات و بـە پارێـزەوە گـوتی: قوربـان جەنابـت کێـی؟

گوتم: نامناسی؟

گوتی: نەخێر.

گوتم: من خدرم، خدر! گوتی: خدری زیندە؟

گوتم: بەڵێ.

گوتی: دەبێ شتێکم بە موتفەڕك وێبدەی.

دیارە ئێمە نانمان وێدا بوو بۆ ڕێیە، گوتی: لە نانەکە کە لە گیرفانمدا بوو، هەندێکم هەڵگوشی و هەندێك وردە نانم وێدا و، گوتم: ها ئەوە بڵێ: خدر وێداوم!

ئنجا دوایی ئەو شوانە، چوو بۆوە دێیەکەی خۆیان و گوتبووی: ئەمڕۆ خدری زیندەم بینی و، ئەوەندە نانەشی وێداوم، وەك موتفەڕك و تەوقەم لەگەڵدا کرد، - لە نێو خەڵکدا واباوە کە (خدری زیندە) ئێسك لە بەدەنیدا نیە و نەرمە - ئەویش گوتبووی: تۆقەم لەگەڵدا کرد و، ئێسك لە بەدەنیدا نەبوو، نەرم بوو.

بە هەرحاڵ وەك (ابن تیمیة) گوتوویەتی و منیش زۆرم پێ ڕاستە: دەگونجێ یەکێك لە جینن - بەڵکو مرۆڤێکیش وەك ئەو بەسەرهاتەی گێڕامەوە - خۆی بەرێتە سەرشێوەیەك و بە خەڵك بڵێ: من فلانە کەسم، یان فریشتەم، یان خضرم، ئەگەرنا لە ڕاستییدا ئەو بەندە چاکە لە سەردەمی مووسادا ﷺ بووەو، لەگەڵ ئەو جیلەش کە لە سەردەمی مووسادا بووە و کۆتاییان هاتوە و، ئەویش کۆتایی هاتوە و بڕاوەتەوە، چونکە هیچ بەڵگەیەکمان بە دەستەوە نیە لەسەر مانەوەی و بەردەوام بوونی ژیانی.

## مەسەلەی دووەم: زانیاریی پەنهان:

لە بارەی {زانیاریی پەنهان}ەوە کە بە (العلم اللَّدنِّي) ناسراوە، یانی: ئەو زانیارییەی کە خوا تایبەت بە هەندێ کەسی دەبەخشێ (أبو حامد الغزالي) ڕەحمەتی خوای لێبێ، دەڵێ:

(إعْلَم أنَّ العلم الإنساني تَحْصِيلُهُ من طريقتين: أ -التعليم لإنساني، ب -والتعليم الرَّباني.

أ- التعليم الإنساني نوعان: ١- خارج، وهو التحصيل بالتعلُّم، ٢- داخِلٌ، وهو الإشتغال بالفكر.

ب- والتعليم الرباني نوعان: ١- الوحي للأنبياء، ٢- الإلهام للأولياء).

واتە: بزانە کە زانیاریی مرۆڤ، لە دوو ڕێیانەوە بۆی پەیدا دەبێ: أ- فێرکردنی مرۆڤ.

٢- فێرکردنی پەروەردگار.

أ- فێرکردنی مرۆڤیش: دوو جۆرە:

١)- لە دەرەوەی خۆی، کە بریتیە لەوەی بچێ زانیاریی لە خەڵك وەربگرێ خۆی فێربکات.

٢)- لە خودی خۆی و لە نێو خۆی دایە، کە بریتیە لە سەرقاڵ بوونی بە بیرکردنەوە.

ب- زانیارییەك کە لە پەروەردگاریشەوە دێ، ئەویش دوو جۆرە:

١- سروش (وحي) بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام).

٢- خورپە و خستنە نێو دڵ بۆ دۆستانی خوا.

(أبو حامد الغزالي) چەند شتێکی دیکەش باس دەکات کە خاوەنی: (محاسن التأويل) لێی دەخوازێتەوە، کە پێم وایە هەندێ لەو قسانەی دەیانهێنێ خوا لێی ببوورێ، جۆرێك لە کەوتنە ژێر کاریگەریی فەیلەسووفەکانی پێوە دیارە، بەڵام بە تەئکید مەبەستی چاك بووە، با لە بێژە و دەربڕینەکەشی دا، نەپێکابێ.

یەکێکی دیکە لەوانە کە زۆر باسی زانیاریی پەنهانی کردوە، بەڵام زێدەڕۆیی تێدا کردوە: (محي الدین بن عربي)ە، لە کتێبی: (الفتوحات المكّية)دا، بۆ وێنە:

ئەوەی لەو بوارەدا بۆ دۆستانی خوا هەیە، ناوی دەنێ: (الوحيُ الإلهاميُّ)!! کە پێم وایە ئەوە زاراوەیەکە خۆی داینـاوە و دایتاشیوە، چونکە ئێمە وەحییمان هەیە تەنیا بۆ پێغەمبەران دێ و، ئیلهامیشمان هەیە کە بۆ دۆستانی خوا دێ، کەواتە: تێکەڵ نین و جیاوازن، شایانی گوتنیشە: ئێمە لە سەرەتای تەفسیری (یونس)دا باسێکی تێر و تەسەلمان دەربارەی وەحیی کردووە ڕوونمان کردۆتەوە، کە وەحیی لە قورئاندا، بە چەند مانایەك هاتوە، بۆ وێنە:

١- بە مانای ئاماژە کردن: ﴿ ... فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا۟ بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿١١﴾ ﴾مريم.

٢- بە مانای ئیلهام: ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ... ﴿٧﴾ ﴾القصص.

٣- بە مانای پەیام ناردن بۆ فریشتەکان: ﴿ إِذْ يُوحِى رَبُّكَ إِلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ ... ﴿١٢﴾ ﴾الأنفال.

٤- بە مانای وەسوەسەی شەیتانەکان: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِىٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِى بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا... ﴿١١٢﴾ ﴾الأنعام.

٥- بە مانای فەرمان پێکردن و بەڕێوەبردن و ئاراستەکردنی خوا ﷻ بۆ دروستکراوەکانی: ﴿ فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ فِى يَوْمَيْنِ وَأَوْحَىٰ فِى كُلِّ سَمَآءٍ أَمْرَهَا ۚ وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفْظًا ۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿١٢﴾ ﴾فصلت.

هەروەها لە سوورەتی (الزلزلة)دا دەفەرمووێ: ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ۝١ وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ۝٢ وَقَالَ ٱلْإِنسَٰنُ مَا لَهَا ۝٣ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ۝٤ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ۝٥﴾.

واتە: خوا فەرمانی پێكردوە، فەرمانێكی پەنهان، چونكە وەحیی یانی: قسەیەكی پەنهان، ئنجا ئەو قسەیە پەنهانە، لە چەند شێوەیەك دا بەرجەستە دەبێ.

٦- بەڵام بە مانای باوو زاراوەیی: (وحي) بریتیە لەو پەیام و سروشەی كە خوا بە تایبەت دەیخاتە دڵی پێغەمبەرانەوە (عَلَيْهِم الصَّلاةُ وَالسَّلَام)، یان بەشێوەیەكی دیكە لە شێوەكانی وەحیی، پەیامیان بۆ دەنێرێ. وەك خوا عز وجل فەرموویەتی: ﴿إِنَّآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ كَمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعْدِهِۦ...﴾ النساء - ١٦٣ - یاخود ڕاستەوخۆ فەرمایشتیان لەگەڵ دا دەكات، وەك هی مووسا ﷺ: ﴿وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَٰهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ ۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ۝١٦٤﴾النساء.

ئیستاش بیروڕاو هەڵوێستی ڕاست و دروست - بەلای منەوە - لەبارەی زانیاریی تایبەت (العلم اللدني) یان: زانیاریی پەنهان (العلم الباطن)ەوە لە چوار بڕگان دا دەخەینە ڕوو:

یەكەم: ئیلهام و خرانە نێو دڵ (خورپە) ڕاستە، بە بەڵگەی ئەو ئایەتە موبارەكەی كە خوا تێیدا دەفەرمووێ: ﴿وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا﴾الكهف، هەروەها لەلایەن خۆمانەوە زانیارییەكی تایبەت و دانستەمان فێركرد بوو.

دەشكونجێ زۆر بەڵگەی دیكە بێنینەوە، بەڵام پێم وایە ئایەتەكە بەس (كافي)یەو وێڕای وێ، ئەم فەرمایشتەش بەڵگەیەكی یەكلاییكەرەوە (حاسِم)ە، لەو بارەوە، كە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: [قَدْ كَانَ يَكُونُ فِي الأُمَمِ قَبْلَكُمْ مُحَدَّثُونَ، فَإِنْ يَكُنْ فِي أُمَّتِي مِنْهُمْ أَحَدٌ، فَإِنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ مِنْهُمْ] (أخرجه مسلم: ٦١٥٤، والترمذي: ٣٦٩٣).

واتە: لە كۆمەڵگاكان و ئۆممەتانی پێش ئێوەدا خورپە بۆ كراوان (مُحَدَّثُونَ) هەبوون [قسە لەگەڵدا كراوان بە پەنهانیی، ئەوانەی زانیاریان دەخرێتە دڵ]، ئنجا ئەگەر لە ئۆممەتم دا كەسێك هەبێ، ئەوە عومەری كوڕی خەتتاب لەوانە.

ئاشكراشە پێشەوا عومەر (ﷺ) چەند جارێك پێشنیاری بۆ پێغەمبەر ﷺ كردووە، ئایەت بە پشتگیریی پێشنیارەكەی وی هاتۆتە خوار، كە بێگومان ئەوە ئیلهام و خرانە

نێو دڵ بووە، هەروەها لە کۆی ژیانی عومەردا (ﷺ) ئەو حاڵەتە زانراوە و، عومەر (ﷺ) باشترین بەرجەستەکەری حاڵەتی ئیلهام بووە، ئەگەرنا بەدڵنیایی خەڵکی دیکەش هەر هەبووە و هەشە و، ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ خاڵیی نابێ لەو جۆرە کەسانە، کە خوای بەخشەر کەم و زۆر، ئەو بەهرەیان پێدەدا.

ئاشکراشە کە زانیاریی تایبەت (العلم اللدني)، دوو ڕێی سەرەکیی هەن: ١- خەون (رؤیا) ٢- خورپە (إلهام).

**دووەم: هیچ کام لە خەون (رؤيا) هەروەها خورپە (إلهام) بە بەڵگەی شەرعیی دانانرێن و، شەریعەتی پابەندکەر (مُلزِم)ی خوا بۆ هەموو لایەك، تەنیا وەحیی بەرجەستەیە لە قورئان و سوننەتدا، بەڵام ئەوی دیکە: فڵان کەس خەونێکی وای بینی، یان: فڵان کەس دەڵێ: فڵان شتە خراوەتە نێو دڵی، ئێمە چۆن بزانین ئەوەی لە خەون دا دیتوویەتی، یان ئەوەی هاتۆتە نێو دڵی، لە خواوەیە و لە فریشتەوەیە، نەك لە شەیتانەوە؟! چونکە خوای پەروەردگار وەك چۆن باسی ئیلهامی فریشتەکان دەکات، وەك فەرموویەتی:**

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَبۡشِرُواْ بِٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحۡنُ أَوۡلِيَآؤُكُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ وَلَكُمۡ فِيهَا مَا تَشۡتَهِيٓ أَنفُسُكُمۡ وَلَكُمۡ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾﴾ فصلت.

ئەوە هەمووی باسی ئیلهامە، کە دەفەرموێ: ئەوانەی گوتیان: پەروەردگارمان خوایە، ئنجا ڕاوەستاویشیان هەبوو (لەسەر ئەوە دامەزراوو بەردەوام بوون) فریشتەکان دادەبەزنە سەریان (پێیان دەڵێن:) ترستان نەبێ و پەژارەتان نەبێ و، دڵخۆش بن بەو بەهەشتەی پێشتر بەڵێنتان پێ دەدرا، ئێمە دۆست و پشتیوانتانین لە ژیانی دنیادا، لە ڕۆژی دواییشدا...

ئنجا ئەوانەی فریشتەکان ئەو مانا و مەبەستانەیان دەخەنە نێو دڵ، ئەوانە دۆستانی خوان.

بەڵام بە هەمان شێوەش خوای زانا و کارزان باسی قسەی پەنهانی شەیتانەکانیشی کردوە بۆ دۆستەکانیان کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا جَعَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٧﴾﴾ الأعراف، واتە: ئێمە شەیتانەکانمان کردوون بە دۆستی ئەوانەی بڕوا ناهێنن، ئنجا ئایا ئەو شەیتانانە چی دەکەن بۆ دۆستەکانیان؟! خوا دەفەرموێ:

﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١١٢﴾ ﴾الأنعام، واتـە: هـەر بـەو شێوەیە بـۆ هـەر پێغەمبەرێـك دوژمنێکـمان ڕەخسـاندوە: شـەیتانەکانی ئادەمیـزاد و جنـد، هەندێکیـان قسـەی ڕازاوەی فریـودەر بـە پەنهانیـی بـۆ هەندێکیـان دەنێـرن، کـە دیـارە مەبەسـت پێـی شـەیتانە جندەکانـن خوتخوتـە بـۆ مرۆڤـەکان دەکـەن و قسـەی فریودەریـان بـۆ دەنێـرن.

هەروەهـا لـە سـوورەتی (الأنعام)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَٰدِلُوكُمْ ۖ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴿١٢١﴾ ﴾، واتـە: بێگومـان شـەیتانەکان وەحیـی دەکـەن، بـۆ دۆسـتەکانیان، تاکـو شـەڕە قسـە و مشـت و مڕتـان لەگەڵـدا بکـەن، ئنجـا ئەگـەر ئێـوە فەرمانبەرییـان بکـەن (لـە حـەڵاڵ و حەڕامـدا) بێگومـان ئێـوە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرن، کەواتـە: شـەیتانەکانیش وەحیـی دەکـەن، واتـە: قسـەی پەنهـان دەنێـرن بـۆ دۆسـتەکانی خۆیان.

ئایـا ئینسـان چ کاتێـك وای لـێ دێ لـە فریشـتان نیزیـك بـێ و، چ کاتێـك وای لێـدێ لـە شـەیتانان نیزیـك بـێ، کـە ئەگـەر لـە فریشـتان نیزیـك بـێ، فریشـتەکان ئیلهامـی چـاکی دەخەنـە دڵ، بەخورپـە و بیرۆکـە و بڕیـاری چـاك و بەرچـاوی ڕوون دەکـەن، بـە هـەق و بـە بـاری دینداریـی و خواپەرسـتیی و چاکەکارییـدا، بـەڵام ئەگـەر لـە شـەیتانەکان نیزیـك بـێ، خوتخوتـە و خەیاڵـی خـراپ و دنـەدانی خراپـی دەخەنـە نێـو دڵ، بـەرەو دوور لـە خوایـی و خراپەکاریـی دەڕوات؟! بەدڵنیایـی مـرۆڤ بـە ئیـمان و تاعـەت و تەقـوا، لـە خـوا نیزیـك دەبـێ و، بـە کوفـر و تـاوان و خراپەکاریی، لـە شـەیتانەکان نیزیـك دەبـێ، بـە بەڵگـەی ئـەوە کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ ﴾یونـس، واتـە: ئاگاداربـن! دۆسـتانی خوا نەترسـیان لەسـەرە و، نـە خـەم و پـەژارەش دادەگـرن، [یانی: نـە بـۆ داهاتـوو ترسـیان لەسـەرە و، نـە بـۆ ڕابـردووش پـەژارە دادەگـرن] ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە [بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی، پێویسـتە بڕوایـان پێبهێنـرێ و، عادەتیشـیان وابـوو] پارێزیشـیان دەکـرد.

یـانی: ئیمانیـان هەبـوو، وەك حاڵـەتی دەروونیـی: ئیـمان لـە دڵیانـدا چەسـپا بـوو، وەك حاڵـەتی ڕواڵەتییـش: پارێزیـان دەکـرد و فەرمانبـەر بـوون بـۆ خـوا و پابەنـد بـوون بـە شـەریعەتی خـواوە.

بـە نسـبەت ئەهـلی کوفریشـەوە، خـوا ئـاوا پێناسـەیان دەکات: ﴿ ... إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٧﴾ وَإِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً قَالُوا۟ وَجَدْنَا عَلَيْهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا ۗ

﴿قُلْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾﴾الأعراف، واتە: ئێمە شەیتانەکانمان کردوونە دۆستی ئەوانەی بڕوا ناهێنن و، ئەگەر کردەوەی نا قۆڵاش بکەن، دەڵێن: باب و باپیرانمان لەسەری بینیوە و، خوا فەرمانی پێکردووین، بڵێ: خوا فەرمان بە دزێوو ناقۆڵا ناکات، ئایا شتێك بەناوی خواوە دەڵێن، کە نایزانن؟! خوا بە درۆیان دەخاتەوە، کە نەخێر خوا فەرمان بە شتی خراپ ناکات، بەڵێ، کە دەڵێن: باب و باپیرانتان لەسەری بینیوە، ڕاست دەکەن، بەڵام شتێکی ناڕەوایە بە دوای شتێکی باب و باپیران و پێشینانی خۆت بکەوی، لە شتێکدا، کە دەزانی بە هەڵەدا چوون.

سێیەم: لە بارەی زانیاریی تایبەت (العلم اللدنّي)یەوە، بێگومان ئەوەش ڕاستە، کە مرۆڤ هەتا دەروونی خۆی ساغتر و پاکتر و چاکتر بکات، زیاتر ئامادەی وەرگرتنی خورپە (إلهام) دەبێ، وەك خوا ﷻ لە سووڕەتی (الأنفال)دا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تَتَّقُوا اللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا وَيُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ ﴿٢٩﴾﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەر پارێز لە خوا بکەن، خوا جیاکەرەوەتان پێدەبەخشێ، {واتە: حاڵەتێك کە هەق و ناهەق، چاك و خراپ، ڕاست و چەوتی، پێ لە یەك جیا دەکەنەوە.} هەروەها لێتان دەبووریّ و خواش خاوەنی بەخششی مەزنە.

لە کۆتایی ئەم بابەتەش دا دەڵێین: بەداخەوە مسوڵمانان، زۆرجار لە ئەنجامی دوورکەوتنەوەیانەوە لە قورئان و سوننەت و، دوورکەوتنەوەیان لە چاك و ڕاست تێگەیشتن لە بەرنامە و شەریعەتی خوا ﷻ، مل دەدەنە شتی پڕوپووچ و ئەفسانەیی و، تفەنگ بە تاریکییەوە نان، کە خوا هیچ بەڵگەی لەسەر نەناردۆتە خوار، هەر بۆیەش زانایان گوتوویانە: خوا عزوجل پارێزراویی لە قورئان و سوننەتدا بۆ دەستەبەر کردووین، بەڵام پارێزراویی لە هەڵەی، لە غەیری قورئان و سوننەت دا بۆ دەستەبەر نەکردووین: {قد ضَمِنَ اللّه لنا العصمة في القرآن والسنة، ولم يَضْمَنْها لنا في غيرهما}.

کەواتە: کەسێ بیەوێ لە هەڵە و لادان پارێزراو بێ، دەبێ هەوڵبدات: چاك لە قورئان تێ بگات، پاشان لە ڕێباز و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ کە وەك زۆرجار گوتوومانە و لێرەش دەیڵێینەوە: سوننەتی پێغەمبەریش ﷺ ئەو ڕێبازەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوو توێیدا قورئانی بەرجەستە کردوە و، لەسەر ئەرزی واقیع، جێبەجێ و پراکتیزەی کردوە، لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و، کۆمەڵایەتیی و، سیاسییدا.

بەڵێ تاکە شتێك کە وادەکات مسوڵمانان سەلامەت و پارێزراو بن، لە لادان و، لە گیرۆدە بوون بە بیر و بڕوای پڕوپووچ و ئەفسانەیی، ئەوەیە کە هەرچی زیاتر هەوڵبدەن لە قورئان تێبگەن، پاشان بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاشنابن و، بە ڕێبازەکەیدا قووڵببنەوە و، پێیەوە پابەندبن، ئا ئەوە دەبێتە هۆکاری ئەوە کە بیانپارێزن لەوەی بەملاولادا بڕۆن، تووشی سەرگەردانیی و، سەراسیمەیی بن، هەر بۆیەش بە درێژایی مێژوو کەسانێك لە قورئان و سوننەتەوە نیزیکتر بوون، سەلامەتتر بوونە لە لادان و، ئەوانەی کە دوور کەوتوونەتەوە، وەك زۆرێك لە خەڵکی عەوام و، هەندێك لە ئەهلی تەصەووف، - ناڵێم هەموویان[1]- تووشی لادان و خلیسکانی زۆری سەیروسەمەرە بوون.

بەڵێ تەنیا ئەوانەی پابەند بوون بە قورئان و سوننەت و شەریعەتەوە، دوور بوون، لە بیرۆکەی پووچ و ئەفسانەیی، ئەگەرنا بێگومان وەك چۆن پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاةُ وَالسَّلام) موعجیزەیان هەبووە، دۆستانی خواش کەرامەتیان هەبووە، بەڵام گەورەترین کەرامەت بریتیە لە پابەندیی بە شەریعەتەوە، بەڵام وێڕای ئەوەش لە بەرەکەتی پابەندیی بە شەریعەتەوە، جاری وایە خوای پەروەردگار بۆ هەندێ لە دۆستەکانی، ئەگەر حیکمەتی بیخوازێ، هەندێ شت کە بۆ خەڵکی دیکە ناتاساییە، لەسەر دەستیان پەیدا دەبێ، یان شتێك دەزانن بێ ئەوەی خەڵکی دیکە بیزانێ، چ لە حاڵەتی بێداریی و، چ لە حاڵەتی خەونیدا، یان هەندێ شت دەکەن، کە خەڵکی دیکە پێی ناکرێ، ئەوانە هەموویان هەن، بەڵام هەر کەسێك ئەو شتانەمان لێی بینین، ئەگەر پێش بینینی ئەو شتانە، پابەندیی تەواومان تێدا نەبینی بە قورئان و سوننەتەوە، دەبێ لەو شتانەشی بکەوینە گومانەوە و، مەرج نیە لە خواوە بن و، مەرج نیە نیشانەی ڕێز لێگرتنی خوا بن بۆ ئەو بەندەیە، بەڵکو دەبینی ئەوە لە جادووەوەیە، یاخود لە جۆرێك: مەشق و ڕاهێنانی ڕووحییەوەیە، وەك مورتازە هیندۆسییەکان و، بووزاییەکان، گەلێ شتی سەیر و عەجایب دەکەن، بەڵام ئەوە نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو کەسە، یان ئەو جۆرە کەسانە، دۆستی خوان و لە خوا نزیکن.

---

(١) وەك لە کتێبی: (ڕێگای صاڵح بوون و بەرە و خوا چوون) و لەو مەوسووعەیەی کە لە (سجن)دا نوسیومە گوتوومە: پێشەوایانی زانستی تەزکیەی نەفس و ڕێبازەکانی تەصەووف، زۆر لە قورئان و سوننەت و شەریعەتدا، شارەزا بوون و گوتووشیانە: هەر کەسێك کردەوەکانی موافیقی قورئان و سوننەت نەبن، ئەگەر بینیتان لەسەر ئاوێ ڕۆیی، یان بە باڵان فڕی، بایی فلسێکە، چونکە دەگونجێ لە ڕێی شەیتانەکانیشەوەو، لە ڕێی جادووشەوە، ئەو جۆرە شتانە کە یاسا دڕن (خارق العادة)ن، ئەنجام بدرێن، کەواتە: سەنگی مەحەك و پێوەر، بریتیە لە پابەندیی بە قورئان و سوننەت و شەریعەتەوە.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی پارمەتییمان بدات: هەرچی زیاتر شارەزابین لە قورئان و سونەت دا و پێیان ئاشنابین و، هەرچی باشتر، پێیانەوە پابەند بین، تاکو لە دنیادا سەلامەت و پارێزراوبین لە عەیبداری و تاوان و، لە دوارۆژیشدا سەلامەت و پارێزراوبین لە گوناهباری و سزادران.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە شازدە (١٦) ئایەت پێکهاتووە، ئایەتەکانی: (٨٣ - ٩٨)، ئەو شازدە ئایەتە، هەموویان باسی (ذو القرنین) دەکەن، پوختەی بەسەرهاتەکەیشی ئەوەیە: کە ئەو پیاوە بابایەکی بڕوادار بووە و خوا ﷻ توانایەکی مەعنەویی و ماددیی باشی بۆ ڕەخساندوەو، زۆربەی جیهانی ئەو کاتی، هێناوە ژێرباری خۆی، ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات و، نێوان دوو چیایەکان، بەرەو باکوور، ئنجا ئەو حوکمڕانە: زۆر دادگەر و چاکەکار بووە و، دژی ستەمکاران بووە و، دۆستی هەژاران و چەوساوان بووە، گرنگترین کاریشی بریتی بووە لە دروستکردنی بەربەستێك لە نێوان یەئجووج و مەئجووج و، گەلێکی دیکەی هەژار و دواکەوتوودا، کە یەئجووج و مەئجووج ستەمیان لێ کردوون و، بەهۆی ئەو بەربەستەوە، کە (ذو القرنین) دروستی کردوە، ئەو خەڵك و گەلە هەژار و دواکەوتووە، لە شەڕو تێکدانی یەئجووج و مەئجووج پارێزراو و سەلامەت بوون.

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ ۖ قُلْ سَأَتْلُوا۟ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴿٨٣﴾ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِى عَيْنٍ حَمِئَةٍ وَوَجَدَ عِندَهَا قَوْمًا ۗ قُلْنَا يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا ﴿٨٦﴾ قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨٧﴾ وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴿٨٨﴾ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَىٰ قَوْمٍ لَّمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتْرًا ﴿٩٠﴾ كَذَٰلِكَ وَقَدْ أَحَطْنَا بِمَا لَدَيْهِ خُبْرًا ﴿٩١﴾ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٩٢﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا ﴿٩٣﴾ قَالُوا۟ يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴿٩٤﴾ قَالَ مَا مَكَّنِّى فِيهِ رَبِّى خَيْرٌ فَأَعِينُونِى بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا ﴿٩٥﴾ ءَاتُونِى زُبَرَ ٱلْحَدِيدِ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيْنَ ٱلصَّدَفَيْنِ قَالَ ٱنفُخُوا۟ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارًا قَالَ ءَاتُونِىٓ أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا ﴿٩٦﴾ فَمَا ٱسْطَٰعُوٓا۟ أَن يَظْهَرُوهُ وَمَا ٱسْتَطَٰعُوا۟ لَهُۥ نَقْبًا ﴿٩٧﴾ قَالَ هَٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّى ۖ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ رَبِّى جَعَلَهُۥ دَكَّآءَ ۖ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّى حَقًّا ﴿٩٨﴾ ﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

[هەروەها لە بارەی (هەواڵی) ذیلقەرنەینەوە لێت دەپرسن، بڵێ: (هەندێک) لە باس و خواسی ویتان بەسەردا دەخوێنمەوە ﴿٨٣﴾ ئێمە ئەومان لە زەمیندا دەست ڕۆیشتوو کرد بوو، ڕێگا و هۆکاری هێنانە دی هەر ئامانجێکیشمان بۆ ڕەخساند بوو ﴿٨٤﴾ ئیدی هۆکارو ڕێی گرتەبەر ﴿٨٥﴾ هەتا کاتێک گەیشتە شوێنی خۆر لێ ئاوابوون، خۆری وا هاتە بەرچاو، کە لەسەرچاوەیەکی قوڕی ڕەشی بۆگەن (باتلاغ)دا، ئاوا دەبێ و، لەو شوێنەش خەڵکێکی لێ هەڵکەوت، گوتمان: ئەی ذەلقەرنەین! (بۆت هەیە) کە یان سزایان بدەی، یان چاکەکارییان تێدا ڕەچاو بکەی ﴿٨٦﴾ گوتی: کەسێک ستەم بکات، مسۆگەر ئێمەش ئازاری دەدەین و، دوایی دەگێڕدرێتەوە لای پەروەردگاری، سزایەکی سەخت و بێڕەزای دەدات ﴿٨٧﴾ بەڵام کەسێک بڕوای هێنابێ و کردەوەی باش بکات، (لە لای خوا) پاداشتی هەرە چاکی هەیە و، بە دڵنیایی، ئێمەش لە لایەن خۆمانەوە، قسەیەکی خۆش و ڕەفتارێکی ئاسانی لەگەڵدا دەکەین ﴿٨٨﴾ دوایی هۆکار و ڕێی گرتەبەر ﴿٨٩﴾ هەتا کاتێک گەیشتە شوێنی هەڵهاتنی خۆر، خۆری وا لێهەڵکەوت کە لەسەر خەڵکێک هەڵدێ، هیچ پۆشەرێکمان بۆ نەڕەخساند بوون [کە تیشکی خۆریان لێ بگێڕێتەوە] ﴿٩٠﴾ ئاوا بەو شێوەیە (ذولقەرنەینمان باڵادەست کرد) و ئێمە بە تەواویی شارەزای هەرچییەک بووین کە لە لای بوو (لە هۆکارەکانی حوکمڕانیی و دەستڕۆیشتوویێتیی) ﴿٩١﴾ دوایی (دیسان) ڕێ و هۆکاری گرتەبەر ﴿٩٢﴾ هەتا کاتێک گەیشتە نێوان دوو (چیایە) بەربەستەکە، لە پێشیانەوە خەڵکێکی لێ هەڵکەوت، نزیک بوو لە قسە تێنەگەن ﴿٩٣﴾ گوتیان: ئەی ذەلقەرنەین! بە دڵنیایی یەئجووج و مەئجووج تێکدەرن لە زەوییدا، ئنجا ئایا پیتاکێکت بۆ کۆبکەینەوە، لە بەرانبەر ئەوەدا، کە بەربەستێک لە نێوان ئێمە و ئەواندا دروست بکەی؟ ﴿٩٤﴾ گوتی: ئەوەی پەروەردگارم تێیدا دەستڕۆیشتووی کردووم (لەوەی ئێوە کۆی دەکەنەوە) باشترە، بەڵام بەهێز (دەستی کار) هاوکاریم بکەن، بەربەستێکی مەحکەمتان لە نێواندا دادەنێم ﴿٩٥﴾ پارچە ئاسنانم بۆ بێنن، (ئیدی پارچە ئاسنەکانی لەسەر یەک کەڵەکە کردن) هەتا کاتێک نێوان دوو چیایەکەی پڕکرد، لە پارچە ئاسنی لەسەر یەک کەڵەکە بوو، گوتی: (بە مووشە دەمان) فووی لێ بکەن (لە ئاگری ژێر پارچە ئاسنەکان)، هەتا کاتێک (سوور بۆوە و) کردیە ئاگر گوتی: مسم بۆ بێنن، بەسەریدا قاڵی بکەمەوە

﴿٩٦﴾ (ئیدی بەربەستێکی مەحکەمی وای دروستکرد) کە یەئجووج و مەئجووج نەیانتوانی پێیدا هەڵگەڕێن و، نەشیانتوانی کونی تێبکەن ﴿٩٧﴾ (ذولقەرنەین) گوتی: ئەمە بەهۆی بەزەیی پەروەردگارمەوە بۆم کرا، ئنجا هەر کات بەڵێنی پەروەردگارم هات، تەخت و یەکسانی دەکات و، بەڵێنی پەروەردگاریشم ڕاستە ﴿٩٨﴾.

## ئشیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(مَكَّنَّا لَهُۥ فِي ٱلْأَرْضِ): واتە: دەستڕۆیشتوومان کرد بوو، پێ چەسپاومان کردبوو لە زەویدا، دەستەڵاتمان پێ دابوو. (أَمْكَنَهُ مِنَ الشَّيء: جَعَلَ لَهُ عَلَيْهِ سُلطَاناً وَقُدْرَةً، وأَمْكَنَ الأَمْرُ فُلاَناً: سَهُلَ عَلَيْهِ، وَمُكِّنَ له فِي الشيء: جُعِلَ لَهُ عَلَيْهِ سُلطَاناً). (أَمْكَنَهُ مِنَ الشَّيء) واتە: دەستەڵات و توانای بەسەریدا شکاند، (وأَمْكَنَ الأَمْرُ فُلاَناً) واتە: کارەکەی بۆ ئاسان بوو، (وَمُكِّنَ له فِي الشيء) واتە: لەسەری باڵا دەستکرا (لەسەر ئەو شتە دەستڕۆیشتوو کرا).

(سَبَبًا): (السَّبَبُ: الحَبْلُ وَكُلُّ شيء يُتَوَصَّلُ بهِ إلى غَيْرِه)، (سبب) واتە: پەت، گوریس و، هەر هۆکارێك پێی بگەیشترێتە شتێکی دیکە (ئامراز)، هەروەها دەشخوازرێتەوە بۆ مانای ڕێگا (يُسْتَعَارُ للطَّرِيق)، (مَا لِي إلَيكَ سَبَبٌ: طريق) واتە: هیچ ڕێم نیە بۆ لای تۆ.

(وَجَدَهَا): (وَجَدَ مَطْلُوبَهُ، وَجْداً ووِجْدَةً وَوجُوداً وَوِجْداناً: أي أدْرَكَهُ) واتە: تووشی بوو، پێی گەیشت، وە دەستی هێنا (ئەو شتەی بەدوای دا دەگەڕا)، (وَجَدَ الضَّالَّةَ) واتە: ئەو ئاژەڵەی لێی ون بوو بوو دۆزییەوە، (ووجد الشَّيءَ كَذَا أي: عَلِمَهُ) لە زمانی عەرەبی دا دەڵێ: (وَجَدَهُ كَذَا) واتە: ئاوا زانی، زانیی کە ئەو شتە ئاوایە، (أوجد اللّه الشيء: أنْشَأَهُ) خوا ئەو شتەی پەیدا کرد، لێرەدا (وَجَدَهَا) من بەوە لێکم داوەتەوە: لێی هەڵکەوت، چونکە دەڵێ: (وَجَدَهَا أي: صَادَفَهَا) واتە: ئەوی لێ هەڵکەوت (لەو شوێنە ئەوی پەیداکرد).

(عَيْنٍ حَمِئَةٍ): (عَيْن) واتە: سەرچاوە، (الحَمأ) یانی: قوڕێکی ڕەشی بۆگەن، (الحَمَأ: الطِّينُ الأسودُ المُنْتِن)، (وَالقِطْعَةُ مِنهُ: حَمأَة) بەشێك لە قوڕێکی ڕەشی بۆگەن، پێی دەگوترێ: (حَمأَة)، بە قوڕەکە بە گشتی دەگوترێ: (حَمَأ).

(ذي القرنين) کە گەیشتۆتە ئەو شوێنەی خۆری لێ ئاوا دەبێ، وای هاتۆتە بەرچاو، لەبەر ئەوەی کەنار دەریا بووە، یاخود ئەو شوێنە بووە کە دەریای (خەزەر)ی لێیە، لەوێ سەرچاوەی نەوت و گازی لێیە.

ئنجا وا هاتۆتە بەرچاوی کە خۆر چۆتە نێو ئەو کانیی و سەرچاوەوە، کە لە ڕاستیی دا لەبەر چاوی وی وابووە، هەروەك چۆن خۆر لەبەر چاوی ئێمە، هێندەی بێژینگێکە! ئەگەرنا ملیۆنێك و سێسەد هەزار (١٣٠٠٠٠٠) جار هێندەی زەوییە.

(نُكْرًا): (النُّكر: الأَمْرُ المُنْكَرُ أوِ الشَّديد) (نُكر) واتە: کارێکی نەویستراو و خراپ (ناقۆڵا)، هەروەها کارێکی سەخت.

(ٱلسَّدَّيْنِ): (السَّدُّ والسُّدُّ)، هەردووکیان بە مانای بەربەست دێن، (قيل: هُمَا وَاحِدٌ، وَقِيلَ السُّدُّ ما كَانَ خِلقةً، و السَّدُّ ما كان صنعةً، وأصل السدّ: مصدر سَددته وشُبِّه به الموانعُ)، وشەی (سَدّ) و (سُدّ) هەندێکیان گوتوویانە: یەك واتایان هەیە و، هەندێکیان گوتوویانە: (سُدّ) ئەوەیە خوا کردبێ و (سَدّ) ئەوەیە دەستکرد بێت، وشەی (سَدّ)یش چاوگی فیعلی (سَدَدْتُه)یە، (سددته سداً) واتە: گرتم (قەپاتمکرد)، (وشبه به الموانع) ئەو بەربەستانەی کە هەن، چ خوا کردبن، چ دەستکردبن، چوێنراون بە شتێکەوە، کە سەری شتێکی پێ دەگیرێ، یاخود ڕێی شتێکی پێ دەگیرێ.

(خَرْجًا): (الخَرْجُ أعم من الخَراج، وجُعل الخَرْج بإزَاءِ الدَّخْلِ) هەندێکیان گوتوویانە: وشەی (خرج) مانای (خراج)ە، بەڵام وشەی (خَرْج) گشتگیرترە لە (خراج)، کە ئەو باجەیە کۆدەکرێتەوە، (خَرْج) بەرانبەری (دَخْل)ە، کە بە مانای دەستکەوت دێ، (خرج) واتە: ئەوەی کە خەرج دەکرێ و سەرف دەکرێ.

(رَدْمًا): (الرَّدم: سَدُّ الثُّلمَةِ بالحَجَر) (رَدْم) بریتییە لە گرتنی کەلێنی شتێك بە بەرد، (الرَّدمُ: السدُّ العظيم) بە بەربەستێکی مەزنیش دەگوترێ، (رَدْم).

(زُبَرَ ٱلْحَدِيدِ): (زُبَر) کۆی (زُبْرة)یە، (القِطعَةُ الضَّخمَةُ مِنَ الحديد) واتە: پارچەیەکی زەبەلاح لە ئاسن، کەواتە: (ءَاتُونِى زُبَرَ ٱلْحَدِيدِ) واتە: پارچە ئاسنە زەبەلاحەکانم بۆ بێنن.

(ٱلصَّدَفَيْنِ): (صَدَفا الجبلِ: جانباهُ، وَالصَّدَف: كل شيء مرتفع، كالهدف والحائط والجبل)، (صدفا الجبل) واتە: دوولا تەنیشتەکەی چیایەك، (صَدَفْ) هەر شتێکی بەرزە، وەك نیشانە و دیوار و چیا.

(أُفْرِغْ): (أَفرغَ الإناءَ: أخلاه مما فيه، وَأَفْرَغَ الشَّيءَ: ألقاهُ مِنْ وِعَائِه). (أفرغ الإناء) واتە: دەفرەکەی خاڵیی کردەوە لەوەی تێی دا بوو، هەمووی ڕشت، (أفرغ الشَّيءَ: ألقاهُ مِنْ وِعَائِه)، (أفرغ الماءَ) واتە: ئاوەکەی هەموو ڕشت لە دەفرکە و دەفرەکەی لێ خاڵیی کردەوە.

کەواتـە: ﴿ أُفۡرِغۡ عَلَيۡـهِ قِطۡـرٗا ﴾، واتـە: مـسی بەسـەردا دەکـەم، مسـەکە لـەو دەفـرەی تێیدایـە (لـەو شـتەی تێیکـراوە) هەمـووی بەتـاڵ دەکـەم و، بەسـەر پارچـە ئاسـنەکانی دا دەکـەم.

(قِطۡـرٗا): (القِطۡرُ: النُّحَاسُ الذَّائـبُ، والحَديـدُ الذَّائـب)، (قِطـر) هـەم بـە مـسی تـواوە دەگوترێ، هـەم بـە ئاسـنی تـواوە، بـەڵام وا پێدەچـێ زیاتـر مـسی تـواوە بگرێتەوە.

(يَظۡهَـرُوهُ): بەسـەریدا سـەربکەون، (ظَهَـرَ عَـلَى الحَائِـطِ: عَـلاَهُ) (ظَهَـرَ عَـلَى الحَائِـطِ) بەسـەر دیوارەکـەدا سـەرکەوت.

(نَقۡبٗا): (نَقَـبَ الجِلْـد والجِـدَارَ: خَرَقَـهُ، وَالنَّقْـبُ: الخَـرْقُ فِي الجلـد أو الجـدار ونحوهـما)، (نَقَـبَ الجِلْـد والجِـدَارَ) واتـە: پێسـتەکە و دیوارەکـەی دڕیـی (کـونی کـرد)، (نَقْـب) بریتیـە لـە کونێـك کـە لـە پێسـتێك دەکـرێ، یـان لـە دیوارێـك دەکـرێ و لـە وێنـەی ئـەوان.

(دَكَّآءَ): (الـدكَّاء: الأَرْضُ المُسْـوَّاة)، زەوییـەکی تەختکـراو، یەکسـان کـراو، (وَالرَّابِيَـةُ مِـنَ الطِّـيْنِ لَيْـسَ بالغَلِيْظَـة)، گردۆلکەیـەك لـە قـوڕ کـە پتـەو نەبـێ، پێـی دەگوتـرێ: (دَكَّاء)، (والـدَّكُّ: مـا اسـتوى مـن الرَّمْـل) ئـەو لمـەی کـە یەکسـان دەکـرێ، چونکـە ئایەتەکـە بـە هـەردووك جـۆر خوێنراوەتـەوە: (دكاء) و (دَكّ).

بەرێـــزان!

پێـش ئـەوەی مانـای گشـتی ئایەتـەكان بكەیـن، بەبـاشی دەزانـم باسـێك لـە ژێر ناوونیشـانی: [بەسـەرهاتی (ذي القرنـين) و چەنـد زانیارییـەك]دا بكەیـن، ئـەو باسـە دەبێتـە بەرچـاو ڕوونیـی و ڕێ خۆشـكردن، هـەم بـۆ مانـای گشـتی و، هـەم بـۆ مەسـەلە گرنگـەكانی كـە لـەو شـازدە (١٦) ئایەتـەی بەسـەرهاتی (ذي القرنين)یـان گرتوتـە خۆیـان، وەردەگیرێـن.

## بەسەرهاتی (ذي القرنين) و چەند زانیارییەكی[1] مێژووی و جوگرافیی

خوا پشتیوان بێ لە سێ تەوەردا، ئەم بابەتە دەخەینە ڕوو:

### یەكەم: (ذي القرنين) كێ بووە و، كەی بووە؟!

لـەو بـارەوە كـە ئایـا (ذي القرنـين) كـێ بـووە و، لـە چ ڕۆژگارێـك دا بـووە؟ زانایـان ڕاجیایـی و مشـت و مـڕی زۆریـان هەیـە، كـە بـە گشـتی دەتوانیـن بڵێیـن: حـەوت ڕا و بۆچوونـن، كـە ئەمـە پوختـەو گوشراوەكەیانـە:

١- ڕایەك دەڵێ: (ذي القرنين) بریتیە لە (الإسكندر بن فيليبوس المقدوني اليوناني)، ئیسكەندەری كوڕی فیلوپوسیی مەقدۆنیی یونانیی، كە گوایە: دنیای خستۆتە ژێر ڕكێفی خۆی، لە نیزیكەی (٣٢٠) پ.ز دا، واتە: (٣٢٠) ساڵ پێش ئەوەی عیسا عليه السلام لە دایك ببێ، كە هەر ئەو ئەسكەندەرەشە: شاری ئیسكەندەرییەی كە ئێستاش لە میسرە، دروستكردوە، ئەو ئەسكەندەرەش كە لە ئەصڵدا بێژەكە: (إسكندر)ە، بەڵام هەر (أسكندر) زیاتر دەگوترێ، قوتابیی ئەڕەستۆ بووە و ئەڕەستۆش پێی گوتراوە: (المعلم الأول) مامۆستای یەكەم، كە من پێم وایە: ناوێكی زیادەیە لێنراوە، بەڵام كەسانێك كە زۆر بە فەلسەفەكەی سەرسام بوون، ئەو ناوەیان لێناوە، ئنجا ئەو ئەسكەندەرە، ئەوە بووە

---

(١) بۆ نووسینی ئەم باسە بەپلەی یەكەم لەم سەرچاوانە بەهرەمەند بووم:
١- التحرير والتنوير، ج١٦ ص٢٣. ٢- تفسير المراغي، ج١٦ ص١٢ - ١٥.
٣- التفسير المنير، ج١٦ ص ٣٥٨. ٤- تفسير الميزان، ج١٣ ص٣٩٥.
٥- الكتاب المقدس، ص٩٩١.

کە جەنگی لە دژی دەوڵەتی فارس کردوە و، دەسەڵات و حوکمڕانیی پادشا دارای فارسی خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.

ئەم ڕایە ئاوا دەڵێ، بەڵام نەزانراوە: (ئەسکەندەر) هیچ بەربەستێکی دروستکرد بێ و، ئەسکەندەریش بە پێی ئەوەکە مێژوو بۆ ئێمەی باس دەکات، لەسەر ئایینی گریك و یونانییەکان بووە و، ئەوانیش بتپەرست بوون و، چەند پەرستراوێکیان پەرستوون، ئەوە شتێکی زانراو و باوە.

سەرباری ئەوەش:

{ئەسکەندەر} ئەو سیفەتانەی کە خوا لێرەدا بۆ (ذو القرنين)ی باسکردوون، کە ئیلهامی بۆ کردوە و، ئەویش بەپێی ئەوە کە خوا ﷻ ڕێنمایی کردوە، بەڕێوە چووە و، دادگەر بووە و، دژی ستەم بووە و، بەرگریی لە ستەملێکراوان، کردوە، ئەو سیفەتانە بەسەر ئەو ئەسکەندەرەدا ناچەسپن.

٢- بۆچوونێکی دیکە هەیە، دەڵێ: ئەو پادشایە، ئەو (ذي القرنين)ە، (أبو كرب الحميري) بووە و ناویشی (أبو بكر بن أفريقيش) بووە، کە یەکێك بووە لە پادشاکانی دەوڵەتی (حمير) کە لە ساڵی: (١١٥)ی پێش زایین تاکو (٥٥٢)ی دوایی زایین بەردەوام بووە، {(١١٥) بخه سەر (٥٥٢) ٥٥٢ + ١١٥ = ٦٧٠، نیزیکەی (٦٧٠) ساڵ ئەو دەوڵەتە دەوامی کردوە، ئنجا ئەو (أبو كرب الحميري) یەکێك بووە لە پادشایەکانی ئەو دەوڵەتە و، بە حیساب (ذي القرنين)، ئەوبووە، پادشاکانی یەمەنیش پێیان گوتراوە: (تبابعة)، کە کۆی (تُبّع)ە، ئەوەش ڕایەکی دیکەیە، بەڵگەشیان ئەوەیەکە: وشەی: (ذي) و (ذو)، ئەوان بەکاریان هێناون، بەڵام ئەو ڕایەش بەڵگەیەکی وای لەسەر نیە، هەرچەندە هەندێ لە تەفسیرەکان ئەو ڕایەیان تەبەننیی کردوە، بە تایبەتی هەندێ لە نووسەرە عەرەبەکان ڕەنگە زیاتر وەك خۆشویستنی ئەوە، کە ئەو پیاوە گەورە لە نەتەوەی عەرەب بووبێ، دەگونجێ ئەوە هاندەرێکیان بووبێ لە تەبەننیی کردنی ئەو ڕایەدا!!!

٣- بۆ چوونێکی دیکە دەڵێ:

پادشایەك بووە لە پادشایەکانی فارس، کە ناوی: (أفريدون بن ألفيان بن جمشيد)بووە، بەڵام ئەمیش دیسان بەڵگەیەکی وای لەسەر نیە و، گیروگرفتی ئەو پادشا و حوکمڕانانەش بۆ ئەوەی بگونجێن لەگەڵ حاڵی (ذي القرنين)دا، ئەوەیە کە زۆربەیان نەزانراوە، خوا بەیەککر و خوا پەرست و دادگەر و چاکەکار بووبن!

**٤- ڕایەکی دیکە دەڵێ: (ملك من ملوك الصين كان موجوداً في حدود: (٢٤٧) قبل الميلاد، وبلاد الصين كانت متدينة بدين كونفيشيوس المشرّع المصلح).**

**واتە: پادشایەك بووە لە پادشایەكانی چین كە لە دەوری ساڵی (٢٤٧)ی پێش زایین بووە و، وڵاتی چینیش ئەو كاتە لەسەر ئایینی كۆنفیشیوس بوون، كە بابایەکی یاسادانەری چاكسازییكار بووە.**

**ئەم ڕایە (محمد الطاهر بن عاشور) لە تەفسیرەكەی خۆیدا هێناویەتی و تەبەننیی كردوە و گوتوویەتی: ئەو پادشایە ناوی (شینگ هوانگ تی) بووە، كە دیواری چینی دروستكردوە ئەو شووره دوور و درێژەی كە دەكەوێتە نێوان مەنغۆلیا و چینەوە، كە درێژیی ئەو دیوارە سێ هەزار (٣٠٠٠) كیلۆمەترە و، پانییەكەی (٩)مەترە و، بەرزییەكەی (١٥) مەترە، بەڵام كەرستەی سەرەكیی بنیاتنانی ئەو دیوارە، بەرد بووە و لە ساڵی (٢٠٤) پێش زایین دەستی پێكردوە و، لە ماوەی (١٠) ساڵ، یاخود (٢٠) ساڵدا تەواوی كردوە.**

**بەڵام ئەم ڕایەش دیسان ئیشكالی زۆری لە بارەوە هەن:**

**یەك: یەكێك لەوانە ئەو دیوارە (٣٠٠٠) كیلۆمەترییە، جیایە لەوەی كە خوا بۆ (ذي القرنين) باسی دەكات، كە كەلێنی نێوان دوو چیایانی گرتوە!!**

**دوو: پاشان ئەو دیوارە هەمووی بە بەرد و خشت و هاووێنەكانیان دروستكراوە و كەرستەكەی دیارە، بەڵام ئەوەی خوا دەفەرموێ: بە ئاسن و مسیی قاڵكراوە، دروستكراوە!**

**سێ: پاشان ئەو (شیگن هوانگ تیە) دیار نیە كە خاوەنی چ جۆرە ئایینێك بووە.**

**چوار: ئنجا ئەو سەفەرانەی (ذي القرنين) كە خوا لێی دەگێڕێتەوە، كردوونی، دیار نیە ئەو پادشایە ئەو سەفەرانەی كرد بن!**

**٥- ڕایەکی دیکە ئەوەیە: كە ئەو كەسە (كورش الكبير) كۆڕشی گەورە بووە، پادشای (هەخامەنشییەكان) لە نێوان (٥٦٠) تاكو (٥٣٩) پێش زایین دا بووە، كۆڕشی گەورە كە دامەزرێنەری ئیمپراتۆری ئێرانییە و، هەردووك شانشینی فارس و ماددیی كردوە بە یەك و، ئیمپراتۆریەتی ئێرانی لێ پێكهێناون.**

**ئەم ڕایەش یەكەم كەس كە باسیكردوە، واپێدەچێ (مولانا أبو الكلام آزاد الهندي) بووبێ، كتێبێكی هەیە بە ناوی: (ذي القرنين أو الكورش الكبير)، (ذي القرنين) یان كۆڕشی گەورە.**

ئـەم ڕایـەش ژمارەیـەك لـە توێـژەرەوان و ڕوونكـەرەوانی مانـا و مەبەسـتەكانی قورئـان، تەبەننییـان كـردوە و، ئـەم ڕایـە هەنـدێ زانیاریـی دیكـەش پشـتگیریی دەكـەن:

یەك: یەكێك لەوانە: (هێرۆدۆت) مێژووناسی یۆنانیی، زۆر مەدحی كۆڕشی كردوە و دەڵێ: پیاوێكی دادگەر و بەخشندە بووە و، بەرگرییكار بووە لە ستەملێكراوان و، دژی ستەم بووە، هەروەها مێژوو نووسێكی دیكەی یۆنانیی بەناوی (ڤینۆفن) ئەویش زۆر مەدحی ئەو پادشایە دەكات.

دوو: كۆڕشی گەورە، هەندێ سەفەری كردوون، بەرەو ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات و باكوور، واتە: لەگەڵ ژیان و سەفەرەكانیشدا دەگونجێ.

سێ: لە چەند كتێبێكی پەیمانی كۆندا هاتوە، كە زۆر مەدحی كۆڕش دەكەن و، جوولەكەكان بە گشتی زۆر ڕێزی دەگرن، چونكە كۆڕش جوولەكەكانی لە ژێر چنگی بابلییەكان كە بەدیلیان گرتبوون و، لە فەلەستینەوە هێنابوویانن، دەریاندێنێ و دەربازیان دەكات و، دەیانگێڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆیان و بە ماڵ و سامانیش هاوكارییان دەكات، تاكو هەیكەلی سولەیمان تازە بكەنەوە و، ئەو شتانەی كە لێیان زەوتكراون، لە ماڵی بە قیمەت و لە شتی نایاب، كە پادشاكانی بابل خستوویاننە نێو خەزێنەكانی خۆیانەوە، ئەوانەشیان بۆ دەگێڕێتەوە، بۆ وێنە: لە (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر العزراء، الإصحاح: ١، ص٩٩١) لە ژێر ناوونیشانی: (نداء كورش) بانگەوازی كۆڕش دا، ئاوا دەڵێ:

(في السـنة الأولى لحكـم كـورش، ملـك فـارس، وإتمامـاً لـكلام الـرب الـذي نطـق بـه عـلى لسـان إرميا، نبَّـه الـربُّ روَح كـورش، فأصـدر نـداءً مكتوبـاً في كل أرجـاء مملكتـه: هـذا مـا يقولـُهُ كـورش ملـك فـارس: لقـد وهبنـي الـربُّ إلـه السـماء، جميـعَ ممالِـك الأرض وأوصـاني أن أُشـيد لـه هيـكلاً في أورشـليم في مملكـة يهـوذا، فعـلى كلُ واحـد مـن أبنـاء شـعبه، ليكـن الـربُّ معـه أن يصعـد إلى أورشـلم في يهـوذا فيبنـي هيـكل الـرب إلـه إسرائيـل...).

واتـە: بانگـەوازی كـۆڕش: لـە سـاڵی یەكەمـی حوكمڕانیـی كۆڕشـدا، پادشـای فـارس، بـۆ تەواوكـردن و هێنانـەدی فەرمایشـتی پـەروەردگار، كـە خـوا لەسـەر زمـانی ئیرمیـا [كـە بـە پێـی پەیـمانی كـۆن: ئەویـش یەكێـك بـووە لـە پێغەمبـەرانی بـەنی ئیسـڕائیل] ئەمـەی ڕاگەیانـد بـوو، كـە پـەروەردگار ڕووحـی كـۆڕشی ئـاگادار كـردەوە [واتـە: ئیلهامیـی بـۆ كـرد] ئەویـش بانگەوازێـكی بڵاوكـردەوە بـە هەمـوو گۆشـە و كەنـاری وڵاتەكەیـدا، كـە ئەمـە نێوەڕۆكەكـەی بـوو: ئەمـە ئەوەیـە كـە كۆڕش پادشـای فـارس دەیڵـێ: پـەروەردگار پەرسـتراوی ئاسـمان، هەموو وڵاتـەكانی سـەر زەوی بـە مـن بەخشـیون، [واتـە: دەسـتی ئـاوەڵا كـردووم كـە دەسـت بەسـەر

هەموویانـدا بکـرم و) و ئامۆژگاریـی کـردووم کـە هەیکەلێـکی لـە ئۆرشـەلیم بـۆ دروسـت بکـەم لـە پادشانشـینیی یەهـوودادا لـە فەلەسـتین، بۆیـە پێویسـتە لەسـەر هـەر کام لـە رۆڵـەکانی ئـەو گەلـە، (واتـە: گـەلی یەهـوودا) بـا پـەروەردگار لەگەڵیـان بـێ، کـە بچێتـەوە سـەرکەوێ بـۆ ئۆرشـەلیم و، لـەوێ هەیکـەلی پـەروەردگار، پەرسـتراوی ئیسـرائیل بنیاتبنێـن.

کـە ئەمـە بەڕاسـتیی نێوەڕۆکەکـەشی، لەگـەڵ ئـەوەدا کـە خـوا دەربـارەی (ذي القرنـين) فەرموویـەتی، دەگونجـێ کـە بەرەو ڕۆژئـاوا و ڕۆژهـەڵات و باکوور چووە، خـوای پەروەردگاریش ئیلهامـی بـۆ کـردوە، تاکـو هەندێـك گوتوویانـە: (ذي القرنـين) وا پێدەچـێ پێغەمبـەر بووبـێ، وایانزانیـوە کـە ئـەوەی خـوا دەفەرمـوێ: ﴿قُلْنَا يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ﴾، ئـەوە بەوەحیـی بـووە.

بـەڵام خـوا بـاسی نەکـردوە کـە پێغەمبـەر بـووە و، وا پێدەچـێ یەکـێ بـوو بـێ لـە دۆسـتانی خـوا و، خـوای زانـا ئیلهامـی بـۆ کـردوە و خستوویەتە نێـو دڵـی، ئنجـا ئـەوەی کـە لـە پەیـمانی کۆنیشـدا لـە: (سـفر)ی (عـزراء)دا هاتـوە، ئـەوەی کـە لـە قوڕئانـدا هاتـوە، تێکدەکاتـەوە.

٦- ڕایەکی دیکە دەڵێ: (ذي القرنين) یەکێك بووە لە پادشاکانی ئاشوور، ناوی (بلینس) بووە.

٧- ڕایەکی دیکە: زانایەك کتێبێکی (٦٠٠ - ٧٠٠) لاپەڕەیی لەسەر نوسیوە لەو بارەوە، کە ئیسپاتی بکات: کە (ذي القرنين) کوڕی فیرعەون بووەو، پیاوێکی خوا بە یەکگر و دیندار بووە، لە دوای بابی کە حوکمڕانیی میسری دەکەوێتە دەست، ئیمان دێنێ! ئنجا ئەگەر وابێ دەبێ کوڕی ئەو ئافرەتە بووبێ، کە خوای پەروەردگار مەدحی دەکات لە قوڕئاندا و، دەفەرموێ: ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ٱبْنِ لِى عِندَكَ بَيْتًا فِى ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِى مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١١﴾﴾التحريم، بەڵام کە تەماشا دەکات: خەڵکی مصر لەگەڵی گونجاوو هاو ئاواز نین، دەڕوا مصر بەجێ دەهێڵێ و، سەرەتا بەرەو ڕۆژئاوا دەچێ و، پاشان بەرەو ڕۆژهەڵات دێتەوە و، دوای دەچێتە باکوور.

بـەڵام وەك گوتمـان: ئـەوەی زیاتـر بەڵگـە مێژوویـیەکان دەیگەیەنـن، ئـەو ڕایەیـە، کـە دەبێ ئـەو پادشـایە کـۆڕشی گـەورە بـوو بێ.

## دووەم: ئایا ئەو بەربەستە (سدّ)ەی (ذي القرنين) دروستی کردوە، لە کوێیە؟!:

١- لەو بارەوە وەك پێشتریش گوتمان: ڕایەك هەیە، دەڵێ: ئەو بەربەست (سَدّ)ە بریتیە لە: دیواری چین (جدار الصّين) کە درێژییەکەی: (٣٠٠٠) کیلۆمەترە و پانییەکەی: (٩) مەترە، بە

موعەددەلیی و بەرزییەکەشی: (١٥) مەترە و، دەکەوێتە نێوان وڵاتی مەنغۆلیا و چین و، ئەو دوو وڵاتە لێك جیا دەکاتەوە، کە ئێستا لە زۆر شوێنان شوێنەواری ماوە و، لە زۆر شوێنیش ڕووخاوە.

بەڵام ئیشکالی ئەو ڕایە ئەوەیە، کە خوا ﷻ بۆ بەربەستەکەی (ذي القرنين) باسی پڕکردنەوەی نێوان دوو چیایان دەکات، ئەویش بە ئاسن و مسی قاڵکراوە، بەڵام دیوارێکی (٣٠٠٠) کیلۆمەتری کە لە بەردو خاك و خۆڵ دروستکرابێ، زۆر جیاوازە، لەوەی قورئان فەرموویەتی.

٢- ڕای دووەم ئەوەیە کە ئەو بەربەستە لە دەربەندێکە، بەناوی: {دەربەندی چیاکانی قەفقاس} ئەو زنجیرە چیایانەش درێژ دەبنەوە، لە دەریای خەزەرەوە تاکو دەریای ڕەش و، ئێستاش ئەو دەربەندە پێی دەگوترێ: دەربەندی داریال (مضيق داريال)، کە دەکەوێتە وڵاتی تەفلیسەوە، بەڵام خاوەنی تەفسیری (الميزان)[1] کە ئەو ڕایە پەسند دەکات، دەڵێ: گرفتی ئەو ڕایە ئەوەیە، کە ئەو بەربەستە تەنیا لە ئاسن و مس دروست نەکراوە، هەندێکیشیان دەڵێن: ئەو بەربەستە پێی دەگوترێ: دەرگای ئاسن (باب الحديد) یان بەربەستی دەرگای دەرگایان (سدّ باب الأبواب).

ئنجا ئەو بەربەستە کە خاوەنی تەفسیری (المراغي)[2] هەروەها خاوەنی (التفسير المنير)[3]، هەردووکیان دەیهێنن، دەڵێن: هەندێك لە مێژوو نووسان لە سەرەتای سەدەی پازدەیەمدا ئەو سەددەیان بینیوە، کە لە پشت ڕووباری جەیحوونەوەیە لە ویلایەتی بەلْخ، و پێی دەگوترێ: دەرگای ئاسن (باب الحديد) لە نیزیك شاری (ترمذ)ە، تەیمووری لەنگ بە لای ویدا تێپەڕیوە، هەروەها (شاهڕوخ) لەگەڵ زانای ئەڵمانیی (سیلْد بەڵجەر) بەویدا تێپەڕیون و، مێژوونووسی ئیسپانیی (کلافیجەر)، لە سەفەرکەی خۆیدا کە لە ساڵی (١٤٠٣) ی زایینییدا، کە نوێنەری پادشای قەشتاڵە بووە لە ئەندەلوس بۆ لای تەیمووری لەنگ، ئەویش باس دەکات و دەڵێ: (إنّ سدّ باب الحديد على الطريق الموصل بين سمرقند والهند) واتە: بەربەستی دەرگای ئاسن لەسەر ڕێی پێکگەیشتن نێوان سەمەرقەند و هیندە.

هەڵبەتە ئەم ڕایە زیاتر لە ڕاستییەوە نیزیکە و، گونجاویشە لەگەڵ ئەو واقیعەدا کە خوای پەروەردگار باسی دەکات، دەربارەی بەربەستەکەی (ذي القرنين).

---

(١) ج١٢ ص٣٩٥.

(٢) ج١٦ ص١٣-١٥.

(٣) ج١٦ ص٣٥٨.

## سێیەم: یەئجووج و مەئجووج کێن؟!

جگـە لـەم ئایەتانـەی ئێـرە لـە سـوورەتی (الكهـف)، بـاسی یەئجـووج و مەئجـووج، لـە سـوورەتی: (الأنبياء)یشـدا کـراوە، ئایەتـەکانی: (٩٦ و ٩٧)، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ۝٩٦ وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ ...۝٩٧ ﴾، واتـە: هەتـا کاتێـك کـە یەئجـووج و مەئجـووج کرانـەوە، ئەوانیـش لـە هەمـوو بەرزاییـەك بـە خێرایـی دەڕۆن و، بەڵێنـی هـەق نزیـك بـۆوە.

کە مەبەست ئاخیر زەمان (ساعة)یە.

هەروەهـا لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەر ﷺ یشـدا هاتـوە، بـۆ وێنـە ئـەم فەرموودەیـە: [عَـنْ أُمِّ حَبِيبَـةَ عَـنْ زَيْنَـبَ ابْنَـةِ جَحْشٍ رَضِيَ اللَّـه عنهـمَا، أَنَّهَـا قَالَـتِ اسْـتَيْقَظَ النَّبِـيُّ ﷺ، مِـنَ النَّـوْمِ مُحْمَـرًّا وَجْهُـهُ يَقُـولُ: «لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ، وَيْـلٌ لِلْعَـرَبِ مِـنْ شَرٍّ قَـدِ اقْتَرَبَ، فُتِـحَ الْيَـوْمَ مِـنْ رَدْمِ يَأْجُـوجَ وَمَأْجُـوجَ مِثْـلُ هَـذِهِ» وحلَّـق، قلـتُ: يـا رسـول اللَّـه! أَنَهْلِـكُ وَفِينَـا الصَّالِحُـونَ؟ قَـالَ: «نَعَـمْ، إِذَا كَـثُرَ الْخَبَـثُ] (أخرجـه البخـاري: ٣٣٤٦، ومسـلم: ٢٨٨٠).

واتـە: ئوممـو حەبیبـە لـە زەینـەبی کچـی جەحشـەوە، کـە هەردووکیـان هاوسـەری پێغەمبـەرن ﷺ خـوا لێیـان ڕازی بـێ، دەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ شـەوێك هاتۆتـە دەرێ و ڕووی سـوور هەڵگەڕاوە و فەرموویـەتی: تەنیـا خـوا پەرسـتراوە و هـاوار بـۆ عـەرەب لـە خراپـە و بەڵایـەك کـە نیزیـك کەوتۆتـەوە، ئەمـڕۆ لـە بەربەسـتی یەئجـووج و مەئجـووج ئەوەنـدە کراوەتـەوە و، ئامـاژەی کـردوە بـە هـەردوو پەنجـەی (پەنجـەی گـەورە و پەنجـەی شـایەتمانی، یـانی: کەمێـکی لێکراوەتـەوە) دەڵـێ: منیـش، گوتـم ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ﷺ ئایـا ئێمـە لـە بەیـن دەچیـن، لـە حاڵێکـدا کـە خەڵـکی چاکەکارمـان تێدایـە؟! فەرمـووی: بەڵـێ، ئەگـەر خراپـەکارەکان زۆر بـوون (چاکەکانیشـیان پێـوە دەفەوتێـن).

ئەمـە دەگونجـێ ئامـاژە بـێ بـە بـەڵای: هاتنـی تەتـەر و مەغـۆل، کـە وەك دوایـی بـاسی دەکەیـن: زۆربـەی زانایـان ڕایـان وایـە: یەئجـووج و مەئجـووج هـەر ئـەو تەتـەر و مەغۆڵـەن، کـە لـە سـاڵی (٦٥٦)ك دا پایتەختـی دەوڵـەتی ئیسـلامیی، شـاری (بەغـداد) یـان گـرت و کاولکرد، دەسـەڵاتی ئیسـلامیش، ئـەو کاتـە زیاتـر لـە گەڵـی عەرەبـدا بەرجەسـتە بـوو بـوو، بـە هاوکاریی گـەلانی دیکـەش و سـەرەنجام ئـەو قـەوارە سیاسـییە لەسـەر دەسـتی تەتـەر و مەغـۆل لـە بەغـداد لـە بەیـن چـوو، لـە سـاڵی: (٦٥٦)ی کۆچییـدا، کەواتـە: وا پێدەچـێ یەئجـووج و

مەئجووج هەر ئەو تەتەر و مەغۆلە بن، کە کۆتاییان بە حوکمڕانیی ئیسلامیی هێناو دوایی حوکمڕانیی مسوڵمانان کەوتە دەستی تورکەکان.

شایانی باسە کە هەردووك وشەی: یەئجووج و مەئجووج لە زمانی چینی دا بە: (مەنکووك و مەنجووك) هاتوون، هەروەها لە پەیمانی کۆندا بە: (کوك و مائکوك) هاتوون، بۆیەش وەك: (**محمد الطاهر بن عاشور**) [1]، دەڵێ: ﴿**وَالَّذِي يَجِبُ اعْتِمَادُهُ أَنَّ يَاجُوجَ وَمَاجُوجَ هُمُ الْمَغُولُ وَالتَّتَرُ، وَقَدْ ذَكَرَ أَبُو الْفِدَاءِ أَنَّ مَاجُوجَ هُمُ الْمَغُولُ، فَيَكُونُ يَاجُوجُ هُمُ التَّتَرُ انطلاقهم الأول في أواخر القرن (٦) الهجري**﴾.

واتە: ئەوەی پێویستە تەبەننیی بکرێ، ئەوەیە کە یەئجووج و مەئجووج هەر مەغۆل و تەتەرن، کە یەکەم دەرچوونیان لە کۆتایی سەدەی شەشەمی کۆچیی دا بوو، ئەوە بوو کە لە ساڵی (٦٥٦)ك دا، کۆتاییان بە دەوڵەتی ئیسلامیی هێنا لە بەغداد و، زیاتر لە ملیۆنێك کەسیان لە نێو شاری بەغداددا کوشت، جەنگیزخان لە ساڵی (٦١٦)ك دا، دەردەچێ و بوخارا دەگرێ و، لە ساڵی (٦٢٨)ك دا، هەر جەنگیزخان دیاربەکر دەگرێ و، دوای خۆی نەوەکەی: هۆلاکۆ لە ساڵی (٦٥٦)ك دا، بەغداد دەگرێ.

پێویستە ئەوەش بگوترێ: ئەوە کە هەندێك دەڵێن: یەئجووج و مەئجووج لە پشت کێوی (قاف)ن، هیچ بنەمایەکی جوگرافیی و زانستیی نیەو، هیچ بنەمایەکیشی لە وەحیی نیە، کە هەندێ کەس وادەزانێ: ئەوە لە قورئاندا هاتوە، یان لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، بەڵام نە لە قورئان و نەلە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ باسی کێوی (قاف) هەر نەکراوە، بەڵێ باسی یەئجووج و مەئجووج کراوە، کە واش پێدەچێ ئەو یەئجووج و مەئجووجە، دوو هۆز بووبن، دوایی بوون بە نەتەوەیەك، کە هەم مەغۆلیان پێ دەگوترێ و، هەم تەتەریان پێدەگوترێ، دەشگونجێ تەتەر و مەغۆل دوو نەتەوە بن.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ ۖ قُلْ سَأَتْلُوا۟ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴾، واتە: لە بارەی (ذي القرنين)ەوە لێت دەپرسن بڵێ: لە بارەیەوە باس و خواسێکتان بۆ دەخوێنمەوە، وا پێدەچێ کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ ﴾، بەپێی هۆی هاتنە خوارەوەکەشی، کە لە سەرەتای سووڕەتی (الكهف)ەوە باسمانکرد، هەر ئەوە بێ کە قوڕەیشییەکان بەڕاسپاردنی جوولەکەکان سێ پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردن:

١- دەربارەی هاوەڵانی ئەشکەوت.

٢- دەربارەی (ذي القرنين).

٣- دەربارەی ڕووح، ئنجا خوا دێتە سەر جێبەجێ کردنی بەڵێنەکەی کە دەفەرموێ: لە بارەی (ذي القرنين)ەوە باس و خواستان بۆ دەخوێنمەوە و بۆتان دەگێڕمەوە:

﴿ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا ﴾، ئێمە ئەومان دەستڕۆیشتوو کرد بوو لە زەوییداو، بۆ هەر شتێك هۆکارمان بۆ ڕەخساند بوو، یاخود: بۆ هەر شتێك ڕێیەکمان بۆ ئاچووخ کرد بوو، چونکە وشەی (سبب) هەم بە مانای هۆکار و ئامراز دێ، هەم بە مانای ڕێگا دێ، بۆ گەیشتن بەو ئامانجە. ﴿ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴾ ئنجا بە دوای هۆکار و ڕێیەکەی کەوت.

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ ٱلشَّمْسِ ﴾، هەتا کاتێك گەیشتە شوێنی لێ ئاوابوونی خۆر، ﴿ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِى عَيْنٍ حَمِئَةٍ ﴾، خۆری وا لێ هەڵکەوت، وای هاتە بەرچاو، کە لە باتڵاغێکدا ئاوا دەبێ، دەچێتە نێو باتڵاغێکەوە، سەرچاوەیەکی باتڵاغ، باتڵاغیش بریتیە لە قوڕێکی ڕەشی بۆگەن، کە وا دیارە ئەو شوێنە، ڕۆژئاوای دەریای خەزەر بووە، کە سەرچاوەکانی نەوتی لێن و، ئێستاش نەوتێکی زۆری لێ دەردەهێنرێ، کاتی خۆی عەرەب پێیان گوتوە (البلد المنتن) وڵاتە بۆگەنەکە، لەبەر ئەوەی بۆنی نەوت و غازی لێهاتوە، یاخود: کەنار دەریایەك بووە، کە خۆری لێ ئاوا دەبێ، کەناری دەریاش ئەگەر بیابانی بەدەمەوە بێ، دەشتی بە دەمەوە بێ، قوڕ و جلێتاو، قوڕی ڕەش و لیتەی لێ پەیدا دەبێ، کاتێك تەماشای دەکەی و خۆر لە دوورەوە دەبینی، وا دەزانی دەچێتە نێو ئەو قوڕ و جلێتاوە، بۆیەش ئەوە دەڵێم:

چونکە هەندێك لەوانەی بە حیساب ڕەخنە لە قورئان دەگرن! گوتوویانە: قورئان هەڵەی جوگرافیی گەورەی تێدایە! دەڵێ: (ذو القرنین) خۆری بینی لە سەرچاوەیەکی قوڕی ڕەشدا ئاوا دەبوو! بەڵام بێگومان مەبەست ئەوەیە کە: بە چاو وا دیارە، ئەگەرنا ئێمە خۆرمان وادێتە بەرچاو: هێندەی بێژینگێکە، کە لە واقیع دا خۆر ملیۆنێك و سێیسەد هەزار (١٣٠٠٠٠٠) جار هێندەی زەوییە! هەروەها مانگیش، کە زۆر گەورەیە، بەڵام هەردووکیان بە قەدەر بێژینگێك، یان گچکەتر دێنە بەرچاو، کە ئەوە بۆ چاوی ئێمە وایە، یاخود ئێمە هەست دەکەین: کە خۆر لە خۆرهەڵاتەوە دێ و دەچێتە خۆرئاوا، لە حاڵێکدا کە ئەوە زەوییە دەخولێتەوە لە بەرانبەری خۆردا، ئەگەرنا خۆر بە دەوری زەویدا ناخولێتەوە، بەڵام بۆ چاوی ئێمە وایە، قورئانیش کە دەفەرموێ: ﴿ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِي عَيْنٍ حَمِئَةٍ ﴾ واتە: ئەو پێی وابوو، کە لەکانییەکی قوڕولیتەدا ون دەبێ، لەبەر چاوی وی بەو شێوەیە بوو، ﴿ وَوَجَدَ عِندَهَا قَوْمًا ﴾، لە نیزیك ئەو شوێنە خەڵکێکی، کۆمەڵگایەکی لێ بینی، کە وا پێدەچێ خراپەکار بووبن.

﴿ قُلْنَا يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا ﴾، گوتمان: ئەی (ذا القرنین) بۆت هەیە، یان سزا و ئازاریان بدەی [لەسەر خراپە و ستەم] یاخود چاکەکارییان تێدا ڕەچاو بکەی [لەبەرانبەر چاکەیان دا].

﴿ قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُۥ ﴾، ئەویش گوتی: کەسێك ستەم بکات، بێگومان سزای دەدەین، ﴿ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا نُّكْرًا ﴾، دوایی دەگێڕدرێتەوە بۆ لای پەروەردگاری، ئەویش سزایەکی سەخت و بێرەزای دەدات.

﴿ وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ ﴾، بەڵام کەسێك بڕوای هێنا بێ و کردەوەی باش بکات، ئەوە پاداشتی هەرە چاکی هەیە ﴿ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴾، ئێمەش لە لایەن خۆمانەوە، قسەیەکی ئاسانی لەگەڵدا دەکەین، واتە: بە شێوەیەکی ئاسان مامەڵەی لەگەڵدا دەکەین و، قسەیەکی خۆشی لەگەڵدا دەکەین.

﴿ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴾، دوایی دووبارە (ذو القرنین) ڕێی گرتەوە بەر و، هۆکاری گرتەوە بەر، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ ٱلشَّمْسِ ﴾، (هەرڕۆیی) هەتا کاتێك گەیشتە شوێنێك کە خۆری لێ هەڵدێ، ﴿ وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَىٰ قَوْمٍ لَّمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتْرًا ﴾، خۆری وا هاتە بەرچاو، لەسەر خەڵکێك هەڵدێ کە لە نێوان ئەوان و خۆردا، پۆششێکمان دانەنابوو، واتە: هیچ

شتێك تیشكی خۆری لێ نەدەگێڕانەوە، كە مەبەست ئەوەیە: بەرگ و پۆشاكیان لەبەر نەبووە، یان مەبەست ئەوە بووە: خانوو و نوایان نەبووە.

﴿ كَذَٰلِكَ وَقَدْ أَحَطْنَا بِمَا لَدَيْهِ خُبْرًا ﴾، واتە: هەواڵی (ذي القرنين) ئاوا بوو و، ئێمە تەواو شارەزا بووین بەوەی لەلای بوو، واتە: هەرچی هۆكاری هەیبوون و دەستڕۆیشتوویتیی كە هەیبوو، ئێمە لە هەمووی ئاگادار بووین.

﴿ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴾، دوایی دیسان ڕێی گرتەوەبەر و، هۆكاری گرتەوە بەر، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ ﴾، (هەر ڕۆیشت) هەتا كاتێك گەیشتە نێوان دوو بەربەستەكە، دوو چیایەكە، ﴿ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا ﴾، لە پێشیانەوە كۆمەڵە خەڵكێكی بینی، ﴿ لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا ﴾، خەریك بوو لە قسە تێنەگەن، واتە: زۆر دواكەوتوو بوون.

﴿ قَالُوا۟ يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، ئەو خەڵكە گوتیان: ئەی ذیلقەرنەین! بە دڵنیایی یەئجووج و مەئجووج، تێكدەرن لە زەویدا، ﴿ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا ﴾، ئنجا ئایا پیتاكێكت بۆ كۆبكەینەوە، ﴿ عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴾، كە لە نێوان ئێمە و ئەواندا، بەربەستێك دابنێی؟ ﴿ قَالَ مَا مَكَّنِّى فِيهِ رَبِّى خَيْرٌ ﴾، (ذو القرنين) گوتی: ئەوەی پەروەردگارم منی تێدا دەستڕۆیشتوو كردوە، باشترە لەو پیتاكەی ئێوە بۆم كۆدەكەنەوە، ﴿ فَأَعِينُونِى بِقُوَّةٍ ﴾، بەڵام بەهێز هاوكاریم بكەن، واتە: بە دەستی كرێكاری خۆتان، ئەگەرنا ماڵ و ئیمكانیەتم هەیە، ﴿ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا ﴾، لە نێوان ئێوە و ئەواندا، بەربەستێكی مەحكەم دادەنێم.

ئنجا دەستی پێكرد: ﴿ ءَاتُونِى زُبَرَ ٱلْحَدِيدِ ﴾، (گوتی:) پارچە ئاسنە گەورەكانم بۆ بێنن، وا پێدەچێ هەر خۆیشی وەك ئەندازیارێك نەخشەی دانابێ، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيْنَ ٱلصَّدَفَيْنِ ﴾، بەردەوام پارچە ئاسنە گەورەكانی خستنە سەریەك، [دەبێ پارچە ئاسنی زۆر زەبەلاح و گەورە بووبن] هەتا نێوان دوو چیایەكەی پڕكرد، ﴿ قَالَ ٱنفُخُوا۟ ﴾، ئنجا گوتی: بەمووشەدەمە فووی لێبكەن و ئاگرەكەی خۆش بكەن، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارًا ﴾، [هەروا بەردەوام بوو لەسەر گەرمكردنی ئاسنەكان] هەتا كاتێك كە ئەو پارچە ئاسنانەی لەسەر یەكی داناون، سووری كردنەوە و كردنی بە ئاگر، ﴿ قَالَ ءَاتُونِىٓ أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا ﴾، گوتی: مسی قاڵكراوەم بۆ بێنن، با بەسەریدا بكەم، بەسەر كەلێنی ئاسنەكان دا، [دەبێ هۆكار و ئامرازی سەرسوڕهێنەری دابینكردبن بۆ ئەوە، ئەگەرنا چۆن دەگەنە ئەو ئاستە بەرزانە!]

ئنجا بەربەستەکەی دروستکرد ﴿ فَمَا ٱسْطَٰعُوٓا۟ أَن يَظْهَرُوهُ ﴾، {ئیدی یەئجووج و مەئجووج} نەیانتوانی سەری بکەون، ﴿ وَمَا ٱسْتَطَٰعُوا۟ لَهُۥ نَقْبًا ﴾، هەروەها نەشیان توانی کونی بکەن، یانی: نەتوانییان پێی هەڵگەڕێن و، نەتوانییشیان کونی بکەن.

ئنجا بابزانین (ذیلقەرنەین) چی گوت؟

﴿ قَالَ هَٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّى ﴾، گوتی: ئەوە بەزەییەکە لە پەروەردگارمەوە {کە یارمەتیی دام ئەو بەربەستە لەنێوان ئەو گەلە ستەم لێکراوە و، ئەو دوو گەلە ستەمکارەدا، دروست بکەم}

﴿ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ رَبِّى جَعَلَهُۥ دَكَّآءَ ﴾، ئنجا هەر کات بەڵێنی پەروەردگارم هات، تەختی دەکات، ﴿ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّى حَقًّا ﴾، بەڵێنی پەروەردگاریشم ڕاستە.

ئنجا ئایا لە بەڵێنی پەروەردگار، مەبەستی ئاخیر زەمانە، یاخود: ئەو کاتەیە کە ئەو بەربەستە لە نێوان یەئجووج و مەئجووجدا لادەچێ؟ هەردووك واتایەکە هەڵدەگرێ.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**خوا دەفەرموێ: هەروەها لە بارەی ذولقەرنەینەوە پرسیارت لێ دەکەن بڵێ: لە بارەیەوە باس و خواسێکتان بەسەردا دەخوێنمەوە، ئێمە لە زەمیندا دەستڕۆیشتوومان کردبوو و، هۆکار و ڕێی هێنانەدی هەر ئامانجێکمان پێدابوو:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ قُلْ سَأَتْلُوا۟ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴿٨٣﴾ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ ﴾، لە بارەی ذولقەرنەینەوە پرسیارت لێ دەکەن.

ئنجا کێ بوون ئەوانەی پرسیاریان کردوە؟ بە تەئکید هۆزی قورەیش بووە، پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کردوە، بە پێی هۆی هاتنە خوارەوەکەش لەسەر ڕاسپاردنی جوولەکەکان، بووە کە گوتوویانە: ئەو سێ پرسیارەی لێ بکەن، ئەگەر وەڵامی دانەوە، وەڵامی ئەو سێ پرسیارەی زانی، دیارە پێغەمبەرە و ﷺ وەحیی بۆ دێ، ئەگەرنا، دیارە کەسێکە لە خۆوە ئیددیعای پێغەمبەرایەتیی دەکات.

لەو بارەوە کە ئایا بۆچی بەو کابرایە گوتراوە: ذیلقەرنەین؟ دەڵێین: (ذِى) واتە: خاوەن، (قَرْن)یش، واتە: قۆچ، شاخ، (قرنين)، واتە: دوو قۆچەکان، بەڵام بۆچی وای پێ گوتراوە؟ زانایان زۆر شتیان گوتوە:

**١) هەندێکیان گوتوویانە: لەبەر ئەوەی: گەیشتۆتە ئەولا ولای زەوی، خۆرهەڵات و خۆرئاوا، (قرني الشمس).**

**٢) هەندێکیان گوتوویانە: لەبەر ئەوەی: دوو کەزیی (ضفيرة)ی هەبوون، کاتی خۆی عادەتیان وابووە، زۆر لە گەل و نەتەوەکان، پیاوانیش قژیان درێژ بووە.**

٣) هەندێكیان گوتوویانە: لەبەر ئەوەی: خوودەیەكی لەسەر بووە، دوو قۆچی هەبوون.

٤) هەندێكیان گوتوویانە: لەبەر ئەوەی: خۆی دوو بەرزایی لەسەری دا هەبوون.

بەڵام هیچ كام لەوانە، بەڵگەیەكی وای لەسەر نیە.

واش پێدەچێ، خوودەیەكی لەسەر نابێ، كڵاوێكی لەسەر نابێ، وەك نیشانەو هێمای هێز، دوو قۆچی پێوەبووبن، وەك چۆن قۆچەكانی گا، ڕەمزی هێزن، ڕەنگە ئەو خوودەیەی لەسەری بووە، دوو قۆچی گای پێوە بووبن، بۆ ترساندنی دوژمنان و گەیاندنی ئەوە كە بەهێزە و بە توانایە، هەركام لە ڕایەكانی دیكەش، كەم و زۆر پێدەچن و، ڕایەكی وامان بە دەستەوە نیە، یەكلاییكەرەوە بێ.

٢)- ﴿ قُلْ سَأَتْلُوا عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴾، پێیان بڵێ: بە دڵنیایی من لە بارەی ویەوە هەواڵێكتان، باس و خواسێكتان بەسەردا دەخوێنمەوە.

(السين في (سَأَتْلُوا) لِتحْقِيقِ الوَعْدِ)، (سين و سَوْفَ)، جاری وایە بۆ هەواڵپێدانی شتێكە كە لە دواییدا ئەنجام دەدرێ، جاری واشە بۆ جەختكردنەوە دێن، بەڵام لێرەدا (س) بۆ جەختكردنەوەیە، یانی: بە دڵنیایی من لە بارەیەوە باس و خواسێكتان بەسەردا دەخوێنمەوە.

كە دەفەرموێ: ﴿ سَأَتْلُوا عَلَيْكُم مِّنْهُ ﴾، ئەم (مِّنْهُ)، (مِنْ للتَبْعِيض)، (من) بۆ بەشێكە یانی: بەشێكی ئەو بەسەرهاتە، نەك هەمووی، ئنجا (منه) لە: ﴿ سَأَتْلُوا عَلَيْكُم مِّنْهُ ﴾، یانی: (مِنْ خَبَرِهِ)، لە هەواڵەكەی، یانی: ڕاناوی (ه) لە (منه)دا، پاڵدەدرێتە لای شتێك كە قرتێنراوە، یانی: لە هەواڵی ئەوتان بۆ دەخوێنمەوە.

ئنجا ئایا بۆچی دەفەرموێ: (أتْلُوا عليكم منه)؟ شتێكتان لێی بەسەردا دەخوێنمەوە؟ واتە: هەندێكیتان بۆ دەگێڕمەوە، كە بە كەڵكی خوێندنەوە بێت، بە كەڵكی ئەوە بێ، ببێتە قورئان و بخوێنرێتەوە، چونكە: خوا ﷻ هەم لە بەسەرهاتی ذیلقەرنەین و، هەم لە تێكڕای بەسەرهاتەكانی دیكەدا، كە دەیانگێڕێتەوە، جێی مەبەست و ئامانج دەگێڕێتەوە، نەك ئەو وردەكاریيانەی كە پەكمان لەسەریان نەكەوتوە و، هیچ حیكمەتێكیان پێوە پەیوەست نیە، بۆ وێنە:

ناوی ذیلقەرنەین، ئەمەنی، خەڵكی كوێ بووە، چی لەبەر كردوە و...هتد؟ وردەكارییەكانی، خوا باسیان ناكات، چونكە حیكمەتێكیان پێوە پەیوەست نیە، بەڵام:

١- ذولقەرنەین کوێی گرتوە؟

٢- ذولقەرنەین سیاسەتیی چۆن بووە؟

٣- ڕەوشتەکانی چۆن بوون؟

٤- چۆن لەگەڵ گەلە مەزڵوومەکاندا ڕەفتاری کردوە؟

٥- چۆن لەگەڵ ستەمکاراندا مامەڵەی کردوە؟

٦- چۆن نیعمەتەکانی بۆ لای خوا گێڕاوەنەوە؟

ئەوانە گرنگن و، ئەوانەش خوای کاربەجێ هەموویانی لە بەسەرهاتەکەدا، گێڕاونەوە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿قُلْ سَأَتْلُوا عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا﴾، بڵێ: بەشێك لەبارەی هەواڵی ویتانەوە بەسەردا دەخوێنمەوە، باس و خواسێك کە بە کەڵك بێ و وشەی زیکری لێ بوەشێتەوە.

٣)- ﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُ فِي الْأَرْضِ﴾، ئێمە ئەومان لە زەویدا دەسترۆیشتوو کردبوو.

**(التَّمْكِيْنُ: جَعْلُ الشَّيءِ مُتَمَكِّناً رَاسِخاً، وَهُوَ تَمْثِيْلٌ لِقُوَّةِ التَّصَرُّفِ، بَحَيْثُ لاَ يُزَعْزِعُ قُوَّتَهُ أَحَدٌ، مَكَّنَاهُ، ومَكَّنَا لَهُ، بِمَعْنَىً لَكِنَ اللاَمَ لِلتَوْكِيدِ، مِثْلُ شَكَرْتُ لَهُ وَنَصَحْتُ لَهُ).**

واتە: (تَمْكِيْنُ)، بریتیە لەوە کە شتێك لە زەویدا چەسپاو و، ڕۆچوو بکرێ، ئەویش وێنا کردنە بۆ هێزو دەستەڵاتی دەستوەردان، کە هیچ کەسێك نەتوانێ هێزەکەی لابەرێ و بلەقێنێ، ئنجا (مَكَّنَاهُ) و (مَكَّنَا لَه)، هەردووکیان بە یەك واتان، بەڵام (ل)ی (مَكَّنَّا لَهُ)، بۆ جەختکردنەوەی زیاترە، وەك (شَكَرْتُ)، واتە: سوپاسم کرد، بەڵام (شَكَرْتُ لَهُ)، سوپاسم بۆی کرد، ئەمە زیاتر جەختکردنەوەی تێدایە، هەروەها (نَصَحْتُ)، واتە: دڵسۆزییم بۆی نواند، بەڵام: (وَنَصَحْتُ لَهُ)، ئەم (ل) کە دەچێتە سەری، ماناکەی تۆختر دەکاتەوە و بەهێزتری دەکات.

٤)- ﴿وَآتَيْنَاهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا﴾، بۆ هەر شتێك هۆکارمان بۆ ڕەخساندبوو، (سبب) لە ئەصڵدا بە مانای پەت و گوریس (حَبْل) دێ و، بە مانای ئامراز (وسيلة) دێ، بەڵام خوازراویشەتەوە بۆ ڕێگا، پاشان بۆ هەر هۆکارێك کە ئینسان ئامانجی پێ وە دەست بێنێ: **(وَأُطْلِقَ هُنَا عَلَى مَا يُتَوَسَّلُ بِهِ إِلَى الشَّيءِ مِنْ عِلْمٍ وَقُدْرَةٍ وَآلاَتِ التَسْخِيرِ).**

کە دەفەرموێ: ﴿وَآتَيْنَاهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ﴾، هەموو شتێك لێرەدا واتە: بۆ شتانێکی زۆر، ئەگەر نا مەبەست ئەوە نیە: بۆ هەموو شتێك بەگشتی! چونکە هەموو شتێك تەنیا

خـوا توانـای بەسـەریان دا هەیـە، ئنجـا ئەمـە وەك ئـەو ئایەتـەی سـوورەتی (یونـس)ە، کـە دەفەرمـوی: ﴿ وَلَوْ جَآءَتْهُمْ كُلُّ ءَايَةٍ ﴿٩٧﴾ ﴾، واتـە: ئەگـەر هـەر هەمـوو نیشـانەیەکیان بـۆ هاتبایـە.

یـان لـە سـوورەتی (الأحقاف)دا، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا ﴿٢٥﴾ ﴾، واتـە: هەمـوو شـتێکی کاول دەکـرد، دەیرمانـد بـە مۆڵەتـی پـەروەردگاری، واتـە: هەمـوو شـتێك کـە خـوا ناردوویەتـی: بیرمێنـێ، ئەگـەر نـا بێگومـان هەمـوو شـتێك، مانـگ و خۆریـش دەگرێتـەوە، بـەڵام ئـەو بایـەی کـە خـوا بـۆ گەلـی عـادی هەڵکـردوە، بـۆی نـاردوون، مانـگ و خـۆر و زەوی و چیاکانـی لـە بەیـن نەبـردوون، کەواتـە: هەمـوو شـتێك، یـانی: ئـەوەی لـەو چـوار چێوەیـەدا مەبەسـتە.

**مەسەلەی دووەم:**

**ئیدی ذولقەرنەین ڕێی گرتەبەر، هۆکاری گرتە بەر، ڕۆیشت هەتا کاتێک گەیشتە شوێنی خۆر لێ ئاوابوون، وای هاتە بەرچاو، کە خۆر لە سەرچاوەیەکی قوڕیین (باتڵاغ)دا، ئاوا دەبێ و، لە لای وی (لە لای ئەو سەرچاوەیە)، خەڵکێکی لێ هەڵکەوت، گوتمان: ئەی ذەلقەرنەین! (بۆت هەیە و دەستت کراوەیە) چ سزایان بدەی، لەسەر خراپەکاریی، چ چاکەکارییان لەگەڵ بکەیە پیشە، ذولقەرنەین گوتی: هەر کەسیان ستەم بکات، بێگومان ئازار و سزای دەدەین و، دواییش دەگێڕدرێتەوە لای پەروەردگاری، سزایەکی سەخت و بێرەزای دەدات و، هەر کەسێکیشیان بڕوا بێنێ و کردەوەی چاك بکات، پاداشتی هەرە چاکی هەیە (لە لای خوا) و، ئێمەش لە لای خۆمانەوە، قسەی باش و مامەڵەی سووك و ئاسانی لەگەڵدا دەکەین:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِى عَيْنٍ حَمِئَةٍ وَوَجَدَ عِندَهَا قَوْمًا ۗ قُلْنَا يَـٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا ﴿٨٦﴾ قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨٧﴾ وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴿٨٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- ﴿ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴾، خوێنراویشەتەوە: (اتَّبعَ) واتە: کەوتە ڕێ، ڕێی گرتەبەر، یاخود شوێن هۆکارەکە کەوت، ئەو هۆکارانەی کە خوا بۆی ڕەخساندبوون، ئامانجەکانی کە دەیەوێن، پێیانیان وەدی بێنێ.

وەك گوتمان: (سبب) کە لە ئەسڵ دا بە مانای پەت (حَبْل)ە، دوایی خوازراوەتەوە بۆ هەرکام لە: ڕێباز (طريق) وئامراز (وسيلة)، بۆیەش من هەردووکیانم بەکارهێناون: ڕێ و هۆکاری گرتەبەر، چونکە: (ڕێ)ش هەر هۆکارە بۆ گەیشتن بەو شوێنەی دەویسترێ، خواش ﷻ لێرەدا دوو وشەی بەکارهێناون: ١- (أَتْبع) (إِتْباع) یانی: شوێنکەوتن، ئینسانیش شوێن ڕێ دەکەوێ، ٢- (بَلغ) ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ ﴾، کە بێگومان ئینسان بە ڕێیەدا دەگاتە ئەو شوێنەی

دەیەوێ، کەواتە: بەو دوو نیشانەیە، کە: (إِتْبَاع) و (بُلُوغ)، تەو دوو وشەیە هاتوون، ئەمە نیشانەن کە (سبب) مانا مەجازییەکەی مەبەستە، کە بریتیە لە رێگا، یان ئامراز.

٢)- ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغۡرِبَ ٱلشَّمۡسِ ﴾، هەر رۆیشت: هەتا کاتێك کە گەیشتە شوێنی خۆر لێناوا بوون، واتە: شوێنی خۆر لێ ئاوابوونی دەوڵەتەکەی، یان قەڵەمڕەوی حوکمڕانییەکەی، یان کۆتایی سەفەرەکەی، خۆرئاوابوونەکەی لە کوێ بووە، گەیشتۆتە ئەوێ، دیارە خۆریش لە زۆر شوێنی گۆی زەوی، وا دێتە بەرچاو، کە ئاوا دەبێ، بۆ وێنە: خۆر دەچێتە نێو بیابان، ئەگەر شوێنەکە بیابان بێ، هەروەها هەست دەکەی: خۆر دەچێتە پشت و ئەو دیو چیایەکە، ئەگەر شوێنەکە چیابێ، یان هەست دەکەی خۆر دەچێتە نێو دەریایەکە، ئەگەر دەریا بێ، یاخود ئەگەر کەنار دەریا و قوڕ و لیتە بێ، هەست دەکەی خۆر دەچێتە نێو قوڕ و لیتەکە، دیارە ئەو شوێنەش کە ذولقەرنەین پێی گەیشتوە، کەنار دەریا بووە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَجَدَهَا تَغۡرُبُ فِي عَيۡنٍ حَمِئَةٖ ﴾.

٣)- ﴿ وَجَدَهَا تَغۡرُبُ فِي عَيۡنٍ حَمِئَةٖ ﴾، خۆری وا هاتە بەرچاو، وای لێ هەڵکەوت کە لە کانی و سەرچاوەیەکی قوڕی بۆگەندا، ئاوا دەبێ، کە بە کوردیی پێی دەڵێن: (باتڵاغ) قوڕ و لیتاو، کە وا پێدەچێ مەبەست لەو شوێنە: دەریای (خەزەر) بێ، کە دەریاچەی (قەزوین)یشی پێ دەڵێن و دەشکەوێتە رۆژئاوای وڵاتی چینەوە، هەروەها ئەو شوێنەش، کەنارەکانی دەریای خەزەرن، لە نیزیك شاری باکۆ، کە مێژوو نووسە مسوڵمانەکان کاتی خۆی بەو شوێنانەیان گوتوە: (البلاد المُنْتِنة)، لەبەر ئەوەی نەوتی لێ هەڵقوڵیوەو ئەوکاتەش نەیانزانیوە و نەیانتوانیوە: لە نەوت و گاز بەهرەمەند ببن، ئیدی بۆنی کردوە و گوتوویانە: وڵاتە بۆگەنەکان.

٤)- ﴿ وَوَجَدَ عِندَهَا قَوۡمٗاۗ ﴾، لەلای وێ خەڵکێکی لێ هەڵکەوت، یانی: لەلای ئەو باتڵاغ و قوڕاوە کە قوڕی رەشی بۆگەن بوو، لەوێ کۆمەڵە خەڵکێکی بینی، سیاقی ئایەتەکان ئەوە دەگەیەنێ، کە ئەوانە خەڵکێکی خراپەکار بوون، بە بەڵگەی ئەوە کە دوایی خوا ﷻ: ذولقەرنەین سەرپشك دەکات لە نێوان سزدان و، چاکە لەگەڵدا کردنیان، ئنجا ئەگەر خراپەکار نەبوونایە، خوای دادگەر دەستی ذولقەرنەینی ئاوەڵا نەدەکرد، کە سزایان بدات.

٥)- ﴿ قُلۡنَا يَٰذَا ٱلۡقَرۡنَيۡنِ ﴾، گوتمان: ئەی ذەلقەرنەین!

ئایا خوا چۆنی پێ فەرموو؟

أ- هەندێك دەڵێن: ئەو پیاوە پێغەمبەر بووە و، خوا لە رێی وەحییەوە ئەوەی پێ فەرمووە! بەڵام بۆ بە پێغەمبەر دانانی هەر کەسێك، دەبێ بەڵگەیەکی دڵنیاکەرمان هەبێ، کە لێرەدا ئەو بەڵگەیە نیە.

ب - ڕای ڕاست ئەوەیە، کە مەبەست لە (قُلْنَا)، پێمان فەرموو، واتە: ئیلهاممان بۆ کرد، خستمانە دڵیەوە، هەروەك چۆن خوا ﷻ ئەو تەعبیرەی بۆ هەر کام لە مەریەم و، دایکی مووساش بەکارهێناوە:

١- ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ۝٧ ﴾القصص.

٢- هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ ۝٤٢ ﴾آل عمران، ئاشکراشە: خوا ﷻ نە وەحیی بۆ دایکی مووسا کردوە و، نە وەحییشی - بە مانا باو و زاراوەییەکەی - بۆ مەریەم کردوە، بە ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایان، هەرچەندە ڕای واش هەیە دەڵێ: ئەو دووانەش پێغەمبەر بوون، بە تایبەت مەریەم، (خوا لێی ڕازی بێ)، بەڵام ڕای ڕاستر ئەوەیە، کە نەخێر پێغەمبەران تەنیا لە پیاوان، نێردراون، لەبەر کۆمەڵێك هۆکار، کە پێشتر باسمان کردوون، کەواتە: مەبەست لەوە کە خوا دەفەرموێ: قسەمان کرد لەگەڵ دایکی مووسا و، لەگەڵ مەریەمدا، واتە: خورپەمان بۆ کردن و خستمانە دڵیانەوە.

٦)- ﴿ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ ﴾ (گوتمان: ئەی ذیلقەڕنەین! تۆ سەرپشکی:) بۆت هەیە سزایان بدەی (مادام شایستەی سزادرانن).

٧)- ﴿ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا ﴾، هەروەها بۆت هەیە چاکەکارییان تێدا ڕەچاو بکەی.

(حُسْناً: مَصْدَرٌ وَعُدِلَ عَنْ «أَنْ تُحْسِنَ إِلَيْهِم» مبَالَغَةً فِي الإِحْسَانِ، حَتَّى جَعَلَ كَأَنَّهُ اتَّخَذَ فِيهِمْ: نَفْسَ الحُسْنِ)، (حُسْنًا)، چاوگە، ﴿ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا ﴾ یانی: چاکەکارییان تێدا ڕەچاو بکەی، بۆیەش نەیفەرموە: (أَنْ تُحْسِنَ إِلَيْهِم)، تاکو تۆختر و زیاتر مانای چاکە لەگەڵ کردن، بگەیەنێ، وەك ئەوەی: خودی چاکە لەگەڵ کردنی، تێدا ڕەچاو کردبن، ئنجا ئەمە وەك ئایەتەکەی سوورەتی (البقرة)یە: ﴿ وَقُولُوا۟ لِلنَّاسِ حُسْنًا ۝٨٣ ﴾البقرة، واتە: چاکەکاریی بە خەڵکی بڵێن، کە بێگومان: قسەی چاکت پێ بە خەڵکی دەگوترێ، نەك خودی چاکە کردن!

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە: خوا ﷻ دەستی ذولقەڕنەینی ئاوەڵا کردۆتەوە، بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو کۆمەڵە خەڵکەدا: چ سزایان بدات، چ چاکەکارییان تێدا بکاتە پیشە!

٨)- ﴿ قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ ﴾ {ذولقەڕنەین} گوتی: بەڵام هەر کامێك لەوان ستەم بکات.

٩)- ﴿ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُۥ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە سزا و، ئازاری دەدەین {واتە: لە دنیادا}.

١٠)- ﴿ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا نُّكْرًا ﴾، دوایی دەگێڕدرێتەوە بۆ لای پەروەردگاری، ئەویش سزایەکی سەخت و بێڕەزای دەدات.

لێرەدا کە دەفەرمویٚ: ﴿ قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ ﴾، زۆرێك لە توێژەرەوانی قورئان، لە نێویاندا (محمد الطاهر بن عاشور) و زۆری دیکەش گوتوویانە: مەبەست لە (ظَلَمَ)، یانی: (أَشْرَكَ)، هاوبەش دابنێ بۆ خوا، بەڵام من پێم وایە: نەیانپێکاوە، بەڵکو وشەی (ظُلم) لێرەدا هەر مانا ڕواڵەتییەکەی خۆی مەبەستە، واتە: دەستدرێژیی کردن بۆ سەر مافی ئەوانی دیکە و، سنوور بەزێنیی، بێگومان دەزانم وشەی (ظُلم)، بە مانای شیركیش هاتووە: ﴿ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ ﴾لقمان، هەروەها بە مانای کوفریش ﴿ وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٥٤﴾ ﴾ البقرة، هەروەها گوناهکردن... (... أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ ...) النساء: ١١٠ بەڵام لێرەدا ناگونجێ مەبەست لە (ظلم) شیرك و کوفر و گوناهکردن، بێ، بەڵکو دەبێ مەبەست ستەم و دەستدرێژیی بێ، چونکە: سزادانی خەڵك لەسەر کوفر و شیرك، تەنیا کاری خوایەو لە قیامەتێ ئەوە دەکرێ، وەك خوا دەفەرمویٚ: ﴿ فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴿٢١﴾ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴿٢٢﴾ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ﴿٢٣﴾ فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَكْبَرَ ﴿٢٤﴾ إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ﴿٢٦﴾ ﴾الغاشية، خوای دادگەر زۆر بە ڕوونیی ئەوەی هەڵبڕیوە و یەکلای کردۆتەوە: کە سزادانی خەڵك لەسەر کوفر و شیرك، تەنیا مافی خوایە و، خوا بۆ خۆی و، لە ڕۆژی دواییشدا، نەك لە دنیادا، لەسەر کوفر و شیرك خەڵك سزا دەدات، بەڵام لەسەر زوڵم، خوا ﷻ دەستی شەریعەت و جێ بەجێ کارانی شەریعەتی تاوەڵا کردوە، کە لەسەر ستەم و دەستدرێژیی، ستەمکاران سزا بدەن و، دەستیان بگرن و نەهێڵن زوڵم بکەن، لەبەر ئەوەی دنیا بە زوڵم تێکدەچێ، ئەگەرنا بە کوفر و ئیمانەوە، دەگونجێ خەڵك بە یەکەوە بژین.

﴿ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُۥ ﴾، (سَوْفَ)، وەك گوتمان: لێرەدا بۆ جەختکردنەوەیە، یانی: بە دڵنیایی ئێمە سزای دەدەین، ﴿ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا نُّكْرًا ﴾، دوایی دەگێڕدرێتەوە بۆ لای پەروەردگاری {لە ڕۆژی دواییدا} ئەویش سزایەکی سەخت و بێڕەزای دەدات.

١١)- ﴿ وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ﴾، بەڵام هەر کەسێك بڕوا بێنی و کردەوەی باش ئەنجام بدات.

١٢)- ﴿ فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ ﴾، ئەوە باشترین پاداشتی هەیە، (جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ أي: فَلَهُ الحُسْنَى جَزَاءً)، ئەوە باشترین، پاداشتیەتی، (تأنِيثُ الحُسنَى بِاعْتِبَارِ الخَصْلَةِ أوِ الجَنَّةِ، أي: فَلَهُ الخَصْلَةُ الحُسْنَى جَزَاءً، أو فَلَهُ الجَنَّةُ الحُسْنَى)، وشەی (الحُسْنَى) بۆیە بەمێینە دانراوە، بەو ئیعتیبارە کە سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراو (صفة موصوفٍ محذوف)ە، وەك (الخصلة الحُسْنى) یان (الجنة الحُسْنى) یانی: خەسڵەتی

هەرەچاك، یان: بەهەشتی هەرەچاك. یانی: ئەو خەسڵەتەی یان ئەو بەهەشتەی كە باشترینە، دەبێتە پاداشتی.

﴿ فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ ﴾، (جزاءً) (تمييزٌ او مَصدرٌ مؤكِّدٌ او حالٌ مُقدّمَةٌ)، (جزاءً) یان (تمییز)ە، یاخود چاوگی جەختكەرەوەیە، یاخود (حال)ێكی پێشخراوە.

١٣)- ﴿ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴾، بێگومان ئێمەش لە لایەن خۆمانەوە، قسەی ئاسانی لەگەڵ دەكەین.

شێوەی ئەم تەعبیرە لە شوێنی دیكەش دا هاتوە، وەك دەفەرمویٚ: ﴿ فَقُل لَّهُمْ قَوْلًا مَّيْسُورًا ﴿٢٨﴾ ﴾الإسراء، ئەگەر نەتتوانی هاوكاریی كەسانێك بكەی، كە داوای هاوكارییت لیٚ دەكەن، قسەیەكی ئاسانیان لەگەڵ بكە.

قسەی خۆش و دڵسۆزانە و ئاسانیش، جاری وا هەیە كەلێنێكی باش دەگریٚ، هەروەك قسەی خراپ و قورس و زەحمەتیش، ئەگەر گریمان چاكە و هاوكارییە مادییەكەیشی لەگەڵدا بیٚ، خاوەنەكەی لەسەری قەرزار دەبێتەوە، بۆیە خوا دەفەرمویٚ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُبْطِلُوا۟ صَدَقَٰتِكُم بِٱلْمَنِّ وَٱلْأَذَىٰ ﴿٢٦٤﴾ ﴾البقرة، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! چاكە و ماڵ بە خشینەكانتان، بە منەت و ئازاردان هەڵمەوەشێننەوە!

خوا پاداشتی هەرە چاكی دەداتەوە لە ڕۆژی دواییدا، ئێمەش لە دنیادا، قسەی خۆشی لەگەڵ دەكەین و، كار ئاسانیی بۆ دەكەین و بە شێوەیەكی ئاسان مامەڵەی لەگەڵدا دەكەین، واتە: ئێمەش پاداشتی دەدەینەوە، هەم پاداشتی ماددیی، هەم پاداشتی مەعنەویی.

كە دەفەرمویٚ: ﴿ فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ ﴾، دەگونجیٚ: مەبەست پێی خوٚی بیٚ، واتە: لە دنیادا پاداشتی هەرە باشی هەیە لەلایەن ئێمەوە، یانی: لە ڕووی مادییەوە، ﴿ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴾، لە ڕووی مەعنەوییشەوە: ئێمە قسەی ئاسانی لەگەڵدا دەكەین،

دەشگونجیٚ: ﴿ فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ ﴾، وەك پێشتر مانامان كرد، واتە: لە لایەن خواوە، باشترین پاداشتی هەیە، كە بەهەشتە و، ئێمەش لە ڕووی دنیاییەوە، قسەی ئاسانی لەگەڵ دەكەین و، مامەڵەی ئاسانی لەگەڵدا دەكەین.

**مەسەلەی سێیەم:**

**دوایی دیسان ذولقەرنەین ڕێی گرتەوە بەر، هەتا کاتێك گەیشتە شوێنی خۆر لێ هەڵهاتن، بینی لەسەر خەڵکێك هەڵدێ، هیچ پەردەیەکمان بۆ نەڕەخساندبوون، تیشکی خۆریان لێ بگێڕێتەوە، حاڵی ذولقەرنەین ئاوابوو و، شارەزایی وردیشمان بە هەموو ئەو شتانە هەبوو، کە لە لای بوون و، لەبەر دەستی دا بوون:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَىٰ قَوْمٍ لَّمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتْرًا ﴿٩٠﴾ كَذَٰلِكَ وَقَدْ أَحَطْنَا بِمَا لَدَيْهِ خُبْرًا ﴿٩١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

**١)- ﴿ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴾، وشەی: (أتبع) هەم لێرەدا، هەم لە ئایەتی پێشێشدا، دوو جۆرە خوێندنەوەی هەن:**

**أ/ (ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا).**

**ب/ (ثُمَّ اتَّبَعَ سَبَباً).**

**هـەردووك خوێندنەوەکـەش واتایـان لێـك نیزیکـە: دوایـی ڕێـی گرتەبـەر، پاشـان شـوێن هۆکارکـەوت.**

**٢)- ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ ٱلشَّمْسِ ﴾ (هەر ڕۆیشت) هەتا کاتێك گەیشتە شوێنی خۆر لێیهەڵهاتن، واتە: ئەو شوێنەی کە بە نسبەت دەوڵەتەکەی ئەوەوە، یان قەڵەمڕەوی سەفەرەکەیەوە: دەبوو بە خۆرهەڵات.**

**٣)- ﴿ وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَىٰ قَوْمٍ ﴾، خۆری وا هاتە بەرچاو، وای لێ هەڵکەوت، کە لەسەر خەڵکێك هەڵدێ.**

**٤)- ﴿ لَّمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتْرًا ﴾، کە ئێمە هیچ پۆشەرێکمان نەخستبووە بەین ئەوان و (تیشکی) خۆرەوە، ئەم تەعبیرە دوو واتای هەن:**

**أ- خەڵکێکی ڕووت بوون و پۆشاکیان لەبەر نەبوو، ڕەنگە تەنیا پاش و پێشی خۆیان داپۆشیبێ.**

ب- لەو سەر زەمینەی ئەوان نە چیای لێ بوو، نە درەختی لێ بوو، نە پەنایەكی لێبوو، بیابان بووە، یان سەر زەمینێكی ئاوەڵا بووە.

٥)- ﴿ كَذَٰلِكَ ﴾، ئەم (ك)ە بۆ لێكچوواندنە، وێچوێنراو (مُشَبَّه بِهِ)ەكە، قسەی پێشوو گرتوویەتە نێو خۆی، یان بە بێژەكەی، یاخود بە مانایەكەی، یانی: حاڵی ذولقەرنەین وابوو، ئەو باس و خواسە بەو شێوەیە بوو، كە پێشتر باسكرا، یاخود مەبەست ئەوەیە: هەر كەسێك دەیەوێ: حاڵی ذولقەرنەین بشوبهێنێ، نایشوبهێنێ بە شتێكی وێچووتر، لەوە كە بە خودی خۆی بیچوێنێ.

٦)- ﴿ وَقَدْ أَحَطْنَا بِمَا لَدَيْهِ خُبْرًا ﴾، هەرچی لە لای ئەو بوو، زانیاریی و شارەزاییمان، دەوری دابوو، واتە: چاك چاك دەمانزانی چی لەبەر دەستدا هەیە و، چی هەیە و، چی نیە، چونكە هەمووی خوا بۆی ڕەخساندبوو، (الخُبْرُ: العِلْمُ والإحَاطةُ بالخَبَرِ)، (خُبْر) بریتیە لە زانیاریی و دەورە دانی هەواڵێك.

(بِمَا لَدَيْهِ: مَا عِنْدَهُ مِنْ عظمة الملك من جنودٍ وقوة وثروة)، واتە: ئەوەی كە لە لایەتی لە حكومڕانیی مەزن و سەرباز و دەسەڵات و سامان. {هۆكارەكانی كە ئامانجەكانی پێ وەدەست دێنان} مەبەست لەو تەعبیرە ئەوەیە كە ذولقەرنەین: خاوەنی دەستەڵات و دەسترۆیشتوویەكی زۆر بووە.

**مەسەلەی چوارەم:**

**دوایی دیسان ڕێ و هۆکاری گرتە بەر، هەتا کاتێك گەیشتە نێوان دوو (چیایە) بەربەستەکان، لە پێشیانەوە خەڵکێکی لێ هەڵکەوت، نیزیك بوو لە قسە تێنەگەن، گوتیان: ئەی ذولقەرنەین! یەئجووج و مەئجووج تێکدەرن لە زەمیندا، ئنجا ئایا پیتاکێکت بۆ کۆبکەینەوە، تاکو بەربەستێکمان لە نێواندا دروست بکەی؟ ذولقەرنەین گوتی: ئەوەی پەروەردگارم پێیداوم، لە توانا و ماڵ و سامان، لە پیتاکی ئێوە باشترە، بەڵام بەهێزی دەست {کرێکاریی} هاوکاریم بکەن، بەربەست و دیوارێکی مەحکەمتان لە بەیندا دروست دەکەم، ئنجا گوتی: پارچە ئاسنی گەورە گەورەم بۆ بێنن، ئنجا کاتێك پارچە ئاسنەکانی لەسەریەك هەڵچنی و، نێوان دوو قەدی چیایەکانی پڕکرد و یەکسان کرد، گوتی: بێنن بە مووشە دەمان، فوو لە ئاگری ژێر پارچە ئاسنەکان بکەن، ئنجا کاتێك پارچە ئاسنەکانی سوور کردنەوە و کردنە ئاگر، گوتی: ئەوجار مسی قاڵبووەوەم بۆ بێنن بەسەریدا بکەم:**

**خوا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٩٢﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا ﴿٩٣﴾ قَالُوا۟ يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴿٩٤﴾ قَالَ مَا مَكَّنِّى فِيهِ رَبِّى خَيْرٌ فَأَعِينُونِى بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا ﴿٩٥﴾ ءَاتُونِى زُبَرَ ٱلْحَدِيدِ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيْنَ ٱلصَّدَفَيْنِ قَالَ ٱنفُخُوا۟ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارًا قَالَ ءَاتُونِىٓ أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا ﴿٩٦﴾ ﴾.**

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شازدە بڕگەدا:

**١)- ﴿ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴾ خوێنراویشتەوە: (اتَّبَعَ)، واتە: دووبارە کەوتەوە ڕێ، ڕێی گرتەوە بەر، یاخود هۆکاری گرتە بەر.**

**٢)- ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ ﴾ (هەرڕۆیشت) هەتا کاتێك گەیشتە نێوان دوو بەربەستەکان.**

**گومانی تێدانیە کە نێوان دوو بەربەستەکان: (بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ)، خوێنراویشتەوە: (بين السُّدَّين)، مەبەست پێی: نێوان دوو چیایان بووە، یانی: دەربەندێك بووە، دوو چیای بەرانبەر یەك هەبوون، نێو قەدیان بەتاڵایی بووە، دابڕاوایی بووە، دیارە یەئجووج و**

مەتجـووج بـەو دابڕاوییـەدا هاتـوون، ئنجـا خەڵكەكـە كـە لـە پێـش دوو چیایەكـە بـوون، مەبەسـتیان بـووە ذولقەرنەیـن ئـەو كەلێنەیـان بـۆ پڕبكاتـەوە و ئـەو دەربەندەیـان بـۆ بگـرێ، ئنجـا كـە دەربەندەكـەی بـۆ گرتـن، ئـەو كاتـە یەئجـووج و مەئجـووج ناتوانـن بـە گالیسـكان بە ئاسـانیی بـەو رێیـەدا بێـن و، دەبـێ بـە سـەر شـاخەكە هەڵگەڕێـن، ئەوانیـش دیـارە توانیویانـە كـە لەسـەر لووتكـەی چیایـەكان سـەنگەری تێشـكچیەتیی و پاسـەوانیی دابنێـن و، بەتیـر و بـەرد و...هتـد نەهێڵـن بۆیـان پـێ هەڵگەڕێـن.

وشـەی (سَدّ)، یاخـود (سُدّ)، هـەم بـە مانـای چیـا، دێ، (ٱلسَّدَّيۡنِ)، واتـە: (الجَبَلَيۡنِ)، دوو چیایـەكان، هـەم بـە مانـای بەربەسـت و دیواریـش دێ.

٣)- ﴿ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوۡمٗا ﴾، (دونهما): ١- أمامهما ٢- ورائهما ٣- فوقهما ٤- تحتهما ٥- غيرهما. یانی: لەپێشیان، لەدوایان، لە سەروویان، لە ژێریان: جگە لەوان ئێمە (أمامهما) لە پێش دوو چیایەكانەوە، ئەو مانایەمان هەڵبژارد، چونكە ذولقەرنەین بە سوپاكەیەوە چووە و، پێش ئەوەی بگاتە دوو چیایەكان، خەڵكەكە هەبوون و، یەئجووج و مەئجووج لە پشت، دوو چیاكانەوە بوون و، لەوێوە هێرشیان بۆ كردوون و، تێكدانیان لە دژ كردوون.

هەندێـك لـە زانایانیـش دەڵێـن: (مِن دُونِهِمَا)، ئـەو ڕانـاوە دەچێتـەوە بـۆ ئـەو دوو كۆمەڵـە خەڵكـەی، كـە لـە خۆرهـەڵات و خۆرئـاوا بینینـی، واتـە: جگـە لـەو دوو كۆمەڵـە خەڵكـە، خەڵكێكـی دیكـەی لـەوێ بینـی، بـەڵام ڕانـاو (ضمير) دەبـێ بـۆ نزیكتریـن باسـكراو بچێتـەوە، نیزیكتریـن باسـكراویش: (ٱلسَّدَّيۡنِ)ە، واتـە: دوو چیایـەكان، كـە وەك دوو بەربەسـت وابـوون، یـانی: ئـەو خەڵكـە كـە ذولقەرنەیـن لێـی هەڵكەوتـن، لـە پێـش دوو چیاكانـەوە بـوون، پێـش ئـەوەی بگاتـە دوو چیایـەكان.

٤)- ﴿ لَّا يَكَادُونَ يَفۡقَهُونَ قَوۡلٗا ﴾، نیزیك بوو لە قسە تێ نەگەن، یانی: زۆر دواكەوتووبوون و زۆر دوور بوون لە شارستانیەتیی و ئاوەدانیی، بێگومان ذولقەرنەین حكومڕانێكی وا گەورە، بۆ هەر شوێنێك چووە، وەرگێڕ (مترجم)ی لەگەڵ خۆی بردوە، ئنجا وا پێدەچێ بۆ ئەوان بە زەحمەت وەرگێڕیان دەست كەوتبێ، یاخود وا پێدەچێ: زمانی ئاخاوتن و دوان و قسە پێكردنیان زۆر دواكەوتووانە بووبێ، خەڵكی دواكەتوو، ئەو وشانەی بەكاریان دێنن، بۆ دەربڕینی واتا و مەبەستەكانیان، كەمن!

ئەمـە خوێنراویشـەتەوە: (لاَ يَـكَادُوْنَ يُفْقِهُـوْنَ قَـوْلاً)، (يَفۡقَهُونَ)، یانـی: تێدەگـەن، (يُفْقِهُـوْنَ)، واتـە: شـارەزا دەكـەن، خەڵـك تێدەگەیەنـن، (يَفۡقَهُونَ)، واتـە: خۆیـان تێدەگـەن، (يُفْقِهَـوْنَ)، واتـە: خەڵـك تێدەگەیەنـن.

یانی: خەریك بوو، نیزیك بوو نەتوانن تێبگەن، یان خەڵك تێبگەیەنن لە قسەی خۆیان.

٥)- ﴿ قَالُوا۟ يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ ﴾، گوتیان: ئەی ذولقەرنەین!

٦)- ﴿ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، بە دڵنیایی یەئجووج و مەئجووج، تێكدەرن لە زەویدا.

یەئجووج و مەئجووج زیاتر وا پێدەچێ تەتەر و مەغۆل بن، ئەوانیش دوو نەتەوە بوون، یاخود یەك نەتەوە بوون: لە دوو هۆز، لە دوو بەرە باب، پەیدا بوون.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم قسەیەك لە پەیمانی كۆن بێنم: دەڵێ:

{ فحِينَ تَنْقَضِي الأَلْفُ سَنَةٍ، يُطْلَقُ الشَّيْطَانُ مِنْ سِجْنِهِ، وَيَخْرُجُ لِيُضَلِّلَ الأُمَمَ الَّذِينَ فِي زَوَايَا الأَرْضِ: جُوجَ وَمَاجُوجَ، وَيَجْمَعُهُمْ لِلْقِتَالِ، وَعَدَدُهُمْ كَثِيرٌ جِداً، كَرَمْلِ الْبَحْرِ! فَيَصْعَدُونَ عَلَى سُهُولِ الأَرْضِ الْعَرِيضَةِ، وَيُحَاصِرُونَ مِنْ كُلِّ جَانِبٍ مُعَسْكَرَ الْقِدِّيسِينَ وَالْمَدِينَةَ الْمَحْبُوبَةَ، وَلَكِنْ نَاراً مِنَ السَّمَاءِ تَنْزِلُ عَلَيْهِمْ وَتَلْتَهِمُهُمْ}[1].

واتە: كاتێك كە هەزار ساڵ تێدەپەڕێ، شەیتان لە بەندیخانەی خۆی بەردەدرێ، دێتە دەرێ بۆ ئەوەی لە هەر چوار گۆشەی زەوی، خەڵك گومڕا بكات [كێ خەڵك گومڕا بكات؟] جووج و ماجووج [كە دیارە شەیتان لە پشتیانەوەیە] و كۆیان دەكاتەوە بۆ جەنگ، ژمارەیان زۆر زۆرە، وەك لمی دەریا وان، سەردەكەونە سەر دەشتە پانەكانی زەوی، لە هەموو لایانەوە سەربازگەی پیاوچاكان ئابڵووقە دەدەن، هەروەها شارە خۆشەویستەكەش ئابڵووقە دەدەن، بەڵام ئاگرێك لە ئاسمانەوە دێتە خوار و دەیانسووتێنێ.

ئەمە زۆر گونجاوە، لەگەڵ ئەوەدا كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتْ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ ﴿٩٦﴾ وَٱقْتَرَبَ ٱلْوَعْدُ ٱلْحَقُّ... ﴿٩٧﴾ ﴾ الأنبياء.

واتە: هەتا كاتێك یەئجووج و مەئجووج كرانەوە (ڕێیان بۆ كرایەوە) كە لە هەموو بەرزاییان زۆر بە خێرایی دەڕۆن، بەڵێنی هەقیش نزیك بۆوە.

كە مەبەست پێی ئاخیر زەمانە، لێرەش (لە پەیمان كۆن دا) ئاماژە بەوە دەكات.

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر الرؤيا «يوحنا» الإصحاح: ٢، ص٢٧٩٥.

ئنجا لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوە، کـە یەئجـووج و مەئجـووج زۆر زۆرن، لێرەش هـەر ئاماژە بـەوە دەکات! دیسـان لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوە، کـە خـوا ﷻ بەڵایەکیـان بـۆ دەنێـرێ و لـە بەیـن دەچـن، ئەگەرنـا مسـوڵمانان ئابڵووقـە دەدرێـن، لـە مەککـە و، مەدینـە و، بەیـت و لمەقدیـس، واش پێدەچـێ قسـەکەی (پەیـمانی کـۆن) [شـارە خۆشەویسـتەکە] مەبەسـت پێـی شـاری پێغەمبـەر (مدینـة الرسـول) بـێ ﷺ، دەشـگونجێ مەبەسـت بەیـت و لمەقدیـس، یاخـود مەککـە بـێ، گرنـگ ئەوەیـە ئـەو شـتانە لـە [پەیمانـی کـۆن]دا هـەن، بـە تەئکیـد دەسـتکاریی کردنـی زۆریـشی بەسـەردا هاتـوە، بـەڵام هەندێـك شـتی تێـك دەکاتـەوە لەگـەڵ ئـەوەدا کـە لـە قورئانـدا یـان، لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوە.

بەڵـێ ئـەو خەڵکـە بـە ذولقەرنەیـن دەڵێـن: یەئجـووج و مەئجـووج تێکـدەرن لـە زەویـدا، دوایـی داواکارییـەکی لەشـێوەی پێشـنیاردا لـێ دەکـەن و دەڵێـن:

٧)- ﴿ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا ﴾، ئایا ئامادەی پیتاکت بۆ کۆبکەینەوە؟ (خَرْجًا)، یانی: (خَرَاجْ)، (الْخَرْجُ: الْمَالُ الَّذِي يُدفَعُ لِلْمَلِكْ)، (خَرْجًا) و (خَرَاجْ)، واتە: باج، دەگوترێ: باج و خەراج، پیتاك ئەو سامانەیە کە کۆدەکرێتەوە بۆ حوکمڕان، کە بەرژەوەندیی خەڵکی پێ دابین بکات.

ئنجا ئایا بۆچی بۆی کۆبکەنەوە؟!

٨)- ﴿ عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴾، تاکو لە نێوان ئێمە و ئەوان [یەئجووج و مەئجووج]دا بەربەستێك دروست بکەی.

(سَدًّا)، خوێنراویشـتەوە: (سُـدًّا)، کـە پێشـتریش باسـمان کـرد: هەندێـك بەیـەك واتایـان دانـاون و، هەندێکیـش گوتوویانـە: (سَـدّ) ئەوەیـە مرۆڤکـرد بـێ و (سُـدّ)یش خواکـردە.

٩)- ﴿ قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ ﴾، [ذولقەرنەین] گوتی: ئەوەی پەروەردگارم منی تێدا دەستڕۆیشتوو کردوە [بە منی بەخشیوە] باشترە، لەو پیتاکەی ئێوە بۆ منی کۆدەکەنەوە، یانی: ئەوەی کە ئێوە بۆ منی کۆدەکەنەوە لە پیتاك، ئەوەی پەروەردگارم پێی داوم، لەوە زیاترە و باشترە.

نەیویستوە باری شانیان قورس بکات.

وشـەی: (مَا مَكَّنِّي)، خوێندراویشـتەوە: (مَـا مَكَّنَنِـي)، ئـەوەی پـەروەردگارم منـی تێـدا دەستڕۆیشـتوو کـردوە، (مَكَّنَنِـي)، و (مَكَّنِّي)یـش هەردووکیـان یـەك واتایـان هەیـە.

١٠)- ﴿ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ ﴾، واتە: بەهێزی جەستە، بە دەستی کرێکار، (الأيدي العامِلَة)، هاوکاریم بکەن، نەك بە ماڵ و سامان، ماڵ و سامانم زۆرە.

١١)- ﴿ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا ﴾، لە نێوان ئێوە و ئەواندا، بەربەستێکی مەزن دەکەم.

(رَدْم)، بریتیە لە بەربەستێکی مەزن، بەربەرستێکی زۆر مەحکەم (السَّدُّ المُحْكَم)، کە ئەوە بوو دوایی: ذولقەرنەین، دوو دیوار زۆر مەحکەمی دروستکردن و نێوانەکەیانی پڕکردەوە، بۆ ئەوەی بە هیچ جۆرێك بۆیان کون نەکرێ.

ئنجا باسی چۆنیەتی دروستکردنی بەربەستەکە، دەکات:

١٢)- ﴿ ءَاتُونِي زُبَرَ ٱلْحَدِيدِ ﴾[1]، واتە: پارچە ئاسنانم بۆ بێنن، بێگومان فەرمانی کردوە و، ئیدی کرێکار و وەستا و، ئەو نەتەوەیەش هاوکاریان بوون، ئەگەرنا بە تەئکید خۆی ئەندازیار و نەخشە دانەرەکە بووە، بەڵام کرێکار و وەستای شارەزا و کارامەشی لەگەڵدا بوون.

گوتی: پارچە ئاسنە گەورەکان بخەنە سەر یەك و کە ڵەکەیان بکەن.

١٣)- ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيْنَ ٱلصَّدَفَيْنِ ﴾ ئیدی هەر پارچە ئاسنەکانی لەسەریەك کەڵەکەکردن: تاکو کاتێك کە نێوان دوو تەنیشتی چیایەکەی {(ٱلصَّدَفَيْنِ)، واتە: دوو لای شتێك، دوو لای چیایەکە} یەکسان کردن، لەگەڵ سەرێیان، یانی: نێوانەکەیانی پڕ کرد لە پارچە ئاسنی گەورە گەورە.

(الصَّدَفُ: جَانِبُ الجبَلِ، وَلاَ يُقَالُ إلاَّ صدَفَان بالتَّثْنِيَة، ولاَ يُقَالُ لأحَدِهِمَا صَدَفٌ، لأنَّ أحَدَهِمَا يصادف الآخر)، (ٱلصَّدَفَيْنِ)، هەر پێکەوە دەگوترێن، (صَدَفٌ)، واتە: تەنیشتی چیا، بەڵام هەر پێکەوە دەگوترێ: (صَدَفَان)، چونکە یەکێکیان بەرانبەری ئەوی دیکەیە.

١٤)- ﴿ قَالَ ٱنفُخُوا۟ ﴾، دوای ئەوەی نێوانی دوو چیایەکانی پڕ کرد لەو پارچە ئاسنە گەورانە: گوتی: فوو بکەن.

فوو لە چی بکەن؟ (انْفُخُوا فِي الكِيْرَان)، (كِير)، موشەدەمەیە، ئەوەی ئاسنگەر هەوای پێ دەکاتە ئەو کوورەیەی کە ئاسنەکەی تێدا قاڵ دەکاتەوە و دەتوێنێتەوە، کۆی (کیر) یش (کیران)ە یانی: مووشەدەمەکان وا دێتە بەرچاو: موشەدەمەی گەورە گەورەیان دانابن بە ڕیز و، فوویان کردبێتە ئەو ئاگرەی کە دراوەتە بەر ئاسنەکان، تاکو ئاگرەکە خۆشتر بێ و ئاسنەکان سوور ببنەوە و تێکرا قاڵببنەوە و بتوێنەوە.

---

(١) (زُبَر)، کۆی (زُبْرَه)یە، (وَهِيَ قطْعَةٌ كَبِيْرَةٌ من الحَدِيْد)، یانی: پارچە ئاسنی گەورە.

١٥)- ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارًا ﴾ به‌رده‌وام بوون له‌ فووکردنه‌ ئاگره‌که‌ به‌مووشه‌ده‌مان (کیران): هه‌تا کاتێك که‌ کردی به‌ ئاگر، یانی: ئاسنه‌کان سوور بوونه‌وه‌.

(نَاراً: أي مَحْمِيّاً كَالنَّارِ اشْتِعَالاً وَتَوَهُّجَاً)، یانی: گه‌رم بوو وه‌ك ئاگر، ئاسن کاتێك زۆر گه‌رم ده‌بێ، وه‌ك ئاگر سوور ده‌بێته‌وه‌ و وه‌ك ئاگر دێته‌ به‌رچاو.

ئنجا دوای ئه‌وه‌ی ئاسنه‌کانی سوور کردنه‌وه‌ و کردنی به‌ ئاگر:

١٦)- ﴿ قَالَ ءَاتُونِىٓ أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا ﴾، گوتی: بۆم بێنن، با مسی قاڵکراوه‌ی به‌سه‌ردا بکه‌م، (القِطْرُ: النُّحَاسُ المُذَابُ)، مسی قاڵکراوه‌.

(المراغي)، له‌ ته‌فسیره‌که‌یدا ئه‌م ته‌عبیره‌، ئاوا داده‌ڕێژێ:

(أي: جِيئُونِي بقطع الحَدِيدِ، فلما جاءوه بها، أخذ يَبْنِي شيئاً فشيئاً، حتى إذا جعل ما بين جانبي الجبلين من البنيانِ مساوياً لهما في العلو، قال للعَمَلَةِ: انفخوا بالكيران في زبر الحديد التي وضِعَتْ بين الصَّدفين، ففعلوا، ومازالوا كذلك، حتى صارت كالنار اشتعالاً وتوهُّجاً، فَصَبَّ النحاس المذاب على الحديد المحمَّيْ، فالتصق بعضه ببعض، وسدّ الفجوات التي بين الحديد وصار جَبَلًا صَلْداً)[1].

واته‌: پێی گوتن: پارچه‌ ئاسنانم بۆ بێنن {هی گه‌وره‌ گه‌وره‌} کاتێك بۆیان هێنان، ورده‌ ورده‌ له‌سه‌ر یه‌کی دانان، که‌ڵه‌که‌ی کردن، هه‌تا نێوان دوو چیایه‌کانی کرد به‌ دیوارێك، که‌ یه‌کسان بێت له‌ ڕووی به‌رزییه‌وه‌، له‌گه‌ڵ دوو ته‌نیشتی چیایه‌کان، ئنجا به‌ کرێکاره‌کانی گوت: به‌ مووشه‌ده‌مان، فوو له‌و ئاگره‌ بکه‌ن که‌ دراوه‌ته‌ به‌ر پارچه‌ ئاسنه‌ گه‌وره‌کان، که‌ له‌ نێوان دوو چیایه‌که‌دا، هه‌ڵچنراون {که‌ڵه‌که‌ کراون} وایان کرد و به‌و شێوه‌یه‌ به‌رده‌وام بوون، هه‌تا وه‌ك ئاگری لێهات، ئه‌و ئاسنانه‌ سوور بوونه‌وه‌ به‌و ئاگره‌، دوایی مسی قاڵکراوه‌ی به‌سه‌ر ئاسنه‌ گه‌رم و سوور بووه‌ وه‌که‌دا کرد، یه‌کسه‌ر به‌ یه‌که‌وه‌ چه‌سپاو، که‌لێنه‌کانی پڕکردنه‌وه‌ {ئه‌و بۆشاییانه‌ی له‌ نێوان پارچه‌ ئاسنه‌کاندا بوون} تاکو وه‌ك چیایه‌کی زۆر مه‌حکه‌می لێهات.

---

(١) تفسير المراغي ج١٢، ص١٩.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**{(ذولقەرنەین) بەربەستەکەی وا بە مەحکەمی دروستکرد کە}: (یەئجووج و مەئجووج) نەیانتوانی پێیدا هەڵگەڕێن و نەشیانتوانی کونی تێبکەن، (ذولقەرنەین) گوتی: دروستکردنی ئەم بەربەستە، بەزەییەکە لە پەروەردگارمەوە، ئنجا هەر کات بەڵێنی پەروەردگارم هات، تەخت و یەکسانی دەکات (لەگەڵ زەویدا) و بەڵێنی پەروەردگاریشم ڕاستە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَمَا ٱسْطَٰعُوٓاْ أَن يَظْهَرُوهُ وَمَا ٱسْتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقْبًا ﴿٩٧﴾ قَالَ هَٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّى ۖ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ رَبِّى جَعَلَهُۥ دَكَّآءَ ۖ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّى حَقًّا ﴿٩٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ فَمَا ٱسْطَٰعُوٓاْ أَن يَظْهَرُوهُ ﴾، (یەئجووج و مەئجووج) نەیانتوانی پێیهەڵگەڕێن، یانی: بەربەستەکە ئەوەندە لووس بووە و، ئەوەندەش بەرز بووە، نەیانتوانیوە پێی هەڵگەڕێن، ڕاناوەکەش دەچێتەوە بۆ یەئجووج و مەئجووج.

٢)- ﴿ وَمَا ٱسْتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقْبًا ﴾، هەروەها نەشیانتوانی کونی بکەن.

واتە: کون تێکردنیشیان بۆ مەیسەر نەبوو.

شایانی باسە: بۆ پێیهەڵگەڕان، فەرموویەتی: ( فَمَا ٱسْطَٰعُوٓاْ أَن يَظْهَرُوهُ )، نەیانتوانی پێی هەڵگەڕێن، بەڵام بۆ کون کردن فەرموویەتی: (وَمَا ٱسْتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقْبًا)، چونکە: پێهەڵگەڕانەکە، کەمتر زەحمەت بووە، لە چاو کەلێن و کون تێکردنی، کونکردنەکەی زۆر زۆر زەحمەت بووە، بۆیە ئەمیان پیتێکی زیادە (وَمَا ٱسْتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقْبًا)!

وشەی: (نَقْبًا)، بە مانای: کونکردن و، بە مانای بڕین، دێ، تەعبیری: ﴿ وَمَا ٱسْتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقْبًا ﴾ یانی: ئەصڵەن هەر کونێکی گچکەشیان بۆ تێنەکرا، چونکە پسپۆڕانی زمان دەڵێن: **(النكرة في سياق النفي تفيد الإستغراق)** هاتنی شتێك بە نەزانراو (نكرة) لە ڕستەیەك دا کە لابردن بگەیەنێ، گشتگیریی و پاماڵکردن دەگەیەنێ.

٣)- ﴿ قَالَ هَٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّى ﴾، گوتی: {دروستکردنی} ئەم بەربەستە، بەزەیی بوو لە پەروەردگارمەوە، واتە: بە ئیلهامی وی و بە کارئاسانیی وی، ئەو کاردەم بۆ ئەنجامدرا.

٤)- ﴿ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ رَبِّى ﴾، هەر كاتێ بەڵێنی پەروەردگاریشم هات، واتە: ئەو كاتەی ئەو بەربەستەی تێدا دەڕووخێ و، كۆتایی پێ دێ، یاخود مەبەست: هاتنی ئاخیر زەمانە، لەو كاتەدا:

٥)- ﴿ جَعَلَهُۥ دَكَّآءَ ﴾، پەرەوەدگارم تەختی دەكات، یەكسانی دەكات، (دَكَّآءَ)، یانی: تەخت و یەكسان، (الدَكَّآء: النَّاقَةُ الَّتِي لا سَنَامَ لَهَا)، ئەو حوشترەی كە لە سەر پشتی دونگی نەبێ و پشتی تەخت بێ، پێی دەگوترێ: (دَكَّآءَ).

ئەمە خوێنراویشەوە: (جَعَلَهَا دَكًّا)، (دَكّ)یش بریتیە لە ورد و خاشكردنی شتێك، (أي مَدْكُوكًا)، واتە: شتی ورد و خاشكراو، وشەی (دَكّ) چاوگ (مصدر)ی بە واتای بەركار (مفعول)ە.

٦)- ﴿ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّى حَقًّا ﴾ بەدڵنیایی بەڵێنی پەروەردگاریشم هەق و ڕاستە و، هەر واش بووە.

پێشتریش گوتمان: سەرەتای كرانەوەی ئەم بەربەستە، لە بەردەمی یەئجووج و مەئجووجدا، لە ساڵی (٦١٦)ك دا، بوو كە جەنگیز خان دەرچوو وەك پادشای تەتەر و مەغۆل، سەرەتا سوڵتان خوارزمی سەلجووقیی كە پادشای دەوڵەتێكی ئیسلامیی بوو، لە (ما وراء النهر)، ئەوی تێكشاند و ڕاوی ناو، وڵاتەكەی داگیر كرد، دوای ئەوەی ئەو سوڵتانە نەزانە، ملهوڕانە چەند بازرگانێكی وڵاتی جەنگیز خانی كوشتبوون! ئیدی لەوێوە سەرەتای دەرچوونی یەئجووج و مەئجووج، یانی: تەتەر و مەغۆل، دەستی پێكرد، ئنجا بەوپێیە، دوا دەرچوونیشان ئەو كاتە دەبێ، كە خوای باڵادەست باسی دەكات، كە پێش هاتنی ئاخیر زەمانە.

## دەرس و پەندەکانی بەسەرهاتی ذولقەرنەین:
## کە سەرجەم حەڤدە (١٧) دەرس و پەندن

١)- خوا ﷻ هەندێ خەڵك بەرز دەکاتەوە و دەستڕۆیشتوویان دەکات، چ لە ڕووی ماددیی، چ لە ڕووی مەعنەویی، چ لە ڕووی سیاسیی، چ لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، بەڵام بە مەبەستی تاقیکردنەوەیان، ئنجا ئەگەر ئەو دەستڕۆیشتوویی و توانایەیان لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاربێنن، یانی: لە بەرژەوەندیی بەندەکانیدا، کە هەمیشە ڕەزامەندیی خوا ﷻ لە سوود گەیاندن بە بەندەکانی و هێنانەدی بەرژوەندیی خەڵکدایە بە گشتی، ئەوە مانای وایە، ئەو کەسە کە خوا دەستڕۆیشتوو و تواناداری کردوە، لە تاقیکردنەوەی خوا دەرچووە و، ئەگەر بە پێچەوانەشەوە بێ، مانای وایە لە تاقیکردنەوەی خوا کەوتوە و، لەسەر ئەو نیعمەتانەی خوا پێی داون، قەرزدار بۆتەوە، خوا ﷻ کە لەبارەی (ذو القرنین)ەوە دەفەرموێ:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ ۖ قُلْ سَأَتْلُوا۟ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴿٨٣﴾ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ ﴾.

... ئێمە دەستڕۆیشتوومان کردبوو لە زەویدا، خاوەن توانامان کردبوو و بۆ هەر شتێك، [بۆ هەر ئامانجێك کە دەیویست بیهێنێتە دی] هۆکار و ئامرازمان بۆ ڕەخساندبوو، یاخود ڕێمان بۆ تەخت و ئاچووخ کردبوو.

بێگومان بە مەبەستی ئەوە کە تاقی بکاتەوە.

٢)- هەر کەسێك بیەوێ لەم ژیانە دنیاییەدا ئامانجێك بهێنێتەدی، دەبێ هۆکاری بۆ بگرێتەبەر و، دەبێ لە ڕێی سروشتیی خۆیەوە، بۆی بچێ، ئنجا خوا ﷻ ئەو ڕێیانەی ئامانجەکانیان لێوە دەستەبەر دەکرێن، ناوی لێناون یاساکان (سنن)، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ ﴿١٣٧﴾ ﴾آل عمران، واتە: لە پێش ئێوەدا یاسایانێکی خوا تێپەڕیون، (واتە: چەسپیون لە ژیانی کۆمەڵگاکانی پێش ئێوەدا)، بە زەویدا بڕۆن و سەرنج بدەن!

یانی: بۆ ئەوەی یاساکانی خوا بدۆزنەوە و، ئێوەش هەوڵبدەن بە پێی ئەو یاسایانەی خوا، ئامانجەکانتان بێننە دی، کە دەفەرموێ: ﴿ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ ﴾الكهف، (من

كُلِّ شَيْءٍ ) لـە هـەر شتێك، یـانی: بـۆ هێنانـەدی هـەر ئامانجێـك، هـەر مەبەستێك، هۆكارمـان بـۆ ڕەخساندبوو.

وشـەی (سـبب)یش وەك پێشـتر باسـمان كـرد: پێشـیّ بـە مانـای پـەت و گوریـس (حَبـل) دێ، دوایـی بـە مانـای ئامـراز و ڕێبازیـش، بەكارهێنراوە.

٣)- ئینسان كە ویستی ئامانجەكانی بێنێتە دی، دەبێ گورج و گۆڵ و، چالاك بێ و، وزە و تواناكانی خۆی بخاتە كار، بۆ لابردنی بەربەستەكان، چونكە ئەگەر تەماشای ذولقەرنەین بكەین، خوا هەموو جارێ دەفەرموێ: ﴿ فَأَتۡبَعَ سَبَبًا ﴾، یانی: كەوتە شوێن هۆكار و هۆكاری گرتە بەر، یان ڕێی گرتە بەر، كەواتە دەبێ لە تۆ جووڵە هەبێ، وەك گوتراوە: «لە تۆ حەرەكەت و لە خوا بەرەكەت».

٤)- ئینسان لە كاتی دەست ڕۆیشتوویی و دەسەڵاتدا، دەبێ وریا بێ: لە جیاتی سوپاسگوزاریی، تووشی سپڵەیی و بێ وەفایی و بێ نمەكیی نەبێ، بەرانبەر بە خواو، بەرانبەر بە چاكەكانی خوا ﷻ، ذولقەرنەین وەك كە دەبینین: ئەهلی شوكر بووە لە كاتی دەست ڕۆیشتوویدا نەك ئەهلی (سُكْر)! یانی: بەو ئیمكانیەت و دەسەڵاتەی خوا بۆی ڕەخساندوە، سەرخۆش و سەرسام و لە خۆبایی نەبووە و، لە كەوڵی خۆی دەرنەچووە، چونكە كە دەڵێ: ﴿ قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيۡرٞ ﴾، ئەوەی پەروەردگارم منی تێدا توانادار كردوە، منی تێدا دەسترۆیشتوو كردوە، باشترە، كەواتە: دەسەڵاتەكەی و، ئیمكانیاتەكەی، وەك نیعمەتێكی خوا تەماشا كردوە.

٥)- بابای دەسەڵاتدار و حوكمڕان و دەسترۆیشتوو، دەبێ هەر كەسە بە پێی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا بكات، وەك پێشینان دەڵێن: (مەڕ بە پێی خۆی، بزن بە پێی خۆی)، ئەوەتا ذولقەرنەین دوای ئەوەی خوا ﷻ پێی دەفەرموێ: بۆت هەیە ئەو خەڵكە سزا بدەی و، بۆشت هەیە چاكەكاریيان تێدا ڕەچاو بكەی، ذولقەرنەین سیاسەتی خۆی، واتە: شێوەی مامەڵەی خۆی لەگەڵ خەڵكەكەدا، لەو دوو ڕستەیەدا كورت هەڵدێنێ: ﴿ قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوۡفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا نُّكۡرٗا ﴾، گوتی: هەر كەسێك ستەم بكات، ئەوە ئیمە سزای دەدەین و دوایی دەگێڕدرێتەوە بۆ لای پەروەردگاری ئەویش سزایەكی زۆر سەختی دەدا، ﴿ وَأَمَّا مَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلۡحُسۡنَىٰۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنۡ أَمۡرِنَا يُسۡرٗا ﴾، بەڵام هەر كەس بڕوای هێنابێ و، كردەوە باشەكان ئەنجام بدات، پاداشتی هەرە باش، هی ئەوە و، ئێمەش لە لایەن خۆمانەوە قسەیەكی باش و ئاسانی لەگەڵدا دەكەین، كەواتە: هەر كەسە بە پێی خۆی، دەبێ مامەڵەی لەگەڵدا بكرێ.

٦)- لە ژێر سایەی حوكمی بەرنامەی خوادا، ستەمكردن ڕێی پێنادرێ، بەڵام بێبڕوایی ڕێی پێدەدرێ:

وەك ژمارەیەك لە توێژەوانی قورئان گوتوویانە، كە پێشتر ئاماژەم پێدان، مەبەست لە (ظلم)، لێرەدا نە كوفرە و نە شیركە، بەڵكو وشەی: (ظلم) لێرەدا مەبەست پێی دەستدرێژیی و ماف پێشێل كردن و خراپەكارییە، بۆچی؟ چونكە خوا ﷻ لەسەر شیرك و كوفر خەڵك لە دنیادا سزا نادات، بەڵكو دەفەرموێ: ﴿ فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ۝٢١ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ۝٢٢ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ۝٢٣ فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَكْبَرَ ۝٢٤ إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ۝٢٥ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ۝٢٦ ﴾الغاشية.

واتە: بیریان بخەوە (ئەی موحەممەد!) تۆ تەنیا بیرخەرەوەی تۆ بەسەریان دا زاڵنی، بەتۆبزیی مسوڵمانیان بكەی، مەگەر كەسێك كە پشت هەڵبكات و بێبڕوا بێ، پەروەردگاری سزای هەرە گەورەی دەدات، بێگومان گەڕانەوەیان بەس بۆ لای ئێمەیە و، لێپرسینەوەشیان تەنیا لەسەر ئێمەیە.

وشەی (ظلم)یش - وەك پێشتریش گوتمان - بەڵێ لە قورئاندا بە مانای شیركیش هاتوە و، بە مانای كوفریش هاتوە و، بە مانای گوناهیش هاتوە بە رەهایی، وەك چۆن بە مانای دەستدرێژیی كردنە سەر مافی ئەوانی دیكەش هاتوە، بەڵام لێرەدا مانای چوارەمیان مەبەستە، چونكە ذولقەرنەین كە بە ئیلهامێك كە لە لایەن خواوە بۆی كراوە، رەفتاری كردوە، زانیویەتی: شەریعەتی خوا، رێگا نادات: لەسەر شتێك كە ماددەی پێ تاقیكرانەوەی مرۆڤە و بە ئیختیاری خۆی هەڵیدەبژێرێ، كە بریتیە لە كوفر و شیرك، لەسەر ئەوە خەڵك سزا بدرێ! چونكە ئەگەر وابێ، ئەو كاتە رێی تاقیكردنەوە لە خەڵك دەگیرێ، بەڵام بێگومان شەریعەتی خوا، رێ لە ستەم (ظلم) دەگرێ، چونكە مرۆڤ یەكی لەسەری نەكەوتوە، تاكو پێی لە تاقیكردنەوەی خوا دەربچێ، كەس یەكی لەسەر ئەوە نەكەوتوە، زوڵم بكات! بەڵام تاقیكرانەوەی مرۆڤ، یەكی لەسەر ئەوە كەوتوە، رێی بدرێ: ئیمان بێنێ، یاخود ئیمان نەهێنێ، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴾ الكهف - ٢٩ -، هەروەها: ئەهلی شیرك بێ، یاخود ئەهلی تەوحید بێ، بەڵام یەكی لەسەر ئەوە نەكەتوە: زوڵم لەوانی دیكە بكات و مافی ئەوانی دیكە پێشێل بكات!

ئاشكراشە: بە كوفرو ئیمانەوە، خەڵك پێكەوە دەژی و، بە شیرك و تەوحیدەوە خەڵك پێكەوە دەژی، بەڵام بە زاڵم و مەزڵوومیی خەڵك پێكەوە ناژین، بۆیەش خوا ﷻ رایگەیاندوە، كە بەهۆی ستەم و دەستدرێژییەوە، ئاوەدانییەكان لە بەین دەبات،

دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ ٥٩﴾ القصص، واتە: ئێمە فەوتێنەری ئاوەدانییەكان نابین، مەگەر خەڵكەكەیان ستەمكاربن. كەواتە: لێرەدا (الكهف -٧٨-) مەبەست لە (ظُلم)، ستەم و دەستدرێژییە بۆ سەر مافی خەڵك.

٧)- هەر كەسێك دەسەڵاتی بوو، دەستڕۆیشتوو بوو، دەبێ بە پێی توانای هەوڵبدات، پشتی ستەملێكراو بگرێ و، دەستی ستەمكار بگرێ، لێرەدا ذولقەرنەین دەڵێ: ﴿أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُۥ﴾، هەڵبەتە كە سزای ستەمكار دەدات و ئازار و ئەشكەنجەی دەدا، مانای وایە: دەستی دەگرێ و، بەرگریی لە مەزڵوومەكە دەكات، بۆیە سزای ستەمكار دەدات و، لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەكات، تاكو دەست بگرێ و نەهێڵێ مافی خەڵكەكەی دیكە پێشێل بكات و ستەمیان لێ بكات، كەواتە: بابای دەستەڵاتدار و دەستڕۆیشتوو، گرنگترین كارێك كە دەیكات بەرگریی كردنە لە ستەم لێكراو و پێشگیرییكردنی ستەمكار و دەست گرتنیەتی كە نەهێڵێ ستەم بكات، وەك پێغەمبەریش ﷺ لە فەرمایشتێكیدا كە لە صەحیحی بوخاریی و غەیری ویشدا هاتوە، دەفەرموێ: {أُنْصُرْ أَخَاكَ ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا}[1]، واتە: برایەكەت سەربخە، ستەمكار بێ، یان ستەم لێكراو بێ، هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێن: ستەملێكراو بێ، دەزانین دەبێ یارمەتی بدەین و نەهێڵین ستەمی لێ بكرێ، بەڵام ئەگەر ستەمكار بێ، چۆن یارمەتی بدەین؟ فەرمووی: دەستی بگرن و مەهێڵن زوڵم بكات، ئەوە یارمەتییدانی ئێوەیە بۆی.

٨)- حوكمڕانی خواپەرستی دادگەر و، خۆ بەكەمگرو، خزمەتكار بۆ خەڵك، خوای بەرز هاوكاریی دەكات، پشتی دەگرێ و، كاری بۆ ئاسان دەكات و كۆسپەكانی بەردەمی لادەبات، چونكە ذولقەرنەین لەبەر ئەوەی لەگەڵ ستەملێكراوان بووە و دژی ستەمكاران بووە، خوا ﷻ وەك لە سەرەتای بەسەرهاتەكەوە ڕایگەیاندوە: ﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ﴾، دەستڕۆیشتوومان كردبوو لە زەوییدا، ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا﴾، بۆ هەرشتێكیش هۆكارێكمان بۆ ڕەخساندبوو، جگە لەوەش خوا ئیلهامیشی بۆ دەكات و دەیخاتە دڵی كەبەرە چاكە و خێر، هەنگاو بنێ: ﴿قُلْنَا يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا﴾، گوتمان: ئەی ذولقەرنەین!...

ئنجا هەرچەندە كەمێك لە زانایان گوتوویانە: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ذولقەرنەین پێغەمبەر بووە و، خوا وەحیی بۆ ناردوە، بەڵام نەخێر، چونكە ئەم شێوە

---

(١) {عَنْ أَنَسٍ رضي اللـه عنـه، أَنَّ رَسُولَ اللـهِ صَلى اللـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «أُنْصُرْ أَخَاكَ ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا»، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللـهِ، هَذَا نَنْصُرُهُ مَظْلُومًا، فَكَيْفَ نَنْصُرُهُ ظَالِمًا؟ قَالَ: تَمْنَعُهُ مِنَ الظُّلْمِ} أخرجه البخاري : (٢٤٤٣)، والترمذي : (٢٢٥٥)، وابن حبان : (٥١٦٧) و (٥١٦٨) ، والطبراني في «الصغير» (٥٧٦).

تەعبیرە، بۆ جگە لە پێغەمبەرانیش بەكارهاتووە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ ﴾ القصص، یان دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ ﴾ آل عمران، كە مەبەست پێی ئیلهام و خستنە نێو دڵە، لێرەش كە دەفەرموێ: ﴿ قُلْنَا يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ ﴾، واتە: خستمانە دڵی و ئیلهاممان بۆ كرد، یانی: ئەو مەبەستە كە خوا ڕایگەیاندووە، خستوویەتە دڵیەوە و، وەك ئەوەیە كە پێی فەرمووبێ، پێغەمبەریش ﷺ - وەك پێشتر باسمان كرد - وشەی ئیلهامی بە (تَحْدِيث)، ناوناوە: (قَدْ كَانَ يَكُوْنُ فِي الأُمَمِ قَبْلَكُم مُحَدَّثُوْن)، (مُحَدَّثُوْن)، واتە: قسە لەگەڵ كراوان، فەرمایشت لەگەڵ كراوان، كە خوا ڕاستەوخۆ لە ڕێی فریشتەكانەوە، فەرمایشتیان لەگەڵ دەكات و خورپە (إلهام) دەخاتە عەقڵ و دڵیانەوە.

٩)- بابای حوكمڕان دەبێ هەوڵبدات: بێ تەماع بێ، لە ماڵ و سامانی خەڵك و میللەتدا، بەڵكو ئەو ماڵ و سامانەی لەبەر دەستیەتی، بۆ خزمەتی خەڵك بەكاری بێنێ، نەك چاو ببڕێتە ماڵ و سامانی خەڵك، وەك وڵاتی خۆمان، هەرێم و عێراق و، دنیا بە گشتی، كە زۆر لە دەوڵەمەندەكان وەك دۆزەخیان لێهاتوە بەهیچ پڕنابن! وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ ٱمْتَلَأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ ﴾ ق، ئەو ڕۆژەی بە دۆزەخ دەڵێین: هەر پڕ نەبووی؟ دەڵێ: چی دیكەش ماوە بێ! با زیاتر بێ! كەسانێك هەن بە چەند ملیار دۆلار سەروەت و سامانیان هەیە، كەچی چاویان لە مووچە و مەعاشی چەند كارمەندێكە، چاویان لەوەیە: بەهەر شێوەیەك بووە زیاتر سەروەت و سامانی خەڵك و وڵات بدزن و، خۆیانی پێ دەوڵەمەندتر بكەن، بۆیە پیرەمێردی شاعیر جوان دەڵێ:

تەماع وەك ئاوی سوێری دەریایە

هەر دەیخۆیتەوە و تەسەلات نایە

ئاوی سوێر، تاكو زیاتری بخۆیەوە، تینووتر دەبێ! بەڵێ حوكمڕان دەبێ چاوی لە ماڵ و سامانی خەڵك نەبێ، بەڵكو دەبێ خێروبێری وڵات بۆ خزمەتی خەڵك بەكاری بێنێ، ئنجا ذولقەرنەین وابووە، كاتێك كە خەڵكەكە پێی دەڵێن: ﴿ قَالُوا۟ يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴾، ئەی ذولقەرنەین! ئایا پیتاكت بۆ كۆبكەینەوە كە بەربەستێك لە نێوان ئێمە و یەئجووج و مەئجووجدا دروست بكەی؟ بۆ ئەوەی لە شەڕ و خراپەیان پارێزراو بین؟ پێشنیارەكەیان ڕەت دەكاتەوە و دەڵێ: ﴿ قَالَ مَا مَكَّنِّى فِيهِ رَبِّى خَيْرٌ ﴾، ئەوەی پەروەردگارم، منی تێدا باڵادەست كردوە و ئیمكانیەتێك كە خوا بە منی داوە، باشترە لەو پیتاكەی بۆم كۆدەكەنەوە، یانی: پێویستیم بە ماڵ و سامانی ئێوە نیە.

١٠)- حوكمڕان دەبێ هەوڵبدات: كۆمەڵگا دواكەوتووەكان و، خەڵك، هانبدات بۆ كاركردن و، عادەتی تەمبەڵیی واز لێبێنن، ئەوەتا ذولقەرنەین دوای ئەوەی پێشنیارەكەیان ڕەت دەكاتەوە، كە پیتاكی بۆ كۆبكەنەوە، باج و خەراجی بۆ كۆبكەنەوە، دەڵێ: ﴿ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ ﴾، بەڵام بە هێزی دەست هاوكارم بن، ماڵ و سامانەكەی خۆتان بۆ خۆتان، دەیەوێ كە خەڵكێكی ئیشكەر بن، گورج و گۆڵ بن و بجووڵێن، بەرهەمدار بن و وەك بابای تەنبەڵ زاریان نەكەنەوە داخۆ: كەینێ كەسێك بە خێری خۆی پارووێكیان دەخاتە نێو زار!!

١١)- سەقامگیركردنی هێمنیی و ئاسایش لە نێو كۆمەڵگادا، یەكێكە لە ئەركە هەرە لە پێشەكانی هەر حكومڕانێك، ئەوەتا ذولقەرنەین كاتێك بەرەو باكوور دەچێ و دەگاتە لای نێوان دوو چیایەكان، لە پێشیانەوە، لە دامێنیانەوە، كۆمەڵگایەك، خەڵكێك دەبینێ، كە زۆر دواكەتوون، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا ﴾، نیزیكە كە لە قسە تێنەگەن، یاخود: (لاَ يَكَادُونَ يُفْقِهُوْنَ قَوْلاً)، خەریكە نەتوانن كەس تێبگەیەنن، كەس لێیان تێناگات، لەبەر ئەوەی دوورە شارستانیی و تێكەڵیی بوون، بەڵام ذولقەرنەین، لەسەر پێشنیاری خۆیان ئەو بەربەستە لە نێوان ئەوان و یەئجووج و مەئجووجدا، دروست دەكات بۆ ئەوەی هێمنیی و ئاسایشیان بۆ فەراهەم بێنێ و دەستبەر بكات و، لە مەترسیی یەئجووج و مەئجووج بیانپارێزێ، چونكە هێمنیی و ئاسایش بناغەی ئاوەدانیی و بەرەو پێشچوونی كۆمەڵگایە.

١٢)- دەبێ ئینسان هەر كارێكی كرد، چ حوكمڕان، چ هەر كەسێكی دیكە، پێویستە بەوپەڕی وردەكاریی و ڕێكیی بیكات، بە چاكیی بیكات و ئەو پەڕی وردەكاریی و پیشەیی تێدا بەكاربێنێ، وەك پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: (**إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يُحِبُّ إِذَا عَمِلَ أَحَدُكُمْ عَمَلاً أَنْ يُتْقِنَهُ**) (**أخرجه البيهقي في شعب الإيمان: ٥٣١٢**)، واتە: بێگومان خوا حەز دەكات ئەگەر یەكێك لە ئێوە كارێكی كرد، بە وردەكاریی و، بە ڕێكیی بیكات، پیشەییانە بیكات، ذولقەرنەینیش ئەو بەربەستە كە لە نێوان ئەو خەڵكە دواكەتووە و، یەئجووج و مەئجووجدا، دروستی كردوە، تەماشا دەكەین: تەنانەت بە پێوەری ئێستاش زۆر وردەكاریی و لێزانیی و كارامەیی تێدا بەكار هێناوە: ئاسن سوور بكرێتەوە و، دوایی قوڕقوشم یاخود مسی قاڵكراوەی بەسەردا بكرێ، كە ئەوە دەبێتە شتێكی زۆر پتە و قایم و مەحكەم، نەهاتوە هەروا هاكەزایی شتێكیان بۆ بكات، بەڵام دوای چەند ڕۆژێك تێك بچێتەوە! وەك هەندێ لە بەرپرسانی ئەم وڵاتەی ئێمە[1]: هەركار و پرۆژەیەك كە دەیكەن: جادە، بەنداو، بینا...هتد، ئەوەندە تەنەخیی و خیانەتی تێدا دەكەن، دوای ماوەیەك هەڵدەوەشێتەوە و تێك دەچێ، لەبەر ئەوەی كواڵێتیی و چۆنیەتییەكەی زۆر بێهیز و پێزە، چونكە

---

(١) هەرێمی كوردستان و عێراقیش بەگشتی.

نەیانویستوە پارەی زۆری تێدا خەرج بكەن، ڕێژەیەكی زۆری پارەكە بۆ خۆیان گل دەدەنەوە و، بە كوالێتیی و چۆنیەتییەكی خراپ جێبەجێ دەكرێ، بۆیە تەنیا بەرگەی چەند ڕۆژێك، یاخود چەند مانگێك دەگرێ.

١٣)- بابای حوكمڕان و كار بەدەست، پێویستە بۆ خۆی چاودێریی كارەكان بكات، بەڵكو جاری وایە بەشدارییشیان بكات و، ئاگای لێیان بێ و، لە ژێر چاودێریی وردی خۆی دا كارەكان ئەنجام بدرێن، نەك لە دوورەوە تەماشا بكات، یان بەس بۆ ڕاگەیاندن و ڕیكلام بەردی بناغەكەی دابنێ، بەڵام دوایی لێی نەپێچێتەوە: ئایا بە چاكیی جێبەجێ كراوە؟ یان خیانەتی تێدا كراوە و دزراوە؟ چۆن كراوە و چۆن نەكراوە؟ لێی نەپێچێتەوە! یان تەنیا شریتەكە هەڵبڕێ، لە كۆتاییدا، بەڵام تەماشای نێوەڕۆك و چۆنیەتییەكەی نەكات! چونكە كە دەفەرموێ: ﴿ ءَاتُونِي زُبَرَ ٱلۡحَدِيدِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيۡنَ ٱلصَّدَفَيۡنِ قَالَ ٱنفُخُواْۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارٗا قَالَ ءَاتُونِيٓ أُفۡرِغۡ عَلَيۡهِ قِطۡرٗا ﴿٩٦﴾ ﴾، مانای وایە: بۆ خۆی چاودێریی وردی پرۆژەكەی كردوە، بەڵكو بە پێی ئایەتەكان، وا پێدەچێ خۆی بە كردەوەش بەشدار بووبێ لە كارەكاندا.

١٤)- بابای حوكمڕان، دەبێ گرنگیی بە هەموو توێژەكانی كۆمەڵگا بدات، پێشكەتوو بن، یان دواكەتوو، دەوڵەمەند بن، یان هەژار، زانا بن یان نەزان، مادام هاووڵاتیین و خەڵكن، ئەركیەتی كە خەمیان لێ بخوات، پێداویستییەكانیان دابین كات و، هێمنیی و ئاسایشیان بۆ بەرقەرار بكات و، لە مەترسیی بیانپارێزێ و خزمەتیان بكات، چونكە ئەو خەڵكە كە ذولقەرنەین بەربەستەكەی لە نێوان ئەوان و یەئجووج و مەئجووج دا دروست كرد، خوا دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوۡمٗا لَّا يَكَادُونَ يَفۡقَهُونَ قَوۡلٗا ﴾، خەڵكێكی بینی لە پێش ئەو دوو چیایەوە، كە هێندە دوا كەوتوو بوون، نیزیك بوو لە قسە تێنەگەن، یاخود: بەرانبەرەكەیان تێنەگەیەنن، (لاَ يُكَادُوْنَ يُفْقِهُوْنَ قَوْلاً)، ئەو خوێندنەوە (قراءة)شی هاتوە، بەڵام ئەوە كە دواكەوتوو بوون و نەزان و بە جێماو بوون و هەژار و داماو بوون، وای لە ذولقەرنەین نەكردبوو كە خەمیان لێ نەخوات و نادیدەیان بگرێ و، پشت گوێیان بخات و، بە كەمیان تەماشا بكات!

١٥)- هەر كەسێك كە بەرهەمێكی دەبێ، دەستكەوتێكی دەبێ، كارێك دەكات، حكومڕانە یان هەر كەسێكە، نابێ خۆی پێ هەڵكێشێ و پێی لە كەوڵی خۆی دەربچێ و شانازیی پێوە بكات، بەڵكو دەبێ خۆ بەكەمگرانە بە چاكەی خوای بزانێ و، سوپاسی خوای لەسەر بكات، چونكە ذولقەرنەین دوای ئەوەی كە ئەو بەربەستە مەحكەمە دروست دەكات، پێی لە خۆبایی نابێ، بەڵكو دەڵێ: ﴿ هَٰذَا رَحۡمَةٞ مِّن رَّبِّي ﴾، ئەوە بەزەییەك بوو لە پەروەردگارمەوە، واتە: ئەوە كە خوا

بۆی ئاسان کردم و، ئەو کەرستانەی بۆ دابین کردم و، هاوکاریی کردم، کە ئەم بەربەستە دروست بکەم، ئەوە بەزەییەك بووە لە پەروەردگارمەوە.

**١٦)- مرۆڤ بەخزمەتکردنی خەڵك لە ڕێی خوادا گەورەو بەڕێز دەبێ:**

دنیا و هەموو چاکە و خێر و خۆشیی و نیعمەتەکانی دنیا، بەرەو نەمانن، وەك زۆر جار گوتوومە: دنیا یان بە جێی دێڵی، یان بە جێت دێڵێ، یان ئەو لە دەست تۆ دەچێ، یان تۆ ئەو بەجێ دێڵی و، دەبێتە میراتت، لایەکیان هەر هەیە، کەواتە: نابێ مرۆڤ لە خۆبایی بێ بە چاکە و نیعمەتەکانی خوا و، بە خێر و خۆشییەکانی ژیانی دنیا، بەڵکو دەبێ هەوڵبدات لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاریان بێنێ، هەمیشەش ڕەزامەندیی خوا، لە خزمەتکردنی خەڵك و، بەختەوەرکردنی خەڵك و، دابین کردنی بەرژەوەندییەکانی خەڵکدایە.

ئنجا ئینسان چەندە لە سوڕگەی خۆی، خۆی: وەك شەخص، وەك حیزب، وەك خزم و عەشیرت، لە سوڕگەی خۆی بچێتە دەرێ، بۆ سوڕگەی خەڵك، ئەوەندە گەورەتر دەبێ، خوای پەروەردگار کە باسی پێغەمبەرانمان (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بۆ دەکات، هەروەها شوێن کەوتووانی ڕەسەنی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، وا باسیان دەکات کە لە خزمەتی خەڵك دابوونە و، لە سوڕگەی خۆیان دا نەخولاونەوە، ئەنانیی نەبوون، بەڵکو ڕەببانیی بوون و ئینسانیی بوون، لە خزمەتی خەڵك و کۆمەڵگادا بوون، بۆ ئەوەی خوای پەروەردگار لە خۆیان ڕازی بکەن.

**١٧)- واقیع بینی و دوژمنی خۆ بەکەم نەگرتن و، پابەندیی بەشەریعەتەوەو، بڕیاری گەورە و گرنگ نەدان مەگەر لەسەر بناغەی زانیاریی ڕاست و ڕاوێژ:**

ئەم دەرس و پەندەی حەڤدەیەم و کۆتایی، لە بەسەرهاتی [خوارزم شاە] لەگەڵ (جەنگیزخان) پادشای تەتەر و مەغۆل وەردەگرین، بەو ئیعتیبارەی کە تەتەر و مەغۆل لە نەوەی (یەئجووج و مەئجووج)ن: کورتەی دەستپێکی بەسەرهاتی ناوبراو، ئەوەیە کە: [خوارزم شاە] بابایەکی ناواقیع بین بووە و، زانیاریی تەواوی دەربارەی تەتەر و مەغۆل نەبووە و، بەشێوەیەکی شەرعییانەش مامەڵەی نەکردوە لەگەڵ ئەو بازرگان و نوێنەرانەی جەنگیز خاندا، کە هاتوونە وڵاتەکەیەوە: با تەماشا بکەین:

هەر کام لە (إبن الأثير) لە مێژووەکەی خۆی (الكامل في التأريخ)[1]، لە ڕووداوەکانی ساڵی (٦١٧)ی کۆچییدا، لە ژێر ناوونیشانی: (ذكرُ خروج التتَرِ إلى بلاد الإسلام)، باسی دەرچوونی تەتەر بۆ وڵاتانی ئیسلام، لەوێدا باسی ئەوە دەکات کە چۆن [خوارزم

---

(١) ج١٢ ص٣٥٨ - ٣٧٠.

شاه) بازرگانەکانی کە جەنگیز خان ناردوونی بۆ وڵاتی ئەو، هەندێکیان دەکوژێ و ماڵەکەشیان لێ زەوت دەکات و ئەزیەتیان دەدا و، دەیانێرێتەوە بۆ لای جەنگیز خان، دوایش کە جەنگیز خان نامەیەك و دوو نوێنەران دەنێرێ: کە بۆچی وات کردوە؟ وەك دوایش نامەکەی جەنگیز خانیش دێنم، بەڵام دیسان (خوارزم شاه) لەو دوو کەسە یەکێکیان دەکوژێ و، ئەوی دیکەش بە شێوەیەکی ناشیرین بەڕێ دەکاتەوە بۆ لای جەنگیز خان! ئیدی لەوەوە جەنگیز خان ڕقی هەڵدەستێ و بڕیاری هێرشکردن دەدات. دوایی کە خوارزم شاه دەبیستێ ئەوە جەنگیز خان هەڕەشەی کردوە، ئنجا هەندێ خەڵك وەك جاسووس و پشکنەر و هەواڵگر دەنێرێ: بزانێ داخۆ ئەوانە کێن و چۆنن و چەندن؟ دوایی کە هەواڵەکەی بۆ دێننەوە:

١- سوپای ئەوانە لە ژمارە نایەت.

٢- ئەوانە گۆشت بەکاڵیی دەخۆن.

٣- ئەوانە وڵاخەکانیشیان پێویستییان بە لەوەڕ نیە.

٤- ئەوانە هەموو شتێکیان لە خۆیە.

٥- ئەوانە هیچ کەس بەرگەیان ناگرێ و...هتد!

تنجا (خوارزم شاه) بۆی دەردەکەوێ: ئەوانە کێن؟ کە بێگومان دەبووایە پێش ئەوەی ئەو مامەڵە خراپەیە لەگەڵ نوێنەرەکان و لەگەڵ بازرگانەکانیدا بکات، زانیاریی دەربارەی ئەوانە هەبووایە، پاشان مسوڵمان دەبێ پابەند بێ بە شەریعەتەوە:

أ- نوێنەر ناکوژرێ.

ب- کەسانێك کە بازرگانن و مەدەنیین، نابێ بکوژرێن و دەست درێژیی بکرێتە سەریان[1]!! ئەوە لەحاڵێك دا کەهی لایەنێك بن کە لەحاڵەتی جەنگیش دایە، چ جای لەحاڵەتی جەنگیش دا نەبێ!

### وشەی (تەتەر)و (مەغۆل):

لە سەرەتاوە وشەی (تەتەر) زیاتر باو بووە، لەوشەی (مەغۆل) کە تەنیا لە سەدەی چوارەمی کۆچیی دا، کە دەکاتە سەدەی دەیەمی زایینی، وشەی مەغۆل پەیدا بووە،

---

(١) هەروەها بڕوانە: (تأريخ الإسلام السياسي والديني والثقافي والإجتماعي) د. حسن إبراهيم حسن، ج٤ ص١٣٠. (غزوات المغول). ص١٣٩ غزوات جنكيزخان.

مێژوو نووسان گوتوویانە: پادشای ئەو وڵاتە ناوی {ئەلیجا خان} بووە، دوو کوڕی هەبوون، {تەتار خان} و {مەغۆل خان} کەواتە: هەردووك هۆزی تەتەر و مەغۆل چوونەوە سەر ئەو دوو کوڕە، بەڵام دوایی وشەی (تەتەر) زاڵ بووە و، دوایی مەغۆلەکان دەسەڵاتیان زیاتر بووە، بۆیە زیاتر وشەی مەغۆل بەکارهاتوە، ئەگەرنا هەر جارە یەکێکیان زیاتر دەسەڵاتی بووە.

**نامەکەی جەنگیزخان:**

ئەو نامەیەی (جەنگیز خان) دەینێرێ بۆ خوارزم شاە موحەممەد، کە نازناوەکەی {عەلائەددین} بووە: {عەلائەددین خوارزم شاە موحەممەد} تەماشای ئەو نامەیە بکەن ئەگەر ڕاست بێ شتی زۆر مەنتیقیی تێدایە:

(كيف تَجَرّأتم على أصحابي ورجالي، وأخذتم تجارتي ومالي؟ أتُحرّكون الفتنة النائمة، وتُنَبِّهون الشرور الكامنة؟ أو ما جاءكم عن نبيِّكم: (وعليكم أن تمنعوا من السفاهة غَنِيَّكم، وعن ظلم الضعيف، غويَّكم)،؟! أو ما بَلَّغكم عنه مرشدوكم: (أُتركوا الترك ما تركوكم)؟ وكيف تؤذون الجار وتسيئون الجوار، ونبيُّكم قد أوصى به؟ ألا إن الفتنة نائمةٌ، فلا توقظوها، وهذه وصاياي إليكم فَعُوها واحفظوها، وتلافوا التّلَف، قبل أن ينهض داعي الإنتقام، وينفتح عليكم سَدُّ يأجوج ومأجوج، وسينصر الله المظلوم، ولينسلنّ عليكم يأجوج ومأجوج من كلّ حَدَبٍ)[1].

واتە: چۆن وێران کە هاوەڵان و پیاوانی من بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵدا بکەن؟ چۆن بازرگانیی و سامانێك کە من ناردوومە بۆ وێ، دەستتان بەسەردا گرتوە؟ ئایا ئاژاوەی خەوتوو بەخەبەر دێنن؟ خراپە شێردراوەکان بێدار دەکەنەوە؟ ئایا لە پێغەمبەرەکەتانەوە پێتان نەگەیشتوە کە فەرموویەتی: پێویستە دەوڵەمەندەکانتان لە نەفامیی بگێڕنەوە و، پێویستە خراپەکارەکانتان لە ستەم لێکردنی بێهێز بگێڕنەوە و دەستی بگرن؟

ئایا ئامۆژگارییکارەکانتان لە پێغەمبەرەکەتانەوە پێی ڕانەگەیاندوون کە فەرموویەتی: واز لە تورکان بێنن و، تاکو ئەوان لە ئێوە گەڕابن، ئێوەش لێیان گەڕێن؟ ئایا ئێوە چۆن ئازاری دراوسێ دەدەن و، لە دراوسێیەتییدا خراپە دەکەن؟ لە حاڵێکدا کە پێغەمبەرەکەتان ئامۆژگاریی کردوە لەگەڵ دراوسێ دا باش بن؟

---

(١) تفسير المراغي، ج٦، ص٢٠.

ئاگاداربن! ئاژاوە خەوتوویە، خەبەری مەكەنەوە! ئەمەش ئامۆژگاریی منە بۆ تێوە، وەری بگرن و لەبەری بكەن و، تێی بگەن: ئەو كەم و كوڕییەی ڕووی داوە، چاكی بكەنەوە، {واتە: قەرەبووی بكەنەوە} بەر لەوەی پاڵنەری تۆڵە ستانەوە هەڵسێ و، بەربەستی یەئجووج و مەئجووج بەسەرتان دا بكرێتەوە، ئەو كاتە خوا ستەملێكراو سەر دەخات و، یەئجووج و مەئجووج لە هەموو بەرزاییەك بەسەرتان وەردەبن!

شایانی باسە: دەگونجێ ڕاست بێ و ئەوە نامەی جەنگیزخان بووبێ و، دەشگونجێ ئەوە دوایی نووسرابێ، چونكە ئەوە (تحصیل الحاصل)ە و ئاكامەكەی بەو شێوەیە بووە! هەڵبەتە لە سەرچاوەكانی دیكەشدا هاتوە: كە (خوارزم شاه موحەممەد) كە حوكمڕانێكی گەورەی ئیسلام بووە لە ناوچەی پشت ڕووبار (ما وراء النهر)، ئەو كاتە بەشێوەیەكی ناشەرعیی و ناشایست مامەڵەی كردوە و، دواییش قۆناغ بە قۆناغ: هەتا سوپایەكەی جەنگیز خان هاتوون، قۆناغ بە قۆناغ هەر لەبەریان ڕایكردوە و، شارەكانی بەجێ هێشتوون و خەڵكەكەیان هەموو قەتڵ عام كراون، كە ئەمە هەم لە: (البداية والنهاية)ی (إبن كثير) و، هەم لە: (الكامل في التأريخ)ی (إبن الأثير)دا بە تەفصیل باسكراوە.

بەڵێ لەو كارەساتەش ئەو دەرس و پەندە وەردەگیرێ، كە ئینسان دەبێ واقیع بین بێ و، زانیاریی هەبێ و پابەند بێ بە شەریعەتەوە و، لە خۆبایی نەبێ بە تۆزە دەسەڵاتێك كە هەیەتی، بۆ ئەوەی تووشی بەڵایەك نەبێت، كە دوایی بۆی تەحەممول نەكرێ، چونكە حیسابی بۆ نەكردوە، كە زۆر نیزیكە لەسەریشی تووشی پاداشت نەبێ، مادام بەهۆی كەمتەرخەمییەوە بێ، چونكە مەرج نیە هەموو بەڵاو گرفتارییەك، مایەی سڕانەوەی گوناهو، پاداشت بێ![1]

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

(١) لە نامیلكەی: {تاقیكردنەوەی خوا بۆ بەندەكانی..} داو، لە تەفسیری سەرەتای سوورەتی (العنكبوت)دا، باسی ئەو مەسەلەیەمان كردوە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان دوازدە (١٢) ئایەتی کۆتایی (الكهف) دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٩٩ - ١١٠)، کە لە هەشتی یەکەمدا: خوای زانا و توانا باسی سەرەنجامی شوومی بێبڕوایان و، سزای سەخت و بێڕەزایان دەکات و، هۆی سزادانەکەشیان دەخاتە ڕوو، لە چوار ئایەتی کۆتاییشدا: سەرەتا باسی سەرەنجامی خێر و پڕ نوور و بەرەکەتی بڕوادارانی کردار باش دەکات، کە بریتیە لە باغەکانی فیردەوس، لەوێدا میوانداریان دەکرێ و، دوایی لە ئایەتی پێش کۆتاییدا، باسی ڕەهایی و بێ سنووریی زانیاریی خوا و وشەکانی کراوە.

لە ئایەتی کۆتاییشدا خوای بەرز و مەزن، فەرمان بە پێغەمبەری کۆتایی ﷺ دەکات، کە مرۆڤبوونی خۆی و یەکتایی خوا، دووپات بکاتەوە و ڕاشیبگەیەنێ: کە هەر کەسێك بە ئومێدی دیداری پەروەردگاری بێ، دەبێ کردەوەی باش ئەنجام بدات و، لە پەرستنی خوای پەروەردگاریشیدا، هیچ کەس نەکاتە هاوبەش.

﴿وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَجَمَعْنَاهُمْ جَمْعًا ﴿٩٩﴾ وَعَرَضْنَا جَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لِلْكَافِرِينَ عَرْضًا ﴿١٠٠﴾ الَّذِينَ كَانَتْ أَعْيُنُهُمْ فِي غِطَاءٍ عَنْ ذِكْرِي وَكَانُوا لَا يَسْتَطِيعُونَ سَمْعًا ﴿١٠١﴾ أَفَحَسِبَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنْ يَتَّخِذُوا عِبَادِي مِنْ دُونِي أَوْلِيَاءَ إِنَّا أَعْتَدْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَافِرِينَ نُزُلًا ﴿١٠٢﴾ قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا ﴿١٠٣﴾ الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ﴿١٠٤﴾ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا ﴿١٠٥﴾ ذَٰلِكَ جَزَاؤُهُمْ جَهَنَّمُ بِمَا كَفَرُوا وَاتَّخَذُوا آيَاتِي وَرُسُلِي هُزُوًا ﴿١٠٦﴾ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلًا ﴿١٠٧﴾ خَالِدِينَ فِيهَا لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا ﴿١٠٨﴾ قُلْ لَوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَادًا لِكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَنْ تَنْفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَدًا ﴿١٠٩﴾ قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَمَنْ كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا ﴿١١٠﴾﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

[لـەو ڕۆژەشـدا لێیـان دەگەڕێیـن، هەندێکیـان لـە نێـو هەندێکیانـدا بێـن و بچـن و لـوول بخـۆن (شـەپۆل بـدەن) و، فـووش بـە کەڕەنـادا کـرا، ئنجـا کۆمانکردنـەوە بـە کۆکردنەوەیەکـی تایبـەت (٩٩) دۆزەخیشـمان بـۆ کافـران ڕانوانـد، بـە ڕانواندنێکـی تایبـەت (١٠٠) ئەوانـەی لـە ئاسـت یـاد و بەرنامـەی منـدا، چاویـان پـەردەی بەسـەردا هەڵکشـابوو و، نەشـیاندەتوانی (هـەق) ببیسـتن (١٠١) ئایـا ئەوانـەی بێبـڕوان، پێیـان وایـە: بـەوە مەداریـان سـاز دەبـێ، کـە بەندەکانـم لـە جیاتـی مـن بکەنـە دۆسـت و پشـتیوان؟ بـە دڵنیایـی ئێمـە دۆزەخـمان کردۆتـە شـوێنی میوانداریـان! (١٠٢) بڵـێ: ئایـا هەواڵتـان بدەمـێ، کێـن زیانبارتریـن لـە کردەوەکانیاندا؟ (١٠٣) ئەوانـەی کـرد و کۆششـیان لـە ژیانـی دنیـادا بـێ سـەر و شـوێن بـووە و، پێشـیان وایـە کاری چـاك دەکـەن! (١٠٤) ئەوانـە کەسـانێکن بڕوایـان بـە نیشـانەکانی پەروەردگاریـان و بـە دیداریشـی نیـە، بۆیـە کـردەوە (چاکە)کانیـان پووچـەڵ بوونـەوە، ئنجـا لـە ڕۆژی قیامەتیشـدا کێشـیان بـۆ دانانێیـن (١٠٥) دۆزەخ سـزایانە بـە هـۆی بێبڕواییـان و، لـە سـۆنگەی ئـەوەوە کـە نیشـانەکان و پێغەمبەرانیـان، بـە گاڵتـە گرتـوە (١٠٦) بـە دڵنیایـی ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە و، کـردەوە چاکـەکان دەکـەن، باخەکانـی فیـردەوس شـوێنی میوانداریـی لێکردنیانـن (١٠٧) تێیانـدا هەمیشـەیی دەبـن و، لـێ گواسـتنەوەیان ناخـوازن (١٠٨) بڵـێ: ئەگـەر (ئـاوی) دەریـا مەرەکەب بووایـە، بـۆ (نووسـینی) وشـەکانی پـەروەردگارم (ئـاوی) دەریـا دەبـڕا، بـەر لـەوەی وشـەکانی پـەروەردگارم بڕابـان، هەرچەنـدە هێنـدەی دیکەشـمان (مەرەکـەب) بـۆ هێنابایـە (١٠٩) بڵـێ: مـن تەنیـا مرۆڤێکـی وەك ئێـوەم، سروشـم بـۆ دەکـرێ: کـە پەرسـتراوی (ڕاسـتەقینەی) ئێـوە تەنیـا یـەك پەرسـتراوە، ئنجـا کـێ بـە ئومێـدی دیـداری پەروەردگاریەتـی، بـا کـردەوەی بـاش بـکات و، هیـچ کـەس لـە پەرسـتنی پەروەردگاریـدا، نەکاتـە هاوبـەش (١١٠)]).

## ڕشیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَتَرَكْنَا): واتە: وازیان لێ دێنین، لێیان دەگەڕێین، وێڵیان دەکەین، (تَرَكَ الشَّيءَ: رَفَضَهُ قَصْداً وَاخْتِيَاراً، أو قَهْراً وَاضْطِرَاراً)، (تَرَكَ الشَّيءَ)، واتە: شتەکەی ڕەفز کرد، وازی لێ هێنا، بە ئانقەست و هەڵبژاردنی خۆی، یاخود بە ناچاریی و بە زۆر لێکراویی.

(يَمُوجُ): (مَاجَ يَمُوجُ وَتَمَوَّجَ تَمَوُّجاً: إضْطَرَبَ اضطراب المَوْجِ)، واتە: جووڵاو، تێکەڵ بوو، وەك چۆن شەپۆلی دەریا، لوول دەخوا و تێکەڵ دەبێ.

(الصُّورِ): (الصُّورُ: قِيلَ هُوَ مِثْلُ قَرْنٍ، يُنْفَخُ فِيهِ فَيَجْعَلُ اللّهُ ذَلِكَ سَبَباً لِعَوْدِ الأرْوَاحِ إلى أجْسَادِهَا)، (صور) گوتراوە: وەك قۆچێك وایە، کە فووی پێدا دەکرێ، خوا ﷻ ئەوە دەکاتە هۆکاری ئەوە کە ڕووحەکان بگەڕێنەوە بۆ جەستەکانیان.

بە کوردیی پێی دەگوترێ: کەڕەنا و بە عەرەبیی دەگوترێ: (بُوق)، هەندێکیش گوتوویانە: ئەوە ڕەمز و هێمایە بۆ ئەوە: وەك چۆن سەربازانێك کە مەشقیان پێ دەکرێ، بووقیان بۆ لێدرا، هەموویان کۆ دەبنەوە، ئەو ڕووحانەش، کاتێك خوا ﷻ فەرمان دەکات، بەو شێوەیە کۆدەبنەوە، وەك سەربازی مەشق پێکراو.

(عَرَضْنا): واتە: ڕاماننواندن، پێشانمان دان، خستماننە گۆڕێ.

(نُزُلاً): (النُّزُلُ: مَا يُعَدُّ للنازِلِ مِنَ الزَّادِ)، (نُزُل) ئەو خۆراکەیە کە ئامادە دەکرێ بۆ میوان.

(ضَلَّ سَعْيُهُمْ): (ضَلَّ الشَّيءُ: ضَاعَ وَهَلَكَ، يَضِلُّ ضَلاَلاً، والضَالَّةُ: مَا ضَلَّ مِنَ البَهِيمَةِ)، (ضَلَّ الشَّيءُ)، واتە: ئەو شتە زایە بوو، فەوتا، دەگوترێ: (يَضِلُّ ضَلاَلاً)، واتە: ئەو شتە ون دەبێ بە ون بوون، زایە دەبێ بە زایە بوون، بەو ئاژەڵە دەگوترێ کە ون بووە لە خاوەنی، کە لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، قەدەغەی کردوە لە مزگەوتدا بانگەواز بکرێ بۆ ئاژەڵێك کە ون بووە، چونکە شوێنی ئەوە نیە.

(فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ): واتە: کردەوەکانیان هەڵوەشاونەوە، (حَبِطَ عَمَلُهُ: بَطَلَ ثَوابُهُ)، واتە: پاداشتەکەی هەڵوەشاوەتەوە، (حَبَطُ) حاڵەتێکە ئاژەڵ لەوەڕ زۆر بخوا، دوایی سکی پێی بئاوسێ و پێی بفەوتێ، یاخود تووشی نەخۆشیی بێ.

(ٱلْفِرْدَوْسِ): (حَدِيقَةٌ فِي الجَنَّةِ، البُسْتَانُ الجَامِعُ لِكُلِّ مَا يَكُونُ فِي البَسَاتِينِ وَالجَنَّةِ)، (فردوس)، باغێکە لە باغەکانی بەهەشت، باغێکی تایبەتە، یاخود باغێکە کۆکەرەوەیە بۆ هەموو ئەوەی لە باغەکانی دیکەدا دەبێت، واتە: باغێکی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو ناز و نیعمەتەکان، دواییش باسی دەکەین، کە باشترین و خۆشترین شوێن لە بەهەشتدا، فیردەوسە.

(لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا): واتە: ناخوازن لێی بگوازنەوە، (بَغَى الشَّيْءَ: طَلَبَهُ، وَابْتَغَى الشَّيْءَ طلبه بِجِدٍ)، واتە: ئەو شتەی داواکرد، ویستی، بە دوایدا گەڕا، بەگرنگیی پێدانەوە لێی خەفتا.

(حِوَلًا): (الحِوَلُ: الإِنْتِقَالُ مِنْ موضع إلى آخر)، (لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا)، واتە: نایانەوێ کە لێی بگوازنەوە، لێی بچنە دەر، ئەوێ بە جێ بهێڵن.

(مِدَادًا): (سَائِلٌ يُكْتَبُ بِهِ)، (مِداد) شلەیەکە، گیراوەیەکە پێی دەنووسرێ، مەرەکەب.

(لَنَفِدَ): واتە: تەواو دەبوو، (نَفِدَ: فَنِيَ وذَهَبَ، أَنْفَدَ فُلَانٌ، فَنِيَ زَادُهُ وَذَهَبَ مَالُهُ)، (لنفد)، واتە: تەواو بوو، ڕما، (أَنْفَدَ فُلَانٌ)، واتە: فڵان کەس زاد و زەخیرەکەی تەواو بوو، ماڵ و سامانەکەی نەما.

(مَدَدًا): (المَدَدُ: مَا يُمَدُّ بِهِ الشَّيْءُ)، (مَدَد) هەرشتێك شتێکی پێ ئیمداد بکرێ و، بخرێتە کەڵی، (مَدَدْتُهُ بِمَدَدٍ: قَوَّيْتُهُ وأعنته بِهِ)، هاوکارییم کرد، بەهێزم کرد ئیمداد کردن ئەوەیە کە شتێك شتی دیکەی بخرێتە گەڵ، بۆ ئەوەی نەبڕێ و بیگەیەنێتە جێی مەبەست.

(لِقَآءَ رَبِّهِۦ): دیداری پەروەردگاری، دەگوترێ: (لاقَاهُ مُلَاقَاةً وَلِقَاءً: قَابَلَهُ وَصَادَفَهُ)، واتە: تووشی بوو، چوو بەرەو ڕووی چوو، بە کوردیی دەڵێن: دیداری خوا، دیداری خواش ﷻ وەك هەموو سیفەتەکانی خوا، بە شێوەیەکە کە شایستەی خوای پەروەردگار بێ.

## مانای گشتی ئایەتەكان

خوا ﷻ لە كۆتایی سوورەتی (الكهف)دا، تێكهەڵكێش لەگەڵ بەسەرهاتی (ذو القرنین) دا، كە باسی ئەو بەربەستەی كرد كە دروستیكردوە و دوایی گوتی: ﴿ قَالَ هَٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُ دَكَّاءَ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي حَقًّا ﴾، گوتی: ئەمە بەزەیی پەروەردگارم بوو [كە توانیم ئەم بەربەستە دروست بكەم، ئەمە بۆ ئەو كۆمەڵگایە بكەم و مەترسیی یەئجووج و مەئجووجیان لێ دووربخەمەوە] بەڵام هەر كاتێك بەڵێنی پەروەردگارم هات، تەختی دەكات، یاخود: وردو خاشی دەكات.

(جعلە دَكّاءَ) یەكسانی كرد لەگەڵ زەوی دا، بەڵام (جعلە دَكّاً) واتە: وردو خاشی كرد و، بەڵێنی پەروەردگاریشم ڕاستە، ئنجا ئایا بەڵێنی پەروەردگار، ئەو كاتەیە كە بەربەستی بەردەمی یەئجووج و مەئجووج لادەچێ، یان مەبەست پێی هاتنی ڕۆژی دواییە؟ هەردووكیان گونجاون، بەڵێ خوای تاك و پاك تێكهەڵكێش لەگەڵ ئەمەدا دەفەرمووێ: ﴿ وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَجَمَعْنَاهُمْ جَمْعًا ﴾، لەو ڕۆژەدا وازیان لێ دێنین، هەندێكیان لەگەڵ هەندێكیاندا تێكەڵ و ئاوێتە ببن و شەپۆل بدەن، فووش بە كەڕەنادا كراو، هەموویانمان بە كۆكردنەوەیەكی سەرسوڕهێنەر كۆكردەوە.

هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ﴿ وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ ﴾، واتە: لەو ڕۆژەدا كە یەئجووج و مەئجووج ئەو بەربەستەیان لەبەر دەمدا نامێنێ، لێیان دەگەڕێین بێن، كە دەبێ مەبەست پێی: دواجارو جاری كۆتایی دەرچوونیان بێ، چونكە جاری یەكەمیان لە دوای دابەزینی قورئان، وەك پێشتر باسمان كرد، ساڵی (٦١٦ و ٦١٧)ی كۆچیی بووە، كە دێن بەسەر دنیا وەردەبن، هەم جیهانی ئیسلامیی، هەم ڕووسیا، هەم بەشێكی ئەورووپا دەخەنە ژێر ڕكێفی خۆیان، بەڵام دواجاری دەرچوونیان، دەبێ ئەوجارە بێ كە پێش ئاخیر زەمان دەبێ، دەگونجێ خوا ﷻ لێرەدا دەربارەی جاری كۆتاییان بدوێ، چونكە دەفەرمووێ: ﴿ وَنُفِخَ فِي الصُّورِ ﴾ یانی: دوا بە دوای ئەوەی كە ئەوانە پێكەوە شەپۆل دەدەن، بە نێو یەكدا دێن و دەچن، هێندە زۆرن، فوو بە صووردا دەكرێ، وا پێدەچێ دنیا بەسەر واندا كاول ببێ و تێكبچێ، ﴿ فَجَمَعْنَاهُمْ جَمْعًا ﴾، كۆمان كردنەوە بە كۆبوونەوەیەكی تایبەت.

هـەروەك دەشـكونجێ: لێـرەدا مەبەسـت كـۆی مرۆڤایەتیـی بـێ، كـە لەوكاتـەدا لەسـەر زەوی دەژیـن، نـەك تەنیـا یەئجـووج و مەئجـووج.

﴿ وَعَرَضْنَا جَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لِّلْكَٰفِرِينَ عَرْضًا ﴾، لـەو ڕۆژەدا دۆزەخ ڕادەنوێنیـن بـۆ بێبڕوایـان، بە ڕانوانـدن و خسـتنەڕوویێكی زۆر تایبـەت و سەرسـوڕهێنەر، كـە هـەر شایسـتەی خوایـە، كـە بـەو شـێوەیە دۆزەخ ڕابنوێنـێ، ئنجـا ئایـا ئـەو بێبڕوایانـە، كێـن؟!

﴿ ٱلَّذِينَ كَانَتْ أَعْيُنُهُمْ فِى غِطَآءٍ عَن ذِكْرِى ﴾، ئەوانـەی كـە چاویـان لەبەرانبـەر بەرنامـەو یـادی منـدا لـە ژێـر پـەردە دابـوو، پـەردە بەسـەر چاویـان هەڵكشـا بـوو، ﴿ وَكَانُوا۟ لَا يَسْتَطِيعُونَ سَمْعًا ﴾، نەشـیاندەتوانی گـوێ بیسـت بـبن، واتـە: نـە دەیانتـوانی هـەق ببینـن، نـە دەشـیانتوانی هـەق ببیسـتن، كـە بێگومـان بـۆ خۆیـان وایـان لـە خۆیـان كـردوە، چونكـە لـە ئەنجامـی گوناهـو تاوانـدا، مـرۆڤ هەسـتەوەرەكانی لـە كار دەكـەون، نەعەقڵـی بـاش شـت دەرك دەكات، نـە گوێـێ هـەق دەبیسـتێ و نەچـاوی دەبینـێ و، نـە زاری هـەق دەڵـێ!!

﴿ أَفَحَسِبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَن يَتَّخِذُوا۟ عِبَادِى مِن دُونِىٓ أَوْلِيَآءَ ﴾، ئایـا ئەوانـەی بێبـڕوان، پێیـان وایـە كـە بەنـدەكانی مـن لـە جیـاتی مـن بكەنـە دۆسـت و پشـتیوانی خۆیـان؟ واتـە: ئایـا پێیـان وایـە كـە بەنـدەكانی مـن شایسـتەی ئـەوەن، لـە جیـاتی مـن، بیانكەنـە دۆسـت و پشـتیوان و مشـوورخۆری خۆیـان؟

ئایـا ئەوانـەی بێبـڕوان، پێیـان وایـە بـەوە مەداریـان سـاز دەبـێ كە بەنـدەكانی من، لـە جیاتی مـن بكەنـە سەرپەرشـتیاری خۆیـان؟! دیـارە ئـەم پرسـیاركردنە پرسـیاركردنی نكوولیلێكەرانەیـە، واتـە: خەیاڵیـان خـاوە، نەدەبـوو وا بیـر بكەنـەوە، ﴿ إِنَّآ أَعْتَدْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَٰفِرِينَ نُزُلًا ﴾، ئێمـە دۆزەخـمان ئامـادە كـردوە، وەك شـوێنی میوانداریـی بـۆ بێبڕوایـان، ئەگـەر پێشـوازییان لێبكـرێ و میوانداریـان بكـرێ، لـە دۆزەخـدا میوانداریـان دەكـرێ!

بـە تەئكیـد ئەمـە بـە توانـج و تەوسـەوەیە، ئەگەرنـا ئایـا دەبـێ لـە دۆزەخ دا چ جـۆرە میوانداریـی و پێشـوازییەك هەبـێ؟! بـە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِٱلْأَخْسَرِينَ أَعْمَٰلًا ﴾، بڵـێ: ئایـا هەواڵتـان پێبـدەم كـێ لـە هەمـوو كـەس لـە كردەوەكانیـدا زیانبارتـر و ڕەنجەڕۆتـرە و، لـە جیـاتی ئـەوەی لێیـان بەهرەمەند بـێ، لێیـان زەرەرمەند بـووە؟ ﴿ ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، ئەوانـەی كۆششـیان لـە ژیـانی دنیـادا ون بـووە، واتـە: تەنیـا گرنگییـان بـە ژیـانی دنیـا داوە و، كاتی ژیانـە دنیاییەكەشـیان بـە جێهێشـتوە، كـردو كۆششـەكەیان ون بـووە، یاخـود هەمـوو هـەول و تەقەللایـان لـە ژیـانی دنیـادا بـووە و، هـەر لـەوێ زایـە بـووەو،

بـەشی قیامـەتی لـێ نەمـاوە، ﴿ وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ﴾، کەچـی پێشـیان وایـە کـە کارێـکی بـاش دەکـەن، کـە دنیایـان کردۆتـە جێگـەی ئەوپـەڕی گرنگیـی و بایەخیـان!!

﴿ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ ﴾، ئـا ئەوانـە کەسـانێکن بێبـڕوان بە نیشـانەکانی پەروەردگاریـان، نیشـانەکان (آيات):

١- دەگونجێ ڕستەکانی قوڕئان بن.

٢- دەگونجێ دیاردە سروشتییەکان بن.

٣- دەگونجێ موعجیزەی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) بن.

ئـا ئەوانـەن کـە بێبـڕوان بـە نیشـانەکانی پەروەردگاریـان، هەروەهـا بـە دیـداری پەروەردگاریـان.

وشەی (كفروا) دەگونجێ:

أ- مەبەست پێی بێبڕوایی بێ.

ب- دەشکونجێ مەبەست سپڵەیی و بێ وەفایی بێ بەرانبەر نیعمەتەکانی خوای بەخشەر، ﴿ فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ ﴾، کردەوەکانیان هەڵوەشاونەوە، یانی: کردەوە چاکەکانیان، کە بە ڕواڵەت چاك بوون، یاخود: چاك بوون و، مەبەست تێیاندا خوای دادگەر نەبووە، ﴿ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا ﴾، بۆیە لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا، کێش و سەنگیان بۆ دانانێین، یاخود تەرازوو دانانێین تاکو کردەوەکانیان هەڵسەنگێنین، هیچی نەماوە، تاکو خوا هەڵیسەنگێنی، خراپەکان ئەوە دیارن، ئەوی دیکەش: کردەوەیەکی باشیان نەماوە، تاکو هەڵبسەنگێنرێ، بزانرێ بایی چەندە؟ ﴿ ذَٰلِكَ جَزَاؤُهُمْ جَهَنَّمُ بِمَا كَفَرُوا وَاتَّخَذُوا آيَاتِي وَرُسُلِي هُزُوًا ﴾، ئا ئەوە سزایانە کە دۆزەخە، بە هۆی ئەوەوە کە بێبڕوابوون، یاخود: سپڵە بوون و، بە هۆی ئەوەشەوە، کە ئایەتەکان و پێغەمبەرانی ئێمەیان بە گاڵتە گرتوەو، گاڵتەیان پێکردووە.

ئنجـا ئەگـەر بێبـڕوا و سـپڵەکان، ئـەوە سـەرەنجامی شـوومیان بـێ، بێگومـان سـەرەنجامی بـڕوادارانی خـوا بەیەکگـر، جۆرێـکی دیکەیـە، بۆیـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلًا ﴾، بێگومـان ئەوانـەی ئیمانیـان هێنـاوەو، کـردەوە چاکەکانیـان ئەنجـام داون، ئەوانـە لـە باخـەکانی فیردەوسـدا میوانداریـان دەکـرێ و، ئـەوێ شـوێنی میواندارییانـە.

﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يَبۡغُونَ عَنۡهَا حِوَلٗا ﴾، بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە و، ناخوازن لێیان بچنە دەرێ، ناخوازن لێیان بگوازنەوە، چونکە هیچ شوێنێکیان لەوێ باشتریان، پێ شك نایەت و بووونی نیە.

ئنجا خوا ﷻ لە کۆتایی ئەم سوورەتە موبارەکەدا، باسی زانیاریی بێ سنووری خۆی دەکات، دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّوۡ كَانَ ٱلۡبَحۡرُ مِدَادٗا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّي ﴾، بڵێ: ئەگەر دەریا مەرەکەب بووایە، بۆ ئەوەی وشەکانی پەروەردگارمی پێ بنووسرێن، ﴿ لَنَفِدَ ٱلۡبَحۡرُ قَبۡلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّي ﴾، ئاوی دەریا دەبڕا، بەر لەوەی وشەکانی پەروەردگارم ببڕێن و، تەواو بێن، ﴿ وَلَوۡ جِئۡنَا بِمِثۡلِهِۦ مَدَدٗا ﴾، ئەگەر بە ئەندازەی خۆیشی زیادەمان خستبایە سەر، هەر دەبڕا، واتە: ئەگەر دەریاکانی سەر زەوی چەندن، هێندەی دیکەشیان بخرێتە گەڵ، بۆ ئەوەی وشەکانی پەروەردگاریان پێ بنووسرێن، دەریاکان دەبڕێن، بەر لەوەی وشەکانی پەروەردگارت کۆتاییان پێ بێ و ببڕێن.

﴿ قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ ﴾، بڵێ: من تەنیا مرۆڤێکم وەك ئێوە ﴿ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ ﴾، سروشم بۆ دەکرێ کە پەرستراوی ئێوە یەك پەرستراوە، پەرستراوی ئێوە کە شایستەی پەرستران بێ، یەکە، نیدی کە دەچن شتانێك دەپەرستن کە شایستەی پەرستن نین، یان وەك خۆتانن، یان لە خۆشتان کەمترن، ئەوە بەس خۆتان بە پەرستراویان دادەنێن، لە خەیاڵ و زەینتان دا، بەڵام لە واقیعدا و، لە لای خوا، پەرستراوی بە هەق تەنیا یەکێکە، ئەویش خوای پەروەردگارە، ﴿ فَمَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلۡيَعۡمَلۡ عَمَلٗا صَٰلِحٗا ﴾، ئنجا هەر کەس بە ئومێدی دیداری پەروەردگاریەتی، حەز دەکات بە دیداری خوا بگات و ببینێ و، میوانی بێ لە بەهەشت دا، با کردەوەی باش ئەنجام بدات، ﴿ وَلَا يُشۡرِكۡ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا ﴾، لە پەرستنی پەروەردگاریشیدا هیچ کەس نەکاتە هاوبەش و، هەرچی کە وەك پەرستن، بۆ پەروەردگاری ئەنجامی دەدات، با بۆ هیچ کەسێکی دیکە - هەروەها هیچ شتێکی دیکە - ئەنجامی نەدات.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**خوا دەفەرموێ: لەو ڕۆژەدا وێڵمان کردن: شەپۆل ئاسا بە نێو یەکدا بێن و بچن و، فووش بە کەڕەنادا کرا ئنجا کۆمان کردنەوە، بەڵام کۆکردنەوە! دۆزەخیشمان لەو ڕۆژەدا بۆ بێبڕوایان ڕانواند، ئەوانەی لە ئاست یادی مندا پەردەیان لەبەر چاوان بوو و، نەیاندەتوانی (هەق) ببیستن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَجَمَعْنَاهُمْ جَمْعًا ﴿٩٩﴾ وَعَرَضْنَا جَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لِلْكَافِرِينَ عَرْضًا ﴿١٠٠﴾ الَّذِينَ كَانَتْ أَعْيُنُهُمْ فِي غِطَاءٍ عَن ذِكْرِي وَكَانُوا لَا يَسْتَطِيعُونَ سَمْعًا ﴿١٠١﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەو ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ﴾ لەو ڕۆژەدا: وازمان لێ هێنان، یاخود: وێڵمان کردن، هەندێکیان بە نێو هەندێکیاندا بچن، ئاوێتەو تێکەڵ ببن و شەپۆل بدەن، ئەمە دوو واتایان هەڵدەگرێ:

أ- دەگونجێ مەبەست پێی ئەو ڕۆژە بێ، کە یەئجووج و مەئجووج، بە یەکجاریی بەربەستیان لەبەردەمدا نامێنێ و، بە دنیا وەردەبن، کە یەکێکە لە نیشانە گەورەکانی هاتنی ئاخیر زەمان.

ب- دەشگونجێ مەبەست پێی ڕۆژی دوایی بێ، واتە: ئەو کاتەی خوا خەڵك کۆدەکاتەوە، لە گۆڕەپانی لێپرسینەوەدا.

کەواتە:

١) (يَوْمَئِذٍ) یانی: (يوم خروج يأجوج ومأجوج) ڕۆژی دەرچوونی یەئجووج و مەئجووج، بۆ دواجاریان.

٢) یاخود: (يَوْمَئِذٍ) یانی: (يوم القيامة) ئەو ڕۆژەی کە مرۆڤەکان زیندوو دەکرێنەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿بَعْضَهُمْ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ﴾ (أي: يَضْطَرِبُون اضْطِرَابَ المَوْج) واتە: مرۆڤەکان دێن و دەچن، ئاوێتەو تێکەڵ دەبن و، شەپۆل دەدەن.

بەڵام هەندێک لە زانایان گوتوویانە: مەبەست ئەوەیە لەو ڕۆژەدا: یەئجووج و مەئجووج لە نێو خۆیاندا تێکبەر دەبن، چونکە کەس لە دنیادا نامێنێ شەڕی لە دژ بکەن، چونکە هەموو دنیا دەخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان.

٢)- ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ﴾، فووش بە کەڕەنا داکرا، (محمد الطاهر بن عاشور) و هەندێك لە ڕوونکەرەوانی ماناو مەبەستەکانی قورئان، دەڵێن: ئەوە وێناکردنێکە بۆ ئەوە، کە وەك چۆن ئەگەر فەرماندەی سوپایەك فیکە لێدەدا، سەربازەکان هەموویان دێنە بەر دەستی، خوای باڵادەستیش کاتێك کە ئیسرافیل ڕادەسپێرێ، فوو بە کەڕەنادا بکات، هەموو ئەوانەی کە لەسەر زەوی ژیاون، ڕووحەکانیان دەچنەوە نێو جەستەکانیان و کۆدەبنەوەو ڕیز دەبەستن.

بەڵام دەڵێم: ئەو مانایەشی هەر هەیە، کە کەڕەنا (قَرْن) یەکێکە لە دروستکراوەکانی خواو بەس خوا دەزانێ چۆنە؟ (صاحب القرن) ئیسرافیل، فووی پێدا دەکات، وەك لەم دەقەدا هاتووە:

[عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كَيْفَ أَنْعَمُ، وَقَدِ الْتَقَمَ صَاحِبُ الْقَرْنِ الْقَرْنَ، وَحَنَى جَبْهَتَهُ، وَأَصْغَى سَمْعَهُ، يَنْتَظِرُ أَنْ يُؤْمَرَ، أَنْ يَنْفُخَ، فَيَنْفُخَ»، قَالَ الْمُسْلِمُونَ: فَكَيْفَ نَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «قُولُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ، تَوَكَّلْنَا عَلَى اللَّهِ رَبِّنَا»] (أَخْرَجَهُ التِّرْمِذِيُّ: ٢٥٥١، وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ).

واتە: ئەبوو سەعیدی خودریی ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چۆن خۆشیی و لەززەت وەربگرم، لە حاڵێکدا کە خاوەنی قەڕن (کەڕەنا، قۆچ) قەڕنی بە دەمەوە گرتووە و نێوچەوانی خوار کردۆتەوەو، گوێی هەڵخستووە، کەینێ فەرمانی پێدەکرێ، فووی پێدا بکات، ئەویش فووی پێدا بکات؟! مسوڵمانان گوتیان: چی بڵێین، ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بڵێن: خوامان بەسەو، ئەو باشترین کارپێسپێردراوە [پشت بە خوا ببەستن].

٣)- ﴿فَجَمَعْنَاهُمْ جَمْعًا﴾، [دوای فووکردن بە کەڕەنا] کۆمانکردنەوە، بەڵام چ کۆکردنەوەیەك!]

ئەگەر ئینسان بیهێنێتە پێش چاوی خۆی: لە ئادەم تاکو دوا مرۆڤ، کە دێتە سەر زەوی، ئەو هەموو ملیار ملیار مرۆڤانە، چ پانتاییەك دادەگرن؟! وەك لە شوێنی دیکەشدا جاری دیکە باسمان کردوە، ئەو شوێنەی لێی کۆدەبنەوە، ئەم سەر زەوییەی ئێمە نیە، چونکە جێگایان نابێتەوە، ئەگەر یەکی لەسەر سانتیمەتر دووجایەکیش بن، جێیان نابێتەوە، بگرە ئەگەر شوێنی دەریاکانیش ببێتە وشکانیی، جێگایان نابێتەوە، ئەگەر بێت و

بە وردیی حیسابی بکەین! بۆیەش خوا دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ ﴾إبراهيم، واتە: ئەو ڕۆژەی کە نە زەوی وەك خۆی دەمێنێ، نە ئاسمانەکان و، هەموویان بۆ خوای تاکی ملپێکەچکەر دێنە گۆڕێ.

کەواتە: ئەو زەوییەی کە کۆبوونەوەو لێپرسینەوەی لەسەر دەکرێ، ئەم زەوییەی ئێستای ئێمە نیە، چونکە پانتاییەکەی بەشی ئەوە ناکات، وەك لە تەفسیری سووڕەتی ئیبراهیم دا، بە تەفصیل باسمان کردوە.

٤)- ﴿ وَعَرَضْنَا جَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لِّلْكَٰفِرِينَ عَرْضًا ﴾، لەو ڕۆژەشدا دۆزەخ ڕادەنوێنین بۆ کافران، بە ڕانواندنێکی سەرسوڕهێنەرو تایبەت.

هەر کام لە وشەی: (جَمْعًا) و (عَرْضًا) چاوگ (مصدر)ن و جەختکەرەوەن بۆ مانای ئەوە: کە ئەو ڕانوندن و کۆکردنەوەیە، ڕانواندن و کۆکردنەوەیەکی ڕاستەقینەیە، ئنجا کە بە نامۆ (نکرة)ش هاتوون، واتە: ڕانواندنێك و کۆکردنەوەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەرو مەزنە.

ئنجا پێناسەی ئەو کافرانە دەکات، کە دۆزەخیان بۆ ڕادەنوێنرێ، دەفەرموێ:

٥)- ﴿ ٱلَّذِينَ كَانَتْ أَعْيُنُهُمْ فِى غِطَآءٍ عَن ذِكْرِى ﴾ یانی: ئەوانەی کە چاویان لە پشت پەردەوە بوو، لە بەرانبەر یادو بەرنامەی مندا، واتە: وەك چۆن، ئەگەر کەسێك پەردە بەسەر چاوی هەڵکشابێ، هەر شتێکی بێتە پێش چاوی، نایبینێ، بە هەمان شێوە: ئەوانەش، وەك پەردە لەسەر چاویان بێ، بۆیە نەیاندەتوانی لەبەرانبەر یادی مندا: بینەر بن.

٦)- ﴿ وَكَانُواْ لَا يَسْتَطِيعُونَ سَمْعًا ﴾، هەروەها نەشیاندەتوانی ببیستێ.

یانی: نەك هەر نەیاندەبیست، بەڵكو نەیاندەتوانی ببیستن، چاویشیان بەو دەردە چوو بوو.

بێگومان ئەمە مەبەست پێی ئەوە نیە، کە خوای پەروەردگار ستەمی لێکردبن و وای لێکردبن، بەڵكو یانی: ئەوەندەیان گوناهو تاوان کردوون، هەستی بینین و بیستنی خۆیانیان لە کارخستوون! ئەم ڕاستییەش لە زۆر شوێنی دیکەی قورئاندا باس کراوە.

**مەسەلەی دووەم:**

**خوا دەفەرموێ: ئایا ئەوانەی بێبڕوان، پێیان وایە بەوە مەداریان ساز دەبێ، کە بەندەکانم لە جیاتی من بکەنە دۆست و پشتیوان؟ بە دڵنیاییی ئێمە دۆزەخمان بۆ میواندارییی لێکردنی بێبڕوایان ئامادە کردوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَفَحَسِبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن يَتَّخِذُواْ عِبَادِي مِن دُونِيٓ أَوۡلِيَآءَۚ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا جَهَنَّمَ لِلۡكَٰفِرِينَ نُزُلٗا ١٠٢ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿ أَفَحَسِبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن يَتَّخِذُواْ عِبَادِي مِن دُونِيٓ أَوۡلِيَآءَ ﴾، ئایا ئەوانەی بێبڕوان، پێیان وایە کە بەندەکانی من، لە جیاتی من، بکەنە دۆست و پشتیوان.

کرداری (حسب) دوو بەرکاران دەخوازێ: ﴿ أَفَحَسِبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن يَتَّخِذُواْ عِبَادِي مِن دُونِيٓ أَوۡلِيَآءَ ﴾، ئەمە لە شوێنی بەرکاری یەکەمە و، بەرکاری دووەمیش، سێ ئەگەری هەن:

**یەکەم:** (أي: أفحسبوا اتخاذهم أولياء من دوني، نافعاً لهم) ئایا پێیان وا بوو بە دۆست و پشتیوانگرتنی بەندەکانی من، لە جیاتی من، سوودبێگەیەنەریانەو مەداریان ساز دەکات!

**دووەم:** ئایا پێیان وایە ئەگەر بەندەکانی من لە جیاتی من بکەنە دۆست و پشتیوان، بۆیان دەبنە پەرچ لەبەردەم سزای مندا؟

**سێیەم:** کە زەمەخشەریی هەڵیبژاردوە، واتە: ئایا ئەوانەی بێبڕوان، پێیان وایە لە قیامەتیش دەتوانن بەندەکانی من بە دۆست بگرن و، بیانکەنە پشتیوانی خۆیان؟

هەر سێ واتاکانیش بەجێن.

بەڵام من واتای یەکەمیانم پێ لە هەموویان بەهێزترە، کە دەڵێ: ئایا پێیان وایە: بە دۆست و پشتیوانگرتنی بەندەکانی من لە جیاتی من، سوودگەیەنەرە بۆ ئەوان و مەداریان ساز دەکات؟! ئەگەر وا بێ، خەیاڵ پڵاویان کردوە، هەمزە (أ) کەش، بۆ پرسیارکردنی نکووڵیی لێکەرانەیە.

٢)- ﴿ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا جَهَنَّمَ لِلۡكَٰفِرِينَ نُزُلٗا ﴾، ئێمە دۆزەخمان بۆ بێبڕوایان، کردوە بە شوێنی میوانداریی.

(أعتدنا) لە ئەصڵدا (أعددنا)یە، (إعداد)یش واتە: ئامادە کردن، (نُزُلًا) واتە: وەك شوێنی پێشوازیی و پشوودان و خزمەت کردنیان.

کە بە تەئکید ئەمە: بە توانج و تەوسەوە قسە کردنە، یانی: ئەگەر بێبڕوایان شوێنێك هەبێ، تێیدا پێشوازیی بکرێن و، خزمەت بکرێن و پشووی تێدا بدەن، بێگومان دۆزەخە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**بڵێ: ئایا هەواڵتان پێ بدەم: کێ لە هەموو کەس زیانبارترینە لە کردەوەکانیاندا؟ ئەوانەی کۆششیان لە ژیانی دنیادا ون بووەو، پێشیان وایە کاری چاك دەکەن! ئەوانە کەسانێکن بە نیشانەکانی پەروەردگارو دیداریشی بێبڕوان، بۆیە کردەوەکانیان پووچەڵ بوونەوەو لە دوارۆژیشدا هیچ کێشیان بۆ دانانێین:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِٱلْأَخْسَرِينَ أَعْمَٰلًا ﴿١٠٣﴾ ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ﴿١٠٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ وَلِقَآئِهِۦ فَحَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا ﴿١٠٥﴾ ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُمْ جَهَنَّمُ بِمَا كَفَرُوا۟ وَٱتَّخَذُوٓا۟ ءَايَٰتِى وَرُسُلِى هُزُوًا ﴿١٠٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِٱلْأَخْسَرِينَ أَعْمَٰلًا ﴾، بڵێ: ئایا هەواڵتان پێ بدەم، کێ لە هەموو کەس لە ڕووی کردەوەکانیەوە، زیانبارترینە؟ بۆیە فەرموویەتی: (بِٱلْأَخْسَرِينَ أَعْمَٰلًا ) بە کۆ (جمع) هێناویەتی، چونکە هەموو جۆرە کردەوەکانیان دەگرێتەوە، ئنجا پەیوەندییان بە عەقیدەیانەوە هەبێ، یان پەیوەندییان هەبێ بە پەرستنەکانەوە، یان لایەنی کۆمەڵایەتیی، یان لایەنی ڕەوشتیی، یان لایەنی سیاسیی، هەمووی دەگرێتەوە.

ئایا ئەو کەسانە، کێن؟!

٢)- ﴿ ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، ئەوانەن کە کۆشش و هەوڵ و تەقەللایان لە ژیانی دنیادا زایەو ون بووە، واتە: وەك چۆن کەسێك بە ڕێگادا دەڕوات، دوایی لە ڕێگاکە ون دەبێ، چونکە (ضَلَّ الطريقَ) واتە: ڕێیەکەی ون کرد، بەڵام (ضَلَّ عَنِ الطريق) واتە: خۆی لە ڕێیەکە ون بوو، جا کەسانێك

کە هەوڵ و کۆششەکەیان ون بووە لە ژیانی دنیادا، وەك کەسێكن کە بە ڕێیەکدا دەڕوات، دوایی ڕێیەکە بزر دەکات و، تووشی هەڵدێر دەبێ.

٣)- ﴿ وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ﴾، کەچی پێشیان وایە کە ئەوان کاری باش دەکەن.

هەمیشە کەسێك کە ڕێی چەوت دەگرێ، ڕێیە چەوتەکەی خۆی بە ڕاست دەزانێ و، هەمیشە کەسێك کە کاری خراپ دەکات، بە زۆریی وایە: کارە خراپەکەی خۆی بە چاك دەزانێ، جاری واش هەیە کەسێك کە ڕێ ون دەکات، دەزانێ کە ڕێی ون کردوە.

کەسێك کە کاری خراپ دەکات و، دەزانێ کە کاری خراپ دەکات، ئەوە مانای وایە، نەزانینی سادە (**الجهل البسيط**)ی هەیە، بەڵام نەزانینی ئاوێتە (**الجهل المركب**) ئەوەیە: کەسێك ڕێی هەڵە کردبێ و، نەشزانێ کە ڕێی هەڵە کردوە، کەسێك، بزانێ ڕێی هەڵە کردوە، لەوانەیە ڕۆژێك هەوڵبدات، بگەڕێتەوە سەر ڕێیە ڕاستەکە، هەروەها کەسێك کە کاری خراپ دەکات، ڕەنگە ڕۆژێك هەوڵبدات دەستی لێ هەڵبگرێ، بەڵام کەسێك ڕێ هەڵە بکات و، واش بزانێ کە بە ڕێی ڕاستدا دەڕوات، یان: کاری خراپ بکات و، واش بزانێ کە کاری چاك دەکات، ئەوە گەڕانەوەو بادانەوەی زۆر قورسە، چونکە خۆی بە هەڵە نازانێ، تاکو بیر لە گەڕانەوە بکاتەوە!

لە چەند شوێنێکی قورئاندا خوای زاناوشارەزا باسی ئەوەی کردوە، بۆ وێنە، فەرموویەتی: ﴿ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًا فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٨﴾ ﴾ فاطر، واتە: ئایا کەسێك کە کردەوەی خراپی بۆ ڕازێنراوەتەوە، بەڵام بە چاکی دەبینێ، [ئایا تۆ دەتوانی هیچی بۆ بکەی؟]

وشەی (ضَلَّ سَعْيُهُمْ) دوو واتایان هەڵدەگرێ، واتە:

١- هەموو کردو کۆشش و تەقەللای خۆیان خستۆتە ژیانی دنیا و ژیانی دنیاش کە لەبەین چوو، واتە: هەموو هەوڵ و کۆششەکەیان ڕۆیی.

٢- ئەوانە هەوڵ و کۆششەکەیان مەرج نیە تەنیا بۆ ژیانی دنیا بووبێ، ڕەنگە بۆ ڕۆژی دواییش بووبێ، بەڵام لەبەر ئەوەی بە ڕێیەکی ڕاستدا نەبووە و بە ڕێیەکی هەڵەدا بووە، ون بووە لە ژیانی دنیادا.

٤)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ وَلِقَآئِهِۦ ﴾، ئەوانە کەسانێکن کە بە ئایەتەکانی پەروەردگاریان و بە دیداری پەروەردگاریان، بێبڕوا بوون، یاخود: بەرانبەریان سپڵەو بێ نمەك و بێ وەفا بوون.

٥)- ﴿ فَحَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ ﴾، كردەوەكانیان هەڵوەشاونەوە، واتە: كردەوە چاكەكانیان، ئەگەرنا كردەوەی خراپ هەر بۆ خۆی هیچە، لێرەدا مەبەست پێی كردەوەی چاكە: خزمەتی خەڵكیان كردوە، پەیوەندیی خزمایەتییان گەیاندوە، كاری باشیان كردوە، بەڵام لەبەر ئەوەی پەیوەستیان نەكردوە بە خواوە ﷻ و، پەیوەستیان نەكردوە بە ڕۆژی دواییەوە، بۆیە كردەوەكانیان هەڵوەشاونەوە.

٦)- ﴿ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا ﴾، لە ڕۆژی دوایی دا كێشیان بۆ دانانێین.

ئەم ڕستەیە سێ مانای هەن:

یەك: گرنگییان پێنادەین و بایەخیان پێنادەین، یانی: مەبەست لە (وَزْن) لێرەدا كێش و قورسایی مەعنەوییە، نەك ماددیی.

دوو: كێش و قورسایی (ثقل) یان نابێ لە تەرازوودا، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا هاتوە:

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّهُ لَيَأْتِي الرَّجُلُ الْعَظِيمُ السَّمِينُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، لاَ يَزِنُ عِنْدَ اللَّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ وَقَالَ: اقْرَءُوا: ﴿ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا ﴾}[1].

واتە: ئەبوو هورەیرە ﷺ، دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ كە فەرموویەتی: لە ڕۆژی قیامەتدا پیاوی (كەلەش) مەزنی قەڵەو دێ، كە لە لای خوا بە ئەندازەی باڵە مێشوولەیەك سەنگی نیە، هەروەها فەرمووی: ئەگەر دەتانەوێ بخوێننەوە: ﴿ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا ﴾.

سێ: واتایەكی دیكەی ئەم ئایەتە موبارەكە ئەوەیە: تەرازوو دانانێین بۆ هەڵسەنگاندنی كردەوەكانیان، چونكە خراپەكانیان ئەوە هیچ، چاكەكانیشیان هەڵوەشاونەوە، كەواتە: هیچیان نەماوە بكێشرێ.

بەڵام بە پێی فەرموودەكە، واتای دووەم بەهێزترە، هەرچەندە پێغەمبەری خوا ﷺ جاری وایە ئایەتێك زیاتر لە واتایەك دەگەیەنێ، بەڵام ئەو تەنیا واتایەكیان دەردەخات، ئەگەرنا مانای وا نیە، بەس ئەو واتایەی هەیە.

٧)- ﴿ ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُمْ جَهَنَّمُ ﴾، (أي: الَّذِي ذَكَرْنَاهُ مِنْ أَنْوَاعِ الوَعِيدِ، جَزَاؤُهُم)، واتە: ئا ئەوەی باسكرا لە هەڕەشەو لە سزا، ئا ئەوە سزایانە، كە دۆزەخە:

---

(١) أخرجه البخاري في: ٩٢ كتاب التفسير: ١٨ سورة الكهف: ٦ باب أولئك الذين كفروا بآيات ربهم.

(جهنم) دەبێتە (بیان) واتە: ئا ئەوە سزایانە کە بریتیە لە دۆزەخ، یاخود دەگونجێ لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە بەمجۆرە بێ: (ذَلِكَ: أي: الشَأنُ وَالحَالُ ذَلِك...) حاڵ بەو شێوەیەیە و سزاشیان دۆزەخە.

ئنجا ئایا ئەوانە کە سزایەکەیان دۆزەخە، هۆکارەکەی چییە؟!

٨)- ﴿ بِمَا كَفَرُواْ ﴾، بە هۆی بێبڕواییانەوە، یان بە هۆی سپڵەییانەوە، چونکە (كَفَروا) دەگونجێ مەبەست پێی (كفر)ی پێچەوانەی ئیمان بێ و، دەشگونجێ مەبەست پێی (كُفْرَان)ی پێچەوانەی (شكر) بێ، واتە: بە هۆی سپڵەییانەوە.

٩)- ﴿ وَٱتَّخَذُوٓاْ ءَايَٰتِي وَرُسُلِي هُزُوًا ﴾، دیسان بە هۆی ئەوەوەش کە نیشانەکانی منیان بە گاڵتە دەگرت، کە جۆرێك لە نیشانەکانی خوا، ئایەتەکانی قورئانن، هەروەها پێغەمبەرانی منیان بە گاڵتە گرتبوون، (هُزُواً: أي مَهْزُوءاً بِهَا) واتە: بە گاڵتەجاڕیان گرتبوون.

ئنجا ئایا مەبەست لەوانە کێیە؟

زانایان زۆر قسەیان لەوبارەوە کردوە، کە ئایا ئەوانەی کە لە هەموو کەس زیاتر دۆڕاوترن، لە کردەوە باشەکانیان دا و، لە هەموو کەس زیاتر لە کردەوە چاکەکانیان دا چوونە خەسارێ و زیانبار بوو ون، کێن؟

١- هەندێك گوتوویانە: جوولەکەو نەصرانییەکانن.

٢- هەندێك گوتوویانە: کافرەکانی مەککەن.

٣- هەندێك گوتوویانە: خەواریجن، کە ئەم ڕایە سەیرە، چونکە خەواریج دوایی پەیدابوون! مەگەر بگوترێ: چەمکی ئایەتەکان دەیانگرێتەوە.

٤- هەندێك گوتوویانە: ڕەبەنەکانن، ئەوانەی کە لە صەومیعەکاندا خواپەرستیی و گۆشەگیریی دەکەن، بەڵام مادام لەسەر ڕێیەکی ڕاست نیە، لە کردو کۆششیان دەچنە خەسارێ.

بەڵام باشتر وایە، واتاو چەمکەکەیان وەك خۆی، فراوان تەماشا بکرێ، وەك هەمیشە (طبري) عادەتی وایە و دەڵێ: بەڵگەیەکمان بە دەستەوە نیە کە ئەو تاقمە، جیا لەو تاقمە، مەبەستە، بەڵکو هەموو ئەوانەی ئەو سیفەتانەیان تێدان، دەیانگرێتەوە.

**مەسەلەی چوارەم:**

**بێگومـان ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوەو کـردەوە چاکـەکان دەکـەن، شـوێنی میوانداریـان باخـەکانی فیردەوسـن، بـە هەمیشـەیی تێیانـدا دەمێننـەوەو، حـەز ناکـەن لێیـان بگوازنـەوە،**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْفِرْدَوْسِ نُزُلًا ﴿١٠٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا ﴿١٠٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

**١)- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾، دوای ئەوەی خوا ﷻ باسی سەرەنجامی شوومی بێبڕوا و سپڵە خراپەکارەکان دەکات، ئنجا دێتە سەر باسی سەرەنجامی پڕ خێرو بەرەکەتی ئیماندارانی کردار باش:**

**دەفەرمـوێ: بێگومـان ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە و کـردەوە باشـەکان ئەنجـام دەدەن، واتـە: بڕوایـان هێنـاوە بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی کـە پێویسـتە بڕوایـان پـێ بهێـنرێ، - وەك زۆرجـار گوتوومانـە - هەروەهـا خەسـڵەت و کـردەوە باشـەکانیان ئەنجـام داون، چ پەیوەندییـان هەبـێ بـە لایـەنی ئیـمان و عەقیـدەوە، یـان ڕەوشـت و ئـاکار، یـان هەڵسـوکەوتە کۆمەڵایەتییـەکان، یـان هەڵسـوکەوتی سیاسـیی، ... هتـدەوە، ئـا ئەوانـە:**

**٢)- ﴿ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْفِرْدَوْسِ نُزُلًا ﴾، باخەکانی فیردەوسیان بۆ دەکرێنە شوێنی میوانداریی.**

**(الفـردوس البسـتان الجَامِـعُ لِـكُلِّ مَـا يَكُـونُ فِي البسـاتِيْنِ، وَإِضَافَـةُ الجَنَّـاتِ إِلى الفِـرْدَوسِ بَيَانِيَـةٌ، أي: جَنَّـاتٍ هِـيَ مِـنْ صِنْـفِ الفِـرْدَوس)[1]، واتـە: (فـردوس) ئـەو باخەیـە کـە کۆکەرەوەیـە بـۆ هەرچـی نـازو نیعمەتـە لـە هەمـوو باخەکانـدا و، لێـرەدا کـە (جنـات) پاڵدراوەتـە لای (فـردوس) ئەمـە پاڵـدانی ڕوونکردنەوەیـە واتـە: ئـەو باخانـەی کـە لـە جـۆری فیردەوسـن.**

**٣)- ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾، واتە: بە هەمیشەیی تێیان دا دەمێننەوە.**

**٤)- ﴿ لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا ﴾، واتە: ناخوازن، لێیان بگوازنەوەو، ئەوێ بەجێبهێڵن، چونکە هیچ شوێنێك لەوێ خۆشتر نیە.**

---

(١) التحرير والتنوير ج١٦، ص٥٠.

لەبارەی (فردوس)ەوە، ئەم فەرمایشتە هەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (... فَإِذَا سَأَلْتُمْ اللَّهَ، فَاسْأَلُوهُ الْفِرْدَوْسَ، فَإِنَّهُ أَوْسَطُ الْجَنَّةِ، وَأَعْلَى الْجَنَّةِ، وَفَوْقَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ، وَمِنْهُ تُفَجَّرُ أَنْهَارُ الْجَنَّةِ)[1].

واتە: ئەگەر داواتان لە خوا كرد، فیردەوسی لێ داوا بكەن، چونكە نێوەڕاستی بەهەشتە و، بەرزترین شوێنی بەهەشتە و، لە سەرووی فیردەوسەوە: عەرشی خوای خاوەن بەزەییە و، لە فیردەوسەوە ڕووبارەكانی بەهەشت هەڵدەقوڵێن و دێنە خوار.

---

(١) حديث أبي هريرة: أخرجه أحمد: ٨٤٠٠، والبخاري: ٦٩٨٧، مطولًا. ومن حديث معاذ: أخرجه ابن ماجه برقم ٤٣٣١، ومن حديث عبادة بن الصامت: أخرجه الحاكم برقم ٢٦٩، وأخرجه أيضًا: الترمذي: ٢٥٣١.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**خوا دەفەرمووێ: بڵێ: ئەگەر ئاوی دەریا هەمووی مەرەکەبی نووسینی وشەکانی پەروەردگارم بێ، بەر لەوەی وشەکانی پەروەردگارم تەواوبن، ئاوی دەریا دەبڕێ، هەرچەندە هێندەی دیکەشی بۆ بێنن.**

خوا دەفەرمووێ: ﴿قُل لَّوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَدًا ﴿١٠٩﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿قُل لَّوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَاتِ رَبِّي﴾، (مداد)[1]، واتە: بڵێ: ئەگەر (ئاوی) دەریا مەرەکەبی (نووسینی) وشەکانی پەروەردگارم بێ...

واتایەکی دیکەی (مداد) (زەیت)ە، وشەکانی پەروەردگار بە چرایەك چوێنراون و، ئاوی دەریاکانیش وەك زەیتێك کە دەکرێتە نێو چراوە، تاکو بئایسێ.

واتە: وشەکانی پەروەردگارم هێندە زۆرن، ئەگەر ئاوی دەریاکان کرابانە زەیت، بۆ ئەوەی چرای وشەکانی خوایان پێ دابگیرسێ، دەریاکان دەبڕان، بەر لەوەی کە چرای وشەکانی خوای پەروەردگار، ببڕێ.

بەڵام زیاتر وا پێدەچێ، مەبەست لە (مداد) مەرەکەبی قەڵەم، وەك دوایی باسی دەکەین، چونکە لە شوێنی دیکەدا خوا ﷻ ڕوونتر ئەوەی باس کردوە.

٢)- ﴿لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي﴾، ئەگەر ئاوی دەریا، مەرەکەبی وشەکانی پەروەردگارم بێ، ئاوی دەریا دەبڕێ، بەر لەوەی وشەکانی پەروەردگارم تەواو بن.

(نَفِدَ: فَنِيَ وَذَهَبَ)، تەواو بوو، ڕۆیی.

٣)- ﴿وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَدًا﴾، ئەگەر وێنەی خۆیشی لەگەڵ بهێنین.

---

(١) (المداد: المركب)، (مداد) یانی: مەرەکەب کە دەکرێتە قەڵەمەوە و پێی دەنووسرێ، کاتی خۆی قامیشیان تێ هەڵێناوە و پێیان نووسیوە.

(مَدَدْ) ناوە بۆ هەر شتێك كە دەخرێتە گەڵ شتێكی دیكەو، بۆی زیاد دەكرێ.

یانی: كە چوار لەسەر پێنجی گۆی زەوی ئاوە، ئەگەر دەریاكانی گۆی زەوی هەموویان مەرەكەب بن و، هێندەی دیكەشیان بخرێتە گەڵ و بكرێنە مەرەكەب، بۆ نووسینی وشەكانی خوای پەروەردگار، ئەو ئاوە هەموو دەبڕێ، پێش ئەوەی وشەكانی خوا تەواوبن.

لە سوورەتی (لقمان)دا بە جۆرێكی دیكە ئەم تەعبیرە دێنێ، دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّمَا فِي ٱلْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَٰمٌ وَٱلْبَحْرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٧﴾ ﴾، واتە: ئەگەر هەرچی درەختە لەسەر زەوی، بكرێنە قەڵەم و دەریاش كە لەسەر زەوی هەیە، لە دوای خۆی حەوت دەریای دیكەشی بخرێنە گەڵ، (بۆ نووسینی وشەكانی خوا) ئنجا وشەكانی خوا تەواو نابن، بێگومان خوا زاڵی كارزانە.

واتە: نەك ئاوی دەریاكان چەندە، هێندەی بخرێتە گەڵ، بەڵكو حەوت هێندەی دیكەشی بخرێتە پاڵ و، وشەكانی خوای پەروەردگاریان پێ بنووسرێن، وشەكانی خوا تەواو نابن.

یەكێك بۆی هەیە بڵێ: ئایا وشەكانی خوای پەروەردگار! كە مەبەست پێیان قورئان، یان هەموو كتێبەكانی خوا بێ، كەی هێندە زۆرن، تاكو هێندە مەرەكەبەیان بوێ؟

لە وەڵامدا دەڵێین: وشەكانی خوای پەروەردگار تەنیا ئەو وشانە نین، كە لە كتێبەكانی دا فەرمووني بۆ پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام)، بەڵكو زانایان گوتوویانە:

وشەكانی پەروەردگار، وەك چۆن ئەو وشانە دەگرێتەوە كە بۆ پێغەمبەرانی ناردوون، لە ڕێی وەحییەوە تاكو ئەوانیش بیگەیەنن، وێڕای ئەوە زانراوو، زانیارییەكانی خواش هەموویان دەگرنەوە، بەو واتایە كە زانیاریی و زانراوەكانی خوا، ئەگەر هەواڵیان پێ بدرێ لە شێوەی وشەدا، بە ئیعتیباری سەرەنجامەكەیان پێیان دەگوترێ: وشەكان.

كەواتە: وشەكانی خوا، یانی: هەموو زانیاریی و زانراوەكانی خوا، كە بێسنوورن، چونكە هەموو سیفەتەكانی خوا بێ سنوورن، بۆیە ئاوی دەریاكان هەرچەندە زۆریش بێ و، حەوت هێندەی دیكەشیان بخرێتە گەڵ، هەر سنووردارە و، بێگومان شتی سنووردارێش لە بەرانبەر شتی بێ سنووردا، دەبڕێ و شتە بێ سنوورەكە نابڕێ.

**مەسەلەی شەشەم:**

**خـوا دەفەرمـوێ: بڵـێ: مـن تەنیـا مرۆڤێـکی وەك ئێـوەم، سروشـم بـۆ دەکـرێ کـە پەرسـتراوتان تەنیا یـەك پەرسـتراوە، ئنجـا هـەر کـەس بـە لومێـدی دیـداری پەروەردگاریـەتی، بـا کـردەوەی بـاش بـکات و، لـە پەرسـتنی پـەروەردگاری دا هیـچ کـەس بەشـدار نـەکات:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا (١١٠) ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ ﴾، بڵێ: منیش تەنیا مرۆڤێکم وەك ئێوە، واتە: بە تەما مەبن: من نادیارو پەنهان بزانم و، چاوەڕوانییم لێ مەکەن: شتێك بکەم کە هی خوای پەروەردگارە، شتێك کە لە سنووری توانای بەشەردا نیە، لە منی چاوەڕوان مەکەن، چ لە ڕووی زانینەوە، چ لە ڕووی توانینەوە.

٢)- ﴿ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ﴾، بەڵام سروشم بۆ لا دەکرێ، کە پەرستراوتان یەك پەرستراوە، یانی: بەوە لە ئێوە جیادەبمەوە، کە سروشم بۆ دەکرێ، خوا بە شێوەی تایبەت، پەیامی پەنهانم بۆ دەنێرێ، ئەگەرنا منیش وەك ئێوە لە ڕووح و جەستە پێکهاتووم، سەرمام دەبێ، گەرمام دەبێ، خۆشییم پێ خۆشە، ناخۆشییم پێ ناخۆشە، ساغ دەبم نەخۆش دەبم، لە هەموو ئەو شتانەدا، وەك ئێوەم، شاعیرێك دەڵێ:

مُحَمَّدٌ بَشَرٌ وَلَيْسَ كَالْبَشَرِ ... بَلْ هو يَاقُوتَةٌ وَالنَّاسُ كَالْحَجَرِ

واتە: موحەممەد مرۆڤە، وەك مرۆڤانیش نیە ... بەڵکو ئەو گەوهەرەو خەڵکیش وەك بەردن

دیارە گەوهەریش هەر بەردە، بەڵام جۆرێکی تایبەتە.

٣)- ﴿ فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ ﴾، ئنجا هەر کەس بە تەمای دیداری پەروەردگاریەتی، بە تەمای لێخۆشبوون و بەخشش و ڕەزامەندیی پەروەردگاریەتی.

٤)- ﴿ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا ﴾، با کردەوەی باش ئەنجام بدات، کردەوەی باشیش هەموو ئەو کردەوانەن کە بە پێی شەریعەتی خوا، بە باش لە قەڵەم دەدرێن، هەر کردەوەیەکیش شەرعی

خوا بە باشی دابنێ، ئەوە عەقڵی سەلیم و سروشتی ساغیش بە باشی دادەنێن، بە پێچەوانەشەوە: هەر كردەوەیەك شەریعەت ڕەفزی بكات و بە خراپی دابنێ، عەقڵی سەلیم و سروشتی ساغیش، ڕەتی دەكەنەوەو بە خراپی دادەنێن.

٥)- ﴿ وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴾، هەروەها با لە پەرستنی پەروەردگاریدا، هیچ كەس نەكاتە هاوبەش، واتە: ئەو شتانەی وەك پەرستن، بۆ خوای پەروەردگاری ئەنجامیان دەدات، با هیچ كەسیان تێدا نەكاتە هاوبەش، چ بە پەنهانیی، كە بریتیە لە ڕووپامایی، چ بە ئاشكرا، كە بریتیە لە هاوبەش بۆ خوا دانانی گەورە، یاخود گچكە، چونكە هەر كردەوەیەك كە قبووڵ دەكرێ، دوو پایەی هەن:

یەكەم: بە پێی شەرع بێ.

دووەم: بە ساغیی بۆ خوا بێ.

لەوبارەوەش ئەم دوو فەرموودەیە دێنێن:

فەرموودەی یەكەم: {عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ أَخْوَفَ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمُ الشِّرْكُ الْأَصْغَرُ، قَالُوا: وَمَا الشِّرْكُ الْأَصْغَرُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: الرِّيَاءُ، يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِذَا جُزِيَ النَّاسُ بِأَعْمَالِهِمْ اذْهَبُوا إِلَى الَّذِينَ كُنْتُمْ تُرَاءُونَ فِي الدُّنْيَا، فَانْظُرُوا هَلْ تَجِدُونَ عِنْدَهُمْ جَزَاءً؟!} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٢٣٦٨٦، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح).

واتە: مەحموودی كوڕی لەبید ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوەی كە لە هەمـوو شتێك زیاتر مەترسییم لێی هەیە بۆ ئێوە، هاوبەش بۆ خوا دانانی گچكەترە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ هاوبەش دانانی گچكەتر چییە؟ فەرمووی: بریتیە لە ڕیابازیی، {كردەوەیەك بكەی مەبەستت پێی سەرنج ڕاكێشانی خەڵك بێ} خوا لە ڕۆژی قیامەتدا كاتێك كە پاداشتی خەڵك دەداتەوە، ئەوانەی ڕیابازییان كردوە، پێیان دەفەرموێ: بڕۆن لە دنیادا ڕیابازییتان بۆ كێ كردوە، داوای پاداشت لەوان بكەن.

فەرموودەی دووەم: {إِذَا جَمَعَ اللَّهُ النَّاسَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لِيَوْمٍ لَا رَيْبَ فِيهِ، نَادَى مُنَادٍ: مَنْ كَانَ أَشْرَكَ فِي عَمَلٍ عَمِلَهُ لِلَّهِ أَحَدًا، فَلْيَطْلُبْ ثَوَابَهُ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللَّهِ، فَإِنَّ اللَّهَ أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٥٨٧٦، وَالتِّرْمِذِيُّ: ٣١٥٤، وَابْنُ مَاجَه: ٤٢٠٣، وابْنُ حِبَّانَ: ٤٠٤، عَنْ أَبِي سَعْدِ بْنِ أَبِي فَضَالَةَ الْأَنْصَارِيِّ).

واتـە: کاتێـك لـە ڕۆژی قیامـەت دا خـوا خەڵـك بـۆ ڕۆژێـك کۆدەکاتـەوە، کـە دوودڵیـی هەڵناگـرێ، بانگکەرێـك جـاڕ دەدات: هــەر کەسـێك کردەوەیــەکی کــردوە، بــەشی یەکێــکی دیکـەی جگەلـە خـوای تێکـردوە، بـا پاداشـتەکەی لـە لای جگـە لـە خـوا داوا بکاتـەوە، چونکـە خـوا بێنیازترینـی هاوبەشـانە، لـە هاوبەشـییەتی.

یـانی: هـەر کەسـێك کردەوەیـەکی بـۆ خـوا ئەنجامدابـێ، بـەشی جگەلـە خـوای تێخسـتبێ، خـوا دەفەرمـوێ: ئـەوە بەشـەکەی خۆشـم دا بـەو.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی لـەو کەسانەمان بگێـڕێ: کـە هەرچی کـە دەیکەیـن، تەنیا مەبەسـتمان پێـی ڕەزامەندیـی خوابـێ و، مەبەسـتمان ئەوەبـێ کـە بەختـەوەرو سـەربەرزبین بـە هـۆی پەرسـتنی خـواوە و، سـەرفرازو ڕوو سـوور بیـن، بـە هـۆی خـۆ سـاغکردنەوەمانەوە بـۆ خـوا.

دوا پێداچوونەوەی

تەفسیری سوورەتی (الكهف):

٢ / ذي القعدة / ١٤٤١ ك

٢٣ / ٦ / ٢٠٢٠ ز

بەڕێـــــزان!

**ئەمـرۆ کـە: ١٥/ ذي الحجـة/ سـاڵی ١٤٣٨ی کۆچیـی، بەرانبـەر: ٦/ ٩/ ٢٠١٧ زاییینییـە، لـە شـاری هەولێـر بـە پشـتیوانیی خـوا، دەسـت دەکەیـن بـە ڕوونکردنـەوەی مانـاو مەبەسـتەکانی سـوورەتی مەڕیـەم.**

## پێناسە و نێوەڕۆکی سوورەتی مەڕیەم

**١)- نـــاوی ئەم ســـوورەتە: ئەم سووڕەتە یەك ناوی هەیە، ئەویش بریتیە لە (مەڕیەم)، هەڵبەتە هەندێکیشیان گوتوویانە: سووڕەتی: (کاف، هاء، یاء، عین، صاد) بەڵام ئەوە کەمترە، سووڕەتی (مەڕیەم) زیاتر ئەو ناوەی بۆ بەکارهاتوە.**

**٢)- ڕیزبەندی لە موصحەف و لە دابەزین دا:** سووڕەتی مەڕیەم سووڕەتێکی مەککەییە لە ڕیزبەندیی (مصحف)دا، ژمارە نۆزدە (١٩)یە و، واتە: هەژدە (١٨) سووڕەتی لە پێشەوەن و، لە ڕیزبەندیی هاتنە خوار (**ترتیب النزول**)دا، ژمارە چل و چوارە (٤٤)ە، بە لای زۆربەی هەرە زۆری شارەزایان، کە سووڕەتەکانی قوڕئانیان بە پێی ڕیزبەندیی دابەزینیان ڕیز کردوون، واتە: پێش سووڕەتی (**طه**) و، دوای سووڕەتـی (**فاطر**) هاتۆتە خوار.

تاشکراشـە کـە مسـوڵمانبوونی عومـەری کـوڕی خەتتـاب (ﷺ)، دوای دابەزینـی سـووڕەتی (**طـه**) بـووە، وەك لـە بەسـەرهاتەکەی دا دیـارە، کـە لـە (**السـيرة النبويـة لابـن هشـام**)[1]دا، بەسـەرهاتەکەی هاتـوە، کـە تەنیـا جێـی مەبەسـتی لێـی دێنیـن، دەڵـێ: (**فَرَجَـعَ عُمَـرُ عَامِـداً إِلَى أُخْتِـهِ وَخَتَنِـهِ، وَعِنْدَهُـمَا خَبَّـابُ بْـنُ الأَرَتِّ مَعَـهُ صَحِيفَـةٌ فِيهَـا: «طـه» يُقْرِئُهُـمَا إِيَّاهَـا**)، واتـە: عومـەر (ﷺ) گەڕایـەوە بـۆ لای خوشـکەکەی و زاوایەکـەی {کـە نـاوی زەیـد بـووە} کـە چـۆوە لـە ماڵەکەیـان دا: خەببـابی کـوڕی ئـەڕەت (ﷺ)، لەلایـان بـوو {لـە پێـش ئەوانـدا مسـوڵمان بـووە} چەنـد پەڕەیـەکی پـێ بـوون، سـووڕەتی (**طه**)یـان تێـدا بـوو، بـۆی دەخوێندنـەوە و پێـی دەخوێنندنـەوە، {شـارەزای دەکـردن لـە سـووڕەتی (**طـه**)}.

کەواتـە: سـووڕەتی (طـه) پێـش مسـوڵمان بـوونی عومـەری کـوڕی خەتـاب دابەزیـوە، هەرچەنـدە (**محمـد الطاهـر بـن عاشـور**) لـە تەفسـیرەکەی خـۆی (**التحریـر والتنویـر**)دا دەڵـێ:

---

(١) ج١، ص١٧٤.

سوورەتی مەریەم کە لە ڕیزبەندیی موصحەفدا چل و چوارەمین (٤٤)ە، دەڵێن: لە ساڵی چواری (٤) پێغەمبەرایەتیی دا دابەزیوە!

بەڵام پێم وایە: ئەوە وا نیە، چونکە هەم مسوڵمانبوونی عومەر (ﷺ) دواکەوتووە و لە ساڵی چوارەمدا نەبووە، چونکە:

١- پێغەمبەر ﷺ سێ ساڵان هەر بە پەنهانیی بانگەوازی کردوە.

٢- پاشان پێش مسوڵمان بوونی عومەر (ﷺ)، وەك هەر لە (السيرة إبن هشام)دا هاتوە، کۆچکردنی یەکەمی مسوڵمانان بۆ حەبەشە، ڕوویداوە.

بۆیە پێموایە بەلای کەمەوە سوورەتی مەریەم لە ساڵی شەشەم، یان حەوتەمی پێغەمبەرایەتیی (بعثة)دا دابەزیوە، واتە: شەش ساڵ بووە، یان حەوت ساڵ بووە کە موحەممەد ﷺ بە پێغەمبەر هەڵبژێردراوەو، بانگەوازی بۆ لای خوای پەروەردگار کردوە، وەك پێغەمبەرو ﷺ ڕەوانەکراوی خوا، ئنجا سوورەتی مەریەم دابەزیوە.

٣- قورئانی مەککەیی هەمووی لە مەککە هاتۆتە خوارەوە و، هەمووی بە کۆ دەوری هەشتاو شەش(٨٦) سوورەتە، ئنجا ئەگەر دابەشی بکەین بەسەر ئەو سێزدە (١٣) ساڵەدا، دیسان لەو ڕووەشەوە هەر زوویە، کە بڵێین: چل و چوار (٤٤) سوورەت، لە ماوەی چوار (٤) ساڵی یەکەمی قۆناغی مەککەدا، دابەزیون!!

٣)- ژمارەی ئایەتەکانی: ژمارەی ئایەتەکانی سوورەتی مەریەم، لەلای خەڵکی مەککەو مەدینە: نەوەدونۆ (٩٩) و، لەلای خەڵکی شام و کووفە: نەوەد و هەشت (٩٨)ە، ئەو موصحەفانەی کە لەلای ئێمەن، ئەو ڕایەیان تەبەننیی کردوە، کە ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە موبارەکە: (٩٨)ە، پێشتریش باسمان کردوە: کە هەندێکیان دەڵێن: (٩٩) ئایەتە و، هەندێکیان دەڵێن: (٩٨) ئایەتە، مانای وانیە ئەوانەی کە دەڵێن: (٩٨)ە، ئایەتێك کەمتر بڵێن، نەخێر، بەڵکو هۆکارەکەی: درێژیی و کورتیی ڕستەکانە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الفاتحة)دا، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ ٧ ﴾الفاتحة، هەندێکیان هەتا ئێرە بە ئایەتێك دادەنێن و ئەوەی دیکە: ﴿ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ٧ ﴾الفاتحة، بە ئایەتێکی دیکە دادەنێن، هەندێکیشیان هەمووی بە یەك ئایەت دایدەنێن، واتە: لە درێژیی و کورتیی ئایەتەکان، لە کوێ ڕستەکە کۆتایی دێ و، لە کوێ ڕستەی دووەم دەست پێ دەکات، لەوەدا ڕاجیاییان هەبووە، ئەگەرنا لەسەر وشەیەك نا، بەڵکو لەسەر پیتێکی قورئانیش زانایان مشت ومڕیان نەبووە، کە یەکێك بڵێ: ئەو وشەیەی تێدایە، ئەوەی دیکە بڵێ: تێیدانیە.

**٤)- نێـوەڕۆکـی ئەم سـوورەتە:** نێوەڕۆکی ئەم سوورەتە، هەمان نێوەڕۆکی سوورەتە مەککەییەکانە و، پانتاییەکی زۆریش، کە زیاتر لە (٣/٢)ی پانتایی سوورەتی مەریەمە، تەرخانکراوە بۆ بەسەرهاتی هەر کام لە: (زکریا، یحیی، مریم، عیسی، إبراهیم، موسی، إسماعیل، إدریس)، (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، وێڕای ناوهێنانی هەندێکی دیکە لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) وەك (إسحاق، يعقوب، هارون) بەڵام ئەم پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) هەر کامیان بە قەبارەیەکی تایبەت بەسەرهاتەکەی، یاخود ئاماژەیەك بە بەسەرهاتەکەی، لەم سوورەتە موبارەکەدا هاتوە.

کـۆی ئـەو بەسـەرهاتانە لـەم سوورەتەشـدا هاتـون، ئایەتـەکانی: (١ - ٦٥)، دەگرنـەوە، واتـە: لـە نـەوەد و هەشـت (٩٨) ئایەتەکـە، شەسـت و پێنـج (٦٥) ئایـەت تەرخانکـراون، بـۆ بەسـەرهاتی ئـەو پێغەمبەرانـە (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم) کـە ناومـان هێنـان.

**٥)- تایبەتمەندییەکانی ئەم سوورەتە:** دوای سەرنجدانی زۆرم بۆ ئەم سوورەتە موبارەکە، وام کەوتۆتە بەرچاو کە پێنج (٥) تایبەتمەندیی هەن، تایبەتن بەم سوورەتەوە و، هەر کام لە سوورەتەکانیش تایبەتمەندیی خۆیانیان هەن:

## تایبەتمەندییەکانی ئەم سوورەتە :

١)- ئەم سوورەتە تاکە سوورەتێکە، بە پێنج (٥) پیتی پچڕ پچڕ، (**الحروف المُقَطَّعَة**) دەستی پێکردبێ: (**كهيعص**)، بێگومان سوورەتی (**الشورى**)ش، بە پێنج (٥) پیتان دەستی پێکردوە، بەڵام ئەو پێنج پیتەی سەرەتای سوورەتی (**الشورى**) بە دوو ئایەت دانراون: (**حم، عسق**)، واتە: لەلایەن شارەزایان و زانایانەوە ئەو پێنج پیتە لێك دابڕاون و، بە دوو ئایەت سەرژمێر کراون.

٢)- لەم سوورەتەدا شازدە (١٦) جاران وشەی (**الرحمن**) هاتوە و، چوار (٤) جاریش وشەی (**رحمة**) هاتوە: (رَحْمَتِ رَبِّكَ، وَرَحْمَةً مِّنَّا، مِّن رَّحْمَتِنَا، مِن رَّحْمَتِنَآ)، واتە: بیست (٢٠) جاران باسی بەزەیی خوا ﷻ کراوە.

٣)- تەنیا لەم سوورەتەدا باسی چۆنیەتی حەشرکردنی پارێزکاران و تاوانباران کراوە، کە دوو جۆرە کۆکردنەوەی جیاوازن:

وەك لـە ئایەتـەکانی: (٨٥ و ٨٦)دا، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿يَوْمَ نَحْشُرُ ٱلْمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحْمَٰنِ وَفْدًا ﴿٨٥﴾ وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴿٨٦﴾﴾ مریـم، واتـە: ئـەو ڕۆژە کـە پارێـزکاران بـەرەو خـوای

خاوەن بەزەیی، بە سواریی وەك نوێنەر {وەك شاندێكی ڕێز لێگیراو} كۆدەكەینەوە، هەروەها ئەو ڕۆژە كە تاوانباران لێ دەخورین بەرەو دۆزەخ بە تینوویێتیی، یان: وەك چۆن ڕەوە ئاژەڵێك دەبەی بۆ سەر ئاو ئاویان بدەی، لێیان دەخورین و پێش خۆمانیان دەدەین.

لە شوێنی دیكەدا بۆ وێنە: لە سوورەتی (الزمر)دا خوای كارزان باسی كۆكردنەوەی هەر كام لە پارێزكاران و بێبڕوایان دەكات، بەڵام بۆ هەردووكیان وشەی: (سیق)ی بەكارهێناوە: ﴿ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا ﴿٧١﴾ ﴾ ... ﴿ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ رَبَّهُمْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ زُمَرًا ﴿٧٣﴾ ﴾الزمر، وشەی (سیق) بۆ هەردووكیان بەكارهاتووە، واتە: بەڕێكران، بەڵام لێرەدا (مریم - ٨٥، ٨٦) بە دوو تەعبیر و وشەی جیاواز باسی كۆكردنەوەی، هەر كام لە پارێزكاران و تاوانباران كراوە.

٤)- لەم سوورەتەدا بەرپەرچدانەوەی پاڵدانی ڕۆڵە بۆ لای خوا ﷻ، بە بەهێزترین شێواز، خراوەتەڕوو، لە زۆر سوورەتاندا، خوای تاك و پاك بیرۆكەی ڕۆڵە پاڵدانە لای خوای، بەرپەرچداوەتەوە، بەڵام لەم سوورەتەدا - بە بۆچوونی بەندە - لە دوو توێی هەشت (٨) ئایەتدا (٨٨ - ٩٥)، بە بەهێزترین شێواز ئەو بیرۆكەیە بەرپەرچ دراوەتەوە، ئەمەش دەقی ئەو ئایەتانەیە:

﴿ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ﴿٨٨﴾ لَّقَدْ جِئْتُمْ شَيْـًٔا إِدًّا ﴿٨٩﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ ٱلْأَرْضُ وَتَخِرُّ ٱلْجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوْاْ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدًا ﴿٩١﴾ وَمَا يَنۢبَغِى لِلرَّحْمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴿٩٢﴾ إِن كُلُّ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّآ ءَاتِى ٱلرَّحْمَٰنِ عَبْدًا ﴿٩٣﴾ لَّقَدْ أَحْصَىٰهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا ﴿٩٤﴾ وَكُلُّهُمْ ءَاتِيهِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فَرْدًا ﴿٩٥﴾ ﴾مريم.

ئەم هەشت (٨) ئایەتە كە دوایی دەیانگەینێ، بەهێزترین بەرپەرچدەرەوەن بۆ ئەو بیرۆكە ئەفسانەییە و، تەنانەت ئاوازی وشەكانیش هەر بەهێز و سەخت و پتەوەو ئاماژە بۆ مەبەست و نێوە ڕۆكیان دەكەن.

٥)- تەنیا لەم سوورەتەدا، باسی چوونی سەرجەم مرۆڤەكان بۆ لای دۆزەخ كراوە.

بەڵێ بەپێی سەرنجدانی من لە قورئان، تەنیا لەم سوورەتەدا لە هەردوو ئایەتی: (٧١ و ٧٢)دا، خوا ﷻ ئەوەی خستۆتە ڕوو كە هەموو مرۆڤەكان دەبرێنە دۆزەخ و، دوایی خوای میهرەبان پارێزكاران ڕزگار دەكات، زانایان لەو بارەیەوە ڕاجیاییان هەیە، كە ئایا خوا دەیانباتە سەر سوێی دۆزەخ، واتە: كە تەماشای بكەن و ببینن، یان دەیانباتە نێو

دۆزەخ، بەڵام دوایی دەربازیان دەکات، زانایان هەردوو ڕایەکانیان هەن، دوایی باسیان دەکەین، ئەمەش دەقی ئەو دوو ئایەتەیە: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾ ﴾مريم، واتە: هیچ کام لە ئێوە نیە مەگەر دەچێتە سوێی دۆزەخ، یان: دەچێتە نێو دۆزەخ، ئەمە بڕیارێکە لەسەر پەروەردگارت کە هەردەبێ جێ بەجێ بکرێ دوایی ئەوانەی پارێزیان کردوە، دەربازیان دەکەین و، لە ستەمکارانیش دەگەڕێین لەسەر ئەژنۆیان لەپەڕوو لەوێدا کەوتوون.

وشەی (واردها)، (ورود) ئەگەر بە مانای (دخول) بێ، واتە: هەموویان دەچنە دۆزەخ، بەڵام مەرج نیە بسووتێنرێن، بەڵام دەچنە جوغرو بازنەی دۆزەخەوە، تاکو تاوانباران و ستەمکاران و خراپەکاران لەوێدا بەجێ بهێڵرێن، پارێزکارانیش دەرباز دەکرێن، تاکو بزانن خوا لەچی دەربازی کردوون، بە هۆی ئیمان و تەقوایانەوە؟ بەڵام ئەگەر (واردها) بە مانای: (وإن منكم إلاّ يُشرِفُ عليها) یانی: {هیچ کامتان نیە نەچێتە سەر سوێی دۆزەخ و نەیبینێ}بێ، واتە: خوا پارێزکاران دەرباز دەکات لەوەی بچنە نێوی، بەڵام ستەمکاران لەوێدا بەجێ دەهێڵرێن.

**٦)- دابەشکردنی بۆ چەند دەرسێك:** ئێمە ئەم سوورەتە، بە پێی ناوەڕۆکەکەی، بۆ شەش (٦) دەرسان دابەش دەکەین:

دەرسی یەکەم: ئایەتەکانی (١ - ١٥) واتە: پازدە (١٥) ئایەتی سەرەتا، کە بەسەرهاتی زەکەریاو یەحیای کوڕی (عَلَيْهِما السَّلام) یان تێدا خراوەتەڕوو، کە هەمان بەسەرهات لە سوورەتی (آل عمران)یشدا هاتوە، بەڵام لێرەدا بە وردەکاریی زیادترەوە باسکراوە و دابەزینی سوورەتی مەریەمیش پێش (آل عمران) بووە، چونکە سوورەتی (آل عمران) مەدینەییە، هەر بۆیەش ئەو بەسەرهاتانەی کە لە سوورەتە مەککەییەکاندا هاتوون، دوایی خوای پەروەردگار، کە لە سوورەتە مەدینەییەکاندا بە پێویستی زانیوە ئاماژەیان پێ بکات، بە کورتیی ئاماژەی پێکردوون، بۆ وێنە: وەك کاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (الأعراف) دا گوتوومانە: بەسەرهاتی مووسا ﷺو، هاروون ﷺ لەگەڵ بەنی ئیسرائیل لەلایەکەوە و، لە بەرانبەریان دا فیرعەون و دارودەستەکەیان، لە سوورەتی (الأعراف)دا بە تەفصیل باسکراوە، هەروەها لە سوورەتەکانی (الشعراء وطه والنمل والقصص)و لە ژمارەیەك لە سوورەتە مەککەییەکانی دیکەشدا، بۆیە لە سوورەتی (البقرة)دا، یان لە سوورەتی (النساء)دا، کە خوا ﷻ ئاماژە دەکات بە هەندێ لە ڕووداوەکانی بەسەرهاتی مووسا ﷺ هاروون و، گەلەکەیان و، هەروەها لە بەرانبەریاندا: فیرعەون و دارودەستەکەی، بە کورتیی ئاماژە

بەو ڕووداو بەسەرهاتانە دەكات، چونكە درێژەو وردەكارییەكانی ئەو بەسەرهاتانە، پێشتر لە سوورەتە مەككەییەكاندا هاتوون.

دەرسی دووەم: ئایەتەكانی (١٦ - ٤٠) واتە: بیست و پێنج (٢٥) ئایەت دەگرێتە خۆی، كە تێیان دا: بەسەرهاتی مەریەم و عیسای كوڕی، صەڵات و سەلامی خوا لەسەر عیسا بێ و خوا لە مەریەم ڕازی بێ، خراوەتەڕوو، ئنجا لە سوورەتی (آل عمران)یشدا، دیسان باسی بەسەرهاتی مەریەم و عیسا سەلامی خوایان لێ بێ، كراوە، بەڵام ئەو وردەكارییەی لێرەدا هاتوە، لە سوورەتی (آل عمران)دا بەو تەفصیلٚ و ڕوونییە نەهاتوە، چونكە پێشتر لە سوورەتی مەریەمدا وردەكارییەكان باسكراون و، بە پێویست نەزانراوە: لە سوورەتی (آل عمران)یش دا، كە سوورەتێكی مەدینەییە، هەرچی لە سوورەتە مەككەییەكاندا هاتوە، لەوێشدا دووبارە بێتەوە.

دەرسی سێیەم: ئایەتەكانی: (٤١ - ٥٠)، واتە دە (١٠) ئایەت دەگرێتە خۆی، كە تێیان دا بەسەرهاتی ئیبراهیم و موناقەشەی لەگەڵ بابی (ئازەر) خراوەتەڕوو، كە لە جێی دیكەش دا، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الأنعام)یشدا، خوا ﷻ لە ئایەتێكدا، باسی مشت و مڕی نێوان ئیبراهیم و بابی دەكات، هەروەها لە سوورەتی (الأنبیاء)دا و، لە سوورەتی (ص)دا، باسی وتوێژی نێوان ئیبراهیم و بابی و گەلەكەی كراوە، بەڵام لێرەدا وردەكاریی زیاتر هەیە و، ئایەتیش كراوە بە وتوێژ و شەڕە قسەی نێوان ئیبراهیم ﷺ و بابی (ئازەر).

دەرسی چوارەم: ئایەتەكانی: (٥١ - ٦٥) واتە: پازدە (١٥) ئایەتە، لەو پازدە ئایەتەدا، ئاماژەیەكی كورت كراوە بۆ بەسەرهاتی مووساو هاڕوونی برای (عَلَيْهِما السَّلَامُ)، دوایی ئیسماعیل كوڕی ئیبراهیم (عَلَيْهِما السَّلَامُ)، دوایی ئیدریس ﷺ، پاشان سەرەنجامی شوومی لادەران و، سەرەنجامی سەرفرازانەی ڕاستڕۆیان، باسكراوە و، كۆتاییش هێنراوە بە باس و خواس و گێڕانەوەی بەسەرهاتی ئەو پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلَامُ)، كە وەك گوتمان: كۆی ئایەتەكانی كە بۆ گێڕانەوە، یان ئاماژەكردن بە بەسەرهاتیان، تەرخانكراون: (٦٥) ئایەتن.

دەرسی پێنجەم: ئایەتەكانی: (٦٦ - ٧٦) واتە: یازدە (١١) ئایەت دەگرێتە خۆی، لەو یازدە ئایەتەدا بەرپەرچدانەوەی مرۆڤی كافری نكووڵیكەر لە قیامەت، خراوەتە ڕوو، پاشان باسی سەرەنجامی شوومی مامەڵەی دادگەرانەی خوا لەگەڵ گومڕایان، كراوە، دواییش سەرەنجامی بەختەوەرانەی ڕێی ڕاستگرتووان، ئەوانە هەردووكیان بە تێكهەڵكێش خوای پەروەردگار خستوونیە ڕوو.

دەرسی شەشەم و کۆتایی: ئایەتەکانی: (٧٧ - ٩٩)، یانی: بیست و دوو (٢٢) ئایەتە، بیست و دوو ئایەتی کۆتایی سوورەتی مەریەم، دەگرنەوە خۆی، کە تێیان دا کۆمەڵێك بابەت باسکراون:

١- سەرەتا باسی بابایەکی بێبڕوا بە ئایەتەکانی خوا، کراوە، کە وێڕای بێبڕوایی بە ئایەتەکانی خوا، لاف لێدەر و، خۆهەڵکێش بووە بەسەر بەندەکانی خوادا.

٢- دوایی باسی هاوبەش بۆ خوادانەران بە گشتی و، سەرەنجامی پڕ سزاو ڕیسواییان و، ئاماژەیەکی کورتیش بە سەرەنجامی پڕ خێر و بەرەکەتی بڕواداران، کراوە.

٣- دوایی ئاماژەیەك بە ئامانجی نێردرانی قورئان کراوە: قورئان بۆچی ڕەوانەکراوە و دابەزێنراوە؟ ئنجا هەڕەشەکردن لە بێبڕوایان، کە خوای دادگەر لە پێش ئەواندا، گەلێك کۆمەڵگای دیکەی ملهوڕی فەوتاندووە، بۆیە ئەگەر عەقڵ و هۆشیان هەبێ، دەبێ دەرس و پەند لەوانەی پێش خۆیان وەربگرن.

ئەمە کۆی ئەو شەش دەرسەیە، کە ئێمە (٩٨) ئایەتەکەی سوورەتی مەریەممان بەسەردا دابەش کردوون، بە پێی نێوەڕۆکییان، بە پێی بۆچوون و تێگەیشتنی بەندە.

# پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان ئایەتەکانی: (١ - ١٥) دەگرێتە خۆی، ئەم پازدە (١٥) ئایەتە بەسەرهاتی زەکەرییاو یەحیای کوڕی (عَلَيْهِمَا الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) دەگرنە خۆیان، سەرەتا خوای بەرز و مەزن باسی زەکەرییا دەکات، کە بە شێوەیەکی پەنامەکیی و، کڕووزانەوەوە لە پەروەردگاری پاڕاوەتەوە و باسی کەوتنە نێو تەمەنی پیریی خۆی کردوەو، باسی هەبوونی مەترسیی لە خزمەکانی کردوە، کە نەتوانن میراتە مەعنەوییەکەی، کە ڕێباز و بەرنامەکەیەتی، بپارێزن، بۆیە داوا دەکات: خوا کوڕێکی چاك و پەسندی پێ ببەخشێ، کە ببێتە میراتگری لە ڕووی ئایین و بەرنامەو ڕێبازەکەیەوە.

خوای بەخشەریش ئاگاداری دەکاتەوە: کە کوڕێکی بە ناوی (یحیی) - کە پێشتر ئەو ناوە بەکارنەهێنراوە - پێ دەبەخشێ، واتە: خوای کاربەجێ بەرلەپیدابوونیشی، ناوی لێ دەنێ!

ئنجا زەکەرییا داوای نیشانەیەك دەکات کە ئایا چ کاتێك ئەو کوڕەیان پێدەدات؟ (واتە: چ کاتێك ئەو کوڕە دەکەوێتە سکی دایکی)، لە کاتێکدا کە ژنەکەی نەزۆك و، خۆیشی زۆر پیرە؟! خوای کارزانیش نیشانەیەکی بۆ دادەنێ، کە بریتییە لە قسە پێنەکرانی لە ماوەی سێ شەو و ڕۆژان دا، لەگەڵ ئەوەشدا کە تەندروست و سەلامەتەو، هیچ نەخۆشییەکی نییە.

ئنجا خوای زانا یەکسەر دێتە سەر باسی دواندنی یەحیای کوڕی، کە ئەوە هەمووی دەپێچرێتەوە: کە خێزانی زەکەرییا دووگیان دەبێ بە یەحیا و، نۆ (٩) مانگ لە سکی دادەبێ و دوایی دەیبێ، دوایی مەلۆتکە دەبێ، دوایی پێڕۆچکەو گەورە دەبێ، خوا ﷻ ئەوە هەمووی دەپێچێتەوە، چونکە جێی مەبەست ئەوەیە کە خوا پاڕانەوەو داوایەکەی زەکەرییای گیراکرد و، یەحیای کردە میراتگر و جێنشینی، بۆیە یەکسەر خوا ﷻ دێتە سەر باسی دواندنی یەحیای کوڕی ودەفەرموێ: ﴿يَٰيَحۡيَىٰ خُذِ ٱلۡكِتَٰبَ بِقُوَّةٖۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحُكۡمَ صَبِيّٗا ١٢﴾مريم، واتە: ئەی یەحیا! کتێبی خوا بە توندیی بگرە، دوایی بە هەشت (٨) سیفەتیش وەسف و پێناسەی یەحیا دەکات.

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ كٓهيعٓصٓ ﴿١﴾ ذِكۡرُ رَحۡمَتِ رَبِّكَ عَبۡدَهُۥ زَكَرِيَّآ ﴿٢﴾ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيّٗا ﴿٣﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ ٱلۡعَظۡمُ مِنِّي وَٱشۡتَعَلَ ٱلرَّأۡسُ شَيۡبٗا وَلَمۡ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيّٗا ﴿٤﴾ وَإِنِّي خِفۡتُ ٱلۡمَوَٰلِيَ مِن وَرَآءِي وَكَانَتِ ٱمۡرَأَتِي عَاقِرٗا فَهَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيّٗا ﴿٥﴾ يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنۡ ءَالِ يَعۡقُوبَۖ وَٱجۡعَلۡهُ رَبِّ رَضِيّٗا ﴿٦﴾ يَٰزَكَرِيَّآ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسۡمُهُۥ يَحۡيَىٰ لَمۡ نَجۡعَل لَّهُۥ مِن قَبۡلُ سَمِيّٗا ﴿٧﴾ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَكَانَتِ ٱمۡرَأَتِي عَاقِرٗا وَقَدۡ بَلَغۡتُ مِنَ ٱلۡكِبَرِ عِتِيّٗا ﴿٨﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ قَالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٞ وَقَدۡ خَلَقۡتُكَ مِن قَبۡلُ وَلَمۡ تَكُ شَيۡـٔٗا ﴿٩﴾ قَالَ رَبِّ ٱجۡعَل لِّيٓ ءَايَةٗۚ قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَ لَيَالٖ سَوِيّٗا ﴿١٠﴾ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنَ ٱلۡمِحۡرَابِ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ أَن سَبِّحُواْ بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ﴿١١﴾ يَٰيَحۡيَىٰ خُذِ ٱلۡكِتَٰبَ بِقُوَّةٖۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحُكۡمَ صَبِيّٗا ﴿١٢﴾ وَحَنَانٗا مِّن لَّدُنَّا وَزَكَوٰةٗۖ وَكَانَ تَقِيّٗا ﴿١٣﴾ وَبَرَّۢا بِوَٰلِدَيۡهِ وَلَمۡ يَكُن جَبَّارًا عَصِيّٗا ﴿١٤﴾ وَسَلَٰمٌ عَلَيۡهِ يَوۡمَ وُلِدَ وَيَوۡمَ يَمُوتُ وَيَوۡمَ يُبۡعَثُ حَيّٗا ﴿١٥﴾ ﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

((بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، کاف، ها، یا، عەین، صاد، ﴿١﴾ ئەمە باسی بەزەیی پێدا هاتنەوەی پەروەردگارتە بە زەکەریبا بەندەی خۆیدا ﴿٢﴾ کاتێك بە بانگ کردنێکی پەنهان لە پەروەردگاری پاڕایەوە ﴿٣﴾ گوتی: پەروەردگارم! من ئێسکم بێهێز بووەو، سەرم گری سپێتیی تێبەڕ بووەو، پێشتریش لە پاڕانەوەم لێت بێمراد نەبووم (وەڵامت داومەوە) ﴿٤﴾ ئنجا من لە خزم و نیزیکەکانم ترسام لە دوای خۆمەوە (کە نەتوانن ئایینی تۆ بپارێزن)، ژنەکەیشم نەزۆکە، دەجا لەلایەن خۆتەوە، جێگرەوەیەکم پێ ببەخشە ﴿٥﴾ کە میراتگری من و بنەماڵەی یەعقووبیش بێ و، بیشیگێڕە بە بابایەکی پەسند ﴿٦﴾ (خوا فەرمووی): ئەی زەکەریبا! ئێمە موژدەی (پەیدابوونی) کوڕێکت دەدەینێ

ناوی یەحیایەو پێشتر هاوناوی نەبووە ﴿٧﴾ گوتی: پەروەردگارم! چۆن کوڕم پەیدا دەبێ! لە حاڵێکدا ژنەکەم نەزۆکە و، خۆیشم لە پیریی دا گەیشتوومە ئەو پەڕی؟ ﴿٨﴾ خوا فەرمووی: بەو شێوەیە، ئەوە بۆ من ئاسانەو، پێشتریش تۆ شتێك نەبووی و دروستم کردی ﴿٩﴾ زەکەریا گوتی: پەروەردگارم! نیشانەیەکم بۆ دابنێ (ئەو کوڕە، کەی دەکەوێتە سکی دایکی؟) خوا فەرمووی: نیشانەکەت ئەوەیە: وێڕای ساغییت، ماوەی سێ شەوان (وات لێ دێ) خەڵك نادوێنی ﴿١٠﴾ ئیدی زەکەریا لە میحرابەوە بۆ لای خەڵکەکەی وەدەرکەوت، ئاماژەی بۆ کردن: کە بەیانیان و ئێواران خوا بە پاك بگرن ﴿١١﴾ ئەی یەحیا! بە توندیی دەست بە کتێبەکەوە بگرەو، هەر بە منداڵیی حیکمەتمان پێ دابوو ﴿١٢﴾ هەروەها لەلایەن خۆمانەوە بەزەیی و پەرۆش و پاکیی و چاکییمان پێدابوو و، پارێزکاریش بوو ﴿١٣﴾ هەروەها لەگەڵ باب و دایکی دا چاکەکاربوو، خۆسەپێن و یاخیی نەبوو ﴿١٤﴾ سەلامیشی لێ بێ، ڕۆژێك کە لە دایك بووەو، ڕۆژێك کە دەمرێ و، ڕۆژێکیش کە بە زیندوویی هەڵدەستێنرێتەوە ﴿١٥﴾).

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَهَنَ): (الوَهْنُ: ضَعْفٌ مِنْ حَيْثُ الخَلْقِ، أو الخُلُقِ) واتە: (وَهْن) بریتیە لە بێهێزیی لە ڕووی جەستەوە، یان لە ڕووی ئاکارو ڕەوشتەوە.

(شَيْبًا): (الشَّيبُ والمَشيبُ: بَيَاضُ الشَّعرِ)، وشەی (شیب) و (مشیب) هەردووکیان بە مووی سپی دەگوترێن، سەرسپی بوون.

(شَقِيًّا): (الشَّقَاوَةُ: خِلاَفُ السَّعَادة): (شَقِيَ يَشْقَى شَقْوَةً وَشَقَاءً، وقَد يُوضَعُ الشَّقَاءُ مَوضِعَ التَّعبِ: شَقِيتُ فِي كَذا: أي تَعِبتُ)، (شقاوة) پێچەوانەی (سَعَادة)ە، (شقاوة) بێ مرادیی، (سعادة) بەختەوەریی، (شَقِيَ يَشْقَى شَقْوَةً وَشَقَاءً) واتە: بێمراد بوو، بێمراد دەبێ، بێمراد بوون، جاری واش هەیە وشەی (شقاء) لە جێی ماندوو بوون، دادەنرێ دەگوترێ: (شَقِيتُ فِي كَذَا) واتە: ماندوو بووم.

(عَاقِرًا): (عَقَرتُهُ: أَصَبتُ عُقْرَهُ أي: أَصْلَهُ، ورَجُلٌ عَاقِر وَإِمرَأَةٌ عَاقِر: لا تَلِدُ)، (عَقَرتُهُ) واتە: لە ڕیشەیمدا، واتە: لە بنکەوە هێنام، لە بەینم برد، دەگوترێ: (رَجُلٌ عَاقِر وَإِمرَأَةٌ عَاقِر) واتە: نەزۆك.

هەندێکیش گوتوویانە: وشەی (عاقر) تەنیا بۆ ئافرەت بەکاردەهێنرێ، بۆیە پێویست نەبووە (ة)ی مێینەی بچێتە سەر، ببێتە (عاقرة)، چونکە (عاقر) واتە: ئافرەتی نەزۆك، هەروەك (حامل) واتە: ئافرەتێك كە دوو گیانە، بۆیە پێویست ناكات بڵێی: (حاملة)، چونكە تەنیا ئافرەت سكی پەیدا دەبێ و دوو گیان دەبێ.

(رَضِيًّا): (الرَّضِيُّ: المَرضِيُّ)، وشەی (رضي) هەم بە مانای پەسندكراو دێ، (فعيل)ە، بە مانای (مفعول)، هەروەها (رضي) بە مانای (مُحِبّ)یش دێ، كەسێك كە پەروەردگاری خۆی خۆش دەوێ و، بە مانای (مُطيع)یش دێ، واتە: فەرمانبەر.

(سَمِيًّا): (السَّمِيُّ) بە مانای هاوتا (النُّظير) دێ، هەروەها بە مانای هاوناویش دێ، (السَّمي) واتە: (المُوَافِقُ عَلَى الإسم) واتە: ناوەكەی لەگەڵ ناوەكەی دا، دەگونجێ.

(عِتِيًّا ): (عَتَا، عُتُوًّا، وَعِتِياً: إستَكْبَرَ وَجَاوَزَ الحَدَّ فَهُوَ عَاتٍ، والجَمْعُ عُتَاة) واتە: خۆی بە زلگرت و لە سنوری تێپەڕاند، (إسم فاعل)ەكەی (عَاتٍ)، (فهو عات) كە بە (عُتَاة) كۆ دەكرێنەوە، (عتاة المجرمين) واتە: ئەو تاوانبارانەی لە سنوور دەرچوون، هەروەها بە (عوت)یش كۆدەكرێتەوە، بەڵام (عتا الشيءُ): وێڕای خۆ بەزلگرتن و لە سنوور دەرچوون بە مانای (إنتهى)ش دێ، (عَتَا الشَّيْخُ: كَبُرَ وَوَلَّى) واتە: ئەو پیرە كۆتایی هات، تەمەنی هەبوو، بەرەو فەوتان چوو.

(هَيِّنٌ): (هَانَ الأَمْرُ فَهُوَ هَيِّنٌ: سَهْلَ) (هَيِّن) یانی: (سَهْل) ئاسان، دەگوترێ: (هَانَ الأمر) واتە: كارەكە ئاسان بوو.

(صَبِيًّا ): (الصَّبِيُّ: مَنْ لَمْ يَبْلُغْ الحلُمَ، وَرَجُلٌ مُصْبٍ: ذُو صبيان)، (صَبي) منداڵێكی نێرینەیە كە نەگەیبێتە ڕاددەی باڵغ بوون، دەگوترێ: (رَجُلٌ مُصبٍ) واتە: پیاوێك كە منداڵی سەلكەو پێچكەی هەبن، كوڕانێكی هەبن كە نەگەیینە ئەندازەی باڵغ بوون، ئنجا وەك چۆن (صَبي) بۆ نێرینە بەكاردەهێنرێ، (صبية)ش بۆ مێینە بەكاردەهێنرێ، كە (صَبي) بە (صبيان) كۆ دەكرێتەوە، بەڵام (صبية) بە (صبايا) كۆ دەكرێتەوە.

(وَحَنَانًا): بە مانای سۆزو پەرۆش دێ، (لَمَّا كَانَ الحَنِينُ مُتضمِّناً للإشْفَاق، والإشْفَاق لا يَنْفَكُّ مِنَ الرَّحْمَةِ، عُبِّرَ عَن الرَّحْمَةِ بِه) لەبەرئەوە وشەی (حنين) پەرۆش بوون دەگرێتە نێو خۆی و، پەرۆش بوونیش لە بەزەیی جیانابێتەوە، بۆیە جاری وا هەیە بە وشەی (حنان) تەعبیر دەكرێ لە ڕەحمەت و بەزەیی، دەتوانین بڵێین: (حنان) لە كوردییدا دەبێتە: پەرۆش بوون، بە تەنگەوە بوون، بە خەمەوە بوون.

(جَبَّارًا): واتـە: خۆسـەپێن، مـل بـە خەڵـك كەچكـەر. (الإِجْبَـارُ فِي الأَصْـلِ: حَمْـلُ الغَـيْرِ عَـلَى أن يُجـبِرَ الآخـرَ، لكـن تُعـورف في الإكـراه المُجَـرَّد). (إجبـار) لـە ئەصڵـدا بریتیـە لـەوەی كـە تـۆ یەكێـكی دیكـە وا لـێ بكـەی، بەرانبەرەكـەی ناچـار بـكات، بـەڵام دوایـی هـەر بـۆ خـودی ناچاركردنەكـەش بەكارهاتـوە. (الجبـار فـي صفـةِ الإنْسَـانِ، يُقَـال لِمَـن يَجـبر نقيصتَـهُ، بإدعـاء منزلةٍ مـن التعـالي لا يسـتحقها). (جبار) كـە بـۆ مـرۆڤ بەكاربهێـنرێ، بـە كەسێك دەگوتـرێ كـە هەسـت بـە نوقسـانیی و ناتەواویـی بـكات، دوایـی پێگەیـەك و پلەیـەك بـۆ خـۆی داوا بـكات و لافی لـێ بـدات لـە بەرزیـی، كـە شایسـتەی نەبـێ.

(عَصِيًّا): (عَـصَىَ عَصِيَـاً وَمَعْصِيَـةً فَهُـو عَـاصٍ، وَجَمْعُـهُ: عُصَـاة، وَهُـوَ عَـصِيٌّ مُبالَغَـةٌ)، واتـە: دەگوتـرێ: (عَـصَىَ عَصِيَـاً وَمَعْصِيَـةً) واتـە: سـەرپێچیی كـرد، سـەرپێچیی كـردن، (فَهُـو عَـاصٍ) ئـەو سـەرپێچییكارە، كـۆی (عَـاص)، (عُصَـاة)ە، واتـە: سـەرپێچییكاران و یاخییـان، بـەڵام (عَـصِي) زێدەڕۆییكردنـە لـە (عَـاصِي) واتـە: زۆر سـەرپێچییكار و یاخیـی.

## مانای گشتی ئایەتەكان

لـەم سـوورەتەدا سـەرەتا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: (بسـم اللـه الرحمـن الرحيـم) بـە نـاوی خـوای بەزەیـی بەخشـندە، زۆرجـاری دیكـە گوتوومانـە: كـە دەڵێـی: بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی و بەخشـندە، واتـە: بـە نـاوی خـوای بەزەیی بەخشـندە، ئـەم كارە دەسـت پێدەكەیـن، یاخـود نـاوی خـوای بـە بەزەیـی و بەخشـندە هێنـان، دەسـتپێكی كارەكەمـە، سـەرەتای كارەكەمـە، ئنجـا ئەویـش چەنـد واتایـەك دەگرێتـە خـۆی:

١- ئەم كارە بۆ ڕازییكردنی خوا دەكەم.

٢- ئەم كارە بە پێی شەرعی خوا دەكەم.

٣- بە پشتیوانیی خوا ﷻ ئەم كارە ئەنجام دەدەم.

٤- بە ناوی خواوەش دەستی پێ دەكەم.

پێنـج (٥) پیـت باسـكراون: (كاف، هـا، یـا، عین، صاد) ﴿ كٓهيعٓصٓ ﴾ كـە هـەر كام لـە: (كاف، عـین، صـاد) درێـژ دەكرێنـەوە.

ئەم جۆرە پیتانە لە سەرەتای بیست و نۆ (٢٩) سوورەت، لە سوورەتەکانی قورئان داهاتوون، کە دووانیان (البقرة وآل عمران) مەدینەیین و، ئەوانی دیکە مەککەیین، ئنجا ئەم پیتە پچڕ پچڕانە (الحروف المقطعة) بۆیە وایان پێدەگوترێ، چونکە دەبێ وەك خۆیان گۆ (تلفظ) بکرێن، نەك هەمووی بەسەریەکەوە، چونکە یەك وشە نین، بەڵکو هەر کامێکیان پیتێکی سەربەخۆیە، ئێمە لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی (یونس)[1]دا، بە درێژیی باسی ئەو پیتانەمان کرد، کە چەندن و چەند جۆرن و مەبەست پێیان چییە؟! لەوێ بە تەفصیل باسمانکردوە و لێرە ناگەڕێینەوە سەری.

﴿ ذِكْرُ رَحْمَتِ رَبِّكَ عَبْدَهُۥ زَكَرِيَّآ ﴾ زانایانی زمانی عەرەبی دەڵێن: لێرەدا گوزارە (مبتدأ) یەك قرتێنراوە، سیاق و سەلیقە دەیگەیەنن: (هذا ذكر رَحْمَتِ رَبِّك)، ئەمە باسی بەزەیی پەروەردگارتە، سەبارەت بە بەندەی خۆی زەکەریا، واتە: خوا ﷻ لەم ئایەتانەدا باسی بەرجەستە بوونی بەزەیی و میهرەبانیی خۆی بۆ بەندەی خۆی، زەکەریا دەخاتە ڕوو، کە چۆن بەزەیی پێدا هاتەوە و لەگەڵی میهرەبان بوو و، کوڕێکی چاکی پێدا کە یەحیایە، لە کاتێکدا کە خۆیشی کەوتبووە تەمەنێکی زۆرەوە و، هاوسەرەکەیشی نەزۆك بووە. ﴿ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيًّا ﴾، کاتێك (زەکەریا) لە پەروەردگاری پاڕایەوە، بە بانگکردن و پاڕانەوەیەکی پەنهان، یانی: لەبەر خۆیەوە، بە کڕووزانەوەو لاڵانەوە. ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ ٱلْعَظْمُ مِنِّي ﴾، گوتی: پەروەردگارم! من ئێسقانم بێ هێز بووە!

ئەگەر ئێسقان کە لە جەستەی مرۆڤدا، لە هەموو پێکهاتەکانی جەستەی مرۆڤ، پتەوترە، بێ هێز بێن، مانای وایە ئەندامەکانی دیکەی، پێشتر بێ هێز بوون.

﴿ وَٱشْتَعَلَ ٱلرَّأْسُ شَيْبًا ﴾، سەریشم گڕی سپێتیی تێبەر بووە، یانی: سەریشم سپی بووە و مووی سپی داوێتیە سەرم، وەك چۆن ئاگرێك لە پووشێك بەردەبێ، لێرەدا سپی بوونی مووەکان، چوێنراوە بە ئاگرێکەوە و سەریش چوێنراوە بە پووش و پەڵاشێکەوە، کە ئاگری تێبەر دەبێ، چۆن بە زوویی هەمووی دەگرێتەوە.

﴿ وَلَمْ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيًّا ﴾، پەروەردگارم! لە ڕابردووشدا لە پاڕانەوەم دا لە تۆ، بێ مراد نەبووم، واتە: هەر جارێ لە تۆ پاڕامەوە، بە دەستی پڕەوە بەڕێت کردووم، ئێستاش لەم پاڕانەوەیەدا کە بەرانبەرت دەیکەم و ئاراستەی تۆی دەکەم لەم داوایەشم دا، بێمرادم مەکەو پاڕانەوەکەم گیرا بکە.

---

(١) هەروەها لە سەرەتای تەفسیرکردنی سوورەتی (البقرة)ش دا قسەمان لەبارەیانەوە کردوە.

ئنجا پاساوی پارانەوەکەی دەخاتەڕوو: ﴿ وَإِنِّي خِفْتُ ٱلْمَوَٰلِيَ مِن وَرَآءِى ﴾، من لە نزیکەکانم لە دوای خۆم ترسام، بێگومان لەوە ترساوە کە نەتوانن بەرنامە و ڕێبازەکەی بپارێزن، میراتە مەعنەوییەکەی بپارێزن ﴿ وَكَانَتِ ٱمْرَأَتِي عَاقِرًا ﴾، لە حاڵێك دا کە ژنەکەشم نەزۆکە، ﴿ فَهَبْ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا ﴾، دەجا لەلایەن خۆتەوە سەرپەرشتیارێك، جێگرەوەیەکم پێ ببەخشە، ﴿ يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنْ ءَالِ يَعْقُوبَ ﴾، تاکو میرات لە منیش و، لە بنەماڵەی یەعقووبیش بگرێ ﴿ وَٱجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيًّا ﴾، ئەی پەروەردگارم! واشی لێ بکە کوڕێکی پەسند و چاك بێ.

خوا ﷻ یەکسەر دەیدوێنێ: ﴿ يَٰزَكَرِيَّآ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسْمُهُۥ يَحْيَىٰ ﴾، ئەی زەکەریا! ئێمە دڵخۆشت دەکەین، مژدەت پێدەدەین بە کوڕێك کە ناوی یەحیایە، خوا ناوەکەشی بۆ داناوە، یانی: ناوی لێبنێ یەحیا ﴿ لَمْ نَجْعَل لَّهُۥ مِن قَبْلُ سَمِيًّا ﴾، پێشتر هاوتامان بۆ دانەناوە، یاخود هاوناومان بۆ دانەناوە، واتە: کەسی دیکە نەبووە ناوی یەحیا بێ، یاخود: ئەو تایبەتمەندییانەی بە یەحیا دەدرێن، لە پێش ویدا بە کەس نەدراون.

کەواتە: هاوتای نەبووە، بەو واتایە نا، کە هیچ کەس نەگەیشتۆتە وی! پێغەمبەرانی خوا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) هەموویان پایە بەرزن، بەڵام بە تەنکید هەر کام لە: نووح و ئیبراهیم و مووسا، لە یەحیا پایە بەرزتر بوون، بەڵام واتە: ئەو تایبەتمەندییانەی یەحیا هەیبوون، لە پێش ویدا بە کەس نەدراون، کە ئاوا لە دایکێکی نەزۆك و باوکێکی پیر پەیدا بێ و، پاشان خوا ناوەکەشی بۆ دیاریی بکات.

﴿ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٌ ﴾، زەکەریا گوتی: پەروەردگارم! چۆن کوڕم بۆ پەیدا دەبێ؟

﴿ وَكَانَتِ ٱمْرَأَتِي عَاقِرًا ﴾، لە حاڵێکدا کە ژنەکەم نەزۆکە، منداڵی هەر نەبووە، ﴿ وَقَدْ بَلَغْتُ مِنَ ٱلْكِبَرِ عِتِيًّا ﴾، خۆیشم لە پیریەتییدا، گەیشتوومە ڕادەیەك کە جەستەم وشکهەڵاتوە، یاخود: گەیشتوومە لووتکە لە تەمەن و پیریەتییدا، ﴿ قَالَ كَذَٰلِكَ قَالَ رَبُّكَ ﴾، (خوا وەڵامی دایەوە) فەرمووی: هەر بەو شێوەیە، پەروەردگارت فەرموویەتی: ﴿ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ ﴾، ئەوە، کاری وا لەسەر من ئاسانە، بۆ من ئاسانە، ﴿ وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِن قَبْلُ وَلَمْ تَكُ شَيْـًٔا ﴾، تۆشم دروست کرد و هیچ شتێك نەبووی، یانی: تۆشم لە نەبوو هێنایەدی، بە هەمان شێوە: یەحیاش بە تۆ دەبەخشم.

﴿ قَالَ رَبِّ ٱجْعَل لِّيٓ ءَايَةً ﴾، گوتی: پەروەردگارم! نیشانەیەکم بۆ دابنێ، نیشانەیەك بە هۆیەوە بزانم: دایکی کەی پێی دووگیان دەبێ؟ ﴿ قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ

﴿ثَلَٰثَ لَيَالٖ سَوِيّٗا﴾، (خوا) فەرمووی: نیشانەکەت ئەوەیە کە لە حاڵێکدا کە تەندروست و ساغی و هیچ نەخۆشییت نیە، سێ شەوان قسە لەگەڵ خەڵکی دا ناکەی، بۆت ناکرێ سێ شەوان خەڵك بدوێنی.

هەڵبەتە لە سوورەتی (آل عمران)دا باسی سێ ڕۆژان (ثلاثة أيام) دەکات، کەواتە: سێ شەو و سێ ڕۆژان خەڵکت بۆ نادوێنرێ، بێ ئەوەی نەخۆشیی و نوقسانیی لە جەستەت پەیدا بووبێ، بەڵکو خوا زمانت دەگرێ و دەبێ بە ئاماژە قسە لەگەڵ خەڵکی دا بکەی، ﴿فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنَ ٱلۡمِحۡرَابِ﴾، ئنجا دوای ئەوەی خوا موژدەکەی پێدا و نیشانە و کاتەکەی بۆ دیارییکرد: لە میحرابەوە چۆ دەر بۆ لای خەڵکەکەی، ﴿فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ﴾، ئاماژەی بۆ کردن، وادیارە بە دەست ئاماژەی بۆ کرد بن.

﴿أَن سَبِّحُواْ بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا﴾، (ئاماژەکەی ئەوە بوو) کە بەیانیان و ئێواران پەروەردگارتان بە پاك بگرن (کە خوا ﷻ هیچ شتێکی لەبەر عاسێ نابێ و، هەر شتێکی بیەوێ دەیکات، ئەوەتا لە کاتێکدا کە من خێزانم نەزۆکەو، بۆ خۆشم پیربوومەو، کەوتوومە تەمەنەوە، کەچی کوڕێکمان پێ دەبەخشێ، خوا بە پاك بگرن، لەوە کە نەتوانێ هەرچی بیەوێ ئەنجامی بدات).

ئنجا یەکسەر ئەوە هەمووی دەپێچێتەوە کە یەحیا دەکەوێتە سکی دایکی و نۆ (٩) مانگ و (٩) ڕۆژ، وەك لە کوردەوارییدا دەڵێن، دوایی دایکی یەحیای دەبێ و، مەلۆتکە دەبێ و گەورە دەبێ، ئەوە هەمووی دەپێچێتەوە و یەکسەر دەفەرموێ: ﴿يَٰيَحۡيَىٰ خُذِ ٱلۡكِتَٰبَ بِقُوَّةٖ﴾، ئەی یەحیا! کتێبەکە بەهێز و بە توندیی بگرە، واتە: (تەورات) یان: ئەو بەرنامەیەی خوا کە پێت دەدات، یان پێیداوی ﴿وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحُكۡمَ صَبِيّٗا﴾، هەر منداڵ بوو، جارێ نابالغ بوو، ئێمە حیکمەت و لێزانییمان پێ بەخشیبوو، ﴿وَحَنَانٗا مِّن لَّدُنَّا﴾، هەروەها لەلایەن خۆمانەوە: خەسڵەتی سۆز و پەرۆشمان بۆی ڕەخساند بوو، ﴿وَزَكَوٰةٗ﴾، هەروەها لەلایەن خۆمانەوە، پاکییمان بۆ ڕەخساند بوو، ﴿وَكَانَ تَقِيّٗا﴾، هەروەها پارێزکاریش بوو، ﴿وَبَرَّۢا بِوَٰلِدَيۡهِ﴾، دیسان لەگەڵ باب و دایکیشی دا زۆر چاکەکار بوو، ﴿وَلَمۡ يَكُن جَبَّارًا عَصِيّٗا﴾، خۆسەپێن و یاخیی و سەرپێچیکاریش نەبوو.

﴿وَسَلَٰمٌ عَلَيۡهِ﴾، سەلامی لێ بێ، ئاشتیی و سەلامەتیی لەسەر بێ، ﴿يَوۡمَ وُلِدَ وَيَوۡمَ يَمُوتُ وَيَوۡمَ يُبۡعَثُ حَيّٗا﴾، ئەو ڕۆژەی کە لە دایك بوو و، ئەو ڕۆژەی کە دەمرێ و، ئەو ڕۆژەش کە بە زیندوویی هەڵدەستێنرێتەوە.

ئەمە هەشت نۆ، خەسڵەتی بەرز و پەسند، کە خوا ﷻ لە یەحیادا باسیان دەکات.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**ئەو پێنج پیتە: (کاف، ها، یا، عین، صاد):**

﴿ كٓهيعٓصٓ ١ ﴾، پێشتر گوتمان: ئەم پیتانە، بە پیتە پچڕ پچڕەکان (الحروف المقطّعة) ناسراون و، لە پێش بیست و نۆ (٢٩) سوورەتی قورئانەوە هاتوون، ئنجا هەیانە پیتێکەو، هەیانە دووانەو، هەیانە سێیەو، هەیانە چوارە و زۆرترینیان کە بەیەکەوە هاتوون پێنج پیتن، ئەویش لێرەیە: (کاف، ها، یا، عین، صاد)، لە سەرەتای سوورەتی (الشوری)شدا، پێنج (٥) پیت هاتوون: (حا، میم، عین، سین، قاف)، بەڵام لەوێدا کراون بە دوو ئایەت، ئێمە - وەك پێشتر گوتمان: - لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی (یونس)دا بە درێژیی لەو بارەوە قسەمان کردوە، بۆیە لێرە بەو ئاماژە کورتە وازدێنین.

**مەسەلەی دووەم:**

**خوا ﷻ باسی بەزەیی پێداهاتنەوەی خۆی دەکات بە بەندەی خۆی، زەکەریادا، کاتێك بە بانگ کردنێکی پەنهان لە پەروەردگاری دەپاڕێتەوە و، باسی بێهێزبوونی ئێسکی و گڕی سپی تێبەربوونی سەری، دەکات و، ئەوەکە پێشتریش لە لێ پاڕانەوەیدا بێمراد نەبووە و، پاساوی ئەوەش کە خوا کوڕێکی چاکی پێ بدات، دەخاتەڕوو: کە ترسی هەیە لە خزمەکانی: لە دوای خۆی میراتە مەعنەوییەکەی، کە ئایین و ڕێبازی خوایە، نەیپارێزن، ئنجا باسی نەزۆکیی ژنەکەیشی دەکات، بۆیە داوا لە خوا دەکات: لەلایەن خۆیەوە بە شێوەیەکی تایبەت، کوڕێکی جێگرەوە و مشوورخۆری پێ ببەخشێ، کە میراتی خۆی و بنەماڵەی یەعقووب بگرێ و بیپارێزێ و داواشی لێ دەکات کە کوڕێکی چاك و پەسند بێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ ذِكۡرُ رَحۡمَتِ رَبِّكَ عَبۡدَهُۥ زَكَرِيَّآ ٢ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيّٗا ٣ قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ ٱلۡعَظۡمُ مِنِّي وَٱشۡتَعَلَ ٱلرَّأۡسُ شَيۡبٗا وَلَمۡ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيّٗا ٤ وَإِنِّي خِفۡتُ ٱلۡمَوَٰلِيَ مِن وَرَآءِي وَكَانَتِ ٱمۡرَأَتِي عَاقِرٗا فَهَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيّٗا ٥ يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنۡ ءَالِ يَعۡقُوبَۖ وَٱجۡعَلۡهُ رَبِّ رَضِيّٗا ٦ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەو ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿ ذِكۡرُ رَحۡمَتِ رَبِّكَ عَبۡدَهُۥ زَكَرِيَّآ ﴾، شارەزایانی زمانی عەرەبی دەڵێن: (ذكر: خَبَرُ مبتدإ محذوف)، دەشگونجێ بڵێین: (ذكر): (مبتدأ)یەو (خبر)ەكەی قرتێنراوە،

١- حاڵەتی یەكەمیان: (هَذا ذِكْرُ رَحْمَتِ رَبِّكَ عَبْدَهُ زَكَرِيَّا)، واتە: ئەمە باسی بەزەیی نواندنی پەروەردگارتە، لەگەڵ زەكەریایدا.

٢- حاڵەتی دووەمیان: (ذِكۡرُ رَحۡمَتِ رَبِّكَ عَبۡدَهُۥ زَكَرِيَّآ)، (هَذا بَيَانُهُ) واتە: باسی بەزەیی هاتنەوەی پەروەردگارت بە بەندەی خۆی زەكەریایدا، ئەمە باس و خواسەكەیەتی.

چونكە خوا ﷻ ئەو شتانەی كە بە عەقڵ و سەلیقە دەزانرێن، لە فەرمایشتی خۆیدا نەیهێناون.

٢)- ﴿ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيّٗا ﴾، كاتێك كە لە پەروەردگاری پاڕایەوە، بانگی پەروەردگاری كرد بە بانگكردن و پاڕاناوەیەكی پەنهان.

(إذ) (ظرف)ی (رحمة)ە، واتە: بەزەیی هاتنەوەی پەروەردگارت بەودا كاتێك بوو كە بانگی پەروەردگاری كرد، بە شێوەیەكی پەنهان، ئنجا ئایا چی گوت، كە لە پەروەردگاری پاڕایەوە؟

٣)- ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ ٱلۡعَظۡمُ مِنِّي ﴾، گوتی: پەروەردگارم! من ئێسكم تێدا بێهێز بووە.

وشەی (العَظْم) كە (أل)ی ناساندنی لە سەرە، مەبەست جینسی ئێسقانە: (العَظْمُ: مُعَرَّف تعريف الجنسِ الدالُ عَلَى عُمُومِ العِظَام)، یانی: كۆی ئێسقانم تێدا بێهێز بووە، تێكڕای پەیكەری ئێسكی.

٤)- ﴿ وَٱشۡتَعَلَ ٱلرَّأۡسُ شَيۡبٗا ﴾، هەروەها سەریشم سپی بووە، بەڵام خوا ﷻ بە تەعبیرێك هێناویەتی، كە هەر شایستەی ڕەوانبێژیی قورئانە: (شُبِّه الشَّيْبُ بالنَّار، وَسَوادُ الشَّعْرِ بالحَشِيش اليَابِسِ)، مووی سپی لە سەردا چوێنراوە بە ئاگرەوە و مووە ڕەشەكانی سەریش، چوێنراون بە پووشی وشكەوە، ئنجا پووشی وشك، كە ئاگری تێبەردەبێ، زۆری پێ ناچێ هەمووی دادەگرێ و، تێكڕای دەگرێتەوە، واتە: من گڕی ئاگری سپی بەربۆتە پووشی سەری ڕەشم.

٥)- ﴿ وَلَمۡ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيّٗا ﴾، پێشتریش لە پاڕانەوەم دا لە تۆ، بێمراد نەبووم (الشَّقِيُّ: هُوَ الَّذِي أَصَابَتْهُ الشِّقْوَةُ، وَهِيَ ضِدُّ السَّعَادَةِ، أَي: الحِرْمَانُ مِنَ المَأْمُولِ، وَضَلَالُ السَّعِي)، (شقي) کەسێکە شەقاوەتی تووش بوو بێ، (شقوة) کە پێچەوانەی بەختەوەرییە، واتە: بێمرادیی و بێ ئاکامیی، کە لێرەدا مەبەست پێی بێبەشبوونە لەو شتەی کە بە هیوایەتی، هەروەها بریتیە لە ڕەنج بە زایە چوون.

واتە: پەروەردگارم! هەر کاتێ لە تۆ پاڕامەوە، بە دەستی خاڵیی بەڕێت نەکردوومەوە، ئێستاش چۆنت عادەت پێداوم، چۆنت ڕاهێناوم، هەر بەو جۆرە مامەڵەم لەگەڵدا بکە! زەکەریا ویستوویەتی: کەرەم و میهرەبانیی خوای پەروەردگار کە پێشتر لەگەڵیدا نواندوویەتی، بیکاتە پاساوی ئەوە، کە ئێستاش هەروا لە تۆ چاوەڕێ دەکرێ، هەروا بۆ تۆ شایستەیە، وەك چۆن لە ڕابردوودا بێمرادو و بێ ئاکامت نەکردووم، ئێستاش بێ هیوام نەکەی و ئەم پاڕانەوەیەم گیرا بکەی.

کە بەدڵنیایی هەرواش بووە.

٦)- ﴿ وَإِنِّي خِفۡتُ ٱلۡمَوَٰلِيَ مِن وَرَآءِي ﴾، من مەترسیی خزمە نیزیکەکانی دوای خۆم هەیە، (مَوَالِي) أي (أَقَارِبِي) (المَوَالِي: العَصَبَةُ، وأَقْرَبُ القَرَابَةِ، والمَوَالِي جَمْعُ مَوْلَى)، (مولى) واتە: نیزیك، (مَوالِي) واتە: نیزیکان، کە خزمانی پشتێن، یاخود نیزیکترینی خزمان، واتە: ئەو خزمانەم کە زۆر لێم نیزیکن، مەترسییم لێیان هەبوو، مەترسیی چی؟ دوایی بۆمان دەردەکەوێ، کە مەبەست لێی مەترسیی: زایە بوونی ڕێباز و بەرنامەکەی و، میراتە مەعنەوییەکەی بووە.

٧)- ﴿ وَكَانَتِ ٱمۡرَأَتِي عَاقِرٗا ﴾، لە حاڵێك دا کە ژنەکەشم نەزۆکە، دەڵێ: (العَاقِرُ: الأُنْثَى الَّتِي لا تَلِد)، ئەو مێینەی کە منداڵیی نابێ، پێی دەگوترێ: (عَاقِر).

(و)ی (وكانت ...)یش (واو الحالية) یانی: ئەو داواکارییەشم لە حاڵێك دایە کە ژنەکەم نەزۆکە.

٨)- ﴿ فَهَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيّٗا ﴾، دەجا لەلایەن خۆتەوە [بە شێوەیەکی تایبەت] جێگرەوەیەك، مشوورخۆرێکم پێ ببەخشە.

کە مەبەستی پێی کوڕێك بووە مشوورخۆر بێ لە دوای و پارێزەری میراتە مەعنەوییەکەی بێ، کە دەفەرموێ: (فَهَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ) لەلایەن خۆتەوە، بێگومان هەموو شتێك هەر لەلایەن خواوەیە و بەس خوا بەدیهێنەرە، بەڵام یانی: بەشێوەیەکی

تایبەت کە تەنیا بە تۆ دەکرێ، ئەو کوڕەم پێ ببەخشە، کە ببێتە سەرپەرشتیار و مشوورخۆر لە دوای من.

٩)- ﴿ يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنْ ءَالِ يَعْقُوبَ ﴾، میرات لە من بگرێ و میرات لە بنەماڵەی یەعقووبیش بگرێ، ئەمە بەمجۆرەش خوێنراوەتەوە: (يَرِثْنِي وَيَرِثْ مِنْ آلِ يَعْقُوب) واتە: بە (جَزْم)، (آل يعقوب) مەبەست پێی خەڵکە تایبەتییەکەی بەنی ئیسرائیلن، بنەماڵەی یەعقووب، مەبەست لە میراتەکەش میراتی مەعنەوییە، نەك ماڵ و سامانی ماددیی.

١٠)- ﴿ وَٱجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيًّا ﴾، ئەی پەروەردگارم! واشی لێ بکە، پەسند بێ، پەسند کراو بێ، یانی: وا نەبێ جێی پەشێمانیی بێت و، لەسەری قەرزدار ببمەوە.

لێرە کە دەفەرموێ: ﴿ يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنْ ءَالِ يَعْقُوبَ ﴾، وەك ئەو ئایەتەی سوورەتی (النمل) وایە کە دەفەرموێ: ﴿ وَوَرِثَ سُلَيْمَٰنُ دَاوُۥدَ ﴿١٦﴾ ﴾النمل، واتە: سولەیمان میراتی لە داوود گرت، کە بە تەنکید مەبەست پێی میراتی پێغەمبەرایەتیی و مەعنەوییە.

با لێرەدا قسەیەکی (ابن كثير) بێنین، لە تەفسیرەکەی خۆی کە کورت کراوەتەوە بە ناوی: (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير)[1] دەڵێ: ﴿ وَإِنِّي خِفْتُ ٱلْمَوَٰلِيَ مِن وَرَآءِى ﴾:

١- أَرَادَ بِالْمَوَالِي الْعَصَبَةَ: وَجْهُ خَوْفِهِ أَنَّهُ خَشِيَ أَنْ يَتَصَرَّفُوا مِنْ بَعْدِهِ فِي النَّاسِ تَصَرُّفًا سَيِّئًا، فَسَأَلَ اللَّهَ وَلَدًا، يَكُونُ نَبِيًّا مِنْ بَعْدِهِ، لِيَسُوسَهُمْ بِنُبُوَّتِهِ وَمَا يُوحَى إِلَيْهِ، فَأُجِيبَ فِي ذَلِكَ، لَا أَنَّهُ خَشِيَ مِنْ وِرَاثَتِهِمْ لَهُ، مَالَهُ، فَإِنَّ النَّبِيَّ أَعْظَمُ مَنْزِلَةً وَأَجَلُّ قَدْرًا مِنْ أَنْ يُشْفِقَ عَلَى مَالِهِ إِلَى مَا هَذَا حَدُّهُ، أَنْ يَأْنَفَ مِنْ وِرَاثَةِ عَصَبَاتِهِ لَهُ، وَيَسْأَلَ أَنْ يَكُونَ لَهُ وَلَدٌ، فَيَحُوزَ مِيرَاثَهُ دُونَهُ دُونَهُمْ.

الثَّانِي: أَنَّهُ لَمْ يُذْكَرْ أَنَّهُ كَانَ ذَا مَالٍ، بَلْ كَانَ نَجَّارًا يَأْكُلُ مِنْ كَسْبِ يَدَيْهِ، وَمِثْلُ هَذَا لاَ يَجْمَعُ مَالًا وَلَا سِيَّمَا الْأَنْبِيَاءُ، عَلَيْهِمُ السَّلَامُ، فَإِنَّهُمْ كَانُوا أَزْهَدَ شَيْءٍ فِي الدُّنْيَا.

الثَّالِثُ: أَنَّهُ قَدْ ثَبَتَ فِي الصَّحِيحَيْنِ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ نُورَثُ، مَا تَرَكْنَا فَهُوَ صَدَقَةٌ»[2] وَفِي رِوَايَةٍ عِنْدَ التِّرْمِذِيِّ بِإِسْنَادٍ صَحِيحٍ: {«نَحْنُ مَعْشَرَ الأَنْبِيَاءِ لاَ نُورَثُ} وَعَلَى هَذَا فَتَعَيَّنَ حَمْلُ قَوْلِهِ: ﴿ فَهَبْ لِى مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا ﴿٥﴾ يَرِثُنِي ﴾، عَلَى مِيرَاثِ النُّبُوَّةِ].

---

(١) ص ٨١٨.

(٢) جاء من حديث عائشة، وأبي بكر الصديق، وعمر بن الخطاب، وطلحة، وعثمان بن عفان، والزبير بن العوام أما حديث عائشة فرواه البخاري: (٦٧٣٠) ومسلم برقم (١٧٥٨) . وأما حديث أبو بكر فرواه البخاري برقم (٣٧/١) ومسلم برقم (١٧٥٩) . وأما حديث عمر بن الخطاب وعثمان وطلحة والزبير، فرواه البخاري برقم (٣٠٩٤، ٦٧٢٨، ٧٣٠٥) ومسلم برقم (١٧٥٧) .

واتـە: کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِنِّي خِفْتُ ٱلْمَوَٰلِيَ مِن وَرَآءِى ﴾، مـن لـە خزمـە نیزیکەکانـم لـە دوای خۆمـەوە ترسـام، دەڵـێ: مەبەسـت لـە (مـوالي) خزمـەکانی پشـتێیەتی [دوایـی سـێ (٣) بەڵگـە دێنێـتەوە لـە سـەر ئـەوە کـە ترسـەکەی لەزایەبـوونی میراتـە مەعنەوییەکـەی بووە، نـەك مـاڵ و سـامان:]

بەڵگـەی یەکـەم: هـۆی ترسـەکەشی ئـەوە بـووە، کـە لـە دوای خـۆی خزمـەکانی بەشـێوەیەکی خـراپ مامەڵـە لەگـەڵ خەڵکـدا بکـەن، بۆیـە داوای کـردوە کـە خـوا کوڕێـکی پـێ ببەخشـێ پێغەمبـەر بـێ، تاکـو بـەو پێغەمبەرایەتییـە و، بـەوەی کـە خـوا بـۆی سروش دەکات، سەرپەرشـتیی خەڵـك بـکات، ئنجـا وەڵامـی ئـەوەشی دراوەتـەوە و ئـەوەی بـۆ جێبەجێکـراوە، نـەك لـەوە ترسـا بـێ کـە مـاڵ و سـامانەکەی لـێ بـە میـرات بگـرن، چونکـە پێغەمبـەر ﷺ پلـەی لـەوە مەزنـترە و، پێگـەی لـەوە گەورەتـرە، کـە هێنـدە ترسـی مـاڵ و سـامانەکەی هەبـێ، داوایـەکی بەوجـۆرە لـە خـوا بـکات، کوڕێـکی پەیـدا بـێ و مـاڵ و سـامانەکەی بـە میـرات بگـرێ و، لـەوە بترسـێ کـە خزمـە نیزیکـەکانی مـاڵ و سـامانەکەی بـە میـرات بگـرن! ئنجـا داوا بـکات: خـوا کوڕێـکی پێبـدات، بـۆ ئـەوەی مـاڵ و سـامانەکەی هەمـووی هـی کوڕەکـەی بـێ و، بـەشی خزمـەکانی لـێ نـەدات [ئـەوە شایسـتەی پێغەمبەرێـك نیـە، قسـەکەشی زۆر جوانـە].

بەڵگـەی دووەم: لەسـەر ئـەوە کـە مەبەسـت لێرەدا میـراتی مەعنەوییـە، ئەوەیـە کـە بـاس نەکـراوە: زەکەریـیا مـاڵ و سـامانی بووبـێ، بەڵکـو [وەك دوایـی بـاسی دەکەیـن] زەکەریـیا دارتـاش بـووە و، لـە بەرهەمـی دەسـتی خـۆی خواردوویـەتی و بابـای ئـاواش سـەروەت و سـامانی بـۆ وەسـەریەك نانـرێ.

بەڵگـەی سـێیەم: لـە هـەردووك (**صحيـح البخـاري وصحيـح مسـلم**)دا هاتـوە، کـە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: [**لاَ نُـورَثُ، مَـا تَرَكْنَـا فَهُـوَ صَدَقَـةٌ**] واتـە: ئێمـە میراتمـان لـێ ناگیـرێ، هەرچـی بەجێـی دەهێڵیـن صەدەقەیـە [بەخشـینە بـۆ هەمـوو خەڵـك] هەروەهـا ڕیوایەتێـك لـە ڕێیەکی ڕاسـتەوە لـە (**سـنن الترمـذي**)دا هاتـوە: [**نَحْـنُ مَعْـشَرَ الأَنْبِيَـاءِ لاَ نُـورَثُ**] واتـە: ئێمـەی کۆمەڵـی پێغەمبـەران میراتمـان [میـراتی مادديـمان و مـاڵ و سـامانمان] لـێ ناگیـرێ.

کەواتـە: پێویسـتە ئـەوە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَهَبْ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا ۝٥ يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنْ ءَالِ يَعْقُوبَ ﴾، بگوتـرێ: تایبەتـە بـە میـراتی مەعنەویـی و پێغەمبەرایەتییـەوە و، هیـچ پەیوەندیـی بـە مـاڵ و سـامانەوە نیـە.

## زەکەرییای بابی یەحیا، لە زەکەرییای کوڕی بەرخیا جیایە

زەکەرییایەك لە پەیمانی کۆندا هاتوە، بە ناوی: (زەکەرییای کوڕی بەرخیا) کە لە سەدەی شەشەمی پێش زایندا بووە، خاوەنی یەکێکە لەو سیفرانەی کە لە پەیمانی کۆندا هاتوون.

کەواتە: ئەو زەکەرییایەی کە لە قورئاندا باسی کردوە، زەکەرییای دووەمە و ئەوە مێردی پووری مەریەمە و، کتێبیشی بە ناوەوە نیە لە پەیمانی کۆندا، ئێمە دواتر باسی ژیانی زەکەرییا و ڕەچەڵەکی و باری کەسێتیی و خێزانییشی دەکەین.

## ئیعجازێکی زانستی لەم پێنج ئایەتەدا:

بەڕێـــــــــزان!

ئەم پێنج شتە:

١- لاوازیی ئێسك، ٢- سەرسپی بوون، ٣- ترسان، ٤- پیریی زۆر، ٥- وەچە نەخستنەوە.

کە زەکەرییا ﵇ لە پاڕانەوەکەی دا باسیان دەکات لە ئایەتەکانی (٣ - ٨)دا، بریتیین لە پایەکانی پەیوەندییەکی هۆرمۆنیی یەکدی تەواوکەر.

پزیشکەکان ئەڵێن:

١)- لە ئەنجامی کەوتنە تەمەن دا، دوو شت ڕوودەدەن:

أ)- کەڵەکەبوونی نوقسانیی لە ماددەی بۆ ماوەیی دا، کە ترشەڵۆکە نێوەکییەکان (الأحماض النووية)، کە هێمای (DNA)ی بۆ بەکارهێنراوە، لە نێوکی خانەدا، ئەوانە نوقسانییان تیادا پەیدادەبێ و ئەوەش دەبێتە هۆی بێ توانایی خانەکان لە دروستکردنی پرۆتینی ساغ و بێ عەیبدا.

ب)- ڕەگە بەڕەڵڵایەکان (الجذور الحُرَّة RADICALS FREE)، کە چەند ماددەیەکی ژەهراویین بۆ لەش و، لە ئەنجامی زیندە چالاکییەکان دا پەیدادەبن، بەرپرسن لەو زیانانەی کە لە خانەکاندا ڕوودەدەن و، دەبنە هۆی پیریی و ڕەقبوونی دیواری خوێنبەرەکان، بە هۆی نیشتنی چەوریی لە ژێر نێو پۆشی دیوارەکاندا، کە ئەویش دەبێتە هۆی کەمیی گەیشتنی خۆراك و ئۆکسجین بە خانە و شانە جیاوازەکانی جەستە، بە تایبەت مێشك کە دەبێتە هۆی پووکانەوەی بە هێواشیی.

٢)- لە ئەنجامی پیرییشدا، ئێسکەکان لاواز دەبن، بە هۆی نوقسانییەکی بەرچاو لە بڕی ماددەی ئێسکیی (المادة العظمية)، کە لە دوای (٤٠) ساڵییەوە دەست پێدەکات، ئنجا لاوازبوونی ئێسك لە پیریی دا، بە هۆی کەمبوونەوەی چالاکی خانە بنیاتنەرەکانی ئێسکە (OSTEOBLASTS)، هەروەها کەمیی ڤیتامین (D) کە لە ئەنجامی ئەوەشدا مژینی کانزای کالیسیۆم لە ڕیخۆڵەکانەوە کەم دەکاتەوەو، لە خوێندا کەم دەبێ و، سەرەنجام هۆرمۆنی (پاراثایۆرید) لە ڕژێنی هاوڕێی دەرەقییەوە زیاد دەبێ و، ئەو هۆرمۆنەش دەبێتە هۆی زیادبوونی تێکشکان و کەمبوونەوەی ماددەی ئێسکیی، هەروەها بەهۆی پیرییەوە هۆرمۆنی نێرینە: تێستۆستیرۆن (TESTOSTERONE) کەم دەبێ، کە هۆکاری چالاکیی خانە بنیاتنەرەکانی ئێسکە و، پێچەوانەی هۆرمۆنی کۆرتیزۆن (CORTISONE)ە.

٣)- هەروەها دڵەڕاوکەو ترسانی بەردەوام، حاڵەتێکی هەژان دروست دەکات و، چەندان گۆڕانکاریی دروست دەکات، کە یەکێکیان بریتیە لە ڕژاندنی هۆرمۆنی کۆرتیزۆن لە کوێرە ڕژێنی سەر گورچیلەکانەوە، ئەمیش هۆکاری ڕاستەوخۆی لاوازیی ئێسك و پیربوونە! هەروەها زیاد بوونی هۆرمۆنی: (ئەدرینالین) کە مایەی بەرزبوونەوەی (کۆلیسترۆل)ە، لە خوێندا و، سەرەنجام ڕەقبوونی خوێنبەرەکان.

٤)- ئنجا هەتا مرۆڤ بە تەمەندا بچێ، قژی سەری سپی تر دەبێ، چونکە چالاکیی خانە ڕەنگکەرەکان لە ژێر کۆنترۆڵی هۆرمۆنێکی تایبەتی دایە، کە کوێرە ڕژێنی ژێر مێشك دەری دەدات، بە هۆرمۆنی چالاککەری خانە ڕەنگکەرەکان (MSH) ناسراوە و، بە بەرەو پێشچوونی تەمەنیش، هۆرمۆنی (MSH) کەم دەکات و، ئەمیش دەبێتە هۆی کەمبوونی ژمارەی خانە ڕەنگکەرەکانی پێست.

٥)- پاشان لە دەرەنجامی ئەو هۆکارانەدا، توانای وەچەخستنەوە (نسل) لە پیاودا کەم دەبێ، چونکە بەهێزیی وەچەخستنەوە لە پیاودا، لە ڕووی بایۆلۆجییەوە لە دروستکردنی تۆو (سپێرم)، لە گونەکاندا خۆی دەبینێتەوە، ئەویش بە هۆی هەڵسانی خانەکانی (لایدیگ) بە ڕژاندنی هۆرمۆنی نێرینە (تێستۆستیرۆن)، کە کار دەکاتە سەر گەشەکردنی خانە سپێرمییەکان، ئەویش بە کاریگەریی بۆ سەر چەند خانەیەکی ناوپۆشی لوولە سپێرمییەکان، کە پێیان دەگوترێ: خانەکانی سێرتۆلیی (CELLS SERTOLI)، کە ڕۆڵێکی سەرەکیی لە پێگەیاندنی سپێرمەکان دا هەیە، لە هەمان کات دا خانەکانی سێرتۆلیی پێویستییان بە هۆرمۆنێکی دیکە هەیە، بۆ چالاك بوونیان کە لە ژێر مێشکە ڕژێنەوە دەردەدرێ، ڕاستەوخۆ بۆ لوولەکانی گون، ئەویش هۆرمۆنی چالاککەری ڕژێنەکانی زاوزێیە (FSH)، هەروەها ژێر مێشکە ڕژێن، هۆرمۆنێکی دیکە دەڕێژێ کە کاریگەریی بۆ سەر خانەکانی

(لایدیگ) هەیەو، هانیان دەدات بۆ دروستکردنی (تیستۆستیرۆن)، ئەو هۆرمۆنەش ڕەمزە کیمیاییەکەی، بریتیە لە (LH).

لە مەوە کە ڕابرد بۆمان دەردەکەوێ: کە ئەو پێنج شتەی زەکەریا ﷺ باسیان دەکات: کەوتنە تەمەنی پیریی، سەرسپی بوون، ئێسك بێهێزبوون، پاشان ترسانی لە خزمەکانی، دوای ئەوەی کەوتۆتە تەمەنەوە، سەرەنجام: بە هیوا نەبوونی ئەوە کە منداڵیان ببێ، مەگەر خوا بە شێوەیەکی تایبەت پێی ببەخشێ.

ئەو پێنج شتە وێکڕا، پەیوەندییەکی ئۆرگانیکیی و تەواوکارییان پێکەوە هەیە[1].

---

(١) ئەو سەرچاوەیەی کە ئەوەم لێی وەرگرتوە کتێبی: (بەڵگە ئاشکراکان)ی دکتۆر کاوە فەرەج سەعدوون، لاپەڕە (٥٥) تاکو (٧٦)، چاپی دووەم ساڵی (٢٠٠٧) زایینی.

**مه‌سه‌له‌ی سێیه‌م:**

**بانگکردنی خوا ﷻ بۆ زه‌که‌ریا: كه‌ ئێمه‌ موژده‌ی کوڕێکت پێده‌ده‌ین: ناوی یه‌حیایه‌ و پێشتر هاوناومان، یان هاوتامان بۆ دانه‌ناوه‌، سه‌رسوڕمانی زه‌که‌ریا! كه‌ چۆن له‌ حاڵێکدا ژنه‌که‌م نه‌زۆکه‌ و خۆشم له‌ پیریی دا گه‌یشتوومه‌ته‌ ئه‌و په‌ڕی، چۆن کوڕم بۆ په‌یداده‌بێ! خواش ﷻ ده‌فه‌رموێ: هه‌ر به‌و شێوه‌یه‌ په‌روه‌ردگارت فه‌رموویه‌تی: ئه‌وه‌ بۆمن ئاسانه‌ و پێشتریش تۆ نه‌بووی و، هێنامیه‌ دی و دروستم کردی و، داواکردنی زه‌که‌ریا بۆ نیشانه‌یه‌ك كه‌ ئایا كه‌ی ئه‌و منداڵه‌ ده‌كه‌وێته‌ سكی دایکی؟ خواش نیشانه‌ی بۆ داده‌نێ كه‌ هه‌تا سێ شه‌وو ڕۆژان زمانت ده‌گیرێ، بێ ئه‌وه‌ی ناته‌ندروست و نه‌خۆش بی، قسه‌ت له‌گه‌ڵ خه‌ڵکدا بۆ ناکرێ، ئنجا كه‌ زه‌که‌ریا ئه‌و حاڵه‌ته‌ی بۆ ئاشکرا ده‌بێ، كه‌ ئه‌و منداڵه‌ که‌وتۆته‌ سكی دایکی له‌ میحرابه‌که‌یه‌وه‌ ده‌رده‌چێ بۆ لای خه‌ڵکه‌که‌ و ئاماژه‌یان بۆ ده‌کات كه‌ به‌یانیان و ئێواران خوا به‌ پاك بگرن:**

خوا ده‌فه‌رموێ: ﴿ يَٰزَكَرِيَّآ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسۡمُهُۥ يَحۡيَىٰ لَمۡ نَجۡعَل لَّهُۥ مِن قَبۡلُ سَمِيّٗا ﴿٧﴾ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَكَانَتِ ٱمۡرَأَتِي عَاقِرٗا وَقَدۡ بَلَغۡتُ مِنَ ٱلۡكِبَرِ عِتِيّٗا ﴿٨﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ قَالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٞ وَقَدۡ خَلَقۡتُكَ مِن قَبۡلُ وَلَمۡ تَكُ شَيۡـٔٗا ﴿٩﴾ قَالَ رَبِّ ٱجۡعَل لِّيٓ ءَايَةٗۚ قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَ لَيَالٖ سَوِيّٗا ﴿١٠﴾ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنَ ٱلۡمِحۡرَابِ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ أَن سَبِّحُواْ بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ﴿١١﴾ ﴾.

## شیکردنه‌وه‌ی ئه‌و ئایه‌تانه‌، له‌ پازده‌ بڕگه‌دا:

١)- ﴿ يَٰزَكَرِيَّآ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسۡمُهُۥ يَحۡيَىٰ ﴾، [خوا بانگی کرد:] ئه‌ی زه‌که‌ریا! ئێمه‌ موژده‌ت پێده‌ده‌ین به‌ کوڕێك كه‌ ناوی یه‌حیایه‌.

لێره‌دا ڕسته‌ی: (يا زكريا)، (مَقُول قَوْلٍ مَحْذُوف)، گوتراوی قسه‌یه‌کی فڕتێنراوه‌، واته‌: گوتمان: ئه‌ی زه‌که‌ریا، (تَبْشِير)یش بریتیه‌ له‌ به‌ڵێن و گفتدان به‌ پێبه‌خشین.

٢)- ﴿ لَمۡ نَجۡعَل لَّهُۥ مِن قَبۡلُ سَمِيّٗا ﴾، كه‌ پێشتر هاوناومان بۆ دانه‌ناوه‌، واته‌: كه‌سێکی دیکه‌مان دانه‌ناوه‌، كه‌ هه‌مان ناوی هه‌بێ، یاخود هاوتامان بۆ دانه‌ناوه‌، واته‌: كه‌ به‌و شێوه‌یه‌ په‌یدابێ و،

ئەو تایبەتمەندییانەی کە لە یەحیادا هەن، بیبن، نەك هیچ کەسی دیکە نەگەیبێتە ئەو ئاستە لە بەرزییدا، چونکە ژمارەیەك پێغەمبەرانی دیکە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ئاستیان لەو بەرزتر بووە، بەڵام ئەو تایبەتمەندییانەی لە یەحیادا هەبوون، لەواندا نەبوون.

هەردووك واتاکەش گونجاون:

کە نە لە پێش یەحیادا، ناوی دیکە بەکارهاتبێ، نە هیچ کەسیش ئەو تایبەتمەندییانەی یەحیای بووبن.

٣)- ﴿ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٌ ﴾، گوتی: پەروەردگارم چۆن کوڕم بۆ پەیدا دەبێ؟! (أَنَّىٰ) یانی: (کیف) چۆن؟ دەشگونجێ: بەمانای (مِنْ أين) لە کوێوە؟ بێ، ئەم قسەیەش: (إسْتِفْهَام فِي التَّعَجُّب وَيُقْصَدُ بِهِ الشُّكْر) ئەمە پرسیارکردنی سەرسووڕمانە، بەڵام مەبەست پێی سوپاسگوزارییە، بۆ وێنە: کەسێك شتێکت بۆ دێنێ، دەڵێی: ئەو شتە جوانەت لە کوێ بوو؟! چۆنت پەیداکرد؟ کە مەبەستت پێی ئەوەیە: سوپاسی بکەی، کە شتێکی زۆر چاکی بۆ هێناوی.

٤)- ﴿ وَكَانَتِ ٱمْرَأَتِي عَاقِرًا ﴾، لە حاڵێکدا کە ژنەکەم نەزۆکە، (إمْرَأَةٌ عَاقِر: أي لاَ تَلِد) منداڵی نابێ.

٥)- ﴿ وَقَدْ بَلَغْتُ مِنَ ٱلْكِبَرِ عِتِيًّا ﴾، بەدڵنیایی خۆیشم لە پیریی دا گەیشتوومە لووتکە، یان گەیشتوومە ڕاددەیەکی زۆر هەڵکشیو.

(الكِبَرُ: كَثْرَةُ سِنِي العُمُر)، (كِبَر) واتە: زۆریی ساڵەکانی تەمەن، (عِتِيًّا) دەگوترێ: (عَتَا العُودُ: يَبُسَ، شَبَّهَ العِظَامَ بالأعْوَادِ اليَابِسَة)، (عَتَا العُودُ: يَبُسَ) واتە: دارەکە وشك بوو، لێرەدا ئێسقانەکانی خۆی بە دارێك کە وشك هەڵبگەڕێ، چواندوە.

(عِتِيًّا) خوێنراوەیشەتەوە: (عُتِيًّا) کە هەردووکیان یەك مانایان هەیە، واتە: لە پیریی دا گەیشتوومە ئاستێکی هەڵکشیو.

٦)- ﴿ قَالَ كَذَٰلِكَ ﴾، خوا فەرمووی: هەروایە، واتە: حاڵ بەو شێوەیەیە، لە کاتێکدا کە تۆ کەوتوویە تەمەنەوە، ژنەکەشت نەزۆکە، ئنجا پەروەردگارت بڕیاری داوە کە منداڵێکتان ببێ، تاکو هەموو خەڵك بزانێ کە دەستەڵاتی خوا سنوور و لەمپەرێکی لە بەردەمدا نیە، بەڵێ خوا یاسای داناون لە دروستکراوەکانی خۆیدا، بەڵام دەشتوانێ ئەو یاسایانە بدڕێ و لە کار بخات، بە یاسای دیکەی تایبەت، لەلایەن خۆیەوە.

٧)- ﴿ قَالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ ﴾، پەروەردگارت فەرموویەتی: ئەوە بۆ من ئاسانە، واتە: دروستکردنی منداڵێك لە باپێکی پیرو، ئافرەتێکی نەزۆك، بۆ من ئاسانە.

(هيّن) واتە: پەیدابوونەکەی بۆ من ئاسانە، بە نسبەت ئێمەوە وشەی ئاسان و قورس بەکاردەهێنرێن، ئەگەرنا بۆ خوا ﷻ ئاسان و قورس نیە، هەمووی وەك یەکە.

٨)- ﴿ وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِن قَبْلُ ﴾، پێشتر تۆشم هێناوەتە دی، تۆشم دروستکردوە لەوەو پێش، [کە نەبووی].

٩)- ﴿ وَلَمْ تَكُ شَيْئًا ﴾، تۆ شتێك نەبووی (لم تكن موجوداً) یانی: بوونت نەبوو، کەچی بووبمان بە تۆدا، وەك خوا لە سەرەتای سوورەتی (الإنسان)دا دەفەرموێ: ﴿ هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا ﴿١﴾ ﴾الإنسان، واتە: ئایا بەسەر مرۆڤدا نەهاتوە، کاتێك لە ڕۆژگار، کە هیچ شتێکی باسکراو نەبوو، [ناوی لە کولەکەی تەڕدا نەبوو!].

١٠)- ﴿ قَالَ رَبِّ ٱجْعَل لِّيٓ ءَايَةً ﴾، (زەکەرییا) گوتی: پەروەردگارم! نیشانەیەکم بۆ دابنێ، کەی ئەو منداڵە لە سکی دایکیدا پەیدا دەبێ؟ کەی دایکی پێی دووگیان دەبێ؟ چونکە خوا مژدەی پێداوە کە کوڕی دەبێ، بەڵام کاتەکەی بۆ دیاریی نەکردوە.

١١)- ﴿ قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ﴾، فەرمووی: نیشانەکەت، ئەوەیە کە: سێ ڕۆژان لەگەڵ ئەوەشدا، کە ساغ و سەلامەتی، قسەت بۆ لەگەڵ خەڵکیدا ناکرێ، ناتوانی قسە لەگەڵ خەڵکدا بکەی، ئەگەرنا مەبەست ئەوە نیە کە نابێ قسە لەگەڵ خەڵکیدا بکەی، واتە: مەبەست پێی نەهی لێکردنی نیە، بەڵکو هەواڵ پێدانیەتی کە ناتوانێ قسە لەگەڵ خەڵك دا بکات.

١٢)- ﴿ ثَلَٰثَ لَيَالٍ سَوِيًّا ﴾، سێ شەوی تێر و تەواو، وشەی (سویاً) دەگونجێ حاڵ بێ بۆ: (ثلاث ليال) واتە: سێ شەوی تێر و تەواو، دەشگونجێ حاڵ بێ بۆ: دوێنراو، واتە: لە حاڵێکدا کە تۆ ساغ و سەلامەتی و، تێر و تەواوی و ناتەندروست و نەخۆش نی، کەچی ناشتوانی قسە لەگەڵ خەڵکیدا بکەی، لێرەدا باسی سێ شەوان دەکات و، لە سوورەتی (آل عمران)دا باسی سێ ڕۆژان دەکات، کەواتە: سێ شەوو، سێ ڕۆژان بووە.

وشەی (سوي) (فَعِيل بِمَعْنَى مَفْعُول، يَسْتَوِي الوَصْفُ بِهِ الوَاحِدُ وَالوَاحِدَةُ ولِلْمُتَعَدِّدُ منهما)، وشەی (سوي) (فعيل)ە، بەڵام بە مانای (مفعول)ە، واتە: ڕێك و پێك، بێ گرفت، تێر و تەواو، کە هەم تاکی نێر و تاکی مێ، هەروەها کۆی نێر و مێش، بە وشەی (سوي) وەسف دەکرێن، دەگوترێ: (إمْرَأَةٌ سويّ) و (نساءٌ سَوِيّ)، هەروەها (رَجُلٌ سوي)، و (رِجَالٌ سوي).

١٣)- ﴿ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنَ ٱلْمِحْرَابِ ﴾، لە میحرابەکەوە چۆوە دەر بۆ لای خەڵکەکەی، (محراب) ژوورێکە، یاخود شوێنێکی دیاریکراوە، مرۆڤ خوا پەرستیی تێدا دەکات.

١٤)- ﴿ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ ﴾، ئاماژەی بۆ کردن.

ئایا ئەو ئاماژەیە بە چاو بووە، یان بە دەست بووە، دیاریی نەکراوە، گرنگ ئەوەیە ئاماژەی بۆ کردن و تێی گەیاندن بە زمانی ئاماژە.

١٥)- ﴿ أَن سَبِّحُواْ بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴾، کە بەیانیان و ئێواران (پەروەردگارتان) بە پاك بگرن.

(أَنْ) {(أن تفسيرية، وجملة: سَبِّحُواْ بُكْرَةً وَعَشِيًّا، تفسير لـ (أوحى))}، ئاماژەی بۆ کردن، ئاماژەکەش بریتی بوو لەوەی کە بەیانیان و ئێواران پەروەردگارتان بە پاك بگرن، واتە: بە پاکی بگرن لەوەی: نەتوانێ منداڵێك بێنێتە دی لە بابێکی پیریی بەساڵداچوو و، دایکێکی نەزۆك، خوا بە پاك بگرن لەوەی کە کارێکی وای پێنەکرێ، چونکە ویستی خوا ﷻ ڕوو بکاتە هەر شتێك، زانیاریی خوا، دەستەڵاتی خوا، هەموو سیفەتەکانی خوا، ڕەها و بێ سنوورن، هیچ لەمپەر و کۆسپێك لە بەردەم ویستی خوادا نیە و هەر شتێکی بیەوێ دەیکات، وەك دەفەرموێ: ﴿ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٦﴾ ﴾البروج، واتە: خوا هەرچی بیەوێ دەیکات، ﴿ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴿٢٧﴾ ﴾إبراهيم، واتە: خوا ئەنجامدەری هەر شتێکە کە بیەوێ، کۆسپ و لەمپەر لە بەردەم سیفەتەکانی خوادا نین، هیچ سنوورێك نیە بۆ سیفەتەکانی خوا ﷻ، خوا هەموو شتێك دەزانێ، هەموو شتێك دەتوانێ، هەر شتێکی بوێ، بەو شێوەیە کە دەیەوێ، لەو کاتەدا کە دەیەوێ، بەو چۆنیەتییەی دەیەوێ، ئەنجامی دەدات.

**مەسەلەی چوارەم:**

**دواندنی خوا ﷻ بۆ یەحیا: ئەی یەحیا! بە توندیی دەست بە کتێبەکەوە بگرە! ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییەش کە: بە منداڵیی حیکمەتمان پێدا بوو و، لەلایەن خۆمانەوە سۆز و پەرۆش و پاکیی و چاکییمان پێدا بوو و، پارێزکاریش بوو، هەروەها لەگەڵ باب و دایکی دا چاکەکار بوو و، خۆسەپێن و سەرپێچیکار و یاخیی نەبوو، سەلامیشی لێ بێ لە ڕۆژی لە دایک بوونی و، ڕۆژی مردنی و، ڕۆژی بە زیندوویی هەڵستێنرانەوەی دا:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ يَٰيَحۡيَىٰ خُذِ ٱلۡكِتَٰبَ بِقُوَّةٖۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحُكۡمَ صَبِيّٗا ١٢ وَحَنَانٗا مِّن لَّدُنَّا وَزَكَوٰةٗۖ وَكَانَ تَقِيّٗا ١٣ وَبَرَّۢا بِوَٰلِدَيۡهِ وَلَمۡ يَكُن جَبَّارًا عَصِيّٗا ١٤ وَسَلَٰمٌ عَلَيۡهِ يَوۡمَ وُلِدَ وَيَوۡمَ يَمُوتُ وَيَوۡمَ يُبۡعَثُ حَيّٗا ١٥ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ يَٰيَحۡيَىٰ ﴾، ئەی یەحیا! ئەمەش: (مَقُول قَوْلٍ مَحْذُوفٍ، يَدُلُّ عَلَيْهِ السِّياق)، گوتراوی قسەیەکی قرتێنراوە، سیاق دەیگەیەنێ وەك: (قال الله يا يحيى)، خوا فەرمووی: ئەی یەحیا!

خوا ﷻ بانگی کردوە و دواندوویەتی.

٢)- ﴿ خُذِ ٱلۡكِتَٰبَ بِقُوَّةٖ ﴾، بە توندیی کتێبەکە بگرە، دوای ئەوەی خوا ﷻ مژدەی دا بە زەکەریا، کە یەحیایان دەبێ و، زەکەریاش ئاماژەی بۆ خەڵکەکەی کرد، چونکە نەیتوانی خەڵك بدوێنێ، ئاماژەی بۆ خەڵکەکە کرد کە سێ شەوو سێ ڕۆژان خوا بە پاك بگرن بەیانیان و ئێواران، خوا ئەوەی دیکە، هەمووی دەپێچێتەوە و باسی ناکات، چونکە جێی مەبەست ئەوەیە کە یەحیا پەیدا بوو و بوو بە پێغەمبەر ﷺ و، بوو بە میراتگر و جێگرەوەو سەرپەرشتییکار لە شوێنی بابی و، داوایەکەی بابی و ئاواتەکەی هاتە دی، ئیدی دێتە سەر جێی مەبەست، ئەی یەحیا کتێبەکە بە توندیی بگرە!

(أل)ی (الكتاب)، بۆ ناساندنی (عهد)ە یانی: کتێبەکە بە توندیی بگرە، جاری دیکەش باسمان کردوە: (أل) ئەلیف و لام (أل)ی (عهد) لە کوردییدا لە بەرانبەر (کە)یە، کتێب: کتێبەکە، واتە: ئەو کتێبەی دەزانریٚ کامەیە؟ (خُذِ الكِتَابَ بقوة) کتێبەکە بە توندیی بگرە.

یاخود (أل) بۆ (جنس)ە، واتە: هەر کتێبێك کە هی خوایە ﷻ، چ (تەورات)، چ ئەو کتێبانەی دیکە کە بە پێغەمبەرانی دیکە دراون، بە توندیی بیانگرە، لێرەدا وشەی

(أخذ) گرتن، خوازراوەتەوە بۆ لێ تێگەیشتن و، لێ وردبوونەوەو، پێوە پابەندبوون، کە دەشفەرموێ: (بقوّة) بە توندیی واتە: بە دڵێکی چەسپاو و بە ئیرادەیەکی بەهێزەوە بیگرە، نەك مەبەست ئەوەبێ بەدەست بە توندیی بیگرێ! بەڵکو مەبەست ئەوەیە: چاك لێی تێبگە و لێی وردبەوە و، باش پێوەی پابەند بە.

٣)- ﴿ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْحُكْمَ صَبِيًّا ﴾، کاتێك کە مێرد منداڵ بوو، ئێمە حیکمەتمان پێدا بوو، (حُکْم) لێرەدا بە مانای (حیکمة)ە، واتە: لێزانیی و کارامەیی و شارەزایی، هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست پێی پێغەمبەرایەتیە، بەڵام ئەو ڕایە بەهێز نیە، چونکە وشەی: (صَبِيّ) ناوە بۆ نێرینەیەك پێش ئەوەی باڵغ بێ، هەروەك (صبية)ش ناوە بۆ مێیینە پێش ئەوەی باڵغ بێ، ئنجا بە تەئکید پلەی پێغەمبەرایەتیی، بە منداڵێکی نا باڵغ نابەخشرێ، بەڵام مەبەست لێی حیکمەت و لێزانیی و کارامەیە.

٤)- ﴿ وَحَنَانًا مِّن لَّدُنَّا ﴾، هەروەها لەلایەن خۆمانەوە سۆز وپەرۆش (حنان)مان پێدا بوو، یاخود: سۆز وپەرۆش (حنان)مان لەگەڵ بەکارهێنا بوو.

(حَنان)یش بە مانای شەفەقەت و سۆز و بەزەیی و پەرۆش دێ، واتە:

أ- بەزەیی و پەرۆشییمان کرد بوو بە سیفەتێك لە یەحیادا.

ب- یاخود: لەلایەن خۆمانەوە بە میهرەبانیی و بەزەیی و پەرۆشەوە، مامەڵەمان لەگەڵ یەحیادا کرد بوو، بە هەردوو واتایان دێ، بەڵام ئەوەی یەکەمیان گونجاوترە، لەگەڵ سیفەتەکانی دیکەش دا کە خوا باسیان دەکات.

لە زمانی عەرەبییدا دەگوترێ: (حَنَانَيْكَ) واتە: (حَنَاناً مِنْكَ بَعْدَ حَنَانَ)، (حَنَانَيْكَ) واتە: پەرۆش و سۆزم لەگەڵ بنوێنە، پەرۆش لە دوای پەرۆش، بەردەوامبە لەگەڵم لە نواندنی بەزەیی و پەرۆش دا.

٥)- ﴿ وَزَكَوٰةً ﴾، (زَكَاةُ النَّفْسِ: نَقَاؤُهَا مِنَ الخَبَائِثِ)، واتە: پاکییشمان لەلایەن خۆمانەوە پێیدا بوو، کە ئەمە لەگەڵ واتای یەکەمیان دا گونجاوترە، واتە: وێڕای پەرۆش و میهرەبانیی، پاکییمان لەلایەن خۆمانەوە پێیدا بوو، نەك مانای دووەمی، لەلایەن خۆمانەوە: بە سۆز و پەرۆش مامەڵەمان لەگەڵ کرد بوو.

٦)- ﴿ وَكَانَ تَقِيًّا ﴾، هەروەها پارێزکاریش بوو، (تقي) لێرەدا: (فَعِيلٌ بِمَعْنَى مُفْعِلْ) واتە: (وَكَانَ مُتَّقِياً) پارێزکار بوو، خۆی دەپاراست، خوا وای لێکرد بوو مەعدەنێکی پاك و چاکی هەبێ و خۆپارێزیش بێ.

٧)- ﴿ وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَيْهِ ﴾، دیسان بەرانبەر بە باب و دایکی چاکەکار بوو، دەڵێ: (البُرورُ: الإِكْرَامُ وَالسَّعيُ فِي الطَّاعَةِ، وَالبَرُّ: وَصْفٌ عَلَى وَزْنِ المَصْدَرِ، فَالوَصْفُ بِهِ مُبَالَغَة)، (بَرّ) سیفەتە لەسەر کێشی

چاوگ، بۆیە وەسفکردن بە (بَرّ) مەبەست پێی زێدەڕۆییە، وەك: خودی چاکەکاریی بێ، ئەگەرنا (برور) بە مانای ڕێزلێگرتن و کۆششکردنە لە فەرمانبەرییدا، ﴿وَبَرًّا بِوَالِدَيْهِ﴾، نەیفەرمووە: (بارّاً بوالديه)، (بارّ) چاکەکار، (بر) چاکەکاریی، وەك: خودی چاکەکاریی بێ لەگەڵ باب و دایکی دا.

٨)- ﴿وَلَمْ يَكُن جَبَّارًا عَصِيًّا﴾، خۆ سەپێن و سەرپێچییکاریش نەبوو، (الجبّار: المُسْتَخِفُّ بحقُوقِ النَّاس)، (جبّار) کەسێکە کە مافەکانی خەڵك بە کەم بگرێ، خۆیان بەسەردا بسەپێنێ، ستەمیان لێ بکات، (عَصِيّ) واتە: سەرپێچییکار و یاخیی، ئەو دوو سیفەتەی تێدا نەبوون، بەڵکو پێچەوانەی خۆسەپاندن و یاخیبوونی تێدا هەبوو، کە بریتی بوو لە نەرم و نیانیی و هێدیی و مەندیی و فەرمانبەریی بۆ خوا.

٩)- ﴿وَسَلَامٌ عَلَيْهِ﴾، سەلامی (خوای) لێبێ، (السَّلَامُ: إِسْمُ الكَلَامِ الَّذِي يُفَاتَحُ بِهِ الزَّائِرُ)، سەلام ناوی دەستپێکی ئەو قسەیە کە بابای سەردانکاری پێ دەدوێندرێ، (فَهُوَ يُؤْذِنُ بِأَنَّ الَّذِي أَقْدَمَ هُوَ عَلَيْهِ: مُسَالِمٌ لَهُ)، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ ئەو کەسەی کە چووە بۆ لای، لەگەڵیدا ئاشتییخوازەو، چاوی لە شەڕ و شۆڕ و زیان پێگەیاندنی نیە، کەواتە: (سلام عليه) یانی: سەلامەتیی، ئاشتیی، بێ بەڵایی لەسەر وی بێ، بەڵام کەی سەلامی لێ بێ؟! لە سێ کاتی زۆر هەستیاردا:

١٠)- ﴿يَوْمَ وُلِدَ﴾، ئەو ڕۆژە کە لە دایك بووە.

١١)- ﴿وَيَوْمَ يَمُوتُ﴾، ئەو ڕۆژە کە تێیدا دەمرێ.

١٢)- ﴿وَيَوْمَ يُبْعَثُ حَيًّا﴾، ئەو ڕۆژەش کە بەزیندوویی هەڵدەسێنرێتەوە.

## سێ کاتی گەورەو گرنگ:

واتە: خوا ﷻ ئەو بەخششەی لەگەڵ یەحیادا بەکارهێناوە، کە هەم ڕۆژی لە دایك بوونی، هەم ڕۆژی مردنی، هەم ڕۆژی زیندووکرانەوەی سەلامەت دەبێ، ئاشتیی و سەلامەتیی لەسەر دەبێ، بێ دەرد و بەڵا دەبێ، شەیتان زەفەری پێ نابات.

کە بەدڵنیایی ئەو سێ کاتەش، سێ کاتی زۆر هەستیار و گەورەو چارەنووسسازن، لە ژیانی هەر مرۆڤێکدا، بەڕاستیی زۆر گرنگە: ئینسان لە ڕۆژی لە دایك بوونی دا سەلامەت بێ و، لە ڕۆژی کۆچکردن و دنیا بە جێهێشتنی داو، لە ڕۆژی زیندووبوونەوەی دا، ئنجا خوا ﷻ سەلامەتیی و، بێ بەڵایی و بێ مزەڕەتیی دەستەبەرکردوە بۆ یەحیا ﷺ لەو سێ کاتەدا.

ئێستاش با کورتەیەك لە بەسەرهاتی باب و کوڕی پاك و موبارەك زەکەریا و یەحیا بخەینە ڕوو.

## پوختەی ژیاننامەی
## زەکەریاو یەحیا (عَلَيْهِما الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)

ئێمە پێشتر باسی زەکەریا کە بابی یەحیایە (عَلَيْهِمَا الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، دەکەین، ئەویش لە پێنج برگەدا و بە کورتی:

### یەکەم: زەکەریا (عليه السلام):

١)- ناوو ڕەچەڵەکی زەکەریا.

٢)- ژمارەی ناوهێنانی زەکەریا لە قورئان دا.

٣)- کەسایەتیی و هاوسەر و منداڵەکانی، زەکەریا.

٤)- کورتەی بەسەرهاتی، زەکەریا.

٥)- چۆنیەتی کۆچی دوایی کردنی، زەکەریا.

### ١)- ناوو ڕەچەلەکی زەکەریا:

نە لە قورئان و سوننەتدا، نە لە پەیمانی کۆن و نوێ دا، باسی ڕەچەڵەکی زەکەریا نەکراوە، بەڵام ناوی زەکەریا هەر بە زەکەریا هاتوە، هەڵبەتە بە زەکەریاء یانی: زیادکردنی (ء) هەمزەش هاتوە، لەگەڵ درێژکردنەوەدا، واتە: هەم بە ناوی زەکەریا هاتوە، هەم بە ناوی زەکەریاء هاتوە و، لە خوێندنەوەی قورئانیشدا، بە هەردوو شێوەکان خوێنراوەتەوە، بەڵام لە پەیمانی کۆندا، باسی زەکەریایەکی دیکە کراوە کە لە قورئاندا بەسەرهاتەکەی نەهاتوە، وەك پێشتر گوتمان، ئەویش: (زكريا بن بَرْخيا)یە کە لە: (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم)[1]دا کتێبیشی هەیە، بەناوی (سِفْر زكريّا) لە نێو کتێبەکانی (پەیمانی کۆن)دا کە بە هەموویان دەگوترێ: (أسفار العهد القديم)، بە هەرکامێکیان دەگوترێ: (سِفر) یانی: کتێب.

---

(١) ص١٨٢٧ - ١٨٤٦.

(إبن كثير)یش لە (قصص الأنبياء)[1] دا نەیپێکاوە کە پێی وابووە (زكريا بن بَرْخيا) هەمان زەکەریایە، هەرچەندە ئینجیلی (برنابا) گوتوویەتی: ناوی بابی زەکەریاش هەر بەرخیا بووە، ئنجا ئەگەر وابێ، (إبن كثير) هەر مەبەستی پێی زەکەریای دووەمە کە هاوچەرخ بووە لەگەڵ عیسادا ﷺ و بابیشی ناوی بەرخیا بووە، ئەگەرنا (زكريا بن بَرْخيا) وەك پێشتر گوتمان زەکەریای یەکەمە کە لە پەیمانی کۆندا هاتوە، نیزیکەی شەشسەد (٦٠٠) ساڵ پێش زەکەریای دووەمە.

زەکەریای یەکەم لە بابل کە جوولەکە کۆچڕەوییان پێکراوە، کاتێ خۆی لە فەڵەستینەوە براون بۆ بابل بە زۆرە ملێ، لە بابل لە دایك بووە، بەڵام دوایی لە ساڵی (٥٣٨) پێش زایین دا، زەکەریا گەڕاوەتەوە بۆ فەڵەستین (ئۆرشەلیم) لە سەردەمی حوکمی (داریۆش) دا، دوای ئەوەی (کۆرش) پادشای فارس (بُخْتَنَصَّر) دەبەزێنێ لە بابل، ئەمەش لە (پەیمانی کۆن) لە لاپەڕە (١٨٢٧)دا باسکراوە، (داریۆش)یش لە دوای (کۆرشی گەورە) هاتوە و پادشای وڵاتی فارس بووە.

زەکەریای بابی یەحیاش هەر لە ڕۆژگاری عیسای مەسیحدا بووە و پێکەوە هاوچەرخ بوون، بۆیە بەسەرهاتەکەشیان هەم لێرە - لە سوورەتی (مەریەم)دا - هەم لە سوورەتی (آل عمران)دا، خوا ﷻ بەسەرهاتی مەریەم و عیسا و، زەکەریاو یەحیای بە تێکهەڵکێشی، هێناون.

ئنجا زەکەریا سەرپەرشتییکاری مەریەم بووە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا ۝٣٧ ﴾آل عمران، واتە: بەفەرمانی خوا زەکەریا سەرپەرشتیی مەریەمی کردوە و بەخێوی کردوە و چاودێریی کردوە.

## ٢)- ژمارەی ناوهێنرانی لە قورئان دا:

ناوی زەکەریا لە قورئاندا حەوت جاران هاتوە، هەرچەندە (عبدالوهاب النجار) لە (قصص الأنبياء)ەکەی خۆیدا، لە لاپەڕە (٦٣٨)دا گوتوویەتی: هەشت (٨) جاران ناوی هاتوە، بەڵام نەیپێکاوە، بەڵکو حەوت (٧) جار ناوی هاتوە، ئەمانەش شوێنەکانی ناو تێیدا هێنرانی زەکەریان:

١- لە سوورەتی (آل عمران)، ئایەتی ژمارە: (٣٧)دا، دوو (٢) جار ناوی زەکەریا هاتوە.

---

(١) ص٤٧١.

٢- هەر لە سوورەتی (آل عمران)، ئایەتی ژمارە: (٣٨)دا، یەك (١) جاری دیکە ناوی هاتوە.

٣- لە سوورەتی (الأنعام) لە ئایەتی ژمارە: (٨٥)دا، یەك (١) جار ناوی هاتوە.

٤- لە سوورەتی (مریم) لە ئایەتی ژمارە: (٢)دا، یەك (١) جار ناوی هاتوە.

٥- لە سوورەتی (مریم) لە ئایەتی ژمارە (٧)دا، یەك (١) جار ناوی هاتوە.

٦- لە سوورەتی (الأنبیاء) لە ئایەتی ژمارە: (٨٩)دا، یەك (١) جار ناوی هاتوە.

هەمووی دەكاتە حەوت (٧) جار.

## ٣)- هاوسەر و منداڵەكانی زەكەریيا:

هاوسەری زەكەریيا وەك خاوەن كتێبەكان دەڵێن، ناوی: (ألیصابات) بووە، ئەوە لە پەیمانی[1] كۆن دا هاتوە، ئەو ئافرەتەش خوشكی دایكی مەریەم بووە، پوور (خالة)ی مەریەم بووە، واتە: كچی (عمران) بووە، دایكی مەریەمیش ناوی (حَنّة) بووە و (ألیصابات) لەگەڵ (حَنّة) خوشك بوون و، هەردووكیشیان كچی (عمران) بوون.

بەڵام ڕایەكی دیكەش هەیە دەڵێ: خێزانی زەكەریيا، خوشكی مەریەم بووە، نەك خوشكی دایكی.

ئنجا ڕایەكیش هەیە دەڵێ: خێزانی زەكەریيا، ناوی: (إیشاع بنت عمران) بووە.

ڕایەكی دیكەش هەیە دەڵێ: (إیشاع بنت فاقوذ بن قبیل)ە، نەك (بنت عمران) لە پەیمانی كۆندا وا دەڵێ.

كەواتە: عیساو یەحیا، یان دایكیان خوشك بوون، یان دایكی یەحیا خوشكی دایكی مەریەم بووە، یانی: دایكی یەحیا و نەنكی عیسا (دایكی دایكی) خوشك بوون. تەنیا منداڵی زەكەریياش یەحیا بووە، ئەویش بەشێوەیەكی تایبەت خوای باڵادەست پێیداوە، ئەگەرنا زەكەریيا نە كچی هەبووە، نە كوڕی دیكەشی هەبوون، جگە لە یەحیا.

(إبن كثیر) لە (قصص الأنبیاء)دا[2] دەڵێ: (فإنَّ أمَّ یحیى أشیاع بنت عمران أخت مریم بنت عمران، وقیل: بل أشیاع وهي امرأة زكریا أمُّ یحیى هي أخت (حَنّة) امرأة عمران أم مریم، فیكون یحیى ابن خالة مریم).

---

(١) التفسیر التطبیقي للكتاب المقدس، العهد القدیم، سفر زكریا، ص١٨٧٣.

(٢) ص٤٧٩.

(إبن كثير)یش ئەوەی کە پێشتر هێنامان و تەفسیرەکان زۆریان ئاماژەیان پێداوە، دەڵێ: دایکی یەحیا (أشیاع)ی کچی عیمران، خوشکیی مەریەمی کچی عیمران بووە، کەواتە: دایکی یەحیاو دایکی عیسا خوشك بوون، هەردووکیان کچی عیمران بوون، ئەوە ڕایەك، هەندێکیشیان گوتوویانە: بەڵکو (أشیاع) یان (آلیصابات) کە دیارە خێزانی زەکەریایە و دایکی یەحیایە، خوشکی (حَنَّة)ی دایکی مەریەم بووە.

## ٤)- کەسایەتیی و کورتەی بەسەرهاتی زەکەریا:

زەکەریا پیشەی ژیانیی دارشیی بووە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ، هاتوە، کە فەرموویەتی: {كَانَ زَكَرِيَّا عَلَيْهِ السَّلَامُ نَجَّارًا} (أخرجه أحمد: ٧٩٣٤، ومسلم: ٢٣٧٩، وابن ماجه: ٢١٥٠، وأبو يعلى: ٦٤٢٦).

واتە: زەکەریا سەلامی لەسەر دارتاش بوو.

ئنجا وێڕای ئەو پیشەیەی کە هۆکاری ژیان و گوزەرانی بووە، خزمەتی پەرستگاشی کردوە، کە لە پەیمانی کۆندا دەڵێ: (هیکل) واتە: (مَعْبد) پەرستگا، هەر بۆیەش کاتێك دایکی مەریەم، کچەکەی دێنێ بۆ خزمەتی پەرستگا، پاش قورعەکێشان (تیرۆپشك) دەکەوێتە ژێر سەرپەرشتیی زەکەریا، وەك لە ئایەتەکانی: (٣٥ - ٤١) لە سوورەتی (آل عمران)دا خوا ﷻ باسی کردوە، کە دەفەرموێ:

﴿ إِذْ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ عِمْرَٰنَ رَبِّ إِنِّى نَذَرْتُ لَكَ مَا فِى بَطْنِى مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّىٓ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّى وَضَعْتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ ۖ وَإِنِّى سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وَإِنِّىٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٣٦﴾ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا ۖ كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا ۖ قَالَ يَٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا ۖ قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾ هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ ۖ قَالَ رَبِّ هَبْ لِى مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً ۖ إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٨﴾ فَنَادَتْهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٌ يُصَلِّى فِى ٱلْمِحْرَابِ أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ مُصَدِّقًۢا بِكَلِمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَسَيِّدًا وَحَصُورًا وَنَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٣٩﴾ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى غُلَٰمٌ وَقَدْ بَلَغَنِىَ ٱلْكِبَرُ وَٱمْرَأَتِى عَاقِرٌ ۖ قَالَ

﴿كَذَٰلِكَ ٱللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ﴿٤٠﴾ قَالَ رَبِّ ٱجْعَل لِّيٓ ءَايَةً قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا وَٱذْكُر رَّبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِٱلْعَشِيِّ وَٱلْإِبْكَٰرِ ﴿٤١﴾﴾ آل عمران.

کەواتە: زەکەریا ﷺ سەرپەرشتیی و چاودێریی مەریەمی کردوە و مەریەمیش خزمەتی پەرستگای کردوە.

زەکەریا دوای دیتنی کەرامەتەکەی مەریەم کە: (خواردنی ناوەخت) بووە: ﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا ﴿٣٧﴾﴾ آل عمران، هەر کاتێك زەکەریا لێی وە ژوور دەکەوت و دەچووە ژوور میحرابەکەی {ئەو شوێنەی (مەریەم) خوا پەرستیی تێدا دەکرد} بژێوی لەلا دەبینی، ﴿قَالَ يَٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾﴾ آل عمران، {گوتراوە: لە زستانان دا میوەی هاوینان و، لە هاوینان دا میوەی زستانانی لەلا دەبینی، یاخود خواردنی ئاوازەی لادەبینی و دەیزانی هی بەشەر نیە و بەشەر دروستیان نەکردوە} واتە: گوتی: ئەی مەریەم! ئەوەت لە کوێ بوو؟ ئەویش گوتی: خوا بژێوی هەر کەسێك دەدات کە بیەوێ.

ئنجا دوای ئەوەی زەکەریا ئەو کەرامەتە لە مەریەم دەبینێ، زەکەریاش ئەوەی بە دڵدا دێ و وەتەماع دەکەوێ، کە خوا منداڵێکی بداتێ، واتە: خوایەك کە دەتوانێ لە کاتی ناوەختدا بە شێوەیەکی تایبەت بژێو بۆ مەریەم برەخسێنێ، دەشتوانێ بەشێوەیەکی تایبەت منداڵێکیش بەو بدات، دوایی ئومێدەکەشی هاتۆتەدی.

کە ئەوە لە ئایەتەکانی: (٨٩ - ٩٠)دا لە سوورەتی: (الأنبياء)یشدا هاتوە، وێڕای ئایەتەکانی: (١ تاکو ١١)ی سوورەتی مەریەم.

## ٥)- چۆنیەتی کۆچی دوایی کردنی زەکەریا:

لە (وهب بن منبه)ەوە دوو ڕیوایەت هەن: کە ئایا زەکەریا ﷺ بە مردن مردوە، بە مردنی خۆی؟ یاخود بە کوژران کوژراوە؟ دوو ڕیوایەت هەن:

**یەکەم:** لە (وهب بن منبه)ەوە هاتوە کە زەکەریا لە چنگ خەڵکەکەی ڕادەکات و دەچێتە نێو درەختێکەوە و، خەڵکەکەش بە دوای دەکەون و، مشار دەخەنە سەر درەختەکە، کاتێك مشار دەگاتە سەر پەراسووەکانی کە لە نێو درەختەکەدایە، خوا ﷻ سر وشی بۆ دەکات: ئەگەر ناڵاندنەکەت بێ دەنگ نەبێ، زەوییان بەسەردا هەڵدەگێڕمەوە، ئیدی زەکەریا چیدیکە ناناڵێنێ، تاکو درەختەکە لەت دەکەن و، زەکەریاشی لەگەڵ دا لەت دەکەن[1].

---

(١) ئەمە لە (قصص الأنبياء)ی (إبن كثير)، لە لاپەڕە (٤٧٦)دا هاتوە.

دووەم: ڕایەکی دیکەش هەیە دەڵێ: زەکەریبیا هەر بە مردنی ئاسایی خۆی مردووە.

دوایـیش ئێمـە ئـەو بەسـەرهاتە دەگێڕینـەوە، کـە گوایـە هـەر کام لـە زەکەریـاو یەحیـای کـوڕی تێیـدا کـوژراون.

## دووەم: یەحـــیـــا (عليه السلام):

۱)- ناوو ڕەچەڵەکی، یەحیا.

۲)- ژمارەی ناوهێنرانی یەحیا لە قورئاندا.

۳)- حاڵەتی خێزانیی، یەحیا.

٤)- کەسایەتیی و کورتەی بەسەرهاتی، یەحیا.

٥)- چۆنیەتی کۆچی دوایی کردنی، یەحیا.

### ۱)- ناوو ڕەچەڵەکی یەحیا:

یەحیـا عليه السلام تاقـە کـوڕ و تاقـە منداڵـی زەکەریبایـە و، زەکەریـا - وەك پێشـتر بەسـەرهاتەکەیمان خستەڕوو - لـە کاتێکـدا بـۆ خـۆی کەوتۆتـە تەمـەنی پیرییـەوە و خێزانەکـەشی کـە نـاوی (أليصابات) یـان (أشياع) بـووە، نـەزۆك بـووە، لـە خـوای پـەروەردگار پاڕاوەتـەوە کـە کوڕێـکی پـێ ببەخشـێ لـە دوای خـۆی سەرپەرشـتیاریی بەرنامـەو ڕێبـازی خـوای بـەرز ومـەزن بـکات، کـە وەك میراتێـکی مەعنەویی بەجێـی دێڵـێ، خـوای بەخشـەریش پاڕانەوەکـەی گیراکـردوەو، یەحیـای پـێ بەخشیوە، وەك لـە سـوورەتی (الأنبياء)دا، دەفەرمـوێ:

﴿ وَزَكَرِيَّآ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ رَبِّ لَا تَذَرۡنِي فَرۡدٗا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ﴿٨٩﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ يَحۡيَىٰ وَأَصۡلَحۡنَا لَهُۥ زَوۡجَهُۥٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗاۖ وَكَانُواْ لَنَا خَٰشِعِينَ ﴿٩٠﴾ ﴾الأنبياء.

لـە: (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد الجديد، إنجيل متىٰ، الإصحاح: ٣، ص١٨٧١)دا، ئەمـە دەربـارەی یەحیـا هاتـوە، کـە لەوێـدا بـە (يوحنا) نـاوی هاتـوە، (يوحنا المعمدان)، بـەڵام بـە تەئکید مەبەست پێـی یەحیـای کـوڕی زەکەریبایـە، ڕەنگـە ئـەو نازنـاوەشی بووبێ، دەڵێ:

(في تِلْكَ الفَتْرَةِ مِنَ الزَّمَانِ ظَهَرَ يُوحنَّا المعمَدان في بَرِيَةِ اليَهودية، يُبَشِّرُ قَائِلاً: تُوبوا، فَقَد اقْتَرَبَ مَلَكُوتُ السَّمَوات، كَانَ يُوحَنَّا يَلْبَسُ ثَوْبَاً مِنْ وَبَرِ الجِمَال، وَيَشُدُّ وَسَطَهُ بِحِزَامٍ مِنْ جِلْدٍ، وَيَقْتَاتُ الجَرادَ وَالعَسَلَ البَرِّي ...).

واتە: {باسی پەیدابوون و سەرهەڵدان و لە دایك بوونی عیسا ﷺ دەكات} لەو ماوەیەشدا لە كات، یوحەننای مەعمەدان لە دەشتی یەهودییە، {دەبێ دەشتێك بەو ناوەوە ناونرابێ} پەیدابوو، مژدەی بە خەڵك دەدا دەیگوت: بگەڕێنەوە، {بگەڕێنەوە بۆ لای خوا} چونكە موڵكی فراوانی خوا نزیك بۆتەوە، {مەسیحییەكان ئەم زاراوەیە: (ملكوت السموات) بە هاتنی عیسا ﷺ دەزانن، دوایی لە درێژەی قسەكاندا دەڵێ:} یوحەننا پۆشاكی دروستكراو لە تووكی حوشترانی دەپۆشی و، نێوەڕاستی خۆشی (واتە: نێو قەدی خۆشی) بە پشتێنێك كە لە چەرم دروستكرابوو، پشتێنی دەبەست، خۆراكیشی بریتی بوو لە كوللەو هەنگوینی دەشت و بیابان.

## ٢- ژمارەی ناوهێنرانی یەحیا لە قورئاندا:

ناوی یەحیا ﷺ پێنج (٥) جاران لە قورئاندا هاتوە، بەو جۆرەی خوارەوە:

١)- لە سوورەتی (آل عمران)، لە ئایەتی (٣٩)دا، یەك (١) جار هاتوە.

٢)- لە سوورەتی (الأنعام)، لە ئایەتی (٨٥)دا، یەك (١) جار هاتوە.

٣)- لە سوورەتی (مریم)، لە ئایەتی (٧)دا، یەك (١) جار و، لە ئایەتی (١٢)ش دا، یەك (١) جار هاتوە.

٤)- لە سوورەتی (الأنبیاء)، لە ئایەتی نەوەت (٩٠)دا، یەك (١) جار هاتوە.

## ٣)- حاڵەتی خێزانیی: یەحیا:

ئەوەی كە لە قورئاندا دەردەكەوێ، هەروەها لە سەرچاوەكانی دیكەشدا هاتوە، یەحیای كوڕی زەكەریا، هاوسەرگیریی نەكردوە و، بە سەڵتیی و زوگورتیی ماوەتەوە، لەوەش دا وەك عیسای كوڕی مەریەم ﷺ بووە، بەڵام بێگومان هاوسەرگیریی نەكردنەكەی یەحیا، لە ڕووی نەبوونی ئارەزووی جینسییەوە نەبووە، وەك هەندێك لە خاوەن تەفسیرەكان گوتوویانە: بۆ نموونە (عبدالرحمن بن ناصر السعدي) لە تەفسیرەكەی خۆیدا (تیسیر الكریم المنان في تفسیر كلام الرحمان) لە لاپەڕە: (١٣٠)دا، دەڵێ: یەحیا ئارەزووی جینسیی نەبووە!!

بەڵام ئەوە ڕاست نیە، بەڵكو هاوسەرگیریی نەكردنی یەحیا، لە ڕووی خۆ مەرزەم كردنەوە بووە، نەك لە ڕووی نەبوونی توانای جینسییەوە و، ئەگەر توانای جینسیی نەبووبایە، هیچ نازایەتیی نەبووە و مەدح نەبووە بۆ یەحیا، كە خوا ﷻ بفەرمووێ: لە ڕووی جینسییەوە، پاك و خۆمەرزەمكەر بوو! چونكە كەسێك غەریزەی جینسیی لە جەستەی دا نەبێ، بە سروشت و بەبێ هەوڵدان و ماندوو بوون پاك دەبێ، وەك فریشتان.

با تەماشای ئایەتی ژمارە: (٣٩) بكەین لە سووڕەتی (آل عمران)، خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ فَنَادَتْهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٌ يُصَلِّى فِى ٱلْمِحْرَابِ أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ مُصَدِّقًۢا بِكَلِمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَسَيِّدًا وَحَصُورًا وَنَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٣٩﴾ ﴾آل عمران.

واتە: فریشتەكان بانگی (زەكەریيا)یان كرد، لە كاتێكدا كە لە میحڕابدا نوێژی دەكرد، كە بە دڵنیایی خوا مـوژدەی یەحیات پێدەدات، كە بە ڕاستدانەری وشەیەكە لە خواوە، {دروستكراوێكە بە وشەی ڕاستەوخۆی خوا دروست بووە، كە عیسایە ﵇، یانی: عیسا بە ڕاست دەزانێ}

(وَسَيِّدًا) پیاوێكی بەڕێز و حورمەت و خاوەن پایەیە، (وَحَصُورًا)[١] هەروەها بابایەكی خۆمەرزەمكەرە.

(وَنَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ )، هەروەها لە پێغەمبەرانی چاك و پەسند دەبێ[٢].

كەواتە: كە خوا مەدحی كردوە بەوەی كە خۆی كۆنتڕۆڵ (ضَبْط) و مەرزەم كردوە، یانی: توانای جینسیی هەبووە و خۆی مەرزەم كردوە، نەك توانای جنسیی نەبێ و، ئەگەر توانای جینسیی نەبووایە، ئەو كاتە لە سەر خۆ مەرزەمكردنی مەدح و ستایش نەدەكرا، وەك فریشتەكان، كە بەوە مەدح ناكرێن: تووشی هەڵەی جینسیی نابن، یان تووشی گوناهی دیكە نابن، چونكە خوا وای دروستكردوون، نەتوانن گوناهو هەڵە بكەن.

---

(١) (حصر) بە مانای قۆرخكردن و ئابڵووقەدانی شتێكە، (حصار) بە مانای ئابڵووقەدانە، دەگوترێ: (الحصار الإقتصادي) ئابڵووقەی ئابووریی، (حَصُور)یش كەسێكە كە خۆی مەرزەم دەكات و خۆی ئابڵووقە دەدات، لە ڕووی جینسییەوە، تووشی هەڵەو پەڵە نەبێ}.

(٢) بێگومان هەموو پێغەمبەران نەك هەر چاك، بەڵكو هەرەچاك و پەسند بوون، كەواتە: (من) لە (من الصالحين)دا وەك پسپۆڕانی زمان گوتوویانە: (من البيانية)یە نەك (من التبعيض)، یانی: بۆ ڕوونكردنەوەیە نەك بۆ بەشێك.

## ٤)- کەسایەتیی و کورتەی بەسەرهاتی یەحیا:

یەحیاش ﷺ، وەك هەر کام لە پێغەمبەران (علیە وعلیهم الصلاة والسلام) سەرگەرمی بانگەواز و فەرمان بە چاکەو، ڕێگریی لە خراپە بووە، لە نێو گەلی جوولەکەدا (بني إسرائیل)، واش دەفامرێتەوە، کە پێش تەمەنی سی (٣٠) سالّیی، کرابێتە پێغەمبەر و، هەر بە منداڵیی خوا حیکمەتی پێداوەو، بابایەکی لێزان و کارامەو کارزان بووە، وەك خوا لەو بارەوە دەفەرموێ: ﴿ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْحُكْمَ صَبِيًّا ﴿١٢﴾ ﴾، واتە: لە کاتێکدا کە مێرد منداڵ بوو، (نابالّغ بوو) ئێمە حیکمەتمان پێ بەخشیبوو.

ئەگەر تەماشای ئایەتەکانی قورئان بکەین، لە سوورەتی مەریەم دا بە هەشت (٨) سیفەت وەسفکراوە و، لە سوورەتی (آل عمران)دا، بە چوار (٤) سیفەت وەسفکراوە، یانی: خوا ﷻ یەحیای بە دوازدە (١٢) سیفەتان پێناسە کردوە:

## سیفەتەکانی یەحیای کوڕی زەکەریا علیهما السلام:

١)- یەکەمین سیفەتی ئەوەیە کە خوا ناوی ناوە: یەحیا، وەك فەرموویەتی: ﴿ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسْمُهُۥ يَحْيَىٰ لَمْ نَجْعَل لَّهُۥ مِن قَبْلُ سَمِيًّا ﴿٧﴾ ﴾ مریم، واتە: موژدەت دەدەینێ بە کوڕێك ناوی یەحیایە، پێشتر هاوناومان بۆ دانەناوە، ئەم ڕستەیە یەکێك لە دوو واتایەکانی ئەوەیە، کە خوا هاوناوی یەحیای دانەناوە و کەس نەبووە، ناوی یەحیا بێ، لە پێش یەحیادا، واتایەکی دیکەشی ئەوەیە کە هیچ کەس هاوتای نەبووە لەو ڕووەوە، کە خاوەنی کۆمەڵێك تایبەتمەندیی بووە، تایبەت بوون بە خۆیەوە.

٢)- ﴿ وَحَنَانًا مِّن لَّدُنَّا ﴾، لەلایەن ئێمەوە زۆر بە بەزەیی و بە پەرۆش بوو، دڵ سووتاو بوو، ئەم مانایەش بەهێزترە لەوە کە بڵێین: مەبەست ئەوەیە کە لەلایەن خۆمانەوە بەزەیی و پەرۆشمان لەگەڵ بەکارهێناوە، چونکە (حَنّان)یش یەکێکە لە ناوەکانی خوا، وەك لە سوننەتدا هاتوە: (یا حنّان یا منّان)[١]، بەڵام ئەو مانایە بەهێزترە - وەك پێشتریش گوتمان - کە (حنان) سیفەتی یەحیا بێ، واتە: حەنانمان پێدابوو، سۆزو بەزەیی و پەرۆشمان پێدابوو، لەلایەن خۆمانەوە.

٣)- ﴿ وَزَكَوٰةً ﴾، هەروەها: چاکیی و پاکییمان پێدابوو، (زَكَى، يَزكُوا، زَكَاة) واتە: پاك بوو، پاك دەبێ، یان چاك بوو، چاك دەبێ، یان گەشەی کرد، گەشە دەکات.

---

(١) أخرجه أحمد : ١٣٤٢٥، والبیهقي في شعب الإيمان: ٣٤٧، وأخرجه أيضًا : أبو يعلى: ٤٢١٠.، وغيرهم.

٤)- ﴿ وَكَانَ تَقِيًّا ﴾، پارێزكاریش بوو، (تقي) (فعيل)ی بە مانای (مُفْعِل)ە، بەڵام ماناكەی بەهێزترە لە (مُتَّقِي) یانی: بەرجەستەكەری (تقوى) بوو، یان تەقوای تێیدا بەرجەستە بوو بوو.

٥)- ﴿ وَبَرًّا بِوَٰلِدَيْهِ ﴾، هەروەها لەگەڵ باب و دایكی زۆر چاكەكاربوو، (بَرّ)یش مانایەكەی بەهێزترە لە (بارّ)، (بار) واتە: چاكەكار، بەڵام (بَرّاً) لەسەر كێشی چاوگ (مصدر)ە و یانی: خودی چاكەكاریی بوو.

٦و ٧)- ﴿ وَلَمْ يَكُن جَبَّارًا عَصِيًّا ﴾، هەروەها خۆسەپێن و ملهوڕو، یاخیی و سەرپێچییكاریش نەبوو.

٨)- ﴿ وَسَلَٰمٌ عَلَيْهِ يَوْمَ وُلِدَ وَيَوْمَ يَمُوتُ وَيَوْمَ يُبْعَثُ حَيًّا ﴾، سەلامیشی لێبێ، ئاشتیی و سەلامەتیی لەسەر بێ، لە ڕۆژێكدا كە تێیدا هاتۆتە دنیاوە و، لە ڕۆژێك كە دەمرێ و، لە ڕۆژێكدا كە بە زیندوویی تێیدا هەڵدەسێنرێتەوە.

٩)- ﴿ مُصَدِّقًا بِكَلِمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ ﴿٣٩﴾ ﴾آل عمران، بەڕاستدانەری وشەیەكە لە خواوە، [مەبەست لە وشە (كلمة) عیسایە ﷺ] لەبەر ئەوەی (عیسا) لە ئەنجامی پێك گەیشتنی نێر و مێیەك، دایك و باپێك دا دروست نەبووە، بەڵكو بە ڕاستەوخۆ لەلایەن خواوە دروست بووە و، ڕووحەكەی بە بەر مەریەمدا كراوە، وەك دوایی باسی دەكەین، ئنجا یەحیا بە ڕاستدانەری عیسا بووە (عَلَيْهِما الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم).

١٠)- ﴿ وَسَيِّدًا ﴿٣٩﴾ ﴾آل عمران، هەروەها پیاوێكی بەڕێزیش بوو، (سيد) واتە: سەرۆك، بەڕێز، بە حورمەت، خاوەن پێگە، سەروەر، گەورە.

١١)- ﴿ وَحَصُورًا ﴿٣٩﴾ ﴾آل عمران، خۆ مەرزەمكەربوو، واتە: خۆ كپ كەرەوە بووە، ئارەزووی جینسیی خۆی كپ كردۆتەوە لە بەرانبەر حەڕام دا و، تووشی هەڵەو پەڵە نەبووە.

١٢)- ﴿ وَنَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٣٩﴾ ﴾آل عمران، هەروەها پێغەمبەرێك بووە لە پێغەمبەرانی چاكەكار.

ئێستاش با ئەم فەرموودەیە ببینین، كە ناوەڕۆكیی پەیام و بانگەوازەكەی یەحیا ﷺ زۆر جوان ڕوون دەكاتەوە:

(عَنِ الحَارِثِ الأَشْعَرِيِّ ﷺ أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى أَمَرَ يَحْيَى بْنَ زَكَرِيَّا بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ أَنْ يَعْمَلَ بِهِنَّ، وَأَنْ يَأْمُرَ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنْ يَعْمَلُوا بِهِنَّ، فَكَادَ أَنْ يُبْطِئَ، فَقَالَ لَهُ عِيسَى: إِنَّكَ قَدْ أُمِرْتَ بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ أَنْ تَعْمَلَ بِهِنَّ، وَأَنْ تَأْمُرَ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنْ يَعْمَلُوا بِهِنَّ، فَإِمَّا أَنْ تُبَلِّغَهُمْ،

وَإِمَّا أَنْ أُبَلِّغَهُمْ، فَقَالَ لَهُ: يَا أَخِي إِنِّي أَخْشَى إِنْ سَبَقْتَنِي أَنْ أُعَذَّبَ، أَوْ يُخْسَفَ بِي، فَجَمَعَ بَنِي إِسْرَائِيلَ فِي بَيْتِ الْمَقْدِسِ حَتَّى امْتَلأَ الْمَسْجِدُ، وَقَعَدُوا عَلَى الشُّرَفِ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِي بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ أَنْ أَعْمَلَ بِهِنَّ، وَآمُرُكُمْ أَنْ تَعْمَلُوا بِهِنَّ: أَوَّلُهُنَّ: أَنْ تَعْبُدُوا اللَّهَ، وَلا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، فَإِنَّ مَثَلَ ذَلِكَ، كَمَثَلِ رَجُلٍ اشْتَرَى عَبْدًا مِنْ خَالِصِ مَالِهِ بِوَرِقٍ أَوْ ذَهَبٍ، فَقَالَ: هَذِهِ دَارِي، وَهَذَا عَمَلِي، فَاعْمَلْ وَأَدِّ إِلَيَّ عَمَلِي، فَجَعَلَ يَعْمَلُ وَيُؤَدِّي عَمَلَهُ إِلَى غَيْرِ سَيِّدِهِ، فَأَيُّكُمْ يَسُرُّهُ أَنْ يَكُونَ عَبْدُهُ كَذَلِكَ؟ وَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ خَلَقَكُمْ وَرَزَقَكُمْ، فَاعْبُدُوهُ وَلا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا.

ثانياً: وَآمُرُكُمْ بِالصَّلاةِ، فَإِنَّ اللَّهَ يَنْصِبُ وَجْهَهُ لِعَبْدِهِ مَا لَمْ يَلْتَفِتْ، فَإِذَا صَلَّيْتُمْ، فَلا تَلْتَفِتُوا.

ثالثاً: وَآمُرُكُمْ بِالصِّيَامِ، فَإِنَّ مَثَلَ الصِّيَامِ كَمَثَلِ رَجُلٍ مَعَهُ صُرَّةٌ مِنْ مِسْكٍ فِي عِصَابَةٍ كُلُّهُمْ يُحِبُّ أَنْ يَجِدَ رِيحَ الْمِسْكِ، وَإِنَّ خُلُوفَ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ.

رابعاً: وَآمُرُكُم بِالصَّدَقَةِ، فَإِنَّ مَثَلَ ذَلِكَ مَثَلُ رَجُلٍ أَسَرَهُ الْعَدُوُّ، فَشَدُّوا يَدَيْهِ إِلَى عُنُقِهِ، فَقَدَّمُوهُ لِيَضْرِبُوا عُنُقَهُ، فَقَالَ: هَلْ لَكُمْ إِلَى أَنْ أَفْتَدِيَ نَفْسِي، فَجَعَلَ يَفْتَدِي نَفْسَهُ مِنْهُمْ بِالْقَلِيلِ وَالْكَثِيرِ حَتَّى فَكَّ نَفْسَهُ.

خامساً: وَآمُرُكُمْ بِذِكْرِ اللَّهِ كَثِيراً، فَإِنَّ مَثَلَ ذَلِكَ كَمَثَلِ رَجُلٍ طَلَبَهُ الْعَدُوُّ سِرَاعًا فِي رَجَاءٍ، فَأَتَى حِصْناً حَصِيناً فَتَحَصَّنَ فِيهِ، وَإِنَّ الْعَبْدَ أَحْصَنُ مَا يَكُونُ مِنَ الشَّيْطَانِ، إِذَا كَانَ فِي ذِكْرِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، قَالَ: وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: وَأَنَا آمُرُكُمْ بِخَمْسٍ، اللَّهُ أَمَرَنِي بِهِنَّ: بِالْجَمَاعَةِ، وَالسَّمْعِ، وَالطَّاعَةِ، وَالْهِجْرَةِ، وَالْجِهَادِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَإِنَّهُ مَنْ خَرَجَ مِنَ الْجَمَاعَةِ قِيدَ شِبْرٍ، فَقَدْ خَلَعَ رِبْقَةَ الإِسْلامِ مِنْ عُنُقِهِ، إِلا أَنْ يُرَاجِعَ، وَمَنْ دَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ، فَهُوَ مِنْ جُثَى جَهَنَّمَ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ! وَإِنْ صَامَ وَصَلَّى؟ قَالَ: وَإِنْ صَامَ وَصَلَّى وَزَعَمَ أَنَّهُ مُسْلِمٌ، فَادْعُوا الْمُسْلِمِينَ بِمَا سَمَّاهُمُ اللَّهُ عَزَّوَجَلَّ: الْمُسْلِمُونَ الْمُؤْمِنُونَ عِبَادُ اللَّهِ} (أخرجه أحمد: ١٧٢٠٩، وابن حبان: ٦٢٣٣، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح، والترمذي: ٢٨٦٣، وقال الشيخ الألباني: صحيح، والطيالسي: ١١٦١، والطبراني في الكبير: ٣٤٣٠، وأبي يعلى: ١٥٧١، قال حسين سليم أسد: إسناده صحيح)

واتە: حاریثی ئەشعەریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان خوای بەرز فەرمانی بە یەحیای کوڕی زەکەریا کرد بە پێنج وشان، کەکاریان پێ بکات و بە بەنی ئیسرائیلیش بڵێ کاریان پێ بکەن، ئنجا یەحیا خەریک بوو سستیی بنوێنێ لە گەیاندنی ئەو پێنج وشەیە (ئەو پێنج فەرمانە)دا، بۆیە عیسا [کە کوڕە پووری بوو] پێی گوت: تۆ فەرمانت پێکراوە بە پێنج وشان کە کاریان پێ بکەی و بە بەنی ئیسرائیلیش

بڵێی کاریان پێ بکەن، ئنجا یان دەبێ بیانگەیەنی، یان من دەیانگەیەنم، ئەویش گوتی: برایەکەم! من دەترسێم ئەگەر تۆ پێش من بیانگەیەنی، سزا بدرێم یاخود بەزەویدا ڕۆببرێمە خوارێ.

ئنجا یەحیای کوڕی زەکەریا بەنی ئیسرائیلی لە (بیت المقدس)دا کۆکردۆتەوە تاکو مزگەوتیان لێ پڕ بوو، هەتا لەسەر دیوارەکانیش دانیشتین، ئەویش ستایش و مەدحی خوای کردو، دوایی گوتی: خوا فەرمانی پێکردووم بە پێنج وشان، کە کاریان پێ بکەم و فەرمان بە ئێوەش بکەم کاریان پێبکەن:

١)- کە بەندایەتیی بۆ خوا بکەن و، هیچ شتێکی نەکەنە هاوبەش، وێنەی ئەوەش وەك وێنەی پیاوێك وایە، کە کۆیلەیەکی بە ماڵی ساغی خۆی کڕیبێ، زیو بووە یان زێڕ، ئنجا ئەو کۆیلەیە کە ئەو پیاوە بە ماڵی خوڵاسەی خۆی کڕیویەتی، دەستی کرد بە کارکردن، بەڵام بەرهەمی کارەکەی بۆ کەسێکی دیکە، جگە لە خاوەنەکەی خۆی، دەبرد، ئنجا کامتان ئامادەیە کە کۆیلەکەی بەو شێوەیە بێ، خواش ئێوەی وەدی هێناوەو بژێوی داون، بۆیە بەندایەتیی بۆ بکەن و، هیچ شتێك مەکەنە هاوبەشی.

٢)- هەروەها فەرمانی پێکردوون بە نوێژ، چونکە خوا ڕووی خۆی بۆ ڕووی بەندەکەی ڕادەگرێ، مادام بەو لاو لادا ئاوڕنەداتەوەو، ڕووی خۆی وەرنەگێڕێ لە ڕووگە، ئێوەش هەر کات نوێژتان کرد ڕوو وەمەچەرخێنن بەلای ڕاست و چەپدا، ڕێك ڕووتان ڕاست بکەن بەرەو ڕووگە، خوا ڕووتان تێدەکات {گرنگییتان پێ دەدات و بایەختان پێ دەدات، بە تەئکید مەبەست پێی ئەوەیە، یاخود ڕووتێکردنی خوا، یەکێکە لە سیفەتەکانی خوا، بەو شێوەیە کە بۆ خوا شایستەیە}.

٣)- هەروەها فەرمانی پێکردوون بە ڕۆژوو گرتن، وێنەی ئەوەش وەك پیاوێکە، کە پڕێسکەیەکی هیسکی پێ بێ لە نێو کۆمەڵە خەڵکێکدا بێ، هەرکامێك لەو کۆمەڵە خەڵکە بۆنی ئەو میسکە بکات، بۆنی گۆڕاوی زاری ڕۆژووەوانیش لەلای خوا، لە بۆنی میسك خۆشترە.

٤)- دیسان فەرمانی پێکردوون بە بەخشین، (ماڵ بەخشین)، وێنەی ئەوەش وەك پیاوێك وایە، کە دوژمن بەدیلی گرتبێ و دەستیان لەگەڵ ملی کۆتکردبێ، {دەستیان بەستبێ لەگەڵ ملی، کە ناخۆشترین حاڵەتی کۆت و بەندکردنە} و هێناویانەتە پێش، بۆ ئەوەی لە گەردنی بدەن، ئەویش پێیان بڵێ: ئایا ئامادەن خۆمتان لێ بکڕمەوە؟ ئیدی هەرچی ماڵ و سامانی هەیە، کەم و زۆر هەمووی دەکاتە بەلا گێڕەوەی خۆی و هەموو ماڵەکەیان پێ دەدات، تاکو خۆی لە دەستیان دەرباز دەکات، {واتە: ئێوەش بە هۆی ماڵ بەخشینەوە، خۆتان دەرباز دەکەن لە سزای خوا}.

٥)- هەروەها فەرمانی پێکردوون کە زۆر یادی خوا بکەن، وێنەی ئەوەش وەك پیاوێکە کە دوژمن بەخێرایی بەدوایدا بڕواو بەتەمابێ بیشیگرێ، {نزیك بێ بیگرێ} ئەویش بچێتە نێو قەڵایەکی مەحکەمەوە و، لەوێدا خۆی دەرگاکە لەسەر خۆی گاڵە بدات و خۆی تاقەت دەکات، ئنجا بەندەش، پارێزراوترین حاڵەتی لە شەیتان، ئەوەیە کە لە کاتی یادی خوا کردندا بێ.

(گێڕەرەوەی فەرموودە) گوتی: پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: منیش فەرمانتان بە پێنج (٥) شتان پێدەکەم، کە خوا فەرمانی پێکردووم:

١)- کۆمەڵ بوون، (واتە: کۆ بن، پێکەوە بن، پرژ و بڵاو مەبن).

٢)- گوێ گرتن (بۆ فەرمانی خوا، بۆ پەیامی خوا، بۆ کەسانێك کە پەیامی خواتان پێ ڕادەگەیەنن).

٣)- فەرمانبەریی کردن، (دوای ئەوەی وەرتانگرت و لێی تێگەیشتن، ئنجا جێبەجێی بکەن).

٤)- کۆچ کردن، (واتە: لە شوێنێك کە ناتوانن دینداریی بکەن، بگوازنەوە و کۆچ بکەن بۆ شوێنێك کە دەتوانن لەوێدا دینداریی بکەن و بەندایەتیی بۆ خوا ئەنجام بدەن).

٥)- تێکۆشان لە ڕێی خوادا، (واتە: بە نەفس و ماڵ و بە زمان و بە هەموو شێوەکان لە پێناوی خوادا تێبکۆشن).

چونکە هەر کەسێك هێندەی بستێك لە کۆمەڵ دەربچێ {لە کۆمەڵی مسوڵمانان} ئەوە ڕێسمانی ئیسلامی لە ملی خۆی داڕنیوە، مەگەر بگەڕێتەوە بۆ نێو کۆمەڵی مسوڵمانان[1]، هەروەها هەر کەسێك بانگەشەی نەفامیی بکات، لەو کەسانەیە کە لەسەر ئەژنۆیان دەکەونە دۆزەخەوە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ {ئەو کەسەی کە بانگەشەی نەفامیی دەکات} ئەگەر نوێژیش بکات و ڕۆژووش بگرێ، بە هۆی بانگەشەی نەفامییەوە هەر دەبێتە دۆزەخیی؟ فەرمووی: بەڵێ ئەگەر نوێژیش بکات و ڕۆژووش بگرێ و پێشی وابێ کە مسوڵمانە[2]، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: مسوڵمانان بە ناوەکانی

---

(١) کە بە تەئکید لێرەدا مەبەست لە (کۆمەڵی مسوڵمانان) ئەوەیە کاتێك مسوڵمانان قەوارەیەکی سیاسییان هەبێ، مسوڵمانێك لەوان جیابێتەوەو، بە دوژمنەوە پەیوەست بێ، لەو حاڵەتەدا مانای وایە لە ڕیزی ئیسلام و مسوڵمانان چۆتە دەرێ.

دەبێ ئاوا تەفسیر بکرێ، نەك هەر کەسێك لە کۆمەڵێ لە کۆمەڵەکانی مسوڵمانان جیابێتەوە، لە ئیسلام بچێتە دەرێ، مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوە نیە، یاخود مەبەست ئەوەیە کە هەر کەسێك لە ئیسلام بچێتە دەرێ، وەك ئیمان و عەقیدە، ئەوە دیارە ڕێسمانی ئیسلامی لە گەردنی خۆی داڕنیوە مەگەر بگەڕێتەوە بۆ نێو ئیسلام پەشێمان بێتەوە.

(٢) بە تەئکید لێرەدا مەبەست (من دعا بدعوى الجاهلية) ئەوە نیە کەسێك سیفەتێکی سەردەمی

خۆیان وەك خوای زاڵی پایە بەرز ناوی لێناون، بەو ناوە بانگیان بکەن: مسوڵمانان، بڕواداران، بەندەکانی خوا.

واتە: ناو وناتۆرەی دیکە لە نێو خۆتاندا بەکارمەهێنن، بۆ لێك دابڕان، ئەوە سەلەفییەو، ئەوە خەلەفییەو، ئەوە فلانەو ئەوە فیسارە، بەڵێ دەگونجێ کۆمەڵە مسوڵمانێك ناوێك لە خۆیان بنێن، بەلام بڵێن: ئەوە وەك ناوونیشانێکی سیاسییە، یان بۆ کارێکی دیاریکراو، ڕێکخراوی فلان، ڕێکخراوی فلان، یان تەریقەتی فلان، یان مەزهەبی فلان، یان فلان کۆمەڵە مسوڵمان، ئەوە دەگونجێ، بەلام وەك دابەشکردنی مسوڵمانان کە هەر کەسێك هاتە ژێر ئەو ناوونیشانە، بۆ وێنە: سەلەفیی، ئەشعەریی، خەلەفیی، فلان ڕێبازە، فلان حیزبە، وەك دابەشکردنی مسوڵمانان، ئا ئەوە بە تەئکید ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ نەهی لێکردوە.

ئەو بابەتەش بە تەفصیل قسەم لێکردوە، لەو مەوسووعەیەی خۆم دا بە ناوی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیعدا) لە (کتێبی دووەم) تەوەری دووەمدا، کە باسی بنەماو تایبەتمەندییەکانی زۆربەی مسوڵمانانم کردوە، کە لە ڕووی مێژووییەوە بە (أهل السنة)، یان (أهل السنة والجماعة) ناسراون.

## ٥)- چۆنیەتی کۆچی دوایی کردنی یەحیا ؑ:

لەوبارەوە ئەم دەقە لە (ابن کثیر)ەوە دێنین، لە کتێبەکەی (قصص الأنبیاء)دا[1] دەڵێ:

**أ/ (بَيَانُ سَبَبِ قَتْلِ يَحْيَى ؑ):**

**وَذَكَرُوا فِي قَتْلِهِ أَسْبَابًا، مِنْ أَشْهَرِهَا أَنَّ بَعْضَ مُلُوكِ ذَلِكَ الزَّمَانِ بِدِمَشْقَ كَانَ يُرِيدُ أَنْ يَتَزَوَّجَ بِبَعْضِ مَحَارِمِهِ، أَوْ مَنْ لَا يَحِلُّ لَهُ تَزْوِيجُهَا، فَنَهَاهُ يَحْيَى ؑ عَنْ ذَلِكَ، فَبَقِيَ فِي نَفْسِهَا مِنْهُ.**

---

نەفامیی تێدابێ ئەگەرنا پێغەمبەر ﷺ بە (أبو ذر)ی فەرموو: (یا أبا ذر إنك امرؤ فيك جاهلية) واتە: ئەی ئەبو زەر! تۆ کەسێکی نەفامییت تێدایە، واتە: لەو هەڵوێستەدا نەفامیی تێدایە، کە خۆی بەسەر کەسێکدا هەڵکێشا، چونکە ڕەش پێست بوو، خۆشی سپی پێست بوو، بە هۆی پێست و ڕەنگییەوە خۆی بەسەر ئەوەی دیکەدا هەڵکێشا، کە ئەوە یەکێك بووە لە نەرێت و عادەتەکانی نەفامیی.

بەلام پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستی پێی شتێکی جوزئیی نیە، بەڵکو مەبەستی بانگەشەی نەفامییە، بەگشتی، ئەوەکە ئالایەکی کە غەیری دینی ئیسلام بەرز بکاتەوە، یاخود بەرنامە و پەیامێکی دیکەی غەیری ئیسلام هەڵبگرێ، ئەوە بە تەئکید ئەو کەسە دۆزەخییە و نوێژو ڕۆژووەکانیشی شەفاعەتی بۆ ناکەن، مادام چووبێتە ژێر بەیداغێك، جیا لە بەیداغی ئیسلام و مادام چووبێتە ژێر ناوونیشانێك، جیا لە ناوونیشانی ئیسلام و مسوڵمانێتیی.

(١) ص ٤٧٨.

فَلَمَّا كَانَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ الْمَلِكِ مَا يُحِبُّ مِنْهَا، اسْتَوْهَبَتْ مِنْهُ دَمَ يَحْيَى، فَوَهَبَهُ لَهَا، فَبَعَثَتْ إِلَيْهِ مَنْ قَتَلَهُ، وَجَاءَ بِرَأْسِهِ وَدَمِهِ فِي طَسْتٍ إِلَى عِنْدِهَا، فَيُقَالُ إِنَّهَا هَلَكَتْ مِنْ فَوْرِهَا وَسَاعَتِهَا.

وَقِيلَ بَلْ أَحَبَّتْهُ امْرَأَةُ ذَلِكَ الْمَلِكِ وَرَاسَلَتْهُ، فَأَبَى عَلَيْهَا، فَلَمَّا يَئِسَتْ مِنْهُ، تَحَيَّلَتْ فِي أَنِ اسْتَوْهَبَتْهُ مِنَ الْمَلِكِ، فَتَمَنَّعَ عَلَيْهَا الْمَلِكُ ثُمَّ أَجَابَهَا إِلَى ذَلِك، فَبَعَثَ مَنْ قَتَلَهُ وَأَحْضَرَ إِلَيْهَا رَأْسَهُ وَدَمَهُ فِي طَسْتٍ).

واتـە: ڕوونکردنـەوەی هـۆی کـوژرانی یەحیا ﷺ: لەوبـارەوە چەنـد هۆکارێکیـان بـاس کـردووە، ناودارترینیـان ئەوەیـە: کـە هەنـدێ لـە حوکمڕانـانی ئـەو ڕۆژگارە لـە دیمەشـق دەیویسـت هاوسـەرگیریی لەگـەڵ هەندێـك لـە مەحرەمـەکانی خۆیـدا بـکات، یـان کەسـێك کە پێـی ناشـێ، یەحیاش پێشـگیریی کـرد لـەو حوکمڕانـە کـە ئـەوکارە بـکات، ئـەو ئافرەتـەش ئـەوەی لـە دڵـدا مایـەوە بەرانبـەر بـە یەحیـا، پێـی ناخـۆش بـوو، ئنجـا کاتێـك کـە لـە نێـوان ئـەو ئافرەتـەو پادشـادا ئـەوە ڕوویـدا کـە پادشـا حـەزی لێیـەتی، {واپێدەچـێ زینـای لەگـەڵ کردبێ} داوای لێکـرد کـە خوێنـی یەحیـای پـێ ببەخشـێ، ئەویـش پێـی بەخشی، ئـەو ئافرەتەش کەسـێکی نـارد: یەحیـای کوشـت و سـەرەکەشی بـە خوێنـەوە لـە تەشـتێکدا بـۆ هێنـا و، دەگوترێ: کـە ئـەو ئافرەتـە هـەر لـەو کاتـەدا دەسـت بەجـێ لـە بەیـن چـووە.

گێڕانەوەیـەکی دیکـە دەڵـێ: ئـەو ئافرەتـە کـە هاوسـەری ئـەو پادشـا حوکمڕانـە بـووە و یەحیـای خۆشویسـتوە و نامـەی بـۆ نـاردوە {بـۆ یەحیـا} کـە دۆسـتایەتیی لەگـەڵ بکـرێ، {خراپـەی لەگـەڵ بـکات} بـەڵام یەحیـا ئامـادە نەبـووە، ئنجـا کاتێـك لێـی نائومێـد بـووە، ئـەو ئافرەتـە بـە حیلـەو فێـڵ کارێـکی وای کـردوە، کـە داوای سـەری یەحیـای کـردوە لـەو پادشـایە، ئەویـش سـەرەتا ئامـادە نەبـووە، بـەڵام دوایـی وەڵامـی داوەتـەوە، ئیـدی ئـەو پادشـایە کەسـێکی نـاردوە، کـە یەحیـای کوشـتوەو سەرەکەشـی و خوێنەکەیشـی لـە تەشـتێکدا هێنـاوە.

ئنجا لە سەرچاوە مێژووییەکاندا، بۆ وێنە: (قصص الأنبياء)ی (عبدالوهاب النجار)[1] دا دەڵێ:

ئـەو پادشـایە نـاوی (هیـرۆدۆس) بـووە، کـە لـە پەیـمانی کـۆن و نـوێ دا، بـاسی (هیـرۆدۆس) کـراوە و، یەکێـك بـووە لـە حوکمڕانـەکانی ڕۆم لـەو کاتـەدا و، ئـەو ئافرەتـە کـە بەتەمـا بـووە بیهێنـێ، بـرازای بـووە، {کچـی بـرای بووە و نـاوی (هیرۆدیا) بـووە}، ئافرەتێکی زۆر جـوان بووە، ئنجـا دەڵـێ: جوولەکـەکان ڕاجیاییـان هەیـە لـەوەدا: کـە ئایـا دروسـتە هاوسـەرگیریی لەگـەڵ کچـی بـرا و کچـی خوشـك (واتـە: بـرازاو خوشـکەزا)دا بکـرێ یـان نـا؟ هەرچـی (ربّانیـون)ن بـە ڕەوای دەزانـن، - کـە جۆرێکـن لـە زانایـانی جوولەکـە - بـەڵام (القُرّاءون) - ئەوانیـش جۆرێـکی

---

(١) ص ٣٦٩.

دیکەیانن - بە قەدەغەی دەزانن، (ربانیون) دەڵێن: لە تەوراتدا باسی حەرامیی برازاو خوشکەزا نەکراوە، کە دروست نەبێ مرۆڤ هاوسەرگیریان لەگەڵ بکات، ئنجا مادام لە تەوراتدا باس نەکراوە، ڕەوایە، بەڵام زاناکانی دیکەی جوولەکە، بە قەدەغەی دەزانن.

پێشتر بەڵێنماندا کە باسی چۆنیەتی کوژرانی زەکەرییاش ﷺ بکەین، کە پەیوەستە بە کوژرانی یەحیای کوڕیەوە (عَلَيْهِمَا السَّلَامُ) لەوبارەوە لە کتێبی (سيرة النبيين والمرسلين)ی (محمد عيد عبدالله اليعقوبي الحسيني)دا، ئەم دەقە هاتوە[1]:

**(عندما علم زكريا بمقتل ولده يحيى، فرَّ من بني إسرائيل و دخل في بساتينهم خارج المدينة، فأمر الملك أن يؤتى به ليقتل أو يذبح كما ذبح ولده، فتبعه بنوا إسرائيل ليقتلوه، وهو يفرُّ من بستان إلى بستان حتى وصل إلى شجرة زيتونٍ، قد فتحت بطنها وقالت: اختف داخلي يا نبي الله! فدخلها فجاء إبليس وأخذ بِطَرفِ ثوبه، فعندما أطبقت الشُّجرة بقي طرفُ الثُّوب خارجها ثم جاء بنوا إسرائيل، فطلب منهم إبليس بصفات رجل أن يأتوا زكريا وهو في الشَّجَرة فوضعوا المنشار على الشجرة فشقوها وزكريا فيها....)**

واتە: لە کاتێکدا زەکەرییا دەزانێ کە یەحیای کوڕی کوژراوە، لە بەنی ئیسرائیل ڕادەکات، دەچێتە نێو باغ و بێستانەکانیان لە دەرەوەی شار، پادشاش فەرمان دەکات کە ئەویش بهێنرێ و بۆی بکوژرێ و سەرببڕدرێ، وەك چۆن کوڕەکەی سەر بڕاوە، بەنی ئیسرائیلیش شوێنی دەکەون بۆ ئەوەی بیکوژن، ئەویش لە باغێکەوە بۆ باغێکی دیکە ڕادەکات، هەتا دەگاتە لای درەختێکی زەیتوون کە ئەو درەختە زەیتوونە خۆی کردۆتەوە (واتە: شەق بووە، دەبێ قەدەکەی گەورە بووبێ) درەختەکە بانگی دەکات دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! وەرە نێو من، دەچێتە نێوی و دوایی وێك دەکەوێتەوە، ئیبلیسیش دێ دامێنی کراسەکەی دەگرێ، کاتێك کە درەختەکە وێك دەکەوێتەوە، هەندێ لە دامێنی کراسەکەی بەشێکی بە دەرەوە دەمێنێ، ئنجا بەنی ئیسرائیل دێن، ئیبلیسیش لە شێوەی پیاوێکدا پێیان دەڵێ: ها ئەوە زەکەرییا لە نێو ئەو درەختەدایە، ئەوانیش دێنن مشار لەسەر درەختەکە دادەنێن و درەختەکە دەبڕن، زەکەرییاشی تێدا دەبێ و ئەویش دەبڕن.

ڕیوایەتی دیکەش هەیە کە هەر بە مردنی ئاسایی خۆی کۆچی دوایی کردوە و، هیچیشیان پشت ئەستوورنین بە بەڵگەیەکی یەکلاییکەرەوەو دڵنیایکەر.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

(١) ج٢ ص ٣٠٦.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان بیست و پێنج (٢٥) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (١٦ - ٤٠) کە تێیاندا بەسەرهاتی مەریەم و عیسای کوڕی سەلامی خوایان لەسەر بێ، خراوەتەڕوو.

پوختەی بەسەرهاتی مەریەم و عیساش ئاوایە:

لە کاتێکدا مەریەم لەلای ڕۆژهەڵاتی خەڵکەکەی پەردە دەگرێتەوە (بۆ خۆ شۆردن، یان بۆ هەر کارێکی دیکەی تایبەتی خۆی)، جیبریل لە شێوەی پیاوێکی تێر و تەواودا، وەك نوێنەری خوا، خۆی پێشان دەدا و، پێی ڕادەگەیەنێ کە خوا ﷻ ناردوویەتی تاکو کوڕێکی پاك و چاکی پێ ببەخشێ، مەریەمیش پەنای لێ بە خوا دەگرێ و سەرسوڕمان دەردەبڕێ، کە چۆن منداڵی پەیدا دەبێ، لە حاڵێکدا کە هیچ پیاوێك بە حەڵاڵیی دەستی نەگەیاندۆتێ و، ئافرەتێکی خراپەکاریش نەبووە؟!

جیبریلیش دڵنیای دەکاتەوە کە ئەوە فەرمانی خوایە و، وەك نیشانەیەکی خوا بۆ خەڵك و بەزەیی خوایە، بەرانبەر بە تۆش و بەرانبەر بە عیساش ﷺ.

ئیدی سەرەنجام مەریەم دووگیان دەبێ و، پاش لە دایك بوونی عیساش ﷺ کە کۆرپەکەیەتی، دەیباتەوە لای خەڵکەکەی و ئەوانیش سەرزەنشتی دەکەن: ئایا ئەو منداڵەت لە کوێ بوو، بەبێ هاوسەر؟!

ئەویش ئاماژە دەکات بۆ مەلۆتکەکەی خۆی، کە عیسایە ﷺ عیسای کوڕیشی دێتە قسەو بەرگریی لە پاکیی دایکی دەکات و، ڕاشیدەگەیەنێ کە ئەو بەندەی خواو پێغەمبەری خوایەو، خوا کتێبی پێ دەدات و، فەرمانی پێدەکات بە نوێژو زەکات و بە چاکە لەگەڵ دایکی داو....هتد.

پاشان خوای کارزان بەو بۆنەوە، چەند ڕاستییەکی مەزن لە بارەی یەکتایی خواو، ڕۆژی دوایی و، سەرەنجامی شوومی هاوبەشدانەرانەوە، دەخاتەڕوو، هەروەها هۆشداریی دەداتە خەڵك لە بارەی قیامەت و ڕۆژی دواییەوە.

﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَرۡيَمَ إِذِ ٱنتَبَذَتۡ مِنۡ أَهۡلِهَا مَكَانٗا شَرۡقِيّٗا ﴿١٦﴾ فَٱتَّخَذَتۡ مِن دُونِهِمۡ حِجَابٗا فَأَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرٗا سَوِيّٗا ﴿١٧﴾ قَالَتۡ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيّٗا ﴿١٨﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمٗا زَكِيّٗا ﴿١٩﴾ قَالَتۡ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَلَمۡ يَمۡسَسۡنِي بَشَرٞ وَلَمۡ أَكُ بَغِيّٗا ﴿٢٠﴾ قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٞۖ وَلِنَجۡعَلَهُۥٓ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِ وَرَحۡمَةٗ مِّنَّاۚ وَكَانَ أَمۡرٗا مَّقۡضِيّٗا ﴿٢١﴾ فَحَمَلَتۡهُ فَٱنتَبَذَتۡ بِهِۦ مَكَانٗا قَصِيّٗا ﴿٢٢﴾ فَأَجَآءَهَا ٱلۡمَخَاضُ إِلَىٰ جِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ قَالَتۡ يَٰلَيۡتَنِي مِتُّ قَبۡلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسۡيٗا مَّنسِيّٗا ﴿٢٣﴾ فَنَادَىٰهَا مِن تَحۡتِهَآ أَلَّا تَحۡزَنِي قَدۡ جَعَلَ رَبُّكِ تَحۡتَكِ سَرِيّٗا ﴿٢٤﴾ وَهُزِّيٓ إِلَيۡكِ بِجِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ تُسَٰقِطۡ عَلَيۡكِ رُطَبٗا جَنِيّٗا ﴿٢٥﴾ فَكُلِي وَٱشۡرَبِي وَقَرِّي عَيۡنٗاۖ فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلۡبَشَرِ أَحَدٗا فَقُولِيٓ إِنِّي نَذَرۡتُ لِلرَّحۡمَٰنِ صَوۡمٗا فَلَنۡ أُكَلِّمَ ٱلۡيَوۡمَ إِنسِيّٗا ﴿٢٦﴾ فَأَتَتۡ بِهِۦ قَوۡمَهَا تَحۡمِلُهُۥۖ قَالُواْ يَٰمَرۡيَمُ لَقَدۡ جِئۡتِ شَيۡـٔٗا فَرِيّٗا ﴿٢٧﴾ يَٰٓأُخۡتَ هَٰرُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمۡرَأَ سَوۡءٖ وَمَا كَانَتۡ أُمُّكِ بَغِيّٗا ﴿٢٨﴾ فَأَشَارَتۡ إِلَيۡهِۖ قَالُواْ كَيۡفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي ٱلۡمَهۡدِ صَبِيّٗا ﴿٢٩﴾ قَالَ إِنِّي عَبۡدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلۡكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي نَبِيّٗا ﴿٣٠﴾ وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيۡنَ مَا كُنتُ وَأَوۡصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمۡتُ حَيّٗا ﴿٣١﴾ وَبَرَّۢا بِوَٰلِدَتِي وَلَمۡ يَجۡعَلۡنِي جَبَّارٗا شَقِيّٗا ﴿٣٢﴾ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَيَّ يَوۡمَ وُلِدتُّ وَيَوۡمَ أَمُوتُ وَيَوۡمَ أُبۡعَثُ حَيّٗا ﴿٣٣﴾ ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَۖ قَوۡلَ ٱلۡحَقِّ ٱلَّذِي فِيهِ يَمۡتَرُونَ ﴿٣٤﴾ مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٖۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓۚ إِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٣٥﴾ وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ﴿٣٦﴾ فَٱخۡتَلَفَ ٱلۡأَحۡزَابُ مِنۢ بَيۡنِهِمۡۖ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن مَّشۡهَدِ يَوۡمٍ عَظِيمٍ ﴿٣٧﴾ أَسۡمِعۡ بِهِمۡ وَأَبۡصِرۡ يَوۡمَ يَأۡتُونَنَاۖ لَٰكِنِ ٱلظَّٰلِمُونَ ٱلۡيَوۡمَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٣٨﴾ وَأَنذِرۡهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡحَسۡرَةِ إِذۡ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَهُمۡ فِي غَفۡلَةٖ وَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّا نَحۡنُ نَرِثُ ٱلۡأَرۡضَ وَمَنۡ عَلَيۡهَا وَإِلَيۡنَا يُرۡجَعُونَ ﴿٤٠﴾﴾

## مانای ده‌قا و ده‌قی ئایه‌ته‌کان

{هه‌روه‌ها له کتێبه‌که دا باسی مه‌ریه‌م بکه، که له شوێنێکی ڕۆژهه‌ڵاتی خه‌ڵکه‌که‌ی، که‌ناری گرت ﴿١٦﴾ ئنجا بۆ خۆ لێ په‌ناگرتنیان په‌رده‌یه‌کی گرته‌وه، (به مه‌به‌ستی خۆ شۆردن، یان کارێکی تایبه‌تی خۆی)، ئێمه‌ش ڕووحه‌که‌مان (جیبریل)مان نارده لای، بۆی چووه سه‌ر شێوه‌ی پیاوێکی تێر و ته‌واو (ڕێك و پێك) ﴿١٧﴾ (مه‌ریه‌م) گوتی: ئه‌گه‌ر تۆ پارێزکاری، په‌نات لێ به (خوای) به به‌زه‌یی ده‌گرم ﴿١٨﴾ (جیبریل) گوتی: به دڵنیایی من نێرراوی په‌روه‌ردگارتم، تاکو کوڕێکی پاك و چاکت پێ ببه‌خشم ﴿١٩﴾ (مه‌ریه‌م) گوتی: ئنجا چۆن چۆنی کوڕم ببێ، که هیچ مرۆڤێك (به حه‌ڵاڵیی) ده‌ستی لێ نه‌داوم و، داوێنپیسیش نه‌بووم؟! ﴿٢٠﴾ (جیبریل) گوتی: به‌و شێوه‌یه، په‌روه‌ردگارت فه‌رمووی: ئه‌وه بۆ من سێنایه‌و، تاکو ئه‌و (کوڕه)یش بۆ خه‌ڵکی بکه‌ینه نیشانه‌و موعجیزه‌و، ئه‌وه‌ش به‌زه‌ییه‌که له ئێمه‌وه‌و، ئه‌و کاره‌ش بڕیاردراوه‌و بڕاوه‌ته‌وه ﴿٢١﴾ ئیدی (مه‌ریه‌م) ئه‌وی (له سکی خۆیدا) هه‌ڵگرت و، به هۆیه‌وه له شوێنێکی لاچه‌پی دوور، که‌ناری گرت ﴿٢٢﴾ پاشان ژانی منداڵبوون په‌نای پێبرده لای بنك و قه‌دی دارخورمایه‌ك، (له ترس و حه‌ژمه‌تان) گوتی: ئه‌ی خۆزگه پێش ئه‌م (حاڵ)ه، مرد بام و، نادیده‌گیراوو له بیرکراو بوومایه ﴿٢٣﴾ له‌لای ژێره‌وه‌ی بانگی کرد: که خه‌مبار مه‌به! په‌روه‌ردگارت له‌لای خۆیه‌وه سه‌رچاوه‌یه‌کی ئاوی داناوه ﴿٢٤﴾ (ئنجا ئاو بخۆوه) و قه‌دی دارخورمایه‌که‌ش به‌لای خۆت دا بجووڵێنه، فه‌ریکه خورمای گه‌یشتووت به‌سه‌ردا ده‌خاته خوارێ ﴿٢٥﴾ ئنجا (له خورمایه‌که) بخۆو (له ئاوی سه‌رچاوه‌که) بخۆوه‌و، خاتر جه‌م و دڵخۆشیش به، ئه‌گه‌ر یه‌کێکیشت له مرۆڤان دی، بڵێ: من ڕۆژووم بۆ (خوای) به به‌زه‌یی له خۆم گرتووه‌و، ئه‌مڕۆ قسه له‌گه‌ڵ هیچ مرۆڤێکدا ناکه‌م ﴿٢٦﴾ ئیدی هه‌ڵیگرت و هێنایه‌وه لای خه‌ڵکه‌که‌ی و گوتیان: ئه‌ی مه‌ریه‌م! به‌ڕاستیی کارێکی (خراپی) سه‌رسوڕهێنه‌رت کردوه ﴿٢٧﴾ ئه‌ی خوشکی هاڕوون! نه بابت پیاوی خراپ بووه‌و، نه دایکت زینا خواز! ﴿٢٨﴾ ئه‌ویش ئاماژه‌ی بۆ (کۆرپه‌که‌ی) کرد (که قسه‌ی له‌گه‌ڵ بکه‌ن)، گوتیان: چۆن که‌سێك بدوێنین که منداڵی سه‌رلانکه‌یه؟ ﴿٢٩﴾ (عیسا) گوتی: من به‌نده‌ی خوام کتێبی پێداوم و، کردوومی به پێغه‌مبه‌ر ﴿٣٠﴾ له هه‌ر جێیه‌کیش بم به‌پێزی کردووم و، ڕاشیسپاردووم که هه‌تا زیندووبم، نوێژ بکه‌م و زه‌کات بده‌م ﴿٣١﴾ هه‌روه‌ها ڕایسپاردووم، که له‌گه‌ڵ دایکم دا چاکه‌کاربم و، نه‌شیکردوومه

خۆسەپێن و خراپەکار و بێمراد ﴿٣٢﴾ سەلامیشم (لە خواوە) لێیە ئەو ڕۆژەی تێیدا لە دایك بووم و، ئەو ڕۆژەی تێیدا دەمرم و، ئەو ڕۆژەش کە بە زیندوویی تێیدا هەڵدەسێنرێمەوە ﴿٣٣﴾ ئا ئەوە عیسای کوڕی مەریەمە، قسەی هەقە، کە تێیدا دوو دڵن ﴿٣٤﴾ بۆ خوا نالوێ هیچ ڕۆڵەیەکی هەبێ، پاکیی بۆ وی، هەر کات بڕیاری کارێك بدات (بێتەدی) بەس پێی دەفەرموێ: ببە، یەکسەر دەبێ ﴿٣٥﴾ (هەروەها عیسا گوتی:) هەر خواش پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەشە، تەنیا ئەو بپەرستن، ئەمە ڕێی ڕاستە ﴿٣٦﴾ ئیدی کۆمەڵە (نەصرانییە)کان لە نێو خۆیان دا، کەوتنە ڕاجیاییەوە، دەجا هاوار بۆ ئەوانەی بێبڕوان لە دیمەن و ئامادەبوونی ڕۆژێکی مەزن ﴿٣٧﴾ ئای ئەو ڕۆژەی دێنە لامان (لە قیامەت دا) چەندە بیسەر و بینەرن! بەڵام ئەمڕۆ ستەمکاران لە گومڕاییەکی ئاشکرادان ﴿٣٨﴾ هەروەها لە ڕۆژی داخ و حەسرەت بیانترسێنە کە بڕیاردرا، لە حاڵێکدا کە ئەوان لە بێ ئاگایی دان و، ئەوان لە بێبڕوایی دان ﴿٣٩﴾ بە دڵنیایی هەر ئێمە زەوی و، هەر کەس کە لەسەریەتی، بە میرات دەگرین و، تەنیا بۆ لای ئێمەش دەگێڕدرێنەوە ﴿٤٠﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(إِذِ ٱنتَبَذَتْ): لە کاتێکدا کە کەناری گرت، (النَّبْذُ: إلقَاءُ الشَّيءِ وَطَرْحُهُ، لِقِلَّةِ الإعْتِدَادِ بِهِ، وَانْتَبَذَ فُلَانٌ: اعْتَزَلَ اعْتَزَالَ مَنْ يَقِلُّ مُبالاتُه بِنَفْسِهِ فِيْمَا بَيْنَ النَّاس)، (نَبْذ) بریتییە: لە فڕێدانی شتێك و هەڵدانی لەبەر ئەوەی لە لای بێ بایەخە، دەگوترێ: (انْتَبَذَ فُلَانٌ) واتە: فڵان کەناری گرت، کەنار گرتنێك کە گرنگیی بە خۆی نەدات، لەو ڕووەوە داخۆ خەڵك چی دەڵێن؟

(وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ): هیچ بەشەرێك دەستی نەگەیاندوومێ، (كُنِّيَ بالمَسِّ عَنِ النِّكَاح)، وشەی (مَس) کینایەیە لە هاوسەرگیریی.

(وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا ): هەروەها داوێن پیسیش نەبووم، (بَغَتِ المَرْأَةُ تَبْغِي بِغَاءً: فَجَرَتْ، فَهِي بَغِيٌّ، وَالجَمْعُ بَغَايا)، واتە: (بغت) ئافرەتەکە داوێن پیسی کرد، داوێن پیسی دەکات، داوێن پیسی کردن، (فَجَرَتْ) واتە: گوناهی کرد، داوێن پیسی کرد، واتە: غەریزەی جینسیی خۆی تێرکرد لە ڕێی ناشەرعییەوە، (فَهِي بَغِيٌّ) ئەگەر تاك بێ پێی دەگوترێ: (بَغِي) و بە کۆش پێیان دەگوترێ: (بَغَايا) واتە: ئافرەتانی داوێن پیس.

(مَقْضِيًّا ): واتـە: بڕیـار لەسـەر دراو، (قَضَى، يَقْضِي، قَضَاءً وَقَضْيَاً وَقَضِيـةً: حَكَـمَ وَفَصَـلَ)، (مَقْضِيَاً أي: مَفْصُـولاً) بڕیاریـدا، بڕیـار دەدا، بڕیـار دان، واتـە: بڕیاریـداو، یەکلایـی کـردەوە، (مَقْضِيَاً) واتـە: یەکلایـی کـراوە، بڕیـار لەسـەر دراو، جیاکـراوە.

(قَصِيًّا ): (القَصِيُّ: البَعِيد) واتە: شوێنێکی دووری کەنار، پەڕگە.

( فَأَجَآءَهَا ): پەنـای پـێ بـرد، (وَأَجَـاءَهُ إلى كَـذَا: الجَـأَهُ اضْطَـرَّهُ)، (جَـاءَ) واتـە: هـات، (أجَـاءَهُ) واتـە: (جَـاءَ بِـهِ) واتـە: هێنـای، (وَأجَـاءَهُ إلى كَذَا) واتـە: پەنـای پێبردە بـەر ئـەوەو ناچـاری کـرد.

(ٱلْمَخَاضُ ): (وَجَـعُ الـوِلادَة) واتـە: ژانی منـداڵ بـوون، (مَخِضَـتِ الحَامِـلُ مَخَاضَـاً: أي ضَرَبَهَـا الطَّلْـقُ فَهِـيَ مَاخِـضٌ)، واتـە: ئافـرەتی دووگیـان کـە ژانی منداڵبـوونی دێتـێ پێـی دەگوتـرێ: (مَخِضَـت) و بـە ژانەکـەی دەگوتـرێ: (مَخَـاض) و بـە خـۆی دەگوتـرێ: (مَاخِـض) واتـە: ژانی منداڵبـوون لێهاتـوو.

(جِذْعِ ): (الجِـذْعُ: سَـاقُ النَّخْلَـةِ وَنَحْوِهَـا) واتـە: قـەدو بنـکی درەخـت، یـان هـی دارخورمـا و غەیـری ئـەوە پێـی دەگوتـرێ: (جِـذْع)، بـە (أجْـزَاعُ وجُـذُوع) کۆدەکرێتـەوە.

(نَسْيًا مَّنسِيًّا ): (النَّسِيُ: مـا نُسِيَ) شـتی فەرامۆشـکراو، لـە بیرکـراو، (مَـا يَقِـلُّ الإعْتِـدَادُ بِـه) شـتێك کـە بایەخیـی کـەم پـێ بـدرێ، (النَّسِيُ) و (النَّسي) هەردووکیـان یـەك مانایـان هەیـە، شـتێك کـە فەرامـۆش بکـرێ، (مَنْسِي) دیـارە (مَفْعُـول بِـه) واتـە: فەرامۆشـکراو.

(سَرِيًّا ): (سَرُوَ، يَسْرو، سَرَاوَةً، وسَرواً: شَرُفَ فَهُـوَ سَرِيٌّ، وَالـسَّرِيُّ، النَّهـرُ: لأنَّـهُ يَـسْرِي)، دەگوتـرێ: (سَرُوَ، يَـسْرو، سَرَاوَةً، وسَرواً) واتـە: گەورەبـوو، بـوو بـە سـەرۆك، ئـەو کوڕێـکی بەرچـاوە، یاخـود کوڕێـکی هەڵکەوتوویـە، (سريـاً) دەگونجـێ بـە مانـای کوڕێـکی هەڵکەوتـوو بـێ کـە عیسـایە، دەشـگونجێ (سريـاً) واتـە: ڕووبارێـك بـێ کـە دەڕوا، سـەرچاوەیەك بـێ کـە ئـاوی لـێ دەڕوات، کـە مانـای دووەمیـان گونجاوتـرە لەگـەڵ سـیاقی ئایەتەکـە.

(وَهُزِّيٓ إِلَيْكِ بِجِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ ): بنـکی دارخورماکـە بـەلای خۆتـدا بکێشـە، بیجووڵێنـە، (هَـزُّ الـشيءِ: حَرَّكَـهُ، وهَـزُّ الشَّـجَرَةَ وَنَحْوِهَـا: حَرَّكَهَـا فِي شِـدَّةٍ) ڕایوەشـێنە بـەلای خۆتـدا.

(رُطَبًا ): دەگوتـرێ: (نَضِيـجُ البُـسْرِ قَبْـلَ أنْ يَصِيْرُ تَمْـرَاً، وَالجَمْـعُ أرْطَـاب وَرُطَـاب وَالوَاحِـدَةُ: رُطَبَـةٌ)، فەریکـە خورمـا پێـش ئـەوەی ببێتـە خورمـا، کاتێـك کـە فەریکـە پێـی دەگوتـرێ: (رُطَـب) کـە بە (أرْطَـاب وَرُطَـاب) کۆدەکرێتـەوە، تاکەکـەی پێی دەگوتـرێ: (رطبة).

(جَنِيًّا): (الجَنـيُّ: كُلُّ مَـا يجْنـى مِـنَ الشَّـجَرَة)، (جَنـي) هـەر شـتێكە كـە لـە درەخـت دەكرێتـەوە، میـوەی درەخـت، بـەری درەخـت.

(وَقَـرِّي عَيْـنًا): (قَـرَّتْ عَيْنُـهُ: سُرَّ وَرَضِيَ، فَهُـوَ قَرِيـرُ العَـيْنِ)، (قَـرَّتْ عَيْنُـهُ) واتـە: دڵخـۆش بـوو، ڕازی بـوو، (قَرِيـرُ العَـيْنِ) واتـە: ڕازی، دڵپەسـند، شـادمان، ئنجـا ئـەوەش بۆیـە وای پێدەگوتـرێ: چونكـە (قَـرٌّ) واتـە: (ثبت)، مـرۆڤ ئەگـەر شـتێكی خۆشویسـت، چـاوی لەسـەر دەچەسـپێنێ و چـاوی تێدەبـڕێ، چـاوی لەسـەر لانـادا، بـە پێچەوانـەی ئـەوەوە كـە شـتێكی پـێ ناخـۆش بـێ، چـاوی لـێ لادەدات.

یاخـود لەبـەر ئـەوە كـە (قَـرٌّ) بـە مانـای سـەرما دێ و فرمێسـكی شـادییش سـاردە جـاری وایـە، مـرۆڤ لـە خۆشـیان فرمێسـكی دێ، كـە فرمێسـكی شـادیی سـاردە، هـەروەك فرمێسـكی دڵتەنگیـی و خەمۆكیـی، گەرمـە.

دەگوتـرێ: (قَـرَّ بِهَـذَا الأَمْـرِ عَيْنَـاً) واتـە: بـەو شـتە دڵـت خـۆش بـێ، (وَقَـرِّي عَيْـنًا) واتـە: (ئـەی مەریـەم!) دڵـت خـۆش بـێ، شـادمان بـە.

(نَذَرْتُ): (نَـذَرَ الشيءِ نَـذْراً وَنُـذُوراً: أَوجَبَـهُ عَـلَى نَفْسِـهِ) ئـەو شـتەی لەسـەر خـۆی پێویسـت كـردوە، بـە كوردیـی دەڵێـن: لـە خـۆی گرتـوە، (نَـذِر بالـشيءِ: عَلِمَـهُ)، واتـە: ئـەو شـتەی زانـی، بـەڵام (نَـذَرَ الـشيء) واتـە: ئـەو شـتەی لەسـەر خـۆی پێویسـت كـردوە.

(فَرِيًّا): (فَـرِيَ الـشيء: يَفْـرِي فَرِيـاً: شَـقَّهُ، وَالفَـرِيُّ: الكَـذِبُ: اختلقـه، وَالفَـرِيُّ مِـنَ الأُمُـورِ: المُخْتَلَـقُ والعَجيـب)، وشـەی (فـري) بـە مانـای (قطـع) دێ، (فـري الجلـد) واتـە: چەرمەكـەی لـەت كـرد، ئنجـا لەبـەر ئـەوەی كەسـێك كـە درۆ دەكات، لەبـەر ئـەوەی كـە ئـەو شـتە درۆیـەو بـوونی نیـە و بـۆ خـۆی دایتاشـیوە، بـە یەكێـك دەگوتـرێ: درۆیـان دەتاشـێ، یانـی: بـوونی نیـە بـەڵام بـۆ خـۆی دروسـتی دەكات، وێـڕای ئـەوەش (فـري) بـە مانـای شـتێكی بوختـان، یـان دروسـتكراو دێ، بـە مانـای شـتی سەرسـوڕهێنەرو شـیاوی سـەر لـێ سـوڕمانیش دێ.

(يَمْتَرُونَ): (إِمْـتَرَى فِي الـشيءِ: شَـكَّ فِيـهِ) تێیـدا دوو دڵ بـوو لـەو شـتەدا، هەروەهـا (المِرْيَـةُ والمُرْيَـة: الجَـدَلُ) بـە مانـای مشـت و مڕیـش دێ، ئـەوە بـە مانـای گومانیـش دێ، دەگوتـرێ: (هَـذِه فِرْيَـةٌ بِلاَ مِرْيَـة) ئـەوە درۆیـە بەبـێ دوو دڵیـی.

(مَّشْهَدِ): (المَشْـهَدُ: الحُضـورُ، والمَشْـهَدُ مـا يُشـاهَدُ، والمَشْـهَدُ: المجْتَمَـعُ مِـنَ النَّـاسِ والجَمْـعُ مَشَـاهِد)، (مَشْـهَد) هـەم بـە مانـای ئامادەبـوون دێ، هـەم بـە مانـای شـتێك كـە دەبیـنرێ، هـەم

بە مانای خەڵکێکی کۆبووەوە دێ، یاخود ئەو شوێنانەی کە خەڵکیان لێ کۆدەبێتەوە، کە بە (مشاهد) کۆدەکرێتەوە.

(يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ): (الحَسْرَةُ: شِدَّةُ التَّلَهُّفِ وَالحُزْنِ)، (حَسْرَة) بە کوردیش هەر بەکاردەهێنرێ کە دەڵێین: داخ و حەسرەت، یاخود (حَسْرَة) واتە: خەفەتباریی، دڵتەنگیی، ناڕەحەتیی، زۆر ناڕەحەتیی، (يوم الحسرة) بە تەئكید مەبەست پێی ڕۆژی قیامەتە، کە لەوێدا بابای بێبڕوا و خەڵکی بێبڕوا زۆر داخ و حەسرەت و، خەفەت دەخوا، یاخود لە دنیادا بە شێوەیەك ژیانیان بەڕێکرد کە لەوێ بۆیان قەرەبوو نابێتەوە، بە شێوەیەك بەڕێیان کرد کە شەرمەزاریی و عەیبدارییان وە دەست هێنا.

## مانای گشتی ئایەتەکان

مانای گشتی ئەم بیست و پێنج (٢٥) ئایەتە بە کورتیی و پوختیی بە ڕێ دەکەین، لەبەر ئەوەی دوایی: هەم لە مەسەلە گرنگەکاندا، ئایەتەکان بڕگە بڕگە شی دەکەینەوە، هەم بەسەرهاتی مەریەم و عیساش صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، دێنین:

خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿ وَٱذْكُرْ فِي ٱلْكِتَٰبِ مَرْيَمَ ﴾، هەروەها لە کتێبدا، واتە: لەم قورئانەدا کە کتێبە، نووسراوە، هەروەها قورئانیشە، خوێنراوەشە، لەم کتێبەدا باسی مەریەم بکە، ﴿ إِذِ ٱنتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَانًا شَرْقِيًّا ﴾، لەو کاتەوە باسی بکە، کە کەناری گرت لە خەڵکەکەی، لەو خەڵکەی ئەو لە نێویاندا بوو، ئەو یەکێك بوو لە خۆیان، کەناری لێگرتن و کەوتە لای ڕۆژهەڵاتیان، ئنجا چۆن چووە ئەو پەرگەیەوە؟ ﴿ فَٱتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَابًا ﴾، پەردەیەکی خستە نێوان خۆی و ئەوانەوە، واتە: پەردەیەکی گرتەوە، ئایا ئەو پەردەیەی بۆچی گرتۆتەوە؟ ساڵ و زەمانانی ڕابردوو وەك ئێستا گەرماو نەبووە، ئافرەتان و پیاوان خۆیانی لێ بشۆن، بەڵکو (سەراو) هەبووە، یاخود شوێنی (کوڵکردن) ئافرەتان لەوێ جل و بەرگیان لێ دەشۆرد و، خۆیان لێ دەشۆردو، پەردەیان لێ دەگرتەوە، یان لە پەنایەك بووە کە پیاو بەلایاندا نەچوو ون، شوێنی ئافرەتان جیا بووە، شوێنی پیاوانیش جیابووە، واتە: پەردەی گرتەوەو لە نێوان خۆی و خەڵکەکەدا، بۆ ئەوەی دیار نەبێ، بۆ کاری تایبەتی خۆی، ئنجا یان خۆی گۆڕیوە، یان خۆی شۆردوە و پاك و خاوێنی خۆی کردوە، ﴿ فَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا ﴾، ڕووحی خۆمانمان ناردە

لای، بۆی چووە سەر شێوەی مرۆڤێکی ڕێك و پێك و تێر و تەواو، کە بێگومان مەبەست پێی جیبریلە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ ﴿١٩٤﴾ ﴾الشعراء، ﴿ قُلْ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ ﴿١٠٢﴾ ﴾النحل، ﴿ تَنَزَّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ ﴿٤﴾ ﴾القدر.

(روح القدس) و (روح الأمين) و (الروح) و (روحنا) هەموویان مەبەست پێیان جیبریلە ﷺ، جیبریل ناویەتی، (روح)یش یان نازناویەتی، یان یەکێکە لە سیفەتەکانی، هەروەك چۆن عیسا ﷺ، (عیسا)ی پێگوتراوە و (مسیح)یش پێگوتراوە و (إبن مریم)یش پێگوتراوە، ڕووحی خۆمانمان نارده لای، بۆی چووە سەر شێوەی مرۆڤێکی تێر وتەواو.

﴿ قَالَتْ إِنِّىٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحْمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيًّا ﴾، لەو کاتەش دا هەر عادەت نەبووە پیاو بچنە سەراوی ئافرەتان و شوێنی کوڵکردن و جل و جۆڕ شۆریی ئافرەتان، بۆیە پێی سەیر بوو، گوتی: من پەنا لە تۆ بە خوای خاوەن بەزەیی دەگرم، ئەگەر تۆ پارێزکاری، چونکە ئەگەر پارێزکار نەبێ، پەناشی لێ بە خوا بگرێ، بێ سوودە، دیارە جیبریل بۆی چۆتە سەر شێوەی پیاوێکی نوورانیی و ڕێك و پێك و خواناس، بۆیە وای گوتوە و وای تێڕابینیوە، پارێزکار بێ.

﴿ قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ ﴾، گوتی: بە دڵنیایی من نێردراوی پەروەردگاری تۆم، ﴿ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمًا زَكِيًّا ﴾، تاکو منداڵێکی پاك و چاکت پێ ببەخشم، (غلام) یانی: کوڕیژگە.

بێگومان سەرەتا کۆرپەلەیەو، دوایی لە دایك دەبێ و، مەلۆتکە دەبێ و، دەبێتە کۆرپە و دەبێتە منداڵ، دوایی دەبێتە مێرد منداڵ (صبي)، پێش باڵغ بوون و دوایی دەبێتە کوڕیژگە (غلام)، کە ئەو کاتەیە باڵغ دەبێ، بەڵام بە ئیعتیباری ئەوەی سەرەنجام دەبێتە غوڵام، کە غوڵام جاری وایە بە مانای پیاوێکی تێر و تەواو و خاوەن ژن وماڵیش هەر هاتوە، یانی: سەرەنجام دەبێتە پیاوێکی تێر و تەواو.

﴿ قَالَتْ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى غُلَٰمٌ ﴾، گوتی: ئنجا چۆن و لە کوێوە کوڕێکی وام پەیدادەبێ؟! ﴿ وَلَمْ يَمْسَسْنِى بَشَرٌ ﴾، لە حاڵێکدا کە هیچ کەس هیچ پیاوێك، یانی: بە حەڵاڵیی کەس دەستی لێنەداوم، چونکە وشەی (مَسّ) کینایەیە بۆ نیکاح و هاوسەرگیریی، ﴿ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا ﴾، (بە حەڵاڵیی هاوسەرگیریم نەکردوە و، دەستی هیچ پیاوێکم پێنەکەوتوە) هەروەها داوێن پیسیش نەبووم، ئافرەتێك نەبووم کە داوای پیاوان بکەم و داوێن پیس بم.

﴿ قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ ﴾، [رووح، جیبریل] گوتی: بڕیارەکە هەر بەو شێوەیەیە، پەروەردگارت فەرموویەتی: ﴿ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ ﴾، ئەوە لەلای من ئاسانە، یانی: بۆوی سێنایە کە کوڕێیەك لە سکی تۆدا پەیدا بکات، بێ ئەوەی پیاوێك دەستت لێ بدات، نە بە حەڵاڵی، نە بە حەرامیی، ﴿ وَلِنَجْعَلَهُۥٓ ءَايَةً لِّلنَّاسِ ﴾، بۆ ئەوەش کە ئەو منداڵە بکێرین بە نیشانەیەك بۆ خەڵك [کە خوا دەتوانێ مرۆڤ بخوڵقێنێ بەبێ پێککەیشتنی نێر ومێش] ﴿ وَرَحْمَةً مِّنَّا ﴾، هەروەها بەزەییشە لەلایەن ئێمەوە، یانی: ئەو منداڵە خودی بەزەییە، یاخود مایەی بەزەییە بۆ تۆ، یاخود بەزەیی خوایە بۆ مرۆڤایەتیی، ﴿ وَكَانَ أَمْرًا مَّقْضِيًّا ﴾، بڕیاری پەیدابوونی ئەو منداڵەش، بڕیارێکی هەڵبڕاوە، بڕیارێکی کۆتایی پێهێنراوە.

﴿ فَحَمَلَتْهُ فَانتَبَذَتْ بِهِۦ مَكَانًا قَصِيًّا ﴾، ئنجا هەڵیگرت، منداڵەکە چووە نێو هەناویەوە و، بەهۆیەوە چووە شوێنێکی پەرگە و دوورە چاو.

دوایی باسی دەکەین کە هەندێك لە زانایان دەڵێن: جیبریل فووی بە یەخەی کراسەکەی داکردوە، یان فووی بە زاریدا کردوە، گرنگ ئەوەیە ڕووحی عیسا چۆتە بەر بەدەنی.

﴿ فَأَجَآءَهَا ٱلْمَخَاضُ إِلَىٰ جِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ ﴾، ژانی منداڵبوون، پەنای پێبردە بەر بنك و قەدی دار خورمایەك [پاڵی وێدا] ئافرەت کە منداڵی دەبێ، دەبێ پاڵ وەدیوار یان بە شتێك بدات، ئافرەتانیش دەوری دەگرن، بەڵام ئەو کەسی لە دەور نەبووە و پاڵی وە قەدی دار خورمایەکە داوە.

﴿ قَالَتْ يَٰلَيْتَنِى مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا ﴾، گوتی: خۆزگە پێش ئەمە مردبامایە!

یانی: ئەم حاڵەم بەسەر نەهاتبایە و نەمدیبایە، ﴿ وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا ﴾، خۆزگە فەرامۆشکراوو لە بیرکراو بوومایە، واتە: هەر نەبوومایەو لە بیر کراوبوومایە، ئاشکرایە خەمی ئەوەی بووە: چۆن وەڵامی خەڵك بداتەوە، بەبێ ئەوەی کە شوو بکات، منداڵێکی پەیدابێ! سەدو یەك گومانی خراپ پێی دەبەن، وەك ئێستاش لەگەڵدا بێ جوولەکەکان هەر گومانی خراپی پێدەبەن! ﴿ فَنَادَىٰهَا مِن تَحْتِهَآ ﴾، لە ژێریەوە بانگی کرد، وا پێدەچێ: هەر کوڕەکەی کە لێی جیابۆتەوە، کە عیسایە، بانگی کردبێ، چی پێگوت؟ ﴿ أَلَّا تَحْزَنِى ﴾، کە خەفەت مەخۆ، ﴿ قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا ﴾، پەروەردگارت لە ژێرتەوە، واتە: لە خوارتەوە، کانیی و جۆگایەکی دەرقوڵاندوە، ئەوە بۆ ئاو، بۆ خواردنیش:

﴿ وَهُزِّيٓ إِلَيۡكِ بِجِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ ﴾، قەدی دارخورمایەکەش بەلای خۆتدا ڕاکێشە، لەو حاڵەدا زۆر بێهێز بووە، بەڵام یانی: هەر دەستی بگەیەنێ دارخورمایەکە بەلاتدا خواردەبێتەوە، شتەکان هەموویان هەر موعجیزە بوون، چی لێدێ؟ ﴿ تُسَٰقِطۡ عَلَيۡكِ رُطَبٗا جَنِيّٗا ﴾، فەریکە خورمای پێگەیشتووت بەسەردا دەبارێنێ! چونکە دارخورما بە چەند پیاوێکیش ڕاناوەشێنرێ! چ جای ئافرەتێک کە لەسەر منداڵ بوونە و بێ هێزە! بەڵام یانی دەستی بگەیەنێ وەك هۆکارێك دەبێ هەر هەبێ، ئەگەرنا خوای پەروەردگار بۆ خۆی کارەکانت هەموو بۆ دەکات، بە شێوەیەکی موعجیزەو بە شێوەیەکی یاسا دڕ (خارق العادة).

ئەمە خوێنراویشەتەوە: ﴿ فَنَادَىٰهَا مَنۡ تَحۡتَهَآ ﴾، ئەوەی کە لە ژێریەوە بوو، جا هەندێك گوتوویانە: ئەوە مەبەست پێی عیسایە ﷺ دوای ئەوەی لێی جیابۆتەوە، لە دامێنیەوە بووە، هەندێکیش گوتوویانە: جیبریل بووە لەسەر تەپۆلکەیەك لە خوارەوە بووە، ئەویش لەوێ بووە و بانگی کردوە: کە تۆ دڵتەنگ مەبە، ئەوە پەروەردگارت کانیاوێکی بۆ ڕەخساندووی جۆگایەك کە دەڕوات، هەروەها بۆ خۆراکیش ئەو دارخورمایە بەلای خۆتدا بکێشەو ڕایوەشێنە، فەریکە خورمای گەیشتووت بەسەردا دەبارێنێ.

ئنجا (مَنْ تَحْتَها) یان (مِنْ تَحْتَها): مەبەست پێی جیبریل بێ، یان عیسا بێ، یەکسانە، هەر چەندە زیاتر وا پێدەچێ: مەبەست پێی عیسا ﷺ بێ.

﴿ فَكُلِي وَٱشۡرَبِي وَقَرِّي عَيۡنٗاۖ ﴾، بخۆو بخۆوە و دڵخۆشبەو خاترجەمبە، ﴿ فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلۡبَشَرِ أَحَدٗا ﴾، ئەگەر کەسێکت لە مرۆڤان بینی، ﴿ فَقُولِيٓ إِنِّي نَذَرۡتُ لِلرَّحۡمَٰنِ صَوۡمٗا ﴾، پێی بڵێ: من ڕۆژووم لە خۆم گرتوە بۆ خوای خاوەن بەزەیی ﴿ فَلَنۡ أُكَلِّمَ ٱلۡيَوۡمَ إِنسِيّٗا ﴾، ئەمڕۆ قسە لەگەڵ هیچ مرۆڤێکدا ناکەم، یان: ڕۆژووگرتنی ئەوان بێ دەنگییشی لەگەڵدا بووە، یاخود جۆرێك لە ڕۆژووگرتیان قسەنەکردنیشی لەگەڵدا بووە.

﴿ فَأَتَتۡ بِهِۦ قَوۡمَهَا تَحۡمِلُهُۥۖ ﴾، دوایی هێنایەوە لای خەڵکەکەی، لای کۆمەڵەکەی لەحاڵێکدا هەڵیگرتبوو، واتە: مەلۆتکەکەی هەڵگرتبوو، ﴿ قَالُواْ يَٰمَرۡيَمُ لَقَدۡ جِئۡتِ شَيۡـٔٗا فَرِيّٗا ﴾، خەڵکەکە گوتیان: ئەی مەریەم! بەڕاستیی تاوانێکی خراپت کردوە، یان درۆیەکی گەورەت هەڵبەستوە، یاخود شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەرت کردوە.

﴿ يَٰٓأُخۡتَ هَٰرُونَ ﴾، ئەی خوشکی هارون! دەگونجێ (هارون) مەبەست پێی برای مووسا بێ، واتە: ئەی مەریەم تۆ لە دین و تەقوادا، وەك هارونی برای مووسا نەرم و هێمن و میهرەبان و بە تەقوا بووی، یاخود هارون پیاوێکی صاڵح بووە لە ڕۆژگاری

خۆیاندا، یاخود لەبەر ئەوە بووە کە مەریەم لە ڕووی ڕەچەڵەکەوە دەچێتەوە سەر هاڕوونی برای مووسا ﷺ ﴿ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمْرَأَ سَوْءٍ ﴾، بابت پیاوێکی خراپ نەبوو، ﴿ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا ﴾، دایکیشت داوێن پیس نەبوو.

﴿ فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ ﴾، ئاماژەی بۆ کرد، ئاماژەی بۆ مەلۆتکەکەی کرد کە بیدوێنن، ﴿ قَالُواْ كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي ٱلْمَهْدِ صَبِيًّا ﴾، گوتیان: ئنجا چۆن قسە لەگەڵ کەسێکدا بکەین کە منداڵەو لەلانکەدایە، لە بێشکەدایە؟

﴿ قَالَ إِنِّي عَبْدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا ﴾، (عیسا هاتە گۆ!) گوتی: من بەندەی خوام و کتێبی پێداوم و بە پێغەمبەری گێڕاوم، واتە: لە کۆتایی دا، ئەگەرنا ئێستا کتێبی پێ نیە.

یانی: دوایی کتێبم پێدەداو، دەشمکات بە پێغەمبەر.

﴿ وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ ﴾، منی بە پیرۆز بەرهەمدار گێڕاوە، لە هەر جێیەك بم، ﴿ وَأَوْصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا ﴾، هەروەها ڕایسپاردووم بە نوێژو زەکات، نوێژ بکەم کە مافی خوایە، زەکات بدەم، کە هەقی خەڵکە، هەتاکو ژیاندارىم، تاکو زیندووبم.

﴿ وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَتِي ﴾، هەروەها خوا منی گێڕاوە بە چاکەکار بەرانبەر بە دایکم، ﴿ وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا ﴾، نەیگێڕاوم بە ملهوڕو خۆسەپێن و بێمراد و خراپەکار.

﴿ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا ﴾، سەلام لەسەر من بێ، یانی: سەلامی خوا، ڕۆژێك کە تێیدا لە دایك بووم و، ڕۆژێك کە تێیدا دەمرم و، ڕۆژێك کە بە زیندوویی تێیدا هەڵدەسێنرێمەوە.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ قَوْلَ ٱلْحَقِّ ٱلَّذِي فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴾، ئا ئەوە عیسای کوڕی مەریەمە، فەرمایشتی هەقی خوا، کە تێیدا دوو دڵن، لەبەر ئەوەی عیسا بە فەرمانی خوا و بە وشەی خوا دروست بووە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ قَوْلَ ٱلْحَقِّ ﴾، یاخود: ئەو بەسەرهاتە قسەی هەق و چەسپاو ڕاستە، یاخود: فەرموودەی خوای هەقە ﷻ ئەو بەسەرهات گێڕانەوەیە، کە ئەوان تێیدا لە دوو دڵیدان.

﴿ مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍ سُبْحَٰنَهُۥٓ ﴾، خوا بۆی نیە، منداڵ و ڕۆڵەی هەبێ، پاکیی بۆ وی، ﴿ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾، هەر کاتێك بڕیاری کارێك بدا دەفەرموێ: ببە دەبێ.

پێویستیی بەوە نیە ڕۆڵەی هەبێ و هاوسەری هەبێ، بەڵکو هەر شتێکی ویست، یەکسەر پەیدای دەکات، ئیدی چ پێویستی بە هاوسەرگرتن و بە ڕۆڵەو وەچەخستنەوە هەیە! ﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ﴾، ئەوەی پێشێ، ئەو دوو ئایەتە فەرمایشتی خوا بوون، ئێوئاخنی کردن لەگەڵ قسەکەی عیسادا، ئنجا دێتەوە سەر قسەی عیسا: بە دڵنیایی خوا پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەشە، هەر ئەو بپەرستن، ئا ئەوە ڕێی ڕاستە.

ئنجا خوا ﷻ وەك ئەنجامگیریی لە بەسەرهاتی مەریەم و عیسا، وەك ئەوە كە عیسا چی لێهات شوێنكەوتووانی عیسا چییان لێهات؟ دەفەرموێ: ﴿ فَٱخۡتَلَفَ ٱلۡأَحۡزَابُ مِنۢ بَيۡنِهِمۡ ﴾، كۆمەڵەكان لە نێو خۆیاندا ڕاجیاییان پەیدابوو، ناكۆكییان پەیدابوو.

كۆمەڵەكان دەگونجێ مەبەست كۆمەڵ نەصرانییەكان بن، كە وەك دوایی باسیان دەكەین، بوونە چوار تاقمی سەرەكیی.

دەشگونجێ مەبەست كۆی ئەو خەڵكە بێ، كە لە بارەی عیساوە ﷺ كەوتنە ڕاجیایی و ناكۆكییەوە: جوولەكەكان كە عیسایان بە زۆڵ و بیژوو دەزانی، نەصرانیەكان كە تێیدا كەوتنە ڕاجیایی و هەندێكیان بە خوا و، هەندێكیشان بە كوڕی خواو، هەندێكیان بە بەندەی خوایان دەزانی، هەروەها مسوڵمانانیش كە قسەی هەق و ڕاست تەنیا لەلای وانە: كە بە بەندەی خواو ڕەوانەكراوی خوای دەزانن.

دیسان خەڵكی دیكەی مولحیدیش هەبووە، كە بە تەئكید لە جوولەكەكان خراپتریشیان بە عیساو دایكیی گوتوە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ فَٱخۡتَلَفَ ٱلۡأَحۡزَابُ مِنۢ بَيۡنِهِمۡ ﴾، كۆمەڵەكان لە نێو خۆیاندا كەوتنە ناكۆكیی و ڕاجیاییەوە ﴿ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن مَّشۡهَدِ يَوۡمٍ عَظِيمٍ ﴾، سزای سەخت بۆ ئەوانەی بێبڕوان لە ئامادەبوونی ڕۆژێكی مەزن، یاخود: لە دیمەنێكی سەرنج دراوی ڕۆژێكی مەزن.

﴿ أَسۡمِعۡ بِهِمۡ وَأَبۡصِرۡ يَوۡمَ يَأۡتُونَنَا ﴾، چەندە بیسەرن و چەند بینەرن، ڕۆژێك كە دێنە لامان، ئای چەند چاك دەبیستن! ئای چەند چاك دەبینن!

﴿ لَٰكِنِ ٱلظَّٰلِمُونَ ٱلۡيَوۡمَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴾، بەڵام ستەمكاران ئەمڕۆ لە گومڕایی دان، یانی: ئەو كاتە زۆر چاك دەبیستن و دەبینن، بەڵام ئێستا لەم ژیانە دنیاییەدا، لە گومڕاییەكی ئاشكرادان.

﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ ٱلْأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، لە ڕۆژی حەسرەت و داخ و خەفەت و پەشیمانیی بیانترسێنە، هۆشداریان بدەیە، کاتێك کە بڕیاردرا، ئەوانیش لە بێ ئاگاییدان و، ئەوانیش بڕواناهێنن، ئنجا چەند داخ و خەفەتێکی گەورە دەخۆن، کە ئێستاش دەستیان بە هیچ شتێك ڕاناگات!

لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَرِثُ ٱلْأَرْضَ وَمَنْ عَلَيْهَا وَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴾، بێگومان ئێمە خۆمان زەوی بە میرات دەگرین و، هەر کەسێکیش کە لەسەر زەوییە، خۆمان بە میراتی دەگرین و، هەر بۆ لای ئێمەش دەگێڕدرێنەوە، نەك بۆ لای هیچ کەسی دیکە.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

باسی بەسەرهاتی مەریەم، کە لەلای ڕۆژهەڵاتی خەڵکەکەی کەناری گرتووە، پەردەیەکی گرتۆتەوە و، خواش ﷻ جیبریلی لە شێوەی پیاوێکی تیر و تەواودا ناردۆتە لای و، لەویش پەنای لێ بە خوا گرتووە، جیبریلیش پێیڕاگەیاندووە، کە نوێنەری پەروەردگاریەتی بۆ لای، تاکو موژدەی کوڕێکی پاك و چاكی بداتێ، ئنجا کە مەریەم سەرسوڕمانی خۆی دەربڕیوە: چۆن بەبێ هاوسەرگیریی، یان زیناکردن، منداڵی دەبێ؟! جیبریل دڵنیای کردۆتەوە کە ئەوە بۆ خوا ئاسانەو، کوڕەکەیشی دەبێتە نیشانەیەکی مەزن بۆ خەڵك و، بڕیاری خواش لەو بارەوە دراوەو بڕاوەتەوە:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَرۡيَمَ إِذِ ٱنتَبَذَتۡ مِنۡ أَهۡلِهَا مَكَانٗا شَرۡقِيّٗا ﴿١٦﴾ فَٱتَّخَذَتۡ مِن دُونِهِمۡ حِجَابٗا فَأَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرٗا سَوِيّٗا ﴿١٧﴾ قَالَتۡ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيّٗا ﴿١٨﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمٗا زَكِيّٗا ﴿١٩﴾ قَالَتۡ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَلَمۡ يَمۡسَسۡنِي بَشَرٞ وَلَمۡ أَكُ بَغِيّٗا ﴿٢٠﴾ قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٞۖ وَلِنَجۡعَلَهُۥٓ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِ وَرَحۡمَةٗ مِّنَّاۚ وَكَانَ أَمۡرٗا مَّقۡضِيّٗا ﴿٢١﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەو ئایەتانە، لە شازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَرۡيَمَ ﴾، هەروەها لە کتێبدا باسی مەریەم بکە، (اتْلُ خَبَرَ مَرِيمَ الّذي نَتْلوهُ عَلَيْكَ فِي القُرْآنِ)، هەواڵی مەریەم کە لە قورئاندا، بەسەر تۆیدا دەخوێنینەوە، تۆش بیخوێنەوە، یاخود باسی بکە.

٢)- ﴿ إِذِ ٱنتَبَذَتۡ مِنۡ أَهۡلِهَا مَكَانٗا شَرۡقِيّٗا ﴾، کاتێك کە کەناری گرت لە خەڵکەکەی، چووە لای ڕۆژهەڵات لە تەرەفی لای ڕۆژهەڵاتەوە چووە شوێنێك، یانی: خەڵکەکە لە کوێ بوون، ئەو چۆتە لای ڕۆژهەڵاتی ئەو شوێنە، نە باکووری، نە باشووری، نە ڕۆژئاوای، بەڵکو چۆتە لای ڕۆژهەڵاتی ئەو شوێنەی کە خەڵکەکەی لێ بووە، ئاشکراشە مەسەلەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواو، باکوورو باشوور

ڕێژەیی (نسبي)ین، واتە: بە نسبەت هەر شوێنێکەوە دەگۆڕێن، شوێنێك بە نسبەت کەسانێکەوە ڕۆژهەڵاتە و، بە نسبەت کەسانێکەوە ڕۆژئاوایە، شوێنێك بۆ هەندێك کەس باکوورە و، بە نسبەت هەندێکەوە باشوورە.

وشەی {(إذ) ظرف متعلق بـ (اذکر)}، کە فەرمووی: (**واذکُر فـي الکتاب مريم إذ انتبذت**)، ئەمە (**ظرف**)ێکە کە پەیوەستە بە (أذکر) واتە: باس بکە لە کاتێکدا کە مەریەم کەناری گرت لە خەڵکەکەی و، چووە لای شوێنێکی ڕۆژهەڵاتی خەڵکەکەی.

کە دەفەرموێ: (**مَكَانًا شَرْقِيًا**)، (**مکانا**) کە (**مفعول**)ە، بۆ (إنتبذت)، چونکە (إنتبذت) مانای سەقامگیربوو (**خَلَت**)ی گرتۆتە نێو خۆی، بۆیە (**مكاناً شرقياً**) دەبێتە (**مفعول بە**)، واتە: (**خَلَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَانًا شَرْقِيًا**)، بە نسبەت خەڵکەکەیەوە چووە شوێنێك کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی خەڵکەکەی.

٣)- ﴿ فَاتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَابًا ﴾، واتە: پەردەیەکی گرتەوە لە نێوان خۆی و ئەواندا، بۆ ئەوەی لەوان دیارنەبێ، ئنجا ئەو پەردەیە دەگونجێ مەریەم بە تەنیا بوو بێ و، دەشگونجێ لەگەڵ ئافرەتان دا بوو بێ، کە ئافرەتان دەچن بۆ کوڵکردن، کاتێ خۆی گەرما و و شوێنی پۆشتەو داخراو نەبووە، چوونە (سەراو) لە دەشت و سارایەك بۆ سەر کانی و ڕووبارێك کە پێیان گوتوە: سەراو، یان شوێنی کوڵکردن، جل شۆردن، ئنجا بۆ کارێکی تایبەتی خۆی یان بۆ خۆ شوردن، یان بۆ هەرچی بووە، پەردەیەکی گرتۆتەوە لە نێوان خۆی و خەڵکەکەدا.

٤)- ﴿ فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا ﴾، ئێمە ڕووحی خۆمامان نادرە لای، بە ئەتکید ڕووح لێرەدا مەبەست پێی جیبریلە، وەك پێشتر باسمان کرد، چونکە لە قورئاندا خوای پەروەردگار وشەی (**الروح القدس**) و (روح الأمين) و (روح) و (روحي) بۆ جیبریل بەکارهێناوە.

٥)- ﴿ فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا ﴾، (**التَّمَثُّل: تَكَلُّفُ المُمَاثَلَةِ، أي: لَيْسَ هَذَا الشَّكْلُ شَكْلَهُ الحَقِيقِي**)، (**تَمَثُّل: تَكَلُّفِ المُمَاثَلَة**)، واتە: خۆی وەك وی لێکرد، ئەگەرنا ئەو وێنەیە هی وی نیە، کەواتە: (**فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا**) بۆی چووە سەر شێوەی مرۆڤێکی تێر و تەواو، ڕێك و پێك، واتە: ئەوە وێنەی ڕاستەقینەی خۆی نەبوو، بەڵکو ئەو وێنەیەی بۆ خۆی هێنابووە دی، دیارە فریشتەکان و، جندیش توانای نواندن (**تمثُّل**)یان هەیە، واتە: توانایان هەیە کە خۆیان لە شێوەی شتی دیکەدا پێشان بدەن.

(**سوياً، السَّوي: المستَوي، التام الخلق**) واتە: ڕێك و پێك، تێر و تەواو.

٦)- ﴿ قَالَتْ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحْمَٰنِ مِنكَ ﴾، مەریەم گوتی: من پەنا بە (خوای) خاوەن بەزەیی دەگرم لە تۆ. ئەمە ئامۆژگاریی مەریەمە بۆ ئەو کەسەی، بۆی چۆتە سەر شێوەی پیاوێکی ڕێك و پێك ئامۆژگاریی دەکات و بیری دەخاتەوە.

٧)- ﴿ إِن كُنتَ تَقِيًّا ﴾، ئەگەر تۆ پارێزکاری، مەبەست لەم شێوازە، هاندانیەتی بۆ پارێزکاریی، واتە: ئەگەر دەتەوێ پارێزکاربی، پەنا بە خوا دەگرم لە تۆ، تەماعم تێمەکە و دەستدرێژییم لێ مەکە و نیازت بەرانبەرم خراپ نەبێ.

٨)- ﴿ قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ ﴾، گوتی: بە دڵنیایی من ڕەوانەکراوی پەروەردگارتم، واتە: من مرۆڤ نیم و لەلایەن پەروەردگارتەوە ڕەوانەکراوم، یانی: من فریشتەم.

بۆچی ڕەوان کراوم؟

٩)- ﴿ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمًا زَكِيًّا ﴾، تاکو منداڵێکی پاك و چاکت پێ ببەخشم.

(لأَهَبَ) خوێنراویشەتەوە: (لِيَهَبَ) تاکو پێت ببەخشێ، یانی: ئەو کارەی بەمن سپاردوە کە ئەو منداڵەت پێ ببەخشم، واتە: کارەکە هی خوایە، بەڵام منی کردوە بە ئامرازی جێبەجێکردنی ئەو فەرمانەی خۆی، بۆیە کە بەخشینەکەی پاڵداوەتەوە لای خۆی، ئەمە (مەجازی عەقلیی) پێی دەڵێن، چونکە خوا ئەوی کردۆتە هۆکار بۆ دروستکردنی عیسا ﷺ بەو شێوە ناوازەو تایبەتەی، کە تەنیا ئەو بەو شێوەیە دروست بووە.

١٠)- ﴿ قَالَتْ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٌ ﴾، گوتی: جا چۆن کوڕم دەبێ؟!

وشەی (أنّى) :

١- بە مانای چۆن (كيف) دێ؟

٢- بە مانای لە کوێ (مِن أين) دێ؟

٣- بە مانای کەی (مَتى) دێ؟

بەڵام لێرەدا کەی (مَتى) ناگونجێ، تەنیا ئەو دووانە دەگونجێن: (چۆن؟) یاخود (لە کوێ؟) من منداڵم دەبێ.

١١)- ﴿ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ ﴾، هیچ مرۆڤێك دەستی نەگەیاندوومێ، واتە: هیچ مرۆڤێك وەك هاوسەر دەستی نەگەیاندۆتە من، چونکە وشەی (مَسّ) لە زمانی عەرەبیدا، کینایەیە بۆ مارەکردن و هاوسەرگیریی بە حەڵاڵیی.

١٢)- ﴿وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا﴾، هەروەها داوێن پیسیش نەبوومە، واتە: لە ڕابردوودا داوێن پیس نەبووم، چۆن ئێستا دەبمە داوێن پیس، بە حەڕامیی دەست لەگەڵ پیاوێك دا تێکەڵ دەکەم، هەڵبەتە هەندێك لە زانایان کە لە (پەیمانی نوێ) وەریانگرتوە دەڵێن: مەریەم خوازراو (مَخْطوبة)ی (یوسف النجار) بووە، بەڵام ئەوە تەنیا لە پەیمانی نوێدا هاتوە، لە قورئاندا ئاماژەی پێ نەکراوە، هەروەها - وەك دوایی لە بەسەرهاتەکەیدا دەیهێنین - گوایە (یوسف النجار) مەریەم دەستگیرانی بووە، بەڵام جارێ نەیگواستۆتەوە، دوایی کە عیسای بووە، عیساو مەریەمی لەگەڵ خۆیدا بردوون بۆ میسر لە ترسی جوولەکەکان، ئەوە هەمووی لە {پەیمانی نوێ}دا هاتوە و لە قورئاندا کەم و زۆر، ئاماژە بەوە نەکراوە، لەبەر ئەوە، ئێمە پشتی پێ نابەستین.

١٣)- ﴿قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ﴾، {جیبریل وەڵامی دایەوە} گوتی: هەروایە، هەر بەو شێوەیەیە {کە بۆم باسکردی} پەروەردگارت فەرموویەتی: ئەوە لەسەرمن ئاسانە، بۆ من شتێکی سێنایە {کە منداڵێك دروست بکەم لە ئافرەتێك، کە نە بە حەڵاڵیی هیچ پیاوێك دەستی گەیاندبێتێ و، نە بە حەڕامیی داوێن پیسیی کردبێ}.

١٤)- ﴿وَلِنَجْعَلَهُۥٓ ءَايَةً لِّلنَّاسِ﴾، دەشمانەوێ بیکەینە نیشانەیەك بۆ خەڵك، واتە: موعجیزەیەك و نیشانەیەك لەسەر ئەوە کە دەستەڵاتی خوا ڕەهایە و، هیچ کۆسپ و لەمپەرێك لەبەردەم دەستەڵاتی خوادا نیە، تەنانەت یاساکانی خۆشی کە دایناون لە دروستکراوەکانیدا کۆسپ و پەرچ نین، لە بەردەم ویستی ڕەهای خواو دەستەڵاتی ڕەهای خوادا، دیارە هەر کاتێ خوا ویستی ئەو یاسایانە، هەڵدەوەشێنێتەوە، یان ئەو یاسایانە ڕادەگرێ، بۆ نموونە:

أ- ئاگر دەسووتێنێ، بەڵام خوا بە ئاگری فەرموو: ئیبراهیم مەسووتێنە!

ب- ئاو دەخنکێنێ، بەڵام خوا فەرمووی: ئەی دەریای سوور بۆ بەنی ئیسرائیل شەق ببە و مەیانخنکێنە، بۆیان ببە جادەو ڕێ! بەڵێ دروستکراوەکان هەموویان فەرمانبەری خوان، ئاشکرایە موعجیزەکانی خواش بە پێی چەند یاسایەکن کە لە ئێمە دیارنین، بەڵام هیچ شتێکی خوا لە دەرەوەی سیستم (نظم) و ڕێك و پێکیی نیە، بەڵام یاسا گەردوونییەکان (القوانین الکونیة) هەر کاتێ خوا ویستی، ڕایان دەگرێ، بۆ وێنە:

بە پێی یاسای خوا: دەبێ پیاوێك و ئافرەتێك پێك بگەن، ئنجا کوڕپەیەك پەیدا دەبێ، بەڵام نەخێر، خوا ویستوویەتی: ئادەم بە بێ ئافرەت پەیدا بێ و، حەوواش بەبێ هیچ کەسێك پەیدابێ، جەستەی ئادەم و حەوا ڕاستەوخۆ لە قوڕەوە پەیدا بێ، هەروەها

ویستوویەتی: عیسا ﷺ بەبێ باب پەیدابێ و، ویستوویەتی: خەڵکی دیکەی ئاسایی بە دایك و باب پەیدابن.

١٥)- ﴿وَرَحۡمَةً مِّنَّا﴾، هەروەها ئەو منداڵە کە پەیدادەبێ، بەزەییەکە لەلایەن ئێمەوە، واتە: بەزەییەکی تایبەتە لەلایەن ئێمەوە:

١)- بەرانبەر بەو منداڵە.

٢)- یاخود: بەرانبەر بە دایکی ئەو منداڵە، کە بۆی دەبێتە هۆی پایە بەرزیی.

٣)- یاخود بەزەیی ئێمەیە بۆ خەڵك، تاکو خەڵك چاکتر خواو پەروەردگاری خۆیان بناسن، کە دەسەڵات و ویستی خوا ڕەهایەو، بێ سنوورەو هیچ کۆسپ و لەمپەرێکی لە بەردەمدا نیە.

١٦)- ﴿وَكَانَ أَمۡرٗا مَّقۡضِيّٗا﴾، ئەو بڕیارەش بڕیارێکی یەکلایی کراوەیە، بڕیارێکە کۆتایی پێهاتوە، (قَاض: إسمُ فَاعِلٍ)، (مَقضِي: اسْم مَفْعُول) (قَاض) واتە: بڕیاردەر {اسم فَاعِل}ە، بەڵام (مقضي) بڕیار لەسەردراو و کۆتایی پێهێنراو و، هەڵبڕدراو (اسم مفعول)ە.

**مەسەلەی دووەم:**

**دووگیان بوونی مەریەم بە عیساو، دوورکەوتنەوەو کەنارگرتنی و، ناچاربوونی بەهۆی ژانی منداڵبوونەوە، بە پەنابردنە ژێر دارخورمایەك و، مردن بە ئاوات خواستنی و، بانگکرانی لەلایەن کۆرپەکەیەوە کە: خەفەتبار نەبێ و، ڕێنمایی کردنی کە بەری دارخورمایەکە بخوات و، لە ئاوی کانیاوەکە بخواتەوەو، دڵخۆش بێ و، هەر کەسێکیشی دی لە‌یدوێنێ و، بڵێ: من بەڕۆژووم و، بۆ خوای خاوەن بەزەیی و قسە ناکەم و کەس نادوێنم:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَحَمَلَتْهُ فَٱنتَبَذَتْ بِهِۦ مَكَانًا قَصِيًّا ﴿٢٢﴾ فَأَجَآءَهَا ٱلْمَخَاضُ إِلَىٰ جِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ قَالَتْ يَٰلَيْتَنِى مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا ﴿٢٣﴾ فَنَادَىٰهَا مِن تَحْتِهَآ أَلَّا تَحْزَنِى قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا ﴿٢٤﴾ وَهُزِّىٓ إِلَيْكِ بِجِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ تُسَٰقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا ﴿٢٥﴾ فَكُلِى وَٱشْرَبِى وَقَرِّى عَيْنًا فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِىٓ إِنِّى نَذَرْتُ لِلرَّحْمَٰنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ ٱلْيَوْمَ إِنسِيًّا ﴿٢٦﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە لە پازدە بڕگەدا:**

**١)- ﴿ فَحَمَلَتْهُ ﴾، ئنجا هەڵیگرت.**

**(الحَمْلُ: العُلوق) (وَحَمَلَتِ المَرْأَةُ: حَمَلَتْ وَلَداً) واتە: پێی دووگیان بووە، پێی تۆڵدار بوو، کۆرپەلەکەی هەڵگرت، ئەو کۆرپەلە چووە نێو سکی، منداڵەکەی وە سك کەوت، ئەگەر ئاژەڵ بێ دەڵێن: ئاژەڵەکە پێی ئاوس بوو، هەڵبەتە دەشگونجێ بڵێین: ئافرەتی ئاوس، بەڵام لە عورفی کوردەوارییدا ئەم وشەیە زیاتر بۆ ئاژەڵ بەکاردەهێنرێ، یاخود بۆ حاڵەتی کەسێك کە بیویسترێ بە شێوەیەکی خراپ بدوێنرێ، بۆیە بەکارنایەت، پیتی (ف) لە وشەی: (فَحَمَلَتْه)دا، (الفَاء: للتفْرِيعِ وَالتَّعْقِيب) واتە: دوای ئەوەی جیبریل بەو شێوەیە دواندی و فەرمانی خوای پێ ڕاگەیاند، یەکسەر بە دوای ئەوەدا بەو منداڵە دووگیان بوو، ئەو منداڵەی وەسکی کەوت.**

**٢)- ﴿ فَٱنتَبَذَتْ بِهِۦ مَكَانًا قَصِيًّا ﴾، بەو منداڵەوە چووە شوێنێکی پەرگە، شوێنێکی دوور، (قَصِيّاً: أي: بَعِيْداً عَنْ مَكَانِ أَهْلِهَا) چووە شوێنێکی پەرگەو دوورە چاو لە کەس و کاری.**

٣)- ﴿ فَأَجَآءَهَا ٱلۡمَخَاضُ إِلَىٰ جِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ ﴾، یەکسەر ژانی منداڵبوون پەنای پێبردە بەر بنکی دارخورمایەك.

لە تەفسیرەکاندا زۆر باسی ئەوە کراوە کە: ئایا عیسا وەك منداڵی ئاسایی وەك کۆرپەلەی ئاسایی: نۆ (٩) مانگ لە سکی دایکیدا بووە؟ یاخود چەند سەعاتێك؟ بە ڕای من: کاتێك سەرنجی ئەم وشانە دەدەین:

أ- ﴿ فَحَمَلَتۡهُ ﴾، بە (ف)ی بەدواداهاتن (التعقیب).

ب- هەروەها ﴿ فَٱنتَبَذَتۡ بِهِۦ مَكَانًا قَصِيًّا ﴾،

ج- ﴿ فَأَجَآءَهَا ٱلۡمَخَاضُ ﴾، هەرسێکیان بە (ف) هاتوون، کە بە مانای بەدوای یەکداهاتن (تعقیب) دێن، بۆمان دەردەکەوێ: کە وەك منداڵی ئاسایی: نۆ (٩) مانگ لە سکی دایکیدا نەبووە، بەڵکو تەنیا چەند سەعاتێك بووە.

ئنجا ئەگەر چووبایە شوێنێکی دوور و نۆ (٩) مانگان لە وێ بوو بایە، بێگومان دوایی خەڵك بەدوایدا دەگەڕان!

پێشتر گوتمان: (فأجاءهاالمخاض) واتە: (جعلها المخاض جائیاً) ژانگرتن وای لێکرد کە بێ، ژانگرتن هێنای و پەنای پێبرد.

(مَخَاض) بە ژانی منداڵبوون دەگوترێ، کە بریتیە لە جووڵانی کۆرپە لە سکی دایکیدا بۆ ئەوەی بێتەدەر، لە ئەنجامی ئەوەشدا ژن ژان و ئێشێکی زۆری بۆ پەیدا دەبێ.

٤)- ﴿ قَالَتۡ يَٰلَيۡتَنِي مِتُّ قَبۡلَ هَٰذَا ﴾، گوتی: ئەی خۆزگە پێش ئەمە مردبامایە {پێش ئەم منداڵ وە سك کەوتنە، پێش ئەو تۆڵدار بوونە} وشەی (مِتُّ) خوێنراویشەتەوە: (مُتُّ) هەر دوو خوێندنەوەکەش یەك واتایان هەیە.

٥)- ﴿ وَكُنتُ نَسۡيٗا مَّنسِيّٗا ﴾، هەر لە بیرکراوو نەبوو، بوومایە، خوێنراویشەتەوە: (نِسْیاً مُنسِیّاً)، (نَسْیاً ونِسْیاً) هەردووکیان واتە: لە بیرکراوو فەرامۆشکراو، (نِسْیاً: شَيْئاً غَيْرَ مُتَذَكَّرٍ، نَسِيَهُ أَهْلُه وتركوه)، شتێك کە باس نەکرێ، یان یاد نەکرێ، شتێکی لە بیرکراو کە خەڵکەکەی لە بیریان کرد بێ و، وازیان لێ هێنابێ.

٦)- ﴿ فَنَادَىٰهَا مِن تَحۡتِهَآ ﴾، دوای ئەوەی مەریەم مردن بە ئاوات دەخوازێ و، دەڵێ: بریا شتێك بام هەر فەرامۆشکرابام و لە بیرکرابام، هەر نەزانرابام.

لە ژێــــریەوە بانگی کرد.

ئــەم وشــەیە وەك چــۆن بــە: (مِــنْ تحتِهــا) خوێندراوەتــەوە، یــانی: لــە ژێریــەوە، لــە ژێــر مەریەمــەوە، عیســا کــە لــە دامێنــی کەوتۆتــە خــوارێ، کۆرپەکــە لــە ژێریــەوە بــووە، خوێندراویشــەتەوە: (مَــنْ تَحْتَهــا) یــانی: ئــەو کەســەی کــە لــە ژێریــەوە بــووە، کــە دیســان دەگونجــێ مەبەســت پێــی عیســا بــێ، دەشــگونجێ لــە هــەردوو حاڵــدا، بــە هــەردوو جــۆرە خوێندنەوەکــە: مەبەســت پێــی جیبریــل بــێ، یــانی: جیبریــل لــە شــوێنێك بــووە لــە خــوار ئــەو شــوێنەوە کــە مەریــەم و عیســای لــێ بــوون، یاخــود: (مِنْ تَحْتِهَا) واتــە: ئــەو کەســەی کــە لــە ژێریــەوە بــووە، بەنسبەت شــوێنەکەیەوە، نــەك بــە نسبەت خۆیــەوە، واتــە: (مِنْ تَحْتِ مَكَانِ تَوَاجُدِهَا)، ئــەو کەســەی کــە لــە ژێریــەوە بــووە، بانگــی کــرد.

٧)- ﴿أَلَّا تَحْزَنِي﴾، کە خەمبار و دڵتەنگ مەبە.

(أَلاَّ تَحْــزَنِي) لــە ئەســڵ دا (أَنْ لاَ تَحْــزَنِي) بــووە کــە (أن التفســيرية)ی پێدەڵێــن، چونکــە ڕوونکردنەوەیــە بــۆ: (ناداهــا) واتــە: بانگکردنەکــەی بریتــی بــووە لــە: دڵتەنــگ مەبــە.

٨)- ﴿قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا﴾، بە دڵنیایی پەروەردگارت جۆگەلە ئاوێك، یان: کانیاوێکی هەڵقوڵاندوە و بۆتە جۆگەلە ئاوێك و لە ژێرتەوە دەڕوا.

یاخــود: (سَرِيّاً) بــە مانــای (پیــاوی مــەزن)ە، پیاوێــکی هەڵکەوتــوو، کــە عیســایە، بــەڵام زیاتــر واپێدەچــێ مەبەســت پێــی: (جۆگەلــە ئــاو) بــێ، چونکــە دوایــی بــاسی خواردنیــش دەکات.

٩)- ﴿وَهُزِّيٓ إِلَيْكِ بِجِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ﴾، بنکی دارخورمایەکە، قەدی دارخورمایەکە بەلای خۆتدا بجووڵێنە، (هُزِّي) واتە: (حرِّكِي، وَعُدِّي بـ (إلى) لتضمينهِ معنى التقريب والإِدْنَاء)، (هَزُّهُ) واتە: جووڵاندی، کە فەرموویەتی: (هُزِّي إِلَيْكِ) بە (إلى) گواستنەوەی پێکراوە بۆ بەرکار، بۆ ئەوەیە کە مانای: لە خۆ نیزیك خستنەوەی، بخرێتە نێو، واتە: ڕایوەشێنەو بەلای خۆتیشیدا بێنە.

١٠)- ﴿تُسَٰقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا﴾، فەریکە خورمای پێگەیشتوون بەسەردا دەخاتە خوارێ. ئەمە بە سێ جۆر خوێنراوەتەوە:

١- (تُسَاقِط عَلَيْكِ).

٢- (يُسَاقِط عَلَيْكِ).

٣- ( تَسَاقَط عَلَيْكِ).

بە هەر سێك جۆرەكەش، مانای ئەوەیە: ئەو دارخورمایە بەسەر تۆدا فەریكەی خورمای پێگەیشتوو دەبارێنێ، (الرُّطَب: ثَمْرٌ لَمْ يتِم جِفافُه) (رُطَبْ) خورمایەكە جارێ وشك نەكراوەتەوە و نەبۆتە خورمای تەواو، واتە: فەریكە خورما، (الجَني: فَعِيلٌ بِمَعْنى مفعول، أي: مُجْتَنَى) (جَني) كە بە مانای (مفعول)ە، یانی: چنراو، لێكراوە، واتە: خورمایەك كە بۆ خۆی دەكەوێتە خوارو لێدەبێتەوەو پێگەیشتوە.

١١)- ﴿ فَكُلِي وَٱشْرَبِي ﴾، ئنجا بخۆو بخۆوە، لە خورمایەكە بخۆو، لە جۆگەلە ئاوەكەش، كە لە كانیاوەكە هەڵقولاوە، بخۆوە.

١٢)- ﴿ وَقَرِّي عَيْنًا ﴾، دڵخۆشیش بەو، بێ خەم و خاترجەم بە.

١٣)- ﴿ فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلْبَشَرِ أَحَدًا ﴾، ئنجا ئەگەر یەكێكت بینی لە مرۆڤان.

١٤)- ﴿ فَقُولِيٓ إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَٰنِ صَوْمًا ﴾، بڵێ: من بۆ خوای خاوەن بەزەیی، ڕۆژووم لە خۆم گرتوە، وادیارە لە شەریعەتی پێغەمبەرانی پێشوودا، ڕۆژووگرتن وێڕای نە خواردن و، نە خواردنەوە، قسەنەكردنیشی لەگەڵدا بووە، یاخود: وێڕای ئەو ڕۆژووە گشتییەی كە ئێستا ئێمە دەیگرین، ڕۆژووی تایبەتیش هەبووە، كە قسەنەكردن بووە، بەڵام ئێستا قسەنەكردن بە خوا پەرستیی لە قەڵەم نادرێ، لە شەریعەتی پێغەمبەری خاتەم دا ﷺ.

١٥)- ﴿ فَلَنْ أُكَلِّمَ ٱلْيَوْمَ إِنسِيًّا ﴾، بە دڵنیایی من هەرگیز ئەمڕۆ قسە لەگەڵ هیچ مرۆڤێكدا ناكەم.

(إنسي) واتە: مرۆڤ، (إِنْسِي: إِسْمُ جَمْعِ إِنْسَانٍ) ناوی كۆیە بۆ مرۆڤ، یانی: ئەمڕۆ لەگەڵ هیچ مرۆڤێكدا قسە ناكەم، بێگومان حیكمەتی خوای كارزان لەوەدا ئەوە بووە، كە مەریەم تووشی شەڕە قسەو دم بە دمەو مشت و مڕ نەبێ، خۆی قسە نەكات و وەك دوایی لە ئایەتەكاندا دێ، عیسا ﷺ لە جیاتی دایكی قسە بكات.

لێرەدا لە باسی ئەوەدا، كە ڕۆژووگرتن لە شەریعەتی ئێمەدا، جگە لە خۆپاراستن لە خواردن و خواردنەوەدا و سەرجێیی، هەروەها خۆپاراستن لە گوناهە ڕواڵەتییەكان، شتێكی دیكەی تێدا بە مەرج نەگیراوە، ئەم فەرمایشتە دێنین:

[عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى شَيْخًا يُهَادَى بَيْنَ ابْنَيْهِ، فَقَالَ: «مَا بَالُ هَذَا»؟ قَالُوا: نَذَرَ أَنْ يَمْشِيَ، قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ عَنْ تَعْذِيبِ هَذَا نَفْسَهُ لَغَنِيٌّ»، وَأَمَرَهُ أَنْ يَرْكَبَ] (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ: ١٧٦٦ وَمُسْلِمٌ: ٤٣٣٦).

ئەنەس ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بە تەمەنی بینی لە نێوان دوو کوڕەکەیدا {واتە: خۆی دابووە سەر دوو کوڕەکەی و ئەولاو ئەولایان گرتبوو، قۆڵیان گرتبوو دەڕۆیشت} پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو پیاوە چیەتی؟ گوتیان: لەسەر خۆی پێویست کردوە، لە خۆی گرتوە کە بە پێیان بچێ (حەج بکات، یان عومرە بکات؟) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوا لە خۆ ئەزیەتدانی ئەو پیاوە، بێ نیازە و فەرمانی پێکرد: سوار بێ.

دیارە لە کاتی تەوافدا بووە، بەڵام نەیتوانیوە بۆ خۆی تەواف بکات و، دوو کوڕی کەوتوونە ژێر قۆڵی و گرتوویانە، ئنجا لە جیاتی ئەوەی خۆشی ئەزیەت بدات و ئەوانیش ئەزیەت بدات، با سوار بێ و بە سواریی تەواف بکات، وەك پێغەمبەر ﷺ جاری وابووە بە سواریی تەوافی کردوە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**هاتنەوەی مەریەم بە مەلۆتکەکەیەوە بۆ لای خەڵکەکەی و، سەرزەنشتکرانی لەلایەن خەڵکەکەوە، کە نەبابی پیاوێکی خراپ بوو، نە دایکی زیناکار بووە؟ کەواتە: ئەو منداڵەی لە کوێ بوو، بێ ئەوەی هاوسەرگیریی کردبێ؟ ئنجا ئاماژەکردنی مەریەم بە مەلۆتکەکەی (عیسا) کە لەگەڵی بدوێن و، سەرسوڕمانیان لەوە کە منداڵێکی نێو لانکە بیاندوێنێ!:**

خوا دەفەرموێ: ﴿فَأَتَتْ بِهِۦ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُۥ ۖ قَالُوا۟ يَـٰمَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْـًۭٔا فَرِيًّۭا ﴿٢٧﴾ يَـٰٓأُخْتَ هَـٰرُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمْرَأَ سَوْءٍۢ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّۭا ﴿٢٨﴾ فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ ۖ قَالُوا۟ كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِى ٱلْمَهْدِ صَبِيًّۭا ﴿٢٩﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿فَأَتَتْ بِهِۦ قَوْمَهَا﴾، واتە: مەریەم مەلۆتکەکەی هێنایەوە لای خەڵکەکەی.

(فَأَتَت بِهِ) ڕاناوەکە دەچێتەوە بۆ عیسا ، واتە: مەریەم عیسای بە مەلۆتکەیی، هێنایەوە بۆ لای خەڵکەکەی، دوای ئەوەی عیسای بووە، پێچاویەتەوەو هێناویەتەوە.

٢)- ﴿تَحْمِلُهُۥ﴾، واتە: بە ئاشکرا هەڵیدەگرت بە باوەشیەوە، خوا ﷻ بە (الفعل المضارع) هێناویەتی بۆ ئەوەی دیمەنەکەمان بۆ وێنا بکات، ئەوە مەریەمە خوا لێی ڕازیبێ، عیسای وەك مەلۆتکەیەك کە تازە بوویەتی و بە باوەشیەوە گرتوە، هێناویەتەوە بۆ لای خەڵکەکەی، واتە: بە ئاشکرا هەڵیگرتبوو، بەبێ باکیی و بێ منەتیی، چونکە ئەوەی پاکە، بێباکە.

٣)- ﴿قَالُوا۟ يَـٰمَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْـًۭٔا فَرِيًّۭا﴾، گوتیان: ئەی مەریەم! شتێکی ساختەت هێناوە، (فَرِي) واتە: شتێك کە هەڵبەسترا بێ، شتی ساختە، واتە: ئەو منداڵە منداڵێکی ڕاستەقینە نیە، کە لە باب و دایکێکی شەرعیی بووبێ، بەڵکو دیارە تۆ تووشیی هەڵەو داوێن پیسیی بووی و، ئەو منداڵەت پەیدابووە.

یاخود: (الفري: العجيب النادر)، واتە: شتی سەرسوڕهێنەرو دەگمەن، هەروەها (فري) بە مانای درۆش دێ، هەروەها (فري) بە مانای شتێك دێ، کە لە خراپیی و دزێوییدا

زۆر ناقولاَبێ، بێگومان مەبەستیان لێرەدا سەرزەنشتکردنی مەریەمە، هەر کام لەم واتایانە مەبەست بن، کە هەموویان لێك نیزیکن.

٤)- ﴿ يَٰٓأُخۡتَ هَٰرُونَ ﴾، ئەی خوشکی هاڕوون!

ئەمەش پێنج واتایان دەگەیەنێ:

**یەکەم:** لێرەدا بە توانج و تەوسەوە پێی دەڵێن، ئەی خوشکی هاڕوون! یانی: لە پاکیی و چاکیی دا.

**دووەم:** یان مەریەم برایەکی هەبووە، بە ناوی هاڕوون و وا پێدەچێ ئەو هاڕوونە پیاوێکی باش بووبێ، واتە: تۆ مادام خوشکی هاڕوونی، لێت نەدەوەشایەوە منداڵێك بەبێ باب پەیدا بکەی، بەبێ هاوسەرێکی شەرعیی!

**سێیەم:** یاخود لەبەرئەوەی مەریەم لە ڕووی ڕەچەڵەکەوە دەچێتەوە سەر هاڕوونی برای مووسا (عَلَيْهِما الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم).

هاڕوونیش پیاوێکی زۆر میهرەبان و خواپەرست بووە و، مەریەمیش بە هەمان شێوە، واتە: تۆ کە لەسەر مەشرەبی هاڕوون لە شێوەی وی دا بووی، لە دینداریی و خوا پەرستیی دا، ئەو منداڵەت لە کوێ بوو؟.

**چوارەم:** یاخود لەو ڕۆژگارەدا پیاوێك هەبووە بە ناوی هاڕوون و، پیاوێکی خوا پەرست و دیندار بووە، واتە: تۆ وەك ئەو هاڕوونە بووی لە دینداریی‌دا.

**پێنجەم:** یان پیاوێك هەبووە بە ناوی هاڕوون، پیاوێکی تاوانبار و خراپەکار بووە، واتە: ئایا تۆ لە گوناهو تاواندا چوویە سەر مەشرەبی ئەو هاڕوونە خراپە، کە ئەو منداڵەت بەبێ هاوسەر پەیدا کردوە!

٥)- ﴿ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمۡرَأَ سَوۡءٖ ﴾، بابی تۆ پیاوێکی خراپ نەبوو، (**السَّوءُ: مَصْدَرُ سَاءَهُ إذَا أضَرَّ بِهِ وَأَفْسَدَ بَعْضَ حَالِهِ**)، (**سَوْء**) چاوگە، (**سَاءَ، يَسوءُ، سَوْءً، فَهُوَ سَيئٌ**)، (**سَوء**) واتە: خراپەکاریی، لێرەدا مەبەستیان ئەوەبووە: بابت پیاوێکی خراپ نەبووە، بەڵام بە چاوگ هێناویانە بۆ زێدەڕۆیی کردن، (**سَوْء**) واتە: خودی خراپەکاریی.

٦)- ﴿ وَمَا كَانَتۡ أُمُّكِ بَغِيّٗا ﴾، دایکیشت داوێن پیس نەبوو.

(**بَغِي**) ئافرەتێکە بەدوای خەڵکدا بگەڕێ، داوێنپیسیی لەگەڵدا بکەن، واتە: نە بابت پیاوی خراپ بووە، نە دایکیشت بێ نامووس بووە، کەواتە: ئەو منداڵەت لە کوێ بووە، بەبێ ئەوەی کە هاوسەرگیریت کردبێ؟.

٧)- ﴿ فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ ﴾، مەریەم ئاماژەی بۆ مەلۆتکەکەی کرد، واتە: ئاماژەی بۆ کردن و حەواڵەی مەلۆتکەکەی کردن کە ئەو بدوێنن و ئەو بیاندوێنێ.

٨)- ﴿ قَالُوا۟ كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِى ٱلْمَهْدِ صَبِيًّا ﴾، بە سەرسوڕمانەوە گوتیان: چۆن کەسێك بدوێنین کە لە لانکەدایەو منداڵە!

وشەی (صَبِي) بۆ مەلۆتکەش بەکاردێ و، بۆ قۆناغەکانی دیکەش تاکو پێش باڵغ بوون، نێرینە پێی دەگوترێ: (صَبِي) و مێیینە پێی دەگوترێ: (صَبِيَّة) لێرەدا یانی: ئایا چۆن منداڵێکی نێو بێشکە، نێو لانکە بدوێنین؟! ئەوە پرسیارکردنی نکووڵییکەرانەیە.

کە گوتوویانە: ﴿ مَن كَانَ فِى ٱلْمَهْدِ صَبِيًّا ﴾، ئەمە زێدەڕۆییکردنە لە نکووڵییلێکردن و بۆ زیاتر وێناکردنی حاڵی ئەو مەلۆتکەیە، کە هەر لە لانکەو لە بێشکەدایە.

(المَهْد)یش بەو شوێنە دەگوترێ: کە مەلۆتکە، یان منداڵی گچکە لەسەری ڕادەکشێ، یاخود بۆی ئامادە دەکرێ، کە بە پێی باوو نەریتی کۆمەڵگاکان دەگۆڕێ: پێی دەگوترێ: لانکە و دەگوترێ: بێشکەو، پێی دەگوترێ: جۆلانە و، پێی دەگوترێ: قۆنداغ، گرنگ ئەوەیە (مهد) ئەو شوێنەیە کە منداڵی مەلۆتکەی لەسەر دادەنرێ و بۆی ئامادە دەکرێ.

**لێرەدا ئەم فەرموودەیە دێنین:**

**{عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى نَجْرَانَ، قَالَ: فَقَالُوا: أَرَأَيْتَ مَا تَقْرَءُونَ يَا أُخْتَ هَارُونَ، وَمُوسَى قَبْلَ عِيسَى بِكَذَا وَكَذَا؟ قَالَ: فَرَجَعْتُ فَذَكَرْتُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: أَلَا أَخْبَرْتَهُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا يُسَمُّونَ بِالْأَنْبِيَاءِ وَالصَّالِحِينَ قَبْلَهُمْ}، (أخرجه أحمد: ١٨٢٣٦، ومسلم: ٢١٣٥، والترمذي: ٣١٥٥، وابن حبان: ٦٢٥٠، والطبراني في الكبير: ٩٨٦)**

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی بۆ لای خەڵکی نەجران (کە نەصرانیی بوون)، پێیان گوتم: دەبینی ئێوە ئەو ڕستە قورئانییە دەخوێننەوە (یا أخت هارون) ئەی خوشکی هاروون! لە حاڵێکدا کە مووسا بە ئەوەندەو ئەوەندە پێش عیسا بووە، {واتە: مووساو هاروون زۆر پێش عیسا بوون، بەلای کەمەوە هەزار و پێنجسەد (١٥٠٠) ساڵێك پێش عیسا بوون}، ئەدی چۆن گوتراوە: خوشکی هاروون؟ {ویستوویانە: ڕەخنە لە قورئان بگرن} دەڵێ: منیش گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەوەم بۆ باسکرد، فەرمووی: دەبوایە هەواڵت پێدابان کە ئەوان عادەتیان وابوو، خەڵکی خۆیان بە ناوی پێغەمبەرانەوە و پیاوچاکانەوە، ناو دەنان.

واتـە: گوتوویانـە: ئـەی مەریـەم! تۆ لـە دینداریـی دا وەك و هـاڕوون وای، یاخـود هاڕوونێك هەبـووە لـەو ڕۆژگارەدا پیاوێـكی دینـدار و چـاك بـووە، كـە بـە نـاو هـاڕوونی بـرای مووسـا كراوەتـەوە، یانـی: فەرمایشـتەكەی پێغەمبـەر ﷺ دوو ئەگـەری هـەن:

أ- یان مەبەستی ئەوە بووە كە پیاوێك هەبووە لەو ڕۆژگارەدا بە ناوی هاڕوون، كە بە ناو هاڕوونی برای مووسا كراوەتەوە، هەرچەندە (١٥٠٠) ساڵ پێش ئەویش هەبووە.

ب- یاخود مەبەست لێی ئەوە بووە كە مەریەمیان بە خوشكی هاڕوون ناوناوە، لەبەر ئەوەی عادەتیان وابووە: خەڵكیان بە ناوی پێغەمبەران و پیاوچاكان و صاڵحانی پێشووەوە بانگكردوە و بە وانیان چواندوون.

ئەگەرنا مەبەسـتیان ئـەوە نەبـووە كـە مەریـەم خوشـكی هـاڕوونی بـرای مووسـا بـووە، كـە (١٥٠٠) سـاڵ لـەوە پێـش بـووە!

**مەسەلەی چوارەم:**

**قسـەکردنی عیسـا ﷺ و، خۆناسـاندنی بـەوە کـە بەنـدەی خوایـەو، خـوا کتێبـی پێـداوەو، کردوویەتـە پێغەمبـەر و، پیـت و پێـزی تێخسـتوە و ڕایسـپاردوە بـە نوێـژ و زەکات و چاکەکاریـی لەگـەڵ دایکی دا و، نەیگێـڕاوە بـە بابایـەکی خۆسـەپێن و بێمـرادو یاخیـی و، لـە ڕۆژی لـە دایـك بوونیـی و، مردنیـی و، زیندووکرانەوەیـدا، سـەلامی خـوای لەسـەرە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ قَالَ إِنِّي عَبْدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا ﴿٣٠﴾ وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا ﴿٣١﴾ وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا ﴿٣٢﴾ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا ﴿٣٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ قَالَ إِنِّي عَبْدُ ٱللَّهِ ﴾، دوای ئەوەی مەریەم ئاماژە دەکات بۆ مەلۆتکەکەی لە وەڵامی خەڵکەکەدا، کە ڕەخنەی لێدەگرن و سەرزەنشتی دەکەن و، بە کنارە و لەبەر ڕاهاویشتن پێی دەڵێن: تۆ داوێن پیسییت کردوە و، منداڵێکی بیژوو و زۆڵت لە باوەش گرتوە! کە ئاماژە دەکات بۆ مەلۆتکەکەی کە عیسایە ﷺ، یەکسەر لەسەر قۆنداغ دێتە قسە و دەڵێ: (قَالَ إِنِّي عَبْدُ ٱللَّهِ) گوتی: من بەندەی خوام.

**ئـەوە کـە عیسـا ﷺ بەنـدەی خوایـە، لـە زۆر شـوێنی قورئانـدا دووبـارە بۆتـەوە و، ئەوەش بـۆ بەرپەرچدانـەوەی ئـەو نەصرانییانەیـە کـە بـە خـواو، بـە کـوڕی خـواو بـە بەشـێك لـە خوایـان لـە قەڵـەم داوە، وەك لـە تەفسیری سـووڕەتی (آل عمـران) و، لـە تەفسـیری سـووڕەتی (النسـاء) و، لـە تەفسـیری سـووڕەتی (المائـدة)دا، کاتی خـۆی بـە تەفصیـڵ باسـمان کـردوە و دواتریـش بەبۆنـەی دیکـەوە بـاسی دەکەیـن.**

٢)- ﴿ ءَاتَىٰنِيَ ٱلْكِتَٰبَ ﴾، (خوا) کتێبی پێداوم، بێگومان جارێ ئەو منداڵە کە لەسەر قۆنداغە، کتێبەکەی لەلای نیە، بەڵام واتە: کتێبم پێدەدا، بەڵام ئایا بۆچی بە کرداری ڕابردوو هێناویەتی؟ یانی: مادام خوا فەرموویەتی، وەك تێپەڕیبێ و ڕابردبێ وایە و بە تەئکید دێتە دی، وەك بەڵێن بە کەسێك دەدەی - ئەوە لە عورف و باوی هەموو میللەتاندا هەیە - ئەو کەسە بۆ ئەوەی دڵنیابێتەوە دەڵێ: دڵنیا بم؟ تۆش دەڵێی: بوو، بە عەرەبیی دەڵێن: (صار) واتە: شتەکە بوو،

تێپەڕی، یانی: هەر چەندە جارێ نەبووە، بەڵام دڵنیایە لە داهاتوودا ئەو شتە دەبێ، یان کەسێك گفتی پێدانی شتێك بۆ وێنە: پارەیەك بە کەسێك دەدات، بۆ دڵنیاکردنەوەی دەڵێ: وابزانە لە دەستت دایە، یان وابزانە لە گیرفانتدایە، (ءَاتَىٰنِيَ ٱلۡكِتَٰبَ)، واتە: خوا بڕیاری داوە: کتێبم پێبدات و، مەبەستیش لەو کتێبە (إنجیل)ە، دەشگونجێ مەبەست پێی: (تەورات)یش بێ، چونکە عیسا ﷺ هەر کام لە تەورات و ئینجیلی فێرکراون، دەشگونجێ مەبەست پێی جینسی (کتاب) بێ، واتە: خوا جینسی کتێبی بە من داوە، ئەو کتێبەی کە پێویست بووە، هەم تەورات کە شەریعەتی تێدایە، هەم ئینجیل کە کۆمەڵێك ئامۆژگاریی و ڕێنمایی تێدان و، کۆمەڵێك ڕاستکردنەوەی تێدان بۆ هەندێك کەم و کوڕیی و زێدەڕۆیی کە جوولەکەکان خستوویانەتە نێو تەوراتەوە.

٣)- ﴿وَجَعَلَنِي نَبِيّٗا﴾، هەروەها منی بە پێغەمبەر گێڕاوە، کردوومی بە پێغەمبەر.

(نبيّ) کە خوێنراویشەتەوە: (نبيءُ) کە (فعيل)ە، بە مانای (مفعول)، واتە: هەواڵ پێدراو، یانی: خوا هەواڵی تایبەتییم پێدەدا، سروشم بۆ دەکات.

یاخود (نبي) (فعيل)ی بە مانای (فاعل)ە، واتە: (مُنبِئ) هەواڵدەر، کە بە ناوی خواوە هەواڵ دەدەم، هەواڵی تایبەت بە هۆی وەحییەوە.

٤)- ﴿وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيۡنَ مَا كُنتُ﴾، هەروەها گێڕاویشمی بە بابایەکی موبارەك، لە هەرجێیەك بم، (مبارك) یانی: بەرەکەتدار، پێزدار، بەرهەمدار، (المبارك: إسم مفعول مِنْ بَارَكَهُ: إذا جَعَلَهُ ذَا بَرَكَةٍ، وَالبَرَكَةُ: الخَيْرُ وَاليُمن)، (مُبَارَك) ناوی بەرکارە لە (بَارَكَهُ، يُبَارِكُهُ فَهُوَ مُبَارَك) واتە: بەرەکەتداری کرد، بەرەکەتیش بریتیە لە چاکەو پیت و پێز و بەرهەم.

٥)- ﴿وَأَوۡصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ﴾، هەروەها منی ڕاسپاردوە بە نوێژکردن و، زەکات دان تاکو لە ژیاندابم، تاکو زیندووبم، (الوِصَايَة: الأَمْرُ المؤَكَّدُ بعَمَلٍ مُسْتَقْبَلٍ) (وِصَايَة) بریتیە لە فەرمانێکی جەخت لەسەرکراو، بە کارێك کە لە داهاتوودا ئەنجام دەدرێ.

٦)- ﴿مَا دُمۡتُ حَيّٗا﴾، واتە: تاکو لە ژیاندا بم، دەبێ نوێژ بەرپا بکەم و زەکات بدەم، یانی: مافی خواو مافی خەڵك جێ بەجێ بکەم، یان: لە ڕووی مەعنەویی و ماددییەوە، دینداریی و بەندایەتیی بۆ خوا ئەنجام بدەم.

٧)- ﴿وَبَرَّۢا بِوَٰلِدَتِي﴾، هەروەها خوا منی ڕاسپاردوە بە چاکەکردن لەگەڵ دایکم.

بابی نەبووە و بەس دایکیەتی، کەواتە: ئەو چاکەیەی کە لەگەڵ بابیش دا دەکرێ، دەبێ بیگوازێتەوە بۆ دایکی، چونکە دایکی تاکە سەرچاوەی پەیدابوونیەتی.

(بَرّ: اسم بمعنى البَارّ) یانی: (بَرّ) ناوە بە مانای (بار) چاکەکار، بەڵام ماناکەی بەهێزترە، چونکە لە چاوگەوە نیزیکە و، ئەو وشەیە بۆ خوا پەروەردگاریش بەکارهاتووە، وەك یەکێك لە سیفەتەکانی، لە سوورەتی (الطور)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْبَرُّ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٨﴾﴾، واتە: بێگومان خوا زۆر چاکەکاری میهرەبانە.

٨)- ﴿وَلَمْ يَجْعَلْنِى جَبَّارًا شَقِيًّا﴾، خوا منی نەگێڕاوە بە بابایەکی خۆسەپێنی ملهوڕ و زیانبار و بێمراد.(الجبّار: المتكبّر الغليظ عَلَى النّاسِ فِي مُعَامَلَتِهِم) واتە: خۆ بە زلگری زبر لە مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا.

وشەی (شقي) بە مانای زیانبار و، بە مانای نەگبەت و، بە مانای بێ خێر، دێ، هەروەها بە مانای بێمرادو بێ ئاکامیش دێ، (شقي) پێچەوانەی (سعید)ە، (سعید) واتە: بەختەوەر و سەرفراز (شقي)یش پێچەوانەکەیەتی.

٩)- ﴿وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىَّ﴾، هەروەها سەلامم لەسەر بێ.

١٠)- ﴿يَوْمَ وُلِدتُّ﴾، ئەو ڕۆژە کە تێیدا لە دایك بووم.

١١)- ﴿وَيَوْمَ أَمُوتُ﴾، هەروەها ئەو ڕۆژە کە تێیدا دەمرم.

١٢)- ﴿وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا﴾، ئەو ڕۆژەش کە بە زیندوویی تێیدا هەڵدەستێنرێمەوە.

وشەی (سلام) لێرەدا بە ناسێنراو (مُعرَّف) هاتووە، بەڵام هی (یحیی) بە نەناسراو (نکرة) هاتبوو: (وسلام علیه...) ﴿وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا ﴿٣٣﴾﴾، ئنجا لێرە کە (السلام) بە (أل)ی (تعریف) هاتووە، مانای جینس دەگەیەنێ، واتە: هەموو سەلام و خێر و خۆشیی و ئاشتییەك لەسەر من، ئەمەش لێی وەردەگیرێ کە عیسا ﷺ پایەی بەرزتر بووە لە یەحیا ﷺ، کە ئەمە یەکێکە لە بەڵگەکان و بەڵگەی دیکەش هەن، یەکێکی دیکە لە بەڵگەکان، ئەوەیە کە عیسا ﷺ، کتێبی پێدراوە، بەڵام یەحیا ﷺ، نەزانراوە کتێبی پێدرابێ[1].

ئنجا کەی سەلام لەسەر عیسا بێ؟

أ- ڕۆژی لە دایك بوون.

ب- ڕۆژی مردن.

ج- ڕۆژی تێدا زیندووبوونەوە.

---

(١) ئەو دوو کتێبەی (صابئە)ی (مندائي): (کَنزا ربّا) و (تعالیم ومواعظ یحیی بن زکریا) هیچ بەڵگەیەك نیە دڵنیامان بکات کە کتێبی خوان، وەك لە: (مەوسووعەی ئیمان و ئیلحاد)دا قسەمان لەبارەیانەوە کردوە.

ئەم سێ کاتە، سێ کاتی زۆر چارەنووسسازن، لە ژیانی هەر کەسێکدا، ئەو ڕۆژەی کە تێیدا دێتە دنیاوە و، ئەو ڕۆژە کە دنیا بەجێدێڵێ و، ئەو ڕۆژە کە تێیدا زیندوودەبێتەوە، ئەگەر لەو سێ کاتەدا، ئەو مرۆڤە سەلامەتیی لەسەربێ، مانای وایە بەختەوەرە و لەخەم ڕەخسیوە. (سلام)یش ئاشتیی و سەلامەتیی و بێ بەڵاییەو، سەلام (سەلامی) خوایە لێرەدا، (وسلام عليّ) واتە: (سلام من الله علي) واتە: سەلامی خوا لەسەر من بێ، ئنجا چ مەبەست پێی سڵاوکردنی خوا بێ، چ مەبەست لە سەلام، مانا زمانەوانییەکەی بێ واتە: ئاشتیی و سەلامەتیی، کەسێك خوا سڵاوی لێبکات، هەر سەلامەت دەبێ، هەروەها کەسێك ئاشتیی و سەلامەتیی لەسەر بێ، سەرفراز و بێ بەڵا دەبێ.

بۆچی ئەو سێ کاتە، بەتایبەت؟!

چونکە جوولەکەکان عیسا ﷺیان تۆمەتبار دەکرد لەو سێ کاتەدا، دەیانگوت:

١- لە دایك بوونی خراپ بووە و بە شێوەی زۆڵ و بیژوو لە دایك بووە، چونکە عیسا بابی نەبوو، جوولەکەکانیش نکووڵییان لەوە دەکرد کە بە فەرمانی ڕاستەوخۆی خوا دروست بوو بێ و دەیانگوت: بیژوو و زۆڵە.

٢)- هەروەها تۆمەتباریان دەکرد بە مردن و دەیانگوت: لە سێدارە دراوە، لە خاچ دراوە و هەڵواسراوە، کە ئەوەش ڕاست نیە و، ئەوەی لە خاچ و سێدارە دراوە، وەك پێشتر باسمانکردووە لە تەفسیری سوورەتەکانی: (آل عمران والنساء والمائدة)دا، ئەو سیخوڕە بوو بە ناوی (يهوذا الأسخريوطي) کە لە بەرانبەر چەند درەمێکدا، لە بەرانبەر هەندێك پارەدا، شوێنی عیسا ﷺو، ئەو هاوەڵانەی کە لەگەڵی دابوون، بۆ ڕۆمانەکان و جوولەکەکانی ئاشکرا کرد، بەڵام خوا عیسای بەرزکردەوە و سەرەنجام شێوەی عیسا ﷺ برایە سەر (يهوذا) و (يهوذا)یان لەدار دا، بۆیە ئەوەشیان ڕاست نیە.

٣)- دەشیانگوت: ئەو ڕۆژەش کە عیسا زیندوو دەکرێتەوە، لەگەڵ کافراندا زیندوو دەکرێتەوە، لێرەشدا خوا بەرپەرچی ئەوەشیان دەداتەوە، کە نەخێر سەلامی خوای لەسەربێ، لە ڕۆژی زیندووکرانەوەشدا.

ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە کە ئەم وتووێژو قسەو باسەی عیسا ﷺ لێرەدا، لە چوار ئینجیلەکاندا (متّى، لوقا، مَرقُس، يُوحَنّا) لە هیچ کامێکیاندا نەك هەر نەهاتوە، بەڵکو ئاماژەشی پێنەکراوە، کە من بە وردیی خوێندوومنەوە.

ئنجا ئەوەی لەم چوار ئایەتەدا: (٣٠، ٣١، ٣٢، ٣٣) هاتوە، زۆر زۆر گرنگە و پایەو پێگەی عیسا ﷺ زۆر بەرز پێشان دەدات، کەچی لە چوار ئینجیلەکاندا نەهاتوە، هەڵبەتە ئەم ڕاستییە و گەلێك ڕاستیی دیکەش، چ لە ئینجیلەکان دا، چ لە تەورات و کتێبەکانی دیکەشدا، کە لەبەردەستی خاوەن کتێبەکاندان، یان لە بیرکراون، یان گۆڕدراون.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**خوای زاناو توانا ڕایدەگەیەنێ کە ئەوەی باسیکراو، ناسێنرا بەو شێوەیە، ئا ئەوە عیسای کوڕی مەریەمە، کە قسەی هەقی خوایە، چونکە بە فەرمایشتی ڕاستەوخۆی خوا دروست بووە، بەبێ پێکەوە جووت بوونی ژن و مێرد، کە چێ ئەوان تێیدا دوودڵن، بەڵام خوا پاکە لەوەی ڕۆڵەی هەبێ و، هەرچی ویستی بێ، یەکسەر پەیدادەبێ، هەروەها عیسا ڕایگەیاند کە پەرستنی پەروەردگار، ڕاستە شەقامی خوایە، هەر ئەو بپەرستن و بەندایەتیی تەنیا بۆ وی بکەن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَۖ قَوۡلَ ٱلۡحَقِّ ٱلَّذِي فِيهِ يَمۡتَرُونَ ﴿٣٤﴾ مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓۚ إِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٣٥﴾ وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ﴿٣٦﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەو ئایەتانە لە حەوت (٧) بڕگەدا:

١)- ﴿ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَۖ﴾، ئا ئەوە عیسای کوڕی مەریەمە، واتە: ئەوەی کە باسکرا و، ئەوەی بەو شێوەیە خۆی ناساند، ئا ئەوە عیسای کوڕی مەریەمە، یاخود ئەوەی باسکرا: ئا ئەوە چییەتی و حەقیقەتی عیسای کوڕی مەریەمە و پێناسەکەیەتی.

٢)- ﴿قَوۡلَ ٱلۡحَقِّ ٱلَّذِي فِيهِ يَمۡتَرُونَ﴾، فەرمایشتی هەق کە تێیدا دوودڵن، (يَمۡتَرُونَ) واتە: (يَشُكُّونَ: الإِمْتِرَاءُ الشَّكُّ) واتە: تێیدا دوودڵن، کە دەفەرموێ: (قَوۡلَ ٱلۡحَقِّ) واتە: عیسا ﷺ قسەی هەقە، فەرمایشتی هەقە، واتە: فەرمایشتێکە پاڵدراوەتە لای هەق، (حق) مەبەست پێی خوایە ﷻ، واتە: قسەی خوایە، چونکە بە فەرمانی ڕاستەوخۆی خوا دروست بووە، وەك لە شوێنێکی دیکە دەفەرموێ: ﴿وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ ﴿١٧١﴾﴾النساء، فەرمایشتی خوا بوو بۆ مەریەمی هاویشت، یانی: خستیە نێو منداڵدانی مەریەمەوە.

خوێندراویشەتەوە: (قَوْلُ الحَقِّ) کە ئەگەر (قَوْلُ الحَقِّ)بێ، ئەوە خەبەری دووەمە بۆ ناوی ئاماژە کە پێشێ هاتوە: (ذَٰلِكَ)، یاخود وەسفە بۆ عیسا، یاخود بەدەلە بۆ عیسا، بەڵام ئەگەر (قَوۡلَ ٱلۡحَقِّ)بێ، ئەوە حاڵە بۆ ناوی ئاماژە کە دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَۖ قَوۡلَ ٱلۡحَقِّ ﴿٣٤﴾﴾، واتە: لە حاڵێك دا کە قسەی خوا هەقە، یاخود حاڵە

بۆ عیسا ﷺ واتە: لە حاڵێکدا ئەو عیسایە کە فەرمایشتی خوای هەقە، دەشگونجێ (قَوْلَ ٱلْحَقِّ) یان (قولُ الحقِّ) مەبەست پێی عیسا ﷺ نەبێ بەڵکو یانی: کۆی ئەو قسەو باسە کە لە چوار ئایەتی ڕابردوودا هات، ئەوە ئەو فەرمایشتە هەقەیە کە ئەوان تێیدا دوودڵن.

٣)- ﴿ مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍ سُبْحَٰنَهُۥٓ ﴾، ناگونجێ خوا ڕۆڵە بگرێ بۆ خۆی، پاکیی بۆ وی.

کە دەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍ ﴾، (هَذا انْتِفاءُ لِلْوَلَدِ لَهُ سُبْحانَهُ بِأَبْلَغِ وَجْهٍ، لأنَّ لامَ الجُحودِ تُفيدُ مُبالَغَةَ النَّفي) ئەمە بۆ لابردنی ڕۆڵە لە خوا، زێدەڕۆیی زیاتری تێدا هەیە و، ماناکەی بەهێزترە لەوەی کە بفەرموێ: (مَا اتَّخَذَ اللّهُ وَلَداً) چونکە (مَا كَانَ لله..) یانی: هەر ئەصڵەن ناگونجێ و نالوێ و شایستە نیە بۆ خوا کە هیچ جۆرە ڕۆڵەیەکی هەبێ، ئەم (مِنْ)ەش کە چووەتە سەر (ولد) واتە: هیچ جۆرە ڕۆڵەیەکی هەبێ بە هیچ تەئویلێك.

٤)- ﴿ سُبْحَٰنَهُۥٓ ﴾، واتە: (تَنَزَّهَ وتَقَدَّسَ عَنْ مَقَالَتِهِم تِلْكَ) واتە: خوا پاکە و بێگەردە، دوورە لەوەی کە ئەوان دەیڵێن.

٥)- ﴿ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾، هەر کاتێ بڕیاری کارێکی دا، (إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا) یانی: (إذَا قَرَّرَ إِيْجَادَ شَيءٍ) هەر کاتێ بڕیاریدا شتێك پەیدا بکات، (فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ) بەس پێی دەفەرموێ: ببە، یەکسەر دەبێ.

کەواتە: پێویستیی بەوە نیە ڕۆڵەی هەبێ، هەر شتێکی بیەوێ، یەکسەر پەیدادەبێ، مرۆڤ بۆیە پێویستیی بە ڕۆڵە و وەچە هەیە، چونکە لەو ڕێیەوە، بوونەکەی بەردەوام دەبێ، بەڵام خوا ﷻ هەر شتێکی بیەوێ، یەکسەر پەیدای دەکات.

٦)- ﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ ﴾، بە دڵنیایی خواش پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەشە، هەر ئەو بپەرستن.

ئەمەش دوو خوێندنەوەی هەن: أ- (وَإِنَّ اللّه). ب- (وَأَنَّ اللّه)

کە هەردووکیان یەك واتایان هەیە، ئنجا ئەمە دەگونجێ هەر قسەی عیسا ﷺ بێ، ئەوەی دیکە کە خوا فەرمووی: ﴿ ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ قَوْلَ ٱلْحَقِّ ٱلَّذِى فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴿٣٤﴾ مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍ سُبْحَٰنَهُۥٓ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٣٥﴾ ﴾، ئەوە هەمووی فەرمایشتی خوا بوو، نێواخنی کرد بوو لەگەڵ قسەکانی عیسادا ﷺ.

هەروەها دەشگونجێ کە ئەمە بگەڕێتەوە بۆ سەر: ﴿ وَأَوْصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا ۝٣١ ﴾، وەك چۆن ڕایسپاردووم بە نوێژو بە زەكات تاكو لە ژیاندا مابم، هەروەها ڕاشیسپاردووم ڕابگەیەنم كە: ئەو پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەشە و تەنیا بەندایەتیی بۆ وی بكەن.

٧)- ﴿ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴾، ئا ئەمە ڕێی ڕاستە، ئەوە كە خوا بە تاكە پەروەردگاری هەموو لایەك دابنرێ، هەر ئەوە ڕێی ڕاست و، ڕاستە شەقامێكە كە دەبێ پێیدا بڕۆین.

**مەسەلەی شەشەم:**

**باسی ڕاجیایی کۆمەڵ و تاقمەکانی دوای عیساو، سزای سەختیان و، ترساندنیان لە ڕۆژی پەشیمانیی و، ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە، کە تەنیا خوا میراتگری زەمین و دانیشتووانیەتی:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱخۡتَلَفَ ٱلۡأَحۡزَابُ مِنۢ بَيۡنِهِمۡۖ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن مَّشۡهَدِ يَوۡمٍ عَظِيمٍ ٣٧ أَسۡمِعۡ بِهِمۡ وَأَبۡصِرۡ يَوۡمَ يَأۡتُونَنَاۖ لَٰكِنِ ٱلظَّٰلِمُونَ ٱلۡيَوۡمَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ٣٨ وَأَنذِرۡهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡحَسۡرَةِ إِذۡ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَهُمۡ فِي غَفۡلَةٖ وَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ٣٩ إِنَّا نَحۡنُ نَرِثُ ٱلۡأَرۡضَ وَمَنۡ عَلَيۡهَا وَإِلَيۡنَا يُرۡجَعُونَ ٤٠ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ فَٱخۡتَلَفَ ٱلۡأَحۡزَابُ مِنۢ بَيۡنِهِمۡ ﴾، ئنجا کۆمەڵەکان لە نێوخۆیان دا کەوتنە ناکۆکییەوە.

(أحزَاب) کـۆی (حِزْب)ە، (حِزْب) هـەر کۆمەڵـە خەڵکێکـە هاوفیکـر بـن، هاومەشرەب بـن، بـۆ مەبەسـتێك کۆببنـەوە، واتـە: کۆمەڵـەکان لـە نێـو خۆیانـدا کەوتنـە ناکۆکیـی و ڕاجیاییـەوە، یـانی: لـە ڕاسـتە شـەقام لایانـداو کەوتنـە نێـو باتڵاغـی ناکۆکیـی، واپێدەچـێ لێـرەدا مەبەسـت لـە (الأحـزاب) ئـەو پێـڕو تاقمانـەی نەصڕانییـەکان بـن، واتـە: شـوێنکەوتووانی عیسـا ، دوای ئـەوەی لـە ڕاسـتە شـەقامی وی کـە بـۆی خسـتنەڕوو، کـە گـوتی: ﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ٣٦ ﴾، واتـە: تەنیـا خـوا پـەروەردگاری مـن و ئێوەشـە تەنیـا بەندایەتیـی بـۆ وی بکـەن و بـەس ئـەو بپەرسـتن، ئـا ئـەوە ڕاسـتە شـەقامە.

کاتێـك لـەو ڕاسـتە شـەقامەی کـە عیسـا بـە بەنـدەی خـواو، خـوا بـە تاکـە پـەروەردگار و پەرسـتراو، بزانـن، لایانـدا، کەوتنـە ناکۆکیـی و ڕاجیاییـەوەو پەرتـەوازە بـوون.

دەشـگونجێ (الأحـزاب) مەبەسـت پێـی جوولەکـەو نەصڕانییـەکان و غەیـری ئەوانیـش بـێ، ئەوانـەی بڕوایـان بـە هیـچ کام لـە پێغەمبـەران (عَلَيْهِـم الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) نەبـووە و، بڕواشـیان بـەوە نەبـووە کـە خـوا وەحیـی و پەیـام بـۆ پێغەمبـەران بنێـرێ، بـەڵام زیاتـر واپێدەچـێ مەبەسـت پێـی پێـڕو تاقمـەکانی نەصڕانییـەکان بـێ.

٢)- ﴿ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، سزای سەخت بۆ ئەوانەی بێبڕوا بوون.

٣)- ﴿ مِن مَّشۡهَدِ يَوۡمٍ عَظِيمٍ ﴾، لە دیداری ڕۆژێکی مەزن. (المَشْهَد: مُشتقٌ مِنَ المُشَاهَدةِ أو الشُهودِ وَهُوَ مَصْدَرٌ مِيمي، أو اسم مَكَانٍ أو زَمَانٍ)، (مَشْهَد) وەرگیراوە لە (مُشاهَدَة) واتە: بینین، یاخود (شهود) واتە: ئامادەبوون، کە ئەویش چاوگێکی میمییە، یان ناوی شوێنە، یاخود ناوی کاتە، کەواتە: (مِن مَّشۡهَدِ يَوۡمٍ عَظِيمٍ) یانی:

أ- لە ئامادەبوونی ڕۆژێکی مەزندا.

ب- یاخود لە شوێنێك کە ڕۆژێکی مەزنی تێدا دێ.

ج- یاخود لە کاتێکدا کە ڕۆژێکی مەزنی تێدا بێ.

٤)- ﴿ أَسۡمِعۡ بِهِمۡ وَأَبۡصِرۡ ﴾، چەند بیسەرن و چەند بینەرن؟ ئەم دووانە: (صِيغَتَا تَعجُبٍ والمقصود هنا: التعجيب)، ڕێژگەی سەرسوڕمانن، بەڵام مەبەست پێیان سەرسوڕماندنە، واتە: سەرت سوڕ بمێنێ لێیان، چەند چاك دەبیستن لە ڕۆژی دواییدا و، چەند چاك دەبینن، هەموو ئەو ڕاستییانەی کە لە دنیادا نەیاندەدیتن و نەیاندەبیستن، لەوێ چاکیان دەبیستن و دەبینن.

٥)- ﴿ يَوۡمَ يَأۡتُونَنَا ﴾، ئەو ڕۆژەی کە دێنە لامان [زۆر باش دەبیستن و زۆر چاکیش دەبینن].

٦)- ﴿ لَٰكِنِ ٱلظَّٰلِمُونَ ٱلۡيَوۡمَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴾، بەڵام ستەمکاران ئەمڕۆ لە گومڕاییەکی ڕوون و بێ چەندو چوون دان.

(لَٰكِنِ) لێرەدا بۆ (إستدراك)ە، واتە: قسەیەك کرابێ و، دوایی تۆ قسەیەکی دیکەی بۆ زیاد یان لێ کەم بکەی، (إِسْتِدْرَاكٌ عَمَّا يُفِيدُهُ يَوْمَ يَأْتُونَنَا، بِأَنَّهُم اليَوْمَ أَيْضاً فِي عَذَابٍ وَضَلَالٍ).

(لکن) لێرەدا بۆ (خستنەگەڵ) یان (لێ کەمکردن)ی قسەکەی پێشەوەیە یانی: وەنەبێ ئەوان ڕۆژێك کە دێنە خزمەت خوا (لە قیامەت دا) کە چاك دەبیستن و چاك دەبینن، ئێستاش لە دنیادا هەروابن، بەڵکو ئەوان: ئەمڕۆ لە گومڕاییەکی ئاشکرادان.

٧)- ﴿ وَأَنذِرۡهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡحَسۡرَةِ ﴾، هەروەها بیانترسێنە لە ڕۆژی خەفەت و داخ و پەشێمانیی، (الحَسْرَةُ: النَّدَامَةُ الشَّدِيْدَة)، (حَسْرَة) پەشێمانییەکی زۆرە، دەگوترێ: (حَسَرَ عَنْ ذِرَاعيهِ) واتە: قۆڵی هەڵکرد، لەبەر ئەوەی ئەگەر پۆشاکەکەی لادا، قۆڵی دەردەکەوێ، (حسير) واتە: ماندووبوونێك کە مرۆڤ بڕست و توانای نەما بێ، (يَوۡمَ ٱلۡحَسۡرَةِ) یانی: ڕۆژێکی پەشێمانیی کە ئینسان دەستی لە هەموو پچکان بڕا بێ و، بە هیچ شتێك ڕانەگات و، دەستی نەگاتە هیچ شوێنێ.

٨)- ﴿ إِذۡ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ﴾، بیانترسێنەو وشیاریان بکەوە بە ڕۆژی پەشێمانییەکی زۆر سەخت و بێزار: کاتێك کە بڕیاردرا، کارەکە تێکدەپەڕێ، کە مەبەست پێی ڕۆژی دوایییە.

٩)- ﴿ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ ﴾، لە حاڵێکدا کە ئەوان ئێستا لە بێ ئاگاییدان.

١٠)- ﴿ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، ئەوان ئێستا بڕوا ناهێنن، یانی: هەرچەندە ڕۆژێکی ئاواش چاوەڕێیان دەکات کەچی لە جیاتی هۆشیاریی، بێ ئاگان و، لە جیاتی بڕواداریی، بێبڕوان، ئەو ڕۆژە سەخت و دژوارەش چاوەڕێیان دەکات.

(وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ) ئەم تەعبیرە زێدەڕۆیی زۆری تێدایە واتە: نەك هەر بێ ئاگان، بەڵكو لە بێ ئاگاییدا نوغرۆ و نوقم بوون.

١١)- ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَرِثُ ٱلْأَرْضَ وَمَنْ عَلَيْهَا ﴾، بە دڵنیایی تەنیا ئێمە زەوی و، هەر کەس کە لەسەریەتی، بە میراتی دەگرین.

یانی: ئەو کەسانەی لەسەر زەوییەن بە میراتیان دەگرین، واتە: دێنەوە لای ئێمە، (الإِرْثُ: مَصِيرُ حَالِ المَيِّتِ إِلى مَنْ يَبْقَى بَعْدَهُ)، (إرث) بریتییە لە ماڵ و سامانی بابای مردوو کە دەچێ بۆ ئەو کەسەی، لە دوایی وی دەمێنێ بە زیندوویی.

ئنجا لەبەر ئەوەی خوا ﷻ بەس خۆی دەمێنێ، دوای ئەوەی کە زەوی لە بەین دەچێ و هەموو ئەوانەی کە لەسەر زەویین دەفەوتێن، کەواتە: خوا میراتگرە، هەم بۆ زەوی و هەم بۆ خەڵکی سەر زەوی.

١٢)- ﴿ وَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴾، واتە: تەنیا بۆ لای ئێمەش دەگێڕدرێنەوە، نەك بۆ لای جگە لە ئێمە، لە زمانی عەرەبییدا کاتێك کە (الجارّ والمجرور) دەخرێنە پێش: (الفعل و الفاعِل) مانای کورت هەڵهێنان دەگەیەنی، واتە: تەنیا بۆ لای ئێمە دەگێڕدرێنەوە.

با لێرەدا ئەم قسەیە لە (قتادة)ەوە بێنین:

(عَنْ قَتَادَةَ فِي قَوْلِهِ: ﴿ ...قَوْلَ ٱلْحَقِّ ٱلَّذِى فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾، قَالَ: اجْتَمَعَ بَنُو إِسْرَائِيلَ وَأَخْرَجُوا مِنْهُمْ أَرْبَعَةَ نَفَرٍ، مِنْ كُلِّ قَوْمٍ عَالِمَهُمْ، فَامْتَرَوْا فِي عِيسَى حِينَ رُفِعَ، فَقَالَ أَحَدُهُمْ: هُوَ اللَّهُ هَبَطَ إِلَى الأَرْضِ، وَأَحْيَا مَنْ أَحْيَا، وَأَمَاتَ مَنْ أَمَاتَ، ثُمَّ صَعِدَ إِلَى السَّمَاءِ، وَهُمُ الْيَعْقُوبِيَّةُ.

فَقَالَتِ الثَّلاثَةُ: كَذَبْتَ، ثُمَّ قَالَ اثْنَانِ مِنْهُمْ لِلثَّالِثِ: قُلْ فِيهِ، فَقَالَ: هُوَ ابْنُ اللَّهِ، وَهُمُ النَّسْطُورِيَّةُ. فَقَالَ الاثْنَانِ: كَذَبْتَ، ثُمَّ قَالَ أَحَدُ الاثْنَيْنِ لِلآخَرِ: قُلْ فِيهِ، فَقَالَ: هُوَ ثَالِثُ ثَلاثَةٍ، اللَّهُ إِلَهٌ، وَعِيسَى إِلَهٌ، وَأُمُّهُ إِلَهٌ، وَهُمُ الإِسْرَائِيلِيَّةُ، وَهُمْ مُلُوكُ النَّصَارَى، فَقَالَ الرَّابِعُ: كَذَبْتَ، هُوَ

عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ وَرُوحُهُ مِنْ كَلِمَتِهِ، وَهُمُ الْمُسْلِمُونَ، فَكَانَ لِكُلِّ رَجُلٍ مِنْهُمْ أَتْبَاعٌ عَلَى مَا قَالَ فَاقْتَتَلُوا، فَظَهَرُوا عَلَى الْمُسْلِمِينَ}[١].

قەتادە (کە یەکێکە لە زانایانی شوێنکەووتوانی هاوەڵان خوا لە هەموویان ڕازیبێ)، لە بارەی قسەی خوای بەرزەوە کە دەفەرموێ: ﴿...قَوْلَ ٱلْحَقِّ ٱلَّذِي فِيهِ يَمْتَرُونَ ٣٤﴾، دەڵێ: جوولەکەکان دوای بەرزکرانەوەی عیسا ﷺ کەوتنە دوودڵییەوەو کۆبوونەوەو، چوار کەسیان لە زانایان لە نێو خۆیاندا هەڵبژارد کە قسە بکەن {ئایا عیسا کێ بوو؟ چی بوو؟ چۆن بوو؟}

١)- یەکێکیان گوتی: عیسا خوا بوو، هاتە سەر زەوی، ئەوەی کە زیندووی کردەوە زیندووی کردەوە و، ئەوەی مراندی مراندی، دوایی بەرز بۆوە بۆ ئاسمان، ئەمانە لە نەصرانییەکان پێیان دەگوترێ: (اليعقوبية)[٢]، سێ زانایەکەی دیکە بەوەی یەکەمیان گوت: درۆ دەکەی، دوایی دووانیان بە سێیەمیان گوت: ڕات چییە، تۆ لە بارەی عیساوە قسە بکە؟

٢)- ئەویش گوتی: عیسا کوڕی خوا بوو، ئەوانیش پێیان دەگوترێ: (النسطورية)[٣]، دووەکەی دیکە بە ویشیان گوت: درۆ دەکەی، دوایی یەکێك لە دووەکان بەوی دیکەی گوت: تۆ ڕات چییە، قسەی لە بارەوە بکە؟

٣)- گوتی: عیسا سێیەمی سێیەکانە: خوا پەرستراوە، عیساش پەرستراوە، دایکیشی پەرستراوە، ئەوانیش (الإسرائيلية)ن[٤]، کە ئەوانەش دەستەڵاتدارانی نەصرانییەکانن، واتە: ئەوانە حوکمڕان بوون و باڵادەست بوون، بۆیە ئەو بیرۆکەیە تەبەنیی کرا، چوارەمیش بە سێیەمی گوت: درۆ دەکەی، بەڵکو بە هەڵەدا چووی.

٤)- چوارەم گوتی: بەڵکو عیسا بەندەی خوا بوو، پێغەمبەری خوا بوو، ڕووحێك بوو لە خواوە کە بە وشەی خۆی دروستی کرد بوو، ئەوانیش (مسوڵمانەکانن)، {واتە: ئەوانەن کە لەسەر ڕێی ڕاست بوون} ئنجا هەر کامێك لەو چوار زانایە، کە ئەو چوار هەڵوێستە جیاوازەیان هەبوون، شوێنکەوتووانی هەبوون و، لە بەینی خۆیاندا بوو بە شەڕ و کێشەو کوشتاریان و، سەرەنجام سێیەکەی دیکە بەسەر

---

(١ ) وَأَخْرَجَ ابْنُ الْمُنْذِرِ وَابْنُ أَبِي حَاتِمٍ، انظر: فتح القدير ج٣، ص٤٠٩ للشوكاني.

(٢) وا پێدەچێ ئەوەی کە بیرۆکەکەی تەبەنیی کردوە، زانایەکەیان ناوی (یەعقوب) بووە.

(٣) واپێدەچێ ئەو زانایەی کە ئەو ڕایەی تەبەنیی کردوە یەکەمجار ناوی (نسطور) بێ

(٤) وەکو گوتم: وا پێدەچێ ئەو زانایەی ئەو بیرۆکەی تەبەنیی کردوە ناوی (إسرائیل) بوو بێ، (إسرائیل) واتە: بەندەی خوا.

مسوڵماناندا سەرکەوتن {بیرە ڕاستەکە لە بەین چوو لەنێو نەصرانییەکاندا و ئەوە تەبەننیی کرا کە ئێستا باوە، ئەو ڕایە تەبەننیی کرا کە گوایە: عیسا ﷺ یەکێکە لە سێ پێکهێنەرەکانی خوا کە ئەوان بە: سێ توخمەکان (**الأقانيم الثلاثة**) ناویان ناون و بەحیساب ئەم سێیەن، (خوا، عیسا، گیانی پیرۆز) کە ئەوان بەزاراوی (**الأب، الإبن، الروح القدس**): باب، کوڕ، گیانی پیرۆز، دەیانناسێنن.

شایانی باسیشە ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (**النساء**) و سوورەتی (**المائدة**)دا هەروەها لە {مەوسووعەی ئیمان و ئیلحاد}دا بەدرێژیی لەوبارەوە قسەمان کردوە و، لە کتێبی یەکەمی مەوسووعەی: {**الإسلام كما يتجلى في كتاب الله**}ش دا بەرپەرچی ئەو بیرۆکە ئەفسانەییەمان داوەتەوە.

# کورتەی بەسەرهاتی

## مەریەم و عیسای کوڕی (سەلامی خوایان لێ بێ)

هەوڵدەدەین لە شەش (٦) برگەدا بە تێکهەڵکێش، هەم باسی مەریەم بکەین، مەریەمی کچی عیمران خوا لێی ڕازیبێ، هەم باسی عیسای کوڕیشی بکەین ﷺ:

١)- ناوو ڕەچەڵەکی مەریەم و عیسای کوڕی.

٢)- ژمارەی ناوهێنرانیان لە قورئاندا.

٣)- چۆنیەتی پەیدابوونی هەرکام لە مەریەم و عیسای کوڕی.

٤)- کەسایەتیی و بەسەرهاتی مەریەم و عیسای کوڕی.

٥)- کاکڵەی پەیام و بەرنامەی عیسا.

٦)- سەرەنجامی مەریەم و عیسای کوڕی، چۆن ئەم ژیانی سەر زەوییەیان بەجێهێشتوە؟

### ا)- ناوو ڕەچەڵەکی مەریەم و عیسای کوڕی:

أ)- مەریەم: خوا ﷻ لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتەکانی: (٣٣ - ٣٧) لەم چەند ئایەتەدا بە تەفصیل باسی چۆنیەتی پەیدابوونی مەریەممان بۆ دەکات، هەڵبەتە ئێمە لە بەرگی (٢)ی ئەم تەفسیرەی خۆماندا: (تەفسیری قورئانی بەرز و بە پێز)، لە کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی (آل عمران) دا، ئەو ئایەتانەمان تەفسیر کردوەو، قسەی تێر و تەسەلمان لەسەر کردوون، بۆیە لێرەدا هەر بە کورتیی باس دەکەین:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحًا وَءَالَ إِبْرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمْرَٰنَ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٣﴾ ذُرِّيَّةًۢ بَعْضُهَا مِنۢ بَعْضٍ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ ﴾آل عمران.

واتە: بە دڵنیایی خوا ئادەم و نووح و ئالی ئیبراهیم و ئالی عیمرانی لەسەر جیهانییان هەڵبژاردن، هەندێکیان لە هەندێکیان پەیدابوون، (نووح لە ئادەم و، ئیبراهیم دەچووە سەر نووح، هەروەها ئالی عیمران دەچێتەوە سەر ئیبراهیم) و خوا بیسەری زانایە.

ئنجا دێتە سەر باسی چۆنیەتی پەیدابوونی مەریەم: ﴿ إِذْ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ عِمْرَٰنَ رَبِّ إِنِّى نَذَرْتُ لَكَ مَا فِى بَطْنِى مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّىٓ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٥﴾ ﴾آل عمران، واتە: یاد بکەوە! کاتێك هاوسەری عیمران گوتی: پەروەردگارم! ئەوەی کە لە سکم دایە، بۆ تۆ لە خۆمم گرتوە، (واتە: بەخشیومە بە تۆ، کە ئازاد بێ و هیچ کۆت و بەندی بەسەرەوە نەبێ، مولکایەتیی کەسی بەسەرەوە نەبێ، لە ژێر فەرمانی کەسدا نەبێ، بێجگە لە تۆ)، لێم وەربگرە بە دڵنیایی تۆ بیسەری زانای.

﴿ فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّى وَضَعْتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ ﴿٣٦﴾ ﴾، واتە: کاتێك کە داینا، (واتە: مەریەمی بوو، سکەکەی دانا،) گوتی: پەرورەدگارم! من مێینەیەکم داناوە، {کچێکم بووە} خواش زاناتر بوو، چی داناوەو چی بووە!

﴿ وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ ۖ وَإِنِّى سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وَإِنِّىٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٣٦﴾ ﴾، (ئەمە قسەی خێزانی عیمرانە) نێرینەش وەك مێینە نیە، {یانی: من چاوەڕێی ئەوە بووم نێرینەیەکم ببێ، بۆ ئەوەی خزمەتی پەرستگا بکات، بەڵام ئێستا کچێکم بووە} و من ناوم ناوە مەریەم و، من پەنای پێدەگرم بە تۆ، هەروەها وەچەکەیشی لە شەیتانی دوورخراوە، {خۆی و وەچەکەی دێنمە پەنای تۆ، تاکو لە شەڕی شەیتانی دوورخراوە لە بەزەیی تۆ، پارێزراوبن}.

﴿ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا ﴿٣٧﴾ ﴾آل عمران، واتە: پەروەردگاری زۆر بە باشی لێی وەرگرت و، زۆر بە چاکیی پێی گەیاند و، بە زەکەریاشی سپارد {کە سەرپەرشتیی بکات و ئاگای لێبێ و بیخاتە ژێر چاودێریی خۆیەوە}.

﴿ كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا ۖ قَالَ يَٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا ۖ قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾ ﴾آل عمران، واتە: ئنجا هەر کاتێك کە زەکەریا لێی دەچووە ژوور میحرابەکەی {کە خوا پەرستیی تێدا دەکرد} بژیوێکی تایبەتی لەلا دەبینی، { گوتراوە: لە هاویندا میوەی زستانە و، لە زستاندا میوەی هاوینەی لەلادەدی، خوا باسی نەکردوە چییە؟ بەڵام بژیوێکی تایبەتی لەلا دەبینی و، دەیزانی کە خەڵك بۆی نەهێناوە و لەلایەن خواوە بۆی هاتوە} گوتی: ئەی مەریەم! ئەمەت لە کوێ بووە؟ گوتی: لە خواوەیە، بە دڵنیایی خوا بژیوی هەر کەسێك دەدات بەبێ ژماردن، {واتە: بەبێ ئەوەی بتوانێ بیژمێرێ، خوا بژیوی دەدات، بەو شێوەیە کە بۆ خۆی بە پێویستی دەزانێ}.

ئنجا لێرە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا﴾، واتە: بە زەکەریای سپارد سەرپەرشتیار (کافل) و چاودێری بێ، بەڵام هەر لە سوورەتی (آل عمران)دا خوا ﷻ بۆمان روون دەکاتەوە، چون و بەچ میکانیزمێك زەکەریا بوو بە سەرپەرشتیار و چاودێری مەریەم؟ دەفەرموێ:

﴿ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ ۚ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَٰمَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴿٤٤﴾﴾آل عمران.

واتە: ئەوە لە هەواڵەکانی نادیارە کە بۆ تۆی سروش دەکەین و، تۆ لەلایان نەبووی کاتێك قەڵەمەکانیان فرێدەدان، {تیروپشکیان دەکرد} کامیان مەریەم، وەخۆی بگرێ؟ هەروەها لەوێ نەبووی کاتێك مشت و مریان دەکرد.

بێگومان وێڕای زەکەریا کە خزمەتی پەرستگای کردوە، کە پێیان گوتوە (هیکل) کۆمەڵێکی دیکەش بوون، ئنجا دیارە دەبێ عیمڕان پیاوێکی باش و ناوداری ئەو قەومەی بەنی ئیسرائیل بووبێ، هەروەها هاوسەرەکەشی - کە پێشتر گوتمان - هەندێکیان گوتوویانە: ناوی (ألیصابات) بووە و هەندێکیان گوتوویانە: ناوی (أشیاع) بووە، کچی (فاقوذ بنت قبیل) چەند رایەك لەو بارەوە هەن، کە ناوەکەی چی بووەو، کچی کێ بووە؟ گرنگ ئەوەیە هاوسەری عیمڕان ئافرەتێکی خواناس و ناسراو بووە، بۆیە خەڵکەکە و زانایەکان بۆتە مشت و مریان: کامیان ئەو کچە کە مەریەمە، وە ئەستۆی بگرێ و بیخاتە ژێر چاودێریی و سەرپەرشتیی خۆیەوەو پەروەردەی بکات؟ ئیدی کە قورعەیان کێشاوەو قەڵەمەکانیان فرێداون، کە لە تەفسیرەکان دەڵێ: قەڵەمەکانیان خستە نێو ئاو و گوتیان: هەر کامێکیان قەڵەمەکەی سەرکەوت، یان قەڵەمەکەی چووە خوارێ، ئەو بردوویەتەوە، سەرەنجام قەڵەمی زەکەریا بەو شێوەیە بوو، کە مەریەم ببێتە سەرپەرشتیکراوی و بخرێتە ژێر چاودێریی ئەوەوە.

ب)- عیسا: ناوو رەچەڵەکی عیسا ﷺ، دیارە کە عیسا ﷺ کوڕی مەریەمە و بابی نیە، ئنجا عیسا هەم بە عیسا ناونراوە، هەم بە مەسیح ناوی هاتوە، هەم بە (إبن مریم) کوڕی مەریەمیش ناوی هاتوە، وەك دواتر باسی دەکەین، لە باسی کەسایەتییەکەیدا، هەم وەك وشەی خوا (کلمة اللّه)، هەم بە مانای رووح، هەم وەك پێغەمبەر (نبيّ)، هەم وەك رەوانەکراو (رسول) ناسێندراوە.

### ٢)- ژمارەی ناوهێنرانیان لە قورئاندا:

#### أ)- مەریەم:

مەریەم یازدە (١١) جاران ناوی هاتوە لە قورئاندا، بەم جۆرەی خوارەوە:

١)- لە سوورەتی (آل عمران)دا، چوار (٤) جاران ناوی هاتوە، لە ئایەتەکانی: (٣٦، ٤٢، ٤٣، ٤٤)دا.

٢)- لە سوورەتی (مریم)دا، دوو (٢) جاران ناوی هاتوە، لە ئایەتەکانی: (١٦، ٢٧)دا.

٣)- لە سوورەتی (المؤمنون)دا، یەك (١) جار ناوی هاتوە، ئەویش لە ئایەتی: (٥٠)دا.

٤)- لە سوورەتی (الزخرف)دا، یەك (١) جار ناوی هاتوە، لە ئایەتی: (٥٧)دا.

٥)- لە سوورەتی (التحریم)دا، یەك (١) جار ناوی هاتوە لە ئایەتی: (١٢)دا.

٦)- لە سوورەتی (النساء)دا، یەك (١) جار ناوی هاتوە لە ئایەتی: (١٥٦)دا.

٧)- لە سوورەتی (الأنبیاء)دا، یەك (١) جار ناوی هاتوە، بەڵام نەك بەناوی مەریەم، بەڵکو بە وەسفەکەی: ﴿وَٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا ٩١﴾ الأنبیاء، ئەو کەسەی کە داوێنی خۆی پاراست، ئەویش لە ئایەتی (٩١)دا هاتوە. کەواتە: یازدە (١١) جاران ناوی هاتوە، ئەوە ژمارەی ناوهێنرانی مەریەمە لە قورئاندا.

#### ب)- ژمارەی ناوهێنرانی عیسا ﷺ لە قورئاندا:

عیسا زۆرجار ناوی هاتوە، سەرجەم (٥٧) جاران لە قورئاندا ناوی هاتوە و تۆزێ وردەکاریی هەیە، چونکە عیسا ﷺ هەم بە ناوی (المسیح) هاتوە، هەم بە ناوی (عیسا)، هەم بە ناوی (إبن مریم) ناوی هاتوە:

١)- سوورەتی (البقرة):

لە سێ ئایەتان دا ناوی هاتوە:

أ- لە ئایەتی (٨٧)دا جارێك وشەی (عیسا) هاتوە و جارێك وشەی (إبن مریم).

ب- لە ئایەتی (١٣٦)دا، جارێك ناوی (عیسا) هاتوە.

ج- لە ئایەتی (٢٥٣)دا جارێك (عیسا) هاتوە و، جارێکیش (إبن مریم) هاتوە.

کەواتە: لە سوورەتی (البقرة)دا پێنج (٥)جاران ناوی هاتوە.

۲)- سوورەتی (آل عمران):

لە سوورەتی (آل عمران)دا لە پێنج ئایەتاندا ناوی عیسا دووبارە بۆتەوە:

أ- لە ئایەتی (٤٥)دا جارێك ناوی (المسیح) هاتوە و، جارێك ناوی (عیسا) هاتوە و، جارێك ناوی (إبن مریم) هاتوە، هەرسێ ناوەكەی هاتوون.

ب- لە ئایەتی (٥٢)دا یەك جار ناوی عیسا هاتوە.

ج- لە ئایەتی (٥٥)دا یەك جار ناوی عیسا هاتوە.

د- لە ئایەتی (٥٩) یەك جار ناوی عیسا هاتوە و، لە ئایەتی (٨٤)یش دا یەك جار ناوی عیسا هاتوە.

واتە: حەوت (٧) جاران ناوی هاتوە.

۳)- سوورەتی (النساء):

لە چوار ئایەتان دا ناوی هاتوە:

أ- لە ئایەتی (١٥٧) یەك جار بە ناوی (المسیح) و، یەك جاریش بە ناوی (عیسا) و، یەك جاریش بە ناوی (إبن مریم) هاتوە.

ب- لە ئایەتی (١٦٣)دا یەك جار بە ناوی (عیسا) ناوی هاتوە.

ج- لە ئایەتی (١٧١) یەك جار بە ناوی (المسیح) و، یەك جاریش بە ناوی (عیسا) و، یەك جاریش بە ناوی (إبن مریم) هاتوە.

د- لە ئایەتی (١٧٢)دا یەك جار بە ناوی (المسیح) ناوی هاتوە.

واتە: هەشت (٨) جاران ناوی هاتوە.

٤)- بەڵام زۆرترین ئایەت كە ناوی عیسایان تێدا هاتوە، سوورەتی (المائدة)یە:

لە نۆ (٩) ئایەتان دا ناوی هاتوە، بیست كەڕەت:

أ- لە ئایەتی ژمارە حەڤدە (١٧)دا، دوو جاران ناوی (المسیح) هاتوە، هەروەها دوو (٢) جاریش ناوی (إبن مریم) هاتوە.

ب- لە ئایەتی چل و شەش (٤٦)دا، یەك جار ناوی (عیسا) و، یەك جاریش ناوی (إبن مریم) هاتوە.

ج- له ئایەتی حەفتاو دوو (٧٢)دا، دوو جاران ناوی (المسیح) هاتوه.

د- له ئایەتی حەفتاو پێنج (٧٥)دا، جارێك ناوی (المسیح) و، جارێك ناوی (إبن مریم) هاتوه.

هـ- له ئایەتی حەفتاو هەشت (٧٨)دا، جارێك ناوی (عیسا) و، جارێك ناوی (إبن مریم) هاتوه.

و- له ئایەتی سەدو ده (١١٠)دا، جارێك ناوی (عیسا)و، جارێك ناوی (إبن مریم) هاتوه.

ز- له ئایەتی سەدو دوازده (١١٢)دا، جارێك ناوی (عیسا)و، جارێك ناوی (إبن مریم) هاتوه.

ح- له ئایەتی سەدو چوارده (١١٤)دا، جارێك ناوی (عیسا)و، جارێك ناوی (إبن مریم) هاتوه.

ط- له ئایەتی سەدو شازده (١١٦)دا، جارێك ناوی عیسا و، جارێك ناوی (إبن مریم) هاتوه.

واته: بیست (٢٠) کەڕەتان ناوی هاتوه.

٥)- سووڕەتی (الأنعام): تەنیا له ئایەتی (١٨٥)دا، ئەویش ناوی (عیسا) هاتوه، یەك جار.

٦)- سووڕەتی (التوبة):

أ- له ئایەتی (٣٠)دا، یەك جار ناوی (المسیح) هاتوه.

ب- له ئایەتی (٣١)دا، یەك جار ناوی (المسیح)و، جارێکیش ناوی (إبن مریم) هاتوه.

واته: سێ جاران ناوی هاتوه.

٧)- له سووڕەتی (مریم): له ئایەتی (٣٤) جارێك ناوی (عیسا)و، جارێك ناوی (إبن مریم) هاتوه.

٨)- له سووڕەتی (المؤمنون): له ئایەتی (٥٠)دا، یەك جار ناوی (إبن مریم) هاتوه.

٩)- له سووڕەتی (الأحزاب): له ئایەتی (٧)دا، جارێك ناوی (عیسا)و، جارێك ناوی (إبن مریم) هاتوه.

١٠)- له سووڕەتی (الشوری): له ئایەتی (١٣)دا، جارێك ناوی (عیسا) هاتوه.

١١)- سووڕەتی (الزخرف):

أ- له ئایەتی (٥٧)دا، جارێك ناوی (إبن مریم) هاتوه.

ب- له ئایەتی (٦٣) سووڕەتی (الزخرف)دا، جارێك ناوی (عیسا) هاتوه.

١٢)- له سووڕەتی (الحدید): له ئایەتی (٢٧)دا، جارێك ناوی (عیسا) و، جارێك ناوی (إبن مریم) هاتوه.

**١٣)- سوورەتی (الصف):**

أ- لە ئایەتی (٦)دا، جارێك ناوی (عیسا)و، جارێك ناوی (إبن مريم) هاتوە.

ب- لە ئایەتی (١٤)دا، جارێك ناوی (عیسا)و، جارێك ناوی (إبن مريم) هاتوە.

واتە: چوار (٤) کەڕەتان ناوی هاتوە.

کەواتـە: کـۆی ناوهێـنرانی (عیسـا): یـازدە (١١) جـاران (المسیح) هاتـوە لـە قورئانـدا و، بیسـت و پێنـج (٢٥) جـاران نـاوی (عیسـا) هاتـوە، بیسـت و سێ (٢٣) جـار نـاوی (إبـن مريـم) هاتـوە.

کەواتە: ١١+٢٥+٢٣=٥٧.

## ٣)- چۆنیەتی پەیدابوونی مەریەم و عیسای کوڕی:

### أ)- مەڕیەم:

ئێمـە پێشـتر ئایەتـەکانی (٣٣ - ٣٧)، هەروەهـا ئایـەتی ( ٤٤)ی (آل عمران)مـان هێنـاو تەفسـیرمان کـردن بـە کـورتی، کـە باسـی چۆنیـەتی پەیدابـوونی مەڕیـەم دەکـەن، کـە هاوسـەری عیمـڕان خـوا لێیـان ڕازیبێ لـە خـوا دەپاڕێتـەوە: خـوا ڕۆڵەیـەکی پێبـدات و دووعایەکـەی گیـرا دەبێ و مەڕیەمیـان دەبێ، بۆیـە لێـرە دووبارەیـان ناکەینـەوە.

### ب)- چۆنیەتی پەیدابوونی عیسا ﷺ:

ئێمـە لـە سـوورەتی مەڕیـەم ئایەتـەکانی (١٦ - ٢١) کـە پێشـتر هێنامانـن، کـە بـاسی لـە دایـك بـوونی عیسـا دەکـەن، هەروەهـا لـە سـوورەتی (آل عمران)یـش ئایەتـەکانی: (٤٥ - ٤٨)، کـە پێشـتر تەفسـیرمان کـردوون، باسـی چۆنیـەتی پەیدابوونـی عیسـامان کـردوە.

بـەڵام لێـرەدا جارێـکی دیکـە چاوێکیـان پێدادەگێڕینـەوە: لـە ئایەتـەکانی (٤٥ - ٤٨) خـوا ﷻ ئـاوا بـاسی پەیدابـوونی عیسـا دەکات:

﴿ إِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٥﴾ وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٤٦﴾ قَالَتْ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِى بَشَرٌ قَالَ كَذَٰلِكِ ٱللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٧﴾ وَيُعَلِّمُهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴿٤٨﴾ ﴾آل عمران.

واتـە: یـاد بکـەوە! کاتێـك فریشـتەکان گوتیـان: ئـەی مەریـەم! بـە دڵنیایـی خـوا مـوژدەت پێـدەدا بـە وشـەیەك لەلایـەن خۆیـەوە، نـاوی (مسـیح)ە، عیسـای کـوڕی مەریـەم، لـە دنیـاو دواڕۆژدا خـاوەن پێگەیـە، پایـە بـەرزەو، لـە زۆر لـە خـوا وەنیزیـك خراوانـە، هـەم لـە بێشـکە (لانکـە)دا خەڵـك دەدوێنـێ و، هـەم لـە کاتێکـدا کـە کامڵیـش دەبـێ و لـە چاکـەکاران دەبـێ، مەریـەم گـوتی: پـەروەردگارم! چـۆن ڕۆڵـەم پەیـدا دەبـێ کـە هیـچ مرۆڤێـك دەسـتی نەگەیاندۆتـە مـن {واتـە: بـە حەڵاڵـی؟!} (خـوا) فەرمـووی: هـەر بـەو شـێوەیەیە، {وەك خـوا هەواڵـی پێـدەدا، وایـە، یـان: هـەر بـەو شـێوەیەیە خـوا هەرچـی بیـەوێ دەیهێنێتـە دی} هـەر کاتێـك ویسـتی شـتێك بـبێ {بڕیـاری بـۆ دەرکـرد} بـەس پێـی بفەرمـوێ: ببـە، دەبـێ، هەروەهـا کتێـب و حیکمـەت و تـەوڕات و ئینجیلیـشی فێـر دەکات.

## ئەمەش پوختەیەکی کتێبە مێژووییەکانە لەبارەی عیساوە:

(أطلس القرآن)ی (د. شوقي أبو خليل)[1]، دەڵێ:

**(وُلِـدَ عِيـسى عَلَيْـهِ السَّـلَامُ في بيـت لحـم بفلسـطين، والأصـل مـن النـاصرة في الجليـل شـمال فلسـطين، عَـاشَ في النَّـاصِرَةِ مَـعَ أُمِّـهِ، وَذُكِـرَتْ لَـهُ رِحْلَـةٌ مَـعَ أُمِّـهِ ويوسـف النَّجَّـار إلى مـصر «عـين الشَّـمس» ثُـمَّ عَـادَت الأُسْـرة إلى النَّـاصِرَةِ، وَهُنَـاكَ صَمـتٌ كَامِـلٌ في الأناجيـل بـين (١٢-٣٠) سـنة!! مـن عمـره، إذ إلتقـى بيحيـى وعَمَّـدَهُ).**

واتـە: عیسـا ﷺ لـە (بيـت لحـم)ی فەلەسـطين {ئێسـتاش شـارێکە لـە فەڵەسـتين} لـە دایـك بـووە و لـە ئەسڵیشـدا خەڵـکی (ناصرة)یـە، (نـاصرة)ش شـارێکە لـە دەڤـەری (جليـل)ە، کـە لـە باکـووری فەڵەسـتینە، لـەوێ لەگـەڵ دایکیـدا ژیـاوە لـە (نـاصرة) {هەربۆیـەش دوایـی بـە شـوێنکەوتووانی عیسـا گوتـراوە: نەصرانیـی، یـان نەصـارا} بـاسی سـەفەرێکی عیسـا لەگـەڵ دایـکی و (يوسـف النجـار)دا کـراوە، بـۆ میـصر بـۆ (عـين الشـمس) {گوایـە: (يوسـف النجـار) پێـش لـە دایـك بـوونی عیسـا، دەسـتگیرانی مەریـەم بـووە، بـەڵام نەیگواسـتۆتەوە، لـە ئینجیلەکانـدا وا دەڵێـن}، دوایـی ئـەو خێزانـە {واتـە: مەریـەم و عیسـای کـوڕی و (يوسـف النجـار)} گەڕاوەتـەوە بـۆ (نـاصرة)، {گوایـە ئـەو کاتـەی عیسـا لەگـەڵ دایـکی دا گەڕاوەتـەوە بـۆ (نـاصرة) تەمـەنی دوازدە (١٢) سـاڵ بـووە} لـەو تەمـەنی دوازدە سـاڵیی تاکـو سی (٣٠) سـاڵیی، چـوار ئنجیلـەکان بـێ دەنگییـەکی تەواویـان لێـی هەیـە، کـە دوایـی عیسـا دەگاتـە یەحیـا، یەحیـا (تعميـد)ی

---

(١) ص١١٦،١١٧.

دەكات، {(تعمید) واتـە: لـە ئـاو هەڵكێشـان كـە جۆرێـك بـووە لـە سرووت (طقس)ێكی ئایینـی وەك چـۆن مسـوڵمانان غوسـڵ دەكـەن و خۆیـان دەشـۆن، یـانی: عیسـا لەسـەر دەسـتی یەحیـا لـە ئـاو هەڵكێشـراوە، هەرچەنـدە دوایـی عیسـا بۆتـە پێغەمبەرێـكی پایـە بـەرز و لـە یەحیـا گەورەتـر بـووە}.

## ٤)- كەسایەتیی و بەسەرهاتی مەریەم و عیسا:

### أ)- كەسایەتیی و بەسەرهاتی مەریەم:

پێشـتر باسـمانكرد كـە ئایەتـەكانی: (٣٧ - ٤٢) و ئایەتـی (٤٣)ی (آل عمـران) بـاسی مەریـەم دەكـەن بـۆ وێنـە: لـە ئایەتی (٣٧)دا دەفەرموێ: ﴿ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا ۖ كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيۡهَا زَكَرِيَّا ٱلۡمِحۡرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزۡقًا ۖ قَالَ يَٰمَرۡيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا ۖ قَالَتۡ هُوَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾ ﴾آل عمـران.

كـە دیـارە مەریـەم لـە ژێـر چاودێریـی و سەرپەرشـتیی زەكەریـا بـووە، كـە مێـردی پووریـشی بـووە، چونكـە دایـكی مەریـەم لەگـەڵ هاوسـەری زەكەریـادا خوشـك بـوون، وەك پێشـتر باسـمانكرد، ئنجـا مەریـەم لـە ژێـر چاودێریـی زەكەریـادا بـووە و بـە تیروپشـك بـۆی دەرچـووە، ئنجـا مەریـەم خەریـكی خزمـەتی پەرسـتگا بـووە، كـە پێیـان گوتـوە: (هیكل) وەك مزگـەوتی ئێمـە، لەوێ لـە ژوورێـكی تایبـەتی خـۆی دا بـووە، كـە پێـی گوتـراوە: میحـراب، هـەر جارێك كـە زەكەریا چۆتـە ژوورەكـەی، خـواردنی تایبەتیـی لـەلا بینیـوە و گوتوویـەتی: مەریـەم ئـەوەت لـە كـوێ بووە؟ گوتوویـەتی: ئـەوە لەلایـەن خواوەیـە، خـوا هـەر كەسێكی بیـەوێ بژیـوی دەدا بەبـێ ژمـاردن!

هەروەهـا لـە ئایەتـەكانی: (٤٢ و ٤٣)دا كەسـایەتیی (مەریەم)مـان زیاتـر بـۆ دەردەكـەوێ:

﴿ وَإِذۡ قَالَتِ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرۡيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ وَٱصۡطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٤٢﴾ يَٰمَرۡيَمُ ٱقۡنُتِي لِرَبِّكِ وَٱسۡجُدِي وَٱرۡكَعِي مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ﴾آل عمـران.

واتـە: یـاد بكـەوە! كاتێـك كـە فریشـتەكان گوتیـان: ئـەی مەریـەم! بـە دڵنیایـی خـوا تـۆی هەڵبـژاردوە و تـۆی پـاك كردۆتـەوەو، تـۆی بەسـەر ئافرەتـانی جیهانـدا هەڵبـژاردوە، {لـە نێویانـدا تـۆی هەڵبـژاردوە} ئـەی مەریـەم! بـۆ پـەروەردگارت ملكـەچ بـە و كڕنـووشی بـۆ بـەرە و ڕكووعـی بـۆ بـەرە لەگـەڵ ڕكـووع بـەران دا.

لە سوونەتی پێغەمبەریشدا ﷺ لە چەند فەرمایشتێکدا، باسی پێگەو پایەی مەریەم کراوە، یەکێك لەوانە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {خَيْرُ نِسَائِهَا مَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ، وَخَيْرُ نِسَائِهَا خَدِيجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ} (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ: ٣٢٤٩ ، وَمُسْلِم: ٢٤٣٠، والترمذي: ٣٨٧٧).

واتە: باشترین ئافرەتانی دنیا: مەریەمی کچی عیمران بوو، هەروەها باشترین ئافرەتانی دنیا: خەدیجەی کچی خوەیلیدە.

یانی: باشترین ئافرەتانی ئوممەتی بەنو ئیسرائیل، مەریەمی کچە عیمران بووە، هەروەها باشترین ئافرەتانی ئوممەتی ئیسلام، خەدیجەی کچی خوەیلیدە.

یاخود: هەردووکیان لەسەر ئاستی ئافرەتانی دنیاو، لەسەر ئاستی بەشەرییەت، هەڵبژاردەن.

هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرموێ: {عَنْ أَنَسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: حَسْبُكَ مِنْ نِسَاءِ الْعَالَمِينَ: مَرْيَمُ ابْنَةُ عِمْرَانَ، وَخَدِيجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ، وَفَاطِمَةُ ابْنَةُ مُحَمَّدٍ، وَآسِيَةُ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٢٤١٤، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين، والترمذي: ٣٨٧٨).

واتە: باشترین ئافرەتانی دنیا چوارن: مەریەمی کچی عیمران و، خەدیجەی کچی خوەیلید و، فاتیمەی کچی موحەممەد (پێغەمبەری خوا) ﷺ و ئاسیای ژنی فیرعەون.

ئنجا بە نسبەت دایکمانەوە عائیشەش (خوا لێی ڕازی بێ)، فەرموویەتی: {وَإِنَّ فَضْلَ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ، كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ} (أَخْرَجَهُ مسلم: ٢٤٤٦).

واتە: پێگەو پلەی عائیشە بەسەر ئافرەتانی دیکەوە، وەك پێگەو پلەی (ثرید)ە {جۆرە خواردنێکی دانستەی ئەو کاتە بووە، لە هەموو خواردنەکانیان پێ چاکتر بووە} لە چاو خواردنەکانی دیکە.

واتە: عائیشە لە هەموو ئافرەتانی دیکە باشترە.

ئەوە بە نسبەت کەسایەتیی مەریەمەوە، بە نسبەت بەسەرهاتەکەشیەوە: پێشتر ئاماژەیەکمان پێدا و، لە قورئاندا وردەکارییەکان باس نەکراون، هەروەها باسی سەفەرەکەشیان نەکراوە بۆ میسر، بەڵام لەو چەند ئایەتەدا کە فریشتەکان مەریەم دەدوێنن، کە خوا ئەو موژدەیەت پێدەدات و دەیدوێنن کە تۆ ئافرەتێکی وا هەڵبژاردەی!

دەردەکەوێ کە مەریەم (خوا لێی ڕازی بێ) ئافرەتێکی زۆر هەڵکەوتوو ناوازە بووە و ژیانێکی پاك و چاکی گوزەراندوە.

**ئایا مەریەم کەی وەفاتی کردوە؟**

**أ- هەندێك دەڵێن: پێش ئەوەی عیسا ﷺ دنیا بەجێبێڵێ و بەرزبکرێتەوە بۆ ئاسمان و، کۆچی دواییکردوە.**

**ب- هەندێکیش دەڵێن: پاش ئەوەی عیسا کۆچی دواییکردوە.**

**لە قورئانیشدا هیچ کام لەو دوو ئەگەرە، پشتڕاست نەکراونەوە.**

**ب)- کەسایەتیی و بەسەرهاتی عیسا ﷺ:**

**عیسا ﷺ لە هەموو قورئان دا پەنجا وحەوت (٥٧) جاران ناوی هاتوە، چ بە ناوی (المسیح)، چ بە ناوی (عیسا)، چ بە ناوی (إبن مریم)، ئنجا عیسا کەسایەتییەکی زۆر ناوازەو بەرزی هەبووە، کە ئەوەی لە هەردووك ئایەتی (١٧١ و ١٧٢) لە سوورەتی (النساء)دا هاتوە، پێگەی عیسا ﷺ و کەسایەتییەکەی زۆر چاك دەردەخات:**

﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۖ وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌۚ ٱنتَهُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٞۘ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ١٧١ لَّن يَسۡتَنكِفَ ٱلۡمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبۡدٗا لِّلَّهِ وَلَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ٱلۡمُقَرَّبُونَۚ وَمَن يَسۡتَنكِفۡ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيَسۡتَكۡبِرۡ فَسَيَحۡشُرُهُمۡ إِلَيۡهِ جَمِيعٗا ١٧٢﴾ النساء.

**واتە: ئەی خاوەن کتێبەکان! لە ئاینەکەتاندا ڕۆمەچن (تێمەپەڕێنن) و جگە لە هەق، شتێکی دیکە سەبارەت بەخوا، نەڵێن، بە دڵنیایی مەسیح عیسای کوڕی مەریەم، ڕەوانەکراوی خواو، وشەی خوا بوو، فڕێدرابوو بۆ مەریەم و، ڕووحێك بوو لەلایەن خۆیەوە، ئنجا بڕوا بە خواو بە پێغەمبەرانی بێنن و مەڵێن: خوا سێیە (سێ بەشە)، وازبێنن بۆ ئێوە باشترە، بە دڵنیایی خوا تەنیا یەك پەرستراوە، پاکیی بۆ وی کە ڕۆڵەی هەبێ، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، هی ئەوە و ئەو بەسە سەرپەرشتیار بێ، نە مەسیح ﷺ و نە فریشتە زۆر لە خوا وەنیزیك خراوەکان، پێیان کەمیی نیە کە بەندەی خوا بن، هەر کەسێکیش لە ئاست پەرستنی خواو بەندایەتیی کردن بۆ خوادا، لووت**

بەرز بێ و خۆی بەزل بگرێ، بە تەئکید (خوا) هەموویان بۆ لای خۆی کۆدەکاتەوە.

دوایی لە درێژەی ئایەتەکان دا باس دەکات، کە پاداشتی چاکەکاران و، سزای لادەران، دەدات.

وەك لە ئایەتی (١٧١)ی سوورەتی (النساء)دا، دەبینرێ: خوای پەروەردگار بە شەش (٦) وشە وەسف و پێناسەی عیسای کردوە: (١-المسیح، ٢- عیسا، ٣- إبن مریم، ٤- رسول اللّه، ٥- كلمته ألقاها إلى مريم، ٦-روح منه):

١)- (المسیح): چ (فعیل)ی بە مانای (فاعل) بێ، واتە: (سائح) ئەو کەسەی گەشت و سیاحەت دەکاو دەگەڕێ، یاخود (المسیح)، (ماسِحْ)بێ، ئەو کەسەی دەست بە خەڵکی دەردەدار و نەخۆش دادێنێ و چاکیان دەکاتەوە بە فەرمانی خوا.

یاخود (المسیح) (فعیل)ی بە مانای (مفعول)بێ، واتە: دەست بەسەرداهێنراو، یانی: فریشتەکان دەستیان پێدا هێناوە، خوای پەروەردگار موبارەکی کردوە.

٢)- (عیسا): ناوی شەخسیەتی و (المسیح) سیفەتیەتی.

٣)- (إبن مريم): کوڕی مەریەم، لەبەر ئەوەی بابی نەبووە، بەناوی دایکیەوە بووە.

٤)- (رسول اللّه): ڕەوانەکراوی خوا.

٥)- (كلمتُهُ ألقاها إلى مريم): وشەی خوا بووە، فڕێیداوە بۆ مەریەم، لە ڕێی جیبریلەوە، کە پێشتریش باسمانکرد: زانایان دەڵێن: جیبریل فووی بە یەخەی کراسی مەریەمدا کردوە، هەندێکیش دەڵێن: فووی بە دەمیدا کردوە و ڕووحەکەی چۆتە بەرجەستەی.

٦)- (روح منه): ڕووحێکە لە خواوە، بێگومان هەموو ڕووحەکان هەر لە خواوەن، بەڵام ئەو ڕووحەی عیسا عليه السلام، جیاوازییەکەی لەوەدایە: بەبێ ئەوەی پیاو و ژنێك پێك بگەن، خوای باڵادەست کۆرپەلەی عیسای هێناوەتەدی.

هەروەها لە سوورەتی (آل عمران) (٥٩ - ٦٣)دا، خوای پەروەردگار باسی گۆشەیەك لە کەسایەتیی و بەسەرهاتی عیسا عليه السلام دەکات، کە ئاوا دەست پێدەکات، کە ئێمە بە کورتیی ئەو پێنج ئایەتە مانا دەکەین: خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾ ﴾آل عمران.

واتە: بە دڵنیایی وێنەی عیسا لەلای خوا، وەك وێنەی ئادەم بوو، كە لە گڵ دروستی كرد، دوایی پێی فەرموو ببە، یەكسەر بوو.

واتە: ئەگەر ئادەم ڕاستەوخۆ لە گڵ دروست بووە، عیسا لە دایكی و لە نێو منداڵدانی دایكیدا دروست بووە، خوای بەدیهێنەر لە ڕێی جیبریلەوە ڕووحەكەی بە بەردا كردوە، كەواتە: ئادەم هیچ ئەسڵێكی نەبووە و ڕاستەوخۆ لە گڵەوە هاتوە، یانی: ئەگەر عیسا دایكی هەیە، ئادەم نە بابی هەبووە، نە دایك!

﴿ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾، واتە: هەق لە پەروەردگارتەوەیە، ئنجا تۆ لە دوو دڵان مەبە.

ڕووی دواندن لە پێغەمبەرە ﷺ، بەڵام مەبەست پێی ئۆممەتەكەیەتی و هەر كەسێكە كە قورئان دەخوێنێ.

﴿ فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا۟ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٦١﴾ ﴾، واتە: ئنجا هەر كەسێك دوای ئەوەی ئەو زانیارییەت بۆ هات لە بارەی عیساوە عليه السلام مشت و مڕی لەگەڵدا كردی، پێیان بڵێ: وەرن كوڕەكانی خۆمان و كوڕەكانی ئێوە و، ئافرەتەكانی خۆمان و ئافرەتەكانی ئێوە و، خۆمان و ئێوە، بانگ بكەین، (ئێوە لەلایەك و ئێمە لەلایەك)، دوایی دەپاڕێینەوە، ئنجا نەفرینی خوا لە درۆزنان دەكەین.

ئەوە وەك لە تەفسیری سوورەتی (آل عمران) بە درێژیی باسمانكردوە، نەصرانییەكانی نەجران، كە هاتن هەر دەیانگوت: عیسا كوڕی خوایە، عیسا خوایە و، كاتێك پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: بەندەی خوایە، دەیانگوت: (لم تشتم صاحبنا) بۆچی جنێو بە هاوەڵەكەمان دەدەی و دەڵێی: بەندەی خوایە؟ وایاندەزانی ئەوە جنێوە.

ئنجا خوا ﷻ دوای ئەوەی بۆی ڕوونكردنەوە، كە عیساش وەك ئادەم دروست بووە و، عیسا ئەگەر دایكی هەیە، ئادەم نە بابی هەیە، نە دایكی هەیە، ئەوانە هەر ئیقناع نەبوون، وایان پیشاندا كە قەناعەتیان نەهات، بۆیە فەرموویی: وەرن (مباهلة) بكەین [(مباهلة) واتە: دوعاكردن، كە خوا لەعنەت لەو كەسە بكات: درۆ دەكات و بە هەڵەدا چووە] بەڵام دوایی ئەوان نەوێران وابكەن، ئنجا خوا دەفەرمویٚ:

﴿ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْقَصَصُ ٱلْحَقُّ ۚ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٦٢﴾ ﴾.

واتـە: بێگومـان ئـەوە بەسـەرهات و گێڕانـەوەی هـەق و ڕاسـتە و جگـە لـە خـوا، هیـچ پەرستراوێك نیـە و خـوا زاڵـی کارزانـە.

﴿ فَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِالْمُفْسِدِينَ ﴿٦٣﴾ ﴾، ئنجـا ئەگـەر پشـتیان هەڵکـرد، ئـەوە بێگومان خوا بـە تێکـدەران، زاناوشـارەزایە.

## ئەو موعجیزەو وەسفانەی کەسایەتیی عیسا ﵇ پێکدێنن :

شـایانی باسـە کـە موعجیزەکانـی عیسـا ﵇ لـە قورئانـدا، خـوا سـەرجەم حەڤـدە (١٧) جـۆرە موعجیـزەو سـیفەتی بـۆ عیسـا باسـکردوون:

١)- لە سوورەتی (آل عمران)، لە ئایەتەکانی (٤٥ - ٤٩)دا، پازدە (١٥) موعجیزەی خستوونە ڕوو.

٢)- لە سوورەتی (المائدة) لە ئایەتی (١١٠)دا، موعجیزەی شازدەیەم (١٦) و، لە ئایەتی (١١٢ - ١١٥) موعجیزەی حەڤدەیەم، کە ئێمە هەروا بە خێرایی چاویان پێدا دەخشێنین:

أ)- لە ئایەتی (٤٥)ی (آل عمران)دا، یەکەم و دووەم: دوو وەسفی عیسا ﵇ کە تایبەتمەندیی ئەون:

﴿ وَجِيهًا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَمِنَ الْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾آل عمـران، زۆر نـاودارو، خـاوەن ڕوو و خـاوەن پێگەیـە لـە دنیـاو لـە دواڕۆژدا و، لـە زۆر لـە خـواوە وە نیزیـك خراوانـە.

ب)- لە ئایەتی (٤٦) (آل عمران)دا خوای پەروەردگار، سێ وەسفی دیکەی لێ هەڵدەدا، کە یەکێکیان موعجیزەیە و دووەکانی دیکەش وەسفن:

﴿ وَيُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلًا وَمِنَ الصَّالِحِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾آل عمران.

واتـە: لـە بێشـکەدا قسـە لەگـەڵ خەڵـك دەکات، هەروەهـا لـە کاتێکـدا کـە کامڵیـش دەبـێ و لـە چاکەکارانیشـە.

ج)- ئنجا لە ئایەتی ژمارە (٤٨) سوورەتی (آل عمران)دا، چوار وەسفی دیکەی خراونە ڕوو (٦، ٧، ٨، ٩) کە بریتین لە:

﴿ وَيُعَلِّمُهُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَالتَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ ﴿٤٨﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: هەروەها (خوا) کتێب و حیکمەت و تەورات و ئینجیلی فێردەکات.

د- لە ئایەتی (٤٩)ی (آل عمران)دا شەش (٦) وەسف و موعجیزەی دیکەی خراونە ڕوو:

﴿وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ أَنِّي قَدۡ جِئۡتُكُم بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ أَنِّيٓ أَخۡلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيۡـَٔةِ ٱلطَّيۡرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيۡرَۢا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۖ وَأُبۡرِئُ ٱلۡأَكۡمَهَ وَٱلۡأَبۡرَصَ وَأُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۖ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأۡكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ٤٩﴾ آل عمران.

واتە: هەروەها (عیسا) ڕەوانەکراوە، بۆ لای بەنی ئیسرائیل، دەڵێ: من نیشانەیەکم لە پەروەردگارتانەوە بۆ هێناون، من لە قوڕێ وەك شێوەی باڵندەتان بۆ دروست دەکەم، فووی پێدا دەکەم، بە مۆڵەتی خوا دەبێتە باڵندە{یەکی زیندوو} و کەڕولاڵی زگماك و بەڵەکی زگماك چاك دەکەمەوە و، مردووان زیندوو دەکەمەوە بە مۆڵەتی خواو، هەواڵتان پێدەدەم بەوەی کە دەیخۆن و، بەوەش کە لە ماڵی خۆتاندا {لە خۆراك و ئازووقە} هەڵیدەگرن، {پێتان دەڵێنم: ئەوەتان خواردوە و، ئەوەتان هەڵگرتوە} لەوەدا نیشانە هەن بۆ ئێوە، ئەگەر ئێوە بڕواداربن.

هـ)- لە سوورەتی (المائدة)شدا، باسی موعجیزەیەکی دیکەی عیسا ﷺ کراوە کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذۡ كَفَفۡتُ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذۡ جِئۡتَهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ١١٠﴾ المائدة.

واتە: یاد بکەوە! کاتێك کە بەنی ئیسرائیلم لە تۆ گێڕانەوە {تۆم پاراست لە دەستیان} کاتێك کە بەبەڵگە ڕوونەکانەوە هاتیە لایان.

عیسایەکی تاك و تەنیا، کەچی خوا نەیهێشت بە دەست جوولەکەکان بفەوتێ و نەشیهێشت بە دەست ڕۆمانەکانیش بفەوتێ، هەرچەندە بە حیساب دەوریشیان گرتبوو، بەڵام خوای باڵادەست، بەرزی کردەوە و هەڵیکێشا، وەك لە سوورەتی (النساء)دا باس دەکات و دوایی باسی دەکەین.

و)- هەروەها موعجیزەی حەڤدەیەم و کۆتایی ئەوەیە کە لە ئایەتەکانی: (١١٢ - ١١٥)دا هاتوە کە دەفەرموێ:

﴿إِذۡ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ هَلۡ يَسۡتَطِيعُ رَبُّكَ أَن يُنَزِّلَ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِۖ قَالَ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ١١٢ قَالُواْ نُرِيدُ أَن نَّأۡكُلَ مِنۡهَا وَتَطۡمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعۡلَمَ أَن قَدۡ صَدَقۡتَنَا وَنَكُونَ عَلَيۡهَا مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ١١٣ قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ ٱللَّهُمَّ رَبَّنَآ أَنزِلۡ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ تَكُونُ لَنَا عِيدٗا لِّأَوَّلِنَا وَءَاخِرِنَا وَءَايَةٗ مِّنكَۖ وَٱرۡزُقۡنَا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ

﴿قَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ فَمَن يَكْفُرْ بَعْدُ مِنكُمْ فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١١٥﴾﴾ المائدة.

ئێمە كاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (المائدة)دا بە تەفصیل باسمانكردوە، كە حەوارییەكان داوا لە عیسا ﷺ دەكەن: سفرەو خوانێكی پڕ خواردنیان بۆ دابەزێنێ، كە هەندێك دەڵێن: ماسیی بووە، بەڵام لە قورئاندا باس نەكراوە، گرنگ ئەوەیە سفرەو خوانێكی پڕ، داوا دەكەن و بۆیان دابەزێ، بەڵام پێشێ عیسا ﷺ دەفەرموێ: پارێز لە خوا بكەن و ئەو داوایە مەكەن، بەڵام ئەوانیش پاساوی خۆیانی بۆ دێننەوە: بۆ ئەوەی دڵیان ئارام بگرێ و، بیكەنە جەژن و، بزانن كە عیسا ﷺ ڕاست دەكات لەگەڵیان، واتە: بەڵگەیەكی دیكەیان دەستبكەوێ، دوایی كە عیسا داوا لە خوای پەروەردگار دەكات، خواش دەفەرموێ: من بۆتان دادەبەزێنم، بەڵام هەر كەسێك پێی بێبڕوا بێ، بەجۆرێك سزای دەدەم، هیچ كەسم لە جیهانییان وا سزا نەدابێ.

ئەوانە موعجیزەكانی عیسا ﷺ و سیفەتە بەرجەستەكانی بوون، كە ژمارەیان حەڤدەیە: (٢+٣+٤+٦+١+١ ١٧).

## ٥)- كاكڵەی پەیام و بەرنامەی عیسا ﷺ:

كاكڵی پەیام و بەرنامەی عیسا ﷺ، وەك ئەو نێوەڕۆكە بووە، كە پەیامەكانی پێغەمبەرانی پێش خۆی گرتوویاننە خۆیان، كە بریتی بووە لە وەی خەڵك بانگ بكات بۆ تەنیا بەندایەتیی كردن بۆ خواو، هاوبەش بۆ خوا دانەنان و، پابەند بوون بە شەریعەتی خواوە و، ڕێكخستنی ژیانی تاكیی و، خێزانیی و، كۆمەڵایەتیی و، سیاسییان بە پێی ڕێنمایی و بەرنامەی خوا، بێگومان هەموو پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بۆ ئەوە هاتوون و، هەم هیدایەتیان بۆ خەڵك هێناوە، هەم ئایینی هەقیان بۆ هێناون، كە هیدایەتەكە، وەك تاك هەڵدەگیرێ و، بەرنامە هەقەكەش ژیانی كۆمەڵگای پێ ڕێك دەخرێ (بالهُدی ودین الحق).

أ- بۆ وێنە: با تەماشای ئەو دوو ئایەتە بكەین لە سوورەتی (آل عمران) (٥٠-٥١)دا، دەفەرموێ:

﴿وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ وَجِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٥٠﴾ إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٥١﴾﴾ آل عمران.

واتە: بەڕاستدانەری ئەوەم کە لە پێش منەوە بووە، لە تەورات، هەروەها (هاتووم) تاکو هەندێك لەو شتانەی لێتان قەدەغەکراون، بۆتان حەڵاڵ بکەمەوە و، نیشانەیەکم لە پەروەردگارتانەوە بۆ هێناون، دەجا پارێز لە خوا بکەن و فەرمانبەرییم بکەن، بە دڵنیایی خوا پەروەردگاری من و ئێوەشە، دەجا بەس ئەو بپەرستن، ئا ئەوە ڕاستە شەقامی خوایە.

ب- لە سووڕەتی: (مریم)یش دا، بەهەمان شێوە، کە پێشتر ئایەتەکانمان هێنان: ﴿ قَالَ إِنِّي عَبْدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا ﴿٣٠﴾ وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا ﴿٣١﴾ وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا ﴿٣٢﴾ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا ﴿٣٣﴾ ﴾، پاشان: ﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٣٦﴾ ﴾.

ج- لە سووڕەتی (الزخرف) -٦٣، ٦٤، ٦٥- دا، دیسان باسی پەیام و بەرنامەی عیساو نێوەڕۆك و کاکڵەکەی کراوە، کە دەفەرمویّ:

﴿ وَلَمَّا جَآءَ عِيسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالَ قَدْ جِئْتُكُم بِٱلْحِكْمَةِ وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِي تَخْتَلِفُونَ فِيهِ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٦٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦٤﴾ فَٱخْتَلَفَ ٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَيْنِهِمْ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْ عَذَابِ يَوْمٍ أَلِيمٍ ﴿٦٥﴾ ﴾الزخرف.

واتە: کاتێ عیسا بە بەڵگە ڕوون و ئاشکرایەکانەوە هات، {بۆ لای بەنی ئیسرائیل هات} فەرمووی: من حیکمەتم بۆ هێناون {دانایی و کارامەیی و لێزانیی لە بەندایەتیی کردن بۆ خوادا} و تاکو ئەوەی کە تێیدا کەوتوونە ڕاجیایی و ناکۆکییەوە، بۆتان ڕوون بکەمەوە.

ئنجا پارێز لە خوا بکەن و فەرمانبەرییم بکەن، بە دڵنیایی بەس خوا پەروەرگاری من و ئێوەشە، دەجا هەر ئەو بپەرستن، ئەوە ڕاستە شەقامی خوایە، کەچی کۆمەڵەکان لە بەینی خۆیاندا ناکۆك بوون، سزای سەخت بۆ ئەوانەی کە ستەمکارن لە ئازارێکی بە ئێش.

## چوار ئینجیلەکان :

شایانی باسە: لە چوار ئینجیلەکان دا: (مَتَّی، مَرْقُس، لُوقا، یُوحَنَّا) زۆر وردەکاریی دەربارەی ژیان و بەسەرهاتی عیسا ﷺ باسکراون، بەڵام جێی پشت پێ بەستن نین مەگەر ئەوەی کە لەگەڵ قورئان و سوننەتدا پێکبگاتەوە، چونکە خوای پەروەردگار

هەواڵی پێداوین، کە خاوەن کتێبەکان، کتێبەکانیانیان گۆڕیون: ﴿ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ ۙ (١٣) ﴾ المائدة، هەروەها هەندێکیان لە بیرچووە: ﴿ وَنَسُواْ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ ۚ (١٣) ﴾ المائدة.

١- ئینجیلی (مَتّی) لە (**التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد الجديد**) لاپەڕە: (١٨٦٤ - ١٩٧٢) دەگرێتەوە و (٢٨) (إصحاح)ە[1].

٢- ئینجیلی (**مرقس**) لاپەڕە: (١٩٧٨- ٢٠٥٠) دەگرێتەوە و (١٦) (إصحاح)ە.

٣- ئینجیلی (**لوقا**) لاپەڕە: (٢٠٥٦ - ٢١٦٣) دەگرێتەوە و (٢٤) (إصحاح)ە.

٤- ئینجیلی (**یوحنا**) لاپەڕە: (٢١٦٨ - ٢٢٤٧) دەگرێتەوە و (٢٧) (إصحاح)ە.

کەواتە: چوار ئینجیلەکان لە لاپەڕە: (١٨٦٢) تاکو (٢٢٤٧) لە (**التفسير التطبيقي للكتاب المقدس**) دەگرنەوە، ئنجا (**أعمال الرُّسُل**)یش کە هەر لە نێو (پەیمانی نوێ)دان، لە لاپەڕە: (٢٢٦٢) تاکو (٢٨٠٢) دەگرنەوە.

## ٦)- سەرەنجامی مەریەم و عیسای کوڕی سەلامی خوایان لێ بێ:

پێشتریش ئاماژەیەکمان پێدا کە مەریەمی دایکی عیسا خوا لێی ڕازیبێ، دوو ڕا هەن لە بارەی کاتی کۆچکردن و دنیا بەجێهێشتنیەوە:

١- ڕایەك دەڵێ: مەریەم کۆچی دوایی کردوە، پێش ئەوەی عیسا ﷺ دەوری بگیرێ و خوا ﷻ بە کڵاوڕۆژنەدا بەرزی بکاتەوە بۆ ئاسمان و، لە جیاتی ئەو: (**یهوذا الأسخریوطي**) لە سێدارە بدرێ.

٢- ڕایەکی دیکەش دەڵێ: نەخێر بەڵکو دوای بەرزکرانەوەی عیسا ﷺ ، مەریەم خوا لێی ڕازیبێ کۆچی دوایی کردوە.

هەڵبەتە هیچ کام لەو دوو ڕایە، پشت ئەستوور نین، بە بەڵگەیەکی مێژوویی پشت پێ بەستراوو دڵنیاکەر، چونکە ئەوە لە پەنهان و نادیارە، ئیدی دەبێ بەڵگەیەك هەبێ دڵنیامان بکاتەوە و، بەڵگەیەکی تەوتۆش لەو بارەوە لەبەر دەستدا نیە، ئەوەی کە لە چوار ئینجیلەکانیشدا هاتوە، لەبەر ئەوەی هەم لە نێو خۆشیاندا لە چەند بڕگەیەکدا کێی و دژیەکییان لەسەر هەندێ لە ڕووداوەکان و، تێکگیرانیان هەیە و، لەسەر هەندێکیشیان

---

(١) (إصحاح) وا پێدەچێ لە بەرانبەر (سووڕەت)ی ئێمەدا بێ، سووڕەتی قورئان.

پێککەیشتنیان هەیە، پاشان کۆمەڵە ڕووداوێك کە لە ژیانی عیسادا ﷺ بوون و لە قورئاندا باسکراون، چوار ئینجیلەکان فەرامۆشیان کردوون.

ئنجا دەربارەی چوار ئینجیلەکان دەڵێن: خوا یەك ئینجیلی بۆ عیسا ﷺ ناردوە، وەك چۆن تەوراتێکی ناردوە بۆ مووسا و، زەبوورێکی ناردوە بۆ داوود و، قورئانێکی ناردوە بۆ موحەممەد و، (صحف)ێکی ناردوە بۆ ئیبراهیم، بەڵام ئێستا کە نەصرانییەکان چوار ئینجیلیان لەبەر دەستدان، چوار ئینجیلی فەرمیی کە لەلایەن نەصرانییەکانەوە تەبەننیی کراون و ئینجیلێکی دیکەی پێنجەمیش هەیە، کە ئینجیلی (بەرنابا)یە، واش پێدەچێ ئینجیلی پێنجەم، لە هەموویان ڕاستتر بێ، چونکە وەك لە تەفسیری سووڕەتەکانی: (**النساء والمائدة**)دا چەند شتێکم لێی وەرگرتوە، دەربارەی تەفسیری ئەو ئایەتانەی کە باسی عیسا ﷺ دەکەن، بە تایبەت بەرزکرانەوەی و وێنەی عیسا برانە سەر یەکێکی دیکە کە (**يهوذا الأسخريوطي**)یە، ئینجیلی (بەرنابا) لەوێدا دەڵێ: (عیسا بەندەی خوایە و پێغەمبەری خوا بووە و، عیسا ئیعدام نەکراوە و، خوا بەرزی کردۆتەوە و، وێنەی براوەتە سەر یەکێکی دیکە) کە (**يهوذا الأسخريوطي**)یە، وەك ئەوەی لە قورئاندا هاتوە، بەڵام ئەو ئینجیلە لەبەر ئەوەی لەگەڵ موعتەقەداتی کڵێسادا تێك دەگیرێ، بۆیە نەصرانییەکان ماوەیەکی زۆر شاردیانەوە و، دوایی یەکێك لە قەشەکان ئاشکرای کردوە و پاشان لە میسر، بۆ یەکەمین جار چاپکراوە و، ئێستاش نەصرانییەکان دانی پێدا ناهێنن، لەبەر ئەوەی لەوێدا باسی بەندایەتیی عیسا دەکات بۆ خوا، کە تەنیا ئەوە قسەی هەق و ڕاست و، لەگەڵ عەقڵ و مەنتیقدا گونجاویشە.

ئنجا ئایا ئەو چوار ئینجیلە، دەبێ کامیان ئەو ئینجیلە بێ، کە خوا بۆ عیسای ناردوە؟ بێگومان هیچ کامیان، چونکە ئەو چوار ئینجیلە هیچ کامیان وانیە، وەك چۆن ئێمە قورئان کە دەیخوێنینەوە، دەزانین ئەوە فەرمایشتی خوایە، بەڵکو ئەو چوارئینجیلە هەر چواریان بیرەوەریی و یاداشتی هەر کام لەو چوار کەسەن: (**متى، لوقا، مرقس، يوحنا**)، کە قوتابیی و شوێنکەوتووی عیسا ﷺ بوون، واتە: ئەوانە بیرەوەرییەکانی خۆیان گێڕاوەتەوە و هەندێك قسەشیان لە عیساوە گێڕاونەوە، یان هەندێك ڕووداویان لە عیسا گێڕاونەوە، کە فڵان ڕۆژی وای کردو، فڵان ڕۆژە وای فەرموو، کەواتە: بیرەوەریی و یاداشتی خۆیانن دەربارەی عیسا ﷺ، نەك ڕاستەوخۆ فەرمایشتی خوا بن، بەڵام ئەوە کە خوا دەفەرموێ: ئینجیلمان بە عیسادا [کە ئینجیل یانی: مژدە، هەروەها تەورات یانی: شەریعەت] بەڵێ ئێمە کە چوار ئینجیلەکان دەخوێنینەوە، وامان نایەتە بەرچاو:

ڕاستەوخۆ فەرمایشتی خوا بن، بە پێچەوانەی قورئانەوە: کاتێ قورئان دەخوێنین، هەست ناکەین: کەسێك وەك یاداشت گێڕابێتیەوە، نە پێغەمبەر ﷺ نە یەکێك لە هاوەڵانی، نە یەکێك لە خەلیفەکان، بەڵکو خوا ڕاستەوخۆ لەگەڵمان دەئاخڤێ و ڕاستەوخۆ دەماندوێنێ.

بە نسبەت سەرەنجامی عیساوە ﷺ بەسەرنجدانی ئەو چوار ئایەتەی سوورەتی (النساء) (١٥٦ - ١٥٩) زۆر بەڕوونیی دیارە سەرەنجامی عیسا و چۆنیەتی بەجێهێشتنی دنیای، چۆن بووە؟ پێشێ خوا ﷻ باسی جوولەکەکان دەکات، دوایی دەفەرمویێ:

﴿ وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ بُهْتَٰنًا عَظِيمًا ﴿١٥٦﴾ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ ۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٥٨﴾ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾ ﴾:

واتە: هەروەها بە هۆی بێبڕواییانەوە، (یانی: جوولەکەکان) و بەهۆی قسەکردنیانەوە لە بارەی مەریەمەوە لە شێوەی تۆمەتێکی مەزندا، [ئەوە بوو دەیانگوت: مەریەم داوێن پیسیی کردوە و، لە ئەنجامی ئەوەدا عیسای کەوتۆتە سك و پێی دووگیان بووە] هەروەها بە هۆی ئەو قسەیانەوە کە گوتیان: ئێمە مەسیح عیسای کوڕی مەریەم ڕەوانەکراوی خوامان کوشتوە، [دیارە ئەم وشەی (رسول الله)، یان فەرمایشتی خوایە و تێواخنی کردوە لەگەڵ قسەی جوولەکەکاندا، یاخود قسەی جوولەکەکانە، بەڵام بە توانجەوە، گوتوویانە: ئەوەی کە پێی وابوو ڕەوانەکراوی خوایە، ئەگەرنا جولەکەکان دانیان بەوەدا نەهێناوە، عیسا پێغەمبەر و ڕەوانەکراوی خوا بوو بێ، گرنگ ئەوەیە ئەوان گوتوویانە: ئێمە ئەو کەسە کە بە مەسیح ناسراوە (عیسای کوڕی مەریەم) کە خۆی بە ڕەوانەکراوی خوا زانیوە، یاخود خوا دەفەرموێ: ڕەوانەکراوی خوایە، ئێمە ئەومان کوشتوە، خواش دەفەرموێ:] بەڵام نەکوشتیان و نە هەڵیشیانواسی، بەڵکو وێنەی عیسایان بۆ برایە سەر یەکێکی دی [واتە: وێنەی عیسا، بۆ ئەوان و لەبەر چاوی ئەوان، برایە سەر یەکێکی دیکە، یەکێکی دیکەیان لێکرا بە عیسا، کە لە تەفسیری ئەم ئایەتانە لە بەرگی سێیەمی ئەم تەفسیرە (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز)دا، بە درێژیی باسمانکردوە و لەوێ لە ئینجیلی (بەڕنابا)شەوە هێناومانە، کە تێیدا هاتوە: ئەوەی کە بە ڕۆمەکانی ڕاگەیاند لە بەرانبەر چەند درەمێکدا و شوێنی عیسای پێگوتن، ناوی (یهوذا الأسخریوطي) بوو، تنجا

کە ڕۆمەکان دەوری ئەو شوێنەیان گرت و ژوور کەوتن لە عیسا ﷺو، حەوارییەکانی، کە دوازدە (١٢) کەس بوون بە یەهوزاوە، یاخود یازدە (١١) بوون بە یەهوزاوە و بە عیساوە دەبوونە (١٢)، یان بەوەوە دەبوونە سێزدە (١٣)، لەوەدا ڕاجیاییەك هەیە و لە قورئاندا ژمارەکەیان باس نەکراوە، بەڵام لە ئینجیلی (بەڕنابا)و لە ئینجیلەکانی دیکەشدا باسکراوە، ئنجا کاتێك لە عیسا دەچنە ژوور، خوای باڵا دەست عیسا بەرز دەکاتەوە و هەڵیدەکێشێ بە کلاو ڕۆژنەی ژوورەکەدا - کاتی خۆی لە خانوودا کلاو ڕۆژنە هەبوو، دووکەڵ و هەڵمی چێشت و ئەوانەی پێدا چۆتە سەرێ، (کولاوکە)شی پێ گوتراوە - بەوێدا خوا بەرزی کردەوە و، وێنەی ئەویش برایە سەر یەهوزا، دوایی کە ماوەیەکی پێچوو، هەر نەهاتنە دەرێ، ڕۆمەکان چوونە ژوور، ئنجا کە وێنەی عیسا برا بووە سەر یەهوزا و وەك وی دەچوو، ڕۆمەکان گوتیان: تۆ عیسای، گوتی: من ئەو نیم و عیسا بەرزکرایەوە، نەخێر بڕوایان پێ نەکردو گوتیان: عەیبە لە مردن دەترسی، ئیدی تاجێکی دڕکی دەخەنە سەر و دەیبەن لە سێدارەی دەدەن، ئنجا ئەو قسە بێهێزانەش کە لە کاتی لە سێدارەدراندا کردوونی، کە ئێستا لە چوار ئینجیلەکاندا هەن، گوایە عیسا دەڵێ:

أ- خوایە بۆچی لێم دەگەڕێی بمرم؟!

ب- خوایە دەربازم بکە، با ئەمجارەش نەمرم!

بە تەئکید ئەو جۆرە قسانە لە عیسا ناوەشێنەوە و، دیارە هی (يهوذا الأسخريوطي)ین، بۆیەش خوا دەفەرموێ: نە کوشتیان و نە هەڵیشیانواسی، وەك جوولەکەکان و ڕۆمانەکان لاف لێدەدەن، بەڵکو وێنەی ئەویان بۆ برایە سەر یەکێکی دیکە و، ئەویان لە جیاتی عیسا لە سێدارە دا}[١]، ئەوانەش کە تێیدا کەوتونە ڕاجیاییەوە، لێی لە دوو دڵییدان دڵنیانین و هیچ زانیارییەکیان لە بارەیەوە نیە، جگە لە شوێن کەوتنی گومان و، بە دڵنیایی ئەویان نەکوشت، بەڵکو خوا ئەوی بەرزکردەوە بۆ لای خۆی {بە جەستەو ڕووحەوە و بە زیندوویەتی} و بە دڵنیایی خوا زاڵی کارزانە، هیچ کام لە خاوەن کتێبەکانیش نیە مەگەر بڕوای پێدێنێ پێش مردنی، {واتە: پێش مردنی عیسا، کە لە ئاخیر زەماندا دێتە خوار، هەموو ئەوانەی خاوەن کتێب بوون بڕوای پێدێنن {ئەوە واتایەکی واتایەکی دیکەی: هیچ کام لە خاوەن کتێبەکان نیە، مەگەر لەسەرە مەرگدا دەزانێ کە عیسا پێغەمبەری خوا بووە و وەك جوولەکەکان و کافرەکان دەڵێن: زۆڵ نەبووە، هەروەها وەك نەصرانییەکانیش دەڵێن: کوڕی خوا نەبووە، بەڵکو بەندەی خوا بووە و پێغەمبەری خوا بووە، هەموو خاوەن کتێبەکان بە شێوەیەکی

---

(١) ئەو کەوانەیە زۆر درێژ بوو، بەڵام بەباشم زانی ئیواخنی تەفسیری ئایەتەکانی بکەم.

ڕاست ئیمانی پێدێنن لەسەرە مەرگدا و هەموو شتێکیان بۆ دیاردەکەوێ}[1] هەروەها ڕۆژی هەڵسانەوەش دا، لەسەریان دەبێتە بەڵگەو شایەد.

دیارە ئەمە وردەکاریی دیکەی هەیە کە وەك گوتمان: لە تەفسیری سوورەتی (النساء)، لە کاتی تەفسیرکردنی ئەم ئایەتانەدا، هەروەها لە تەفسیری سوورەتی (آل عمران)دا و، جارێکی دیکە لە تەفسیری سوورەتی (المائدة)دا، لە هەر کام لەو سوورەتانەدا، کەم و زۆر باسی بەسەرهاتی عیساو ﷺ چۆنیەتی بەجێهێشتنی ئەم ژیانە دنیاییەمان کردوە.

## چەند دەرس و حیکمەتێك لە بەسەرهاتی مەریەم و عیسادا:

ئێمە سەرجەم حەوت دەرس و پەندمان لێی وەرگرتوون، کە دەگونجێ زۆر شتی دیکەی لێ وەربگیرێ:

١)- ڕستەی (يَٰلَيۡتَنِي مِتُّ قَبۡلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسۡيٗا مَّنسِيّٗا )، کە قسەی مەریەمە (خوا لێی ڕازی بێ)، دوای ئەوەی عیسای وەسك دەکەوێ و پێی تۆڵدار دەبێ، کە زانایان لەو بارەوە ڕاجیاییان هەیە، ئایا خوا کە لەسەر زمانی جیبریل دەفەرموێ: ﴿ قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمٗا زَكِيّٗا ﴾، ئایا چۆنی ئەو منداڵە پاك وچاكە پێ بەخشی؟

١- ڕایەکیان دەڵێ: (نَفَخَ فِي جيبِ قَميصِهَا)، (جيب) یەخەی کراس، ئەو دابڕاوەیە کە ئینسان لێیەوە کراس لەبەر دەکات، یان کە ئافرەت مەمك لێیەوە بدات بە منداڵ، کراسەکەی دابڕاوەییەکی هەیە بۆ ئەوەی مەمکی لێ بێنێتە دەرێ، لەوێوە فووی پێداکردوە و، فووەکە چووەتە نێو منداڵدانی، یانی: ڕووحی عیسا ﷺ بووە، ڕاستەوخۆ جیبریل خستوویەتە نێو جەستەی، مەریەمی دایکیەوە.

٢- هەندێکی دیکە لە زانایان دەڵێن: جیبریل فووی بە دەمیدا کردوە، واتە: لە ڕێی دەمیەوە، ڕووحەکەی بە بەرداکردوە.

بەڵام خوا ﷻ ئەو وردەکارییە باس ناکات و، تەنیا لە سوورەتی (النساء)دا بەگشتی دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُۖ ﴿١٧١﴾ ﴾، واتە: بێگومان مەسیح عیسای کوڕی مەریەم ڕەوانەکراوی خوا و، وشەی خوا بوو، فڕێیدا بۆ مەریەم و، ڕووحێك بووە لەلایەن خواوە.

فڕێیدا یانی: لە ڕێی جیبریلەوە، کە بۆی چۆتە سەر شێوەی پیاوێکی تێر و تەواو.

---

(١) ئەوەش کەوانەیەکی دیکەیە.

ئنجا زانایان دەڵێن: لێرەدا کە مەریەم دەڵێ: ﴿يَٰلَيۡتَنِي مِتُّ قَبۡلَ هَٰذَا﴾، ئەی خۆزگە پێش ئەمە مردبامایە! ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە مرۆڤ کاتێك دەکەوێتە حاڵەتێکی زۆر ناخۆشەوە، دروستە مردن بە ئاوات بخوازێ.

بەڵام گرنگ ئەوەیە لە رووی ناشوکرییەوە نەبێ، لە رووی ڕەخنەگرتن لە خواو، بێزاریی دەربڕینەوە بەرانبەر بە قەدەری خوا نەبێ، بەڵکو لەو رووەوە بێ، کە: خوایە! گیانەکەم لێم وەربگرەوە، ئەم حاڵەم بۆ تەحەممول ناکرێ، کە ئەوەی مەریەم بریتی بووە لە حاڵەتێك خۆی بە شەرمەزار و عەیبدار زانیوە، چونکە ئافرەتێکی پاك و پاکیزەو ڕێك و پێك، لە هەموو شتێك بۆی ناخۆشتر، تۆمەتبارکردنیەتی بە داوێن پیسی.

وەك دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازیبێ لە ڕووداوی بوختان (حادثة إفك)دا کە لە (صحيح البخاري) و(صحيح مسلم)دا هاتوە و ئەسڵەکەی لە سوورەتی (النور)دا هاتوە، دیارە چەند ناڕەحەت بووە، چونکە ئینسانی پاك، زۆر زۆر لەسەر دڵی قورسە، تۆمەتبار بکرێ بە ناپاکیی.

کەواتە: بە قیاس لەسەر ئەم حاڵەتە: کاتێك ئینسان دەکەوێتە نێو حاڵەتێکی زۆر ناڕەحەتەوە، دروستە مردن بە ئاوات بخوازێ و، داوا لە خوا بکات کە مەرگی بۆ بێنێ، بەڵام بە مەرجێك لەو ڕووەوە نەبێ کە ناڕازییە بە قەدەری خوا و، لە ڕووی ڕەخنەگرتنەوە لە خواو لە قەدەری خوا نەبێ، بەڵکو لەو ڕووەوە بێ، کە: ئەوەك لەو تاقیکردنەوەیە دەرنەچێ و بارەکەی بۆ تەحەممول نەکرێ.

٢)- لە ڕستەی: (وَهُزِّيٓ إِلَيۡكِ بِجِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ)، یانی: (ئەی مەریەم!) قەدی دار خورمایەکە بەلای خۆتدا بکێشەو ڕایوەشێنە.

ئەمە لێی وەردەگیرێ کە بەڵێ بژێو لەلای خواوەیە، ڕزق و ڕۆزیی خوا دەیدا، بەڵام پێویستیی بە هۆکاریش دەکات.

لێرەدا مەریەم (خوا لێی ڕازی بێ)، خوا پێی دەفەرموێ، لە ڕێی جیبریلەوە، ئەگەر ئەو بووبێ کە ئەو قسەیەی ئاڕاستە کردوە، یاخود لە ڕێی عیساوە، ئەگەر بێژەرەکە عیسا بووبێ، کە دار خورمایەکە، ئەو قەدە دارخورمایەی کە پاڵی ویداوە، لە کاتی منداڵ بووندا، بەلای خۆیدا بیکێشێ و ڕایوەشێنێ، واتە: دەستێکی بگەیەنێتێ، چونکە بە تەئکید قەدە دار خورمایەکە لەوە بەهێزتر بووە، مەریەم بتوانێ ڕایکێشێ بەلای خۆیداو ڕایوەشێنێ، بەڵام ئەوە هۆکارێکە، دەبێ هۆکارێك هەبێ، ئنجا خوا ﷻ لە میانی

هـۆكارەكان و، بەكارهێنـانی هۆكارەكانـەوە، ئـەوەی بیـەوێ ئەنجامـی دەدا، وەك پێشـینان گوتوویانـە: (خـوا بـۆ كـەس نابارێنـێ)، واتـە: دەبـێ كۆشـش و هەوڵێـك هەبـێ.

هەروەها لە فەرمایشتی پێغەمبەردا هاتوە:

{لَوْ أَنَّكُمْ تَتَوَكَّلُونَ عَلَى اللَّهِ حَقَّ تَوَكُّلِهِ، لَرَزَقَكُمْ كَمَا يَرْزُقُ الطَّيْرَ، تغدُو خِمَاصًا، وَتَروحُ بِطَانًا}[1]، واتـە: ئەگـەر بەڕاستیی پشـت بـە خـوا ببەسـتن، بژێوتـان دەدات، وەك چـۆن بژێـوی باڵنـدە دەدات، بەیانییـان بـە سـكی برسـییەوە دەڕواو، ئێـواران بـە سـكی تێـرەوە دێتـەوە.

بـەڵام گرنـگ ئەوەیـە باڵنـدە: دەرچـوونی بەیانییـانی هەیـە و، هاتنـەوەی ئێوارانیـشی هەیـە، نـەك هـەر لـە هێلانەكـەی خـۆی هەڵنیشـێ و خـوا ڕزقـی بـۆ ببارێنـێ! بەڵكـو دەبـێ خـۆی بـۆی بـڕوا، كەواتـە: پێغەمبـەر كـە دەفەرمـوێ، ئەگـەر بەڕاسـتیی پشـت بـە خـوا ببەسـتن، بێگومـان بەڕاستیی پشـت بـە خـوا بەسـتن، ئـەوە نیـە دەسـت لـە كـراس دەربهێنی و، دەسـت لـە ئەژنۆیـان وەربێنـێ و، لـە ماڵـی خـۆت لێـی دانیـشی! چونكـە پێغەمبـەر ئـەو پشـت بـە خـوا بەسـتنە، دەچوێنـێ بـە باڵنـدەوە، باڵندەكـە بەیانییـان دەردەچـێ بـۆ ئـەوەی نێچیرێـكی دەسـت بكـەوێ، دەردەچـێ بـۆ ئـەوەی بژێوێـكی دەسـت بكـەوێ و دوایـی ئێوارانیـش دێتـەوە، وەك گوتـراوە: لـە تـۆ حەڕەكـەت و لـە خـوا بەرەكـەت.

٣)- كە دەفەرموێ: (تُسَٰقِطۡ عَلَيۡكِ رُطَبٗا جَنِيّٗا )، واتە: فەریكە خورمای پێگەیشتووی ئاسان هەزمكراو و ئاسان لێ بۆوەت بەسەردا دەبارێنێ، لە كاتێكدا قەدە دارخورمایەكە ڕادەوەشێنی، پزیشكگەریی ئێستا دەریخستوە، كە خورما و فەریكە خورما، شتێكی زۆر بەسوودە بۆ ئافرەتی زەیستان، بۆیە لە كوردەواریی خۆشمان دا، ژنی زەیستان حەڵوای بۆ دروست دەكەن، وا پێدەچێ هەر شتێك شیرین بێ، بایی خۆی سوودی هەیە، بەڵام باشترین شت، ئەو خواردن و خۆراكانەن كە خوا كردن و، مرۆڤ دەستی تێنەخستوون، هەنگوینە، فەریكە خورمایە، هەر شتێكی دیكەی شیرین، چونكە ئافرەتی زەیستان، خوێنی زۆر لەبەر دەڕوات و بێهێز دەبێ و، شیرینییش زووتر دەبێتە وزە و بە ئاسانیی هەرس دەبێ، هەروەك بۆ ڕۆژووەوانیش سوننەتە ئەگەر دەستی بكەوێ، بە چەند دەنكە خورمایەك ڕۆژوو بشكێنێ، ئەمە حەقیقەتێكی زانستییەو، لەم ڕۆژگارەدا زیاتر دەركەوتوە.

٤)- ڕستەی: (فَلَنۡ أُكَلِّمَ ٱلۡيَوۡمَ إِنسِيّٗا )، خوا عز وجل یان لە ڕێی جیبریلەوە، یاخود لە ڕێی عیسای مەلۆتكەوە سەلامی خوایان لێبێ، بە مەریەم دەفەرموێ، بڵێ: (فَلَنۡ أُكَلِّمَ ٱلۡيَوۡمَ إِنسِيّٗا )، ئەمڕۆ قسە لەگەڵ هیچ مرۆڤێكدا ناكەم، ئنجا دواییش دەفەرموێ: ﴿ فَأَشَارَتۡ إِلَيۡهِۖ ﴾، [دوای ئەوەی لێی دەپرسن] دەفەرموێ: مەریەم ئاماژەی بۆ كرد.

---

(١) أخرجه الترمذي: ٢٣٤٤، وابن ماجه: ٤١٦٤، وأبو يعلى: ٢٤٧، وابن حبان: ٧٣٠.

ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ: کەسێك سوێند بخوات، کە قسە ناکات، دوایی زمانی ئامـاژە بەکاربێنێ، ئنجا بە چاو بێ، بە دەست بێ، بە هەر شێوەیەك بێ، ئەوە بە سوێند شکاو (حانث) لە قەڵەم نادرێ، واتە: سوێندەکەی نەشکاندوە، چونکە ئاماژە کردن، بە قسەکردن لە قەڵەم نادرێ، بە بەڵگەی ئەوەی کە مەریەم پێی گوتراوە: بڵێ: هەرگیز ئەمڕۆ قسە لەگەڵ هیچ مرۆڤێکدا ناکەم، دواییش کە قسەی لەگەڵدا دەکەن، ناڵێ: قسە ناکەم، بەڵام ئاماژە دەکات بۆ مەلۆتکەکەی کە عیسایە ﷺ، کەواتە: ئاماژەکردنەکە، لەگەڵ قسەنەکردنەکەدا تێك ناگیرێن، تاکو بگوترێ: مەریەم ئەو بەڵێنەی داویەتی، شکاندوویەتی.

٥)- ڕستەی: (فَلَنْ أُكَلِّمَ ٱلْيَوْمَ إِنسِيًّا)، ئەمە لێشی وەردەگیرێ، کە لە بەرانبەر خەڵکی نەفامدا، زۆر جاران بێدەنگیی پێویستە، یان پەسندە، یان ڕەوایە، بەڵێ جاری وا هەیە بێدەنگیی باشترە لە قسەکردن، گوتراویشە (جَوَابُ الأَحْمَقِ السُّكُوت) وەڵامدانەوەی بابای نەفام و کەودەن بریتیە لە بێدەنگیی، زۆرجاران بێدەنگیی، وەڵامێکی ددان شکێنە.

٦)- ڕستەی: (مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا)، نە بابت پیاوی خراپ بوو، نە دایکت ئافرەتێکی داوێن پیس بوو، ئەمە لێی وەردەگیرێ: کە گوناح کردن لە ڕۆڵەو وەچەی کەسانی باش، باب و دایکی باش و بە دین و چاك، ناشیرینتر و ناقۆڵاتر و، چاوەڕوان نەکراوترە.

٧)- ڕستەی: (فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا)، بۆی چووە سەر شێوەی مرۆڤێکی تێر و تەواو و ڕێك و پێك، ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ کە فریشتەکان دەتوانن خۆیان لە شێوەی مرۆڤدا بەرجەستە بکەن.

ئنجا زانایان لەو بارەوە زۆر قسەیان کردوە، ئایا جیبریل کە لە فەرموودەی صەحیحدا هاتوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خۆی پێشاندام شەشسەد (٦٠٠) باڵی هەبوو، ئاسۆی ون کردبوو لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی خۆی، خۆی پێشاندام!

ئەدی ئایا ئەو هەموو زەبەلاحیی و گەورەیی قەبارەی جیبریل، چی لێدێ کاتێك کە لە شێوەی پیاوێکدا خۆی پێشاندەدات، ماددە زیادەکەی چی لێدێ؟ لەو بارەوە زانایان زۆر قسەیان کردوە، کە من پێم وایە هیچی پێویست نیە، چونکە جیبریل کاتێك کە لەسەر شێوەی پیاوێك خۆی پێشان دەدا، یان فریشتەکان لەسەر شێوەی چرایەك بینراون، وەك کۆمەڵێك لە هاوەڵان لەسەر شێوەی چرا بینیویانن، ئەوە تەنیا وێنەیەکە، ئەوان خۆی دەبەنە سەری و، خوای پەروەردگاریش ئەو توانایەی داوە بەوان و، وەك ئێمە

نین، کە زۆرجاران لە ئەنجامی قیاسکردن لەسەرخۆ (**قیاس النفس**)دا، ئینسان تووشی ئەو هەڵانە دەبێ، جەستەی مرۆڤ سنووردێکی دیاریکراو و ئەندازەیەکی دیاریکراوی هەیە، ئەگەر لەوە بچووکتر بێتەوە، بە کەڵک نایەت و، لەوەش گەورەتر بێ، بە کەڵک نایەت، بەڵام فریشتەکان سروشت و بابەتێکی دیکەن و جۆرێکی دیکەن.

لە مەسەلەی چوونە سەر شێوەی مرۆڤێکی تێر و تەواو، لەلایەن جیبریلەوە، دا (**جمال الدین القاسمي**) لە تەفسیرەکەیدا[1] هەندێ قسە نەقڵ دەکات لە (**القاشاني**)یەوە، دەڵێ:

**(وَإِنَّمَا تَمَثَّلَ لَهَا بَشَراً سَوِيَّ الخلق حَسَنَ الصُّورَة، لِتَتَأثَّر نَفْسُهَا بِهِ وَتَستَأنِس، فَتَتَحَرَّكَ على مُقْتَضَى الجِبِلَّةِ، وَيَسْرِيَ الأثَرُ مِنَ الخَيَالِ فِي الطَّبِيْعَة، فَتَتَحَرَّكَ شَهْوَتُهَا فَتَنْزِلَ كَمَا يَقَعُ فِي المَنَامِ مِنَ الإحْتِلاَمِ...)**.

واتە: بۆیە جیبریل بۆ مەریەم چۆتە سەر شێوەی مرۆڤێکی ڕێك و پێك و وێنە جوان، تاکو نەفسی مەریەم کارتێکراو بێ و هۆگری بێ، تنجا بەپێی ئەو سروشتە، کە خوا مرۆڤی لەسەر خوڵقاندوە، نەفسی بجووڵێ و ئەو کارتێکردنە لە خەیاڵەوە بگوازرێتەوە بۆ سروشت، (واتە: لە حاڵەتی مەعنەویی و خەیاڵییەوە بگوازێتەوە بۆ حاڵەتێکی جەستەیی)، سەرەنجام ئارەزووی بجووڵێ [مەبەستی پێی ئەو تۆو ئاوەیە کە مرۆڤی لێ دروست دەبێ، بێتە خوار بۆ منداڵدانی] وەك چۆن لە حاڵەتی لە خەوندا حاڵەتی ئیحتیلام [بۆ پیاوان و بۆ ئافرەتان دێتە پێش].

لێرەدا (**القاشاني**) کە وای گوتوە (**جمال الدین القاسمي**)یش لێی خواستۆتەوە وەك پشتگیریی کردن و، هەندێ لە ڕاڤەکەرانی دیکەی قورئانیش ئاماژەیان بەوە داوە، بەڵام من ئەوەم پێ شتێکی گونجاو نیە، بۆچی؟

چونکە دروست بوونی عیسا ﷺ هەر خۆی شتێکی موعجیزەیە، ئیدی پێویست بەو تەئویل و پینەو پەڕۆیە ناکات، هەروەها ئەوەی لە هەندێك تەفسیران دا هاتوە، کە جاری وا هەیە، ئاوی ئافرەت قەرەبووی تۆو (**مني**)ی پیاویش دەکاتەوە واتە: دەگونجێ منداڵ دروست ببێ بەبێ تۆوی پیاو! دەڵێم: ئەو قسانە بۆ کەسێك باشن، کە بڕوای بە موعجیزە نەبێ، بڕوای بە یاسادڕ (**خارق العادة**) نەبێ، ئەگەرنا بۆ بابای بڕوادار، ئەو پینەو پەڕۆیە پێویست ناکات.

---

[1] خاوەنی (محاسن التأویل) ج٧، ص (١٢٢ ، ١٢٣).

خوا ﷻ بە دەقی قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُ ﴿١٧١﴾﴾ النساء، واتە: مەسیح عیسای کوڕی مەریەم ڕەوانەکراوی خوا و وشەی وی بووە، فڕێداوە (هەڵیداوە) بۆ مەریەم، هەروەها ڕووحێك بووە لەلایەن ویەوە.

واتە: ڕووحەکە لە ڕێی جیبریلەوە خراوەتە نێو جەستەی مەریەمەوە، ئیدی پێویست بەو تەئویل و پینەو پەڕۆیە ناکات، هەرچەندە ئەوەش کە: جیبریل بۆی چۆتە سەر شێوەی پیاوێکی ڕێك و پێك و تێرو تەواو، دەگونجێ ئەوەشی لێوەربگیرێ و حیکمەتەکەی ئەوە بووە کە مەریەم لە پێش چاوی جوان بێ و، پێی کارتێکراو بێ، بەڵام ئەوە کە بۆ مەریەم ببێتە قەرەبوو کردنەوەی جووت نەبوونی لەگەڵ هاوسەرێك دا، من ئەوە بە دوور دەزانم و ئایەتەکانیش ئەوە ناگەیەنن، بەڵکو ئەوە زیاتر قسەی کەسانێکە کە دەیانەوێ موعجیزە بەرنە عەقڵی کەسانێکەوە کە بڕوایان پێی نیە، کە ئەوەش بە بۆچوونی من خۆ ماندووکردنێکی بێ سوودە و، پینەو پەڕۆیەکی ناپێویستە، چونکە کەسێك بڕوای بە موعجیزە نەبێ، ئیمان بە پینەو پەڕۆ پەیدا نابێ و، کەسێکیش بڕوای بەموعجیزە هەبێ، پەکی لەسەر ئەوە نەکەوتوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان دە (١٠) ئایەتە، ئایەتەکانی: (٤١ - ٥٠)، لەو (١٠) ئایەتەدا وتووێژی نێوان ئیبراهیم و بابی (ئازەر) باسکراوە، کە ئیبراهیم چوار جاران بە بابی دەڵێ: ﴿ يَٰٓأَبَتِ ﴾، ئەی بابە گیان! یان ئەی بابی خۆم!

سەرەتا دەیدوێنێ واز لە بتپەرستیی و شەیتان دۆستیی بێنێ، پێی ڕادەگەیەنێ کە ئەو زانیارییەکی بۆ هاتوە، کە لەلای بابی نیە و، پێی ڕادەگەیەنێ، کە بە قسەی شەیتان نەکات کە سەرپێچیکار بووە لە فەرمانی خوا، پاشان لە کۆتاییی دا پێی دەڵێ: بابە گیان! دەترسێم بە هۆی دۆستایەتیی شەیتان و سەرپێچیی کردنی خواوە، ببیە دۆستی شەیتان و خوا سزات بدات.

بەڵام بابی زۆر بەڕەقیی وەڵامی دەداتەوە و هەڕەشەی لێ دەکات بە دەرکردن، کەچی ئیبراهیم ﷺ خۆی شلوێ ناکات و زۆر بە ئەدەب و نەجابەتەوە بابی دەدوێنێ و، خوا حافیزی لێدەکات و، گفتی بۆ پاڕانەوەو داوای لێبوردن کردن لە پەروەردگاریشی، پێ دەدات.

ئیدی سەرەنجام کە ئیبراهیم لێیان دادەبڕێ، خوا ئیسحاق و یەعقووبی پێدەدات، ئیسحاقی پێدەدات و دواییش یەعقووب کە ئەویش کوڕی ئیسحاقە، دیارە ئیبراهیم ﷺ یەعقووبیشی هەر بینیوە، بۆیە خوا دەفەرموێ: هەردووکیانم پێدا، ئەگەرنا ئەوان کوڕو نەوەن و، هەر کامێکیشیان بە پێغەمبەر دەگێڕێ و، لە بەزەیی خۆی و ناوبانگی بەرزو پەسندیش، بەهرەمەندیان دەکات.

﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِبۡرَٰهِيمَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيًّا ﴿٤١﴾ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعۡبُدُ مَا لَا يَسۡمَعُ وَلَا يُبۡصِرُ وَلَا يُغۡنِي عَنكَ شَيۡـٔٗا ﴿٤٢﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي قَدۡ جَآءَنِي مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَمۡ يَأۡتِكَ فَٱتَّبِعۡنِيٓ أَهۡدِكَ صِرَٰطٗا سَوِيّٗا ﴿٤٣﴾ يَٰٓأَبَتِ لَا تَعۡبُدِ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ كَانَ لِلرَّحۡمَٰنِ عَصِيّٗا ﴿٤٤﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٞ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيۡطَٰنِ وَلِيّٗا ﴿٤٥﴾ قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنۡ ءَالِهَتِي يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهِ لَأَرۡجُمَنَّكَۖ وَٱهۡجُرۡنِي مَلِيّٗا ﴿٤٦﴾ قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيۡكَۖ سَأَسۡتَغۡفِرُ

لَكَ رَبِّيٓ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيًّا ﴿٤٧﴾ وَأَعۡتَزِلُكُمۡ وَمَا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدۡعُواْ رَبِّي عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّي شَقِيًّا ﴿٤٨﴾ فَلَمَّا ٱعۡتَزَلَهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۖ وَكُلًّا جَعَلۡنَا نَبِيًّا ﴿٤٩﴾ وَوَهَبۡنَا لَهُم مِّن رَّحۡمَتِنَا وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ لِسَانَ صِدۡقٍ عَلِيًّا ﴿٥٠﴾ ﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

[هەروەها لە کتێبدا باسی ئیبراهیم (یان بۆ) بکە، بەڕاستیی ئەو کەسێکی زۆر ڕاست بوو، پێغەمبەریش بوو ﴿٤١﴾ کاتێک بە بابی گوت: ئەی بابی خۆم! بۆچی شتێک دەپەرستی کە نابیستێ و نابینێ و، هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنێ؟ [هیچ دادێکت نادا]؟ ﴿٤٢﴾ ئەی بابی خۆم! بە دڵنیایی من زانیارییەکم (لە خواوە) بۆ هاتوە کە بۆ تۆ نەهاتوە، بۆیە شوێنم بکەوە، ڕێیەکی ڕاستت پێشان دەدەم ﴿٤٣﴾ ئەی بابی خۆم! شەیتان مەپەرستە، بێگومان شەیتان سەرپێچییکاری (خوای) بە بەزەییە ﴿٤٤﴾ ئەی بابی خۆم! بەڕاستیی دەترسم لەلایەن (خوای) میهرەبانەوە، سزاو ئازارت بگاتێ و، ببیە دۆستی شەیتان ﴿٤٥﴾ بابی گوتی: ئەی ئیبراهیم! ئایا تۆ پەرستراوەکانی منت ناوێن؟ مسۆگەر ئەگەر واز نەهێنی (لەو پەیامەی دەیگەیەنی)، بەرد بارانت دەکەم و ماوەیەکی دوورو درێژیش برۆ، (لە پێش چاوم ونبە) ﴿٤٦﴾ ئیبراهیم گوتی: سەلامت لێ بێ، بە دڵنیایی داوای لێبوردنت بۆ لە پەروەردگارم دەکەم، چونکە ئەو بەرانبەرم مشوورخۆر و میهرەبانە ﴿٤٧﴾ کەناریش دەگرم لە خۆتان و، لەوەی لە جیاتی خوا لێی دەپاڕێنەوە، لە پەروەردگاریشم دەپاڕێمەوە دەرووم لێ بکاتەوە، نیزیکە لە لێ پاڕانەوەی پەروەردگارم بێ مراد نەبم ﴿٤٨﴾ ئنجا کاتێک دووریی گرت لە خۆیان و لەوەی لە جیاتی خوا دەیپەرستن، هەر کام لە ئیسحاق (ی کوڕی) و یەعقووب (ی نەوەی)مان پێ بەخشین و، هەر کامێکیشیانمان کردە پێغەمبەر ﴿٤٩﴾ لە بەزەیی خۆشمان پشکمان پێ بەخشین و، ناوبانگێکی پەسندی بەرزیشمان بۆیان ڕەخساند (لە نێو خەڵکی دا) ﴿٥٠﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(صِدِّيقًا): دەڵێ: (الصِّديقُ: مَنْ كَثُرَ مِنْهُ الصِّدْقُ)، (صِدِّیق) کەسێکە کە زۆر ڕاست بێ، ڕاستیی زۆر تێدا بێ، ئنجا (صدق) تەنیا ڕاست گوتن نیە، بەڵکو ڕاستکردن و ڕاست خوا پەرستن و ڕاست مامەڵەکردن، واتە: ئەم (صِدْق)ە، هەم دەری مرۆڤ، هەم دەروونی، هەم قسەی، هەم نیەتی، هەم کردەوەی، دەگرێتەوە.

هەندێکیش گوتوویانە: (الصِّدِّيقُ: مَنْ صَدَّقَ بِقَوْلِهِ، اعْتِقَادَهُ، وَحَقَّقَ صِدْقَهُ بِفِعْلِهِ)، (صدیق) کەسێکە قسەی خۆی و ئەوەی کە دەری دەبڕێ، بەڕاستی دابنێ و، ڕاستییەکەی خۆشی بە کردەوە بەرجەستە بکات.

(يَٰٓأَبَتِ): ئەی بابی خۆم! لە ئورجوزەیەکدا دەربارەی ئەم (أَبَتِ)ی، ئەم (ت)یە، کە دەچێتە سەر (اب وأم)، هاتووە:

(وَفِي النِّدا أَبَتِ أَمَتِ عَرَض وَارْفَعْ أو اكْسِر ومن اليا، التا، عِوَضْ).

واتە: لە کاتی بانگکردندا، دەگوترێ: (أَبَتِي، أَمَتِي) جا دەگونجێ بڵێ: (أبتا، أبتي، أو أُمّتا، أُمّتي) واتە: بەسەر، یان بە ژێر و، لە جیاتی (ي)ش لە جیاتی بڵێ: (أبي، أمي) (ت) جێی (ي) دەگرێتەوە و قەرەبووی ئەوی کردۆتەوە.

(وَلَا يُغْنِي عَنكَ شَيْـًٔا): دەگوترێ: (أَغْنَاهُ عَنْهُ كَذَا: كَفَاهُ) واتە: ئەو شوێنەی بۆ گرت، یاخود دادی دا، بە کەڵکی هات، کەواتە: (وَلَا يُغْنِي عَنكَ شَيْـًٔا) واتە: هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنێ، هیچ دادێکت نادات، هیچ کەلێنێکت بۆ پڕ ناکاتەوە.

(سَوِيًّا): (رجل سوي: اسْتَوَت أَخْلَاقُهُ وَخَلْقُهُ عَنِ الإِفْرَاطِ وَالتفرِيطِ، السّوي: المصَان عَنِ الإِفْرَاطِ وَالتفرِيطِ، مِنْ حَيْثُ القدرِ والكيفية)، دەگوترێ: پیاوێکی (سوي) واتە: هەم لە ڕووی ڕەوشتەوە، هەم لە ڕووی جەستەوە، نە زێدەڕۆیی تێدایە، نە کەمتەرخەمیی تێدایە، هەروەها (سوي) واتە: پارێزراو لە تێپەڕاندن و بەزایەدان، لە ڕووی ئەندازەو لە ڕووی چۆنیەتییەوە.

(أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ ءَالِهَتِي): ئایا تۆ پەرستراوەکانی منت ناوێن؟ نادیدەیان دەگری؟ دەگوترێ: (رَغِبَ فِيهِ وَإِلَيْهِ: حَرَصَ عَلَيْهِ) ئەگەر بگوترێ: (رَغِبَ فِيهِ) یان (رَغِبَ إِلَيْهِ)

واتــە: ســوور بــوو لەســەری، بەلایــەوە گرنــگ بــوو، بایەخــی پێــدا، بــەڵام (رَغِبَ عَنْهُ: زَهِدَ فِیهِ، وَانْصَرَفَ عَنْهُ) واتــە: بــە کەمــی گــرت و، بەدڵــی نەبــوو، نەیویســت.

(لَأَرْجُمَنَّكَ): واتــە: بــەرد بارانــت دەکــەم، ئەویــش لــە چیــەوە هاتــوە؟ (الرِّجَامُ: الحِجَارَة، وَالرَّجْمُ: الرَّمْيُ بالرِّجَامِ)، (رجام) بــە بــەرد دەگوتــرێ: کەواتــە: (رَجْم)یــش بریتیــە لــە بــەرد پێــدادان.

(وَٱهْجُرْنِي ): واتــە: لێــم دووربکــەوەوە، (الهَجْرُ وَالهِجْرَانُ: مُفَارَقَةُ الإِنْسَانِ غَيْرَهُ، بَدَنَاً أو لِسَانَاً أو قَلْبَاً)، (هَجْر و هِجْرَان) بریتیــە لــەوە کــە مــرۆڤ لــە غەیــری خــۆی دووربکەوێتــەوە بــە جەســتە، یــان بــە زمــان، قســەی لەگــەڵ نــەکات، یاخــود بــە دڵ خــۆشی نــەوێ و بیبوغزێنــێ.

(مَلِيًّا ): واتــە: ماوەیــەکی زۆر، دەگوتــرێ: (عِشْتُ مَلِيًّا: طَوِيلاً) ماوەیــەکی زۆر، (وَالمَلَوَانُ: اللَّيْلُ وَالنَّهَار) شــەو و ڕۆژ پێیــان دەگوتــرێ: (مَلَوَان) لەبــەر ئــەوە کــە هەردووکیــان کاتیــان پێدەچــێ، (تَمَلَّيْتَ الثَّوبَ: تَمَتَّعْتَ بِهِ طَوِيلاً) ماوەیــەکی زۆرت لەگــەڵ ئــەو پۆشــاکەدا بــردە ســەر، واتــە: ماوەیــەکی زۆر پۆشــیت.

(حَفِيًّا ): (الحَفِيُّ: البَرُّ اللَّطِيفُ، حَفِيْتُ بِفُلاَنٍ وَتَحَفَّيْتُ بِهِ تَحَفِّيًا: إِذَا عَنِيتَ بِإِكْرَامِهِ، وَالحَفِيُّ: العَالِمُ بالشَيءِ)، (حفي) بریتیــە لــە چاکــەکار و خاوەن لوتــف، دەگوتــرێ: (حَفَيْت بِفُلاَنٍ وَتَحَفَّيْتُ بِهِ تَحَفِّيًا) ڕێــزم لێگــرت و گرنگییــم پێــدا، بایەخــم پێــدا، (والحَفِي) بریتیــە لــە زانــا بــە شــتێك، وەك لــە ســوورەتی (الأعــراف)دا هاتــوە: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنْهَا ﴿١٨٧﴾ ﴾، واتــە: پرســیارت لێدەکــەن وەك ئــەوەی تــۆ زۆر پێــی ئاشــنابی و لێــی شــارەزابی و، زۆر گرنگییــت پێدابــێ، لــە ڕووی لــێ شــارەزابوون و پێــی ئاشــنابوونەوە.

(لِسَانَ صِدْقٍ ): (لســان) واتــە: زمــان، (صِدْق) بــە مانــای ڕاســتیی دێ، بــەڵام لێــرەدا دەڵــێ: (يُعَبِّرُ عَنْ كُلِّ فِعْلٍ فَاضِلٍ ظَاهِرَاً أو بَاطِنَاً بالصِّدْقِ، فَيُضَافُ إِلَيْهِ ذَلِكَ الفِعْلُ الَّذِي يُوصَفُ بِهِ، نَحْو: ﴿ فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ ﴿٥٥﴾ ﴾القمــر، ﴿ أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ ﴿٢﴾ ﴾یونــس، هەروەهــا کــە ئیبراهیــم ﷺ فەرموویــەتی: ﴿ وَٱجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي ٱلْآخِرِينَ ﴿٨٤﴾ ﴾الشــعراء، لــەم سوورەتەشــدا: ﴿ وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا ﴿٥٠﴾ ﴾مریــم).

(لســان صــدق) تەعبیــر دەکات لــە کردەوەیــەکی بــاش، چ ڕواڵەتیــی بــێ، یاخــود پەنهــان، وشــەی (صِــدْق) بــەوە تەعبیــری پــێ دەکــرێ، ئنجــا ئــەوە پاڵدەدرێتــە لای ئــەو شــتە کــە دەویســترێ وەســف بکــرێ، بــۆ وێنــە: ﴿ فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ ﴾، (مقعــد) واتــە: نشــینگە، یــانی:

لە نشینگەیەکی زۆر پەسندیدا، کە خوای پەروەردگار باسی ئەهلی تەقوا دەکات: ﴿ فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ ﴿٥٥﴾ ﴾القمر، لە نشینگەیەکی پەسندکراودا لەلای حوکمڕانی توانادار [کە خوایە ﷻ].

هەروەها کە دەفەرموێ: ﴿ أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِندَ رَبِّهِمْ ﴿٢﴾ ﴾یونس، واتە: (سابقة فضل)ی، خاوەن ڕابردوویەکی باشن، هەروەها کە ئیبراهیم دەفەرموێ: ﴿ وَٱجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي ٱلْآخِرِينَ ﴿٨٤﴾ ﴾الشعراء، واتە: ناوبانگی چاك و ناو وشۆرەتی چاك [کە خەڵك مەدحم بکەن و ستایشم بکەن و لێم ڕازیبن] بڵاوی بکەوە بە نێو خەڵکدا، بۆچی ئیبراهیم داوای کردوە؟ چونکە ئەگەر تۆ لە نێو خەڵك دا، ناو و ناوبانگی چاکت نەبێ و، خەڵك خۆشیان نەوێی و ڕێزت نەگرن، قسەت لێوەرناگرن، دیارە ئیبراهیم کە (خلیل الله) بووە، ئەوەی وەك ئامرازو هۆکاری گەیاندنی پەیامەکەی خوا، لە خوا داواکردوە، کە لە نێو خەڵکدا ناوبانگی چاکی هەبێ و، دوعاکەشی باش گیرابووە، ئەوەتا ئێستا وێڕای مسوڵمانان، هەر کام لە جوولەکەو نەصرانیی و بەڵکو صابیئەش، بگرە کۆی ئەوانەی کە خۆیان بە خاوەنی کتێبی ئاسمانیی و خوایی دەزانن، ڕێز لە ئیبراهیم دەگرن و، بە چاوی حورمەت و قەدرەوە تەماشای دەکەن.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ دوای بەسەرهاتی هەر کام لە زەکەریاو یەحیا، پاشان مەریەم و عیسای کوڕی، کە زەکەریاو یەحیا باب و کوڕ بوون، مەریەم و عیساش دایك و کوڕ بوون (عَلَيْهِمُ السَّلَام) ئنجا دێتە سەر باسی ئیبراهیم، کە وەك لە پێشەوە گوتمان: ئەم سوورەتە پانتاییەکی زۆری بۆ بەسەرهاتی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) کە شەست و پێنج (٦٥) ئایەتە، تەرخانکراوە، دەفەرموێ:

﴿ وَٱذْكُرْ فِي ٱلْكِتَٰبِ إِبْرَٰهِيمَ ﴾، هەروەها لە کتێبدا، [ئەم کتێبەی کە لەبەر دەستتە، کە قورئانە] باسی ئیبراهیمیان بۆ بکە، باس و خواسی ئیبراهیم بگێڕەوە، چی بوو؟ کێ بوو؟ ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا ﴾، بە دڵنیایی ئیبراهیم (مرۆڤێکی) زۆر ڕاست و پێغەمبەر بوو، واتە: پێغەمبەرێك بوو، بەڵام پێش پێغەمبەربوون، پیاوێکی زۆر ڕاست و ساغ بوو، ڕاستییەکەی ئیبراهیم ﷺ هەم لە ڕووی نیەتیەوە، هەم لە ڕووی قسەیەوە، هەم لە

ڕووی کردەوەیەوە، هەم لە خودی خۆیدا، هەم لەگەڵ خەڵکدا، هەم لەگەڵ خوادا، ڕاست و ساغ و بێ گرێ و گۆڵ بوو، ئنجا پێغەمبەریش بوو، دیارە ئەگەر ڕاست نەبووایە، شایستەی ئەوە نەدە بوو، خوا بیکاتە پێغەمبەر.

ئنجا دوای ئەو پێناسە کورتە، دێتە سەر ئەو وتووێژەی کە لەگەڵ بابی دا کردوویەتی: ﴿ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَـٰٓأَبَتِ ﴾، یاد بکەوە! کاتێک بە بابی خۆی گوت: ئەی بابی خۆم! ﴿ لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِى عَنكَ شَيْـًٔا ﴾، بۆچی شتانێك دەپەرستی کە نابیستێ و نابینێ و، هیچ سوودیشت پێناگەیەنێ، هیچ دادێکت نادات، هیچ کەلێنێکت بۆ ناگرێ؟ ﴿ يَـٰٓأَبَتِ ﴾، ئەی بابی خۆم! ﴿ إِنِّى قَدْ جَآءَنِى مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَمْ يَأْتِكَ ﴾، بە دڵنیایی من بەشێك لە زانیاریم بۆ هاتوە، کە تۆ بۆت نەهاتوە، ئەو جۆرە زانیاریەت نیە، لێرەدا ئیبراهیم ﷺ ناڵێ زانیاریەکی زۆرم بۆ هاتوە، دەڵێ: شتێك لە زانیاریم بۆ هاتوە کە بۆ تۆ نەهاتوە، بۆ ئەوەی خۆی لەوە بە دووربگرێ بڵێ: بابە تۆ هیچ نازانی و من هەموو شتێك دەزانم! ﴿ فَٱتَّبِعْنِىٓ أَهْدِكَ صِرَٰطًا سَوِيًّا ﴾، دەجا شوێنم بکەوە [چونکە من زانیاریم لەلایە، زانیاریەك کە تۆ لەلات نیە] تاکو ڕێیەکی ڕاستت پێشان بدەم، ڕێیەکی ڕاستی ساغی بێ گرێ و گۆڵ و بە ئامانج گەیەنەر.

﴿ يَـٰٓأَبَتِ لَا تَعْبُدِ ٱلشَّيْطَـٰنَ ﴾، ئەی بابی خۆم! شەیتان مەپەرستە.

بۆچی؟ ﴿ إِنَّ ٱلشَّيْطَـٰنَ كَانَ لِلرَّحْمَـٰنِ عَصِيًّا ﴾، بە دڵنیایی شەیتان سەرپێچیکاربووە، بەرانبەر بە (خوای) خاوەن بەزەیی، خوای میهرەبان و خوای خاوەن بەزەیی.

﴿ يَـٰٓأَبَتِ ﴾، ئەی بابی خۆم! ﴿ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَـٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيْطَـٰنِ وَلِيًّا ﴾، من دەترسێم کە لەلایەن خوای خاوەن بەزەییەوە، سزاو ئازارێکت تووش بێ، سەرەنجام ببی بە دۆستی شەیتان، چونکە خوا ئەوانە سزا و ئازار دەدات لە دواڕۆژدا، کە دۆستی شەیتانن!

چەند بە نەرمیی و نەزاکەت و، بە حورمەت و میهرەبانییەوە بابی دەدوێنێ، بەڵام با بزانین: بابی چ وەڵامێك دەداتەوە؟

﴿ قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ ءَالِهَتِى يَـٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴾، (بابی) گوتی: ئەی ئیبراهیم! ئایا تۆ پەرستراوەکانی منت ناوێن، نادەیدەیان دەگری، پێیان ڕازی نی؟ ﴿ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ ﴾، بێگومان بابی بە پرسیارکردنی نکوولێکەرانە و بە ڕەخنەگرتنەوە وا دەڵێ،

چـۆن پەرسـتراوەکانی منـت ناوێـن؟ ئەگـەر واز نەهێنـی، واتـە: واز نەهێنـی لـە ڕەخنەگرتـن لـە پەرسـتراوەکانم، یاخـود واز نەهێنـی لـەو پەیـام و بانگـەوازەی کـە هێناوتـە، کـە بریتیـە لـە پەیامـی تەنیـا خـوا پەرسـتیی، بـەرد بارانـت دەکـەم. ﴿ وَٱهْجُرْنِي مَلِيًّا ﴾، ماوەیـەکی زۆریـش بـڕۆ لێـم دابـبڕێ، لەبـەر چـاوم ون بـە، وەك لـە زمانـی کوردیـی دا ئـەو تەعبیـرە بـەکاردێ دەڵـێ: بـڕۆ مـلی خـۆت بشـکێنە، لەبـەر چـاوم ون بـە، بـەڵام ئیبراهیـم چـۆن جـوابی دەداتـەوە؟ ئیبراهیـم دەریایـەکی قووڵـە، دڵێـکی گـەورەو فـراوانی هەیـە، وا بـە ئاسـانیی شـلوێ نابـێ، ﴿ قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيْكَ ﴾، گـوتی: سـەلامەت لـێ بـێ.

لێرەدا سـەلامەت لێبـێ، یـانی: خـوا حافیـز، مەبەسـت سـڵاوە، دەشـکونجێ بڵـێ: سـەلامەتیی لەسـەر تـۆ بـێ، بـێ بـەڵا بی و، سـەلامەتیی و ئاشـتیی خـوا لەسـەر تـۆ بـێ، ﴿ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّيٓ ﴾، بـە دڵنیایـی داوای لێبوردنـت بـۆ لـە پـەروەردگارم دەکـەم، ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيًّا ﴾، چونکـە ئـەو بەرانبـەرم زۆر میهرەبانـە، بـە مشـوور و سەرپەرشـتیارە، ﴿ وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، گۆشـەگیریش دەبـم لـە خۆتـان و لـەوەی کـە لـە جیـاتی خـوا لێیـان دەپاڕێنـەوە، ﴿ وَأَدْعُواْ رَبِّي ﴾، لـە پەروەردگاریشـم دەپاڕێمـەوە، بۆکـێ؟ زۆربـەی تەفسـیرەکان گوتوویانـە: بـۆ بـابی.

بـەڵام مـن ئـەوەم بـەلاوە پەسـندە کـە مەبەسـت ئـەوە بـێ: لـە خـوا دەپاڕێمـەوە کـە قەرەبـووی ئـەو نیشـتیمان ئـەو خەڵـك و کـەس و کارەم، کـە دەرم دەکـەن، بـۆ بکاتـەوە، بـە شـوێنێکی دیکـەو، بـە خەڵکێـکی دیکـە، ﴿ عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّي شَقِيًّا ﴾، نیزیکـە کـە مـن لـە پاڕانـەوەم دا لـە خـوا، بێمـراد نەبـم، واتـە: بـە هـۆی پاڕانەوەکەمـەوە بەختـەوەر بـم، نـەك بێمـراد و دەسـت خاڵیـی.

﴿ فَلَمَّا ٱعْتَزَلَهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، ئنجـا کاتێـك کەنـاری گـرت لـە خۆیـان و لـەوە کـە لـە جیـاتی خـوا دەیپەرسـتن، ﴿ وَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَكُلًّا جَعَلْنَا نَبِيًّا ﴾، هـەر کام لـە ئیسـحاق و یەعقووبمـان پـێ بەخشـین، (کـوڕو نـەوە) و هەرکامێکیشـیانمان گێـڕا بـە پێغەمبـەر، ﴿ وَوَهَبْنَا لَهُم مِّن رَّحْمَتِنَا وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا ﴾، هەروەهـا لـە بەزەیـی خۆشـمان پێمـان بەخشـین و، نـاوی چـاك و بەرزمـان بـۆ پەیداکـردن، واتـە: لـە نێـو گـەلان و مرۆڤایەتییدا نـاوو ناوبانگـی چاکمان بـۆ بڵاوکردنـەوە.

# مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**فەرمانکردنی خوا بە باسکردنی ئیبراهیمی ڕاست و ساغی پێغەمبەری خوا و، باسکردنی وتووێژی لۆژیکییانەو هێمنانەی ئیبراهیم لەگەڵ باپی (ئازەر)دا، لە بارەی پووچیی بیرۆکەی بتپەرستییەوەو، ترساندنی لە سزای خوا، بە هۆی دۆستایەتیی کردنی شەیتانێك کە لە خوا یاخییە و سەرپێچیکارە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِبۡرَٰهِيمَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيًّا ﴿٤١﴾ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعۡبُدُ مَا لَا يَسۡمَعُ وَلَا يُبۡصِرُ وَلَا يُغۡنِي عَنكَ شَيۡـٔٗا ﴿٤٢﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي قَدۡ جَآءَنِي مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَمۡ يَأۡتِكَ فَٱتَّبِعۡنِيٓ أَهۡدِكَ صِرَٰطٗا سَوِيّٗا ﴿٤٣﴾ يَٰٓأَبَتِ لَا تَعۡبُدِ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ كَانَ لِلرَّحۡمَٰنِ عَصِيّٗا ﴿٤٤﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٞ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيۡطَٰنِ وَلِيّٗا ﴿٤٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

**١)- ﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِبۡرَٰهِيمَ ﴾، هەروەها لە کتێبدا باسی ئیبراهیم بکە، (أُتلُ خَبَرَهُ فِي القُرْآن) باس و خواسەکەی لە قورئاندا بگێڕەوە، واتە: بۆ خەڵکەکە باسی ئیبراهیم ﷺ بکە، باس و خواسەکەی بگێڕەوە.**

**٢)- ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا ﴾، بە دڵنیایی ئەو زۆر ڕاست بوو، (صِدِّيق: صِيغَةُ مُبَالَغَةٍ فِي الصَّادِق) (صادق) واتە: ڕاست، بەڵام (صِدِّيق) واتە: زۆر ڕاست، زۆر ساغ، چونکە ئەم صیغەیە بۆ زێدەڕۆیی کردنە، دەگوترێ: (مِسِّيك) کە صیغەی موبالەغەی (ماسك)ە، (ماسك) کەسێك کە چرووکە و نابەخشێ، بەڵام (مِسِّيك) واتە: زۆر چرووك، هەروەها دەگوترێ: (طَعَامٌ حِرِّيف) واتە: زۆر تیژ، هەروەها دەگوترێ: (رَجلٌ خِرِّيت: حَاذِقٌ بالطَّرِيق) واتە: زۆر شارەزا لە ڕێ و بانان، کەواتە: ئەم ڕێژگەیە بۆ زێدەڕۆیی تێداکردنە، ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا ﴾، بە دڵنیایی ئیبراهیم زۆر ڕاست بوو:**

**١- هەم زمانی ڕاست بوو.**

**٢- هەم دڵی ڕاست بوو، نیەتی ڕاست بوو.**

٣- هەم کردەوەکانی ڕاست بوون.

٤- لە خودی خۆیدا ڕاست بوو.

٥- لەگەڵ خوادا ڕاست بوو.

٦- لەگەڵ خەڵکدا، ڕاستبوو.

٣)- ﴿نَّبِيًّا﴾، هەروەها پێغەمبەریش بوو، ئەمە بەدوو جۆر خوێنراوەتەوە: (نبيًّا) و(نبيئاً) بە هەردوو شێوەکە خوێندراوەتەوە، (النَّبِيُّ: فَعيل بِمَعْنَى مَفْعُول، أو بِمَعْنَى فَاعِل)، (نبي)و (نبيئ) یان (فعیل)ی بە مانای (مفعول)ن، واتە: هەواڵ پێدراو (مُنْبَأ)، یاخود (فعیل)ی بە مانای (فاعل)ن، واتە: هەواڵ پێدەر (مُنْبِئ) پێغەمبەرانیش هەم خوا هەواڵیان پێدەدا، هەم ئەوانیش هەواڵی خوا بە خەڵك دەدەن.

٤)- ﴿إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ﴾، کاتێك بە بابی خۆی گوت: ئەی بابی خۆم! کە خوێنراویشەتەوە: (یا أَبَتَ)، هەروەها خوێنراویشەتەوە: (یا أَبَتَا)، واتە: هەم بە سەر (فتح)، هەم بە (ا) ئەلیف، هەم بە ژێر (کسر): (یا أَبتِ، یا أَبتَ، یا أَبَتَا)، سێ خوێندنەوەی هاتوون و هەرسێکیشیان واتە: ئەی بابی خۆم! ئنجا (ت) یەکە، چ ژێر، چ سەری هەبێ، چ ئەلیفی پێوە بلکێ، قەرەبووی (ي)ە، لە جیاتی: (یا أبي) دەگوترێ: (یا أبتِ)، یان: (یا أمي: یا أُمّتِ، یا أُمّتَ، یا أُمّتا)، ﴿إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ﴾، واتە: یادی ئەو کاتە بکەوە، کە ئیبراهیم ئاوای بە بابی گوت.

٥)- ﴿لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ﴾، بۆچی شتێك دەپەرستی کە نابیستێ و نابینێ، واتە: هیچ شتێك نابیستێ و هیچ شتێك نابینێ، کە مەبەست پێی بت و صەنەمەکانن، یاخود ئەگەر مەبەست پێی کەسانێك بێ کە مرۆڤن و دەپەرسترێن، یان شەیتانن و دەپەرسترێن، یانی: هەق نابیستن و هەق نابینن.

٦)- ﴿وَلَا يُغْنِي عَنكَ شَيْـًٔا﴾، هیچ سوودیشت پێ ناگەیەنێ، (أَغْنَى عَنْهُ كَذَا: كَفَاهُ إِيَّاهُ) واتە: ئەو شتەی لە کۆڵ کردەوە، یان ئەو کەلێنەی بۆ گرت، کەواتە: ﴿وَلَا يُغْنِي عَنكَ شَيْـًٔا﴾، واتە: هیچ دادێکت نادا، هیچ کەلێنێکت بۆ ناگرێ، هیچ بەهرەیەکت پێ ناگەیەنێ، نە زیانت لێ دوور دەخاتەوە، نە سوودت بۆ دێنێ.

٧)- ﴿يَٰٓأَبَتِ إِنِّي قَدْ جَآءَنِي مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَمْ يَأْتِكَ﴾، جارێکی دیکە دووبارەی دەکاتەوە:

ئەی بابی خۆم! بە دڵنیایی من لە زانیاریی شتێکم بۆ هاتوە، کە بۆ تۆ نەهاتوە.

كە مەبەست پێی زانیاریی (وحي)ە، واتە: خوا سروشی بۆ كردووم، چەند بە ئەدەبەوە دەڵێ: ﴿إِنِّي قَدْ جَآءَنِي مِنَ ٱلْعِلْمِ﴾، واتە: (جاءني شيءٌ مِنَ العِلمِ، وَأنتَ عَلى شَيءٍ مِنَ الجَهْلِ)، من شتێك لە زانیاریم بۆ هاتووە و، تۆش شتێك لە نەزانییت هەیە، ناڵێ: من زۆر زانام و تۆش زۆر نەزانی، بەڵكو دەڵێ: شتێك لە زانیاریم بۆ هاتووە، كە تۆ ئەو شتەت لە زانیاریی لەلا نیە، بەشێك لە زانیاریی بۆ من هاتووە، كە تۆ ئەو بەشەت لە زانیاریی لەلا نیە، نەك بڵێ: تۆ هیچ نازانی، چونكە ئەوە پێچەوانەی ئەدەب و ڕێزە لەگەڵ باب دا، با لە چاو ئیبراهیمیش نغرۆ بووبێ لە نەفامییدا، بەڵام دەبێ كوڕ لەگەڵ بابیدا زۆر بە ئەدەب و نەزاكەتەوە قسە بكات.

٨)- ﴿فَٱتَّبِعْنِيٓ﴾، واتە: ئەو زانیارییەی كە بۆم هاتووە، لێم وەربگرە، مەبەست پێی ئەوەیە، بەڵام گوتوویەتی: شوێنم بكەوە، واتە: من لە خزمەتت دام، وەرە پێكەوە دەڕۆین، بەو زانیارییەی كە لەلایەن خواوە بۆ من هاتووە، بەپێی ئەو زانیارییە، دەكەومە پێشت و لە خزمەتتدام، بڕۆ با پێكەوە بڕۆین بە ڕێی ڕاستدا، نەك بڵێ: تۆ شوێنم بكەوە، بەو واتایە من لە پێش تۆوە دەڕۆم، نا، یانی: من لە خزمەتتدا دەڕۆم، تۆش وەرە لەگەڵمدا بەو ڕێ ڕاستەدا كە خوا پێشانی منی داوە، بۆ ئەوەی سەرفراز و دەرباز بین.

٩)- ﴿أَهْدِكَ صِرَٰطًا سَوِيًّا﴾، ڕێیەكی ڕاستت پێشان دەدەم، دیارە لێرەدا: ﴿أَهْدِكَ صِرَٰطًا سَوِيًّا﴾، پێی دەگوترێ: (إسْتِعَارَة مصرَّحَة) خواستنەوەیەكی ڕاشكاو، (شُبِّهَ الإعْتِقَاد المُوصِلُ إلى الحَقّ، بالطَّرِيقِ المُستَقِيم)، بیر و بڕوایەكی گەیەنەر بە هەق، چوێنراوە بە ڕێیەكی ڕاستەوە، واتە: وەك چۆن بە ڕێی ڕاستدا دەگەیە ئامانج، ئەو زانیارییە خواییەش كە بۆ من هاتووە، دەمانگەیەنێتە ئامانج و دەرباز دەبین.

١٠)- ﴿يَٰٓأَبَتِ لَا تَعْبُدِ ٱلشَّيْطَٰنَ﴾، بۆ جاری سێیەم دووبارەی دەكاتەوە: ئەی بابی خۆم! شەیتان مەپەرستە، بێگومان بابی بت و صەنەمی پەرستوون، بەڵام ئەوە شەیتانە، كە پەرستنی بت و صەنەمەكان جوان دەكات، بۆیە پەرستنەكەی ڕێك پاڵداوەتە لای شەیتان.

١١)- ﴿إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ عَصِيًّا﴾، بەڵگە دێنێتەوە كە نابێ شەیتان بپەرسترێ، دەڵێ: چونكە شەیتان بۆ (خوای) خاوەن بەزەیی سەرپێچیكارو لە بەرانبەریدا یاخییە.

(عَصِيّ: صيغة مبالغة للعَاصِي) دیسان (عَصِيّ)یش ڕێژگەیەكی زێدەڕۆیی كردنە بۆ (عاصي)، (عاصي) واتە: تاوانكار، یاخیی، بەڵام (عصي) واتە: زۆر تاوانكار و زۆر سەرپێچیكارو یاخیی، خوا ﷻ دەیتوانی بفەرموێ: (يا أبَتِ لا تعبُدِ الشَّيطَانَ إنَّهُ كَانَ لِلرَّحْمَانِ عَصِيًّا) بەڵام: (الإظْهَارُ

مَقَامَ الإِضْمَارِ لِزِيَادَةِ التَّنفِير)، باسی شەیتان بۆیە دووبارە کراوەتەوە، کە ئەمە دەرخستنە لە جیاتی پەنهانکردن، یانی: لە جیاتی ئەوەی ڕاناو بەکاربێنێ، یەکسەر ناوی ئاشکرای شەیتانی دووبارە کردۆتەوە، ئەمە بۆ زیاتر سڵەماندنەوەی بابیەتی لە پەرستنی شەیتان و گوێڕایەڵیی بۆ شەیتان.

١٢)- ﴿ يَـٰٓأَبَتِ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَـٰنِ ﴾، بۆ جاری چوارەم و کۆتایی ئیبراهیم دەڵێ: ئەی بابی خۆم! من دەترسێم کە لە (خوای) خاوەن بەزەییەوە ئازار و سزات تووش بێ.

ئنجا ئەگەر خوای خاوەن بەزەیی کەسێك سزاو ئازار بدات، دیارە شتێکی زۆر خراپی کردووە، ئەگەرنا خوای خاوەن بەزەیی، هەر میهرەبانیی و لوتف و کەرەم و بەخشش لێ چاوەڕێ دەکرێ، بەڵام ئەو کەسەی خوای خاوەن بەزەیی وا لێدەکات، سزای بدات، دیارە دەبێ کارێکی زۆر نا قۆڵاو خراپی کردبێ، ئەگەرنا خوا ﷻ خەڵك سزا نادات، لێرەدا: (التَّعبيرُ بالخَوفِ: تَأَدُّبٌ مَعَ اللهِ الذِي لاَ يَعْلَمُ الغَيْبَ سِوَاهُ)، بۆچی دەڵێ: ﴿ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَـٰنِ ﴾؟ دەترسێم لە خاوەن بەزەییەوە سزاو ئازارت تووش بێ؟

ئەم تەعبیرە جۆرێکە لە ئەدەب لەگەڵ خوای بەرزدا، کە بەس خوا بۆ خۆی دەزانێ: پەنهان چۆنە؟ چونکە دەگونجێ خوا، بابی ئیبراهیم بخاتە سەر ڕاستە ڕێ و هیدایەت بخاتە نێو دڵی و، سەرەنجام سزای تووش نەبێ، بۆیە لە نێوان ئەگەرو نەگەردا هێشتوویەتەوە، خوا سزای بدات یان نا، ئەویش بەو تەعبیرە (إِنِّي أخاف أن يمسَّك عذابٌ من الرحمان) من دەترسێم سزات تووش بێ لە (خوای) خاوەن بەزەییەوە.

١٣)- ﴿ فَتَكُونَ لِلشَّيْطَـٰنِ وَلِيًّا ﴾، سەرەنجام ببیە دۆستی شەیتان.

(الوَلِيّ: الصَّاحِبُ وَالتَّابِعُ وَالقَرِيب والمحب)، (ولي) هەم بە مانای هاوەڵ، هەم بە مانای شوێنکەوتوو، هەم بە مانای نیزیك، هەم بە مانای خۆشەویست دێ، بە تەئکید کەسێك فەرمانبەریی شەیتان بکات، لە شەیتانەوە نیزیك دەبێ و شوێنی دەکەوێ و، سەرەنجام تووشی هەمان چارەنووسی تاڵ و دژوار دێ، کە شەیتان تووشی بووە.

لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە کە ئیبراهیم ﷺ چوار جاران بانگی بابی دەکات: (يا أبتِ، يا أبتِ، يا أبتِ، يا أبتِ)، ئەی بابی خۆم:

جاری یەکەم: پووچیی پەرستراوەکەی دەخاتە بەرچاوی: ﴿ لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِى عَنكَ شَيْـًٔا ﴾، کەواتە: پووچە، پەرستراوێك نە ببیستێ و، نەبینێ، نە هیچ

سوودێکت پێ بگەنێ، نە هیچ دادێکت بدات، نە هیچ کەلێنێکت بۆ بگرێ، شتێکی پووچە و نابێ بپەرسترێ.

جاری دووەم: ﴿ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي قَدْ جَآءَنِي مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَمْ يَأْتِكَ ﴾، واتە: بابە گیان! تۆ گیرۆدە بووی بە نەزانییەوە، منیش خوا زانیاری کردووم و شارەزای کردووم، بەرچاوی روون کردووم، کەواتە: لەگەڵم ببە، با هەردووکمان لەو زانیارییەی کە خوا پێیداوم، بەهرەمەند بین.

جاری سێیەم: ﴿ يَٰٓأَبَتِ لَا تَعْبُدِ ٱلشَّيْطَٰنَ ﴾، باسی نەپەرستنی شەیتانی بۆ دەکات، کە سەرپێچیکارە بۆ خوا.

جاری چوارەم: وردە وردە لێی توند دەکات و دەڵێ: ﴿ يَٰٓأَبَتِ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ ﴾، ئەی بابە! دەترسم سزای خوای خاوەن بەزەییت بگاتێ، ئنجا خوای خاوەن بەزەیی کەسێك سزا بدات، دەبێ شتێکی زۆر خراپ و ناقۆڵای کردبێ، خۆی داری داوەتە دەست خوا، کە سزا و ئازاری بدات، نەگەرنا خوای خاوەن بەزەیی جگە لە کەرەم و بەخشش و چاکە، لێی چاوەڕێ ناکرێ.

**مەسەلەی دووەم:**

**وەڵامدانەوەیەکی ڕەق و قورسی ئازەر، بۆ ئیبراهیمی کوڕی و هەڕەشەلێکردنی بە بەرد بارانکردنی و دەرکردنی بۆ ماوەیەکی زۆر و شوێنێکی دوور:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ ءَالِهَتِي يَـٰٓإِبْرَٰهِيمُ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ وَٱهْجُرْنِي مَلِيًّا ﴿٤٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

**١)- ﴿ قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ ءَالِهَتِي يَـٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴾، (بابی) گوتی: ئەی ئیبراهیم! عليه السلام ئایا تۆ پەرستراوەکانی منت ناوێن؟ (الزمخشري) دەڵێ: (قَدَّم الخَبَرَ على المبتدإ، لأنه كان أهم عنده)، ناڵێ: (يا إبراهيم أراغب أنت عن آلهتي)، بەڵکو دەڵێ: ﴿ قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ ءَالِهَتِي يَـٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴾، (خبر) پێش (مبتدإ) خراوە، چونکە ئەوە گرنگتر بووە، ئەوەی کە بەلای ئازەرەوە گرنگ بووە، نەویستنی ئیبراهیم و، ڕەفزکردنی بووە بۆ پەرستراوەکانی، ئەوەی بەلاوە گرنگ بووە، نەك بانگ کردنی ئیبراهیم.**

**٢)- ﴿ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ ﴾، بێگومان ئەگەر وازنەهێنی، ئەم (ل)ە، لە عورفی شارەزایانی زمانی عەرەبیی دا، زەمینە خۆشکەرە بۆ سوێند (اللام مُوَطِّئَة للقسم) کە مانای جەختکردنەوە دەگەیەنێ، دەڵێ: (تأكيد لكونه رَاجِمَهُ إن لَم يَنْتَهِ عَنِ الكُفْر بآلهتهم) واتە: جەختکردنەوەی ئەوەیە کە بە تەئکید بەرد بارانی دەکات، ئەگەر دەست هەڵنەگرێ، لە کوفرکردن بە پەرستراوەکانیان.**

**واتایەکی دیکە: ئەگەر تۆ دەست هەڵنەگری و واز نەهێنی لە بانگەشەکردن بۆ ئەو پەیامەی کە هێناوتە، کە بریتیە لە پەیامی تەنیا خواپەرستیی.**

**یاخود: هەردووکیان پێکەوە: دەبێ واز بێنی لە بانگەشەکردن بۆ تەنیا خواپەرستیی و، بێبڕوایی بەو پەرستراوانەی ئێمە.**

**ئەگەر واز نەهێنی:**

**٣)- ﴿ لَأَرْجُمَنَّكَ ﴾، بە دڵنیایی بەرد بارانت دەکەم، (الرَّجمُ: الرَّمْيُ بالرِّجَامِ وَهِيَ الحِجَارَة) (رِجام) واتە: بەرد، (لأرجمنَّكَ) واتە: بەرد بارانت دەکەم، یان سەنگەو بەردت دەنێم، ئەوەش دەگونجێ واتە: کەڵەکە بەردت لەسەر دەکەم، هێندەت بەردان پێدا دەدەم.**

٤)- ﴿وَٱهۡجُرۡنِي مَلِيّٗا﴾، ماوەیەکی زۆریش لێم دووربکەوەو، لەبەر چاوم ون بە و برۆ، (**الهَجْرُ: قَطْعُ الْمُكَالمَةِ وَقَطْعُ المعَاشَرَة**)، (**هَجْر**) بریتیە لە قسە لێك دابڕین و مامەڵە لێ دابڕین، (**ملياً: أي طويْلاً**) لە چیەوە هاتوە؟ (**هُوَ فَعيلٌ وَلاَ يُعْرَفُ لَهُ فِعْل مُجَرَّدٌ ولا مصدر، فملي مُشْتَقٌ مِنْ مَصْدَرُ مُمَاتٍ وَهُوَ فَعيْل بِمَعْنَى فَاعِل، يُقَالُ: أُمْلِي لَهُ، إذَا أَطَالَ لَهُ المدَّة، (فملياً) صفة لمصدر مَحْذُوفٍ مَنصوبٍ على المَفعوليَّة المُطْلَقَةِ أي : هَجْراً مَليّاً أو مَنصوبٌ عَلَى الصِّفَةِ لِظَرْفٍ مَحْذُوفٍ: زَمَناً طويلاً**)، وشەی (**مَلِي**) لەسەر کێشی (**فعيل**)ە، بەڵام نە (**فعل**)ێکی ڕووتی هەیە و نە چاوگێکیشی هەیە، بەڵکو لە چاوگێکی مردووەوە وەرگیراوە، کە لێرە ئەم (**فعيل**)ە، بە مانای (**فاعل**)ە، (**مَليّاً**) واتە: (**طويلاً**) ماوەیەکی زۆر درێژ، دەگوترێ: (**أُمْلِي لَهُ**) ئەگەر ماوەی دیکەی بۆی درێژ کرد، کەواتە: لێرەدا (**مَلياً**) سیفەتە بۆ چاوگێکی فڕتێنراو کە لەسەر حاڵەتی بەرکاری ڕەها (**المفعولية المطلقة**) (**منصوب**)ە، واتە: دووربکەوەوە بەدوورکەوتنەوەیەکی درێژ، یاخود (**منصوب**)ە، لەسەر صیفەت بۆ (**ظرف**)ێکی فڕتێنراو، واتە: (**زمناً طويلاً**) تۆ بڕۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لەبەر چاوم ون بە.

بە کورتیی: بابی ئیبراهیم ویستوویەتی شار بەدەری بکات و گوتوویەتی: لەبەر چاوم ون بە، وەك پێشتریش گوتمان: لە کوردەواریی خۆمان دا، ئەگەر کەسێك لە کەسێك تووڕەبێت دەڵێ: دەبڕۆ ملی خۆت بشکێنە، واتە: بڕۆ لەبەر چاوم ون بە، بەڵام هەر زمانە، شێوە دەربڕینێکی تایبەت بە خۆی هەیە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**وەڵامدانەوەیەکی میهرەبانانەو ئارامانەی ئیبراهیم ﷺ بۆ بابی و، بڕیاردانی بۆ کەنار گرتنی لە خۆیان و لە پەرستراوەکان و، بڕیاردانی کە لە پەروەردگاری بپاڕێتەوە و داوای لێبوردن بۆ بابی بکات:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيْكَ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّيٓ إِنَّهُۥ كَانَ بِى حَفِيًّا ﴿٤٧﴾ وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدْعُوا۟ رَبِّى عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّى شَقِيًّا ﴿٤٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەو ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

**١)- ﴿ قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيْكَ ﴾، (ئیبراهیم ﷺ) گوتی: سەلامت لێبێ.**

**گوتنی (سلام علیك) لێرەدا دوو مانای هەن:**

**أ- مەبەست سڵاوکردن و ڕێز لێگرتنە، یانی: سەلامت لێبێ.**

**ب- دەشگونجێ ئەمە دوعاکردنی ئیبراهیم ﷺ بێ بۆ بابی واتە: یاخوا هەر سەلامەت و بێ بەڵا بی، من وا دەڕۆم.**

**٢)- ﴿ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّيٓ ﴾، بە دڵنیایی داوای لێبوردنت بۆ لە پەروەردگارم دەکەم.**

**بێگومان ئەمە پێش ئەوە بووە کە ئیبراهیم دڵنیا بێ: بابی بڕوا ناهێنێ، چونکە لە ئایەتەکانی: (١١٣ و ١١٤)ی سوورەتی (التوبة)دا، خوا ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە دەفەرمووێ: ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِىِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن يَسْتَغْفِرُوا۟ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوٓا۟ أُو۟لِى قُرْبَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾ ﴾، واتە: پێغەمبەر (ﷺ) و بڕواداران بۆیان نیە داوای لێبوردن بۆ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بکەن، ئەگەر خاوەن نیزیکایەتییش بن لەگەڵیان {یا خزمیشیان بن} دوای ئەوەی بۆیان ڕوون بۆتەوە کە هاوەڵی دۆزەخن، {واتە: دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوتوە کە لەسەر کوفر و شیرك مردوون، نابێ بۆیان بپاڕێنەوە}.**

دوایی دەفەرمووێ: ﴿ وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٌ ﴿١١٤﴾ ﴾، واتە: داوای لێبوردن کردنی ئیبراهیمیش بۆ بابی، تەنیا بەهۆی بەڵێنێکەوەبوو کە پێیدا بوو، بەڵام دوای ئەوەی بۆی ڕوون بۆوە کە دوژمنی خوایە (و هەر بڕوا ناهێنێ) دووریی لێگرت، حاشای لێکرد، بە دڵنیایی ئیبراهیم زۆر بە پەرۆش بوو، زۆریش هێدیی و مەند بوو.

ئێمە لە بەرگی هەشتەمی ئەم تەفسیرەدا، کە تەرخانمان کردوە، بۆ تەفسیری سووڕەتی (التوبة) بە تەفصیلی باسی ئەو بابەتەمان کردوە.

کەواتە: لێرەدا کە دەفەرمووێ: ﴿ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّيٓ ﴾، بێگومان داوای لێبوردنت بۆ لە پەروەردگارم دەکەم، بە تەئکید ئیبراهیم لە چەندان شوێن لە قورئاندا خوای پەروەردگار لێی گێڕاوەتەوە، وەفاداربووە بۆ بەڵێنەکەی کە بە بابی داوەو، داوای لێبوردنی بۆ بابی هەر کردوە، تاکو دڵنیا بووە کە دوژمنی خوایەو بڕوا ناهێنێ و لێی نائومێد بووە.

٣)- ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيًّا ﴾، بە دڵنیایی پەروەردگارم بەرانبەر بە من زۆر چاکەکارە، زۆر خاوەن لوتفە، زۆر بەخشندەیە لەگەڵم و گرنگییم پێدەدا، (الحَفِيُّ: الشَّدِيدُ البِرِّ، والإلطَاف، والحَفَاوَة: الإهْتِمَامُ وَالإكْرَام)، (حفي) کەسێکە کە زۆر چاکەکار بێ و زۆر خاوەن لوتف بێ بەرانبەر بە کەسێك، (الحفاوة) واتە: گرنگیی پێدان و بایەخ پێدان و ڕێزلێکرتن.

٤)- ﴿ وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، هەروەها پەڕیدە و گۆشەگیردەبم لە ئێوەو لەوەی کە لە جیاتی خوا لێی دەپاڕێنەوە، دەشگونجێ (تدعون) لێرەدا مەبەست (تعبدون)ە، بێ، واتە: ئەوەی کە لە جیاتی خوا دەیپەرستن، هەڵبەتە پاڕانەوەش کاکڵی پەرستنە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: (الدُّعَاءُ هُوَ العِبَادَةُ) (أخرجه أحمد: ١٨٤١٥، وأبو داود: ١٤٧٩، والترمذي: ٢٩٦٩، وقال: حسن صحيح)، واتە: پاڕانەوە بریتیە لە پەرستن.

٥)- ﴿ وَأَدْعُواْ رَبِّي ﴾، لە پەروەردگاریشم دەپاڕێمەوە.

هەموو ڕاڤەکەرانی قورئان وایان لێکداوەتەوە، واتە: بۆ تۆ دەپاڕێمەوە ئەی بابە!

بەڵام من وای تێدەگەم کە مەبەست ئەوە نیە بۆ بابی بپاڕێتەوە، چونکە پێشێ باسی ئەوەی کرد، داوای لێبوردنت بۆ لە پەروەردگارم دەکەم، بەڵکو کە دەفەرمووێ: ﴿ وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، گۆشەگیر دەبم و دەستبەرداریی ئێوەو

پەرستراوەکانتان دەبم و، دەڕۆم و سەری خۆم هەڵدەگرم، ﴿وَأَدْعُواْ رَبِّي﴾، لە پەروەردگاریشم دەپاڕێمەوە، واتە: لە پەروەردگارم دەپاڕێمەوە کە دەرووی خێرم لێبکاتەوە و کارم بۆ ئاسان بکات، قەرەبووی ئێوەو ئەو نیشتیمان و زێدەم بۆ بکاتەوە، کە بە ناچاریی بەجێی دەهێڵم، ئنجا ئەو ئایەتەی دوایی، لەگەڵ ئەو مانایەدا دەگونجێ کە گوتمان، چونکە دوایی دەفەرمویَ:

٦)- ﴿عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّي شَقِيًّا﴾، نیزیکە، لەوانەیە، چاوەڕوانکراوە کە من بە پاڕانەوەم لە پەروەردگارم بێمراد نەبم، دەستخەڕۆ نەبم، بێبەش نەبم، واتە: کە ئێوە بەو شێوەیە لەگەڵ مندا مامەڵە دەکەن، منیش لە پەروەردگارم دەپاڕێمەوە، هیوام وایە خوا دەرووی خێرم لێبکاتەوەو قەرەبووی ئێوەم بۆ بکاتەوە.

ئەم مانایە ڕاسترە، بۆ ئەوەی دووبارە نەبێ لەگەڵ ئەوەدا، کە پێشتر باسکراوە کە داوای لێبوردن بۆ بابی دەکات.

## قوڵە باسێك: هەڵهێنجانی دوو حوکمی گرنگ لەم دوو ئایەتە: (٤٧ و ٤٨)

**حوکمی یەکەم:** (القرطبي) گوتوویەتی: (أستدلّ بقوله: ﴿سَلَٰمٌ عَلَيۡكَ﴾ عَلَى جَوَازِ بَدأ السَّلاَم مَعَ الكَافِر)، واتە: لێرەدا کە فەرموویەتی ﴿سَلَٰمٌ عَلَيۡكَ﴾ ئەمە بە بەڵگە هێندراوەتەوە {ئەو فەرموودەیەی خوا} لەسەر ئەوە کە دروستە مرۆڤ لەسەرەتاوە سڵاو لە کافر بکات، کە هەندێك لە شەرعزانان بە پێی تێگەیشتنیان لە هەندێك فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ ڕایەکی پێچەوانەی ئەوەیان هەیە و، پێیان وایە دروست نیە مسوڵمان دەستپێشخەری سڵاوکردن بێ لە کافر، بۆ وێنە ئەم دەقەیان لەوبارەوە بە بەڵگە هێناوەتەوە: کە دەفەرموێ: {لاَ تَبْدَؤُوا أَهْلَ الكِتَابِ بِالسَّلاَمِ، وَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمْ فِي طَرِيْقٍ فَاضْطَرُوهُمْ إِلَى أَضْيَقِهِ} (أخرجه إبن حبان: ٥٠١، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم)، واتە: ئێوە لە سەرەتاوە سڵاو لە خاوەن کتێبەکان مەکەن و ئەگەر لە ڕێیەکیش دا بینیتانن بیانخەنە تەنگەبەرەوە!

بەڵام بەڵگەهێنانەوە بەو دەقە بۆ حوکمێکی وا بەرەهایی، ڕاست نیە، چونکە: وەك زانایانی فەرموودەناس ئەوانەی کە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ یان شەرح و تەفسیر کردوون، دەڵێن:

ئەوە بۆنەیەکی تایبەت بووە و، لە کاتێکدا بووە کە ئەو خاوەن کتێبانە دژایەتیی و ناکۆکییان لەگەڵ ئەهلی ئیسلام دا بووە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئێوە دەست پێشخەر مەبن بۆ

سڵاولێکردنیان، بۆ ئەوەی لەو سڵاو لێکردنە و دەستپێشخەرییەی ئێوە، وا هەڵنەهێنجن کە ئێوە لێیان دەترسێن، واتە: ئەمە بۆنەو مەقامێکی تایبەت بووە، ئەگەرنا نابێ هیچ کەس لە ئەهلی ئیسلام بەڕێزترو بە حورمەتتر بێ، خوای پەروەردگار کە پێمان دەفەرموێ: ﴿وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنٗا ۝٨٣﴾البقرة، واتە: چاکە بە خەڵکی بڵێن، هەروەها پێمان دەفەرموێ: ﴿وَأَحۡسِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ۝١٩٥﴾البقرة، واتە: چاکەکار بن، بێگومان خوا، چاکەکارانی خۆشدەوێن، سڵاوکردن و دەست پێشخەریی کردن بۆ سڵاو، یەکێکە لە شتە چاکەکان، یەکێکە لە چاك گوتنەکان، بەڵکو لای کەمی چاکە گوتنە کە تۆ سڵاو بکەی و، دەستپێشخەریی بکەی بۆ سڵاوکردن.

کەواتە: ئەوەی لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە، ئەویش ئەگەر ساغ بکرێتەوە کە سەنەدەکەی ڕاستەو پێغەمبەر ﷺ وای فەرمووە، دەبێ بڵێین: بە تەئکید پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ حاڵ و مەقامێکی تایبەت وای فەرمووە، ئەگەرنا ڕووحی گشتی ئیسلامەتیی ئەوەیە کە تۆ دەست پێشخەربی بۆ چاکەکاریی و هاوکاریی و بۆ سوود گەیاندن بە بەندەکانی خوا، مسوڵمان بن، یان نا مسوڵمان بن، بە مەرجێك لە حاڵەتی بەر بەرەکانێ و جەنگ و شەڕدا نەبن، ئەگەرنا هیچ کەس نابێ لە مسوڵمان خۆش خوڵقتر بێ، بەڕێزتر بێ، بە حورمەتتر بێ، ئنجا ئەم ڕستە قورئانییەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە.

**حوکمی دووەم:** ئەگەر تەماشای ئایەتەکانی قورئان بکەین، بۆمان دەردەکەوێ کە ئیبراهیم عليه السلام هەتا ماوەیەکی زۆر هەر بۆ باب و دایکی پاڕاوەتەوە، بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی لە سوورەتی: (إبراهیم) -٤١- دا هاتوە، کە پێشتر لە تەفسیری سوورەتی (إبراهیم) و لە بەسەرهاتی ئیبراهیمدا باسمان کرد، ئنجا ئەو دوعایەشی کاتێك کردوە، کە ماوەیەکی زۆر لە (حَرّان) ماوەتەوە، دوایی چووە بۆ سەر زەمینی کەنعانییەکان، هەر لە شام، دوایی چووە بۆ میسر، دوایی کە پادشای میسر هاجەری پێداوە، یان هاجەری بەخشیوە بە سارە خان، ئەویش داویەتی بە ئیبراهیم عليه السلام و هاوسەرگیریی لەگەڵدا کردوە، ئنجا دوایی هاجەر ئیسماعیلی دەبێ و، جارێ ئێستا سارە خان ئیسحاقی نەبووە، دوایی ئیبراهیم عليه السلام هاجەرو ئیسماعیلی کوڕی کە مەلۆتکە بووە، دەبات و لەسەر زەمینی حیجاز دایان دەنێ، دوایی کە لێیان دووردەکەوێتەوە، کۆمەڵێك پاڕانەوە دەکات لە خزمەت خوادا و، کۆتا پاڕانەوەی ئەوەیە کە دەفەرموێ:

﴿رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡحِسَابُ ۝٤١﴾إبراهیم، واتە: پەروەردگارمان! لێم ببوورەو، لە باب و دایکم ببوورەو، لە بڕواداران ببوورە، لە ڕۆژێکدا

کە لێپرسینەوە دێتە ئاراوە، کەواتە: تاکو ئەو کاتەش ئیبراهیم هەر بۆ باب و دایکی پاڕاوەتەوە، بە پێی ئەو بەڵێنەی کە بە بابی داوە!

بەڵام دوایی - وەك لە سوورەتی (التوبة)دا دیارە - لە کۆتاییدا کە گەیشتۆتە دڵنیایی، یان خوای پەنهانزان دڵنیای کردۆتەوە کە: بابت دوژمنەو بڕوا ناهێنێ، ئەوجار دەستبەرداری داوای لێبوردن بۆ کردنی بووە، ئنجا خوای پەروەردگاریش لە سوورەتی (الممتحنة)دا پێمان ڕادەگەیەنێ و دەفەرموێ:

﴿ قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُوا۟ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُا۟ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمْلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ۖ رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٤﴾ ﴾الممتحنة.

واتە: لە ئیبراهیم و ئەوانەدا کە شوێنی کەوتبوون، سەر مەشقییەکی باش هەیە بۆ ئێوە،... (دوایی لێی هەڵداوێرێ) جگە لە قسەی ئیبراهیم کە بە بابی گوت: داوای لێبوردنت بۆ لە پەروەردگارم دەکەم،... یانی: لەوەدا ئیبراهیم مەکەنە سەر مەشق، چونکە ئیبراهیم کاتێك کە ئەو بەڵێنەی بە پەروەردگاریدا (وەك ئایەتەکەی سوورەتی (التوبة) بۆمان دەردەخات)، کە ئومێدی هەبوو بڕوا بێنێ، بەڵام دوایی کە دڵنیا بوو بڕوا ناهێنێ، دەستبەرداری بوو و حاشای لێکرد.

کەواتە: لەوەدا چاو لە ئیبراهیم مەکەن، چونکە ئەو ئومێدی هەبوو، بابی بڕوا بێنێ، بۆیە بۆی پاڕایەوە و، کاتێك کە دڵنیابوو کە ئیمان ناهێنێ، دەستبەرداری بوو.

**مەسەلەی چوارەم و كۆتایی:**

دوای ئـەوەی ئیبراهیـم، بـاب و گەلەكـەی و پەرسـتراوەكانیانی جێهێشـت، خـوا ئیسـحاق و یەعقـوبی وەك دوو پێغەمبـەر پێبەخشـین، كـە خـوا بەهرەمەنـدی كـرد بـوون لـە بەزەیـی خـۆی و ناوبانگـی بـاش و بەرزیـشی پێـدان:

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَلَمَّا ٱعْتَزَلَهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ۖ وَكُلًّا جَعَلْنَا نَبِيًّا ﴿٤٩﴾ وَوَهَبْنَا لَهُم مِّن رَّحْمَتِنَا وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا ﴿٥٠﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەو ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ فَلَمَّا ٱعْتَزَلَهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، كاتێك لێیان پەڕیدە بوو و كەناری لێیان گرت، لەوەی كە لە جیاتی خوا دەیپەرستن، واتە: دەستبەرداری خۆشیان و پەرستراوەكانیشیان بوو، پەڕیدە بوو، وازی لێهێنان و لێیان دووركەوتەوە.

وشـەی (لَـمَّا) (حَرْف وجـود لوجُـودِ أي: يَقْتَضِي وجُـود جَوَابـِهِ لأجـلِ وجـود شَرْطِـهِ)، (لَـمَّا) پیتـی بوونـە لەبـەر بـوون، واتـە: بـوونی وەڵامەكـەی دەخـوازێ، لەبـەر هەبـوونی مەرجەكـەی.

٢)- ﴿ وَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ﴾، لە ئەنجامی ئەوەدا كە لێیان دووركەوتەوە و، لەوەش كە لە جیاتی خوا دەیپەرستن: ئێمە ئیسحاق و یەعقووبمان پێدان، ئیسحاق كوڕی ئیبراهیمە ﷺ، لە سارەخان، خوا لێی ڕازی بێ، یەعقووبیش كوڕی ئیسحاقە، كە ئیسحاقیش هاوسەرێكی بووە و یەعقووبیان بووە، كەواتە: ئیسحاق كوڕی ئیبراهیمە و یەعقووب نەوەیەتی، ئنجا لە پەیمانی كۆندا دەڵێ: تاكو یەعقووب گەیشتۆتە تەمەنی پازدە (١٥) ساڵیی، ئیبراهیم لە ژیاندا بووە، بۆیە خوا دەفەرموێ: هەردووكیانمان پێ بەخشین.

بەڵام لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش:

بۆچـی خـوا ﷻ لێـرەدا تەنیـا بـاسی ئیسـحاق و یەعقـووب دەكات؟ هەڵبەتـە دوایـی بـاسی ئیسـماعیل بـە تایبـەت دەكات، بـەڵام بۆچـی نافەرمـوێ: ئیسماعیلیشـمان پێـدا؟ ئـەوە حیكمەتێـكی گرنگـی تێدایـە، چونكـە ئیسـماعیل پێـش ئیسـحاق، خـوا بـە ئیبراهیمـی داوە، بـەڵام بۆیـە بـاسی ئیسـحاق و یەعقـووب دەكات، چونكـە لێـرەدا سـیاقەكە ئـەوە دەخـوازێ،

بابزانین چۆن؟ ئیبراهیم لە زێدی خۆی و لە نیشتمانی خۆی، دەرکراوە و بابی شاربەدەری کردوە و خزمەکانی ناچاریان کردوە، وڵات بەجێبهێڵی، تەنیا خۆی و سارەخانی خێزانی بووە و هیچ هۆگر و کەسێکی دیکەی نەبووە، دڵی پێخۆش بکات، بەڵام دوایی کە خوا ئیسحاقی پێ دەبەخشێ و، دوایی یەعقووبیش بە ئیسحاق دەبەخشێ، ئەوانە لەلای ئیبراهیم دەمێننەوە، بەڵام ئیسماعیل و دایکی ئیسماعیل، هاجەر، ئیبراهیم بە فەرمانی خوا دەیانبات بۆ حیجاز، واتە: ئیسماعیل لەلای ئیبراهیم نابێ، کە ببێتە هۆگری و، ببێتە قەرەبووی خزم و قەومەکەی کە دەریان کردوە، بەڵکو ئەوانەی بوونە مایەی هۆگریی و ئولفەی: ئیسحاق و یەعقووب و سارەخانن، وێڕای بووکەکەی کە دەبێتە دایکی یەعقووب، ئەوانە لەلای ماونەوە لە شام و، ئەوانە بوونە جێگای دڵخۆشیی و بوونە قەرەبوو، لەو خەڵك و خزمانەی، کە لە ئووری کلدانییەکان ئیبراهیم بەجێی هێشتوون و ناچاریان کردوە بە جێیان بهێڵێ، بۆیە لێرە تەنیا باسی ئەوان دەکات، بەڵام دوایی بەتایبەت باسی ئیسماعیل دەکات.

٣)- ﴿وَكُلًّا جَعَلْنَا نَبِيًّا﴾، هەرکامێکیشمان گێڕا بە پێغەمبەر، کەواتە: پێغەمبەرایەتیی (النُبُوَّة) کە زانایان هەموویان لەسەر ئەوە یەك دەنگن: (النبوة وَهبيَّةٌ وَلَيْسَت كَسبية) واتە: پێغەمبەرایەتیی بەخشراوە و وەدەستهێنراو نیە، خوا دەیبەخشێ، نەك مرۆڤ خۆی، وەدەستی بێنێ، وەك لە هەندێ کەسەوە شتێکی وا بیستراوە، کە مرۆڤ ئەگەر لەگەڵ خۆیدا خەریك بێ، لەوبارەوە شتێك بەشتێك دەکات!! بەڵام لە ڕاستییدا ئەوانە قسەی پووچن، پێغەمبەرایەتیی شتێکە خوا دەیبەخشێ! بەڵام بە تەئکید خواش کە دەیبەخشێ، کاری خوا هیچی لە گۆترە نیە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ ﴿١٢٤﴾﴾الأنعام، خوا زاناترە کە پەیامی خۆی لە کوێ دادەنێ و بەکێی دەبەخشێ، بۆیە ڕاست نیە کە: ئەگەر کەسێك بۆ خۆی هەوڵبدات بکونجێ ببێتە پێغەمبەر ﷺ، چونکە لە دوای پێغەمبەری خاتەم (موحەممەد) دەرگای پێغەمبەرایەتیی گاڵە دراوەو داخراوە.

وشەی (نبیًّا) خوێنراویشەتەوە: (نبيئاً) وەك پێشتریش گوتمان، کە هەر یەك واتایان هەیە، ئنجا (نبي) دەگونجێ (فعيل) بێ، بە مانای (فاعل)، واتە: هەواڵدەر (مُنْبِيء) و، دەشگونجێ (فعيل)ی بە مانای (مفعول) بێ، واتە: هەواڵ پێدراو (مُنْبَأ) ئەو کەسەی کە هەواڵی پێدەدرێ لە خواوە، کە دیارە پێغەمبەران هەم هەواڵیان لە خواوە پێدەدرێ، هەواڵی تایبەت، هەم هەواڵیش بە خەڵك دەدەن واتە: هەواڵی وەحیی خوا.

٤)- ﴿وَوَهَبْنَا لَهُم مِّن رَّحْمَتِنَا﴾، لە بەزەیی خۆشمان پێمان بەخشی، واتە: شتێك لە بەزەیی خۆمانمان بەوان بەخشی، بەڵام بێگومان کەمی خوا، زۆرە.

٥)- ﴿ وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا ﴾، هەروەها ناوبانگی چاکمان بۆ گێڕان، (لِسَانَ صِدْقٍ) واتە: زمانی ڕاست، (عَلِيًّا) واتە: بەرز، بەڵام وەك پێشتر باسمانکرد: لێرەدا (صدق) واتە: هەر شتێکی پەسند و چاك، پەنهان بێ، یان ئاشکرا بێ، (لسان)یش دیارە ئامرازی قسەکردنە، کەواتە: (لسان صدق) واتە: ناوبانگی باش و باس و خواسی خێر، بۆیە زانایان بە: (الذِّكرُ الحَسَن) لێکیانداوەتەوە، یانی: باسی چاك، ناوبانگی باش، چونکە زمان مەجازە لە باسکردن و لە مەدح کردندا، (صدق)یش لێرەدا چاوگە، (لسان صدق) واتە: زمانی پەسندکراو، زمانی چاك، واتە: ناوی چاك و ناوبانگی باش.

زانایـان ئاوایـان گوتـوە: (الصِّدْقُ: بلُوغُ كَمَالِ نَوْعِهِ، وَوُصِفَ بالعُلوُ مَجَازاً بِشَرَفِ ذَلِكَ الثَّنَاء)، واتـە: (صـدق) بریتیـە: لـە گەیشـتن بـە لووتکـە لـە جـۆری خـۆی، بـۆ هـەر شـتێك، لـە قورئـان دا، ئـەم پێنـج وشـەیە هاتـوون: (١- قَدَمَ صِدْق، ٢-مَقْعَدَ صِدْق، ٣-مُخْرَجَ صِدْق، ٤-مُدْخَل صِدْق، ٥-لِسَانَ صِدْق).

ئنجـا کـە (لسـان) وەسـفکراوە بـە بەرزیـی، واتـە: ئـەو ناوبانگـەت ناوبانگێـکی زۆر بـەرزە، زۆر باڵایـە و خەڵکێـکی زۆر پێـی زانیـوە، هەڵبەتـە خـوا ﷻ هـەم نـاوو ناوبانگـی ئیبراهیـم، هـەم ئیسـحاق و یەعقـووبی کوڕیـشی سـەلامی خـوا لەسـەر هەموویـان بـێ، بـە دنیـادا بـڵاوی کردۆتـەوە و، وای کـردوە کـە لـە نێـو مرۆڤایەتییـدا، نـاو ناوبانگێـکی بـەرزو پەسـندیان هەبـێ.

شـایانی باسـە: کاتی خـۆی لـە تەفسـیری سـوورەتی (إبراهيـم)دا، بـە درێژیـی باسی بەسـەرهاتی ئیبراهیـم (خليـل اللـه) ﷺ مـان کـردوە، ئنجـا بـە ئێواخـن و لـە میـانی بەسـەرهاتی ئیبراهیمـدا بەسـەرهاتی هـەر کام لـە ئیسـحاق و ئیسـماعیلی کوڕیـشی (عَلَيْهِـمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) کـەم و زۆر باسـکراوەو ئامـاژەی پێکـراوە.

بـەڵام بـە باشـم زانی: لێـرە لـە کۆتایـی ئـەم دەرسـەماندا، کـە خـوا ﷻ فەرموویـەتی: هـەر کام لـە ئیسـحاق و یەعقووبمـان بـە ئیبراهیـم بەخشـیون: ﴿ فَلَمَّا ٱعْتَزَلَهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ۖ وَكُلًّا جَعَلْنَا نَبِيًّا ﴿٤٩﴾ وَوَهَبْنَا لَهُم مِّن رَّحْمَتِنَا وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا ﴿٥٠﴾ ﴾مریـم.

دوو کورتـە بـاس بخەمـەڕوو: کورتـە باسـێك لەبـارەی ئیسـحاقەوە و، کورتەباسـێك لـە بارەی یەعقووبەوە:

## یەكەم: كورتە باسێك لە بارەی ئیسحاقەوە ﷺ :

بـــەڕێــــــــزان !

لە چوار بڕگەدا، بە كورتیی باسی ئیسحاق ﷺ دەكەین:

**١)- ناوو ڕەچەڵەكی:** ئیسحاق بەس ئەو ناوەی بۆ بەكارهێنراوە، لە قورئاندا و لە پەیمانی كۆنیشدا، ئیسحاق كوڕی ئیبراهیمە و دایكی ئیسحاق (سارة) یان (سارا)یە، كە لە پەیمانی كۆن و لە كتێبە مێژووییەكاندا هاتوە، بەڵام لە قورئاندا ئەو ناوە نەهاتوە، ئیبراهیم و سارەش (عَلَيْهِمَا الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، لە كاتێ كەوتنە تەمەنیان دا ئیسحاقیان بووە، هەڵبەتە ئیسحاق لە دوای ئیسماعیل بووە و، هەر كام لە ئیسماعیل و ئیسحاق لە كاتێكدا خوا بە ئیبراهیمی بەخشیون، كە كەوتووەتە تەمەنەوە، وەك لە سوورەتی ئیبراهیم -٣٩- دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى وَهَبَ لِى عَلَى ٱلْكِبَرِ إِسْمَـٰعِيلَ وَإِسْحَـٰقَ إِنَّ رَبِّى لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴾، واتە: ستایش بۆ ئەو خوایەی كە لە كاتێ كەوتنە تەمەنمدا، لە كاتێ بە ساڵدا چوونمدا، ئیسماعیل و ئیسحاقی پێبەخشیم، بە دڵنیایی پەروەردگارم بیسەری پاڕانەوەیە، دوای ئەوەی پاڕاوەتەوە: خوایە! ڕۆڵەم پێ ببەخشە، خوا عزوجل ئیسماعیلی پێبەخشیوە لە هاجەری میسریی وەك لە (صحيح البخاري)دا بەسەرهاتەكەی بە درێژیی باسكراوە و، دواتریش ئیسحاقی پێ بەخشیوە و، بە پێی (پەیمانی كۆن) (١٠ - ١٥) ساڵ دوای ئیسماعیل، ئیسحاقیشی بووە لە سارە خان.

لە سوورەتی (هود) (٦٩ - ٧٣)دا، كاتێ خۆی ئێمە لە بەسەرهاتی ئیبراهیمدا، ئەو ئایەتانەمان هێنا، خوا ﷻ بە وردیی باسی چۆنیەتی مژدە پێدرانی سارەخان، دەكات كە ئیسحاقیان دەبێ و لە ئیسحاقیش یەعقووبیان دەبێ:

﴿ وَلَقَدْ جَآءَتْ رُسُلُنَآ إِبْرَٰهِيمَ بِٱلْبُشْرَىٰ قَالُوا۟ سَلَـٰمًا قَالَ سَلَـٰمٌ فَمَا لَبِثَ أَن جَآءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ ﴿٦٩﴾ فَلَمَّا رَءَآ أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً قَالُوا۟ لَا تَخَفْ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٠﴾ وَٱمْرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٌ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَـٰهَا بِإِسْحَـٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسْحَـٰقَ يَعْقُوبَ ﴿٧١﴾ قَالَتْ يَـٰوَيْلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٌ وَهَـٰذَا بَعْلِى شَيْخًا إِنَّ هَـٰذَا لَشَىْءٌ عَجِيبٌ ﴿٧٢﴾ قَالُوٓا۟ أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ رَحْمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَـٰتُهُۥ عَلَيْكُمْ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ إِنَّهُۥ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ ﴿٧٣﴾ ﴾ هـود.

ئێمە ڕاستە واتای ئەم چەند ئایەتە بە كورتی دەخەینەڕوو، كە لە تەفسیری سوورەتی (هود)دا، بە بە درێژیی قسەمان لە بارەی ئەو بابەتەوە كردوە، خوا ﷻ دەفەرموێ:

بێگومان ڕەوانەكراوانمان (كە مەبەست پێی فریشتەكانە) موژدەیان بۆ ئیبراهیم هێنا، گوتیان: سەلامت لێبێ، ئەویش گوتی: سەلامتان لێبێ، هێندەی پێنەچوو گۆلكێكی برژێنراو (یان: پیشێنراو)ی بۆ هێنان، كاتێك دەستیانی بینی كە بۆی ناچێ، (دەستیان بۆ نەبرد)، بە نامۆ تەماشای كردن، (یان: گومانی خراپی پێ بردن) و ترسی ڕێنیشت بەهۆیانەوە، گوتیان: مەترسێ ئێمە بۆ لای (لوط) ڕەوانەكراوین، ژنەكەشی [هاوسەری ئیبراهیم: سارەخان] بە پێوە بووە، پێكەنی {دڵخۆش بووە بەوە كە ئەوانە هاتوون گەلی لووط، ئەو گەلە ڕەوشت نزمە لە بەین بەرن} ئێمەش موژدەمان پێدا بە ئیسحاق و لە دوای ئیسحاقیش بە یەعقووب {واتە: موژدەمان پێدا كە ئیسحاقی دەبێ، دواییش ئیسحاق هاوسەرگیریی دەكات و یەعقووبی دەبێ} ئەویش گوتی: ئەی هاوار بۆ من، چۆن منداڵم دەبێ، لە كاتێكدا كە من پیرەژنم و ئەوەش مێردەكەمە، ئەویش بە ساڵداچووە، بەڕاستیی ئەوە شتێكی سەرسوڕهێنەرە! گوتیان: ئایا سەرت سوڕدەمێنێ لە كاری خوا؟ بەزەیی و پێزی خوا لەسەر ئێوە بێ، ئەی خاوەنی ئەم ماڵە، بەڕاستیی (خوا) ستایشكراوی پایە بەرزە.

**٢)- ژمارەی ناوهێنرانی ئیسحاق لە قورئاندا:** ئیسحاق عليه السلام سەرجەم حەڤدە (١٧) جاران ناوی لە قورئاندا هاتوە، بەم شێوەیە:

١)- لە سوورەتی (البقرة)دا سێ جاران، لە ئایەتەكانی: (١٣٣، ١٣٦، ١٤٠)دا هاتوە.

٢)- لە سوورەتی (آل عمران)دا، یەك جار، لە ئایەتی: (٨٤)دا هاتوە.

٣)- لە سوورەتی (النساء)دا، یەك جار، لە ئایەتی: (١٦٣)دا هاتوە.

٤)- لە سوورەتی (الأنعام)دا، یەك جار، لە ئایەتی: (٨٤)دا هاتوە.

٥)- لە سوورەتی (الهود)دا، دوو جار، لە ئایەتەكانی: (٧١، ٧١)دا دووبارە بۆتەوە.

٦)- لە سوورەتی (یوسف)دا، دوو جار، لە ئایەتەكانی: (٦، ٣٨)دا هاتوە.

٧)- لە سوورەتی (إبراهیم)دا، یەك جار، لە ئایەتی: (٣٩)دا هاتوە.

٨)- لە سوورەتی (مریم)دا، یەك جار، لە ئایەتی: (٤٩)دا هاتوە.

٩)- لە سوورەتی (الأنبیاء)دا، یەك جار، لە ئایەتی: (٧٢)دا هاتوە.

١٠)- لە سوورەتی (العنكبوت)دا، یەك جار، لە ئایەتی: (٢٩)دا هاتوە.

١١)- لە سوورەتی (الصافات)دا، دوو جار، لە ئایەتەكانی: (١١٢، ١١٣)دا هاتوە.

١٢)- لە سوورەتی (ص)دا، یەك جار، لە ئایەتی: (٤٨)دا هاتوە.

کەواتە: هەمووی دەکاتە (١٧) جار.

**٣)- ژیان و گوزەرانی ئیسحاق** ؑ: لە قورئاندا وردەکارییەکانی ژیانی ئیسحاق باس نەکراون، بەڵام دیارە کە ئیسحاق هەر لەگەڵ بابی (ئیبراهیم)دا ژیاوە و، لە هەندێك سەرچاوەدا هاتوە، کە ئیبراهیم یەکێك لەبەر دەست و خزمەتکارەکانی خۆی ناردوە بۆ (فَدَّان آرام) لە باکووری عێراق، بۆ هێنانی (رِفقة) کە کچێك بووە و بێگومان دەبێ خزم یان، ئاشنایان بوو بێ، چونکە ئیبراهیم ؑ کە ناردووتی لەوێرا بە تایبەتیی، ئەو ئافرەتەی بۆ بێنن، ئیدی ئیسحاق هاوسەرگیریی لەگەڵدا کردوە، ئەمە لە پەیمانی کۆنیشدا هەر هاتوە.

ئنجا کوڕێکی کە زۆر ناودار بێ، بۆ ئیسحاق، هەر یەعقووبە، بەڵام ئایا کوڕی دیکەشی بوون، یان نا؟! لە قورئاندا باس نەکراوە، بەڵام ئەوە ئاشکرایە کە یەعقووب کوڕی ئیسحاقە.

**٤)- مردنی ئیسحاق** ؑ: ئیسحاق لە تەمەنی سەدو هەشتا ساڵیی (١٨٠)دا، کۆچی دوایی کردوە، وەك لە پەیمانی کۆندا هاتوە، لە شاری (خلیل) مردوە، لە (حَبْرون)، لە ئەشکەوتی (المکفیلة) دا بە خاك سپێردراوە، ئەم زانیارییانە لە پەیمانی کۆندا[1] هاتوون، هەروەها (أطلس القرآن)ی دکتور (شوقي خلیل)[2]یش، ئەم وردەکارییانەی هێناون.

## دووەم: کورتە باسێك لە بارەی یەعقووبەوە ؑ:

ئەویش لە چوار بڕگەدا، بە کورتیی دەخەینەڕوو:

**١)- ناوو ڕەچەڵەکی**: یەعقووب هەر ناوی یەعقووب بووە، بەڵام نازناوی (إسرائیل)ە، (إسرا) واتە: بەندە، (ئیل) واتە: (أللە)، کەواتە: (إسرائیل) واتە: (عبداللە)، بەندەی خوا، ئەمە نازناوی یەعقووبە لە قورئاندا، هەم بە (إسرائیل) ناوی هاتوە، هەم بە (یعقوب)یش و، یەعقووب نازناوەکەی (إسرائیل)ە و کوڕی ئیسحاقە، وەك لە سوورەتی (هود)دا هاتوە کە پێشتر ئایەتەکانمان خوێندنەوە: ﴿ فَبَشَّرْنَٰهَا بِإِسْحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسْحَٰقَ يَعْقُوبَ ﴿٧١﴾ ﴾هود، واتە: موژدەمان پێیدا [بە سارەی خێزانی ئیبراهیم] کە ئیسحاقی دەبێ و لە دوای ئیسحاق یەعقووبیش، واتە: نەك سارەخان یەعقووبیشی ببێ، بەڵکو وەك چۆن ئیسحاق لە ئیبراهیم و سارە پەیدادەبێ، یەعقووبیش لە ئیسحاق و هاوسەرەکەی کە (رفقة)یە، پەیدادەبێ.

---

(١) التفسیر التطبیقي للکتاب المقدس، العهد القدیم، سفر التکوین، الإصحاح: ٢٥-٢٨ ص ٦٦-٧٥.

(٢) ص ٥٠ - ٥٢.

هەروەها لە سوورەتی (مریم)یشدا: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَكُلًّا جَعَلْنَا نَبِيًّا ﴿٤٩﴾﴾ مريم، ئیسحاق و یەعقووبمان پێدان هەرکامێکیانمان گێڕا بە پێغەمبەر.

**٢)- ژمارەی ناوهێنانی لە قورئان دا:** لە قورئاندا شازدە (١٦) جاران ناوی یەعقووب هاتوە، بەم شێوەیە:

١)- لە سووڕەتی (البقرة)دا، چوار (٤) جاران ناوی هاتوە، لە ئایەتەکانی: (١٣٢، ١٣٣، ١٣٦، ١٤٠)دا.

٢)- لە سووڕەتی (آل عمران)دا، یەك جار، ناوی هاتوە لە ئایەتی: (٨٤)دا.

٣)- لە سووڕەتی (النساء)دا، یەك جار، ناوی هاتوە لە ئایەتی: (١٦٣)دا.

٤)- لە سووڕەتی (الأنعام)دا، یەك جار، ناوی هاتوە لە ئایەتی: (٨٤)دا.

٥)- لە سووڕەتی (هود)دا، یەك جار، ناوی هاتوە لە ئایەتی: (٧١)دا.

٦)- لە سووڕەتی (یوسف)دا، سێ جار، ناوی هاتوە لە ئایەتەکانی: (٦، ٣٨، ٦٨)دا.

٧)- لە سووڕەتی (مریم)دا، دوو جار، ناوی هاتوە لە ئایەتەکانی: (٦، ٤٩)دا.

٨)- لە سووڕەتی (الأنبیاء)دا، یەك جار، ناوی هاتوە لە ئایەتی: (٧٢)دا.

٩)- لە سووڕەتی (العنکبوت)دا، یەك جار، ناوی هاتوە لە ئایەتی: (٢٧)دا.

١٠)- لە سووڕەتی (ص)دا، یەك جار، ناوی هاتوە لە ئایەتی: (٤٥)دا.

لەو ناوهێنانانەش دا تەنیا ناوی یەعقووب ژمێردراون، چونکە وشەی (بني إسرائيل) زۆر جاران هاتوە، بەڵام ڕاستەوخۆ مەبەست (يعقوب) نیە.

**٣)- ژیان و بەسەرهاتی یەعقووب :** لە (پەیمانی کۆن)دا هاتوە[1]: هەروەها لە (قصص الأنبياء)ی (عبدالوهاب النجار)(٢)یش دا، دەڵێ: یەعقووب دەچێ بۆ لای خاڵی کە ناوی (لابان) بووە، لە (فدام آرام) کە وا پێدەچێ ئیسحاق لەسەر زەمینی کەنعان بوو بێ، [(فدان آرام)یش ناوچەی (حرّان) ە]، لەوێ دە (١٠) ساڵان لەلای خاڵی دەمێنێتەوە، کە ئاژەڵی بۆ بلەوەڕێنێ و شوانیی بۆ بکات، لە بەرانبەر ئەوەدا کە (راحیل)ی کچی، [واتە: (راحیل) کە کچی (لابان)ە]، بیدات بە یەعقووب، بیدات بە خوارزایەکەی خۆی، بەڵام خاڵی دوای ئەوەی یەعقووب دە (١٠) ساڵ شوانییەکەی تەواو دەکات، لە جیاتی ئەوەی (راحیل)ی بۆ بگوازێتەوە، (لَيئة)ی بۆ دەگوازێتەوە، کە ئەویش

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح: ٥٠، ص ١٢٣ فما بعد.

(٢) قصص الأنبياء، عبدالوهاب النجّار، ص ١١٩.

هەر کچی (لابان)بووە، کە دیارە یەعقووب حەزی لێ بووە، لەگەڵ (راحیل)دا هاوسەرگیریی بکات، ئیدی دوای ئەوەی کە یەعقووب بۆی دەردەکەوێ ئەوە (لیئة)یە، (لیئة)ی کچی خاڵیەتی، نەك (راحیل)، قسە لەگەڵ خاڵیدا دەکات، [هەڵبەتە دەبێ خاڵی عوزرێکی بوو بێ: ئایا (لیئة) گەورەتر بووە؟ یان هۆکارێکی دیکەی بووە؟ یان ویستوویەتی هەردوو کچەکانی بداتێ، کە ئەو کاتە لە شەریعەتی ئەواندا - دروست بووە، دوو خوشك لە ژێر نیکاحی پیاوێکدا لە یەك کاتدا کۆببنەوە] خاڵیشی پێی دەڵێ: دە (١٠) ساڵی دیکە شوانییم بۆ بکە، تاکو (راحیل)یشت بکەمە هاوسەر، ئەویش دە (١٠) ساڵی دیکە شوانیی دەکات و (راحیل)یش بە هاوسەر دەگرێ.

ئنجا (لیئة) کەنیزەکێکی دەبێ بە ناوی (زَلْفا) یان (زُلْفا)، (راحیل)یش کەنیزەکێکی دەبێ بە ناوی (بَلْها) و، هەردووکیان کەنیزەکەکەی خۆشیان دەدەن بە یەعقووب، واتە: چوار (٤) هاوسەری پەیدادەبن، دوایی هەموو کوڕەکانی - کە لە (پەیمانی کۆن)دا ناویان هاتوە و، کە ژمارەیان دوازدە (١٢)یە - هەموویان لە (لیئة) و (راحیل)و، لە (زُلْفا)و (بَلْهان)ن و، هەمووشیان لە سەر زەمینی (آرام) (فدان آرام) لە دایك دەبن، جگە لە (بنیامین) کە لەسەر زەمینی (کنعان) دەبێ و لە هەموو کوڕەکانی یەعقووبیش گچکەتر بووە.

٤)- بەسەرهاتی: یەعقووب لەگەڵ یوسف و کوڕەکانی دیکەی دا:

تێمە لە سوورەتی (یوسف)دا بە درێژیی باسمانکردوە، کە یەعقووب لەسەر زەمینی میسرِ مردوە، بەڵام دوایی جەنازەکەی گوازراوەتەوە بۆ فەڵەستین و لەوێ ئەویش لە ئەشکەوتی (المکفیلة)دا، کە لە شاری (خلیل)ە، لە (حبرون) بە خاك سپێردراوە(١).

لە کۆتاییدا ئەوە دەڵێین: کە ناوی کوڕەکانی یەعقووب کە تێمە لە تەفسیری سوورەتی (یوسف)یشدا هێناومانن و، لە پەیمانی کۆن وەرمانگرتوون، هەرچەندە لە هەندێك لە سەرچاوە مێژووییەکاندا ناوەکانیان هاتوون، بەڵام هەندێکیان دەستکارییان تێدا کراوە، بە پێی ڕیزبەندیی تەمەنیان ناوی کوڕەکانی یەعقووب بەم شێوەیەن:

١) راؤبین.

٢) شمعون.

٣) لاوي.

٤) یهوذا.

---

(١) التفسیر التطبیقي للکتاب المقدس، العهد القدیم، سفر التکوین الإصحاح: ٥٠، ص١٢٣.

٥) یسّاكر.

٦) زبولونا.

ئەم شەش كورە لە (لیئة) بوون، كە كچی خاڵی یەعقووب بووە و، خاڵی یەعقووب ناوی (لابان) بووە.

٧) یوسف.

٨) بنیامین.

ئەم دووانەش لە (راحیل) كچی دووەمی خاڵی یەعقووب، بوون، پێشتریش گوتمان: (لابان) دوو كچی بوون، (لیئة) یاخود (لِییا) و (راحیل).

٩) دان.

١٠) نفتالي.

ئەو دووانەش لە (بَلْها) یان (بیلها) بوون، كە كەنیزەكی (راحیل) بووە.

١١) جاد.

١٢) أشیر.

ئەوانەش لە (زلفا) پەیدابوون، كە ئەویش كەنیزەكی (لیئة) بووە.

هەڵبەتە ئەمە (عبدالوهاب بن النجار) لە (قصص الأنبیاء)[1]دا هێناویەتی، هەروەها لە پەیمانی كۆنیشدا هاتوە و، ڕەنگە سەرچاوە ئەسڵییەكەش هەر (پەیمانی كۆن) بێ.

یەعقووب لە تەمەنی سەدو چل و حەوت (١٤٧)ساڵییدا كۆچی دوایی كردوە[2].

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

(١) ص ١٢٠.

(٢) التفسیر التطبیقي للكتاب المقدس، العهد القدیم، سفر التكوین، الإصحاح: ٤٨، ص ١١٩.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان پازدە (١٥) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٥١ - ٦٥)، خوای بەرزی مەزن و زانای توانا، لەم پازدە (١٥) ئایەتەدا، سەرەتا باسی هەر کام لە مووساو هارِوونی برای (عَلَيْهِمَا السَّلَامِ) دەکات، دوایی باسی ئیسماعیل دەکات بە ئایەت، پاشان باسی ئیدریس دەکات بە ئایەت، صەڵات و سەلامی خوا لەسەر مووساو هارِوون و ئیسماعیل و ئیدریس و سەرجەم پێغەمبەرانی خوا بێ، پاشان بە گشتی باسی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) دەکات و، باسی هەندێك لە سیفەتە بەرزو پەسندەکانیان دەکات، دوایی باسی پاشینی خراپیان دەکات، واتە: ئەوانەی لە شوێنی ئەوان دانیشتن، بەڵام خراپ و بە کەڵك نەهاتوو بوون و، سیفەتە خراپەکانیشیان ئاماژە پێدەدا، دوایی ئەوانەیان لێ هەڵداوێرێ کە دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا، کە ئەوانە پاداشتیان بەهەشتە، دواییش باسی بەهەشت دەکات بە کورتیی.

پاشان لەسەر زمانی فریشتەکان، چەند قسەیەك دەکات، کە ئەوانە بە فەرمانی پەروەردگار نەبێ دانابەزن و، پەروەردگاریان شارەزای ڕابردوو و داهاتوە، یاخود شارەزای ئەوەیە کە لە پێشیانە و لە دوایانە و، ئەوەی لە نێوانیان دا هەیە و، پەروەردگاریان بێ هاوەڵ و هاوتایە.

﴿ وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ مُوسَىٰٓ إِنَّهُۥ كَانَ مُخْلَصًا وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا ﴿٥١﴾ وَنَٰدَيْنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلْأَيْمَنِ وَقَرَّبْنَٰهُ نَجِيًّا ﴿٥٢﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥ مِن رَّحْمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيًّا ﴿٥٣﴾ وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ إِسْمَٰعِيلَ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا ﴿٥٤﴾ وَكَانَ يَأْمُرُ أَهْلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرْضِيًّا ﴿٥٥﴾ وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ إِدْرِيسَ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا ﴿٥٦﴾ وَرَفَعْنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴿٥٧﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّۦنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْرَٰٓءِيلَ وَمِمَّنْ هَدَيْنَا وَٱجْتَبَيْنَآ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُ ٱلرَّحْمَٰنِ خَرُّوا۟ سُجَّدًا وَبُكِيًّا ۩ ﴿٥٨﴾ ۞ فَخَلَفَ مِنۢ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلشَّهَوَٰتِ ۖ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا ﴿٥٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ شَيْـًٔا ﴿٦٠﴾ جَنَّٰتِ عَدْنٍ ٱلَّتِى وَعَدَ ٱلرَّحْمَٰنُ عِبَادَهُۥ بِٱلْغَيْبِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ وَعْدُهُۥ مَأْتِيًّا ﴿٦١﴾ لَّا

يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا إِلَّا سَلَٰمًا ۖ وَلَهُمْ رِزْقُهُمْ فِيهَا بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿٦٢﴾ تِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِى نُورِثُ مِنْ عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيًّا ﴿٦٣﴾ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ ۖ لَهُۥ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَٰلِكَ ۚ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا فَٱعْبُدْهُ وَٱصْطَبِرْ لِعِبَٰدَتِهِۦ ۚ هَلْ تَعْلَمُ لَهُۥ سَمِيًّا ﴿٦٥﴾ ﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{هەروەها لە کتێبدا باسی مووسایان بۆ بکە، بێگومان ئەو (بەندەیەکی) هەڵبژاردە بوو، نێرراوێکی پێغەمبەر بوو ﴿٥١﴾ لەلای ڕاستی (کێوی) طووڕەوە بانگمان کردو، بە ڕاز و نیاز لەگەڵ کردنەوە، لە خۆمامان نیزیکخستەوە ﴿٥٢﴾ لە بەزەیی خۆشمانەوە: هاڕوونی برایمان وەك پێغەمبەر پێبەخشی ﴿٥٣﴾ هەروەها لە کتێبدا باسی ئیسماعیلیان بۆ بکە، بێگومان ئەو گفت ڕاست و، نێردراوێکی پێغەمبەر بوو ﴿٥٤﴾ فەرمانیشی بە خێزان و کەس و کاری دەکرد، بە نوێژکردن و زەکات دان و، لەلای پەروەردگاریشی (بەندەیەکی) زۆر پەسند بوو ﴿٥٥﴾ هەروەها لە کتێبدا باسی ئیدریسیان بۆ بکە، بە دڵنیایی ئەو زۆر ڕاست بوو، پێغەمبەریش بوو ﴿٥٦﴾ بۆ پێگەو شوێنێکی بڵیندیش بەرزمان کردەوە ﴿٥٧﴾ ئا ئەوانە پێغەمبەرانێکن، خوا چاکەی لەگەڵ کردوون، لە وەچەی ئادەم و، لەوانەی لەگەڵ نووح (لە کەشتیی دا) هەڵمانگرتن، هەروەها لە وەچەی ئیبراهیم و ئیسرائیل (یەعقووب) و لەوانەی ڕاستەڕێمان کرد بوون و، هەڵمان بژارد بوون، کاتێك ئایەتەکانی (خوای) میهرەبانیان بەسەردا خوێنرابانەوە، بە گریانەوە دەکەوتنە کڕنووش ﴿٥٨﴾ بەڵام دوایی پاشینێکی خراپیان هاتەجێ، نوێژیان فەوتاند و، شوێن ئارەزووان کەوتن، بێگومان دووچاری بێمرادیی دەبن ﴿٥٩﴾ جگە لە کەسێك کە بگەڕێتەوە (بۆ لای خوا) و کردەوەی چاك بکات، ئا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوەو، هیچ ستەمیان لێ ناکرێ (بە کەمکردنەوەی پاداشتیان) ﴿٦٠﴾ بەهەشتانێکی هەمیشەیی کە (خوای) بە بەزەیی بەڵێنی بە بەندەکانی داوە، بیانخاتە نێوی، لە حاڵێکدا کە پەنامەکیی و نادیارن، بە دڵنیایی بەڵێنی وی، هێنراوە ﴿٦١﴾ قسەی پووچی تێدا نابیستن (لەو بەهەشتەدا) جگە لە سەلام کردن و، بەیانیان و ئێوارانیش بژیوی خۆیانیان تێیدا هەیە ﴿٦٢﴾ ئەو بەهەشتە ئەوەیە کە دەیکەینە میراتی ئەو بەندانەمان کە پارێزکارن ﴿٦٣﴾ (فریشتەکان دەڵێن): ئێمە تەنیا

بـە فەرمـانی پـەروەردگارت دادەبەزیـن، هەرچـی لـە پێشـمانەوەو لـە دوامانـەوەو، ئـەوەی لـەو نێوانـەش دایـە، هـەر هـی ویـە و پـەروەردگارت (بـۆ هیـچ شـتێك) لەبیرچـوو نیـە (هیـچ شـتێك فەرامـۆش نـاکات) ﴿٦٤﴾ پـەروەردگاری ئاسـمانەکان و زەوی و ئـەوەی نێوانیانـە، بـەس ئـەو بپەرسـتەو بـۆ پەرسـتنی خۆڕاگـر بـە، ئایـا هیـچ هاوتـاو هاوناوێـکی بـۆ دەزانی؟ (هیـچ کەسـت پـێ شـك دێ هاوتـاو هاونـاوی وی بـێ؟) ﴿٦٥﴾).

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(مُخْلَصًا): (الخَالِـصُ: كَالصَّـافِي إلاَّ أنَّ الخَالِـص مَـازَالَ عَنْـهُ شَـوْبُهُ، بَعْـدَ أنْ كَانَ فِيْـهِ)، وشـەی (خَالِـص) وەك (صَـافِي) وایـە، بـەڵام (خَالِـص) ئەوەیـە کـە شـتێکی نامـۆی لەگـەڵ ئاوێتـە بـوو بـێ و لێـی لاچـوو بـێ و، لێـی پـاك بووبێتـەوە، بـەڵام (صَـافِي) ئەوەیـە هـەر لـە بنەڕەتـدا، بێگـەرد و سـاغ و بـێ خلتـە بـێ.

(مُخْلَصًا) واتـە: سـاغکراوە، هەڵبژێـردراو، هەڵبەتـە لـە قورئانـدا خوێنراویشـەتەوە: (مُخْلِصًا) واتـە: سـاغکەرەوە، یـانی: کـردەوەی خـۆی سـاغ کردۆتـەوە بـۆ خـوا.

(نَجِيًّا): (النَّجِـيُّ: المُنَاجـي، يُقَـالُ للوَاحِـدِ وَالجَمْـع)، (نَجـي) واتـە: (مُناجـي) قسـەکەر بـە چپـە، یـان بەدەنگـی نـزم و کـپ، ئەمـە بـۆ تـاك و کـۆ بـەکاردێ.

(مَرْضِيًّا): (مـرضِيٌ: مرضـوٌ)، (مَرضيُـون) یـان (مُرْضَـون) هەردووکیـان واتـە: پەسـندکراو، (رَاضِي) واتـە: پەسـندکەر، (مَـرْضِي) واتـە: پەسـندکراو.

(خَرُّواْ سُجَّدًا وَبُكِيًّا)، واتـە: بـە گریانـەوە بـە کڕنووشـدا کەوتـن، وشـەی (خَـرَّ) واتـە: (سَـقَطَ) وەك خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (النحـل)دا دەفەرمـوێ: ﴿فَخَرَّ عَلَيْهِمُ ٱلسَّقْفُ مِن فَوْقِهِمْ ﴿٢٦﴾﴾، واتـە: سـەربانەکە لەسـەرەوە بەسـەریاندا کـەوت.

(خَرُّوا سُجَّدًا)، (سُجَّداً) کـۆی (سـاجِد)ە، و (بُكِيًا) کـۆی (باكِي)یـە، یـانی: ئەوانـە لـە کاتێکـدا کـە دەگریـان، بـە کڕنووشـدا دەکەوتـن، وشـەی (بـاكِي) وەك چـۆن بـە (بُكِيًا) کۆدەکرێتـەوە، بـە (باكـون) و (باكين)یـش کۆدەکرێتـەوە.

(خَلَفَ): (الخَلْـفُ: الرَّدِيُ المتَخَلِّـف لِقُصُـورِ مَنْزِلَتِـهِ) وشـەی (خَلْـف) بـە مانـای خـراپ دێ و، بـە مانـای دواکەوتـوو، دێ، لـە ڕووی پێگـەوە، ئەگەرنـا وشـەی (خَلـف) ئەگـەر پێچەوانـەی

(أمامْ) بێ، هەروەك (وراء) پێچەوانەی (قُدّام)ە، (قُدّام) واتە: لە پێشەوە، (وَرَاء) واتە: لە پشتەوە، (خَلْف) واتە: لە دواوە، (أمَام) واتە: لە پێشەوە، ئنجا ئەگەر مانایەکەی وابێ، ئەو کاتە زەم و باسی خراپ ناگەیەنێ، دەگوترێ: فڵان کەس لە پشت فڵان کەسەوەیە، (مِنْ وَرَائِهِ) یان (مِنْ خَلْفِهِ)، بەڵام لێرەدا (خَلْف) بە مانای خراپ، بەجێماو لە ڕووی پێکەوە، بەکارهاتوە، لە زمانی عەرەبییدا ئەم پەندە هەیە: (سَكَتَ أَلْفَاً، وَنَطَقَ خَلْفَاً)، واتە: هەزار ساڵ بێدەنگ بوو، دوایی قسەی خراپی کرد، هەروەها گوتراویشە: (سَكَتَ دَهْرَاً فَنَطَقَ كُفْرَاً) ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوو، دوایی قسەی کوفری کرد.

(غَيَّا)، لێرەدا (غَيّ) لەلایەن بەشێك لە زانایانەوە بە مانای (سزاو ئازار) لێکدراوەتەوە، بەڵام ئەوە ڕاست نیە و وەك (راغب الأصفهاني) دەڵێ: (غَوَىَ: أي فَسَدَ عَيْشُهُ)، ژیانی تێکچوو، کەواتە: (غي) واتە: ژین تاڵیی و، بێمرادیی و، بێ حاڵیی، بۆیە هەندێك لە شیکەرەوانی وشەکانی قورئان، کە وشەکانی: (ضلال و غي) و، بە پێچەوانەشەوە لە بەرانبەریان دا (هُدى ورشد)یان، بە یەك واتا هێناون و گوتوویانە: (ضلال) یانی: گومڕایی و (غي)ش یانی: گومڕایی، هەروەها (هُدى) یانی: ڕێنمایی، (رُشد)یش واتە: ڕێنمایی، ئەوە لە ڕاستییدا نەیانپێکاوە، چونکە (ضلال) واتە: گومڕایی، بەڕێ نەزانین، لە ڕێ ون بوون، بەڵام (غي) دەرەنجامی (ضلال)ە، واتە: بێمرادیی و ژین تاڵیی و بێ حاڵیی.

هەروەك (هُدى) واتە: بە ڕێگا زانین، بەڵام (رُشد) واتە: سەر ڕاستیی و بە ئاکام گەیشتن، بە مراد گەیشتن، واتە: ئەو دووانە یەکێکیان هۆکارە، ئەوەی دیکەیان دەرەنجامە، بۆیە خوا کە دەفەرموێ: ﴿ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ ۝٢ ﴾النجم، هاوەڵەکەتان (کە موحەممەدە) نە گومڕا بووە، نە بێمرادو ژین تاڵیش بووە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا ۝٥٩ ﴾مریم، واتە: تووشی ژین تاڵیی و بێ حاڵیی و بێ مرادیی دەبن، یانی: لە ئەنجامی ئەوەدا کە لە دنیادا گومڕا (ضاڵ)ن، لە دوارۆژدا تووشی (غي) بێ مرادیی و ژین تاڵیی دەبن.

(مَأْتِيَّا)، (مَفعولٌ بِهِ)یە، لە (أَتَيتُهُ) هاتمە لای، (آتي) (إسم فاعل)ە، واتە: هاتوە، کەسێك کە دێ، (مأتي) (إسم مفعول)ە، واتە: شتێك کە دەهێنرێ.

کەواتە: (مأتي) واتە: هێنراو، هەڵبەتە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: (مَأتي) لێرەدا بە مانای (آتي) (هاتوو)یە، بەڵام وانیە و بەمانای (هێنراو)ە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەم ئایەتـە موبارەکـە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُۥ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَٰلِكَ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾ ﴾،

ئەمە گێردراوەتەوە:

(عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ رَضِيَ اللَّـهُ عَنْهُـما، قَـالَ قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ لِجِبْرِيـلَ: مَـا يَمْنَعُـكَ أَنْ تَزُورَنَـا أَكْثَرَ مِـمَّا تَزُورُنَـا؟ فَنَزَلَـتْ: ﴿ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُۥ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَٰلِكَ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾ ﴾)، (أخرجـهُ أحمـد: ٢٠٤٣، والبخـاري: ٣٢١٨، والترمـذي: ٣١٥٨).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس (خـوا لـە خـۆی و بـاﺑﻰ ڕازی بـێ)، دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ بـە جیبریـلی فەرمـوو: چ شـتێك ڕێـت لێدەگـرێ کـە زیاتـر لـەوەی سـەردانمان دەکـەی، سـەردانمان بکـەی؟ ئیـدی ئـەم ئایەتـە دابـەزی و خـوا ﷻ لـە جیـاتی جیبریـل و فریشـتەکان، وەڵامـی پێغەمبــەر ﷺی دایـەوە، کـە دەفەرمـوێ: ئێمـە بـە فەرمـانی پـەروەردگارت نەبـێ دانابەزیـن، ئـەوەی لـە پێشـمانەو، ئـەوەی لـە دوامانەوەیـە و، ئـەوەی لـە نێوانیانـدا هەیـە، هـەر هەمـووی هـی خوایـە و، پـەروەردگارت هیـچ شـتێکی لەبیرناچـێ، (خـوا لەبیرچـوو (نـاسي) و فەرامۆشـکار نیـە بـۆ هیـچ شـتێك).

## مانای گشتی ئایەتەکان

وەك لە پێناسەی ئەم دەرسەدا گوتمان: خوا ﷻ هەر لەسەر خستنەڕووی باس و خواسی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بەردەوام دەبێ، کە وەك گوتمان: زۆرترین پانتایی لەم سووڕەتەدا، دوو لەسەر سێ (٣/٢) ئەم سووڕەتە زیاتر، (١ - ٦٥) یەك تاکو شەست و پێنج، لە نەوەد و هەشت (٩٨) ئایەت، هەمووی بۆ باس و خواسی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) تەرخانکراوە.

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱذْكُرْ فِي ٱلْكِتَٰبِ مُوسَىٰٓ ﴾، هەروەها لە کتێبدا لەم قورئانەدا، لەم فەرمایشتە نووسراوەدا، باسی مووسا بکە، بەسەرهاتەکەی بگێڕەوە، ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ مُخْلَصًا وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا ﴾، بە دڵنیایی مووسا ساغ کراوە بوو و نێردراوێکی پێغەمبەریش بوو، پێغەمبەرێك بوو کە نێردراو بوو و ڕەوانەکرا بوو بۆ لای خەڵك، کە پەیامی خوایان پێ بگەیەنێ.

(مُخْلَصًا) واتە: هەڵبژێردراو و ساغکراوە، خوێنراویشەتەوە: (مُخْلِصاً) واتە: خۆ ساغکەرەوە، خۆ یەکلاییکەرەوە، یانی: کردەوەکانی خۆی ساغ و پاك کردبوونەوە و خڵتەی پێوە نەهێشتبوون، تەنیا بۆ خوا ئەنجامی دابوون، یاخود: دڵ و دەروونی خۆی ساغ کرد بۆوە، یان: دەروونی خۆی و دەری خۆی، پەنهان و ڕواڵەی خۆی ساغ و یەکلاکرد بۆوە بۆ خوا، ﴿ وَنَٰدَيْنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلْأَيْمَنِ وَقَرَّبْنَٰهُ نَجِيًّا ﴾، لەلای ڕاستی طوورەوە بانگمان کرد و بە ڕاز و نیاز لەگەڵدا کردن و بە پەنهانیی قسە لەگەڵداکردنەوە: لە خۆمامان نیزیکخستتەوە.

(طور) دەگونجێ چیایەکی دیاریکراو بێ، کە لە دەشتی (سینا)یە، وەك خوای بەرزوبێ هاوتا لە باسی زەیتووندا، دەفەرموێ: ﴿ وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَآءَ تَنۢبُتُ بِٱلدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِّلْءَاكِلِينَ ٢٠ ﴾المؤمنون. یانی: درەختێکیش لە طووری سینا دەڕوێ، بەرهەمهێنەری چەوریی و پێخۆرە بۆ بخۆران.

دەشگونجێ هەر چیایەك بێ، واتە: (طور) بە مانای چیا (جَبَل) هاتوە بە ڕەهایی، هەروەها بە مانای چیایەکی دیاریکراویش هاتوە کە لە دەشتی (سینا)یە، دەبێ مووسا

ﷺ لەسەر ئەو کێوە، ئەو چیایە، ڕاز و نیاز و گفتو گۆی لەگەڵ خوای بەرزی بێ وێنەدا کرد بێ، ﴿ وَوَهَبْنَا لَهُۥ مِن رَّحْمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيًّا ﴾، هەروەها لە بەزەیی خۆمانەوە هاڕوونی برایمان وەك پێغەمبەر پێبەخشی، وەك لە سوورەتی (طه)دا هاتوە، مووسا لە خوا پاڕاوەتەوە: ﴿ وَٱجْعَل لِّي وَزِيرًا مِّنْ أَهْلِي ﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ أَخِي ﴿٣٠﴾ ٱشْدُدْ بِهِۦٓ أَزْرِي ﴿٣١﴾ وَأَشْرِكْهُ فِيٓ أَمْرِي ﴿٣٢﴾ كَيْ نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا ﴿٣٣﴾ وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرًا ﴿٣٥﴾ ﴾طه.

مووسا لە خوا دەپاڕێتەوە: کە خوا هاڕوونی برای بۆ بکاتە وەزیر، واتە: هاوکار و پشتگیر، نەك بەو واتا زاراوەییەی ئێستا کە حکوومەتێك دروست بکرێ و، سەرۆکی حکوومەت و چەند وەزیرێکیش هەن! بەڵکو وەزیر، یانی: کەسێك کە ئینسان پشتی پێ دەبەستێ و دەبێتە پشت و قەوەت بۆی، ئنجا کە لەوێ پاڕاوەتەوە لە خوای پەروەردگار، خواش پاڕانەوەکەی و داوایەکەی گرتۆتەوە، بۆیە دەفەرموێ: لە بەزەیی خۆمانەوە، هاڕوونی برایشیمان پێبەخشی وەك پێغەمبەر.

لێرەدا تەنیا بەو سێ ئایەتە باسی مووساو هاڕوونی برای کراوە، بەڵام لە زۆر شوێنی دیکەی قورئاندا، بە تەفصیل باسی مووسا کراوە و لەگەڵیشیدا، باسی هاڕوونی برای کراوە، وەك ئێمە لە سوورەتی (الأعراف)دا، لەو بارەوە قسەمان کردوە، لە تەفسیری ئەو ئایەتانەدا کە لە سوورەتی (الأعراف)دا هاتوون، کە پانتاییەکی زۆریان گرتوە و بە دەم تەفسیرکردنیانەوە، بەسەرهاتی مووسا ﷺ مان هێناوە، هەروەك خوا پشتیوان بێ، کاتێك دەگەینە سوورەتەکانی: (طه) و (الشعراء) و (القصص)، دووبارە قسەی لەبارەوە دەکەین، بە تایبەت (القصص) چونکە ئێمە لە سوورەتی (الأعراف)دا قۆناغەکانی بەسەرهاتی مووسامان بۆ سێزدە (١٣) قۆناغ دابەشکردوون، ئنجا لەو (١٣)یە، لە (الأعراف)دا هەشت (٨) یانمان باسکردوون و، پێنج (٥)یشیانمان هەڵگرتوون بۆ کاتێك کە دەگەینە سوورەتی (القصص)، چونکە ئەو پێنج قۆناغانەی سەرەتای تەمەنی مووسا، زیاتر لەوێدا هاتوون.

ئنجا دوایی خوا دێتە سەر باسی ئیسماعیل: ﴿ وَٱذْكُرْ فِي ٱلْكِتَٰبِ إِسْمَٰعِيلَ ﴾، هەروەها لە کتێبدا (لەم قورئانەدا) باس و خواسی ئیسماعیلیشیان بۆ بکێڕەوە، ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا ﴾، بە دڵنیایی ئەو (ئیسماعیل) زۆر بەڵێن ڕاست بوو، لە بەڵێنی خۆیدا ڕاستگۆبوو، کە گفتێکی دەدا، جێبەجێی دەکرد، ڕەوانەکراوێکی پێغەمبەریش بوو، زۆربەی زانایان دەڵێن: (نبي) ئەو کەسەیە کە خوا هەواڵی پێدەدا بە تایبەت، سروشی بۆ دەکات، پەیامی بۆ دەنێرێ، چونکە (نبي) و (نبيء) هەردوو خوێندنەوەکانیشی هاتوون،

یان (فعیل)ی بە مانای (مفعول)ن، واتە: هەواڵ پێدراو، (مُنْبَأ)، یاخود: (فعیل)ی بە مانای (فاعل)ن، واتە: هەواڵ پێدەر (مُنْبِيء) دیارە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)یش خوا هەواڵیان پێدەدا بە شێوەی تایبەت و، هەواڵیش بە خەڵك دەدەن: هەواڵی خوا ﷻ.

بەڵام (رسول) واتە: ڕەوانەکراو، ئنجا گوتوویانە: هەموو (رسول)ێك (نبي)ە، بەڵام مەرج نیە هەموو (نبي)ێك (رسول)بێ، ئەوە ڕایەکە لە ڕایەکانی زانایان و ڕای دیکەش هەن، کە دوایی وردتر ڕایەکان دەخەینەڕوو.

﴿ وَكَانَ يَأْمُرُ أَهْلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرْضِيًّا ﴾، ئیسماعیل فەرمانی بە ماڵ و خێزان و کەس و کاری خۆی دەکرد، بە نوێژکردن و بە زەکات دان.

چونکە: نوێژ مافی خوایە و زەکات مافی خەڵکە، هەروەها نوێژ پایەی مەعنەویی دینداریە و، زەکات پایەی ماددیی دینداریە، دینداریش لەسەر ئەو دوو پایە ڕادەوەستێ: دەبێ ئینسان هەم لە ڕووی مەعنەوییەوە، بەندایەتیی بۆ خوا، لە خۆیدا بەرجەستە بکات، هەم لە ڕووی ماددییەوە، دەبێ هەم خوا پەرست بێ، هەم خەڵك دۆست بێ، هەم لەگەڵ خوا ڕاست بێ، هەم لەگەڵ خەڵکدا چاك بێ.

هەروەها ئیسماعیل لە لای پەروەردگاری، پەسندکراو و خۆشویستراو و ستایشکراو بوو.

ئنجا دێتە سەر باسی ئیدریس، دەفەرموێ: ﴿ وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَـٰبِ إِدْرِيسَ ﴾، هەروەها لە کتێبدا (لەم کتێبەدا) باس و خواسی ئیدریسیان بۆ بکێڕەوە، ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا ﴾، ئیدریسیش پیاوێکی زۆر ڕاست و، پێغەمبەریش بوو، یانی: هەواڵ پێدراو بوو و، هەواڵدەر بوو بە ناوی خواوە، لێرەدا بۆ ئیدریس باسی (رسول)ی نەکردوە، کە پەیامێکی پێدرابێ بە خەڵکی ڕابگەیەنێ، بەڵام لەبەر ئەوەی باسی ڕیسالەت و ڕەوانەکراوێتیی وی نەکراوە، مانای وا نیە کە ڕەوانەکراو (رسول) نەبووە، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا باسی ئیبراهیمیش دەکات، هەر دەفەرموێ: ﴿ وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَـٰبِ إِبْرَٰهِيمَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا ﴿٤١﴾ ﴾مريم، لە حاڵێکدا کە ئیبراهیم خوا پەیامی پێدا ناردوە، بۆ هەموو گەلان، لە شام بووە، لە عێراق بووە، لە میسر بووە، لە حیجاز بووە، بەڵام کە لە شوێنی دیکەدا باسی ڕیسالەت و ڕەوانەکراوێتیی ئیبراهیم کراوە، لێرەدا بە پێویست نەزانراوە باس بکرێ.

﴿ وَرَفَعْنَـٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴾، هەروەها ئیدریسمان بەرزکردەوە بۆ شوێنێکی زۆر بڵند، ئەو

شوێنە بڵندە - وەك دوایی باسی دەکەین - لە فەرمایشتی پێغەمبەردا هاتوە، کە ئیدریس لە ئاسمانی چوارەمە، کە پێغەمبەری خوا لە شەوی میعراج دا پێی گەیشتوە، ئنجا ئایا بە ڕووح و جەستە لەوێیە؟ تەنیا ڕووحەکەی لەوێیە؟ لە قاڵبێکی بەرزەخیی دایە؟ دوایی باسی دەکەین.

دوای ئەوەی خوای زانا و توانا، باسی ئەو پێغەمبەرانەی کرد بە کورتی، ئنجا بە گشتی باسیان دەکات و دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾، ئا ئەوانە، ئەو کەسانەن لە پێغەمبەران، کە خوا چاکەی لەگەڵدا کردوون، ئنجا ئاشکرایە خوا چاکەی لەگەڵ هەموو پێغەمبەراندا کردوە، بۆیە (مِن) لە (مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ)دا، دەگونجێ بۆ هەندێك (تبعيضية)بێ، واتە: ئا ئەوانە لە نێو پێغەمبەراندا، کەسانێکن کە خوا چاکەی تایبەتیی لەگەڵ دا کردوون، ئەگەرنا خوا لەگەڵ هەموو پێغەمبەراندا چاکەی کردوە و، پلەو پایەی پێغەمبەرایەتیی گەورەترین چاکەیە، کە خوا بە هەموو پێغەمبەرانی داوە.

دەشگونجێ: (مِن) (بيانيّة) بێ، واتە: خوا چاکەی لەگەڵ ئەوانەدا کردوە کە هەموویان لە جۆری پێغەمبەرانن (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، یانی: تێکڕای پێغەمبەران، چاکە لەگەڵدا کراون، ئنجا ئەوانیش لە کوێوە هاتوون؟ ﴿ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ ﴾، لە وەچەی ئادەمن، کەواتە: ئادەم عليه السلام هەروەك چۆن بابی مرۆڤایەتییە، کە دیارە حەوواش دایکی مرۆڤایەتییە، بە هەمان شێوەش لە نێو مرۆڤایەتییشدا، ئادەم بابی هەموو پێغەمبەرانە، هەروەك دایکی هەمووشیان، بریتیە لە حەووا (عَلَيْهِمَا الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، بەڵام لە دوای ئادەم، کەسێك کە هەموو مرۆڤایەتیی دەچێتەوە سەری، بریتیە لە نووح، بۆیە بە نووح گوتراوە: بابی دووەمی مرۆڤایەتیی (أبو البشر الثاني)، وەك لە بەسەرهاتەکەیدا بە تەفصیل باسمانکرد، لە سووڕەتی (هود)دا، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَمِمَّنۡ حَمَلۡنَا مَعَ نُوحٍ ﴾، هەروەها ئەوانە لە وەچەی ئەوانەن کە لەگەڵ نووحدا هەڵمان گرتبوون، واتە: لە کەشتییەکەی نووحدا، چونکە هەرچی لە کەشتییەکەی نووحدا بووە، هەمووی لە وەچەی نووح بووە، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلۡنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلۡبَاقِينَ ﴿٧٧﴾ ﴾الصافات، واتە: هەر وەچەکەی ئەومان هێشتەوە، کەواتە: ئەوەی کە لە کەشتییەکەدا، لەگەڵ نووحدا سوار بووە، هەمووی لە ڕووی ڕەچەڵەکەوە، هەموویان چوونەتەوە سەر نووح، بۆیە بە نووح گوتراوە: بابی دووەمی مرۆڤایەتیی.

﴿ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْرَٰٓءِيلَ ﴾، لە دوای نووحیش ئنجا ئەو پێغەمبەرانە دەچنەوە سەر ئیبراهیم و دەچنەوە سەر ئیسرائیل، یانی: یەعقووب، ئیسرائیل واتە: بەندەی خوا (عبداللە) نازناوی یەعقووب بووە، ﴿ وَمِمَّنْ هَدَيْنَا وَٱجْتَبَيْنَآ ﴾، هەروەها ئەو پێغەمبەرانە لەوانەن کە ئێمە ڕێنماییمان کرد بوون و خستبوومانە سەر ڕاستە ڕێ و هەڵمانبژارد بوون.

ئنجا ئایا سیفەت و حاڵیان چۆن بوو؟ ﴿ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُ ٱلرَّحْمَٰنِ خَرُّوا۟ سُجَّدًا وَبُكِيًّا ﴾، هەر کات ئایەتەکانی خوای خاوەن بەزەییان بەسەردا خوێنرابانەوە، لەپە و ڕوو بە گریانەوە بە کڕنووشدا دەکەوتن، واتە: ملکەچ بوون بۆ خوا و، لە بەرانبەر خوادا ﷻ بەندایەتییان دەکرد و بۆ خوا: زەبوونیی و بچووکییان پێشاندەدا.

﴿ فَخَلَفَ مِنۢ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ ﴾، بەڵام پاشینێکی خراپ هاتنە شوێنیان، (خَلْف) واتە: کەسانێکی خراپ، کە لە ڕووی پێگەو پلەوە: دواکەوتوون و هاتوونە دوا، بێگومان خەڵکی باشیشیان لە پاش بووە، بەڵام لێرەدا خوا باسی پاشینە خراپەکانیان دەکات و، هۆکاری خراپییەکەشیان باس دەکات و دەفەرموێ: ﴿ أَضَاعُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلشَّهَوَٰتِ ﴾، نوێژیان فەوتاند و کەوتنە شوێن ئارەزووان.

کەواتە: نوێژ فەوتاندن و، دوای ئارەزوو کەوتن، دوو شتی تێکهەڵکێشن، هەر کەس نوێژ بفەوتێنێ، بەهۆی ئەوەوەیە، کە شوێن ئارەزووەکانی دەکەوێ، هەروەها: هەر کەسێك شوێن ئارەزووەکانی بکەوێ، نوێژ دەفەوتێنێ، ئەو دووانە تێکهەڵکێشن و هەمیشە پێکەوەن، نوێژ بۆچی دەفەوتێنرێ؟ ئنجا چ ئەوەی کە هەر نەیکات، یان ئەوەی کە هەندێ جار نوێژەکانی نەکات: بە هۆی شوێن کەوتنی ئارەزووەکانەوەیە، بەهۆی هەڵبژاردنی ئیسراحەت و تەمبەڵییەوەیە، بەسەر گورج و گۆڵییدا، یان بەرژەوەندییەکی شەخسیی، یان بەرژەوەندییەکی گشتیی دنیایی، هاتۆتە پێشی و زاڵی کردوە بەسەر جێبەجێکردنی فەرمانی خوادا، بۆیە هەمیشە شوێن ئارەزووکەوتن و نوێژ فەوتاندن (نوێژ چواندن) دوو شتی تێکهەڵکێشن، ﴿ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا ﴾، ئەوانە بە دڵنیایی دووچاریی بێ مرادیی و ژین تاڵیی و بێ حاڵیی دەبن، کە مەبەست پێی سزای ڕۆژی دواییە، یاخود هەر لە دنیاشدا تووشی ژین تاڵیی و بێ حاڵیی دەبن، چونکە: ئەو کەسەی نوێژ دەفەوتێنێ و لەگەڵ خوادا ﷻ شەو و ڕۆژی پێنج جاران، بەلای کەمیی، پەیمانی تازە ناکاتەوە: شەیتان بەسەریدا زاڵ دەبێ، ئنجا ئەو کەسەی شوێن ئارەزووەکانی دەکەوێ، هەم لە ڕووی جەستەییەوە و، هەم لە ڕووی ڕووحییەوە و، هەم لە ڕووی عەقڵییەوە و، لە

ڕووی تاکیی و، لە ڕووی خێزانیی و، لە ڕووی کۆمەڵایەتیی و، لە ڕووی سیاسییەوە، زەرەر دەکات، هەرچی لادان و تاوان و خراپەکاریی هەیە، بە هۆی دوورکەوتنەوەوەیە لە خوا.

بەڵام دوایی خوا ﷻ هەندێکیان لێ هەڵدەوێرێ و دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ﴾، جگە لەوانەی کە دەگەڕێنەوە و، ئیمان دێنن و، کردەوەی چاك دەکەن.

کەسێك بگەڕێتەوە بۆ لای خوا و، بڕوابێنێ و، کردەوەی باش بکات: ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا ﴾، ئا ئەوانە دەچنە بەهەشت و هیچ ستەمێکیان لێ ناکرێ، یانی: هیچ ئەندازەیەك لە پاداشتیان کەم ناکرێتەوە.

ئنجا خوا پێناسەیەکی کورتی ئەو بەهەشتانە دەکات:

﴿ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ عِبَادَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِ ﴾، ئەم بەهەشتە هەمیشەییانەی کە (خوای) خاوەن بەزەیی بە پەنامەکیی بەڵێنی بە بەندەکانی داوە، بەبێ ئەوەی بیانبینن خوا بەڵێنی پێداون، نایانبینن، بەڵام متمانەیان بە بەڵێنی خوا هەیە، ئەگەر بە چاوی سەر نایانبینن، بەڵام بە چاوی عەقڵ و دڵ دەزانن: ئەو خوا بەرزو مەزنە، هەر شتێك بفەرموێ، وایە، بڕوا بە خوا هێنان ﷻ ڕیشەکەی بریتیە لە ئیمان بە نادیار، خوا بۆ خۆشی نادیارە، ئەگەر بە چاوی سەر بۆی بڕوانی نادیارە، ئەگەر بە پێنج (٥) هەستەکان بۆی بڕۆی، نا بەرهەستە، چونکە خوا لەوە بەرزترە، کە بە تۆڕو شەداوی پێنج هەستەکان: دیتن و بیستن و تامکردن و بۆنکردن و دەست لێ کوتان، پەی پێ ببردرێ، خوا زۆر لەوە بەرزترە، بگرە هەندێ لە دروستکراوەکانی خواش بە پێنج هەستەکان پەییان پێ نابردرێ، وەك: ڕووح، هێزی کێشندە، هێزی موگناتیسیی، تیشکی ژێر سوور، تیشکی سەروو وەنەوشەیی و، گەلێك لە دروستکراوەکانی خوا، لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە، بە تۆڕو شەدای پێنج هەستەکان، ناگیرێن، چ جای خوای بەرزی مەزنی بێ وێنە، هەر بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلۡبَاطِنُۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ٣ ﴾الحديد، واتە: ئەوە (خوا) یەکەمینەو دوایەمینە، ئاشکرایەو پەنهانە و، ئەو بەهەموو شتێك زانایە.

یانی:

١- خوا یەکەمینە، ئەگەر بە چاوی دڵ و عەقڵ بۆی بڕوانی، بەڵام دوایەمینە یاخود ڕەنگە هەر پەی پێ نەبەی، ئەگەر بە پێنج هەستەکان بۆی بگەڕێی.

٢- خوا ئاشکرایە، ئەگەر بە چاوی عەقل و دڵ بۆی بڕوانی، بەڵام پەنهانە، ئەگەر لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە بەدوایدا بگەڕێی.

٣- ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ وَعۡدُهُۥ مَأۡتِيّٗا ﴾، بە دڵنیایی بەڵێنی خوا هێنراوە، هەر دێتەدی و هیچ گومانی تێدانیە. ﴿ لَّا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوًا إِلَّا سَلَٰمٗا ﴾، ئەو بەهەشتانە قسەی پووچیان تێدا نابیستن، جگە لە سڵاوکردن.

سڵاوکردن:

أ- خوا سڵاویان لێ دەکات: ﴿ سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ ﴿٥٨﴾ ﴾یس.

ب- فریشتەکان سڵاویان لێ دەکەن: ﴿ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَدۡخُلُونَ عَلَيۡهِم مِّن كُلِّ بَابٖ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم ﴿٢٤﴾ ﴾الرعد، واتە: فریشتەکان لە هەموو دەروازانەوە لێیان دەچنە ژوور دەڵێن: سڵاوتان لێ بێ.

ج- بۆ خۆشیان سڵاو لە یەکدی دەکەن: ﴿ تَحِيَّتُهُمۡ فِيهَا سَلَٰمٞ ﴾ إبراهيم - ٢٣ - ئەوە واتایەکی.

یاخود: هیچ قسەیەکی پووچی تێدا نابیستن، جگە لە قسەی سەلامەت و باش.

هەڵبەتە (سلام) چ بە مانای سڵاوکردن بێ، چ بە مانای قسە سەلامەت و باش بێ، جیایە لە (لغو)، یانی: قسەی پووچ، بۆیە زانایان دەڵێن: ئەم هەڵاواردنە لێرەدا پێی دەگوترێ: (إستثناءٌ مُنْقَطِع) واتە: هەڵاواردنی لێک دابڕاو، چونکە جیاکراوە (مستثنی) لە جینسی لێ جیاکراوە (مستثنی منه) نیە، بۆیە پێی دەگوترێ: هەڵاواردنی لێک دابڕاو، بەڵام ئەگەر هەڵاوێردراو، لە جینسی لێ هەڵاوێردراو بێ، ئەو کاتە پێی دەگوترێ: هەڵاواردنی پەیوەست (الإستثناء المتصل).

﴿ وَلَهُمۡ رِزۡقُهُمۡ فِيهَا بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ﴾، هەروەها بژێوی خۆیانیان هەیە لە بەهەشتدا، بەیانیان و ئێواران، واتە: لە بەیانییەوە تاکو ئێوارە و، لە ئێوارەوە تاکو بەیانیی، هەر خەریکی عەیش و نۆشن.

(رزق)یش مەرج نیە تەنیا مەبەست پێی بژێوی ماددیی بێ، چونکە لە ڕاستییدا بۆ کەسانێك کە ڕووحێکی زیندوویان هەبێ، بژێوی ڕووحیی و مەعنەویی، زۆر بەتام و چێژترە و، زۆریش پێویستترە لە بژێوی جەستەیی، کەواتە: (رزق) هەردووکیان دەگرێتەوە.

﴿ تِلۡكَ ٱلۡجَنَّةُ ٱلَّتِي نُورِثُ مِنۡ عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيّٗا ﴾، ئا ئەو بەهەشتە ئەوەیە کە ئێمە دەیکەینە میرات بۆ ئەو بەندانەمان کە پارێزکارن، (تقي) ڕێژگەی زیدەڕۆیی کردن (صیغة المبالغة)یە، بۆ (مُتَّقي)، واتە: کەسێك کە زۆر پارێزکار بێ، پارێزکاریش کەسێکە:

خۆی بپارێزێ لە هەر شتێ: کە خوا پێی ناخۆش بێ، خواش دوو شتی سەرکیی پێ ناخۆشن: ئەرکەکانی بچوێنی و، قەدەغەکانی بشکێنی.

ئنجا دێتە سەر بابەتێکی دیکە، کە لەسەر زمانی فریشتەکانەوەیە، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا باسمانکرد، کە پێغەمبەر ﷺ بە جیبریلی فەرمووـ: چ شتێك ڕێگرتە کە سەردانمان بکەی، زیاتر لەوەی سەردانمان دەکەی؟ خواش ﷻ لەسەر زمانی جیبریل و فریشتەکان، وەڵامی پێغەمبەر ﷺ دەداتەوە: ﴿ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ ﴾، ئێمە بە فەرمانی پەروەردگارت نەبێ، دانابەزین، نایەینە خوار، بۆ سەر زەوی، ﴿ لَهُۥ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَٰلِكَ ﴾، هەرچی لە پێشمانەوەیە و، هەرچی لە دوامانەوەیە و، هەرچی لە نێوانیان دا هەیە، هەمووی هی خوایە ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴾، پەروەردگاریشت هیچ شتێك فەرامۆش ناکات، هیچ شتێکی لەبیر ناچێ، لە بیرچوو (ناسي) نیە بۆ هیچ شتێك.

ئنجا پێناسەی خوا ﷻ دەکات، دەفەرموێ: ﴿ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ﴾، پەروەردگارو خاوەنی ئاسمانەکان و زەوییەو، ئەوەی دەکەوێتە نێوانیشیانەوە، ﴿ فَٱعْبُدْهُ وَٱصْطَبِرْ لِعِبَٰدَتِهِۦ ﴾، دەجا بەس ئەو بپەرستەو بەندایەتیی بۆ بکە و، خۆڕاگریش بە بۆ پەرستنی وی.

بە تەئکید بەندایەتیی بۆ خوا کردن، بەبێ خۆڕاگریی، بەبێ پشوو درێژیی، بەبێ نە لە خشاویی و نەپساویی، ئەنجام نادرێ، ئەگەر بە باشیی تێبگەین لە چەمك و واتای خواپەرستیی، کە بریتیە لە کۆی هەڵس و کەوتەکانی مرۆڤ کە هەموویان دەبێ، بە شێوەیەك بن، لەلای خوا پەسند بن، چ هەڵسوکەوتی تاکیی بن، چ خێزانیی، چ کۆمەڵایەتیی، چ سیاسیی.

چ پەیوەندییان بە تاکەوە هەبێ، یان بە خێزان، یان بە کۆمەڵ و کۆمەڵگا، یاخود بە قەوارەی سیاسیی.

پاشان: چ پەیوەندییان بە دەروونییەوە هەبێ و پەنهانی بن، یان پەیوەندییان بە ڕواڵەت و جەستەیەوە هەبێ و ئاشکرا بن، خواپەرستیی بەو چەمك و واتا گشتگیرە، بێگومان بەبێ خۆڕاگریی و پشوو درێژیی، ئەنجام نادرێ.

لە کۆتاییدا خوا دەفەرموێ: ﴿ هَلْ تَعْلَمُ لَهُۥ سَمِيًّا ﴾، ئایا هیچ هاوناوێکت بۆ خوا پێ شك دێ؟ ئایا دەزانی هیچ هاوتاو هاوناوی هەبن؟

وشەی (سَمِيًّ) هەم بە مانای (هاوناو) دێ، هەم بەمانای: هاوتا (كُفْء) واتە: ئایا كەست پێ شك دێ، ناوی وەك ناوی خوابێ، سیفەتەكانی وەك هی خوا ﷻ بن؟

یاخود: ئایا هیچ كەست پێ شك دێ، هاوتای خوا بێ، لە زاتیدا، لە ناوەكانیدا، لە سیفەتەكانیدا، لە كردەوەكانیدا، هیچ كەست پێ شك دێ، هاو ئاستی خوا بێ؟ ئەمە پرسیاركردنێكی نكوولْییلێكەرانەیە، واتە: بە تەئكید: هیچ كەس نیە كە هاوناوی خوا و هاو سیفەتی خوابێ، یاخود: هاوتا و هاو ئاستی خوای بەرزی مەزن بێ.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**باسی مووسا ﷺ کە بەندەیەکی هەڵبژاردەو نێردراو و پێغەمبەری خوا بوو، خوا لە نیزیك لای ڕاستی کێوی طوورەوە بە پەنامەکیی دواندوویەتی و، لە بەزەیی خۆشیەوە هارووني برای بۆ کردۆتە پێغەمبەر:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مُوسَىٰٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ مُخۡلَصٗا وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ٥١ وَنَٰدَيۡنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنِ وَقَرَّبۡنَٰهُ نَجِيّٗا ٥٢ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ مِن رَّحۡمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيّٗا ٥٣﴾.

### شیکردنەوەی ئەو ئایەتانە لە شەش بڕگەدا:

**١)- ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مُوسَىٰٓۚ﴾، هەروەها لە کتێبدا (لە قورئان دا) باسی مووسایان بۆ بکە، باس و خواسی مووسایان بۆ بخوێنەوە.**

**(أل)ی سەر (الكتاب)، (أل)ی (عهد)ە، نەك (أل)ی جینس، واتە: لە کتێبەکەدا کە قورئانە، باس و خواسی مووسا بگێڕەوە، بۆ ئۆممەتەکەت، بۆ خەڵك، بۆ مرۆڤایەتی، بۆیەش باسی مووسا کراوە، چونکە مووسا، پایە بەرزترین پێغەمبەر بووە لە وەچەی ئیسحاق و یەعقووب و ئیبراهیمیش (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ).**

**ئنجا هەندێك لە سیفەتەکانی مووسا دەخاتەڕوو:**

**٢)- ﴿إِنَّهُۥ كَانَ مُخۡلَصٗا﴾، بەڕاستیی ئەو هەڵبژێردراو بوو، ساغکراوە بوو، خوێنراویشەتەوە: (إنه كان مُخْلِصاً) بەڕاستی ئەو ساغکەرەوە بوو، دڵی خۆی و، کردەوەکانی خۆی و، پەنهانی خۆی و، ڕواڵەتی خۆی، بۆ خوا ساغ و یەکلاکرد بۆوە.**

**٣)- ﴿وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا﴾، هەروەها ئەو ڕەوانەکراوی پێغەمبەر بوو، پێغەمبەرێکی ڕەوانەکراو بوو.**

**(نبي) کە خوێنراویشەتەوە: (نبيء)، واتە: کەسێك کە خوا بەشێوەی تایبەت هەواڵی پێدەداو سروشی بۆ دەکات و، وەحی بۆ دەنێرێ، (نَبيء) و (نبيّ)یش دەگونجێ (فعيل)ی بە مانای (فاعل)بن، واتە: کەسێك کە بە ناوی خواوە هەواڵدەدا بە خەڵك.**

یاخود لەسەر کێشی (فعیل)ن، بەڵام بە مانای (مفعول)ن، وەك (قتیل) یانی: (مقتول)، واتە: کەسێك کە خوا هەواڵی تایبەتی پێدەدا.

## جیاوازیی نێوان: (رسول) و (نبي):

بێگومان هەر کەسێك (رسول)بێ، (نبي)یشە، بەڵام مەرج نیە هەر کەسێك (نبي) بوو، (رسول) بێ.

ئەدی ئایا جیاوازییان چییە؟!

أ- زۆربەی هەرە زۆری زانایان، دەڵێن:

(نبي) کەسێکە خوا ﷻ سروشی بۆ کردوە، بەڵام فەرمانی پێ نەکردوە و مولزەمی نەکردوە، کە پەیامی خوا بە خەڵك ڕابگەیەنێ.

بەڵام (رسول) کەسێکە خوا سر وشی بۆ کردوەو ڕاشیسپاردوە: پەیامی خوا بە خەڵك بگەیەنێ، (رسول) واتە: نێردراو، ڕەوانەکراو، بەڵام (نبي) واتە: هەواڵ پێدراو، یا هەواڵدەر، ئەوە زۆربەی زانایان وا دەڵێن.

ب- هەندێکیش گوتوویانە: (نبي) کەسێکە، مەرج نیە خاوەنی بەرنامەیەکی سەربەخۆ بێ.

بەڵام (رسول) دەبێ خاوەنی بەرنامەیەکی سەربەخۆ بێ، واتە: هەموو پێغەمبەران، ئەرکیان ئەوە بووە کە پەیامی خوا ﷻ بە خەڵك بگەیەنن، ئنجا هەندێك لەنێو پێغەمبەراندا، خاوەنی بەرنامەیەکی سەربەخۆ بوون، بەڵام بەرنامەی سەربەخۆ، بەو واتایە نا، کە بەهرەمەندیش نەبوو بێ لە بەرنامەی پێغەمبەری پێش خۆی، بۆ وێنە: عیسا ﷺ خوا ئینجیلی پێداوە و، داوود خوا زەبووری پێداوە، بەڵام هەر کام لە عیساو داوود کە خۆشیان خوا کتێبی پێداون، شوێن تەوراتیش کەوتوون بە دەقی ئایەت، بەڵام خۆشیان پەیام و بەرنامەی تایبەتییان هەبووە، وێڕای ئەوە کە پابەندیش بوون بە تەوراتەوە.

من ئەو ڕایەی دووەمیانم پێ ڕاسترە، کە پێچەوانەی ڕای زۆربەی هەرە زۆری ڕاڤەکەرانی قورئانە، کە مەگەر بە دەگمەن، دەنا هەموویان دەڵێن: (نبي) کەسێکە خوا ﷻ وەحیی بۆ ناردوە، بەڵام ڕاینەسپاردوە: پەیام و وەحیی خوا ﷻ بە خەڵك بگەیەنێ، بەڵام (رسول) کەسێکە خوا پەیامی بۆ ناردوە و ڕاشیسپاردوە: پەیامی خوا بە خەڵك بگەیەنێ.

بەڵێ، من پێموایە: هەموو (نبي)ێك خوا ڕایسپاردوە: پەیامی خوا ﷺ بە خەڵك بگەیەنێ، ئنجا (نبي) یەك كە (رسول) نیە، پابەندكراوە بەشوێنكەوتنی بەرنامەی (رسول) ێك كە پێش وی بووە، بەڵام ئەو پێغەمبەران (أنبیاء)ەی كە (رسول)یشن، ئەوانەن كە خوا بەرنامە و پەیامێكی تایبەتیشی بۆ ناردوون، ئەمەش تێكناگیرێ لەگەڵ بەهرەمەند بوونیان لە كتێب و بەرنامەی پێغەمبەری پێش خۆیان، بە تایبەت بۆ پێغەمبەرانی (بني إسرائیل) كە هەموویان شوێن تەورات كەوتبوون، بەڵام خوا بۆ هەندێكیان بەرنامەو كتێبی تایبەتیشی ناردوە، وەك داوود كە زەبووری پێداوە و، عیسا كە ئینجیلی پێداوە.

٤)- ﴿ وَنَٰدَيۡنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنِ ﴾، هەروەها بانگی مووسامان كرد لەلای ڕاستی طووڕەوە، (نداء) واتە: بانگكردن، بانگكردن بۆ ئەوەی كەسێك بێ، یان بە دەنگی بەرز بانگ كردن.

لەلای ڕاستی كێوی طووڕەوە، طووڕیش:

١- یان چیایەكە، كە لە نێوان وڵاتی شام و میسرە لە دەشتی (سیناء)، وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (المؤمنون)دا دەفەرموێ: ﴿ وَشَجَرَةٗ تَخۡرُجُ مِن طُورِ سَيۡنَآءَ تَنۢبُتُ بِٱلدُّهۡنِ وَصِبۡغٖ لِّلۡأٓكِلِينَ ٢٠ ﴾المؤمنون.

(طور سیناء)یش:

أ- یان زنجیرە چیایەكە لە دەشتی (سیناء) و بە هەموویان دەگوترێ: (طور).

ب- یاخود كێوێك و چیایەكی تایبەتە لەوێ، كە بۆ مووسا عليه السلام زانراوو ناسراو بووە و مووسا لەسەر ئەو چیا و كێوە، فەرمایشتی لەگەڵ خوادا كردوە.

٢- یان: (طور) ناوی چیا و كێوە بەگشتی و، بێ پێ مەبەست بوونی چیایەكی دیارییكراو، هەردوو واتایەكە هاتوون لە تەفسیرەكاندا، كەواتە: (طور) یان ناوی هەر چیایەكە بەگشتی، یاخود ناوی چیایەكی تایبەتە كە لە دەشتی (سیناء)یە، كە دەكەوێتە نێوان وڵاتی شام و میسری ئێستاوە و، ئەویش: یان مەبەست پێی زنجیرە چیای طوورە، یان: چیایەكی تایبەت و دیارییكراو.

٥)- ﴿ وَقَرَّبۡنَٰهُ نَجِيّٗا ﴾، هەروەها مووسامان لە خۆمان نیزیكخستەوە، بە ڕازو نیاز لەگەڵ كردنەوە.

(نجي) (فَعِيلٌ بِمَعْنَى مَفْعولٍ، مِنَ المُنَاجَاةِ وَهِيَ المُحَادَثَةُ السِّرِيَّةُ)، (نجيّ) لێرەدا لەسەر كێشی (فعيل)ە، بەڵام بە مانا (مفعول)ە، واتە: دوێنراو بە پەنهانیی، موناجات لەگەڵ كراو، موناجاتیش بریتیە لە دواندنی پەنهان.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَنَٰدَيۡنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنِ ﴾، لەلای ڕاستی طوورەوە، یانی: بە نسبەت مووساوە ﷺ کەوتۆتە لای ڕاستی، ئەوەش لە کاتێکدا بوو، کە مووسا ﷺ ئاگرێکی، یان ڕووناکییەکی کەوتە بەرچاو، لە شەوێکی ساردی زستاندا، کاتێك لە مەدیەن دەگەڕایەوە بۆ میسر لەگەڵ ماڵ و خێزانی دا، وایزانی ئاگرێکە لەوێ، چونکە وەك لە چەند شوێنێکدا هاتوە، لە سوورەتی (النمل)و لە سوورەتی (طه)دا: ﴿ إِذۡ رَءَا نَارٗا فَقَالَ لِأَهۡلِهِ ٱمۡكُثُوٓاْ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِقَبَسٍ أَوۡ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدٗى ﴿١٠﴾ ﴾طه، واتە: یادبکەوە! کاتێك (مووسا) ئاگرێکی بەدی کرد، بە هاوسەری گوت: (لێرە) بوەستن، من ئاگرێکم بەدی کرد، بەڵکو بزووتێکتان لێی بۆ بهێنم، یان کەسێك لەسەر ئاگرەکە ببینم، مایەی ڕێنمایی بێ.

وایزانی شوانێکە یان گاوانێکە بەڵکو ڕێنماییمان بکات، دیارە ڕێیان لێ تێکچووە.

گوتوویەتی: یان بزووتێکتان بۆ دێنم، بۆ ئەوەی ئاگری پێ بکەینەوە و خۆمان گەرم بکەینەوە، یاخود: کەسێك لەوێ دەبینم، ڕێنماییمان بکات و ڕاستەڕێمان بکاتەوە! ئنجا کە چووە، مووسا ﷺ، کەوتۆتە لای ڕاستی کێوەکە، بە نسبەت مووساوە، لەوکاتەدا، چونکە ڕاست و چەپ ڕێژەیی (نسبي)ین، بە پێی ئەوەی ئەو مرۆڤە دەکەوێتە کوێوە! جاری وایە شوێنێك لای ڕاستی تۆیە، بەڵام لای چەپی کەسێکی دیکەیە.

٦)- ﴿ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ مِن رَّحۡمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيّٗا ﴾، لە بەزەیی خۆشمانەوە، هاڕوونی برایمان وەك پێغەمبەر پێبەخشی.

ئەمە وەڵامی داوایەکەی مووسایە ﷺ کە لە سوورەتی (طه)دا لە ئایەتەکانی: (٢٥ - ٣٥)دا، هاتووە، دوای ئەوەی خوا ﷻ بە مووسا دەفەرموێ: ﴿ ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٢٤﴾ ﴾طه، بڕۆ بۆ لای فیرعەون یاخیی بووە، چەند داوایەك لە خوا دەکات، دەفەرموێ:

﴿ قَالَ رَبِّ ٱشۡرَحۡ لِي صَدۡرِي ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرۡ لِيٓ أَمۡرِي ﴿٢٦﴾ وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةٗ مِّن لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي ﴿٢٨﴾ وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي ﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ أَخِي ﴿٣٠﴾ ٱشۡدُدۡ بِهِۦٓ أَزۡرِي ﴿٣١﴾ وَأَشۡرِكۡهُ فِيٓ أَمۡرِي ﴿٣٢﴾ كَيۡ نُسَبِّحَكَ كَثِيرٗا ﴿٣٣﴾ وَنَذۡكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرٗا ﴿٣٥﴾ ﴾طه.

واتە: گوتی: پەروەردگارم! سینەم گوشاد بکە و، کارم ئاسان بکە و، گرێی زمانم بکەوە. بۆ ئەوەی لە قسەم تێبگەن. لە نیزیکانی خۆشم پاڵپشتێکم بۆ بڕەخسێنە. هاڕوونی برام.

لە کاری منـدا بەشـداریی بکـە. {تاکـو پێکـەوە چاکـتر} تـۆ بـە پـاك بگریـن و، زۆرت یـاد بکەیـن، بێگومـان تـۆ بینـەری ئێمـەی.

خـواش دەفەرمـوێ: ﴿ قَالَ قَدۡ أُوتِيتَ سُؤۡلَكَ يَٰمُوسَىٰ ٣٦ ﴾طـه، ئـەی مووسـا! ﷺ داوایەکـەت جێبەجـێ بـوو، ئنجـا لێـرە بـاسی جێبەجێکـردنی ئـەو داوایـە دەکات، کـە خـوا لـە بەزەیـی خـۆی هـاڕوونی برایـشی وەك پێغەمبـەر پێبەخشـیوە.

کۆتایـی ئـەم مەسـەلەیە بـەم فەرمایشـتەی پێغەمبـەر ﷺ دێنیـن، دەربـارەی چپەکـردن، کـە دەفەرمـوێ: {إِذَا كُنْتُمْ ثَلَاثَـةً، فَـلَا يَتَنَاجَـى اثْنَـانِ دُونَ الآخَـرِ، حَتَّـى تَخْتَلِطُـوا بِالنَّـاسِ، مِـنْ أَجْـلِ أَنْ يُحْزِنَـهُ} (مُتَّفَـقٌ عَلَيْـهِ: البُخَـارِيّ: ٦٢٩٠، وَمُسْـلِم: ٢١٨٤، وَاللَّفْـظُ لِمُسْـلِمٍ).

واتـە: ئەگـەر سـێ کـەس بـوون، بـا دووانتـان جیـا لـە سـێیەم بەیەکـەوە قسـەی چپـە نەکـەن، تاکـو تێکـەڵ بـە خەڵـك دەبـن، چونکـە ئـەوە دڵتەنگـی دەکات.

یـانی: ئەگـەر چوونـە نێـو قەڕەباڵغیـی، ئنجـا دوو کـەس پێکـەوە قسـەیەکی تایبەتیـش بکـەن قەیناکات.

**مەسەلەی دووەم:**

**باسی ئیسماعیلی كوڕی گەورەو یەكەمی ئیبراهیم ﷺ، كە بابایەكی بەڵێن ڕاست بووە، وێڕای پایەی ڕەوانكراوێتیی و پێغەمبەرایەتیی، فەرمانی بە خێزان و نیزیكانیش كردوە بە نوێژو زەكات، لەلای خواش بەندەیەكی پەسندو خۆشویستراو ڕێزلێگیراو بووە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِسۡمَٰعِيلَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ﴿٥٤﴾ وَكَانَ يَأۡمُرُ أَهۡلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرۡضِيّٗا ﴿٥٥﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِسۡمَٰعِيلَ ﴾، هەروەها لە كتێبدا، [لە كتێبەكەدا، كە قورئانە] باس و خواسی ئیسماعیلیان بۆ بگێڕەوە، بۆیان بخوێنەوە.

پێویستە بزانین كە: ئیسماعیل كوڕی گەورەو یەكەمین كوڕی ئیبراهیم بووە (عَلَيْهِمَا الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمِ).

٢)- ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ ﴾، بە دڵنیایی ئیسماعیل بەڵێن ڕاست بوو.

جا ئەم بەڵێن و گفت ڕاستییەی ئیسماعیل، زەقترین (مصداق)ی، زەقترین حاڵەت كە بەڵێن ڕاستیی ئیسماعیلی تێدا بەرجەستە بووە، ئەوەیە كاتێك بابی گوتی: ﴿ يَٰبُنَيَّ إِنِّيٓ أَرَىٰ فِي ٱلۡمَنَامِ أَنِّيٓ أَذۡبَحُكَ فَٱنظُرۡ مَاذَا تَرَىٰۚ ﴿١٠٢﴾ ﴾الصافات، واتە: ئەی ڕۆڵە گیان! من لە خەومدا بینیم كە تۆم سەردەبڕی، ئنجا تۆش تێوەڕامێنە! داخۆ ڕات چییە؟ ئیسماعیل گوتی: ﴿ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفۡعَلۡ مَا تُؤۡمَرُۖ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾ ﴾الصافات، ئەی بابە گیان، ئەی بابی خۆم! ئەوەی فەرمانت پێكراوە، ئەنجامی بدە، ئەگەر خوا بیەوێ لە خۆڕاگرانم دەبینی.

بەڵێنەكەشی بردە سەر و ملی خۆی خستە بەر چەقۆی بابی، بەڵام ئەوە بوو خوا ﷻ دەربازی كرد، چونكە خوا ﷻ مەبەستی نەبوو ئیسماعیل سەرببڕدرێ، بەڵكو مەبەستی بوو، ئیبراهیم تاقیی بكاتەوە، وەك دوایی لە تەفسیركردنی ئایەتەكان دا باسی دەكەین.

٣)- ﴿ وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ﴾، ئیسماعیل هەم ڕەوانەكراو بوو، هەم هەواڵپێدراو بوو.

پێشتریش چەند جارێك گوتمان: وشەی (نبي) و (نبيء) یان (فعیل)ی بە مانای (فاعِل)ن، واتە: هەواڵدەر، بەناوی خواوە هەواڵدەدات، یاخود: (فعیل)ی بە مانای (مفعول)ن، واتە: هەواڵپێدراو، یانی: خوا هەواڵی تایبەتیی پێدەدات، سروشی بۆ دەکات.

٤)- ﴿ وَكَانَ يَأْمُرُ أَهْلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ ﴾، (ئیسماعیل) عادەتی وابوو، فەرمانی بە ماڵ و خێزان و نزیکەکانی خۆی دەکرد، بە نوێژ و زەکات.

ئنجا کە لێرە خوا نەیفەرمووە: (وَكَانَ يَأْمُرُ قَوْمَهُ) حیکمەتێکی تێدایە، ئەویش ئەوەیە کە هۆزی (جُرهُم) کە ئیسماعیل هاوسەری یەکەمی لەوان بووە و، ڕەنگە هی دووەمیشی هەر لەوان بوو بێ، هۆزی (جُرهُم) کە یەکێك بوون لە هۆزەکانی عەرەب و، هاتوون لە دەوروبەری مەککە نیشتەجێ بوون، دوای ئەوەی ئاوی زەمزەم لەوێ پەیدابووە، کە وەك موعجیزەیەك بووە بۆ هاجەرو ئیسماعیلی کوڕی (عَلَيْهِمَا السَّلَام)، ئنجا هاوسەری ئیسماعیل لە هۆزی (جُرهُم) بووە، وەك لە (صحیح البخاري)دا هاتوە، بەڵام ئەوانە خەڵك و گەلی ئیسماعیل نەبوون، بۆیە خوا نەیفەرمووە: (وَكَانَ يَأْمُرُ قَوْمَهُ)، چونکە ئەوانە خەڵکێکی بتپەرست (وَثني) بوون، بەڵام ئیسماعیل فەرمانی بە نیزیکان و ماڵ و خێزان و کەس و کاری خۆی کردوە، کە دوایی - وەك لە {پەیمانی کۆن}دا هاتوە - دوازدە (١٢) کوڕی بوو ون و، هەر کامێك لەو کوڕانەی، بووە بە باب و، ئەسڵ بووە بۆ عەشیرەتێکی زۆر، ئنجا ئیسماعیلیش تەمەنێکی زۆری بووە - وەك دوایی باسی دەکەین - کە نەك هەر نەوەکانی خۆی، بەڵکو ئەوەی پێی دەڵێن: (نەدیتە)ش، هەموو ئەوانەی بینیوە، چەند جیلێك لە وەچەی خۆی بینیون و، دوایی هەر لە تەمەنی خۆی دا بوونە هۆزێکی گەورە، پاشان گەل (شعب)ێك و هەمووشیان لە ڕووی ڕەچەڵەکەوە، نیزیك و خزم و خێزانی بوون، ئنجا فەرمانی بەوان کردوە، نوێژ بکەن و زەکات بدەن.

٥)- ﴿ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرْضِيًّا ﴾، هەروەها ئیسماعیل لەلای پەروەردگاری پەسندکراو بوو، (مرضي) یان (مرضو) هەردووکیان هاتوون، واتە: پەسندکراو، بێگومان بەس: (مرضي) هاتوە لە قورئاندا، بەڵام ئەگەر بشڵێی: (مرضو) لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە، ڕاستە، واتە: پەسندکراو، کەسێك کە بەرانبەرەکەی لێ ڕازییە.

## کورتە باسێک لە بارەی ئیسماعیل ﷺ ەوە

بەڕێـــــزان!

ئێمـە لـەم سـوورەتەدا سـەرجەم حـەوت (٧) کورتـە باسـمان، هێنـاون دەربـارەی ژیـان و بەسـەرهاتی حـەوت لـە پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامُ) کـە تاکـە[1] سـوورەتێکە لـە تەفسیرکردنەکەی دا، ئـەو ژمـارە زۆرەی پێغەمبـەران، بەسـەرهاتیان، بخرێتـە ڕوو، کـە بریتیـن لـە: زەکەریـا و، یەحیـا و، عیسـا و، ئیسـحاق و، یەعقـووب و، ئیسـماعیل و، حەوتەمیـش: ئیدریـس، کـە دوایـی پێـی دەگەیـن.

بەسەرهاتی ئیسماعیل ﷺ لە چوار بڕگەدا دەخەینەڕوو:

١)- ناوو ڕەچەڵەکی.

٢)- ژمارەی ناوهێنرانی لە قورئان دا.

٣)- ژیان و هەڵوێستەکانی.

٤)- تەمەن و کۆچی دواییکردنی.

### ١)- ناوو ڕەچەڵەکی ئیسماعیل ﷺ:

ئیسـماعیل کـوڕی ئیبراهیمـە لـە هاجـەری قیبتیـی میسـریی، وەك لـە (صحيـح البخـاري) دا هاتـوە، لـە سـاڵی هەشـتاو شەشـەمینی (٨٦) تەمـەنی باپیـدا لـە دایـك بـووە، واتـە: کاتێـك کـە ئیبراهیـم تەمـەنی (٨٦) سـاڵ بـووە، ئیسـماعیلی کـوڕی لـە هاجـەرە خاتـوون، پەیدابـووە، کـە قیبتیـی بـووەو خەڵکی میسـر بـووە، کەنیـزەك بـووە، دراوە بـە سـارە خـان، سـارە خانیـش داویـەتی بـە ئیبراهیـم کـە بیکاتـە هاوسـەری خـۆی.

ئنجـا ئـەوە کـە ئیبراهیـم تەمـەنی (٨٦) سـاڵ بـووە، کـە ئیسـماعیل لـە دایـك بـووە، قورئـان ئامـاژەی پـێ دەکات، کـە تەمـەنی زۆر بـووە، بـەڵام دیاریکـردنی ئـەو تەمەنـە لـە (پەیـمانی

---

(١) لـە سـووڕەتی (الأنبياء)یـش دا بەسـەرهاتی شـەش (٦) لـە پێغەمبەرانمـان علیهـم السـلام هێنـاون، کـە بریتیـن لـە: داود، سـلیمان، أیـوب، اليسـع، ذوالكفـل، إليـاس.

کۆن)دا هاتوە، کە ئەمە دەقی قسەکەیەتی: (وَكَانَ أَبْرَامُ إِبنَ سِتٍّ وَثَمَانِينَ سَنَةً لَمَّا وَلَدَتْ هَاجَرُ إِسْمَاعِيلَ لأَبْرَام)[1]، واتە: {(أَبْرَام) واتە: ئیبراهیم}، تەمەنی (٨٦) ساڵ بوو، کاتێك کە هاجەر ئیسماعیلی بۆ ئیبراهیم هێنایە دی.

بەڵام ئیسحاق کاتێك لە دایك بووە، کە بابی تەمەنی گەیشتۆتە سەد (١٠٠) ساڵ، وەك لە (پەیمانی کۆن)دا[2] هاتوە، جا ئێمە ئیشمان بەو دوو مێژووەیە: کاتێك ئیسماعیل پەیدا بووە، کە ئیبراهیم ﷺ تەمەنی (٨٦) ساڵ بووە، بەڵام کاتێك ئیسحاقیان پەیدا بووە لە سارە خاتوون، کە ئیبراهیم ﷺ تەمەنی سەد (١٠٠) ساڵ بووە، واتە: چواردە (١٤) ساڵ کەوتۆتە نێوان پەیدا بوونی ئیسماعیل و ئیسحاقەوە، وەك گوتم: ئەوە دوایی ئیشمان پێیەتی، چونکە لە پەیمانی کۆندا هاتوە و جوولەکەکان وا دەڵێن و، هەندێك لە زانایانی ئیسلامیش - بەداخەوە - وادەڵێن، کە (ذبیح) واتە: ئەوەی هێندراوەتە سەر سەربڕان: ئیسحاق ﷺ بووە، نەك ئیسماعیل ﷺ کە ئێمە ئەو دوو مێژووە کە هەر لە تەوراتدا هاتوون، دەکەینە بەڵگە و، ئەو ئیددیعایە هەڵدەوەشێنینەوە.

## ٢)- ژمارەی ناوهێنرانی ئیسماعیل ﷺ لە قورئاندا:

سەرجەم ناوهێنرانی ئیسماعیل لە قورئاندا، دوازدە (١٢) جارە، بەم شێوەیە:

١) لە سوورەتی (البقرة)دا، لە ئایەتەکانی: (١٢٥، ١٢٧، ١٣٣، ١٣٦، ١٤٠) واتە: پێنج جاران ناوی ئیسماعیل ﷺ هاتوە.

٢) لە سوورەتی (آل عمران)دا، جارێك لە ئایەتی (٨٤)دا، ناوی هاتوە.

٣)- لە سوورەتی (النساء)دا، جارێك لە ئایەتی (١٦٣)دا، ناوی هاتوە.

٤)- لە سوورەتی (الأنعام)دا، جارێك لە ئایەتی (٨٦)دا، ناوی هاتوە.

٥)- لە سوورەتی (إبراهيم)دا، جارێك لە ئایەتی (٣٩)دا، ناوی هاتوە.

٦)- لە سوورەتی (مريم)دا، جارێك لە ئایەتی (٥٤)دا، ناوی هاتوە.

٧)- لە سوورەتی (الأنبياء)دا، جارێك لە ئایەتی (٨٥)دا، ناوی هاتوە.

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح: ١٧، ص ٤٤.

(٢) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح: ٢١، ص ٥٤.

٨)- لە سوورەتی (ص)دا، جارێك لە ئایەتی (٤٨)دا، ناوی هاتوە.

هەمووی دەكاتە: دوازدە (١٢) جار.

## ٣)- ژیان و هەڵوێستەكانی ئیسماعیل عليه السلام:

ئێمە زەقترین وێستگە و هەڵوێستەكانی ژیانی ئیسماعیل (عليه السلام)مان هێناون، كە سەرجەم، چوار هەڵوێست و وێستگەن:

**أ)- ئیبراهیم عليه السلام هاجەرو ئیسماعیلی كوڕیان دەباتە شیوی مەككە:**

ئەمە ڕووداوێكی گەورەیە لە ژیانی ئیبراهیمدا عليه السلام، هەروەها لە ژیانی هاجەری خێزانی و ئیسماعیلی كوڕیشیاندا عليه السلام، بەڵام لە قورئاندا تەنیا ئەوەندە باسكراوە، كە لە سوورەتی (إبراهیم)دا خوا دەفەرموێ:

﴿رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ ٣٧﴾إبراهیم.

كە لە تەفسیری سوورەتی (إبراهیم)دا، بە تەفصیڵ باسمانكرد.

واتە: پەروەردگارمان! من هەندێك لە وەچەی خۆمم لە شیوێك كە كشتوكاڵی تێدا ناكرێ، لەلای ماڵە قەدەغەكراوەكەی تۆ، نیشتەجێم كرد، پەروەردگارمان! بۆ ئەوەی نوێژ بەرپا بكەن، تۆش وابكە كە عەقڵ و دڵی خەڵكێك بەلایاندا بچێ و، لە بەروبوومی میوەكان بژێویان بدە، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاریی بكەن.

بەڵام لە (صحیح البخاري)دا كە ئێمە لە كاتی تەفسیركردنی سوورەتی (إبراهیم)دا دەقەكەمان بە تەواویی هێنا، كە بە درێژیی باسی چۆنیەتی ئەو گواستنەوەی ئیبراهیم عليه السلام بۆ هاجەرو ئیسماعیلی كوڕی دەكات، لە شامەوە، كە شوێنی نیشتەجێ بوونی ئیبراهیم بووە، بۆ حیجاز و بە وردیی بۆ (مەككە) ئەو شوێنەی كە دوایی دەبێتە (شاری مەككە) و ئەو شوێنەی كە دوایی ماڵی قەدەغەكراوی خوا (بَيْتُ اللّٰه الحرام)ی تێدا بنیات دەنرێ، هەر بەدەستی ئیبراهیم و ئیسماعیلی كوڕی (عَلَيْهِما الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، یانی: وێڕای ئەوە كە لە قورئاندا ئاماژەی پێكراوە، لە (صحیح البخاري)یشدا بە تەفسیڵ باسكراوە،

هەروەها لە پەیمانی کۆنیشدا هاتوە لە ژێر ناوونیشانی: (**طَرْد هَاجَرَ وَإِسْمَاعِيل**) دەرکرانی هاجەرو ئیسماعیل، کە بە ناوونیشانێکی زەق و ڕەق هێناویەتی و، کۆمەڵێك حیکایەتیشی هێناون، مەرج نیە وابن، بەڵام ئەسڵەکەی ئەوەیە:

سارە خاتوون، دوای ئەوەی هاجەر ئیسماعیلی پەیدا دەبێ، هەستی هەوێدارێتیی (غَيْرَة)ی زیاد دەبێ و، داوا لە ئیبراهیم دەکات کە هاجەر دووربخاتەوە، ئیدی بە فەرمانی خوا عز وجل ئیبراهیم ﷺ هاجەری هاوسەری لەگەڵ ئیسماعیلی کوڕی، دەبات لەو شوێنەی کە دوایی کەعبەی لێ دروست دەکرێ و دەبێتە شاری مەککە، لەوێ نیشتەجێیان دەکات، کە خوا ﷻ بە: (**وَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ**) [شیوێکی بێ کشتوکاڵ و دێمەکار و قاقڕ] ناوی هێناوە، جا لە پەیمانی کۆندا، دەڵێ: (**وَكَانَ اللّٰهُ مَعَ الصَّبِيِّ، فَكَبُرَ وَسَكَنَ فِي صَحْرَاءِ فَارَانَ، وَبَرِعَ فِي رَمْيِ الْقَوْسِ، وَاتَّخَذَتْ لَهُ أُمُّهُ زَوْجَةً مِنْ مِصْرَ**)[1].

واتە: خوا لەگەڵ ئەو منداڵە گچکە بوو [ئەو منداڵە نەباڵغە، کە مەبەست پێی ئیسماعیلە کە ئەو کاتەش مەلۆتکە بووە] تاکو گەورە بوو و لە بیابانی فاران نیشتەجێ بوون، [دایکی لەگەڵ خۆی برد بووی بۆ ئەوێ، فاران بە چیاکانی دەوری شاری مەککە دەگوترێ] لە تیر هاویشتندا زۆر کارامە بوو، دایکیشی ژنێکی لە میسر بۆ هێنا، هاوسەرگیرییەکی لە میسر بۆ کرد.

بەڵام بە پێی (**صحيح البخاري**) هاوسەری یەکەمی ئیسماعیل لە هۆزی (**جُرهُم**) بووە، مەگەر هاوسەری دووەمی - ئەگەر قسەکەی (پەیمانی کۆن) ڕاست بێ - خەڵکی میسر بوو بێ، ئەگەرنا قسەکەی (پەیمانی کۆن) ڕاست نیە، بەڵکو هەر لە خۆوە ناوی میسری هێناوە، ئەگەرنا تۆزێك بەدوور دەزانرێ، دایکی لەحیجازەوە دەستی بگاتەوە میسرو، لەوێوە ئافرەتێك بێنێ بۆ ئیسماعیلی کوڕی! لە حاڵێکدا کە هۆزی (**جرهم**) ژنی یەکەمیشی لێ هێناون، هەر لەوێ نیشتەجێن و، وردە وردە شاری مەککەش دروست بووەو فەرەباڵغیی لێ پەیدابووە، کەواتە: زیاتر واپێدەچێ: هاوسەری دووەمیشی هەر لە هۆزی (**جرهم**) بوو بێ، کە ئەوانیش هۆزێك بوون لە نەتەوەی عەرەب.

**ب)- ئیبراهیم ئیسماعیلی کوڕی (عَلَيْهِمَا السَّلَام) دێنێتە سەر سەربڕین:**

واتە: دەیهێنێتە سەر ئەوە کە سەری ببڕێ، بەڵام سەری نابڕێ، ئەوەش لە سوورەتی (**الصافات**)دا، خوا ﷻ بە وردیی باسی کردووە، کە ئێمە ئایەتەکان دێنین، دیارە ئەوەی

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح ٢١، ص٥٦.

جێی مەبەستە: ئایەتەکانی: (٩٩ - ١١٣)ن، واتە: پازدە (١٥) ئایەت، بەڵام ئێمە ئایەتەکانی پێش ئەوانیشیان لەگەڵدا تەفسیر دەکەین، لەبەرئەوەی تیشکی زیاتر دەخەنە سەر ئەو هەڵوێستەی ئیبراهیم و ئیسماعیلی کوڕی (عَلَيْهِمَا السَّلَامُ)، هەروەها تیشکی زیاتر دەخەنە سەر هەڵوەشاندنەوەی، ئەو لاف لێدانەی جوولەکەکان، کەلە پەیمانی کۆندا هاتووە، گوایە: ئەو کەسەی هێنراوەتە سەر سەربڕین، ئیسحاق بووە، نەك ئیسماعیل! با تەماشا بکەین، خوا ﷻ لە سوورەتی (الصافات)دا، دوای ئەوەی باسی نووح دەکات، دەفەرموێ:

﴿ وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِۦ لَإِبْرَٰهِيمَ ﴿٨٣﴾ ﴾، لە کۆمەڵەکەی، لە شوێنکەوتووانی نووح، ئیبراهیم بوو، ﴿ إِذْ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٤﴾ ﴾، کە بە دڵێکی ساغ و سەلیمەوە، هاتە لای پەروەردگاری، (واتە: بەرەو پەروەردگاری چوو)، ﴿ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَاذَا تَعْبُدُونَ ﴿٨٥﴾ أَئِفْكًا ءَالِهَةً دُونَ ٱللَّهِ تُرِيدُونَ ﴿٨٦﴾ فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾، کاتێك ئیبراهیم بە بابی و بە گەلەکەی خۆی گوت: چی دەپەرستن؟ ئایا بە درۆ چەند پەرستراوێك لە جیاتی خوا هەڵدەبەستن و دەتانەوێن؟ ئەدی گومانتان بەرانبەر پەروەردگاری جیهانییان چییە، چۆن ئەو ناپەرستن؟

﴿ فَنَظَرَ نَظْرَةً فِى ٱلنُّجُومِ ﴿٨٨﴾ فَقَالَ إِنِّى سَقِيمٌ ﴿٨٩﴾ ﴾، ئنجا تەماشایەکی ئەستێرانی کردو گوتی: من نەخۆشم.

بۆچی تەماشای ئەستێرانی کردوە؟ چونکە بەپێی عەقڵی خۆیان دواندوونی، وادیارە ئەوانە بڕوایان بە ئەستێرەوانیی هەبووە، کە بە هۆی ئەستێرەکانەوە، ڕووداوەکانی سەر زەوی بزاندرێن! یاخود تەماشای ئەستێرەکانی ئاسمانی کردو، ئەو قسەیەی کرد، گوتی: من نەخۆشم، کە مەبەستی ئەوە بووە و، ئەوان وا حاڵی بوون کە لە ڕووی جەستەییەوە نەخۆش بێ و، نەتوانێ لەگەڵیان دا بچێ بۆ ئەو جەژن و چوونە دەرە، بەڵام ئەو مەبەستی ئەوە بووە، کە من دڵم نەخۆشە و میزاجم تێکچووە، بەرانبەر بەو بتپەرستییەی ئێوە!

﴿ فَتَوَلَّوْا۟ عَنْهُ مُدْبِرِينَ ﴿٩٠﴾ ﴾، ئەوانیش یەکسەر پشتیان تێکردو بە جێیان هێشت، (واتە: لە شاردا بەجێیان هێشت)، ﴿ فَرَاغَ إِلَىٰٓ ءَالِهَتِهِمْ فَقَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٩١﴾ مَا لَكُمْ لَا تَنطِقُونَ ﴿٩٢﴾ فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْبًۢا بِٱلْيَمِينِ ﴿٩٣﴾ ﴾، ئەویش چوو بۆ لای پەرستراوەکانیان، گوتی: ئایا هیچ ناخۆن؟ بۆچی قسە ناکەن؟ یانی: نە خواردن و خواردنەوەتان هەیە، نە قسەکردن و دواندنتان هەیە، کەواتە: پەرستراوی چین؟! ئیدی بە دەستی ڕاستی دەستی کرد بە لێدانیان، وەك لە سوورەتی (الأنبياء)دا، دەفەرموێ: ﴿ فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا إِلَّا

﴿ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾، واتـە: هەموویـان وردو خاشـکردن، جگـە لە بتە گەورەکەیـان، بـۆ ئـەوەی بگەڕێنـەوە بـۆ لای، لێـی بپرسـن: بەپێـی عەقڵـی خۆیـان، کـێ ئـەو بتانـەی دیکـەی شـکاندوون؟ ﴿ فَأَقْبَلُوٓا۟ إِلَيْهِ يَزِفُّونَ ﴿٩٤﴾ ﴾، ئەوانیـش هاتـن زۆر بـە خێرایـی بـۆ لای چـوون، ﴿ قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ ﴿٩٥﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾، گـوتی: ئایـا شـتانێك دەپەرسـتن کـە خۆتـان داتـان تاشـیون! لـە حاڵێـك دا: خـوا خۆتـان و ئەوانـەش کـە دروسـتتان کـردوون، خـوا خۆتـان و پەیکەرەکانیشـتانی دروسـت کـردوون؟ ﴿ قَالُوا۟ ٱبْنُوا۟ لَهُۥ بُنْيَٰنًا فَأَلْقُوهُ فِى ٱلْجَحِيمِ ﴿٩٧﴾ فَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَسْفَلِينَ ﴿٩٨﴾ ﴾، گوتیـان: خانوویـەکی بـۆ دروسـت بکـەن، قەڵایـەك، [ئاگرێـکی مەشـخەڵانی تێـدا نێـڵ بـدەن] دوایـی بیخەنـە نێـو کڵپـەی ئـەو ئاگـرەوە، ئـەوان پیلانیـان لـە دژی گێـڕا، پیلانیـان بـۆ وی ویسـت، بـەڵام ئێمـە ئەوانمـان خسـتە ژێـرەوە.

وەك لـە سـووڕەتی (الأنبیـاء)دا هاتـوە، خـوا فەرمـوی: ﴿ قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ ﴾، واتـە: گوتمـان: ئـەی ئاگـر! سـارد و سـەلامەت بـە، لەسـەر ئیبراهیـم، ئاگرەکە زیـانی پێنەگەیانـد.

ئنجـا دوای ئـەوە: ﴿ وَقَالَ إِنِّى ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّى سَيَهْدِينِ ﴿٩٩﴾ ﴾، هەروەهـا گـوتی: مـن بـەرەو پـەروەردگارم دەڕۆم، ئێـرە بەجێدێڵـم، [دوای ئـەوەی بـابی دەری کـرد و لەگەڵیـان نەحەوایـەوە] بەدڵنیایـی پـەروەردگارم دەمخاتـە سـەر ڕاسـتە ڕێ، ﴿ رَبِّ هَبْ لِى مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠٠﴾ ﴾، پـەروەردگارم! لـە صاڵحانـم پـێ ببەخشـە، لـە منداڵـە چاکـەکان بـە مـن ببەخشـە، ﴿ فَبَشَّرْنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ ﴿١٠١﴾ ﴾، ئێمـەش مـوژدەی منداڵێـکی هێدیـی و مەندمـان پـێ دا، ﴿ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ قَالَ يَٰبُنَىَّ إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ أَذْبَحُكَ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾ ﴾، ئنجـا کاتێـك کوڕەکـەی لەگەڵـی گەیشـتە حاڵـەتی وەرگێڕکەیـی کـە لەگەڵـی دا بێـت و بچـێ و کارو ئیـشی لەگەڵـدا بـکات، گـوتی: ئـەی ڕۆڵـە گیـان! مـن لـە خەومـدا بینیـم: تـۆم سـەر دەبـڕی، ئێسـتاش ڕامێنـەو بیـر بکـەوە، ڕات چییـە، چیـت پـێ چاکـە؟ [سـەرت ببـڕم، یـان نـا؟] کوڕەکـەی گـوتی: ئـەی بابـە گیـان! ئـەوەی فەرمانـت پێکـراوە، ئەنجامـی بـدە، ئەگـەر خـوا بیـەوێ: لـە خۆڕاگرانـم دەبینـی.

﴿ فَلَمَّآ أَسْلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلْجَبِينِ ﴿١٠٣﴾ ﴾، ئنجـا کاتێـك بـۆ خـوا ملکـەچ بـوون و لەپـەو ڕوو خسـتی [پشـتە مـلی کـردە خـۆی و، چەقـۆشی خسـتەر مـلی و، هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: چەقۆکـەشی پێداهێنـا].

﴿ وَنَٰدَيۡنَٰهُ أَن يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ ﴿١٠٤﴾ ﴾، ئێمەش بانگمان کرد: ئەی ئیبڕاهیم!

﴿ قَدۡ صَدَّقۡتَ ٱلرُّءۡيَآۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٠٥﴾ ﴾، بێگومان خەونەکەت هێنایەدی [یانی: ئەو فەرمانەی لە خەونتدا پێمان کرد بووی، فەرمانەکەت جێبەجێ کرد] ئێمە بەو شێوەیە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە.

﴿ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡبَلَٰٓؤُاْ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٠٦﴾ وَفَدَيۡنَٰهُ بِذِبۡحٍ عَظِيمٖ ﴿١٠٧﴾ ﴾، تا ئەوە تاقیکردنەوەیەکی ڕوون و ئاشکرایە، بەران و ئاژەڵێکی مەزنمان کردە قەرەبووی (کوڕەکە) [یانی: لە جیاتی وی ئاژەڵەکە سەر ببڕە].

﴿ وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١٠٨﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ ﴿١٠٩﴾ ﴾، لە نێو گەلانێ کە بە دوای ئەودا دێن، لە نێو ئەوانی دیکەدا، ئەوەمان بۆ بەجێهێشتن: سەلامی خوا لەسەر ئیبڕاهیم بێ، ﴿ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١١٠﴾ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١١١﴾ ﴾، ئاوا پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە، بە دڵنیایی ئەو لە بەندە بڕوادارەکانمان بوو.

﴿ وَبَشَّرۡنَٰهُ بِإِسۡحَٰقَ نَبِيّٗا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٢﴾ ﴾، هەروەها موژدەشمان پێدا بە ئیسحاق کە ئەویش پێغەمبەرێکە لە چاکان، ﴿ وَبَٰرَكۡنَا عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ إِسۡحَٰقَۚ وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا مُحۡسِنٞ وَظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ مُبِينٞ ﴿١١٣﴾ ﴾، پیت و پێزیشمان خستە سەر ئەویش و ئیسحاقیش و، لە وەچەکەیان [وەچەی ئیبڕاهیم و ئیسحاق] چاکەکار هەبوون، کەسێك کە ئاشکراش دیارە ستەمی لە خۆی کردوە، ئەوانەش هەبوون، یانی: هەم چاکەکار و هەم خراپەکار هەبوون.

لێرەدا زۆر ڕوون و ئاشکرایە: کە دوای ئەوەی ئیسماعیل لە دایك دەبێ و دەهێنرێتە سەر سەر بڕان، ئنجا دوای ئەوە ئیسحاق لە دایك دەبێ و لە تەوراتیشدا دەڵێ: چواردە (١٤) ساڵ دوای ئیسماعیل، ئیسحاق لە دایك بووە.

بەڵام وەك گوتمان لە (پەیمانی کۆن) لە تەوراتدا لە: (سفر التكوين، الإصحاح: ٢٢، ص٥٨، ٥٩)دا، لە ژێر ناوونیشانی: (أَللهُ يَمْتَحِنُ إِبْرَاهِيم) [خوا ئیبڕاهیم تاقیدەکاتەوە]دا، دەڵێ: ئەوەی ویستراوە سەر ببڕدرێ، ئیسحاق بووە، کە ئەمە دەقەکەیەتی: (وَبَعْدَ هَذَا امْتَحَنَ اللهُ إِبْرَاهِيمَ فَنَادَاهُ: يا إبراهيم فَأَجَابَهُ: لَبَّيْكَ، فقال: خُذْ ابْنَكَ وحيدك إسحاق الذي تُحِبُّهُ، وانطلق إلى أرض المُرِيَّا وقَدِّمْهُ مُحْرَقَةً عَلى أَحَد الجبَالِ الَّذي أَهْدِيكَ إليه)[1].

---

(١) ئەمە لە لاپەڕە (٥٨)ی سەرچاوەی ئاماژە پێدراودا هاتوە.

دوای ئـەوە خـوا ئیبراهیمـی تاقیکـردەوە و بانگـی کـرد، ئـەی ئیبراهیـم! وەڵامـی دایـەوە لـە خزمـەت دام، خـوا فەرمـووی: کوڕەکـەت، تاقانەکـەت {واتـە: ئـەو کاتـە تەنیـا ئـەو کـوڕەی بـووە} ئیسـحاق کـە زۆرت خـۆش دەوێ، ببـە و بچـۆ بـۆ سـەر زەمینـی موریـا، لـەوێ بیکـە بـە قوربانیـی لەسـەر یەکێـك لـە چیـاکان، کـە مـن ڕێنماییـت دەکـەم بـۆی {پێـت دەڵێـم: کام چیایـە؟}.

بـەڵام وەك (عبدالوهـاب النجـار) لـە (قصـص الأنبيـاء)(١)دا گوتوویـەتی: هـەر خـودی تەوڕات، بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە کـە (ذبیـح)، {ئـەوەی کـە هێنراوەتـە سـەر سـەربڕان} ئیسـماعیل بـوو، نـەك ئیسـحاق، چونکـە: وەك دەقەکـەی تەوڕاتمـان هێنـا دەڵـێ: (خُذْ ابْنَكَ وَحِيْدَكَ) کوڕەکـەت تاقانەکـەت بگـرەو ببـە {سـەری ببـڕە} ئنجـا هـەر لـە تەوڕاتـدا هاتـوە، کـە ئیسـحاق چـواردە (١٤) سـاڵ پـاش ئیسـماعیل لـە دایـك بـووە، چونکـە وەك پێشـتر هێنامـان کاتێـك کە ئیسـماعیل لـە هاجـەر هاتۆتـە دنیـاوە، ئیبراهیـم تەمـەنی (٨٦) سـاڵ بـووە، بـەڵام کاتێـك ئیسـحاق لـە سـارە خـان هاتۆتـە دنیـاوە، ئیبراهیـم تەمـەنی سـەد (١٠٠) سـاڵ بـووە، واتـە: چـواردە (١٤) سـاڵیان بەیـن بـووە.

کەواتـە: هیـچ کات ئیسـحاق، تاقانـە کـوڕی ئیبراهیـم نەبـووە، بەڵکـو ئـەوە ئیسـماعیل بـووە کـە تاقانـە کـوڕی ئیبراهیـم بـووەو، لـە کاتێکـدا کـە ئـەوی بـووە، هیـچ کـوڕی دیکـەی نەبـوون، بـەڵام کاتێـك کـە ئیسـحاق پەیدابـووە، ئیسـماعیلی هەبـووە، کەواتـە: ناگونجـێ بـە ئیسـحاق بگوتـرێ: تاقـە کوڕەکـەت، تاقـە کوڕەکـەی هـەر ئیسـماعیل بـووە و، کاتێـك ئیسـماعیل هێنراوەتـە سـەر سـەربڕان، تەنیـا خـۆی کـوڕی ئیبراهیـم بـووە و، لـە بەرەکـەتی ئـەوە، کـە ئامـادە بـووە دەسـت لـەو تاقـە جگـەر گۆشـەی خـۆی هەڵبگـرێ، خـوا تاژەڵێـکی بـۆ کـردە فەرەبـوو و، ئەویـشی بـۆ هێشـتەوە و دوایـی ئیسـحاقیشی پـێ بەخـشی لـە سـارەخان، وەك لـە ئایەتـەکانی سـوورەتی (الصافات)دا هێنامـان زۆر ڕوون و ئاشـکرایە، کـە دوای ئـەوەی ئیبراهیـم واز لـە گەلەکـەی دێنـێ و، لـە بـابی و گەلەکـەی دووردەکەوێتـەوە و لـە ئـووری کلدانییەکانـەوە دەچـێ بـۆ شـام، ئنجـا دوای ئـەوە خـوا ئیسـماعیلی پێـداوە، وەك قەرەبوویـەك بـۆ ئـەو خـزم و کـەس و کارە بێبڕوایـەی کـە بەجێـی هێشـتوون، دواییش کـە خـوا تاقیدەکاتەوە بـە ئیسـماعیل و، ئامـادە دەبـێ تاقـە جگـەر گۆشـەکەی خـۆی سـەرببڕێ، ئنجـا خـوا ئەویـشی بـۆ دەهێڵێتـەوەو، دواتـر ئیسـحاقیشی پـێ دەبەخشـێ، چونکـە دوای قەرەبـوو بـۆ درانی ئیسـماعیل، خـوا فەرموویـەتی: ﴿ وَبَشَّرْنَٰهُ بِإِسْحَٰقَ نَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٢﴾ ﴾الصافات، واتـە:

---

(١) ص ١٠٢، ١٠٣.

(١٤) ساڵ دوای ئەوەی کە ئیسماعیلی پێداوە، بە پێی قسەکەی پەیمانی کۆن، هەروەها ئایەتەکانی قورئانیش ئاماژە بەوە دەکەن، ئنجا ئیسحاقی پێداوە.

**ج)- دروستکردنی کەعبە:**

وەك خوا ﷻ لە سووڕەتی (البقرة)، لە ئایەتەکانی: (١٢٧، ١٢٨، ١٢٩)دا، باسی ئەو ڕووداوە دەکات و دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَٰهِـۧمُ ٱلْقَوَاعِدَ مِنَ ٱلْبَيْتِ وَإِسْمَٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ رَبَّنَا وَٱجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٨﴾ رَبَّنَا وَٱبْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٢٩﴾ ﴾.

واتە: یاد بکەوە! کاتێك ئیبراهیم و ئیسماعیل دیوارەکانی ماڵ (ی خوا)یان بەرزدەکردنەوە دەیانگوت: پەروەردگارمان! لێمان قبوڵ بکە، بێگومان تۆ بیسەری زانای ...هتد.

**د)- تەڵاقدانی ئیسماعیل بۆ هاوسەری، لەسەر فەرمانی بابی ئیبراهیم ؈:**

پێشتریش دەقی ئەو ڕووداوەمان لە (صحيح البخاري)دا هێنا، لە کاتی، تەفسیرکردنی سووڕەتی (إبراهيم)دا، بەڵام لێرەش بە پێویستی دەزانم دووبارە بیهێنین بوخاریی بە دوو ڕیوایەت هێناویەتی، بە ژمارە: (٣٣٦٤) و، بە ژمارە: (٣٣٦٥)یش، ئەمەش دەقی ڕیوایەتی یەکەم:

**(عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَوَّلَ مَا اتَّخَذَ النِّسَاءُ الْمِنْطَقَ مِنْ قِبَلِ أُمِّ إِسْمَاعِيلَ، اتَّخَذَتْ مِنْطَقًا لَتُعَفِّيَ أَثَرَهَا عَلَى سَارَةَ، ثُمَّ جَاءَ بِهَا إِبْرَاهِيمُ، وَبِابْنِهَا إِسْمَاعِيلَ وَهِيَ تُرْضِعُهُ حَتَّى وَضَعَهُمَا عِنْدَ الْبَيْتِ عِنْدَ دَوْحَةٍ، فَوْقَ زَمْزَمَ فِي أَعْلَى الْمَسْجِدِ، وَلَيْسَ بِمَكَّةَ يَوْمَئِذٍ أَحَدٌ، وَلَيْسَ بِهَا مَاءٌ، فَوَضَعَهُمَا هُنَالِكَ، وَ وَضَعَ عِنْدَهُمَا جِرَابًا فِيهِ تَمْرٌ وَسِقَاءً فِيهِ مَاءٌ، ثُمَّ قَفَّى إِبْرَاهِيمُ مُنْطَلِقًا، فَتَبِعَتْهُ أُمُّ إِسْمَاعِيلَ فَقَالَتْ: يَا إِبْرَاهِيمُ! أَيْنَ تَذْهَبُ وَتَتْرُكُنَا بِهَذَا الْوَادِي الَّذِي لَيْسَ فِيهِ إِنْسٌ وَلاَ شَيْءٌ؟ فَقَالَتْ لَهُ ذَلِكَ مِرَارًا، وَجَعَلَ لاَ يَلْتَفِتُ إِلَيْهَا، فَقَالَتْ لَهُ: آللَّهُ الَّذِي أَمَرَكَ بِهَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَتْ: إِذًا لاَ يُضَيِّعُنَا، ثُمَّ رَجَعَتْ، فَانْطَلَقَ إِبْرَاهِيمُ حَتَّى إِذَا كَانَ عِنْدَ الثَّنِيَّةِ، حَيْثُ لاَ يَرَوْنَهُ اسْتَقْبَلَ بِوَجْهِهِ الْبَيْتَ، ثُمَّ دَعَا بِهَؤُلاَءِ الْكَلِمَاتِ وَرَفَعَ يَدَيْهِ، فَقَالَ: ﴿ رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ ... ﴿٣٧﴾ ﴾ حَتَّى بَلَغَ ﴿ يَشْكُرُونَ ﴾، وَجَعَلَتْ أُمُّ إِسْمَاعِيلَ تُرْضِعُ إِسْمَاعِيلَ، وَتَشْرَبُ مِنْ ذَلِكَ الْمَاءِ، حَتَّى إِذَا نَفِدَ مَا فِي السِّقَاءِ، عَطِشَتْ وَعَطِشَ ابْنُهَا، وَجَعَلَتْ تَنْظُرُ إِلَيْهِ يَتَلَوَّى أَوْ قَالَ يَتَلَبَّطُ، فَانْطَلَقَتْ كَرَاهِيَةَ أَنْ تَنْظُرَ إِلَيْهِ، فَوَجَدَتِ الصَّفَا أَقْرَبَ جَبَلٍ فِي الأَرْضِ يَلِيهَا، فَقَامَتْ**

عَلَيْـهِ، ثُمَّ اسْـتَقْبَلَتِ الْـوَادِيَ تَنْظُـرُ: هَـلْ تَـرَى أَحَـدًا؟ فَلَـمْ تَـرَ أَحَـدًا، فَهَبَطَـتْ مِـنَ الصَّفَـا حَتَّـى إِذَا بَلَغَـتِ الْـوَادِيَ، رَفَعَـتْ طَـرَفَ دِرْعِهَـا، ثُـمَّ سَـعَتْ سَـعْيَ الإِنْسَانِ الْمَجْهُـودِ، حَتَّـى جَـاوَزَتِ الْـوَادِيَ، ثُـمَّ أَتَـتِ الْمَـرْوَةَ، فَقَامَـتْ عَلَيْهَـا وَنَظَـرَتْ: هَـلْ تَـرَى أَحَـدًا؟ فَلَـمْ تَـرَ أَحَـدًا، فَفَعَلَـتْ ذَلِـكَ سَـبْعَ مَـرَّاتٍ، قَـالَ ابْـنُ عَبَّـاسٍ قَـالَ النَّبِـيُّ ﷺ: فَذَلِـكَ سَـعْيُ النَّـاسِ بَيْنَهُـمَا، فَلَـمَّا أَشْرَفَـتْ عَـلَى الْمَـرْوَةِ، سَـمِعَتْ صَوْتًـا، فَقَالَـتْ: صَـهٍ، تُرِيـدَ نَفْسَـهَا، ثُـمَّ تَسَـمَّعَتْ، فَسَـمِعَتْ أَيْضًـا، فَقَالَـتْ: قَـدْ أَسْـمَعْتَ، إِنْ كَانَ عِنْـدَكَ غِـوَاثٌ، فَـإِذَا هِـيَ بِالْمَلَـكِ، عِنْـدَ مَوْضِـعِ زَمْـزَمَ، فَبَحَـثَ بِعَقِبِـهِ، أَوْ قَـالَ بِجَنَاحِـهِ، حَتَّـى ظَهَـرَ الْـمَاءُ، فَجَعَلَـتْ تُحَوِّضُـهُ وَتَقُـولُ بِيَدِهَـا هَكَـذَا، وَجَعَلَـتْ تَغْـرِفُ مِـنَ الْـمَاءِ فِي سِـقَائِهَا، وَهُـوَ يَفُـورُ بَعْـدَ مَـا تَغْـرِفُ، قَـالَ ابْـنُ عَبَّـاسٍ: قَـالَ النَّبِـيُّ ﷺ: يَرْحَـمُ اللَّـهُ أُمَّ إِسْـمَاعِيلَ لَـوْ تَرَكَـتْ زَمْـزَمَ، أَوْ قَـالَ: لَـوْ لَـمْ تَغْـرِفْ مِـنَ الْـمَاءِ، لَكَانَـتْ زَمْـزَمُ عَيْنًـا مَعِينًـا، قَـالَ فَشَرِبَـتْ وَأَرْضَعَـتْ وَلَدَهَـا، فَقَـالَ لَهَـا الْمَلَـكُ: لاَ تَخَافُـوا الضَّيْعَـةَ، فَـإِنَّ هَـا هُنَـا بَيْـتَ اللَّـهِ، يَبْنِـي هَـذَا الْغُـلاَمُ، وَأَبُـوهُ، وَإِنَّ اللَّـهَ لاَ يُضِيـعُ أَهْلَـهُ.

وَكَانَ الْبَيْـتُ مُرْتَفِعًـا مِـنَ الأَرْضِ كَالرَّابِيَـةِ، تَأْتِيـهِ السُّـيُولُ، فَتَأْخُـذُ عَـنْ يَمِينِـهِ وَشِـمَالِهِ، فَكَانَـتْ كَذَلِـكَ، حَتَّـى مَـرَّتْ بِهِـمْ رُفْقَـةٌ مِـنْ جُرْهُـمَ أَوْ أَهْـلُ بَيْـتٍ مِـنْ جُرْهُـمَ مُقْبِلِـينَ مِـنْ طَرِيـقِ كَـدَاءٍ، فَنَزَلُـوا فِي أَسْـفَلِ مَكَّـةَ، فَـرَأَوْا طَائِـرًا عَائِفًـا، فَقَالُـوا: إِنَّ هَـذَا الطَّائِـرَ لَيَـدُورُ عَـلَى مَـاءٍ، لَعَهْدُنَـا بِهَـذَا الْـوَادِي وَمَـا فِيـهِ مَـاءٌ، فَأَرْسَـلُوا جَرِيًّـا أَوْ جَرِيَّيْنِ، فَـإِذَا هُـمْ بِالْـمَاءِ، فَرَجَعُـوا فَأَخْبَرُوهُـمْ بِالْـمَاءِ، فَأَقْبَلُـوا، قَـالَ: وَأُمُّ إِسْـمَاعِيلَ عِنْـدَ الْـمَاءِ، فَقَالُـوا: أَتَأْذَنِـينَ لَنَـا أَنْ نَنْـزِلَ عِنْـدَكِ؟ فَقَالَـتْ: نَعَـمْ، وَلَكِـنْ لاَ حَـقَّ لَكُـمْ فِي الْـمَاءِ. قَالُـوا: نَعَـمْ، قَـالَ ابْـنُ عَبَّـاسٍ قَـالَ النَّبِـيُّ ﷺ: فَأَلْفَـى ذَلِـكَ أُمَّ إِسْـمَاعِيلَ، وَهْـيَ تُحِـبُّ الإِنْـسَ، فَنَزَلُـوا وَأَرْسَـلُوا إِلَى أَهْلِيهِـمْ، فَنَزَلُـوا مَعَهُـمْ حَتَّـى إِذَا كَانَ بِهَـا أَهْـلُ أَبْيَـاتٍ مِنْهُـمْ، وَشَـبَّ الْغُـلاَمُ، وَتَعَلَّـمَ الْعَرَبِيَّـةَ مِنْهُـمْ، وَأَنْفَسَـهُمْ وَأَعْجَبَهُـمْ حِـينَ شَـبَّ، فَلَـمَّا أَدْرَكَ، زَوَّجُـوهُ امْـرَأَةً مِنْهُـمْ.

وَمَاتَـتْ أُمُّ إِسْـمَاعِيلَ، فَجَـاءَ إِبْرَاهِيـمُ، بَعْـدَ مَـا تَـزَوَّجَ إِسْـمَاعِيلُ يُطَالِـعُ تَرِكَتَـهُ، فَلَـمْ يَجِـدْ إِسْـمَاعِيلَ، فَسَـأَلَ امْرَأَتَـهُ عَنْـهُ؟ فَقَالَـتْ: خَـرَجَ يَبْتَغِـي لَنَـا، ثُـمَّ سَـأَلَهَا عَـنْ عَيْشِـهِمْ وَهَيْئَتِهِـمْ فَقَالَـتْ: نَحْـنُ بِـشَرٍّ، نَحْـنُ فِي ضِيـقٍ وَشِـدَّةٍ، فَشَـكَتْ إِلَيْـهِ، قَـالَ: فَـإِذَا جَـاءَ زَوْجُـكِ فَاقْـرَئِي عَلَيْـهِ السَّـلاَمَ، وَقُـولِي لَـهُ يُغَيِّرْ عَتَبَـةَ بَابِـهِ. فَلَـمَّا جَـاءَ إِسْـمَاعِيلُ، كَأَنَّـهُ آنَـسَ شَـيْئًا، فَقَـالَ: هَـلْ جَاءَكُـمْ مِـنْ أَحَـدٍ؟ قَالَـتْ: نَعَـمْ، جَاءَنَـا شَـيْخٌ كَـذَا وَكَـذَا، فَسَـأَلَنَا عَنْـكَ فَأَخْبَرْتُـهُ، وَسَـأَلَنِي كَيْـفَ عَيْشُـنَا؟ فَأَخْبَرْتُـهُ أَنَّـا فِي جَهْـدٍ وَشِـدَّةٍ، قَـالَ: فَهَـلْ أَوْصَـاكِ بِـشَيْءٍ؟ قَالَـتْ: نَعَـمْ، أَمَـرَنِي أَنْ أَقْـرَأَ عَلَيْـكَ السَّـلاَمَ، وَيَقُـولُ: غَـيِّرْ عَتَبَـةَ بَابِـكَ، قَـالَ: ذَاكِ أَبِي، وَقَـدْ أَمَـرَنِي أَنْ أُفَارِقَـكِ الْحَقِـي بِأَهْلِـكِ، فَطَلَّقَهَـا، وَتَـزَوَّجَ مِنْهُـمْ أُخْـرَى، فَلَبِـثَ عَنْهُـمْ إِبْرَاهِيـمُ مَـا شَـاءَ اللَّـهُ، ثُـمَّ أَتَاهُـمْ بَعْـدُ، فَلَـمْ يَجِـدْهُ، فَدَخَـلَ عَـلَى امْرَأَتِـهِ، فَسَـأَلَهَا عَنْـهُ، فَقَالَـتْ: خَـرَجَ يَبْتَغِـي لَنَـا، قَـالَ: كَيْـفَ أَنْتُـمْ وَسَـأَلَهَا عَـنْ عَيْشِـهِمْ، وَهَيْئَتِهِـمْ. فَقَالَـتْ: نَحْـنُ بِخَـيْرٍ وَسَـعَةٍ، وَأَثْنَـتْ عَـلَى اللَّـهِ، فَقَـالَ: مَـا طَعَامُكُـمْ؟ قَالَـتِ: اللَّحْـمُ، قَـالَ: فَـمَا شَرَابُكُـمْ قَالَـتِ: الْـمَاءُ، فَقَـالَ: اللَّهُـمَّ بَـارِكْ لَهُـمْ فِي اللَّحْـمِ وَالْـمَاءِ.

قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ يَوْمَئِذٍ حَبٌّ، وَلَوْ كَانَ لَهُمْ دَعَا لَهُمْ فِيهِ، قَالَ: فَهُمَا لاَ يَخْلُو عَلَيْهِمَا أَحَدٌ بِغَيْرِ مَكَّةَ إِلاَّ لَمْ يُوَافِقَاهُ. قَالَ: فَإِذَا جَاءَ زَوْجُكِ، فَاقْرَئِي عَلَيْهِ السَّلاَمَ، وَمُرِيهِ يُثْبِتُ عَتَبَةَ بَابِهِ، فَلَمَّا جَاءَ إِسْمَاعِيلُ، قَالَ: هَلْ أَتَاكُمْ مِنْ أَحَدٍ؟ قَالَتْ: نَعَمْ أَتَانَا شَيْخٌ حَسَنُ الْهَيْئَةِ، وَأَثْنَتْ عَلَيْهِ، فَسَأَلَنِي عَنْكَ، فَأَخْبَرْتُهُ، فَسَأَلَنِي كَيْفَ عَيْشُنَا؟ فَأَخْبَرْتُهُ أَنَّا بِخَيْرٍ، قَالَ: فَأَوْصَاكِ بِشَيْءٍ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، هُوَ يَقْرَأُ عَلَيْكَ السَّلاَمَ، وَيَأْمُرُكَ أَنْ تُثْبِتَ عَتَبَةَ بَابِكَ. قَالَ: ذَاكِ أَبِي، وَأَنْتِ الْعَتَبَةُ، أَمَرَنِي أَنْ أُمْسِكَكِ، ثُمَّ لَبِثَ عَنْهُمْ مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ جَاءَ بَعْدَ ذَلِكَ، وَإِسْمَاعِيلُ يَبْرِي نَبْلاً لَهُ تَحْتَ دَوْحَةٍ قَرِيبًا مِنْ زَمْزَمَ، فَلَمَّا رَآهُ قَامَ إِلَيْهِ، فَصَنَعَا كَمَا يَصْنَعُ الْوَالِدُ بِالْوَلَدِ وَالْوَلَدُ بِالْوَالِدِ، ثُمَّ قَالَ: يَا إِسْمَاعِيلُ، إِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِي بِأَمْرٍ. قَالَ: فَاصْنَعْ مَا أَمَرَكَ رَبُّكَ. قَالَ: وَتُعِينُنِي؟ قَالَ: وَأُعِينُكَ. قَالَ: فَإِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِي أَنْ أَبْنِيَ هَا هُنَا بَيْتاً، وَأَشَارَ إِلَى أَكَمَةٍ مُرْتَفِعَةٍ عَلَى مَا حَوْلَهَا، قَالَ: فَعِنْدَ ذَلِكَ رَفَعَا الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ، فَجَعَلَ إِسْمَاعِيلُ يَأْتِي بِالْحِجَارَةِ، وَإِبْرَاهِيمُ يَبْنِي، حَتَّى إِذَا ارْتَفَعَ الْبِنَاءُ، جَاءَ بِهَذَا الْحَجَرِ فَوَضَعَهُ لَهُ، فَقَامَ عَلَيْهِ وَهُوَ يَبْنِي، وَإِسْمَاعِيلُ يُنَاوِلُهُ الْحِجَارَةَ، وَهُمَا يَقُولاَنِ: ﴿رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ١٢٧﴾ البقرة، قَالَ: فَجَعَلاَ يَبْنِيَانِ حَتَّى يَدُورَا حَوْلَ الْبَيْتِ، وَهُمَا يَقُولاَنِ: ﴿رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ١٢٧﴾ البقرة).

لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە هاتووە دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس گوتی: یەکەمین جار کە ئافرەتان دامێنی خۆیان درێژ کرد، [کراسی خۆیان درێژ کرد، کە لە دوایان بخشێ] لەلایەن دایکی ئیسماعیلەوە بوو، ئەویش بۆیە دامێنی کراسەکەی درێژ کرد [کە لە دوای بخشێ] تاکو ئەگەر بە شوێنێکدا ڕۆیی، سارە نەتوانێ بەدوایدا بچێ و شوێن پێی هەڵبگرێ و دامێنی کراسەکەی، شوێنەکەی ون بکات و بیسڕێتەوە [دیارە پێکەوە هەوێ بوون، خوا لە هەردووکیان ڕازی بێ و، دوای ئەوەی هاجەر ئیسماعیلی دەبێ، سارە زۆر هەستیاریی بەرانبەری پەیدا دەبێ، وەك لە صەحیحی بوخاریشدا هاتووە، دواتر هەر لەسەر داواکاریی سارە دەبێ کە ئیبراهیم، ئیسماعیل و هاجەر دەبات و لە شوێنی ئێستای شاری مەککە نیشتەجێیان دەکات، لێرەدا عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ بەسەرهاتەکە کورت دەکاتەوە][1] دوایی ئیبراهیم ﷺ هاجەر و ئیسماعیلی کوڕی لە کاتێکدا کە شیرەخۆرە بوو، بردنی هەتاکو لەلای ماڵ (بیت) دانیان (نیشتەجێی کردن)، لەلای درەختێك لە پشت ئەو شوێنەوە کە دوایی ئاوی زەمزەمی لێ پەیدا دەبێ، لە سەرووی مزگەوتەوە [کە دوایی مزگەوتی لێ پەیدا دەبێ، ئەگەرنا ئەوکاتە نە مزگەوت هەبووە، نە ئاوی زەمزەم هەبووە، نە شاری مەککەش هەبووە، هیچ

---

(١) ئێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست.

ئاوەدانییەکی لێ نەبووە} لەو کاتەدا لە مەککە هیچ کەسێکی لێ نەبووە و ئاویشی لێ نەبووە و لەوێ دایینان و جەواڵێك [یان توورەکەیەك} خورما لەگەڵ مەشکەیەك ئاویشی لەلا دانان، دوایی ئیبراهیم ﷺ پشتی تێکردن و گەڕایەوە، هاجەری دایکی ئیسماعیل شوێنی کەوت و گوتی: ئەی ئیبراهیم! بۆ کوێ دەچی و ئێمە لەو شیوە بەجێ دێڵی، کە نە مرۆڤێکی لێیە و نەهیچی لێیە؟ چەند جارێك ئەوەی دووبارە کردەوە، بەڵام ئیبراهیم ئاوڕی لێ نەدایەوە، دوایی هاجەر گوتی: ئایا خوا فەرمانی بەمە پێ کردووی؟ ئیبراهیم گوتی: بەڵێ، گوتی: کەواتە خوا ئێمە زایە ناکات، دوایی هاجەر گەڕایەوە و ئیبراهیمیش ڕۆیشت تاکو لەلای (ثَنِيَة) {شوێنێکە لە مەککە} بە شێوەیەك کە هاجەر نەیدەبینی، لەوێ ڕووی کردە (بیت) و {ئەو شوێنەی کە ئێستا کەعبەی لێ دروست کراوە} دەستی بەرز کردەوەو بەو وشانە لە خوا پاڕایەوە و فەرمووی:

﴿رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ ﴿٣٧﴾﴾.

دایکی ئیسماعیلیش دەستی کرد بە شیر پێدانی ئیسماعیل و بۆخۆشی لە ئاوەکەی دەخواردەوە (دیارە لە خورماکەشی خواردوە) هەتا کاتێك ئەو ئاوەی لە مەشکەکەدا بوو، بڕا، دایکەکە تینووی بوو، منداڵەکەش تینووی بوو، تنجا کاتێك هاجەر تەماشای ئیسماعیلی دەکرد، لە تینووان و لە برسان خۆی تێکباهەڵدەدا و، لینگە فرتەی بوو، ئەویش ڕۆیشت بۆ ئەوەی کە بەو شێوەیە ئیسماعیل نەبینێ، (واتە: ڕۆیشت تەماشا بکات، بزانێ: کەسێك نابینێ؟) سەرنجی دا تەپۆلکەی سەفا نزیکترین چیا بوو، بە نسبەت ئەوەوە، بۆیە چووە سەر تەپۆلکەی سەفا و ڕووی کردە شیوەکە، بزانێ: هیچ کەس دەبینێ؟ کەسی نەبینی، دوایی لە تەپۆلکەی سەفا دابەزی، تاکو گەیشتە نێو شیوەکە و کراس و دامێنی خۆی هەڵکرد، تاکو بتوانێ چاك بڕوات، بە نەرمە غار ڕۆیشت، وەك کەسێکی ماندووی بێ تاقەت، تاکو لە شیوەکە تێپەڕی و، گەیشتە سەر تەپۆلکەی مەڕوە، لەوێش لەسەر شاخۆلکەی مەڕوە، دووبارە لەوێشەوە سەرنجی دا بەملاو لادا، داخۆ کەسێك دەبینێ؟ دووبارە کەسی نەبینی، ئیدی بەم شێوەیە حەوت جاران وای کرد (واتە: لە سەفاوە چوو بۆ مەڕوە و لە مەڕوەوە هاتەوە سەفا، حەوت جاران بەو شێوەیەی کرد) عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (فَذَلِكَ سَعْيُ النَّاسِ بَيْنَهُمَا)، هاتن و چوونی ئێستای خەڵك لە نێوان سەفا و مەڕوەدا، بەهۆی ئەو هاتن و چوونەی هاجەرەوە

بووە، لە نێوانی ئەو دوو شاخۆلکەیەدا، (دیارە ئەو کاتە ئەو دوو شاخۆلکەیە بەرز بوون، بەڵام وردە وردە داڕووخاون و نزم بوونەوە) تاکو پەیسەرێك و سۆراغێك بکات، بزانێ: کەس دەبینێ یان نا؟ ئنجا کاتێك بۆ دواجار چوو بۆ سەر شاخۆلکەی مەڕوە، دەنگێکی بیست، بە خۆی گوت: بێ دەنگ بە (وەك بڵێی: گوێ هەڵخە، هەناسەی خۆی بڕی، بۆ ئەوەی چاك گوێ بگرێ)، ئنجا دووبارە دەنگەکەی بیستەوە، دوایی هاجەر بانگێکی کرد و گوتی: ئەوە وات کرد، کە من دەنگت ببیستم، ئەگەر هاوکارییەکت بۆ من پێ دەکرێ، با بزانم، تەماشای کرد ئەوە فریشتەکە (مەبەست پێی جبریلە) لەو شوێنەیە، کە دوایی سەرچاوەی زەمزەمی لێ پەیدا بووە، بە پاژنە پێی، یاخود بە باڵەکەی لە زەوییەوە دەژەنی و، عەرزی هەڵدەکەند، تاکو ئاوەکە دەرکەوت، کە ئاوەکە دەرکەوت هاجەریش چوو، ئەو ئاوەی کە هەڵقوڵی لەوێ، بەدەستی ویستی ئاوەکە نەڕوا و حەوزێکی بۆ دروست کرد، پاشان دەستی کرد بەوە کە بەمست لەو ئاوەی کە لە حەوزەکەدا کۆبوو بووەوە لە کاتێکدا کە دەردەقوڵی، مەشکەکەی لێ پڕ کرد، عەبدوڵلای کوڕی عەبباس دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوا بەزەیی بە دایکی ئیسماعیلدا بێتەوە، ئەگەر لە زەمزەم گەڕابایە، (ئەگەر بەدەستی مستی تێهەڵ نەدابایە و، لێی گەڕابایە) ئاوی زەمزەم دەبوو بە سەرچاوەیەکی گەورە، (واتە: گەورەتر لەوەی کە ئێستا هەیە) ئنجا هاجەر و لە ئاوەکەی خواردەوە و شیری دا بە منداڵەکەی و، فریشتەکەش (جبریل کە بۆی چۆتە سەر شێوەی مرۆڤێك) پێی گوت: لە فەوتان مەترسێن، لێرەدا لەم شوێنە ماڵێك بۆ خوا دروست دەکرێ، ئەم کوڕە (ئیسماعیل)و بابی ئەو ماڵە بۆ خوا دروست دەکەن و، هەرکەسێك عایدی خوابێ و، لە خوا نزیك بێ، خوا زایەی ناکات، ئنجا دەڵێ: کاتی خۆی کەعبە شوێنەکەی بەرزایی بوو لە زەوی (وەك تەپۆلکەیەك بوو)، بەڵام وردە وردە لافاو هاتن، لەلای ڕاست و لەلای چەپیان برد، (تاکو دوایی بەم شێوەیە شوێنەکەی نزم بووەوە) ئنجا هاجەر و ئیسماعیلی کوڕی بەو شێوەیە مانەوە، تاکو جارێك کاروانێك لە هۆزی جورهوم، یاخود بنەماڵەیەك لە جورهوم، بەلایاندا تێپەڕین، کە لە ڕێی کەدائەوە دەگەڕانەوە (ناوی شوێنێکی ئەو ناوچەیەیە) لە خوارەوەی ئەو شوێنەی کە مەککەی لێ دروستکراوە، لەوێ مەنزڵگەیان خست، باڵندەیەکیان بینی بە ئاسمانێوە بوو، گوتیان: ئەو باڵندەیە لە ئاو دەگەڕێ و بەپێی شارەزایی ئێمە، ئەم شیوە هەرگیز ئاوی تێدا نەبووە، دەلیلێکیان، یاخود دوو کەسیان ناردن، کە بگەڕێن و بپشکنن ئایا ئاوی لێ پەیدا بووە؟ تەماشایان کرد ئاوی لێ هەیە، دەلیلەکان گەڕانەوە، هەواڵیان پێدان کە ئەو شوێنە ئاوی لێیە، ئەوانیش هاتن بۆ سەر ئاوەکە، دایکی ئیسماعیلیش لەسەر ئاوەکە بوو،

پێیان گوت: ئایا مۆڵەتمان دەدەی کە ئێمەش لێرە بارگە و بنە بخەین و، ئێرە بکەین بە نشینگەی خۆمان؟ لەبەر ئەوەی ئاوەکە هی ئەو بووە، گوتی: بەڵێ، بەڵام مافتان بە ئاوەکەوە نیە (ئەو مەرجەی لێ گرتن) گوتیان: باشە (ڕازیین)، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێك ئەوە بوو، کە دایکی ئیسماعیلیش خوای خوای بوو هۆگرێك و ئاوەدانییەکی لە دەور پەیدا بێ، بۆ خۆی بە تاقی تەنیا لەگەڵ ئەو منداڵە بووە، ئیدی لەوێ دابەزین (هۆزی جورهوم)، لەو شوێنە بارگەیان خست، دواتر بە دوای کەس و کاری خۆیاندا نارد، ئەوانیش هاتن و ئەوێیان قەرەباڵغ کرد، هەتا وای لێهات چەند ماڵێك لەوێ کۆبوونەوە.

دواتر ئیسماعیل گەورە بوو (بوو بە گەنج) و زمانی عەرەبییش لەوانەوە فێر بوو، {ئەگەرنا ئیسماعیل دایکی قیبتیی بووە و بە زمانی خەڵکی میسری ئەو کاتە قسەی کردوە و باییشی ئیبراهیم عەرەب نەبووە، چونکە هەر بەپێی ڕێزمانی زمانی عەرەبی، وشەی (ئیبراهیم و ئیسماعیل) ناوی تەعجەمیین و عەرەبیی نین} ئنجا کاتێك کە گەورە بوو (بوو بە گەنج)، ئەوانیش پێی سەرسام بوون و بە مرۆڤێکی باشیان هاتە بەرچاو، بۆیە کاتێك کە باڵغ بوو (گەورە بوو)، ئافرەتێك لە خۆیانیان پێدا، ئنجا هەر لەو سەرو حەددەدا، ماوەیەك دواتر دایکی ئیسماعیلیش وەفاتی کرد، دوای ئەوەی ئیسماعیل هاوسەرگیریی کرد، ئیبراهیم عليه السلام هات بۆ ئەوەی سۆراغی ماڵ و منداڵی بکات و، بزانێ داخۆ چییان لێهاتوە؟ کە چوو بۆ ماڵی ئیسماعیلی کوڕی، ئیسماعیلی نەبینی (دیارە لە ماڵەکانی دیکەی پرسیوە و، ماڵی ئیسماعیلی بینیوەتەوە) لە هاوسەرەکەی پرسی: ئیسماعیل لە کوێیە؟ هاوسەرەکەی گوتی: چۆتە دەرێ بۆ ڕاو و شکار، تاکو نێچیرێك، یاخود خۆراکێك شتێکمان بۆ بهێنێتەوە، ئیبراهیم دەربارەی ژیان و گوزەرانیان لێی پرسی: وەزعتان چۆنە و بارو دۆختان چۆنە؟ ئەویش گوتی: گوزەران و بارو دۆخمان زۆر خراپە و ئێمە لە تەنگ دەستیی و سەغڵەتیی داین، {سکاڵای خۆی لەلا کرد} ئیبراهیم پێی گوت: ئەگەر هاوسەرەکەت هاتەوە، سەلامی پێ بگەیەنە و پێشی بڵێ: با شیپانەی (چوارچێوە)ی دەرگاکەی بگۆڕێ، کاتێك ئیسماعیل هاتەوە، وەك بۆنێکی کرد بێ، هەستی کرد کەسێك هاتبێ، گوتی: کەس هاتوە بۆ لاتان؟ خێزانەکەی گوتی: بەڵێ، پیاوێکی بەتەمەن هات، حاڵ و حیسابی ئاواو ئاوا بوو، لەبارەی تۆوەش پرسیاری لێ کردم، منیش هەواڵم پێدا و، دەربارەی ژیان و گوزەرانمان پرسیاری کرد، هەواڵم پێدا، کە ئێمە لە تەنگ دەستیی و سەغڵەتیی داین، ئیسماعیل پێی گوت: ئایا هیچ ئامۆژگاریی نەکردی؟ {هیچ

پێشنیاری بۆ نەکردی؟} ئافرەتەکە گوتی: با، فەرمانی پێکردم کە سەلامت پێ بگەیەنم، گوتیشی: با شیپانە و چوارچێوەی دەرگایەکەی بگۆڕێ! ئیسماعیل گوتی: ئەوە بابم بووە، فەرمانیشی پێکردووم لە تۆ جیاببمەوە، تۆ بچۆرەوە لای کەس و کارت، ئیسماعیل دەستی لێ هەڵگرت (تەڵاقی دا) و، ئافرەتێکی دیکەی لێهێنان، ماوەیەك ئیبراهیم عليه السلام نەچوو بۆ لایان {ئەوەندەی کە خوا حەز بکات، ماوەیەکی پێ چوو} دوایی جارێکی دیکە هاتەوە بۆ سەردانیان، دیسان ئیسماعیلی لەوێ نەبینی، چوو بوو بۆ ڕاو و شکار {ژیانیان لەسەر ڕاو و شکار بووە} چوو بۆ لای هاوسەرەکەی و دەربارەی ئیسماعیل لێی پرسی؟ ئەویش {ئافرەتەکە} وەڵامی دایەوە و گوتی: چووە بژێوێکمان بۆ پەیدا بکات، ئیبراهیم عليه السلام دەربارەی حاڵ و گوزەرانیان پرسیاری لێکرد و گوتی: حاڵ و بارو دۆختان چۆنە؟ ئەویش گوتی: وەزعمان باشە، ژیان و گوزەرانمان لە فراوانیی و خۆشییدایە و سوپاس و ستایشی خوای کرد، گوتی: خواردنتان چییە؟ ئەویش گوتی: خواردنمان گۆشتە، ئیبراهیم عليه السلام گوتی: ئەدی خواردنەوەتان چییە؟ گوتی: خواردنەوەشمان ئاوە، ئیبراهیم عليه السلام گوتی: (اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُم فِي اللَّحْمِ وَالْمَاءِ)، خوایە! پیت و پێزیان بۆ بخە گۆشت و ئاوەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو کاتە دانەوێڵەیان نەبووە، ئەگەر دانەوێڵەیان هەبووایە، ئیبراهیم دوعای بۆ دانەوێڵەش بۆ دەکردن کە پیت و بەرەکەتی بکەوێتێ، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ: تەنیا لە مەککە خەڵك دەتوانێ بە گۆشت و ئاو بژیی، بەڵام لە جگە لە مەککە، هیچ کەسێك بە تەنیا بە گۆشت و ئاو مەدار ناکات، {یانی: لەبەر بەرەکەتی دوعایەکەی ئیبراهیم عليه السلام، هەڵبەتە ژینگەکەش بۆ خۆی وایە}.

ئنجا ئیبراهیم بە هاوسەری ئیسماعیلی گوت: ئەگەر هاوسەرت هاتەوە، سڵاوی پێ بگەیەنە و پێشی بڵێ: با شیپانە و چوارچێوەی دەرگاکەی بچەسپێنێ.

کاتێك ئیسماعیل هاتەوە، گوتی: هیچ کەس هاتوە بۆ لاتان؟ خێزانەکەی گوتی: بەڵێ، پیاوێکی بەتەمەنی شکڵ و شێوە جوان هات، زۆر مەدحی کرد، کە پیاوێکی ئەوەندە نوورانیی و جوان بوو و، دەربارەی تۆش پرسیاری لێکردم، منیش هەواڵم پێدا، هەروەها دەربارەی ژیان و گوزەرانمان پرسیاری لێکردم، منیش هەواڵم پێدا: کە ئێمە ژیانمان باشە، بارو گوزەرانمان خۆشە، ئیسماعیل پێی گوت: هیچ ئامۆژگاریی نەکردی؟ هیچ پێشنیاری نەکرد کە بەمن بڵێی؟ گوتی، بەڵێ، سڵاوی لێکردی و فەرمانیشی پێکردی: کە شیپانە و چوارچێوەی دەرگایەکەت بچەسپێنی، ئیسماعیل گوتی: ئەوە بابم بووە و تۆ چوارچێوەی دەرگایەکەمی {تەعبیرێکی ڕەمزییە بۆ ئەوە}و فەرمانی پێکردووم کە تۆ بهێڵمەوە لەلای

خۆم، دوای ماوەیەك ئیبراهیم چۆوە بۆ لایان، ئەوەندەی كە خوا حەز بكات [دیارە هەر بەین بەین سەردانی كردوون] لەو كاتەدا ئیسماعیل تیری چاك دەكرد، [لە لقی درەخت بریویەتی بۆ ئەوەی چاكی بكات و دواتر نووكێكی ئاسنی تێ بخات و، بۆ ڕاو و شكار بەكاری بهێنێ] ئیسماعیل لە ژێر درەختێك دا كە لە نیزیك ئاوی زەمزەمەوە بوو، دانیشتبوو، كاتێك ئیسماعیل ئیبراهیمی بابی بینی، هەڵسا بۆی (بەرەو پێشوازیی چوو)، هەروەك باب لەگەڵ كوڕ و كوڕ لەگەڵ باب چی دەكەن! ئەوانیش ئاوایان كرد [ئیسماعیل دەستی بابی ماچ كردوە و ئیبراهیم كوڕەكەی خۆی ماچ كردوە و، لەباوەشی گرتوە] دواتر ئیبراهیم گوتی: ئەی ئیسماعیل! خوا فەرمانێكی پێ كردووم، ئیسماعیل گوتی: پەروەردگارت بەچی فەرمانی پێ كردووی، ئەنجامی بدە، ئیبراهیم گوتی: ئنجا هاوكاریم دەكەی؟ گوتی: بەڵێ، هاوكاریت دەكەم، فەرمووی: خوا فەرمانی پێكردووم: لێرە ماڵێك دروست بكەم، ئامارەی بۆ گردێك كرد كە بەرزتر بوو لە دەور و بەری خۆی، [پێشتر باسمان كرد: ئەو شوێنەی كەعبەی لێ دروستكراوە، بەرزتر بووە، بەڵام دواتر هەر لافاو هاتوە و خوراندوویەتی، تاكو لەگەڵ زەوی دەورو بەریدا تەخت بووە] لەوێ ئیبراهیم عليه السلام دەستی كرد بەدانانی بناغەی كەعبە (ماڵی خوا)، ئیبراهیم بینای دەكرد و، ئیسماعیلیش بەردی بۆ دەهێنان، تاكو دیوارەكە بەرز بۆوە، لەو كاتەدا كە دیوار بەرز بۆوە دەستی نەیدەگەیشتێ، ئیسماعیل بەردێكی بۆ هێنا كە ئیبراهیم لەسەری بوەستێ، [ئەوەی ئێستا پێی دەڵێن: مەقامی ئیبراهیم، دیارە بەردێكی گەورە و بەرز بووە، بۆ ئەوە بووە ئیبراهیم بچێتە سەری و، دەستی بگاتە دیوارە بەرزەكان و ئیسماعیل بەردانی وێ بدات ئەویش لەسەری دابنێ] ئنجا لەو كاتەدا ئیبراهیم بەیتی دروست دەكرد و، ئیسماعیلیش بەردی بۆ دەهێنان و هەردووكیان دەیانگوت:

﴿ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ ﴾البقرة، واتە: پەروەردگارمان! لێمان وەربگرە، بێگومان تۆ بیسەری زانای.

**كوڕەكانی ئیسماعیل:** لە قورئاندا باس نەكراوە، ئیسماعیل چەند كوڕی هەبوون، بەڵام ئامارە هەیە، هەم لە (صحيح البخاري)دا، هەم لە قورئاندا، كە وەچەی لێ پاشكەوتبێ، بەڵام لە پەیمانی كۆندا، هاتوە:

(وَهَـذَا سِجِلُّ مَوَالِيدِ إِسْمَاعِيل بن إبراهيم الذي أنجبَتْهُ هَاجَر المِصْرِيَّة الجَارِيَة لِسارة، لإبراهيم، وَهَـذِهِ أَسْمَاءُ أَبْنَاءِ إسماعيل، مُدَوَّنَةٌ حَسْبَ تَرْتِيبِ وِلَادَتِهِم: نبايوت بكر إسماعيل،

**وقيدار، وأَدْبَئِيل، ومِبسام، ومِشْماع، ودُومَة، ومَسَّا، وحَدَار، وتَيْما، ويَطور، ونافيش، وقَدِمة، وقد صاروا اثني عشر رئيساً لاثنتي عشرة قبيلة).**[1]

واتە: ئەمە تۆماری کورەکانی ئیسماعیلی کوری ئیبراهیمە، کە لە هاجەری میسری کەنیزەکی سارە، بۆ ئیبراهیم لە دایک بوو بوون، ئەوەش ناوی کورەکانی ئیسماعیلە بە پێی ڕیزبەندیی لە دایك بوونیان نووسراون: (نەبایوت کوری گەورەی ئیسماعیل، و قەیدار، و ئەدبەئیل، و میبسام، و میشماع، و دوومە، و مەسسا، و حەدار، و تەیما، و یەتور، و نافیس، و قەدیمە) دوایی بوونە دوازدە (١٢) سەرۆك بۆ دوازدە (١٢) هۆز.

## ٤)- کۆچی دوایی کردنی ئیسماعیل عليه السلام:

ئیسماعیل عليه السلام بە پێی قسەی (پەیمانی کۆن) تەمەنێکی زۆری بووە، دەڵێ: (مَاتَ **إِسْمَاعِيل وَلَهُ مِنَ العُمُر مائَة وَسَبْعٌ وَثَلاَثُونَ سَنَةً، وَلَحِقَ بقَوْمِهِ ...).**

واتە: ئیسماعیل مرد لە کاتێکدا کە تەمەنی سەدوسی و حەوت ساڵ (١٣٧) بوو و، بە خەڵکەکەی دیکەیەوە پەیوەست بوو {واتە: لە جیهانی بەرزەخدا، بەوانەوە پەیوەست بوو}.

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين: الإصحاح ٢٥، ص٦٦.

**مەسەلەی سێیەم:**

**باسی ئیدریس (عليه السلام) کە مرۆڤێکی زۆر ڕاست بووە و، پێغەمبەر بووە و، خوا بۆ شوێنێکی بڵند بەرزی کردۆتەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِدۡرِيسَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيّٗا ٥٦ وَرَفَعۡنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ٥٧ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێ بڕگەدا:

**١)- ﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِدۡرِيسَ ﴾، هەروەها لە کتێبدا {کە قورئانە} باسی ئیدریسیان بۆ بگێڕەوە.**

**٢)- ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيّٗا ﴾، بە دڵنیایی ئەو زۆر ڕاست بوو و پێغەمبەریش بوو {هەواڵپێدراو، یان هەواڵپێدەر بوو}(نَبِيّاً) بە: (نبيئاً)یش خوێنراوەتەوە.**

**٣)- ﴿ وَرَفَعۡنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴾، بەرەو شوێنێکی بەرزیش بڵندمان کرد، یان بەرەو شوێنێکی بڵند، بەرزمان کردەوە.**

**پێویستە بزانین کە ئیدریس لەلای مێژوونووسان بە باپیری بابی نووح (عليه السلام) دانراوە، کەواپێدەچێ: لەوەدا هەر پشتیان بە (پەیمانی کۆن) بەستبێ، کە دەڵێ: (إدريس جَدُّ أبي نُوح: نوح بن لامك بن متوشالح بن أخنوخ)[1]، واتە: ئیدریس باپیری بابی نووحە، نووح کوڕی لامەکە، لامەك کوڕی مەتوشالحە، مەتوشالحیش کوڕی ئەخنووخە.**

**کەواتە: (أخنوخ) کە بە (خنوخ)یش هاتوە، ناوی ئیدریسە.**

**کە دەفەرموێ: ﴿ وَرَفَعۡنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴾، ئەمە دوو واتایان دەگەیەنێ:**

**أ- هەندێکیان دەڵێن: ئەو بەرزکردنەوەیە مەبەست پێی بەرزکردنەوەی مەجازییە، یانێ: پلەو پایەی مەعنەوییمان بەرزکردەوە، نەك خۆی بە جەستە بەرزکرابێتەوە بۆ شوێنێکی بڵند.**

**ب- واتایەکی دیکەی ئەوەیە کە ئەو بەرزکردنەوە، بەرزکردنەوەیەکی ڕاستەقینەیە، نەك مەجازیی، واتە: بە جەستە و ڕواڵەت بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمان، کە ئەمە لە (صحيح البخاري) و(صحيح**

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين: الإصحاح:٥، ص٢٢.

مسلم)دا هاتوە، كە دوايى باسى دەكەين، هەرچەندە (محمد الطاهر بن عاشور)[1]، دەڵێ: (لكنْ حديث الإسراء لا دليلَ فيه على هذا، لأنه تحدّث عن أنبياء آخرين كذلك) واتە: فەرموودەكەی شەوڕۆ و بەرزبوونەوە، بەڵگەی لەو بارەوە تێدا نیە [كە ئیدریس بە جەستە بەرزكرابێتەوە بۆ ئاسمان، (ئاسمانی چوارەم)] چونكە لە فەرموودەكەدا باسی پێغەمبەرانی دیكەش كراوە لە ئاسمانەكانی دیكە، كەواتە: بوونی ئەوان لە ئاسمانەكانی دیكەدا چۆنە؟ هی ئیدریسیش هەروایە.

## كورتە باسێك لە بارەی ژیان و بەسەرهاتی ئیدریسەوە عليه السلام:

ئێمە لە شەش بڕگەدا بەكورتیی باسی ئیدریس عليه السلام دەكەین، چونكە بەسەرهاتی ئیدریس لە قورئاندا زۆر بە كورتیی هاتوە و، لە فەرمایشتی پێغەمبەریشدا ﷺ بەس لەو فەرموودەیەدا كە باسی شەو ڕۆ و بەرزبوونەوە دەكات، باسیكراوە كە دەفەرموێ: لە ئاسمانی چوارەم دا ئیدریس پێشوازیی لێكردم، تەنیا ئەوەندە هاتوە، شتی دیكە باسكراوە، بەڵام جێی پشت پێ بەستن نیە، ئەگەرنا لە پەیمانی كۆندا زۆر شت باسكراوە، هەرچەندە من لەو شەش بڕگەیەدا، هەندێ شتم هەر لێوە هێناوە، چونكە جۆرێك لە بەرچاو ڕوونیی تێدایە، دەربارەی ئیدریس عليه السلام، با سەلمێنراوو پشت پێ بەستراویش نەبێ، ئنجا هیچ حوكمێكی شەرعییشیان پێوە پەیوەست نیە، تاكو دەست بەستراو بین، وەك مەسەلەكانی حەڵاڵ و حەڕام.

**١)- ژمارەی ناوهێنانی ئیدریس لە قورئان دا:**

ئیدریس تەنیا دوو جاران، ناوی لە قورئاندا هاتوە:

شوێنی یەكەم: ﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِدۡرِيسَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيّٗا ﴿٥٦﴾ ﴾مريم.

شوێنی دووەم: ﴿ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِدۡرِيسَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ كُلّٞ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٨٥﴾ وَأَدۡخَلۡنَٰهُمۡ فِي رَحۡمَتِنَآۖ إِنَّهُم مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٦﴾ ﴾الأنبياء، واتە: هەروەها ئیسماعیل و ئیدریس و ذەلكیفل، هەر كامێكیان لە خۆڕاگران بوون و، خستمانە نێو بەزەیی خۆمانەوە، چونكە ئەوان لە چاكان بوون.

---

(١) التحرير والتنوير: ج١٦، ص١٣١.

**٢)- ئیدریس لە سەرچاوە مێژووییەکان دا:**

**سەرچاوە مێژووییەکان گوتوویانە:**

**ئیدریس عليه السلام لە میسر لە دایك بووە و بە (هیرمس الهَرَامِسَة)، حەکیمی حەکیمان، فەیلەسووفی فەیلەسووفان ناوی هاتوە، چونکە ئیدریس ناوی زۆر بە حەکیم ڕۆیشتوە، یانی: لێزان و کارامە و قسە نەستەق، وشەی (هیرمس)یش ناوی عەلەمە و وشەیەکی سوریانییەو لە (هیرموس)ەوە هاتوە، کە کەسێکە بیر وڕایەکی پتەوی هەبێ و پیاوێکی ئەزموونکار بێ.**

**زۆربە گوتوویانە: ئیدریس عليه السلام لە میسر لە دایك بووە و، هەر لەوێش زیاتر ژیانی بردۆتە سەر.**

**هەندێکیش گوتوویانە: لە بابل لە دایك بووەو، دوایی کۆچی کردوە بۆ میسرو، ژیانەکەی زیاتر لە میسر بردۆتە سەر.**

**شایانی باسە: لە (پەیمانی کۆن[١])دا، ناوی ئیدریس بە (خنوخ) هاتوە، کە بە عەرەبی دەبێتە: (أخنوخ)، ئنجا ئایا (أخنوخ)، یان (خنوخ) چۆن گۆڕاوە بۆ ئیدریس؟ یاخود هەر لێیان تێکچووە؟ بە تەئکید ئەوەی خوا فەرموویەتی هەر ئەوە ڕاستە(٢).**

**٣)- دەربارەی بەرزکرانەوەی ئیدریس بۆ ئاسمانی چوارەم:**

**أ)- خوا دەفەرموێ: ﴿وَرَفَعْنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ۝٥٧﴾ مريم، - (ئیدریس)مان - بۆ شوێنێکی بڵند بەرز کردەوە.**

**وەك پێشتر گوتمان: دوو ڕا هەن لەو بارەی بەرزکرانەوەی ئیدریسەوە:**

**یەك: هەندێك دەڵێن: مەبەست پێی بەرزکردنەوەی مەجازییە، واتە: پلەو پایەمان بەرزکردوە، پلەو پایەی مەعنەویی.**

**دوو: هەندێکیش گوتوویانە: بەڵکو مەبەست پێی بەرزکردنەوەی ڕاستەقینەو جەستەییە و، بۆ ئاسمانی چوارەم بە جەستەوە بەرزکراوەتەوە.**

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين: الإصحاح:٥، ص٢٢.

(٢) ئەو زانیارییانە لە (أطلس القرآن) ص (١٧)دا هاتوون، کە هی دکتۆر (شوقي أبو خليل)ە، هەروەها لە (قصص القرآن لابن كثير) ص (٦٢، ٦٣)دا هاتوون، هەروەها لە (قصص القرآن)ی (عبدالوهاب النجار) ص (٢٤ - ٢٩)دا.

ب- لە باسی (الإسراء والمعراج)، {شەورەو بەرزبوونەوە}دا، ئەم دەقە لە بارەی ئیدریسەوە هاتوە:

[ثُمَّ عَرَجَ بِنَا إِلَى السَّمَاءِ الرَّابِعَةِ، فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ ﷺ، قِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ، قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ، قَالَ: وَقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: قَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ. فَفُتِحَ لَنَا فَإِذَا أَنَا بِإِدْرِيسَ، فَرَحَّبَ وَدَعَا لِي بِخَيْرٍ، قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿ وَرَفَعْنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴿٥٧﴾ ﴾مريم] (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيّ: ٣٣٤٢، وَمُسْلِمٌ: ٤٠٩، وَالنَّسَائِيُّ: ٤٤٨، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ).

واتە: دوایی بەرزی کردنەوە بۆ ئاسمانی چوارەم، جیبریل ﷺ داوای دەروازە کردنەوەو دەرگا کرانەوەی کرد، گوترا: کێیە؟ گوتی: جیبریلم، گوترا: کێت لەگەڵە؟ گوتی: موحەممەد ﷺ، گوترا: ڕەوانەکراوە و کراوەتە پێغەمبەر؟ گوتی: ڕەوانەکراوە، دەرگامان بۆ کرایەوە، لەوێ ئیدریسم بینی سڵاوی لێکردم و بەخێری هێنام و دوعای چاکی بۆ کردم، خوای زاڵی پایە بەرزیش فەرموویەتی: ﴿ وَرَفَعْنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴿٥٧﴾ ﴾مریم، واتە: بۆ شوێنێکی بڵند بەرزمان کردەوە.

ئەمەش زیاتر پشتگیری ئەو ڕایە دەکات، کە ئیدریس وەك عیسا ﷺ بە جەستەوە بەرزکرابێتەوە بۆ ئاسمان و، دیارە ئیدریس لە ئاسمانی چوارەمە، بەڵام واتایەکەی دیکەش هەر دەگەیەنێ، کە مەبەست بەرزکرانەوەی پلەو پایەی بێ، واتە: بەرزکرانەوەی مەعنەویی.

## ٤)- چەند تیشکێکی دیکە بۆ سەر کەسایەتیی ئیدریس ﷺ :

یەك: لە بارەی ئیدریسەوە ئەمەش هاتوە کە گوتراوە: (وكان أول بني آدم أعطي النبوة، بعد آدم وشيث عليهم السلام)[1]، واتە: (ئیدریس) یەکەمین وەچەی ئادەم بووە، لە دوای ئادەم و شیث، پلەی پێغەمبەرایەتیی پێدراوە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ).

دوو: هەروەها لەو بارەوە ئەمەش هاتوە: (وَذَكَرَ ابْنُ إِسْحَاقَ: أَنَّهُ أَوَّلَ مَنْ خطَّ بِالْقَلَمِ)[2].

واتە: (إبن إسحاق) باسی کردوە کە (ئیدریس) یەکەمین کەس بووە بەقەڵەم نووسیویەتی.

سێ: هەروەها لەو بارەوە ئەمەش هاتوە: (أَدْرَكَ مِنْ حَيَاةِ آدَمَ ثلاثمائة وثماني سنين) واتە: ئیدریس لەگەڵ ئادەمدا سێیسەدو هەشت (٣٠٨) ساڵ ژیاوە.

---

(١) أخرجه ابن سعد في الطبقات الكبرى، ج١، ص١٦، عن ابن عباس رضي الله عنهما.

(٢) (قصص الأنبياء) ابن كثير، ص ٦٢.

دیاره دەبێ ئیدریس لە دوای ئادەمیش تەمەنێکی گوزەراند بێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە (٣٠٨) ساڵی تەمەنی لەگەڵ باپیرەی ئادەمدا بەڕێکردوە، ئەمەش هەر لە: (قصص الأنبياء)ی (إبن كثير)[1]دا هاتوە، ئنجا ئەوان لە کوێوە هێناویانە؟ زیاتر واپێدەچێ لە پەیمانی کۆنەوە و لە کتێبەکانی دیکەی خاوەن کتێبەکانەوە هێنابیان.

**٥)- چەند حیکمەتێکی ئیدریس:**

ئیدریس ﷺ کە بە (هيرمس الهرامسة)، یانی: حەکیم و قسە نەستەق و قسە زان و کارزان ناودار بووە، لە هەندێك کتێب و سەرچاوان دا، زۆر لە حیکمەتەکانی گێڕدرانەوە، کە من حەوتیانم لێ گوڵبژێر کردوون:

١-(**لن يستطيع أحد أن يشكر الله على نِعَمِهِ بِمثل الإنعام على خلقه**)، واته: هیچ کەس ناتوانێ سوپاسگوزاریی خوا لەسەر چاکەکانی بکات، وەك بە چاکە کردن لەگەڵ دروستکراوەکانی دا، سوپاسی دەکات، واته: ئەگەر مرۆڤ چاکە لەگەڵ خەڵکی خوادا بکات، ئەوە باشترین سوپاسگوزارییە بۆ چاکەکانی خوا.

بەڕاستیی قسەیەکی زۆر نەستەق و بەجێیە.

٢- (**إذا دعوتم الله فأخلصوا النية**) واته: هەر کاتێك لە خوا پاڕانەوە، دڵی خۆتان ساغ بکەنەوە، یانی: خڵتە بەدڵتانەوە مەهێڵن، بە ساغیی و پاکیی و چاکیی لە خوا بپاڕێنەوە.

ئەمە لە فەرمایشتی پێغەمبەریشدا ﷺ هاتوە: {**أُدْعُوا اللَّهَ وَأَنْتُمْ مُوقِنُونَ بِالْإِجَابَةِ**} (**أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ: ٣٤٧٩ عَن أَبِي هُرَيْرَةَ، وَحَسَّنَهُ الألبَانِي**).

واته: لە خوا بپاڕێنەوە کاتێك کە دڵنیان لەوەی وەڵامتان دەدرێتەوە.

هەڵبەتە (وەڵامتان دەدرێتەوە) مەرج نیە ئێستا کارەکەت بۆ جێبەجێ بکرێ، بەڵام خوا داوایەکەت وەردەگرێ، ئنجا چیت بۆ دەکات؟ خوا خۆی دەزانێ، چونکە ئەوەی ئەو بۆ تۆی دەزانێ، تۆ بۆ خۆتی نازانی، وەك لە تەفسیری سوورەتی (**الأعراف**)دا بە درێژیی دەربارەی پاڕانەوەو، چۆنیەتی گیرابوونی پاڕانەوە لەلای خواو، چۆنیەتی وەڵامدانەوەی خوا بۆ پاڕانەوەی بەندەکانی، لەو بارەوە قسەمان کردوە.

٣- (**حَيَاةُ النَّفْسِ: الحِكْمَةُ**) واته: ژیانی ڕووح: حیکمەتە، هەندێکیان ئاوایان حیکمەت پێناسە کردوە: (**إدراك الحقائق والتحلي بها**) واته: دەرککردنی ڕاستییەکان و خۆ پێ ڕازاندنەوەیان.

---

(١) قصص الأنبياء، ابن كثير، ص ٦٢.

ئا ئەوە ژیانی ڕووحە و، ڕووح بە حیکمەتەوە دەژی.

٤- **(لا تحسدوا النّاس على مؤاتاة الحظ، فَإِنَّ استمتاعهم بِهِ قَلِيل)** واتە: حەسوودیی بە خەڵك مەبەن لەسەر ئەوەی خۆش بەختن، [واتە: چونکە لە ڕووی ژیان و گوزەرانی دنیاییەوە لە خۆشگوزەرانی دان، حەسوودییان پێمەبەن] چونکە بەهرەمەند بوونیان لە ژیان و گوزەرانی خۆش، شتێکی زۆر کەمە و، شایستەی ئەوە نیە حەسوودییان پێ ببرێ.

٥- **(مَنْ تَجَاوَزَ الكَفَافَ لَمْ يُغْنِهِ شيءٌ)** واتە: هەر کەسێك بە شتێك کە بەشی دەکات و بەسیەتی، پێی ڕازی نەبێ، هیچ شتێك تێری ناکات.

یانی: ئەگەر تۆ ئەو ئەندازەیەت هەبوو کە پێی بژی، بەڵام بەوە قەناعەتت نەکرد، لەوە تێپەڕی، تازە بە هیچ شتێك چاوت پڕنابێ.

٦- **(إملأوا أفواهكم بحمدالله)** واتە: زاری خۆتان پڕبکەن لە ستایشکردنی خوا.

یانی: هەمیشە ستایشی خوا بکەن و مەدح و سەنای بکەن.

٧- **(خَيْرُ الدُّنيَا حَسْرَةٌ، وَشَرُّهَا نَدَمٌ)** واتە: خۆشیی دنیا خەم و خەفەتی بەدواوەیە و، ناخۆشیی و ناڕەحەتیی دنیاش، پەشێمانیی بەدواوەیە[1].

**٦)- تەمەن و کۆچی دوایی ئیدریس:**

لە قورئاندا ئاماژەی پێنەکراوە ئیدریس ﷺ تەمەنی چەند بووە! هەروەها لە فەرمایشتی پێغەمبەردا نەهاتوە، بەڵام وەك پێشتر گوتمان: لە پەیمانی کۆندا ئیدریس بە (خنوخ) یان (أخنوخ) هاتوە، ئنجا لەو بارەوە ئەم دەقە هاتوە، کە تەمەنی چەند بووە، دەڵێ:

**(وكان عمر أخنوخ خمساً وستين سنة عندما أنجب (متوشالح) ثم عاش أخنوخ بعد ذلك ثلاثمائة سنة، سار فيها مع الله، وولد له بنون وبنات، وكانت كل أيام أخنوخ ثلاثمائة وخمساً وستين سنة، و سار أخنوخ مع الله ثم توارى عن الوجود، لأن الله نَقَلَهُ إِلَيْه)**[2].

---

(١) ئەمە هەمووی لە (أطلس القرآن)ی دکتور (شوقي أبو خليل) لە لاپەڕە (١٧)دا، و هەندێکیان لە (قصص الأنبياء)ی (عبدالوهاب النجار) لەلاپەڕە (٢٨)دا هاتوون.

(٢) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح: ٥، ص٢٢.

واتـە: (أخنوخ) {یـانی: ئیدریـس} لـە کاتێکـدا (متوشالح)ی بـوو {کـە دەکاتـە باپیـری (نـوح)} تەمـەنی (٦٥) سـاڵ بـوو، دوای ئـەوەش (أخنـوخ) سـێ سـەد سـاڵی دیکـە ژیـاو لـە خزمـەت خـوادا ڕۆیشـت و، لـەو ماوەیـەدا کـوڕان و کچـانی زۆری بـوون، هەمـوو ڕۆژەکانی تەمـەنی (أخنـوخ) {هەمـوو ماوەکـەی} سێسـەدو شەسـت و پێنـج (٣٦٥) سـاڵ بـوو، دوایـی (أخنوخ) لـە خزمـەت خـوادا ڕۆیشـت و لـە بـوون پەنهـان بـوو {واتـە: لـەم بوونـە دنیاییـە} چونکـە خـوا بـۆ لای خـۆی گواسـتیەوە.

ئەمـەش پشـتگیریی ئـەو ڕایـە دەکات کـە ئیدریـس بـە جەسـتەوە، خـوا بردوویـەتی بـۆ ئاسـمانی چـوارەم، لێـرەش دەڵێـن: (لأن اللـه نقلـه إليـه) خـوا بـۆ لای خـۆی گواسـتیەوە، کـەوا پێدەچێ مەبەسـت پێـی بەرزکرانـەوەی بـێ بـە جەسـتەو ڕووحـەوە، هەرچەنـدە دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی ڕووحەکـەی بـێ، کـە بـۆ لای خـوا گوازراوەتـەوە، بـەڵام ئەگـەر وابـێ، ئـەو کاتە ئـەوە تایبـەت نیـە بـە ئیدریسـەوە، چونکـە پێغەمبـەرانی دیکـەش (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَمُ) خـوا ڕووحەکەیـانی هـەر گواسـتۆتەوە بـۆ لای خـۆی، بـۆ بەهەشـت، بـۆ سـەرێ، بگـرە سـەرجەم بڕوادارانیـش بـە هەمـان شـێوە، بۆیـە مانـای یەکـەم بەهێزتـر و پەسـندترە.

**مەسەلەی چوارەم:**

**پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) هەموویان لەلایەن خواوە چاکە لەگەڵ کراون و، هەمووشیان وەچەی ئادەم و، وەچەی ئەوانەن کە لە کەشتییەکەی نووح دا سوارکرابوون و، لە وەچەی ئیبراهیم و ئیسرائیلن و، لە ڕێنماییکراوان و هەڵبژێردراوانن و، عادەتیان وابووە: لە کاتی گوێ بیست بوونی ئایەتەکانی خوادا، بە گریانەوە کڕنووشیان بردوە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنۡ حَمَلۡنَا مَعَ نُوحٖ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡرَٰٓءِيلَ وَمِمَّنۡ هَدَيۡنَا وَٱجۡتَبَيۡنَآۚ إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُ ٱلرَّحۡمَٰنِ خَرُّواْۤ سُجَّدٗاۤ وَبُكِيّٗا ﴿٥٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم ﴾، ئا ئەوانە کەسانێکن کە خوا چاکەی لەگەڵ دا کردوون.

بێگومان خوا چاکەی لەگەڵ هەموو بەندەکانی دا کردوە، بەڵام نیعمەت بە ڕەهایی کاتێک باس دەکرێ، بە پێی بنچینەی: (الْمُتَبَادِرُ إِلى الذِّهنِ عند ذكر شيءٍ، هُوَ الفَرْدُ الكَامِلُ) ئەوە بنچینەیەکی شەرعیی و بنچینەیەکی عەقڵییشە:

لە کاتێکدا کە شتێك باسدەکرێ، ئەوەیان کە لە هەمووان تەواوترە، ئەو دێتە نێو زەینەوە، کە باسی نیعمەت دەکرێ، نیعمەتی ڕەها نیعمەتی پێغەمبەرایەتییە، گەورەترین نیعمەت لە ژیانی مرۆڤەکاندا، پلەو پایەی پێغەمبەرایەتییە، بۆیە کە دەفەرمووێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم ﴾، ئا ئەوانە کەسانێکن کە خوا چاکەی تایبەتیی لەگەڵدا کردوون، واتە: پلەی پێغەمبەرایەتیی پێ بەخشیون.

**٢)- ﴿ مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾، لە پێغەمبەران، هەڵبەتە ئەم (مِن)ە، (بيانيَّة)یەو، (مِنْ)ی (تبعيضية) نیە، چونکە ئەوانەی باسکراون، هەموویان پێغەمبەر بوون، خوێنراویشەتەوە: (من النبيئين) هەردووك خوێندنەوەکەش یەك واتایان هەیە، واتە: هەواڵدەران، یان: هەواڵپێدراوان، کەسانێك کە بەناوی خواوە هەواڵدەدەن، یان لەلایەن خواوە هەواڵیان پێدەدرێ.**

**٣)- ﴿ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ ﴾، {ئەوانە هەمووشیان} لە وەچەی ئادەم بوون.**

٤)- ﴿ وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ ﴾، هەروەها لە وەچەی ئەوانە بوون کە لەگەڵ نووحدا هەڵمانگرتن، لە وانەی کە سواری کەشتییەکەمان کردن، چونکە لە دوای تۆفانی نووح، ئەوەندە مرۆڤەی مانەوە، هەموویان لە وەچەی ئەوانە بوون، کە لە گەڵ نووحدا سوارکراون، ئنجا ئەوانەش کە لەگەڵ نووحدا سواری کەشتییەکە بوون، هەموویان خزم و نیزیکانی بوون، کوڕان و کچان و نەوەکانی وی بوون، وەك لە سوورەتی (الصافات)دا دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴿٧٧﴾ ﴾، واتە: تەنیا وەچەکەی ویمان هێشتەوە.

٥)- ﴿ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْرَٰٓءِيلَ ﴾، هەروەها ئەو پێغەمبەرانە لە وەچەی ئیبراهیم و ئیسرائیل بوون، (ئیسرائیل)یش نازناوی یەعقووبە.

٦)- ﴿ وَمِمَّنْ هَدَيْنَا وَٱجْتَبَيْنَآ ﴾، هەروەها ئەو پێغەمبەرانە، ئەوانە بوون، کە خستمانە سەر ڕاستە ڕێ و هەڵمانبژاردن.

ئنجا ئایا ئەوانە چۆن بوون؟

٧)- ﴿ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُ ٱلرَّحْمَٰنِ ﴾، کاتێك کە ئایەتەکانی (خوای) میهرەبانیان بەسەردا دەخوێنرانەوە.

٨)- ﴿ خَرُّوا۟ سُجَّدًا وَبُكِيًّا ﴾، لەپەو ڕوو بە کڕنووشدا دەکەوتن بە گریانەوە، (سُجَّد: جمع سَاجد)، (بُكِيّ: جمع باكِي)، (سُجَّد) کۆی (ساجِد)ە، واتە: کڕنووش بردوو، (بكِي)یش کۆی (باكِي)ە، واتە: گریاو.

کەواتـە: لێرەدا خـوا ﷻ پێناسـەی پێغەمبـەران دەکات، هـەم لـە ڕووی نەسـەبەوە، هەم لە ڕووی حەسـەبەوە، یـانی: هـەم لـە ڕووی ڕەچەڵەکـەوە، هـەم لـە ڕووی سیفەتە بـەرز و ئـاکارە پەسـندەکانیانەوە، ئێرەش یەکێکـە لـە شـوێنەکانی کڕنـووش تێـدا بـردنی قورئـان خوێنـدن، کـە ئێمـە لـە کۆتایـی سـوورەتی (الأعـراف)دا، بـە تەفسیـل باسـێکمان دەربـارەی ئـەو ئایەتانـە کـرد، کـە سـەجدەی قورئـان خوێندنیـان تێـدا دەبـردرێ و، مشـت و مـڕ و ڕاجیایـی زانایانمـان لـەو بـارەوە باسـکردوە.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**باسی لەوە کە پاشینێکی خراپ، کە نوێژ چوێنەر و شوێنکەوتووی ئارەزوو بوون، بوونە جێگرەوەی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) کە سەرەنجامیان بێ مرادییە، جگە لەوانەی کە بە ئیمان و کردەوەی باشەوە، دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا، کە شوێنیان بەهەشتانێکی هەمیشەییە، قسەی پووچیان تێدا نابیستن و، بە هۆی پارێزکارییەوەش، شایستەی ئەو میراتەن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا ﴿٥٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا ﴿٦٠﴾ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ عِبَادَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ إِنَّهُۥ كَانَ وَعۡدُهُۥ مَأۡتِيّٗا ﴿٦١﴾ لَّا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوًا إِلَّا سَلَٰمٗاۖ وَلَهُمۡ رِزۡقُهُمۡ فِيهَا بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ﴿٦٢﴾ تِلۡكَ ٱلۡجَنَّةُ ٱلَّتِي نُورِثُ مِنۡ عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيّٗا ﴿٦٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

**١)- ﴿ فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ ﴾، لە دوای وان پاشینێکی خراپ جێی گرتنەوە.**

**(الخَلْفُ: عَقِبُ السُّوءِ، وبفتح اللام «خَلَف» عَقِبُ الخَيْرِ)، وشەی (خَلْف) بە زەنئە (سکون) واتە: پاشینی خراپ، بەڵام (خَلَف) واتە: پاشینی چاك، جێگرەوەی خراپ و، جێگرەوەی چاك، بەڵام (خَلْف) بە مانای پشتەوەش دێ، کە پێچەوانەی پێشەوە (أمام)یە، بەڵام لێرەدا (خَلْف) واتە: کەسێك کە لە پشتەوەیەو بەجێماوە لە ڕووی پلەو پایەوە، نەك لە ڕووی شوێنەوە، ئنجا ئایا ئەوانە چۆن بوون، ئەو پاشینە خراپە؟ خراپترین سیفەتیان دەخاتەڕوو:**

**٢)- ﴿ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِ ﴾، نوێژیان چواندو، شوێن ئارەزووان کەوتن.**

**نوێژیان فەرامۆش دەکرد و، دەکەوتنە شوێن ئارەزووان.**

**(الإضَاعَةُ: مَجَازٌ فِي التَّفْرِيط)، واتە: کەمتەرخەمییان دەکرد لە نوێژەکانیان دا، بێگومان نوێژ چواندن و، شوێن ئارەزوو کەوتن، دوو شتی پێکەوە پەیوەستن، کەسێك شوێن**

تـارەزووان بکـەوێ، ناتوانــێ نوێــژەکانی بپارێــزێ، هەروەهــا کەسـێك نوێــژەکانی بچوێنـێ، شـەیتان زەفـەری پێدەبـات و، دوای تـارەزووەکانی خـۆی، یـان هـی غەیـری خـۆی، دەخـات.

٣)- ﴿ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا ﴾، بە دڵنیایی دووچاری بێمرادیی دەبن، (الغَيُّ: الشَّرُّ) خراپەکاریی، خراپە، سەرەنجامی خراپ، دەگوترێ: (غَوَى: أَي فَسَدَ عَيْشُهُ) وەك (راغب الأصفهاني) گوتوویەتی، یانی: ژیانی تێکچوو، ژین تاڵ بوو.

(الزمخـشري) گوتوویـەتی: (كل شَرٍّ عنـد العـرب: غَـيٌّ، وكل خـيرٍ: رَشـادٌ) واتـە: هەمـوو زیـان و خراپەیـەك لـەلای عەرەبـان بـە (غـيٌّ) دادەنـرێ و، هەمـوو سـوود و چاکەیەکیـش بـە (رشـاد) دادەنـرێ، لـە شـیعرێکیش دا هاتـوە:

فَمَنْ يلق خيراً يحمد الناسُ أمره     ومَنْ يَغْوَ لا يَعْدَمُ على الغَيِّ لائماً

واتـە: هەرکـەس خێـرو چاکـەی تـووش بـێ، خەڵـك سـتایشی حاڵـی دەکات و، هەرکـەس خراپـەی بێتـەرێ، کەسـێك هەردەبـێ سـەرکۆنەی بـکات.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا ﴾، کـە بـە کرداری (مضـارع) هێناویەتی و (سـوف) شی لەگەڵدایـە، ئەمـە ئـەوە دەگەیەنـێ، کـە دووچاربـوونی بێمرادیـی و ژیـن تاڵیـی و بـێ حاڵیـی، دووبـارە دەبێتـەوە و، هـەر کەسێك و، هـەر جیلێـك لەوانـە، کـە شـوێن و جێـی پێغەمبەرانیـان (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) گرتۆتـەوە، نوێـژی چوانـدو، یاخـود: فەرامۆشـکردو، شـوێن ئـارەزووان کـەوت، بەدڵنیایـی تـووشی ژیـن تاڵیـی و بـێ حاڵیـی دەبێ.

٤)- ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ﴾، مەگەر کەسێك بگەڕێتەوە و ئیمان بێنێ و کردەوەی باشیش بکات.

کەسـێك بگەڕێتـەوە بـۆ لای خـوا، بـە ئیـمان هێنـان و کـردەوەی باشـەوە، یـانی: لـە خراپـە بگەڕێتـەوە و دەسـتبەرداری ببـێ و، کاری چـاك بـکات.

٥)- ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ ﴾، ئا ئەوانە دەچنە بەهەشت، یانی: کەسانی بەوجۆرە شایستەی چوونە بەهەشتن و، ئەوەی وانەبێ با بەهیوای بەهەشت نەبێ.

٦)- ﴿ وَلَا يُظْلَمُونَ شَيْـًٔا ﴾، هیچیان لێ کەم ناکرێتەوە و هیچیان لێ داناشکێت لە پاداشتیان.

(شـيئاً: فِي سِـياقِ النَّفِـي، يُفِيـدُ نَفِـيَ كُلِّ فَـرْدٍ مِـنْ أَفْـرَادِ النَّقْـصِ وَالإِجْحَـافِ)، ﴿ وَلَا يُظْلَمُونَ شَيْـًٔا ﴾، واتـە: (شَـيْئاً مِّنَ الظُّلْـمِ)، (شـيئاً) کـە لـە ڕەوتـی لابـردن (سـياق النفـي)دا هاتـوە، ئـەوە

دەگەیەنێ کە: هیچ کام لە تاکەکانی کەمکردنەوەو نادیدەگرتن، ڕوو لەوان ناکات، کە لە پاداشت و لە قەرەبووی کردەوەکانیان دابشکێنرێ.

**نوکتەیەکی ڕەوانبێژیی:**

(الخطیب الإسكافي) لە (دُرَّةُ التنزيل وَغُرَّة التأويل)ەکەی[1] خۆیدا بەراوردێك دەکات، لە نێوان ئەم ئایەتەی ئێرە، کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ﴿٦٠﴾ ﴾مریم، لەگەڵ ئەو ئایەتەی سوورەتی (الفرقان)دا، کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا ﴿٧٠﴾ ﴾:

لێرە دەفەرموێ: ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ ﴿٦٠﴾ ﴾مريم.

لەوێ دەفەرموێ: ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ﴿٧٠﴾ ﴾الفرقان.

ئنجا ئایا حیکمەتی ئەو جیاوازییە چییە؟!

وەڵام/ دەڵێ: هۆکارەکەی ئەوەیە کە لە سوورەتی (مریم)دا، بە کورتیی باسی گوناهەکان کراوە، چونکە تەنیا دەفەرموێ: ﴿ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِ ﴿٥٩﴾ ﴾مریم، تەنیا دوو سەرپێچیی و تاوانی لەسەر تۆمارکردوون: نوێژ زایەکردن (نوێژ چواندن) و، شوێن ئارەزووان کەوتن، بەڵام لە سوورەتی (الفرقان)دا، بە درێژیی باسی گوناهەکان کراوە، پێشێ باسی (عباد الرحمن) دەکات، دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ ﴾الفرقان، چەند گوناهێك باس دەکات: شیرك باس دەکات، قەتڵ باس دەکات، زینا باس دەکات، ئنجا مادام لەوێ بە درێژیی باسی گوناهەکان کراوە، بۆیە لێرەش بە تەفسیل باسی چۆنیەتی گەڕانەوەکەیان کراوە، واتە: درێژ لە بەرانبەر درێژدا، بەڵام لە سوورەتی (مریم)دا، بە کورتیی باسی گوناهەکانیان کراوە و، بە کورتییش باسی چۆنیەتی گەڕانەوەکەیان کراوە، کورت لە بەرانبەر کورت دا.

٧)- ﴿ جَنَّٰتِ عَدْنٍ ٱلَّتِي وَعَدَ ٱلرَّحْمَٰنُ عِبَادَهُۥ بِٱلْغَيْبِ ﴾، ئەو باغە هەمیشەییانەی کە (خوای) میهرەبان و خاوەن بەزەیی، بە پەنامەکیی بەڵێنی پێبەخشرانیانی بە بەندەکانی داوە.

بە پەنامەکیی (بالغیب).

---

(١) ص ٢٠١، ٢٠٢.

لێرەدا سێ مانایان هەڵدەگرێ:

أ- کاتێك کە بەهەشتەکان نادیارن لێیان.

ب- لە کاتێکدا کە ئەوان ئاگایان لێ نەبووە و، بە نسبەت ئەوانەوە پەنهان بووە، خوا ئەو بەڵێنەی پێداون.

ج- بەهۆی ئیمان هێنانیان بە پەنهان و نادیارەوە، خوا بەڵێنی ئەو بەهەشتانەی پێداون، پێشێ دەفەرموێ: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ ﴿٦٠﴾﴾مریم، بەڵام دوایی دەفەرموێ: ﴿جَنَّٰتِ ﴿٦١﴾﴾مریم، کە دیارە (جنات) جێگرەوە (بدل)ی (جنة)یە و لە شوێنی دادەنیشێ، لەبەرئەوەی ئەو باغە، ئەگەر لە دوورەوە تەماشای بکەی، وەك یەك باغ دێتە بەرچاو، بەڵام کە دەچیە نێوی، دەبینی: چەندان باغ و بێستان و گوڵ و گوڵزارن.

٨)- ﴿إِنَّهُۥ كَانَ وَعْدُهُۥ مَأْتِيًّا﴾، بە دڵنیایی بەڵێنی خوا، هێنراوە.

(آتِـي) واتـە: کەسێك کـە دێ، (مَـأْتِي) واتـە: کەسێك کـە خەڵـکی بـۆ لا دێ، شـوێنێك کـە خەڵـکی بـۆ لا دێ، (الوَعْـدُ: مَصْـدَرٌ مُسْـتَعْمَلٌ فِي مَعْنَـى المفعُـول)، ﴿إِنَّهُۥ كَانَ وَعْدُهُۥ﴾، (وَعْـدُهُ) واتـە: (مَوْعـودُه)، بەڵێـن (وعـد) چاوگـە، بـەڵام لـە شـوێنی بـەرکار (مفعـول بـه) دانیشـتوە، واتـە: بەڵێندراوەکـە، گفتدراوەکـەی خـوا دێ، (مـأتِي: الَّـذِي يَأتيـهِ غَـيْرُهُ) جگەلـە خـۆی دێتـە لای، واتـە: بـە دڵنیایـی ئـەو بەڵێـن پێـدراوەی خـوای پـەروەردگار، ئەوانـەی کـە بەڵێنیـان پێـدراوە، دێـن بـۆ لای و پێـی شـاد دەبـن.

٩)- ﴿لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا﴾، قسەی پووچی تێدا نابیستن.

(اللَّغْـو: فُضُـولُ الـكَلَامِ ومَـا لَاطَائِـلَ تَحْتَـهُ) (لغـو) قسـەی زیـادو، قسـەیەك بـێ سـوود بـێ، یـانی: لـە بەهەشـتێ دا قسـەی بـێ سـوودو پووچـی تێـدا نابیسـتن.

١٠)- ﴿إِلَّا سَلَٰمًا﴾، تەنیا سەلامی تێدا دەبیستن.

سـەلام کـە هەڵاوێـردراوە لـە (لَغـو)، ئەمـە پێـی دەگوتـرێ: هـەڵاواردنی دابـڕاو (إسـتثناء منقطـع)، چونکـە سـەلام، چ مەبەسـت پێـی قسـەی سـەلامەتیی بـێ، چ مەبەسـت پێـی سڵاوکردن بێ، بەشێك نیـە لـە قسـەی پـووچ، ئنجا کاتێـك کـە هەڵاوێـردراو و لـێ هەڵاوێردراو (مُسْـتَثْنَى ومُسْـتَثْنَى مِنْـهُ)، یـەك جینـس نەبـوون، ئـەوە پێـی دەگوتـرێ: (الإسـتثناء المنقطـع) واتە: هـەڵاواردنی لێـك دابـڕاو، بـەڵام ئەگـەر یـەك جـۆر بـوون، ئـەو کاتـە پێـی دەگوتـرێ: (الإسْـتِثْنَاءُ المتَّصِـل)، واتـە: هـەڵاواردنی پەیوەسـت.

دەشکونجێ لێرەدا (إلاَّ) بە مانای (لكن) بێ: ﴿ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا إِلَّا سَلَٰمًا ﴾، یانی: (لَكِنْ يَسْمَعُونَ سَلاَمًا)، قسەی پووچی تێدا نابیستن، بەڵام سڵاوی تێدا دەبیستن، یاخود: بەس قسەی سەلامەتی تێدا دەبیستن، چونکە سەلام:

أ- دەگونجێ بە مانای: سڵاوکردن (تحية) بێ.

ب- دەشکونجێ بە مانای قسەیەکی سەلامەت و بێ زیان بێ (قولٌ ذو سلامة).

ئەگەر مەبەست لە (سلاماً) سڵاوکردن بێ، ئەوە چوار مانای هەن:

١- سڵاوکردنی فریشتان لێیان: ﴿ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ فَنِعْمَ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٤﴾ ﴾ الرعد.

٢- سڵاوکردنی هەندێکیان لە هەندێکیان: ﴿ دَعْوَىٰهُمْ فِيهَا سُبْحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ أَنِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠﴾ ﴾ يونس.

٣- سڵاوکردنی خوای بەرز ومەزن لێیان: ﴿ سَلَٰمٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ ﴿٥٨﴾ ﴾ يس.

٤- ئەو سڵاوکردنانە هەرسێکیان پێکەوە و لەیەك كات دا.

١١)- ﴿ وَلَهُمْ رِزْقُهُمْ فِيهَا بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴾، هەروەها بژیوی خۆیانیان لەوێدا هەیە، بەیانیان و ئێواران.

(بُكْرَةً) بە نیوەی یەکەمی ڕۆژ دەگوترێ، و (وَعَشِيًّا) بە نیوەی دووەمی دەگوترێ، واتە: بەردەوام و بێ پسانەوە بژیویان لەوێدا هەیە.

١٢)- ﴿ تِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِى نُورِثُ مِنْ عِبَادِنَا ﴾، ئا ئەو بەهەشتەیە کە دەیکەینە میراتی ئەو بەندانەمان کە پارێزکارن، یانی: هەر کام لە بەندەکانمان پارێزکار بێ، ئەو بەهەشتە دەکەینە میراتی، هەروەها ئەوانیش دەکەینە میراتگری ئەو بەهەشتە.

(نُورِثُ) خوێنراویشەتەوە: (نُوَرِّثُ)، هەر یەك واتایان هەیە، (أَوْرَثَه) و (وَرَّثَه) واتە: ئەم بەهەشتە دەکەینە میراتی کەسێك کە پارێزکار بێ.

پێشتریش زۆرجاران باسمان کردوە، کە حیکمەتی بەکارهێنانی وشەی (أورثنا) و (نُورِثُ) لە جیاتی (أعطينا) و (نُعطي) ئەوەیە کە خاوەندارێتیی میرات زۆر بەهێزە، هەروەها بەهەشت لە چاو کردەوە باشەکانی بڕواداران، یەکجار گەورە و مەزنە و، هەروەك بەهەشتیان بە بەلاش چنگ کەوتبێ!

١٣)- ﴿ مَن كَانَ تَقِيًّا ﴾، هەر کەسێك پارێزکار بێ، لێرەدا ئەسڵی عیبارەتەکە بەم شێوەیە: (نُوْرِثُ مَنْ كَانَ تَقِيَّاً مِنْ عِبَادِنَا تِلْكَ الْجَنَّةَ)، ئا ئەو بەهەشتە دەکەینە میراتی هەر کام لە بەندەکانمان، کە پارێزکار بێ، بەڵام لە ئایەتەکەدا ئەوەی کە زیاتر جێی بایەخ پێدرانە، پێشخراوە، کە بریتیە لە بەهەشتەکان: ﴿ تِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِى نُورِثُ مِنْ عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيًّا ﴾، بۆیە تەعبیرەکە واهاتوە.

مەسەلەی شەشەم:

گێڕانەوەی قسەی جیبریل و فریشتەکان کە بە فەرمانی خوا نەبێ دانابەزن و، خوا لە هەموو شتێکیان ئاگادارە و، داهاتوو و ڕابردوو و ئێستایان - کە لە نێوان داهاتوو و ڕابردوو دایە - هی ویە و، پێویستە هەر خۆیشی بپەرسترێ، چونکە هیچ هاوناو و هاوتای نیە.

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُۥ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَٰلِكَ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا فَٱعْبُدْهُ وَٱصْطَبِرْ لِعِبَٰدَتِهِۦ هَلْ تَعْلَمُ لَهُۥ سَمِيًّا ﴿٦٥﴾ ﴾.

## توێژینەوەی ئەو ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ ﴾، ئێمە بە فەرمانی پەروەردگارت نەبێ دانابەزین.

ئێمە لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا، ئەم دەقەمان هێنا لەبارەی ئەم ئایەتەوە:

(عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِجِبْرِيلَ: مَا يَمْنَعُكَ أَنْ تَزُورَنَا أَكْثَرَ مِمَّا تَزُورُنَا؟ فَنَزَلَتْ: ﴿ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُۥ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَٰلِكَ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾ ﴾)، (أخرجهُ أحمد: ٢٠٤٣، والبخاري: ٣٢١٨ ، والترمذي: ٣١٥٨).

واتە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و لە بابی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە جیبریلی فەرموو: چ شتێك ڕێت لێدەگرێ، کە زیاتر لەوەی سەردانمان دەکەی، سەردانمان بکەی؟ ئنجا ئەم ئایەتە دابەزی، کە خوا ﷻ لە جیاتی جیبریل و فریشتەکان، وەڵامی پێغەمبەر ﷺی دایەوە، دەفەرموێ: ئێمە بە فەرمانی پەروەردگارت نەبێ دانابەزین، ئەوەی لە پێشمان و ئەوەی لە دوامانەوەیە و ئەوەی لە نێوانیاندا هەیە، هەر هەمووی

هی خوایە و، پەروەردگارت هیچ شتێکی لەبیرناچێ، (لەبیرچوو و فەرامۆشکار نیە بۆ هیچ شتێك).

بەڵام واتایەکی دیکەشیان بۆ ئەم ڕستەیە لێکداوەتەوە، ئەویش ئەوەیە کە ئەمە هەمووی تەواوکەری قسەی بەهەشتییەکانە، چونکە لە ئایەتی پێشەوەدا بەهەشتییەکان قسە دەکەن، دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا إِلَّا سَلَٰمًا ۖ وَلَهُمْ رِزْقُهُمْ فِيهَا بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿٦٢﴾ تِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِى نُورِثُ مِنْ عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيًّا ﴿٦٣﴾ ﴾مريم.

ئنجا دوایی بەهەشتییەکان دەڵێن: ﴿ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ ۖ لَهُۥ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَٰلِكَ ۚ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾ ﴾مريم، واتە: ئێمە نایەینە خوار لەو بەهەشتانە، لە پێکە بەرزەکان بەرەو خوار و، هاموشۆ ناکەین لە بەهەشتدا، مەگەر بە فەرمانی پەروەردگارت، چونکە ئەوەی لە پێشمانەو ئەوەی لە دوامانەوەیە و ئەوەی لەو بەینەدا هەیە، هەمووی هی خوایە و پەروەردگارت هیچ شتێك فەرامۆش ناکات و، هەرچی کە ئێمە دڵمان ویستوویەتی، بۆی ڕەخساندووین لەو بەهەشتانەدا و ئێمە هەموو هەڵسوکەوت و جموجۆڵەکانیشمان بە فەرمانی خوان، لە بەهەشتدا.

بەڵام واتای یەکەمی زیاتر پێدەچێ.

وشەی (تَنَزُّل)یش هاوواتای (نزول)ەو لێیەوە نزیکە، بەڵام (تَنَزُّل) کارێکە کە بە تەکەللوفەوە دەکرێ، ئەویش لەبەرئەوەیە:

أ- فریشتەکان کاتێك کە دادەبەزێنرێن بۆ لای پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، دەبێ لەو حاڵەتە ئاساییەی خۆیان کە حاڵەتی فریشتەییە، بێنەدەر، ئەگەر بیانەوێ ببینرێن و بەرجەستە بن لە حاڵەتی مرۆڤێکدا.

ب- یاخود مەبەست ئەوەیە کە ئەوان بە پێی سروشتی خۆیان، پێیان خۆشە هەر لە سەرێ بن، لەو شوێنەی کە خوا بۆی دیاریکردوون و نەیەنە سەر زەوی و، کاتێك دێنە سەر زەوی، پێویست بە زۆر لە خۆکردن (تکلُّف) دەکات و دەبێ خۆیان ئەزیەت بدەن، لە سروشتی خۆیان و لە مەنزڵگای سروشتی خۆیان، دوور بکەونەوە بۆیە ئەو تەعبیرە بەکارهاتوە.

٢)- ﴿ لَهُۥ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَٰلِكَ ﴾، (لَهُ مَا بَيْنَ أَيْدِيْنَا) یانی: ئەوەی لە پێشمانەوەیە هی ویە، (وما خلفنا) ئەوەی لە دواشمانەوەیە، هی ویە، (ومابين ذلك) ئەوەی دەکەوێتە نێوان ئەوە

شەوە، دەگونجێ ئەمە لە ڕووی شوێنەوەبێ واتە: ئەوەی کە لە پێشەوەمانەوە، ئەوەی لە پشتمانەوەیە و، ئەوەی لە نێوانیشیان دایە، هەمووی هی خوایە، ڕاست و چەپ و باکوور و باشوور و...

دەشگونجێ لە ڕووی کاتەوە بێ واتە: ئەوەی کە بەرەو ڕووی دەچین و، ئەوەی کە بە جێمان هێشتوە، هەمووی هی خوایە، واتە: ڕابردوو و داهاتوو و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیشیانەوە، کە ئێستایە.

٣)- ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴾، هەروەها پەروەردگارت فەرامۆشکار نیە، (نَسِيًّا: صِيْغَةُ مُبَالَغةِ النَّاسِي) (نَسِيْ) ڕێژگەی زێدەڕۆییە بۆ (ناسي) واتە: لەبیرچوو، (النِّسْيَانُ: الغَفْلَةُ عَنْ تَوْقِيْتِ الأَشْيَاءِ بِأَوْقَاتِهَا) (نسيان) بریتیە بێئاگایی لەوە کە شتەکان بە کاتی خۆیانەوە پەیوەستکراون، ئەوەکە مرۆڤ کاتەکانی لەبیربچن.

٤)- ﴿ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا ﴾، پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیشیانەوە واتە: پەروەردگاری هەموویانە.

٥)- ﴿ فَٱعۡبُدۡهُ وَٱصۡطَبِرۡ لِعِبَٰدَتِهِۦ ﴾، بیپەرستەو خۆڕاگریش بە بۆ پەرستنەکەی، (الإِصْطِبَارُ: شِدَّةُ الصَّبْرِ عَلَى الأَمْرِ الشَّاقِّ، لأَنَّ صِيغَةَ الإِفتعالِ، تَرِدُ لإِفَادَةِ قُوَّةِ الفِعْلِ)، (إصطبار) واتە: خۆڕاگرتنێکی بەهێز لەسەر کارێکی قورس، چونکە سیغەی (إفتعال) لە زمانی عەرەبیدا، مانای هێزی کردەوەکە دەگەیەنێ، کەواتە: (إصطبار)، واتە: زۆر خۆڕاگریی، خۆڕاگرییەکی بەهێز، (وعُدِّيَ الإِصْطِبَار بـ «ل» لِتضمِيْنِهِ مَعْنَى الثَّبَات، أي: أَثْبتْ لِلْعِبَادَة)، دیارە وشەی (إصطبار) عادەت وایە بە (على) بەرکار دەخوازێ، بەڵام لێرەدا بە (ل) بەرکاری خواستوە، (واصطبر لعبادته) تاکو مانای چەسپاویی بخرێتە نێو، واتە: چەسپاوبە بۆ پەرستنی خوا ﷻ.

٦)- ﴿ هَلۡ تَعۡلَمُ لَهُۥ سَمِيًّا ﴾، ئایا هیچ هاو ناوو هیچ هاوتایەکت بۆ خوا پێ شك دێ؟ دەزانی هیچ هاوناو و هیچ هاوتای هەبێ؟

(السَّمِيُّ: المماثِـلُ فِي الإِسْـمِ، أَو المُمَاثِـلُ فِي الرُّتْبَـةِ)، (سَـمِيُّ) هـاو وێنەیـە لـە نـاودا، یاخـود هاوتایـە لـە پایـەو پێگـەدا، کـە دووەمیـان زیاتـر پێدەچـێ مەبەسـت بـێ و پرسـیارکردنەکەش پرسـیارکردنی نکوولّیلێکەرانەیـە.

یـانی: دەفەرمـوێ: ئایـا هیـچ هاونـاو و هاوتـات بـۆ خـوا پـێ شـك دێ؟ واتـە: پێـت شـك نایـەت و، نازانـێ هیـچ هاونـاوو هاوتایـەکی هەبـێ، ئەگـەر هەیبووایـە دەتـزانی.

کەواتە: خوا ﷻ وەك چۆن، هیچ هاوتای نیە، هیچ هاوناستی نیە، هیچ کەسێك نیە وەك وی بێ، نە لەزاتی دا، نە لە ناوەکانی دا، نە لە سیفەتەکانی دا، نە لە هیچ شتێکیدا، بەهەمان شێوە پێویستە مامەڵەیەکیش کە لەگەڵ خوادا دەکرێ، ئەو جۆرە مامەڵەیە لەگەڵ کەسی دیکەدا نەکرێ، بەندایەتیی دەبێ تەنیا بۆ خوا بکرێ و، ئەو بەندایەتییەی کە بریتیە لە: ئەوپەڕی خۆشویستن، ئەوپەڕی بە گەورەگرتن، ئەوپەڕی لێ ترسان، ئەوپەڕی ڕێزلێگرتن، ئەوپەڕی پشت پێ بەستن، ئەوپەڕێ ملکەچی بۆ کردن، ئا ئەوە، دەبێ تەنیا بۆ خوا بکرێ و، هیچ بەشێکی ئەو پەرستنە، بۆ جگە لە خوا ئەنجام نەدرێ، چونکە مادام خوا هیچ هاوتایەکی نیە، هیچ هاوکوفێکی نیە، هیچ هاوناستێکی نیە، پێویستە مامەڵەیەکیش کە لەگەڵ خوادا دەکرێ، وەك بەندایەتیی، ئەو جۆرە مامەڵەیە، لەگەڵ هیچ کام لە دروستکراوەکانی خوادا نەکرێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان ئایەتـەکانی: (٦٦ - ٧٦) دەگرێتـە خـۆی، واتـە: (١١) ئایـەت، تـەوەری سـەرەکیی ئـەم یـازدە ئایەتـە، بـاسی مرۆڤـی بێبـڕوا و لـە خـوا یاخییـە. سـەرەتا بـە تـاك (مفـرد) دەیهێنـێ، بـەڵام مەبەسـت پـێ جینـسی مرۆڤـی لـە خـوا یاخییـە، بۆیـە دوایـی دەیکاتـە کـۆ (جمـع)، چ لـە ڕووی بیروبۆچـوونی بێبڕوایانـەی و، چ لـە ڕووی سـەرەنجامی شـووم و سـەر بـە فەتارەتچـوونی، لـە دنیـاو لـە دواڕۆژدا.

لەمیـانی ئەوەشـدا بـاسی کۆکردنـەوەی بێبڕوایـان، وێـڕای شـەیتانەکان لـە ڕۆژی دوایـی داو، بردنیـان بـۆ لای دۆزەخ، پاشـان بەجێهێشـتنی بێبڕوایـان و شـەیتانەکان لەسـەر ئەژنۆیـان لـە دۆزەخـداو، دەربازکـردنی پارێـزکاران، کـراوە، هەروەهـا بـاسی هەڵوێسـتی کەللەڕەقانـەی بێبڕوایـان لـە بەرانبـەر ئایەتـەکانی خـوادا و، خـۆ هەڵکێشـانیان بـە مـاڵ و سـامانی حـەرام و کـوڕ و کاڵ و خـزم و خەڵـکی دەوروبەریـان، کـە دەوریـان قەرەباڵـغ کـردوون.

لـە کۆتاییشـدا خـوا بـاسی یەکێـك لـە یاسا گەردوونییـەکانی خـۆی، کـردوە، لـە ژیـانی مرۆڤدا، کـە گومڕایـان بـەردەوام گومڕاتـر و، ڕێ ڕاسـتگرتووانیش بـەردەوام سـەر ڕاسـتتر دەبـن و، خـوا ﷻ هـەم گومڕاترکـردنی بێبڕوایـان و هـەم سـەر ڕاسـتتر کـردنی ڕێ ڕاسـتگرتووانی، پاڵداوەتـە لای خـۆی، لەبەرئـەوەی هـەر کام لـەو دوو حاڵەتـە، بـە پێـی ئـەو یاسـا گەردوونیانـەی کـە خـوا لـە ژیـانی مرۆڤـدا دانـاون، بەڕێـوە دەچن.

﴿ وَيَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ أَءِذَا مَا مِتُّ لَسَوْفَ أُخْرَجُ حَيًّا ﴿٦٦﴾ أَوَلَا يَذْكُرُ ٱلْإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ وَلَمْ يَكُ شَيْـًٔا ﴿٦٧﴾ فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ وَٱلشَّيَٰطِينَ ثُمَّ لَنُحْضِرَنَّهُمْ حَوْلَ جَهَنَّمَ جِثِيًّا ﴿٦٨﴾ ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى ٱلرَّحْمَٰنِ عِتِيًّا ﴿٦٩﴾ ثُمَّ لَنَحْنُ أَعْلَمُ بِٱلَّذِينَ هُمْ أَوْلَىٰ بِهَا صِلِيًّا ﴿٧٠﴾ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ثُمَّ نُنَجِّى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَىُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ خَيْرٌ مَّقَامًا وَأَحْسَنُ نَدِيًّا ﴿٧٣﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَحْسَنُ أَثَٰثًا وَرِءْيًا ﴿٧٤﴾

﴿قُلْ مَن كَانَ فِي ٱلضَّلَٰلَةِ فَلْيَمْدُدْ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ مَدًّاۚ حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوْاْ مَا يُوعَدُونَ إِمَّا ٱلْعَذَابَ وَإِمَّا ٱلسَّاعَةَ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضْعَفُ جُندًا ﴿٧٥﴾ وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْاْ هُدًىۗ وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ مَّرَدًّا ﴿٧٦﴾﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{هەروەها مرۆڤ (ی بێبڕوا) دەڵێ: ئایا کە مردم بە زیندوویی (لە خاك و گۆڕ) دەهێنرێمەوە دەرێ؟ ﴿٦٦﴾ ئایا مرۆڤ لە یادی نیە، کە ئێمە پێشتر دروستمان کردوەو شتێك نەبووە! ﴿٦٧﴾ (سوێند) بە پەروەردگارت ئەوان و شەیتانەکان کۆدەکەینەوە، دوایی لە دەوری دۆزەخ لەسەر ئەژنۆیان ئامادەیان دەکەین ﴿٦٨﴾ ئنجا لە هەر کۆمەڵێك، کامیان لە بەرانبەر (خوای) میهرەباندا یاخیتر و سەرکەشترە، ڕایدەکێشینە دەرێ {بۆ فڕێدانە دۆزەخ} ﴿٦٩﴾ پاشان مسۆگەر خۆمان زاناترین بەوانەی لە پێشترن بۆ تێدا سووتێنرانی ﴿٧٠﴾ هیچ کامێکیشتان نیە کە نەچێتە سوێی (دۆزەخ) ئەوە بڕیارێکی مسۆگەرو هەڵبڕاوە لەلایەن پەروەردگارتەوە ﴿٧١﴾ ئنجا ئەوانەی پارێزیان کردوە، دەربازیان دەکەین و، ستەمکارانیش لەوێدا، بە لەسەر چۆکان کەوتوویی بەجێ دەهێڵین ﴿٧٢﴾ هەروەها ئەوانەی بێبڕوان، هەر کات ئایەتە ڕۆشنەکانمانیان بەسەردا خوێنرانەوە، بەوانەی بڕوایان هێناوە دەڵێن: کام لە دوو کۆمەڵەکان {ئێمە یان ئێوە} پلەو پێگەی باشترەو کۆڕو مەجلیسی بەرچاوترە؟ ﴿٧٣﴾ (ئەوە دەڵێن) لە حاڵێکدا بەر لەوانیش گەلێك سەدە (کۆمەڵگا)مان فەوتاندوون، کە کەل و پەل و بەزم و بازاڕ و دیمەنیان لە هی ئەوان جوانتربوو! ﴿٧٤﴾ بڵێ: هەرکەس لە گومڕایی دا بێ، با (خوای) میهرەبان ڕستی بۆ درێژ بکات و هاوکاریی بکات، هەتا کاتێك ئەوەیان دی، کە بەڵێنیان پێدرابوو {هەڕەشەیان پێی لێکرابوو} چ سزاو ئازار (ی دنیا) چ ئاخیر زەمان، ئەو کاتە باش دەزانن کێ پێگەو شوێنی خراپتر و سوپای بێهێزترە! ﴿٧٥﴾ هەروەها خوا کەسانێك کە ڕاستە ڕێ بوون، ڕێنماییان بۆ زیدە دەکات، کردەوە ماوە باشەکانیش لەلای پەروەردگارت، پاداشتیان باشترو ئاکامیان چاکترە ﴿٧٦﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(جِثِيًّا): لە زمانی عەرەبیدا دەگوترێ: (جَثَى عَلَى رُكْبَتَيهِ، يَجْثُو جُثُوّاً وجِثِيّاً، فَهُوَ جَاثٍ، جمعهُ جُثِيٌ مِثْلُ بُكِيٌ)، (جَثَى عَلَى رُكْبَتَيهِ) واتە: لەسەر ئەژنۆیان کەوت، کەسێك کە لەسەر ئەژنۆ بکەوێ، وەك شێوەی خوێندنی تەحییات، ئەوە ئەوپەڕی ملکەچیی و زەبوونیی دەگەیەنێ، یاخود ئەوپەڕی ڕێز و حورمەت دەگەیەنێ، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی ملکەچیی و زەبوونیی و بێ دەستەڵاتییە، دیارە هەر کام لە: (جُثُوّاً وجِثِيّاً) چاوگن، واتە: لەسەر ئەژنۆ کەوتن و لەسەر چۆکان کەوتن، (فَهُوَ جَاثٍ) بۆ تاکێك بەکاردێ، لەسەر ئەژنۆی کەوتبێ، کۆیەکەی بریتییە لە (جُثِيٌ) یان (جِثِي) هەردووکیان هاتوون، کۆی (جاثِي) ن، وەك چۆن (بُكِيٌ) کۆی (باكِي)یە، لێرەدا واتە: ئەوانەی کە لەسەر ئەژنۆیان کەوتوون.

ئنجا هەرچەندە دەشکونجێ (جثوّاً) و (جِثِيّاً) چاوگ بن، بەڵام لێرەدا ئەوە زیاتر دەگونجێ کە کۆ بن.

(عِتِيًّا): (العُتُوُّ: النُّبوُّ عَنِ الطَّاعَةِ، عَتَا يَعْتُو عُتُوّاً وعِتِيّاً، مَصْدَرٌ أو جَمْعُ عَاتٍ)، (عتوّ) بریتییە لە خۆ دوورگرتن لە فەرمانبەریی، دەگوترێ: (عَتَا يَعْتُو عُتُوّاً وعِتِيّاً) واتە: سەرکەش بوو، سەرکەش دەبێ، سەرکەشیی و یاخیی بوون.

وشەی (عِتي) یان چاوگە، یاخود کۆیە بۆ (عَاتِي) واتە: یەکێکی سەرکەش و یاخیی، (عُتوّ) و (عِتِي)یش، یانی: کۆمەڵە خەڵکێکی سەرکەش و یاخیی و خۆ بەزلگر لە بەرانبەر خوادا[1].

(لَنَنزِعَنَّ): واتە: بە تەنکید ڕادەکێشین، (نَزْعُ الشَّيءِ: جَذْبُهُ مِنْ مَقَرِّهِ، كَنَزْعِ القَوْسِ عَنْ كَبِدِهِ)، (نَزْع) بریتییە لە ڕاکێشانی شتێك لە شوێنی خۆیەوە، بە توندیی، وەك چۆن کەوان دەکێشرێ، بۆ ئەوەی تیرەکەی پێ بهاویشترێ، هەروەها (نَزْع) بە مانای واز لە شت هێنان دێ، هەروەك (نُزوع)یش بە مانای تامەزرۆیی، دێ، بەڵام ئەوەی کە لێرە لە ئایەتەکەدا هاتوە (لننزعن) یانی: دەردەکێشین، ڕادەکێشین.

هەروەك لە سوورەتی (النازعات)دا، هاتوە: ﴿وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرۡقٗا ١﴾، واتە: ئەو فریشتانەی کە بە توندیی ڕووحی بێبڕوایان لە جەستەیان دەردەکێشن.

---

(١) وشەی (عاتي) بە (عتاة) یش کۆ دەکرێتەوە.

(صِلِيًّا): (أَصْلُ الصَّلى: الإيقادُ بالنَّارِ صَلِيَ بالنَّارِ وَبِكَذَا: بُلِيَ بِهَا، صَلَيْتُ الشَّاةَ: شَوَيْتُهَا) وشەی (صِلى) یان (صَلِي) بریتیە لە سووتاندن بە ئاگر، دەگوترێ: (صَلِيَ بالنَّارِ وَبِكَذَا) واتە: تووشی چوونە نێو ئاگر بوو، دیسان دەگوترێ: (صَلَيْتُ الشَّاةَ) واتە: مەڕەکەم برژاند، هەڵبەتە لە زمانی عەرەبییدا (صلي) بریتیە لەوە کە شتێك ببرژێنرێ لە هەر چوار دەوریەوە و ئاگری بدرێتە بەر، کە جۆرە برژاندنێکی، یان پیشاندانێکی تایبەتە.

کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ لَنَحْنُ أَعْلَمُ بِالَّذِينَ هُمْ أَوْلَىٰ بِهَا صِلِيًّا﴾، واتە: ئێمە زاناترین کامیان لە پێشترە بۆ ئەوەی ببرژێنرێ، یان بپیشێنرێ.

(حَتْمًا): (الحَتْمُ: القَضَاءُ المُقَدَّرُ، والحَاتِمُ: الغُرَابُ الَّذِي يُحَتِّمُ بالفِرَاقِ، كَمَا زَعَمُوا)، (حَتْم) بریتیە لە بڕیارێکی ئەندازەگیریی بۆ کراو، واتە: شتێك کە بڕابێتەوەو هەڵبڕا بێ، یەکلایی بووبێتەوە، (حاتِم) بەو قەلەڕەشە دەگوترێن، کە بە پێی ئەفسانەیی گەلە پێشووەکان، عەرەب و غەیری عەرەبیش، پێیان وابووە، لە هەر شوێنێك بخوێنێ نیشانەی ئەوەیە، کەسێك لەوێ دەمرێ، یاخود ئەو شوێنە کاول دەبێ.

(مَّقْضِيًّا): (القضاء) واتە: بڕیار، (القَضَاءُ: فَصْلُ الأَمْرِ قَوْلاً أَو فِعْلاً)، بریتیە لە جێبەجێکردنی کارێك، چ بە قسە بێ، یان بە کردەوە، بەڵام (مَقْضِي) واتە: بڕیار لەسەر دراو، واتە: (مَا صَدَرَ بِهِ قَضَاءٌ)، شتێك بڕیاری لەسەر درا بێ.

(مَّقَامًا): (المَقَامُ: مَصْدَرٌ، أو اسْمُ مَكَانِ القِيَامِ، أو زمانه)، (مقام) دەگونجێ چاوگ بێ، واتە: ڕاوەستان، دەشگونجێ ناوی شوێن بێ، واتە: شوێنی لێ ڕاوەستان، یاخود کاتی ڕاوەستان بێ.

(نَدِيًّا): (ندي) بە مانای کۆڕ و مەجلیس دێ، هەروەها دەشگونجێ بە مانای کەسێك بێ کە لە کۆڕو مەجلیس دا دانیشتوە، دیسان دەشگونجێ بە مانای ماڵ بەخشین و سەخاوەت بێ، دەگوترێ: (هُوَ أَنْدَى مِنْ فُلانٍ كَفاً)، واتە: فلان کەس دەستی لە فلان کەس کراوەترە بۆ بەخشین، کەواتە: (النَّدى) بە مانای (السَّخاء)یش دێ.

(أَثَٰثًا): (الأَثَاثُ: مَتَاعُ البَيْتِ الكَثِيرِ، وَأَصْلُهُ مِنْ أَثَّ، إِذَا كَثُرَ وَتَكَاثَفَ)، (أثاث) بریتیە لە کەل وپەلی زۆری ماڵ، شمەکی ماڵ، بنچینەکەشی لە (أَثَّ)ەوە هاتوە، (أَثَّ) واتە: ئەو شتە زۆرو چڕ و پڕ بوو.

(وَرِءْيًا): خوێنراویشتەوە: (رَئْياً) (مِثْلُ ذَبْحٍ وذِبْحٍ بِمَعْنَى المَذْبُوحِ)، واتە: (رِئياً) و (رَئْياً) بە مانای (مَرْئِياً)، یانی: بەرچاو، یان: بینراو، یاخود: خاوەن دیمەن، هەروەها خوێندراویشەتەوە: (رِيّاً) کە لە (الرِّي) هاتوە، واتە: پاراو و ئاودراو.

(مَرَدًّا ): (مَرْجَعَاً وَالْمُرَادُ بِهِ عَاقِبَةُ الأَمْرِ)، (مَرَدّ) واتە: شوێنی بۆ لا گەڕانەوە، کە لێرەدا مەبەست پێی سەرەنجامی کارەکەیە.

(مَدًّا): (الْمَدُّ: إِرْخَاءُ الحَبْلِ، وَإِطَالَتُهُ، ومَجَازاً: الإِمْهَالُ)، (مَد) بریتیە لە ڕست بۆ درێژکردن و ڕێشمە بۆ درێژکردن، بەڵام بە مەجاز بە مانای مۆڵەتدان دێ، دەڵێ: ڕستت بۆ درێژ دەکەم، واتە: جارێ مۆڵەتت دەدەم، لێت دەگەڕێم، چونکە ئاژەڵێك کە دەلەوەڕێنرێ، ئەو پەتەی کە تێیخراوە و پێیەوەبەستراوە، ئەگەر درێژتر بێ زیاتر مەجالی جووڵانی هەیە، یان جاری وا هەیە بە پێچەوانەوە دەڵێ: دوایی پەتت بۆ توند دەکەم، یان ڕێشمەت توند دەکەم، واتە: نایەڵم زۆر بڕۆی، ئەوانە هەموویان مانای مەجازیین، ئەگەرنا مانای ڕاستەقینەکەیان بۆ ئاژەڵ بەکاردێ.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ لێرەدا دوای گێڕانەوەی بەسەرهاتی ژمارەیەك لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، کە ئایەتەکانی: (١ - ٦٥)، یانی: پانتاییەکی زۆر لەم سوورەتە موبارەکە، بۆ گێڕانەوەی بەسەرهاتی ژمارەیەك لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) تەرخان کرابوو، بە تایبەتی زەکەریاو یەحیای کوڕی (عَلَيْهِمَا السَّلاَم)، هەروەها مەریەم و عیسای کوڕی (عَلَيْهِمَا السَّلاَم)، پاشان ئاماژەیەك بە بەسەرهاتی ئیبراهیم ﷺ و وتووێژی لەگەڵ بابی دا.

دوایی ئاماژەیەك بە مووسا هاڕوونی برای و، پاشان ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم و، دوایش ئاماژەیەکی کورت بە ئیدریس، دوایی بە گشتی باسی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) و ئەوانەی کە دێنە شوێنیان، لە پاشینی خراپ.

ئنجا دوایی خوا ﷻ دێتە سەر باسی مرۆڤی بێبڕوا، ئەوانەی بە دوای ڕێبازی ئەو پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ناکەون، کە خوا ناردوونی بۆ ڕێنمایی کردنی مرۆڤایەتیی و، بۆ هێنانە سەر ڕاستەڕێیان و، بۆ بەختەوەرکردنیان لە دنیاداو، سەرفرازکردنیان لە دواڕۆژدا، دەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ ﴾، مرۆڤ دەڵێ، لێرەدا دەزانین کە دوایی ئایەتەکان دەبینین، کە مەبەست پێی مرۆڤی بێبڕوایە.

کەواتــە: لێرەدا هەرچەنــدە (إنسـان)، (ألْ)ی ناسـاندنی لەسـەرە کـە بـۆ جینسـە واتـە: جینـسی مـرۆڤ، بـەڵام بـە سـیاق و مەقـام دەزانیـن، کە مەبەسـت جینـسی مرۆڤی بێبڕوایە، نـەك مرۆڤەکان بـە گشـتی، یاخـود ئـەو مرۆڤـەی لـە هیدایـەتی خـوای بەهرەمەنـد نەبـووە و وەك ئەسـڵی خـۆی ماوەتـەوە، بانزانیـن مرۆڤی بێبـڕوا، یـان بێبـەش لـە ڕووناکیـی پەیامـی خـوا، چـی دەڵـێ؟

﴿ أَءِذَا مَا مِتُّ لَسَوْفَ أُخْرَجُ حَيًّا ﴾، بـە پرسـیارکردنی نکووڵیلێکەرانـەوە، دەڵـێ: ئایـا کاتێـك مـردم دوایـی بـە زیندوویـی دەردەهێنرێمـەوە؟ یـانی: لـە خـاك دەردەهێنرێمـەوە، دوایی ئـەوەی ژێـر خـاك دەکرێـم؟ چونکـە عـادەتی زۆربـەی گـەلان وایـە، کـە مردووەکانیـان دەخەنـە ژێـر خاکـەوە، ئەگەرنـا هەنـدێ لـە گەلانیـش هـەن، مردووەکانیـان ناخەنـە ژێـر خاکـەوە و دەیانسـووتێنن، یاخـود بـە شـێوەیەکی دیکـە جەنازەکانیـان هەڵدەگـرن، یـان دەیانفەوتێنـن.

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ أَوَلَا يَذْكُرُ ٱلْإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ وَلَمْ يَكُ شَيْـًٔا ﴾، ئایـا مـرۆڤ (ئـەو جـۆرە مرۆڤـە) نایەتـە یـادی، کـە ئێمـە پێشـتر دروسـتمان کـردوە و هیچ شـتێك نەبـوو؟ واتە: بـوونی نەبـوو ئێمـە هێنامانـەدی، ئـەدی دوای ئـەوەی کـە پەیدابـووە و بـوونی پێبەخـشراوە، بـەڵام گۆڕانێـکی بەسـەردا هاتـوەو، ڕووحـی لـە جەسـتەی جیابۆتـەوە و جەسـتەکەی چۆتـەوە نێـو خـاك، بێگومـان ئەگـەر مـرۆڤ لـە ڕووی عەقـڵ و مەنتیقـەوە تەماشـای بـکات، پەیداکـردنی شـتێك لـە نەبـوون، بـە زەحمەتـترو قورسـترە لـەوە کـە دوای ئـەوەی پەیدابـووە، بگێڕدرێتـەوە و بهێنرێتـەوە.

﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ وَٱلشَّيَٰطِينَ ﴾، سـوێند بـە پـەروەردگارت، بەدڵنیایـی ئـەوان و شـەیتانەکان کۆدەکەینـەوە، واتـە: لەگـەڵ شـەیتانەکاندا کـە خراپتریـن دروسـتکراوی خـوان، کۆیـان دەکەینـەوە، لـە کـوێ؟ بێگومـان مەبەسـت پێـی ڕۆژی دواییـە، ﴿ ثُمَّ لَنُحْضِرَنَّهُمْ حَوْلَ جَهَنَّمَ جِثِيًّا ﴾، دوایـی لـە دەوری دۆزەخ، بـە لەسـەر ئەژنۆیـان کەوتوویـی، ئامادەیـان دەکەیـن، واتـە: بـە زەبوونیـی و بـێ دەسـتەڵاتیی، کەسـێك کـە لەسـەر ئەژنـۆ دەکـەوێ، مانـای وایـە بـێ دەسـەڵات و زەبـوون و دەسـتەپاچەیە.

﴿ ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى ٱلرَّحْمَٰنِ عِتِيًّا ﴾، دواییـش لـە هـەر کۆمەڵێـك، کامیـان یاخییـترە لـە بەرانبـەر (خوای) خـاوەن بەزەیی دا، دەریدەکێشـین، واتـە: ڕایدەکێشـینە دەر لە ڕیز.

﴿ ثُمَّ لَنَحْنُ أَعْلَمُ بِٱلَّذِينَ هُمْ أَوْلَىٰ بِهَا صِلِيًّا ﴾، دوایـی ئێمـە زاناتریـن بـەوەی کـێ لـە پێشـترە، بچێتـە نێـوی و بسـووتێنرێ و بپیشـێنرێ لـە دۆزەخـدا.

کاری خـوا هیچـی گۆترەکاریـی نیـە، هـەر کەسـە بـە ئەنـدازەی تۆخیـی و خەسـتیی کوفرەکـەی و تاوانەکـەی سـزا دەدرێ، هـەر کەسـە بەپێـی ڕیزبەندییـەك کـە بـەس خـوای کارزان و زانـای

پەنهـان و ئاشـکرا، دەزانـێ، پلـەی خـۆی هەیـە، هـەر کەسـە حـاڵ و مەقامـی خـۆی هەیـە و، هـەر کەسـەش سـزاو جەزرەبـەی تایبـەت و دیاریـکراویـی پـڕ بـە پێسـتی خـۆی هەیـە.

دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ﴾، هیـچ کام لـە ئێـوەش نیـە مەگـەر دەیچێتە سـوێ، (وارِدُها) واتـە: دەچنـە سـوێی دۆزەخ، ڕانـاوی (هـا)ی (واردهـا) بـۆ دۆزەخ دەچێتـەوە.

هەڵبەتـە هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: واتـە: دەچێتـە نێـو دۆزەخ، کـە لـەلای خـوا ئاسـانە، بـڕواداران بچنـە نێـو دۆزەخیـش و زیانیـان پـێ نەگەیەنـێ، وەك چـۆن ئیبراهیـم ﷺ چـووە نێـو ئاگـر و خـواش سـەلامەتی کـرد، بـەڵام وەك دوایـی لـە مەسـەلە گرنگەکانـدا بـاس دەکەیـن، لێـرەدا واتـای: (وارِدُهـا)، (داخلوهـا) نیـە، بەڵکـو وەك لـە سـوورەتی (القصـص)دا، دەربـارەی مووسـا ﷺ گوتـراوە: ﴿ وَلَمَّا وَرَدَ مَاءَ مَدْيَنَ ﴿٢٣﴾ ﴾، واتـە: کاتێـك چـووە سـەر ئـاوی مەدیـەن، کـە بـە تەئکیـد مووسـا نەچۆتـە نێـو ئاوەکـەوە و نەچۆتـە نێـو گۆمەکـە، یـان بیرەکـە، ﴿ وَلَمَّا وَرَدَ مَاءَ مَدْيَنَ ﴿٢٣﴾ ﴾القصـص، واتـە: کاتێـك چـوو سـوێی ئاوەکـە، چـووە نیزیـك ئاوەکـە، هـەر لـە کوردەواریـی خۆشـماندا دەڵێـن: فڵانکـەس چـووە سـەر ئاوەکـە، یـانی: چـووە نیزیـك و قـەراغ ئاوەکـە، ﴿ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴾، ئـەو بڕیـارە لەسـەر پـەروەردگارت، بڕیارێـکی یەکلایـی کراوەیـە، واتـە: بڕیـار دراوەو بڕاوەتـەوە.

﴿ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴾، دوایـی ئەوانـەی پارێزیـان کـردوە، دەربازیـان دەکەیـن و، سـتەمکارانیش لەوێـدا لەسـەر چـۆکان بەزەبوونیـی بەجێدەهێڵیـن.

وەك دوایـی بـاسی دەکەیـن زۆربـەی زانایـان ڕایـان وایـە، کـە ئـەم چوونـە سـوێی دۆزەخـە، مەبەسـت پێـی ڕەتبوونـە بەسـەر (صراط)دا، کـە ئـەو پردەیـە بەسـەر پشـتی جەهەننـەم ڕادەهێڵـدرێ و، هەمـوو مرۆڤایەتیـی دەبـێ بەسـەر پشـتی ئـەو پـردەدا بـڕوا، ئنجـا ئـەوەی کـە بڕواداربـێ، هـەر کەسـە بـە ئەنـدازەی ئیمانەکـەی، دەربـازی دەبـێ بـە خێرایـی و، ئەوانـەی دیکـەش گرفتـار دەبـن و لەسـەر ئـەو پـردە، کـە لـووس و خلیسـکە، دەکەونـە خـوار.

ئنجـا دێتـە سـەر بابەتێـکی دیکـە و، هەڵوێسـتێکی دیکـەی ئـەو بێبڕوایانـە و، دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ ﴾، کاتێـك ئایەتـە ڕۆشـنەکانی ئێمەیـان بەسـەردا خوێنرانـەوە، ﴿ قَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ آمَنُوا ﴾، ئەوانـەی بێبـڕوا بـوون، بەوانەیـان گـوت: کـە بـڕوادارن: ﴿ أَيُّ الْفَرِيقَيْنِ خَيْرٌ مَّقَامًا وَأَحْسَنُ نَدِيًّا ﴾، واتـە: کام لـە دوو کۆمەڵـەکان [واتـە: ئێمـە یـان ئێـوە] پێگـەی باشـترە و کـۆڕو مەجلیسـی قەرەباڵغـترە؟

﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَحْسَنُ أَثَاثًا وَرِءْيًا ﴾، لە پێش ئەواندا چەندان سەدەمان فەوتاندوون، کە کەل وپەلیان لەوان باشتر بوو و، دیمەنیشیان لەوان جوانتر بوو، بەرچاوتربوون، واتە: خانووبەرەو کەل و پەل و نێو ماڵیان باشترو، خزم و کەس و قەوم و قەرەباڵغیی مەجلیسیان لەوانە زیاتر بوو، کە خۆیان بەسەر بڕواداراندا هەڵدەکێشن.

بۆیەش خوا ﷻ دەفەرموێ: لە پێش ئەواندا زۆر سەدەمان فەوتاندوون، کە لەوان کەل وپەلیان زیاتر و، لەوان دیمەنیان بەرچاوترو بووە، چونکە بێبڕوایەکان کاتێک کە ئایەتە ڕۆشنەکانی خوایان بەسەردا دەخوێنرێنرانەوە، بە بڕوادارانیان، دەگوت: ئێمە لەسەر هەقین، نەك ئێوە کە شوێن ئایەتەکانی خوا دەکەون، بە بەڵگەی ئەوە، کە ئێمە حاڵمان باشترە و ئێمە پێگەمان چاکترە و، ئێمە کۆڕ و مەجلیسمان قەرەباڵغترە و، ئێمە کوڕان و سامانمان زیاترە، بۆیە خوا دەفەرموێ: ئەگەر وا بووایە، ئەگەر سەروەت و سامانی زۆر و خزم و قەرەباڵغیی زۆر، بەڵگەی لەسەر هەق بوون، بووایە، نەدەبوو ئەو گەلانەی لە پێش ئەواندا، خەڵك و قەومیان زیاتر بوو، کۆڕ و مەجلیسیان قەرەباڵغتر بوو، سەروەت و سامانیان پتربوو، بفەوتابانەیە!

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ مَن كَانَ فِي الضَّلَالَةِ فَلْيَمْدُدْ لَهُ الرَّحْمَٰنُ مَدًّا ﴾، بڵێ: هەر کەسێ لە گومڕایی دابێ، با (خوای) خاوەن بەزەیی بە زیادکردن بۆی زیاد بکات.

ئەمە یان دوعایە، یاخود: مەبەست ئەوەیە: سەرەنجامەکەیان وای لێدێ: خوای خاوەن بەزەیی لەگەڵ ئەوەشدا کە خاوەن بەزەییە، بەڵام ئەوانە هێندە خراپن، هەر لە گومڕایی بۆیان زیاد دەکات، ﴿ حَتَّىٰ إِذَا رَأَوْا مَا يُوعَدُونَ ﴾، هەتا کاتێ ئەوەیان بینی کە بەڵێنیان پێدراوە، یان هەڕەشەیان پێی لێکراوە، ﴿ إِمَّا الْعَذَابَ وَإِمَّا السَّاعَةَ ﴾، یان سزای دنیایی، یاخود ئاخیر زەمان، (ساعة) واتە: ئەو کاتەی کە دنیای تێدا کۆتا دێ، ﴿ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضْعَفُ جُندًا ﴾، ئەو کاتە دەزانن: کێ پێگەی خراپترە و کێ هێزو سوپای بێهێزترە، ﴿ وَيَزِيدُ اللَّهُ الَّذِينَ اهْتَدَوْا هُدًى ﴾، ئەوانەش کە ڕێنمایی خوایان وەرگرتوە و ڕاستە ڕێ بوون، خوا ڕێنماییان بۆ زیاد دەکات، زیاتر دڵڕۆشنیان دەکات، ﴿ وَالْبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ مَّرَدًّا ﴾، کردەوە باشە ماوەکانیش لەلای پەروەردگارت، پاداشتیشیان چاکترە و سەرەنجامیشیان باشترە.

کەواتە: بڕوادارانێك کە خاوەنی ئەو کردەوە چاکانەن، کە دەمێننەوە و پاداشتیان بەردەوامە، تەنیا ئەوانە بەختەوەرن و، ئەوانەی دیکە، ماڵوێران و ڕۆژ ڕەشن.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**مرۆڤی کافر، دەڵێ: ئایا کاتێك مردم، زیندوو دەکرێمەوە؟! وا دیارە لە بیری چووە، کە پێشتر هیچ نەبووەو خوا هێناویەتە دی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ أَءِذَا مَا مِتُّ لَسَوْفَ أُخْرَجُ حَيًّا ﴿٦٦﴾ أَوَلَا يَذْكُرُ ٱلْإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ وَلَمْ يَكُ شَيْـًٔا ﴿٦٧﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەو ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَيَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ أَءِذَا مَا مِتُّ ﴾، مرۆڤ دەڵێ: ئایا کاتێك کە مردم.

بە تەئکید لێرەدا مەبەست مرۆڤی بڕوادار نیە، (الْمُرَادُ بالإِنْسَانِ هُنَا جَمْعٌ مِنَ النَّاسِ، بدَليلِ: ﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ وَٱلشَّيَٰطِينَ ﴾)، لێرەدا مەبەست لە مرۆڤ (إنسان) کۆمەڵە خەڵکێکی دیاریکراون، بە بەڵگەی ئەوە کە دوایی خوا دەفەرموێ: ﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ وَٱلشَّيَٰطِينَ ﴿٦٨﴾ ﴾مریم، سوێند بە پەروەردگارت ئەوان و شەیتانەکان کۆدەکەینەوە.

یانی: لێرەدا مەبەست مرۆڤی بێبڕوایە، وەك لە سووڕەتی (الکهف)دا پێشتر گوتمان کە دەفەرموێ: ﴿ وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا ﴿٧٩﴾ ﴾، واتە: پادشایەك لە پشتیانەوە بوو، کە هەر کەشتیەکی دەست بەسەر دادەگرت.

مەبەست پێی کەشتیی چاکە، (کل سفینة صَالِحة) لێرەشدا (الإنسان) دەزانین کە مەبەست مرۆڤ (إنسان)ی بێبڕوایە، چونکە بە پێی سیفەتەکانی دیارە، واتە: (أل)ی سەر (الإنسان) بۆ ناساندن (تعریف)ە، بەڵام مەبەست پێی (عهد)ە، واتە: مرۆڤە زانراوو ناسراوەکە، ئنجا (أل)ی (عهد) لە زمانی کوردیی دا، لە بەرانبەر (کە)دا دەوەستێ، ئەگەر گوتم: (جِئني بِكتابٍ) کتێبم بۆ بێنە، نازانی، کامە؟ بەڵام ئەگەر گوتم: (جئني بالكتاب) کتێبەکەم بۆ بێنە، دەزانی کامیان مەبەستە.

٢)- ﴿ لَسَوۡفَ أُخۡرَجُ حَيًّا ﴾، [ئەو مرۆڤە، دەڵێ: ئایا کاتێ مردم] ئایا بە زیندوویی دەردەهێنرێمەوە، لە گۆڕ و خاك؟ بێگومان لێرەدا ئەو پرسیارکردنە، ﴿ أَءِذَا مَا مِتُّ ﴾، پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە، واتە: شتی وا نابێ، بۆیە خوا لە وەڵامی دا دەفەرموێ:

٣)- ﴿ أَوَلَا يَذۡكُرُ ٱلۡإِنسَٰنُ ﴾، ئایا ئینسان لە یادی نیە، نایەتەوە بیری؟ لێرەشدا دیسان (الإِسْتِفْهَامُ: إِنْكَارٌ وَتَعَجُّبٌ مِنْ ذُهُولِ الإِنْسَانِ المُنْكِرِ لِلْبَعْثِ)، ئەو پرسیارکردنە بۆ نکووڵیلێکردن و سەرسوڕمانە لە بێ ئاگایی مرۆڤی نکووڵیکار لە زیندووبوونەوە.

(يَذْكُر) خوێنراوەتەوەش: (يَذَّكَّر): (أولا يَذَّكَّر الإنسان) ئایا ئینسان لەبیری نیە، نایەتەوە یادی؟ کە بەدڵنیایی هیچ کەسێك ئەو کاتەی تێیدا دروستکراوە، لە یادی نیە، بەڵام مەبەست ئەوەیە: ئایا ئینسان بیرناکاتەوە و نازانێ: کاتێ خۆی هیچ نەبووە، ئایا دڵنیا نیە کە کاتێ خۆی نەبووەو، خوا پەیدای کردوە؟!

٤)- ﴿ أَنَّا خَلَقۡنَٰهُ مِن قَبۡلُ ﴾، کە ئێمە دروستمان کردوە لەوەو پێش، واتە: پێش ئەو حاڵەتەی کە ئێستا لەسەریەتی، کە ئێستا مرۆڤێکی تێر و تەواوە!

٥)- ﴿ وَلَمۡ يَكُ شَيۡـٔٗا ﴾، کە ئەو کاتە هیچ شتێك نەبوو، واتە: شتێکی هەبوو (موجود) نەبوو، لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە مرۆڤی بێبڕوا بە سەرسوڕمانەوە و بە نکووڵیلێکردنەوە، دەڵێ: ئایا کە مردم، بە زیندوویی دەردەهێنرێمەوە؟! پێی سەیرە و پێی دوورە، خوا دوای مردن، لە خاك و لە گۆڕ دەری بێنێتەوە و زیندووی بکاتەوە! ئنجا خوا دەفەرموێ: ئایا بیرناکاتەوە: کاتێك کە نەبووەو پەیدامان کردوە، بێگومان پەیداکردنی لە نەبوون، کە هیچ نەبووە، قورستر و بە زەحمەتترە لە زیندووکردنەوەی دوای مردنی، لە عەقڵی مرۆڤ دا، ئەگەرنا بۆ خوای پەروەردگار هەموو شتێك وەك یەکە، بەڵام بە عەقڵی مرۆڤ، پەیداکران لە نەبوونەوە، قورسترە، لە زیندووکرانەوەی دوای مردن، چونکە مردنەکە بەس بریتیە لەوە کە جەستەو ڕووحی لەیەك جیانوونەوە و، ڕووحەکەی چووە بۆ شوێنێك و، جەستەکەشی چۆتەوە نێو خاك، کە بە تەئکید پەیداکرانەوەی دوای بوون، ئاسانترە، لە پەیداکرانی پێش بوون، بۆ وێنە: کەسێك کە شتێك دروست دەکات، دوای ئەوەی ئەو شتەی لێ تێکدەچێ، ئاسانتر دەتوانێ خودی شتەکە چاك بکاتەوە، یاخود یەکێکی دیکەی وەك ئەو دروست بکاتەوە.

**مەسەلەی دووەم:**

**سوێند خواردنی پەروەردگار کە کافران و شەیتانەکان لە دۆزەخدا لەسەر ئەژنۆیان کۆدەکاتەوەو، پاشان کامەیان یاخیتر و سەرکەشتر بووە لە ئاست (خوای) خاوەن بەزەییدا، لە نێویاندا، رایدەکێشێ و لە پێش ئەوانی دیکەدا، دەیخاتە نێو دۆزەخەوە و تێیدا دەبرژێنێ و دەیبشێنێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ وَالشَّيَاطِينَ ثُمَّ لَنُحْضِرَنَّهُمْ حَوْلَ جَهَنَّمَ جِثِيًّا ﴿٦٨﴾ ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى الرَّحْمَٰنِ عِتِيًّا ﴿٦٩﴾ ثُمَّ لَنَحْنُ أَعْلَمُ بِالَّذِينَ هُمْ أَوْلَىٰ بِهَا صِلِيًّا ﴿٧٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ وَالشَّيَاطِينَ ﴾، واتە: سوێند بە پەروەردگارت ئەوان و شەیتانەکان کۆدەکەینەوە.

٢)- ﴿ ثُمَّ لَنُحْضِرَنَّهُمْ حَوْلَ جَهَنَّمَ جِثِيًّا ﴾، دوایی لە دەوری دۆزەخ، لەسەر ئەژنۆیان ئامادەیان دەکەین.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَوَرَبِّكَ ﴾، ئەم (و)ە، بۆ سوێند خواردنە، بۆ ئەوەی دڵنیابن کە ئەو بەڵێنە دێتە دی، ڕاناوەکەش خوا بە کۆ (جمع) دەیهێنێ، هەرچەندە پێشێ بە تاک (مفرد) باسی کردوە، ﴿ وَيَقُولُ الْإِنسَانُ أَإِذَا مَا مِتُّ ﴾، بەڵام دوایی دەفەرموێ: ﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ ﴾، لەبەرئەوەی مەبەست لە (الإنسان) کە (أل)ی تەعریفی لەسەرە، جینسی مرۆڤە، یانی: تێکرای مرۆڤەکان.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ وَالشَّيَاطِينَ ﴾، سوێند بە پەروەردگارت لەگەڵ شەیتانەکان دا کۆیان دەکەینەوە، بۆچی لەگەڵ شەیتانەکان دا؟ چونکە شەیتانەکان خراپترین و نزمترین دروستکراوەکانی خوان و، ئەو بێبڕوایانەش شایستەی ئەوەن لەگەڵ واندا ڕەپێچەك بدرێن و خڕ بکرێنەوەو لە دۆزەخ دا کۆبکرێنەوە.

وشـەی (جثـي) خوێنراویشـەتەوە: (جُثـي): ﴿ثُمَّ لَنُحْضِرَنَّهُمْ حَوْلَ جَهَنَّمَ جِثِيًّا﴾، (جِثِيّاً، جُثِيـاً) هەردووکیـان کـۆی (جـاثي)ن، وەك (قاعـد) کـە کۆیەکـەی (قعـود) و، (جالـس) کـە کۆیەکـەی (جلـوس)ە.

کـە هـەرکام لـە: (جثـي) و (قعـود)و (جلـوس) بـە چـاوگ (مصدر)یـش هاتـوون، واتە: لەسـەر ئەژنـۆ کەوتـن، دانیشـتن، ڕۆنیشـتن، بـەڵام بـە (کـۆ)ش هاتـوون یـانی: (جِثِيّ) و (جُثِيّ) کـۆی (جَاثي)ن، واتـە: لەسـەر ئەژنـۆ کەوتـوو، هـەروەك (قعـود) و(جلـوس) کـۆی (قاعـدُ) (جالـس)ن، واتـە: دانیشـتوو، ڕۆنیشـتوو.

٣)- ﴿ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى ٱلرَّحْمَٰنِ عِتِيًّا﴾، دوایی لە هەر کۆمەڵێك، کامیان لە ئاست (خوای) خاوەن بەزەیی دا، یاخیتر و سەرکەشتر بووە، زیاتر لە سنوور دەرچووە، ڕایدەکێشین، دەریدەکێشین لە نێویان.

وشـەی (عِتيّاً) خوێنراویشـەتەوە: (عُتِيّاً) وەك چـۆن (جِثيـاً- جُثِيـاً) (عِتيـاً، عُتِيـاً) هەردووکیـان یـەك واتایـان هەیـە، کـە واتـە: سەرکەشـتر و یاخییـتر، خـۆ بەزلگرتـر.

(الشِّيْعَةُ: الطَّائِفَـةُ الَّتِـي شَـايَعَتْ أَحَـداً فَهِـيَ عَـلَى رأيٍ وَاحِـد)، (شـيعة) ئـەو کۆمەڵـە خەڵکـەی لەگـەڵ کەسـێکدا دەڕۆن، پەیڕەویـی لێدەکـەن، کەواتـە: (شـيعة) یـانی: کۆمەڵـە خەڵکێـك گوتـراوە: (شـيعة عـلي) هەروەهـا: گوتراویشـە: (شـيعة معاويـة) واتـە: ئـەو کۆمەڵـەی کـە هـاوڕای (عـلي)ن ﷺ، یاخـود هـاوڕای (معاويـة)ن، خـوا لێـی ببـوورێ، کـە پێکـەوە کێشـەو شـەڕو ناکۆکییـان بـووەو، بـە دڵنیایـی (عـلي) لەسـەر هـەق بـووە و (معاويـة) لادەرو یاخیـی بـووە، بـە دەقـی فەرمایشـتی پێغەمبـەر ﷺ کـە بـە (عـمار بـن یـاسر)ی فەرمـوو: [تَقْتُلُكَ الْفِئَـةُ الْبَاغِيَـةُ][1] واتـە: کۆمەڵـە یاخییەکـە دەتکـوژێ، دوایيـش لەلایـەن کۆمەڵـی موعاویـەوە کـوژرا.

٤)- ﴿ثُمَّ لَنَحْنُ أَعْلَمُ بِٱلَّذِينَ هُمْ أَوْلَىٰ بِهَا صِلِيًّا﴾، دوایی بە دڵنیایی ئێمە زاناترین بەو کەسانەی کە لە پێشترن بخرێنە نێوی، واتە: بخرێنە نێو دۆزەخ و تێیدا بسووتێنرێن، (أولى بها أي: بجهنم)، (ها)ی سەر (بها) بۆ دۆزەخ دەچێتەوە.

(صِليـا) خوێنراویشـەتەوە: (صُلِيـاً)، واتـە: کامیـان لـە پێشـترە لـە پێشـدا بخرێتـە نێـو دۆزەخ و تێیـدا بپیشـێنرێ و ببرژێـنرێ؟

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٩١٦، والترمذي: ٣٨٠٠، وقال: حسن صحيح، واللفظ له.

وشـەی (صِلِي) چاوگـە دەگوتـرێ: (صَلِيَ النـارَ صِلِيّـاً) واتـە: خرایـە نێـو ئاگرەكـە، بەخرانـە نێـو.

وشـەی (أيّ) لـە: ﴿ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى ٱلرَّحْمَٰنِ عِتِيًّا ﴾، (إسم موصول)ە، بـە مانـای (ما ومَنْ) دێ، بـەڵام (أَيُّهُـم) لێـرەدا یـانی: (مَنْ مِنْهُـم) كامیـان.

وشـەی (الرحمـن) كـە لـەم سـوورەتەدا - وەك پێشـتر باسـمانكرد - شـازدە (١٦) جـاران دووبـارە بۆتـەوە، بۆیـە لێرەدا هاتـوە: ﴿ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى ٱلرَّحْمَٰنِ عِتِيًّا ﴾، یـانی: لەگـەڵ ئەوەشـدا كـە خـوا خـاوەنی ئەوپـەڕی بەزەیـی و بەخشـش و سـۆزو میهرەبانییـە، كەچـی ئەوانـە لێـی هەڵگەڕاونـەوە و لـە بەرانبەریـدا سـەركەش و یاخییـن، ئنجـا ئەمـە بـۆ زیاتـر ناقـۆڵا پێشـاندانی: هەڵگەڕانـەوە و یاخیـی بوونیانـە، چونكـە ئەگـەر لـە بەرانبـەر كەسـێكدا كـە سـتەم دەكات، سەركەشـیی بنوێنـی، ڕەوایـەو بگـرە پێویستیشـە، بـەڵام لـە بەرانبـەر كەسـێكدا كـە خـاوەنی ئەوپـەڕی میهرەبانیــی و بەخشــندەیی و، ســۆزو بەزەییــە: یاخیبــوون و ســەرپێچییكردن و هەڵگەڕانـەوە، زۆر شـتێكی ناقـۆڵاو دزێـوە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**باسی ئەوە کە: هیچ کام لە مرۆڤەکان نیە، نەچێتە سوێی دۆزەخ و نیزیکی و، ئەوە بڕیاری یەکلاییکەرەوەی خوای لەسەرە و، خوا لەوبارەوە بڕیاری یەکلاییکەرەوەی داوە، پاشان خوا پارێزکاران دەپارێزێ و دەرباز دەکات لە دۆزەخ و، ستەمکارانیش لەسەر ئەژنۆیان، لە ئاگری دۆزەخدا بە زەبوونیی بەجێدەهێڵێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەو ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ﴾، هیچ کام لە ئێوە نیە، کە نەچێتە سوێ (دۆزەخ)، نزیکی نەکەوێتەوە، بەسەریدا ڕەت نەبێ.

**ئەمانە هەموویان مانای (ورود)ن: لێی نزیک دەکەوێ، دەچێتە سوێی، دەچێتە ئەنیشتی، بەسەریدا ڕەت دەبێ، بەسەر ئەو پردەدا کە بەسەر دۆزەخ ڕاهێڵراوە، هەندێکیش گوتوویانە: (واردها) واتە: (داخلها)، واتە: دەچێتە نێو دۆزەخ، کە دوایی کورتە باسێك لەو بارەوە دەکەین و ڕوونی دەکەینەوە، کە ئەم ڕایە هەڵەیە.**

٢)- ﴿ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴾، ئا ئەو بڕیارە لەلایەن پەروەردگارتەوە، بڕیارێکی بڕێنراوەیە، بڕیارێکی یەکلاییکراوەیە، (حَتْم) ئەوەیە شتێك پێویست بوو بێ و هەڵبڕابێ و بواری چاو پێداگێڕانەوەی نەبێ، (مَقْضِيٌّ) واتە: بڕیار لەسەر دراو، (قضاء) واتە: بڕیار، (مَقْضِيٌّ) یانی: شتێك کە بڕیاری لە بارەوە دراوە.

٣)- ﴿ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا ﴾، دوایی ئەوانەی پارێزیان کردوە، دەربازیان دەکەین، خوێنراویشەتەوە: (ثُمَّ نُنْجِي الَّذِينَ اتَّقَوا) هەردووك خوێندنەوەکەی هاتوون.

٤)- ﴿ وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴾، ئەوانەش کە ستەمکاربوون، لەوێدا لێیان دەگەڕێین، بەجێیان دەهێڵین لەسەر ئەژنۆیان.

(نَذَر) یانی: (نَتْرُكُ، نُهْمِلُ) لێیان دەگەڕێین، وازیان لێدێنین، پشتگوێیان دەخەین، وشەی (نذر) (فعل مضارع)ە، بەڵام ڕابردووی لە بێژەی خۆی نیە و لە زمانی عەرەبییدا کردارە ڕابردووەکەی، مرێنراوە و ئیکتیفایان کردوە بە کرداری ڕابردووی هەرکام لە: (تَرَكَ و وَدَعَ) یانی: لێیگەڕا، وازی لێهێنا.

## کورتە باسێك دەربارەی چوونە سوێ دۆزەخ و ڕەتبوون بەسەر (صراط)دا:

بەڕێـــــزان!

لە میانی تەفسیرکردنی ئەم دوو ئایەتە موبارەکەدا، کە خوا عزوجل دەفەرموێ: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾ ﴾مريم.

کورتە باسێك دەکەین لە بارەی مانای وشەی (واردها) و، چۆنیەتی چوونە سوێی دۆزەخ، یاخود چوونە نێو دۆزەخەوە:

لەو بارەوە بەگشتی دوو ڕاهەن:

١)- کە دوێنراو (مُخاطب) لێرەدا کافرەکانن بە تەنیا، واتە: هیچ کام لە ئێوە نیە، ئەی بێبڕوایەکان! مەگەر دەچێتە نێو دۆزەخ، ئنجا ئەگەر وابێ، ئەو کاتە (واردها) یانی: دەچێتە نێوی (داخلُها)، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴾، (ثُمَّ) (للتَّرتيبِ الرُّتبي) یانی: دوایی کافرەکان لە دۆزەخدا بەجێدەهێڵین، بەڵام ئەوانەی پارێزکاربوون، دەربازیان دەکەین، واتە: لێرەدا باسی ئەوە نیە کە پارێزکارانیش و ئیماندارانیش دەچنە نێو دۆزەخ، بەڵکو خوا دەفەرموێ: دەربازیان دەکەین، لەوەی بچنە نێو دۆزەخ.

٢)- دوێنراو (مُخاطَب) لێرەدا تێکڕای خەڵکە، هەموو مرۆڤەکانن، ئنجا ئەگەر هەموو مرۆڤەکان بن، ئەو کاتە دەبێ بڵێین: (واردها)، یانی: دەچێتە سوێی، دەچێتە نزیکی، یاخود بەسەر پشتیدا ڕەت دەبێ.

(الزمشـخري) گوتوویـەتی: (﴿ وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾ ﴾مريـم، فيـهِ دَليلٌ عَلى أَنَّ المرَادَ بالـوُرودِ: الجُثـوُّ حَوَاليهَـا، وَأنَّ المؤمِنِيْنَ يُفَارِقُـونَ الكَفَـرَةَ إلى الجَنَّـةِ، بَعْدَ تَجَاثِيهِـم، وَتَبْقَى الكَفَـرَةُ في مَكَانِهِم جَاثِين)[١]، واتـە: ئـەم ئایەتـە بەڵگـەی تێدایـە لەسـەر ئـەوە کـە مەبەسـت لـە (ورود) بریتیـە لـە

---

(١) محاسن التأويل ج٧، ص١٤٢.

لەسـەر ئەژنـۆ کەوتـن، لـە دەوری دۆزەخ، دوایـی بـڕواداران لـە کافـرەکان جیادەبنـەوە، بـەرەو بەهەشـت، دوای ئـەوەی هەموویـان پێکـەوە لەسـەر ئەژنـۆ لـە دەوری دۆزەخ دانیشـتبوون، بـەڵام کافـرەکان لـە شـوێنی خۆیـان بـە (لەسـەر ئەژنـۆ کەوتوویـی) دەمێننـەوە.

لـە بـارەی مانـای ئـەو ئایەتـەی پێشـووەوە، زانایـان دوو ڕای سـەرەکییان هـەن، کـە پێشـتریش باسـمان کـردن، بـەڵام چەنـد فەرمایشـتێکی پێغەمبـەر ﷺ هـەن، بۆمـان یەکلایـی دەکەنـەوە، کـە کام ڕاییـە ڕاسـترە و، مەبەسـت لـەم ئایەتـە موبارەکـە و، مەبەسـت لـە وشـەی: (وَارِدُهَا) لێـرەدا چیـە؟

١)- [عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنهما، قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: الْوُرُودُ: الدُّخُولُ، لَا يَبْقَى بَرٌّ وَلَا فَاجِرٌ إِلَّا دَخَلَهَا، فَتَكُونُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ بَرْدًا وَسَلَامًا، كَمَا كَانَتْ عَلَى إِبْرَاهِيمَ: ﴿ ثُمَّ نُنَجِّي ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴾] (أَخْرَجَهُ أَحْمَد ج٣، ص٣٢٩، وَالحَاكِمُ: ٨٧٤٤، وَقَالَ الهَيْثَمِيُّ فِي المجمع: ج٧، ص٥٥ رَوَاهُ أَحْمَد، وَرِجَالُهُ ثِقَات).

واتـە: جابیـری کـوڕی عەبدوڵـڵا (خـوا لـە خـۆی و لـە بـابی ڕازی بـێ) دەڵـێ: گوێـم لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـوو دەیفەرمـوو: (وُرُود) لێـرەدا مانـای چوونـە ژوور (الدُّخـول)ە، هیـچ چاکـەکار و خراپەکارێـك نامێنـی، مەگـەر دەچێتـە نێـو دۆزەخ، دوایـی بـۆ بـڕواداران دەبێتـە فێنکایەتیـی و سـەلامەتیی، هـەروەك چـۆن ئاگـر بـۆ ئیبراهیـم بـوو بـە فێنکایەتیـی و سـەلامەتیی، دوایـی ئـەو ئایەتـەی خوێنـدەوە: ﴿ ثُمَّ نُنَجِّي ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴾، واتـە: دوایـی ئەوانـەی پارێزییـان کـردوە، دەربازیـان دەکەیـن.

٢)- [يَرِدُ النَّاسُ النَّارَ، ثُمَّ يَصْدُرُونَ مِنْهَا بِأَعْمَالِهِمْ، فَأَوَّلُهُمْ كَلَمْحِ البَرْقِ، ثُمَّ كَالرِّيحِ، ثُمَّ كَحُضْرِ الفَرَسِ، ثُمَّ كَالرَّاكِبِ فِي رَحْلِهِ، ثُمَّ كَشَدِّ الرَّجُلِ، ثُمَّ كَمَشْيِهِ] (أَخْرَجَهُ التِّرْمِذِيُّ: ٣١٥٩، وَالدَّارِمِيُّ: ٢٨١٠، وَصَحَّحَهُ الأَلبَانِيُّ فِي «السلسلة الصحيحة»: ٣١٢).

واتـە: خەڵـك دەچنـە سـوێی ئاگریـی دۆزەخ، دوایـی بەکردەوەکانیـان لێـی دەردەچـن، یەکەمیـان: وەك برووسـکەی تیشـك، دوایـی وەك بـا، (لـە ڕوویـی خێراییـەوە) دوایـی وەك ئەسـپێك کـە بـە خێرایـی بـڕوا، دوایـی وەك حوشـتر سـوارێك کـە بـە خێرایـی دەڕوات، ئنجـا وەك پیاوێـك کـە بەڕاکـردن دەڕوات، دوایـی وەك ڕۆیشـتنی ئاسـایی.

٣)- [ثُمَّ يُضْرَبُ الجِسْرُ عَلَى جَهَنَّمَ، وَتَحِلُّ الشَّفَاعَةُ، وَيَقُولُونَ: اللَّهُمَّ سَلِّمْ سَلِّمْ، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ! وَمَا الجِسْرُ؟ قَالَ: «دَحْضٌ مَزِلَّةٌ، فِيهِ خَطَاطِيفُ وَكَلَالِيبُ وَحَسَكٌ تَكُونُ بِنَجْدٍ فِيهَا شُوَيْكَةٌ، يُقَالُ لَهَا: السَّعْدَانُ،

فَيَمُرُّ الْمُؤْمِنُونَ كَطَرْفِ الْعَيْنِ، وَكَالْبَرْقِ، وَكَالرِّيحِ، وَكَالطَّيْرِ، وَكَأَجَاوِيدِ الْخَيْلِ، وَالرِّكَابِ، فَنَاجٍ مُسَلَّمٌ، وَمَخْدُوشٌ مُرْسَلٌ، وَمَكْدُوسٌ فِي نَارِ جَهَنَّمَ)(أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ: ٤٩١٩، وَمُسْلِم: ١٨٣).

واتـە: {پێغەمبـەر ﷺ لـە فەرمایشـتێکدا، کـە بـاسی ڕۆژیـی دوایـی دەکا، دوایـی لـە درێـژەی فەرمایشـتەکەدا دەفەرمـوێ:} دوایـی پـرد بەسـەر دۆزەخ ڕادەهێڵـدرێ و تکاکـردن (شـفاعة) کـردن، دێتـە گـۆڕێ، خەڵکەکـەش هـەر دەڵێـن: ئـەی خوایـە! سـەلامەتمان بکـە و بـێ بەڵامـان بکـە، گوتـرا: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ﷺ پـرد چییـە !؟ فەرمـووی: لووسـە خلیسـکە، قولاپـی هـەن و دڕکـی پێـوەن، وەك دڕکێـك پێـی دەڵێـن: (حَسَـك) لـە (نَجـد) دەڕوێ، دڕکۆکێکـی پێوەیـە، بـە قولاپـە، پێـی دەگوتـرێ: (السَّعْدَان)، بـڕواداران تێدەپـەڕن، وەك: چـاو تـرووکان و، وەك برووسـکە و، وەك بـاو، وەك باڵنـدە و، وەك ئەسـپی خێـرا و، وەك وشـترێکی خێـرا {ئنجـا خەڵـك دەبنـە چەنـد بەشـێك و پۆلێـن دەکرێـن:}

١- (فَنَاجٍ مُسَلَّمٌ): دەربازبووێکی سەلامەت هەیە، کە هیچ ئازاری پێ ناگات.

٢- (وَمَخْدُوشٌ مُرْسَلٌ): هەشە بریندار دەبێ، بەڵام دوایی دەرباز دەبێ و بەرهەڵدا دەکرێ، {ئەو قولاب و دڕکانە، تێی دەئاڵێن دوایی دەربازی دەبێ}.

٣- (وَمَكْدُوسٌ فِي نَارِ جَهَنَّمَ): کەسانێکیش هەن دەکەونە ئاگری دۆزەخەوە و لەوێدا کەڵەکە دەبن.

(القرطبي) لـە تەفسـیرەکەی خۆیـدا دەڵـێ: {وَبِـهِ احْتَـجَّ مَـنْ قَـالَ: إِنَّ الجَـوَازَ عَـلَى الـصِّرَاطِ هُـوَ الْـوُرُودُ الَّـذِي تَضَمَّنَتْـهُ هَـذِهِ الْآيَـةُ، لَا الدُّخُـولُ فِيهَـا}[1].

واتـە: ئەوانـەی کـە گوتوویانـە: مەبەسـت لـە (الْـوُرُودُ) بریتیـە لـە ڕەتبـوون بەسـەر پـرددا، ئـەو (ورود)ەی لـەم ئایەتـەدا هاتـوە، مەبەسـت پێـی ڕەتبوونـە بەسـەر پـردی پشـتی دۆزەخـدا، نـەك چوونـە نێـو دۆزەخ، بەڵگەیـان بـەم فەرمایشـتە هێناوەتـەوە.

هەڵبەتـە ڕای ڕاسـتیش هـەر ئەوەیـە، کـە مەبەسـت لـەو ئایەتـە موبارەکـەی دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ﴾، واتـە: دەچێتـە سـوێی، دەچێتـە نیزیـکی، کـە لـە فەرمایشـتی دووەمـدا ئامـاژەی پێـداوە، کـە دەفەرمـوێ: (يَـرِدُ النَّـاسُ النَّـارَ، ثُمَّ يَصْـدُرُونَ مِنْهَـا)، هەروەهـا لـە فەرمایشـتی یەکەمـدا کـە دەفەرمـوێ: (الْـوُرُودُ: الدخـول، لا يَبْقـى بَـرٌّ ولاَ فَاجِـرٌ إِلاَّ دَخَلَهَـا)، چونکـە کـە چوویـە سـەر ئـەو پـردەی بەسـەر دۆزەخ ڕاهێڵـدراوە، مانـای وایـە: چوویـە سـنووری دۆزەخـەوە، مەبەسـتی فەرمایشـتەکان هـەر ئەوەیـە، مەبەسـت ڕەتبـوونی هەموویانـە، بەسـەر

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج١١، ص١١٦.

پردەکـەدا، ئنجـا ئـەوەی برواداربـێ، هــەر کەسـە لـە قـەدەر ئیمانـی خـۆی، بـە خێرایـی تێدەپـەڕێ، ئـەوەش کـە بـێ ئیمان و خراپـەکار بـوو بـێ، لەسـەر ئـەو پـردە دەکەوێتـە خـوار.

لەو بارەوە دەگونجێ بەڵگەی دیکەش بهێنرێنەوە، بۆ نموونە:

٤)- پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێ: {الحُمَّى حَظُّ الْمُؤْمِنِ مِنَ النَّارِ} (أَخْرَجَهُ البَزّار: ٧٦٥، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، وَعَنْ أَنَس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: ٧٦٢ وَصَحَّحَهُ الألباني فِي « السلسلة الصحيحة»، : ١٨٢١).

واتە: تا، (کە مرۆڤ بەدەنی گەرم دادێ)، پشك و بەشی بڕواداره لە ئاگری دۆزەخ.

{واتـە: ئـەوە پشـك و بەشـەکەیەتی لـە دنیـادا و بـە هـۆی ئـەو تـا لێهاتنـەوە، ئـەو گەرمییـە دەبینـێ، کەواتـە: گەرمیـی دۆزەخ نابینـێ.

٥)- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ أَحَدَكُمْ، إِذَا مَاتَ، عُرِضَ عَلَيْهِ مَقْعَدُهُ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ، إِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَمِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ؛ فمن أهل النار فَيُقَالُ هذَا مَقْعَدُكَ حَتَّى يَبْعَثَكَ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ} (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ: ٣٢٤٠، وابن ماجه: ٤٢٧٠ وأحمد ج٢، ص٥١).

واتــە: عەبدوڵـڵای کــوڕی عومــەر (خــوا لێــان ڕازی بــێ)، دەڵــێ: پێغەمبــەری خــوا ﷺ فەرموویـەتی: هـەر کامێك لـە ئێـوە مـرد، بەیانیـان و ئێـواران شـوێنی خۆی پـێ پێشـان دەدرێ، ئەگـەر خەڵـکی بەهەشـت بـێ، ئـەوە خەڵـکی بەهەشـتە (یـانی: بەهەشـتی پێشـان دەدرێ) و ئەگـەر خەڵـکی ئاگریـش بـێ، ئـەوە خەڵـکی ئاگـرە، (یـانی: ئاگـری پێشـان دەدرێ) دەگوتـرێ: ئەمـە جێیەکەتـە هەتاکـو ڕۆژی قیامـەت خـوا زینـدووت دەکاتـەوە.

٦)- بەڵگەیەکی دیکە لەو بارەوە کە دەگونجێ بهێنرێتەوە، ئەوەیە کە خوا ﷻ وشەی (ورود)ی بەمانای چوونە سوێ بەکارهێناوە، لە سوورەتی (القصص)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسْقُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾، واتە: کاتێك مووسا چووە سەر ئاوی مەدیەن، کۆمەڵێکی لەسەر دیتن ئاژەڵیان ئاو دەدا.

واتە: چووە سوێی، چووە قەراغی، بێگومان مەبەست پێی ئەوەیە.

(راغـب الأصفهـاني) لـە کتێبەکـەی خـۆی (مفـردات ألفـاظ القـرآن)دا گوتوویـەتی: {وَرَدْتُ مَـاءَ كَـذَا: إِذَا حَضَرَهُ، وإِنْ لَـمْ يَـشْرَعْ فِيـهِ، وَقِيْـلَ: بَـلْ يَقْتَضِي ذَلِـكَ الـشروعَ، وَلَكِـن مَـنْ كَانَ مـن أوليـاء اللَّـه وَالصَّالحـين لا تُؤثِّـرُ فيهـم، بَـلْ يَكُـون حَالُـهُ فِيهَـا كَحَـالِ إِبْرَاهِيـم عَلَيْـهِ السَّـلام، حَيْـثُ قَـالَ: ﴿ قُلْنَا يَـٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَـٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ ﴾الأنبيـاء}[1]

---

(١ ) مفردات ألفاظ القرآن، ص٨٦٥.

واتە: (وَرَدْتُ مَاءَ كَذَا)، واتە: لە لای ئامادە بوو، هەرچەندە نەچووبێتە نێویشی، هەندێکیش گوتوویانە: بەڵکو ئەوە دەخوازێ کە بچێتە نێوی {واتە: بە نسبەت ئایەتەکەوە} بەڵام ئەوەی کە لە دۆستانی خوا بێ و لە چاکان بێ، ئاگرەکە کاریگەریان تێ ناکات، بەڵکو حاڵی وەك حاڵی ئیبراهیم ﷺ دەبێ کە خرایە نێو ئاگرەوە، بەڵام خوا فەرمانی بە ئاگر کرد کە سارد و سەلامەت بێت لە سەر ئیبراهیم ﷺ.

بەڵام وەك گوتمان: ڕای ڕاست ئەوەیە کە ڕابردنیان بەسەر پردەکەدا و، تێپەڕینیان، ئەوە مانای وشە قورئانییەکەیە: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ﴾، یانی: (ورود) مەبەست پێی ڕەتبوونە بەسەر پشتی دۆزەخدا، نەك بچنە نێو دۆزەخ، ئنجا دوایی خوای پەروەردگار بیانهێنێتە دەرێ، چونکە وشەی (ورود) هەر ئەوەندە دەگەیەنێ و، فەرمایشتەکان لەو بارەوە، زۆر ڕۆشن و ئاشکران.

**مەسەلەی چوارەم:**

**کاتێك بێبڕوایان ئایەتەکانی خوایان بە سەردا دەخوێنرێنەوە، لە جیاتی بڕواپێهێنان، بە سامان و قەڕەباڵغیی دەوریان، خۆیان بەسەر بڕوادارانـدا هەڵدەکێشن و، دەیکەنە بەڵگە کە ئەوان لەسەر هەقن، هەرچەندە خوا گەلێك کۆمەڵگای لەوان سامانداترو بەرچاوتری لە پێش ئەواندا فەوتاندوون، ئنجا ئەگەر ماڵ و سامان و دەسەڵات، هەبوون بەڵگە بووایە لەسەر هەق بوون، دەبوو ئەو گەل و کۆمەڵگا پێشووانە نەفەوتێنرابانایە:**

**خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَىُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ خَيْرٌ مَّقَامًا وَأَحْسَنُ نَدِيًّا ﴿٧٣﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَحْسَنُ أَثَٰثًا وَرِءْيًا ﴿٧٤﴾ ﴾:**

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێ بڕگەدا:

**١)- ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ ﴾، کاتێك ئایەتە ڕۆشنەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنرێنەوە.**

**٢)- ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان {بە خواو فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی و، بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بێنن} بەوانەیان گوت کە بڕوادارن، {بڕوادارن بە: خواو فریشتەکانی و کتێبەکانی و، پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی و، بە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە بڕوایان پێ بێنن} چییان پێگوتن؟**

**٣)- ﴿ أَىُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ خَيْرٌ مَّقَامًا وَأَحْسَنُ نَدِيًّا ﴾، کام لە دوو کۆمەڵەکان، {ئێمە یان ئێوە} پێگەی باشترە و کۆڕ و مەجلیسیشی چاکترە؟ یانی: مادام ئێمە دەوڵەمەندترین و دەورمان قەڵەباڵغترە، کەواتە: ئێمە ڕاسترین!**

**وشەی ﴿ مَّقَامًا ﴾ خوێنراویشەتەوە: (مُقاماً)، ئنجا (مُقام) و (مَقام) ناوی شوێنی: (قامَ، يَقُومُ، مَقاماً ومُقاماً)، بەڵام لێرەدا هەردووکیان (مَقام ومُقام) بە مەجاز مەبەست پێیان پلە بەرزییە.**

**وشەی ﴿ نَدِيًّا ﴾ وەك پێشتریش باسمان کرد، بە مانای مەجلیس دێ، یان بە مانای کەسانێك کە لە مەجلیسەکەدا دادەنیشن، واتە: کاممان دیوەخانمان چاکترە؟ یاخود: دانیشتووانی نێو دیوەخانمان جوانترن و، بەرچاوترن و حاڵ و پێگەمان باشترە؟**

بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ ﴾، (كَمْ) لێرەدا زانایانی زمان دەڵێن: (كَمْ الخَبَرِيَّة، يَدُلُّ عَلَى الكَثْرَةِ)، (كَمْ) یانی: زۆر، لە پێش ئەوان دا زۆر سەدەمان فەوتاندوون، واتە: زۆر کۆمەڵگا کە لە سەدەیەکدا پێکەوە ژیاندوومانن، فەتاندوومانن.

﴿ قَرْنٍ ﴾، یانی: (أُنَاسٌ مُقْتَرِنُونَ بزمان)، خەڵکێک کە لە ڕۆژگارێکی تایبەتدا لە سەدەیەکی تایبەتدا ژیاون، زۆرمان فەوتاندوون.

چۆن بوون؟ ﴿ هُمْ أَحْسَنُ أَثَٰثًا وَرِءْيًا ﴾، کە ئەوان کەل و پەلیشیان باشتر بوو، دیمەنیشیان چاکتر بوو.

وشەی ﴿ أَثَٰثًا ﴾، دەگوترێ: (مَتَاعُ البَيْتِ الذِي يُتَزَيَّنُ بِهِ، لا وَاحِدَ لَهُ وَقِيلَ: مُفْرَدُهُ أَثَاثَة)، ﴿ أَثَٰثًا ﴾: بە کەل و پەلی ماڵان دەگوترێ، کە نێو ماڵی پێ دەڕازێندرێتەوە، ئەو وشەیە تاك (مفرد)ی نیە لە خۆی.

هێندێکیش گوتوویانە: تاکەکەی بریتیە لە: (أَثَاثَة)، لە ئەصڵدا لە (أَثَّ)ەوە هاتوە، (أَثَّ)، یانی: (كَثُرَ)، (وكَثُفَ)، واتە: زۆر بوو، چڕو پڕ بوو.

وشەی (رِءْيًا) (فِعْل)ە، بە مانای (مَفْعُول)ە، یانی: (الرِّءْي) (المَرئِي)، وەك (الذِّبْح): (المَذْبُوح)، یانی: سەربڕاو، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَفَدَيْنَٰهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ ﴿١٠٧﴾ ﴾الصافات.

کەواتە: (الرِّءْي)، واتە: دیمەن، دیمەنی بینراو و بەرچاو، خوێنراویشەتەوە: (رِيًّا)، کە ئەو کاتە لە (رَيِّ)ەوە هاتوە، (رَيّ)، واتە: ئاودار و پاراو، کە مەبەست پێی خۆشگوزەرانیی و خاوەن نیعمەت بوونە.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**باسی ڕست درێژ کردن و، مۆڵەت دانی خوا بە گومڕایان و، زیاتر ڕاستەڕێکردنی ڕێ ڕاستگرتووان و، سەرەنجامی شوومی لادەران و، ناکامی خێری کردەوە باشانی بڕوادار:**

**خوا فەرموویەتی:** ﴿ قُلْ مَن كَانَ فِي الضَّلَالَةِ فَلْيَمْدُدْ لَهُ الرَّحْمَٰنُ مَدًّا ۚ حَتَّىٰ إِذَا رَأَوْا مَا يُوعَدُونَ إِمَّا الْعَذَابَ وَإِمَّا السَّاعَةَ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضْعَفُ جُندًا ﴿٧٥﴾ وَيَزِيدُ اللَّهُ الَّذِينَ اهْتَدَوْا هُدًى ۗ وَالْبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ مَّرَدًّا ﴿٧٦﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:**

**١)- ﴿ قُلْ مَن كَانَ فِي الضَّلَالَةِ ﴾، بڵێ: هەر کەسێك لە گومڕاییدا بێ.**

**٢)- ﴿ فَلْيَمْدُدْ لَهُ الرَّحْمَٰنُ مَدًّا ﴾، با (خوای) خاوەن بەزەیی بە ڕست درێژکردن، ڕستی بۆ درێژ بکات، با بە مۆڵەت دان، مۆڵەتی بدات و، بیهێڵێتەوە.**

**ئەمە وەڵامی ئەو قسەیانە کە دەیانگوت: ﴿ أَيُّ الْفَرِيقَيْنِ خَيْرٌ مَّقَامًا وَأَحْسَنُ نَدِيًّا ﴾، واتە: کام لە دوو کۆمەڵەکان، پێگەی باشترە و کۆڕو مەجلیسیشی چاکتر و بەرچاوترە؟ خوا پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ فێردەکات کە پێیان بفەرموێ: ئا ئەوەی کە دەیبینن: ئەوە مۆڵەت پێدانی خوایە، ئەوە ڕست و ڕێشمە بۆ درێژکردنی خوایە، بۆ بێبڕوایان، نەك ئەوە کە لە لای خوا، پەسندو ڕێزلێگیراوبن! چونکە پێوەر و تەرازووی ئەوە کە: خوا ڕێز لە بەندەیەك دەگرێ: یان ڕێزی لێناگرێ؟ خۆشی دەوێ، یان خۆشی ناوێ؟ پابەندییەتی بە شەریعەتەوە، نەك ئەوە کە چەندەی داوەتێ، یان چەندەی نەداوەتێ! دەوڵەمەندی کردوە، یان هەژاری کردوە! ساغی دەکات، یان نەخۆشیی دەکات! دەسەڵاتی داوەتێ، یاخود بێ دەسەڵاتە! چونکە مەسەلەکانی: سامانداریی و هەژاریی، ساغیی و نەخۆشیی، دەستەڵاتداریی و بێ دەسەڵاتیی، کۆمەڵێ هۆکاری دیکەیان هەن، هەر کەسێ ئەو هۆکارانە بگرێتەبەر، دەوڵەمەند دەبێ، ساغ دەبێ، بە دەسەڵات دەبێ، خاوەن ئیمکانیات دەبێ، بەپێچەوانەوەش: هەر کەسێك ئەو هۆکارانە پشتگوێ بخات، پێچەوانەی ئەو حاڵەتانەی بۆ دێنە پێش، بەڵام مەرج نیە، هەر کەسێك: بێ دەستەڵات و هەژار و نەدار و نەخۆش و داماو بوو، خوا ڕقی لێی بێ و، هەر کەسێکیش: خاوەن**

دەسەڵات و سەروەت و سامان و جەستەی ساغ و، خاوەن خزم و قەومی زۆر بوو، خوا خۆشی بویّ! پەسەند بوون و، پەسەند نەبوون، لەلای خوا، دەبیّ بیگێڕینەوە بۆ پێوەرو تەرازووی شەریعەت.

٣)- کە دەفەرمویّ: هەر کەسێك لە گومراییدا بیّ، ﴿ فَلْيَمْدُدْ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ مَدًّا ﴾، ئەم (ل) ە: (لامُ الأمْرِ أوِ الدُّعَاءِ، اسْتُعْمِلَتْ مَجَازاً فِي لاَزِمِ مَعْنَى الأمْرِ، وَهُوَ التَّحْقِيق أي سَيَمُدُّ لَهُ الرَّحْمَنُ مَداً، وهَذا وَاقِعٌ لا مَحَالَةَ عَلَى سُنَّةِ اللّٰهِ فِي أهلِ الضَّلالِ)، واتە: (ل) بۆ فەرمانە یان بۆ پاڕانەوەیە، بەڵام لێرەدا بە مەجاز بەکارهێنراوە بۆ شتێك کە بەرهەمی مانای فەرمان (أمْر)، [یاخود بەرهەمی مانای دوعایە] کە بریتیە لە: هاتنە دیّ و مسۆگەر بوونی ئەو شتە، واتە: بە مسۆگەریی خوای خاوەن بەزەیی ڕستی بۆ درێژ دەکات، بە پێی یاسای خوا لە مامەڵە کردنی لەگەڵ گومڕایان و سەرلێشێواواندا، [لێیان دەگەڕیّ و ڕستیان بۆ درێژ دەکات و، مۆڵەتیان دەدا].

٤)- ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوْاْ مَا يُوعَدُونَ ﴾، هەتا کاتێك ئەوەیان بینی کە بەڵێنیان پیّ درابوو، یاخود: هەڕەشەیان پیّ لیّ کرابوو، کە بە نسبەت ئەوانەوە، هەڕەشە لیّ کردنە، چونکە (وَعْدُ و وَعِيْد) هەردووکیان لە حاڵێکدا کە بە بکەر نادیار (البناءُ للمَجْهُوْل) دەهێنرێن، هەر بە (يُوعَدُون) دەهێنرێن، ئەگەرنا (أوْعَدَ، يُوعِدُ، وَوَعَدَ، يَعِدُ)، لە حاڵەتی بکەر زانراو (البناء للمعلوم)دا لە یەك جیادەبنەوە.

٥)- ﴿ إِمَّا ٱلْعَذَابَ وَإِمَّا ٱلسَّاعَةَ ﴾، ئەوەی کە بەڵێنیان پیّ درابوو، هەڕەشەیان پیّ لێکرابو و، دوو شتە: یان سزایە لە دنیادا، یاخود ئاخیر زەمانەو هاتنی کۆتایی دنیایە.

وشەی (إمَّا) لێرەدا (حَرْفُ تَفْصِيلٍ لِمَا يُوعَدُوْن)، پیتێکە بەکاردەهێنریّ بۆ ڕوون کردنەوەی شتێك، کە لە پێشەوە هاتوە، ئنجا ئەوەی لە پێشەوە هاتوە و (إمَّا) ڕوونی دەکاتەوە، بریتیە لە: ﴿ مَا يُوعَدُونَ ﴾، ئەوەش کە هەڕەشەیان پێی لێکراوە، یان گفتیان بەهۆیەوە پێدراوە: یان سزای دنیاییە، یاخود ئاخیر زەمانە.

٦)- ﴿ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ شَرٌّ مَّكَانًا ﴾، ئەو کاتە دەزانن: حاڵی کیّ خراپترە؟ ئەمەش لە بەرانبەر ئەو قسەیاندایە، کە دەیانگوت: ﴿ أَيُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ خَيْرٌ مَّقَامًا ﴾، ئەو کاتە بۆیان دەردەکەویّ: کیّ پێگەو حاڵ و باڵی خراپترە.

٧)- ﴿ وَأَضْعَفُ جُندًا ﴾، بۆشیان دەردەکەویّ: کیّ سوپاو سەربازەکانی بێهێزترن، ئەمیش لە بەرانبەر ئەو قسەیان دایە، کە دەیانگوت: ﴿ وَأَحْسَنُ نَدِيًّا ﴾، واتە: کیّ کۆڕو مەجلیسیشی قەڵەباڵغترە.

کافرەکان خۆیان بەو کۆڕ و مەجلیسە هەڵدەکێشا کە پشت و قوەتیان بوو خواش دەفەرموێ: کاتێك ئەوەی هەڕەشەیان پێ لێکراوە، دێ، چ سزای دنیایی بێ، چ ئاخیر زەمان، بۆیان دەردەکەوێ: کێ حاڵی خراپترە و پێگەی خراپترە و، کێش سوپاکەی بێهێزترە، یانی: ئەو خەڵکەی کە خۆیان پێ هەڵدەکێشێ، بێهێزن لە بەرانبەر سزای خوادا.

٨)- ﴿ وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ هُدًى ﴾، خوا ئەوانەی کە ڕاستەڕێ بوو ون، ڕاستەڕێ بوونیان بۆ زیاد دەکات، یانی: زیاتر هیدایەتیان دەدات و، دڵیان ڕۆشن دەکات.

٩)- ﴿ وَٱلْبَـٰقِيَـٰتُ ٱلصَّـٰلِحَـٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ مَّرَدًّا ﴾، واتە: کردەوە چاکە ماوەکان لە لای پەروەردگارت، لە ڕووی پاداشتەوە باشترن، ﴿ وَخَيْرٌ مَّرَدًّا ﴾، هەروەها لە ڕووی سەرەنجامیشەوە، بێگومان چاکترن.

﴿ مَّرَدًّا ﴾، (المَرَدُّ: المَرجِعُ، والمَرَادُ بِهَا عَاقِبَةُ الأمرِ)، مەبەست پێی سەرەنجامە، یانی: ئەو کردەوە باشە ماوانە [نەك کردەوە خراپە فەوتاوەکان] بەڵکو کردەوە باشە ماوەکان، پاداشتیان لەلای پەروەردگارت باشترەو، سەرەنجامیشیان بێگومان پڕ خێر و بەرەکەتترە.

## پێنج کورتە سەرنجی زمانەوانیی:

١)- (المَدُّ حَقِيقَتُهُ إِرْخَاءُ الحَبْلِ وإِطَالَتُهُ، يُسْتَعْمَلُ مَجَازاً فِي الإِمْهَالِ، يُقَالُ مَدَّ اللَّهُ فِي عُمُرِكَ، ومَدّاً: مَفْعُولٌ مُطْلَقٌ مُؤَكِّدٌ لِعَامِلِهِ، أي: فَلْيَمْدُدْ لَهُ المَدَّ الشَّدِيدَ)، (مَدّ) مانا ڕاستەقینەکەی بریتیە لە ڕست بۆ درێژ کردن، پەت بۆ درێژ کردن و شل کردن، بەڵام بە مەجاز بەکاردەهێنرێ بۆ مۆڵەت دان، کە دەگوترێ: (مَدَّ اللَّهُ فِي عُمُرِكَ)، خوا تەمەنت درێژ بکات، واتە: مۆڵەتت بدا زیاتر بژی، وشەی (مَدًّا) لە ڕستەی ﴿ فَلْيَمْدُدْ لَهُ ٱلرَّحْمَـٰنُ مَدًّا ﴾دا، بەرکارێکی ڕەهایە و جەختکەرەوەی کارەکەی خۆیەتی، یانی: با خوای خاوەن بەزەیی زۆر ڕستی بۆ درێژ بکات و زۆر مۆڵەتی بدات.

٢)- وشەی (حَتَّى) (لِبلوغِ الغايةِ، وهنا لِغَايَةِ المَدِّ)، یانی: (حَتَّى) بەکاردەهێنرێ بۆ گەیشتن بە ئامانجێك، لێرەدا بۆ ئەوپەڕی درێژکردنەکەوەیە، (أي: يَمُدُّ لَهُ الرَّحْمَنُ إِلَى أَنْ يَرَوا مَا يُوعَدُونَ، أي لاَ مَحِيصَ لَهُمْ عَنْ رُؤْيَتِهِ)، واتە: با خوای بە بەزەیی مۆڵەتیان بدات تاکو ئەوەی هەڕەشەیان پێ لێدەکرێ، یاخود بەڵێنیان پێ دەدرێ، دەیبینن، واتە: حەتمەن هەر دەیبینن.

٣)- کە دەفەرموێ: ﴿ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ شَرٌّ مَّكَانًا ﴾ ، پیتی (س) لە (فسیعلمون)دا (سِينُ الإسْتِقْبَال)ە، یانی: سینی داهاتوویە، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی داهاتوو نیە، بەڵکو مەبەست پێی جەختکردنەوەی پەیدابوونی زانیارییە، ﴿ فَسَيَعْلَمُونَ ﴾، یانی: بە تەئکید زانیارییان پەیدادەبێ، ئەگەرنا مەبەست ئەوە نیە لە داهاتوودا ئەوە بزانن، چونکە مانای داهاتوو لە: (حَتّى) فامراوەتەوە، بەڵام لێرەدا پیتی (س) مەبەست پێی تەئکید کردنەوەی زانیاریی پەیداکردنیانە بەو شتە.

٤)- وشەی (إمّا) کە پێشتر گوتمان: پێی دەگوترێ: (حَرْفُ التَّفْصِيل)، پیتێکە بۆ درێژە پێدان و، ڕوونکردنەوە بە کاردێ و، لێرەدا بۆ ڕوون کردنەوەی مانای: ﴿ مَا يُوعَدُونَ ﴾ە، واتە: هەر کامێکیان لە بێبڕوایان: یان سزا دەبینێ، یاخود ئاخیر زەمانی بەسەر دادێ.

٥)- ﴿ وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْاْ هُدًى ﴾، خوا ئەوانەی کە ڕێی ڕاستیان گرتوە، ڕێنماییان بۆ زیاد دەکات، یان: ڕاستەڕێ بونیان زیاد دەکات، واتە: وەك چۆن لە گومڕایان دەگەڕێ و مۆڵەتیان دەدا، چونکە بە پێی یاسای خۆی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات، بە هەمان شێوەش: ڕێی ڕاست گرتووانیش هاوکاریی دەکات، بە یارمەتیی و هاوکاریی و خۆی، کە بریتیە لە زیادبوونی هیدایەت و پتر بەهرەمەندیان دەکات.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان کۆتا ئایەتەکانی سوورەتی (مریم)ی تێدا تەفسیر دەکەین، کە بیست و سێ (٢٣) ئایەتن، ئایەتەکانی: (٧٧ - ٩٨)، لەو (٢٣) ئایەتەدا، خوا چەند ڕاستییەکی گەورەو گرنگی خستوونە ڕوو، کە تەوەری سەرەکییان بەرپەرچدانەوەی شیرك و، چەند بیر و بۆچوونێکی هەڵەی بێبڕوایانە، هەروەها پانتاییەکی باشیش بۆ سەرەنجامی هەرکام لە پارێزکاران و تاوانباران تەرخان کراوە و، بە بەهێزترین شێوازی دەربڕین، بەرپەرچی بیرۆکەی هاوبەش پەرستیی دراوەتەوە، بە تایبەتی ئەفسانەی ڕۆڵە پاڵدانە لای خوا ﷻ.

لە کۆتاییشدا خوا ﷻ کۆی بابەتەکانی ئەم سوورەتە، بە سێ بابەتان کۆتایی دێنێ:

١)- بڕواداڕانی کردار باش، خوا خۆشەویستییان بۆ دەڕەخسێنێ.

٢)- خوا ﷻ قورئانی بە زمانی موحەممەد ﷺ کە عەرەبییە ئاسان کردوە، تاکو موژدەی پێبدات بە پارێزکاران و، کۆمەڵی کەللە ڕەقانی نەسەلمێنی پێ بترسێنێ.

٣)- خوای دادگەر گەلێك کۆمەڵگای لە سەدە پێشووەکاندا، فەوتاندوون، کە ئێستا هەست و نەستیان نەماوەو، چرپەیان لێوەنایەت.

﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا ﴿٧٨﴾ كَلَّا ۚ سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ﴿٧٩﴾ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ﴿٨٠﴾ وَٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً لِّيَكُونُوا۟ لَهُمْ عِزًّا ﴿٨١﴾ كَلَّا ۚ سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا ﴿٨٢﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّآ أَرْسَلْنَا ٱلشَّيَـٰطِينَ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ تَؤُزُّهُمْ أَزًّا ﴿٨٣﴾ فَلَا تَعْجَلْ عَلَيْهِمْ ۖ إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا ﴿٨٤﴾ يَوْمَ نَحْشُرُ ٱلْمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحْمَـٰنِ وَفْدًا ﴿٨٥﴾ وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴿٨٦﴾ لَّا يَمْلِكُونَ ٱلشَّفَـٰعَةَ إِلَّا مَنِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا ﴿٨٧﴾ وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَـٰنُ وَلَدًا ﴿٨٨﴾ لَّقَدْ جِئْتُمْ شَيْـًٔا إِدًّا ﴿٨٩﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَـٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ ٱلْأَرْضُ وَتَخِرُّ ٱلْجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوْا۟ لِلرَّحْمَـٰنِ وَلَدًا ﴿٩١﴾ وَمَا يَنۢبَغِى لِلرَّحْمَـٰنِ أَن

يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴿٩٢﴾ إِن كُلُّ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ إِلَّآ ءَاتِي ٱلرَّحۡمَٰنِ عَبۡدًا ﴿٩٣﴾ لَّقَدۡ أَحۡصَىٰهُمۡ وَعَدَّهُمۡ عَدًّا ﴿٩٤﴾ وَكُلُّهُمۡ ءَاتِيهِ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَرۡدًا ﴿٩٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجۡعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وُدًّا ﴿٩٦﴾ فَإِنَّمَا يَسَّرۡنَٰهُ بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ ٱلۡمُتَّقِينَ وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوۡمًا لُّدًّا ﴿٩٧﴾ وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّن قَرۡنٍ هَلۡ تُحِسُّ مِنۡهُم مِّنۡ أَحَدٍ أَوۡ تَسۡمَعُ لَهُمۡ رِكۡزَۢا ﴿٩٨﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

[ئایا ئەو کەسەت بینی، کە بڕوای بە ئایەتەکانمان نیەو، گوتی: بە دڵنیایی سامان و کوڕانم پێ دەدرێن لە ڕۆژی دواییدا! ﴿٧٧﴾ ئایا ئاگاداری پەنهانە! یان لە لایەن خوای میهرەبانەوە، پەیمانی وەرگرتوە؟! ﴿٧٨﴾ نەخێر، (هەرگیز وانیە)، بە دڵنیاییشەوە ئەوەی کە دەیڵێ، دەینووسین و، بەردەوام سزاو ئازاریشی بۆ زێدە دەکەین ﴿٧٩﴾ ئەوەش کە دەیڵێ: (لە سامان و کوڕان) لێی بە میرات دەگرین و، بە تەنیاو سەڵت و قوڵت دێتەوە لامان ﴿٨٠﴾ لە جیاتی خواش پەرستراوانێکیان گرتن، تاکو بۆیان ببنە هۆکاری باڵا دەستیی و زاڵبوون ﴿٨١﴾ نەخێر لەمەودوا بە پەرستنەکەیان بێبڕوا دەبن و دەبنە دژیان ﴿٨٢﴾ ئایا (بە چاوی عەقڵ و دڵ) نابینی کە ئێمە شەیتانەکانمان ناردوونە سەر کافران و، (ئێمان بەرداون)، بە سەختیی (لەسەر کوفرو تاوان) هانیان دەدەن ﴿٨٣﴾ دەجا پەلەیان لێ مەکە (سزا بدرێن)، ئێمە زۆر بە وردیی بۆیان دەژمێرین، (چەندە گوناهو تاوان دەکەن و، دەبێ چەندە و چۆن سزا بدرێن!) ﴿٨٤﴾ ئەو ڕۆژەی کە پارێزکاران بەرەو لای (خوای) میهرەبان لە شێوەی شانددا کۆدەکەینەوە [بە ڕێز و حورمەتەوە بەڕێیان دەکەین] ﴿٨٥﴾ تاوانبارانیش وەك ئاژەڵان بە تینوێتیی بەرەو دۆزەخ لێ دەخوڕین ﴿٨٦﴾ خاوەنی تکاکردن نین و، (شایستە نین تکایان بۆ بکرێ)، مەگەر کەسێك پەیمانی لە خوای میهرەبان وەرگرتبێ ﴿٨٧﴾ هەروەها (کافرەکان) گوتیان: (خوای) بەخشندە ڕۆڵەی گرتوە! ﴿٨٨﴾ بە ڕاستی ناماقووڵییەکی بێرەزاتان گوت ﴿٨٩﴾ نیزیکە بە هۆیەوە ئاسمانەکان بقڵیشێن و، زەوی لەت و پەت ببێ و، چیایەکان بەسەر یەکدا بڕووخێن ﴿٩٠﴾ بە هۆی ئەوەوە کە بانگەشەی ڕۆڵەیان بۆ خوای بەخشندە کرد ﴿٩١﴾ ناشکونجێ (خوای) میهرەبان

ڕۆڵە بۆ خۆی دابنێ (٩٢) بە دڵنیاییەوە هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان و زەوی دان، بە بەندایەتیی (لە ڕۆژی دوایی دا) دێنە لای خوای بەخشندە (٩٣) (خوا) هەموویانی سەرژمێر کردوون و، بە وردیی ژماردوونی (٩٤) هەر کامێکیشیان لە ڕۆژی قیامەتدا، بە تەنیا دێتە خزمەتی (٩٥) بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوەو، کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون، خوای بە بەزەیی خۆشەویستییان (لە دڵی خەڵکدا) بۆ دەڕەخسێنێ (٩٦) بۆیە ئەم قورئانەمان بە زمانی تۆ ئاسان کردوە، تاکو موژدەی پێ بە پارێزکاران بدەی و، کەسانێکی ناحەزی سەرسەختی پێ بترسێنی (٩٧) چەندان سەدەشمان لە کۆمەڵگا لادەرەکان لە پێش واندا، فەوتاندوون، ئایا هەست بە هیچ کامیان دەکەی (مابن)، یان هیچ ورتەیەکیان لێ دەبیستی! (٩٨)).

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ): واتە: ئایا پەنهانی زانیوە، (إطَّلَعَ: إفْتَعَلَ مِنْ طَلَعَ، أطْلَعَهُ عَلَيهِ: أعْلَمَهُ بِهِ)، (إطَّلَعَ)، لەسەر کێشی (افتَعَلَ)ە، لە وشەی (طَلَعَ)ەوە هاتوە، (طَلَعَ) یانی: چووە سەر شوێنێکی بەرز و، تەماشای کرد، بەڵام دوایی خوازراوەتەوە بۆ زانین، (طَلَعَ) یانی: زانی، (أطْلَعَهُ عَلَيْهِ)، واتە: وایکرد کە بزانێ.

(عِزًّا): (العِزُّ: ضِدُّ الذُّلِّ، والعِزَّةُ: الحَالَةُ المَانِعَةُ للإنْسَانِ مِنْ أنْ يُغْلَبَ)، (عِز) پێچەوانەی (ذُل)ە، (عِزة)یش، حاڵەتێکە وا لە مرۆڤ دەکات، کە بەرانبەرەکەی بە سەریدا زاڵ نەبێ، کەواتە: ﴿عِزًّا﴾، واتە: باڵا دەستیی و بەهێزیی.

(ضِدًّا): واتە: دژ، (الضِدَّانُ، مَا لاَ يَصِحُّ اجْتِمَاعُهما فِي مَحَلٍّ وَاحِدٍ، والضِّدُّ: المُنَافِي للشيء)، (ضِدّان) دووشت کە ناگونجێ لە یەك شوێن و کاتدا کۆببنەوە، هەروەها (ضِدّ)، بریتیە لە شتێك کە پێچەوانەی شتێك بێ و، لەگەڵی ناتەباو نەگونجاو بێ.

(تَؤُزُّهُمْ أَزًّا): (تُزْعِجُهُم إزْعَاجاً، أزَّتِ القِدْرُ، أي: اشْتَدَّ غَلَيَانُها، وأزَّهُ، أبْلَغُ مِنْ هَزَّهُ)، (تَؤُزُّهُمْ أَزًّا)، واتە: بێزاریان دەکا و، پاڵیان پێوە دەنێ و هانیان دەدا، وەك چۆن مەنجەڵ کە دەکوڵێ دەنگێکی لێ دێ، دەگوترێ: (أزَّت القِدْرُ)، مەنجەڵەکە دەنگی لێوە هات، کە قوڵپ دەداو دەنگی دێ، بەڵام وشەی (أزَّه) مانایەکەی لە (هَزَّهُ) بەهێزترە، (هَزَّهُ)، واتە: ڕایوەشاند، بەڵام (أزَّهُ)، واتە: ڕایوەشاند و پاڵی پێودنا.

(نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا)، واتە: بۆیان دەژمێرین، (العَدُّ: ضَمُّ الأَعْدَاد بَعْضُهَا إلى بَعْض)، ژمارەکان هەندێکیان بخرێنە پاڵ هەندێکیان، دەگوترێ: (عَدَّ).

(وَفْدًا): (وَفَدَ القَوْمِ يَفِدُونَ إفَادَةً، وَهُمْ وَفْدٌ وَوفُودٌ، وَهُمْ الَّذِينَ يَقْدَمُونَ عَلَى المُلُوكِ مُسْتَنْجِزِيْنَ الحَوائِجَ)، دەگوترێ: (وَفَدَ القَوْمِ يَفِدُونَ إفَادَةً)، خەڵکەکە وەك شاند چوون، (وَفْدٌ وَوفُودٌ)، هەردووکیان بۆ کۆی شاند بەکاردێن، کە کەسانێکن کە دەچنە لای حوکمڕانان بۆ ئەوەی داوای پێداویستییەکانیان لێبکەن.

کەواتە: (وَفْد)، یانی: خەڵکێك کە وەك نوێنەر دەچن، بێگومانیش کەسانێك بچن بۆ لای پادشا و حوکمڕان، بە شێوەیەکی ڕێك و پێك و، بە ڕێز و حورمەتەوە دەچن و، بە ڕێز و حورمەتیشەوە وەردەگیرێن.

(وِرْدًا): (الوِرْدُ، أَصْلُهُ قَصْدُ المَاءِ، والمَاءُ مَوْرُودٌ، والوَرُود: المَاءُ المُرَشَّحُ للوُرُودِ، وَالوِرْدُ خِلافُ الصَّدْرِ، وَالوِرْدُ: الوُرَّادُ، وَهُمْ الَّذِينَ يَرِدُنَ المَاءَ)، وشەی (وِرْد) ئەصڵەکەی بریتیە لە: چوونە سەر ئاو، ئاوەکە (مَوْرُود)ی پێ دەگوترێ، هەروەها (وِرْد) بەو ئاوە دەگوترێ کە ڕەچاو کراوە بۆ ئەوەی خەڵك بچێتە سەری، هەروەها (وِرْد) پێچەوانەی (صَدْر)ە، (وَرَدَ المَاءَ)، واتە: چووە سەر ئاوەکە بۆ ئەوەی ئاو بێنێ، بەڵام (صَدرَ عَنِ المَاءِ)، واتە: ئاوی هێناو گەڕایەوە، هەروەها (وِرْد) بە مانای (وُرَّادُ) دێ، کە کەسانێك کە دەچنە سەر ئاو، بۆ ئاو خواردنەوە، یاخود بۆ ئاو هەڵهێنجان.

(إِدًّا): (الإِدُّ: الدَّاهِيَةُ، والأَمْرُ الفَظِيْعُ، الذي يَقَعُ فِيهِ جَلَبٌ)، (إدّ) بە مانای بەڵایەکی گەورە و بێزەزا، یاخود شتێکی زۆر خراپ و ناقۆڵا کە دەنگ و گاڵەی لێوەبێ.

(يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ): (الفَطْرُ: الشَقُّ طُولاً)، (فَطْر)، بریتیە لە لەتکردنی شتێك بە باری درێژییدا، کە پێی دەگوترێ: قلێشاندن.

(وَتَنشَقُّ ٱلْأَرْضُ): (الشَقُّ: الخَرْمُ الوَاقِعُ فِي الشَّيء)، (شَق)، بریتیە لە لەتکردنی شتێك، بۆیە من بە وشەی لەت و پەتکردن مانام کردوە.

(وَتَخِرُّ ٱلْجِبَالُ هَدًّا): واتە: چیاکان دەکەون و بەسەر یەکدا دەڕمێن، دەگوترێ: (خَرَّ: سَقَطَ سُقُوطاً، يُسْمَعُ مِنْهُ خَرِيرٌ، والخَرِيرُ: صَوْتُ المَاءِ وَالرِّيحِ)، دەگوترێ: (خَرَّ): واتە: کەوت بە کەوتنێك کە دەنگی (خَرِير)ی لێ دێ، (خَرِير)یش دەنگی ئاوە، یاخود دەنگی بایە، واتە: وششەی بێ، یان خوڕڕەی بێ.

(وُدًّا): (الوُدُّ: مَحَبَّةُ الشَّيءِ وَتَمَنِّي كَوْنِهِ، (سَيَجْعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ وُدًّا): إِشَارَةٌ إِلَى مَا أَوقَعَ بَيْنَهُمْ مِنَ الأُلْفَةِ)، (وُدّ)، بریتیە لە خۆشویستن، یاخود خۆزگە پێ خواستنی شتێك، ﴿سَيَجْعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ وُدًّا﴾ ئاماژەیە بەو ئولفەت و هۆگرییە کە خوا خستوویەتە دڵی بڕوادارانەوە.

(لُدًّا): (الأَلَدُّ: الخَصِيمُ الشَّدِيدُ التأَبِّي، وَجَمْعُهُ لُدٌّ، وَأَصْلُ الأَلَدِّ: الشَّدِيدُ اللَّدِيدِ أي: صَفْحَةُ العُنُقِ)، وشەی (لَدِيد) بە مانای لامل دێ، (ألَدّ)، یانی: کەسێکی مل ڕەق و نەسەلمێن و، کەللە ڕەق، یاخود زۆر ناکۆکییکار، کە بە (لُدّ) کۆدەکرێتەوە.

(تُحِسُّ): (أَحْسَسْتُهُ: أَدْرَكْتُهُ بِحَاسَّتِي، وأَحَسْتُ مِثْلُهُ، مثل: ظَلَلْتُ وَظَلْتُ)، (أَحْسَسْتُهُ)، واتە: هەستم پێ کرد، ﴿هَلْ تُحِسُّ مِنْهُم﴾، ئایا هەست بە هیچ کامیان دەکەی؟ دەگوترێ: (أَحَسْتُ وأَحْسَسْتُ)، هەر یەك مانایان هەیە، وەك: (ظَلَلْتُ وَظَلْتُ)، هەردووکیان یانی: بوو.

(رِكْزًا): (الرِّكْزُ: الصَّوْتُ الخَفِيُّ، وَرَكَزْتُ كَذَا، دَفَنْتُهُ دَفْناً خَفِيّاً)، (رِكْز) بە مانای دەنگێکی کپ و پەنهان، دێ، (رَكَزْتُ كَذَا)، واتە: شتەکەم بە شێوەیەکی پەنهان خستە ژێر گڵ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم چوار ئایەتە

١)- هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَٰنِ عَهْدًا ﴿٧٨﴾ كَلَّا ۚ سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ﴿٧٩﴾ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ﴿٨٠﴾﴾

لەوبارەوە ئەم بەسەرهاتە گێڕدراوەتەوە:

(عَنْ خَبَّابٍ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ رَجُلاً قَيْنًا بِمَكَّةَ فِي الجَاهِلِيَّةِ، فَعَمِلْتُ لِلعَاصِ بْنِ وَائِلٍ السَّهْمِيِّ سَيْفًا، فَاجْتَمَعَ لِي عِنْدَهُ دَيْنٌ، «وَفِي رِوَايَةٍ: دَرَاهِمُ» فَأَتَيْتُهُ أَتَقَاضَاهُ؟ فَقَالَ: لاَ واللهِ! لاَ أَقْضِيكَ حَتَّى تَكْفُرَ بِمُحَمَّدٍ، قُلْتُ: أَمَا واللهِ! حَتَّى تَمُوتَ ثُمَّ تُبْعَثَ فَلاَ، وَفِي رِوايةٍ: قلت: لَا أَكْفُرُ بِمُحَمَّدٍ ﷺ حَتَّى يُمِيتَكَ اللهُ ثُمَّ يُحْيِيَكَ، قَالَ: وَإِنِّي لَمَيِّتٌ، ثُمَّ مَبْعُوثٌ مِنْ بَعْدِ المَوْتِ؟ قُلْتُ: نَعَم، قَالَ: فَإِنَّهُ سَيَكُونُ لِي، ثَمَّ مَالٌ، وَوَلَدٌ، فَأَقْضِيكَ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَٰنِ عَهْدًا ﴿٧٨﴾ كَلَّا ۚ سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ﴿٧٩﴾ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ﴿٨٠﴾﴾) (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ: ٤٧٣٥، وَمُسْلِمٌ: ٢٧٩٥).

واتە: خەبابی کوڕی ئەرەت ﷺ، دەڵێ: من پیاوێکی ئاسنگەر بووم، لە مەککە لە سەردەمی نەفامییدا، بۆ عاصي کوڕی وائیل شمشێرێکم بۆ دروست کرد، قەرزێکم کەوتە لای {لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ: چەند درەمێکم کەوتنە لای، یانی: نرخی دروست کردنی شمشێرەکە} چوومە لای داوای قەرزەکەم لێکرد، گوتی: سوێند بە خوا ناتدەمەوە، تاکو بە موحەممەد ﷺ بێبڕوا نەبی، {دیارە ئەو دەسەڵاتدار و، ئەم بێ دەستەڵات و، کابرایەکی ئاسنگەر بووە} منیش گوتم: ئاگاداربە! سوێند بە خوا هەتا دەمری و، دوایی زیندوو دەکرێیەوە، من کوفر بە موحەممەد ﷺ ناکەم، لە ڕیوایەتێکدا: پێم گوت: بێبڕوا نابم بە موحەممەد ﷺ تاکو خوا دەتمرێنێ و، زیندووت دەکاتەوە، {مانای وایە هەرگیز پێی بێ بڕوا نابم} ئەویش گوتی: ئایا من دەمرم و دوای مردنیش زیندوو دەکرێمەوە؟ گوتم: بەڵێ، گوتی: باشە، ئەو کاتە سامانم دەبێ و، کوڕانم دەبن، ئەو کاتە وەرە قەرزەکەت دەدەمەوە، ئیدی خوا ﷻ لەو بارەوە ئەمەی دابەزاند: ﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَٰنِ عَهْدًا ﴿٧٨﴾ كَلَّا ۚ سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ﴿٧٩﴾ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ﴿٨٠﴾ ﴾.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ سەرەتا هەر لە درێژەی باسی بێبڕوایانی کەللەڕەق و، هاوبەش بۆ خوا دانەرانی شوێنکەوتووی بیرۆکە و نەریتی پووچ و ڕزیوی سەردەمی نەفامیی دا، بەردەوام دەبێ و، دەفەرموێ: ﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَٰتِنَا ﴾، ئایا ئەو کەسەت بینی کە بە ئایەتەکانی ئێمە بێبڕوا بوو، ﴿ وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴾، گوتیشی: لەمەودوا {لە ڕۆژی دواییشدا} سامان و کوڕانم پێ دەدرێن، بە پێی هۆی هاتنە خوارەوەکەی، کە لە صەحیحی بوخاریی و، صەحیحی موسلیمدا هاتوە، ئەو کابرایە (العاص بن وائل السَّهمي) بووە، کە یەکێک بووە لە زلەزلەکانی قوڕەیش، بەڵام وەك زۆرجار گوتوومانە: زانایان وەك بنچینەیەك دایاناوە: (إِنَّ خُصُوصَ السَّبَبِ لا يَمْنَعُ شمول المَعْنَى) واتە: تایبەتبوونی هۆی هاتنە خوار، ڕێ ناگرێ لە گشتگیربوونی واتای ئەو دەقە، کە ئەو هۆی هاتنە خوارەوەی لەسەر بووە.

لێرەدا خوا ﷻ باسی بابایەکی بێبڕوا دەکات کە خەیاڵ پڵاو دەکات: بڕوای بە ئایەتەکانی خوا نیەو، کەچی پێشی وایە: ئەگەر زیندو بوونەوەو سزاو پاداشت، هەبێ،لە

قیامەتێ، حاڵی زۆر باش دەبێ و دەڵێ: هەم سەروەت و سامانی زۆرم دەدرێتێ، هەم خزم و قەڵەباڵغیشی بە دەورەوە دەبێ، کە ئەوە خەیاڵ پڵاوێکی سەیرە!

بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ أَطَّلَعَ ٱلۡغَيۡبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحۡمَٰنِ عَهۡدٗا ﴾، کاتێک ئەو لافە لێ دەداو ئەو ئیددیعایە دەکات، لە دوو حاڵ بە دەر نیە:

أ- یان دەبێ ئاگاداری پەنهان بێ.

ب- یان دەبێ خوای خاوەن بەزەیی پەیمانێکی پێدابێ! کە بە تەئکید نە ئاگاداری پەنهانە و نادیار دەزانێ و، نە خوای خاوەن بەزەییش پەیمانێکی پێداوە، کەواتە: لە خۆڕا ئەو ئیددیعایە دەکات و ئەو لافە لێ دەدات، ﴿ كَلَّا ﴾، واتە: هەرگیز وا نیە، وەك ئەو دەڵێ.

﴿ كَلَّا ﴾، لە زمانی عەرەبیدا بۆ تێوەخوڕین و، بەرپەرچدانەوەیە، بەرپەرچدانەوەی شتێك کە لە پێشەوە هاتوە، لێرەدا ئەو لاف لێدانەی کابرا، بەرپەرچدەداتەوە.

﴿ سَنَكۡتُبُ مَا يَقُولُ ﴾، ئەوەی دەیڵێ، دەینووسین، ﴿ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلۡعَذَابِ مَدّٗا ﴾، لە ڕۆژی دواییشدا، هەر سزای بۆ زیاد دەکەین، نەك ماڵ و سامانی پێ نادەین، نەك سامان و کوڕانی بۆ ناڕەخسێنین، بەڵکو ئەوەی پێی بدەین و بۆی زیاد بکەین، بەس سزاو ئازارە! ﴿ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأۡتِينَا فَرۡدٗا ﴾، ئەوەش کە دەیڵێ، لە کوڕان و سامان، ئێمە بە میراتی دەگرین، یانی: ئەوەی کە هەشیەتی، میراتێکە دێتەوە لای ئێمە، ﴿ وَيَأۡتِينَا فَرۡدٗا ﴾، خۆیشی بە سەڵت و قوڵتیی، دێتەوە لامان.

ئنجا دێتە سەر بابەتێکی دیکە: ﴿ وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةٗ لِّيَكُونُواْ لَهُمۡ عِزّٗا ﴾، هەروەها لە جیاتی خوا پەرستراوانێکیان گرتن، تاکو بۆیان ببنە مایەی دەستەڵات و زاڵ بوون و هێز و پێز، ﴿ كَلَّا ﴾، هەرگیز وانیە، یانی: ئەو پەرستراوانە بۆیان نابنە مایەی دەسەڵات و، هێزو پێز، بۆیان نابنە مایەی باڵادەستیی، ﴿ سَيَكۡفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمۡ وَيَكُونُونَ عَلَيۡهِمۡ ضِدًّا ﴾، لە داهاتوودا ئەو پەرستراوانە حاشا یان لێ دەکەن و، بێبەروا دەبن بە پەرستنەکەیان و، لە سەریشیان دەبنە دژ.

یاخود ئەو کەسانەی کە ئەو پەرستراوانە دەپەرستن، لە ڕۆژی دواییدا کوفر بە پەرستنەکەی خۆیان، دەکەن و لێشیان دەبنە دژ، نەك هیچ چاوەڕوانییەکیان لێ ناکەن، بەڵکو لە بەرانبەریشیان دا دەبنە دژ و دوژمن.

واتە: یان ئەوان دەبنە دژی پەرستراوەکان، یان پەرستراوەکان دەبنە دژی ئەوان.

﴿ فَلَا تَعْجَلْ عَلَيْهِمْ إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا ﴾، ئنجا پەلەیان لێ مەکە، واتە: پەلەیان لێ مەکە خوا سزایان بدات، ﴿ إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا ﴾، بە تەئكید ئێمە هەر بۆیان دەژمێرین، واتە: کردەوەکانیان بۆ دەژمێرین و سزای کردەوەکانیان بۆ دەژمێرین، ڕۆژەکانیان دەژمێرین، یانی: ئێمەش لێیان بە پەلەین، بەڵام تۆ پەلە مەکە، خوا سزایان بدات، خوا هاتنی هەر شتێکی لە کاتی خۆیدا دیاریی کردوە.

ئنجا دێتە سەر باسێکی دیکە، کە چۆنیەتی بەڕێ کرانی پارێزکاران و، تاوانبارانە، هەر کەسە بۆ شوێنی خۆی، دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ نَحْشُرُ الْمُتَّقِينَ إِلَى الرَّحْمَٰنِ وَفْدًا ﴾، ئەو ڕۆژە کە پارێزکاران بەرەو (خوای) خاوەن بەزەیی، بە ڕێزو حورمەتەوە کۆدەکەینەوەو بەڕێ دەکەین، ﴿ وَنَسُوقُ الْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴾، تاوانبارانیش بەرەو دۆزەخ لێدەخوڕین بە تینوێتیی، وەك چۆن گاڕانێك، ڕانێك بە تینوێتیی پێش خۆ دەدرێن و، دەبرێنە سەر ئاو، ئەوانیش بەو شێوەیە بەڕێیان دەکەین و، بەرەو دۆزەخ لێدەخوڕین.

بڕواداران و پارێزکاران، بە ڕێز و حورمەتەوە، وەك شاند و نوێنەر، تاونبارانیش وەك ئاژەڵی تینوو، کە دەبرێتە سەر ئاو، ﴿ لَّا يَمْلِكُونَ الشَّفَاعَةَ ﴾، خاوەنی تکاکردن نین، واتە: تکایان بۆ ناکرێ، لە لایەن پەرستراوەکانیانەوە، ئەوە هیچ، لە لایەن پێغەمبەران و پیاوچاکانیشەوە، تکایان بۆ ناکرێ، ﴿ إِلَّا مَنِ اتَّخَذَ عِندَ الرَّحْمَٰنِ عَهْدًا ﴾، ئەمە: هەڵاواردنێکی دابڕاو (إسْتِثْنَاءِ مُنْقَطِعَ)ە، واتە: بەڵام کەسێك کە پەیمانی لەلای (خوای) خاوەن بەزەیی هەبێ، ئەوە دەبێتە خاوەنی تکاو، تکای بۆ دەکرێ.

ئنجا دێتە سەر بابەتێکی دیکە، کە هەشت ئایەتی بۆ تەرخان کراون و، وەك پێشتر گوتوومانە: بەهێزترین شێواز کە لە هەموو قورئاندا بەکارهێنرابێ، بۆ بەرپەرچدانەوەی بیرۆکەی هاوبەش بۆ خوادانەران و، بیرۆکەی ڕۆڵە پاڵدانە لای خوا، لەم هەشت ئایەتە موبارەکەدایە:

﴿ وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ﴿٨٨﴾ لَّقَدْ جِئْتُمْ شَيْئًا إِدًّا ﴿٨٩﴾ تَكَادُ السَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ الْأَرْضُ وَتَخِرُّ الْجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوْا لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدًا ﴿٩١﴾ وَمَا يَنبَغِي لِلرَّحْمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴿٩٢﴾ إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَٰنِ عَبْدًا ﴿٩٣﴾ لَّقَدْ أَحْصَاهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا ﴿٩٤﴾ وَكُلُّهُمْ آتِيهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَرْدًا ﴿٩٥﴾ ﴾.

﴿ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗا ﴾، بێبڕوایەکان گوتیان: (خوای) خاوەن بەزەیی ڕۆڵەی گرتوە، دەیانگوت: شەیتانەکان کوڕانی خوان و، فریشتەکان کچانی خوان!

﴿ لَّقَدۡ جِئۡتُمۡ شَيۡـًٔا إِدّٗا ﴾، بە ڕاستیی قسەیەکتان کرد زۆر بێڕەزا لە خراپیی و ناقۆڵاییدا، شتێکی زۆر خراپتان هێنا، هەڵوێستێکی زۆر بێماناتان لە ئاست خوادا نواند.

﴿ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِنۡهُ ﴾، ئاسمانەکان خەریکن بقڵیشێن، بە هۆی ئەو قسەیەوە، لە سەرڕا بۆ خوارێ، هێندە پێیان ناخۆشە، ﴿ وَتَنشَقُّ ٱلۡأَرۡضُ ﴾، دیسان زەوی خەریکە لەت و پەت ببێ و پارچەپارچە بێ، ﴿ وَتَخِرُّ ٱلۡجِبَالُ هَدًّا ﴾، هەروەها خەریکە چیاکانیش بکەون و، بەسەر یەکدا بڕووخێن.

﴿ أَن دَعَوۡاْ لِلرَّحۡمَٰنِ وَلَدٗا ﴾، بە هۆی ئەوەوە کە ڕۆڵەیان بۆ (خوای) خاوەن بەزەیی بانگەشە کرد و، ڕۆڵەیان بۆ خوای خاوەن بەزەیی هەڵبەست.

﴿ وَمَا يَنۢبَغِي لِلرَّحۡمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴾، ناشکونجێ و نالوێ خوای خاوەن بەزەیی ڕۆڵەی هەبێ، بۆچی؟

﴿ إِن كُلُّ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ إِلَّآ ءَاتِي ٱلرَّحۡمَٰنِ عَبۡدٗا ﴾، (چونکە:) هیچ کەس نیە لەوانەی ئاسمانەکان و زەویدا هەن، کە بە بەندەیی نەیەتەوە بۆ لای خوای خاوەن بەزەیی، هەموویان بەندەی خوان و ملکەچی خوان.

﴿ لَّقَدۡ أَحۡصَىٰهُمۡ وَعَدَّهُمۡ عَدّٗا ﴾، بەدڵنیایی (خوا) سەرژمێری کردوون و، زۆر بە وردیی ژماردوونی.

﴿ وَكُلُّهُمۡ ءَاتِيهِ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَرۡدًا ﴾، هەمووشیان لە ڕۆژی قیامەتدا بە سەڵت و قوڵتیی، تاک و تەنیا، دێنەوە خزمەت خوا.

لە کۆتایی دا، ئاماژە بە سێ ڕاستیی گرنگ دەکات:

١- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجۡعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وُدّٗا ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بڕوایان هێناوە {بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ} و کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داون، (خوای) خاوەن بەزەیی، خۆشەویستییان بۆ دەڕەخسێنێ، خۆشەویستیی لە لای خۆیەوە، کە خۆشیدەوێن، یان خۆشەویستیی لە لای فریشتەکانەوە، یاخود خۆشەویستیی لە لایەن مرۆڤەکانەوە، یان هەرسێکیان پێکەوە.

٢- ﴿ فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ ﴾، ئێمە ئەم قورئانەمان بە زمانی تۆ {کە زمانی عەرەبییە} ئاسان کردوە: لە ڕووی خوێندنەوە و لەبەرکردنەوەو، لە ڕووی لێ تێگەیشتنە وە، ﴿ لِتُبَشِّرَ بِهِ ٱلْمُتَّقِينَ وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوْمًا لُّدًّا ﴾، تاکو موژدەی پێبدەی بە پارێزکاران و، کۆمەڵێکی سەرسەخت و کەللە وشك و نەسەلمێنی، پێ بترسێنی و، وریایان بکەیەوە، کە سزای خوا چاوەڕێیان دەکات.

٣- ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ ﴾، لە پێش ئەواندا زۆر سەدەمان فەوتاندوون، واتە: ئەوانیش دەفەوتێن، وەك چۆن سەدەکانی پێش ئەوانمان فەوتاندوون، ﴿ هَلْ تُحِسُّ مِنْهُم مِّنْ أَحَدٍ ﴾، ئایا هەست بە هیچ کامیان دەکەی؟ هەست دەکەی هیچیان مابن، ﴿ أَوْ تَسْمَعُ لَهُمْ رِكْزًا ﴾، یاخود ئایا هیچ دەنگێکی کپ و، ورتەیەکیشیان لێ دەبیستی؟ بە تەئکید نەخێر، نە هەست و خوستیان هەیە، نە چرپەو ورتەیان هەیە، دنیا بۆتە ئاشی ئاولێبڕاو و ئەوان چوونەتە شاری خامۆشان، لە دنیایەکی کش و ماتدان، بە نسبەت ئێمەوە، هەرچەندە لە جیهانی بەرزەخدا، ئەوەی خراپەکار بووبێ، لە سزادایەو، ئەوەی چاکەکار بووبێ، لە ناز و نیعمەت دایە.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**باسی کەسێکی بێبڕوا بە ئایەتەکانی خوا، لاف لێدەری لەوە کە لە ڕۆژی دوایيدا خوا سامان و کوڕانی دەداتێ و، بەرپرچدانەوەی خوا بۆی و هەڕەشەی سەخت لێکردنی، لەسەر بێبڕوایی و ئەو درۆ و دەلەسەو لاف لێدانەیەوە کە دەیکات:**

**خوا دەفەرموێ:** ﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا ﴿٧٨﴾ كَلَّا ۚ سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ﴿٧٩﴾ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ﴿٨٠﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا ﴾، ئایا ئەو کەسەت بینی کە بێبڕوا بوو بە ئایەتەکانی ئێمە، بێگومان مەبەست لە (آيات)، ڕستەکانی قورئانن، کە بە پێی سیاق و مەقام ئەوە دەزانین، ئەگەرنا لە ئەصڵدا وشەی (آيات) کە کۆی (آيَة)ە و بە کوردیی یانی: نیشانە (عَلامَة)، لە قورئانێ دا بە چوار واتایان بەکارهاتوە:

١- ڕستەکانی فەرمایشتی خوا.

٢- دیاردە گەردوونیی و سروشتییەکان.

٣- موعجیزەکانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلام).

٤- ئەو کارەسات و بەڵایانەی کە خوا ﷻ بەسەر گەلە پێشووەکانی هێناون.

بەو چوار واتایە هاتوە، بەڵام دەبێ بە پێی سیاقی خۆی تەماشا بکرێ، ئایا مەبەست لە (آيات) یان (آيَة)، چییە؟ کە لێرەدا بە تەئکید مەبەست پێی ڕستەکانی قورئانن.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا ﴾، ئایا ئەو کەسەت بینی، کە بە ئایەتەکانمان بێبڕوایە! بینین لێرەدا بینینی زانستییە (**الرُّؤيَةُ هُنَا عِلمِيَّةٌ**)، واتە: ئایا دەرکت

پێکرد و، ئەو کەسەت زانی، بە چاوی عەقڵ و دڵ بینیت؟ ڕووی دواندنیش بۆ هەر کەسێکە کە بشێ بۆ دوێنران، (الخِطَابُ مُوَجَّهٌ لِكُلِّ مَنْ يَصْلُحُ للخطاب)، واتە: دەگونجێ مەبەست پێی پێغەمبەری خوا ﷺ بێ، کە یەکەمین عەقڵ و دڵ کە ئەم قورئانەی وەرگرتوە، عەقڵ و دڵی پێغەمبەری خاتەم ﷺ بووە: ﴿ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَفِى زُبُرِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٩٦﴾ ﴾الشعراء، لە دوای ئەویش هاوەڵانی بەڕێزی، پاشان شوێنکەوتووانیان و، دوایی هەموو ئەوانەی کە قورئان دەخوێننەوە، لە بڕواداران و، بێبڕوایان، هەموویان دەگرێتەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿ أَفَرَءَيْتَ ﴾، هەمزە (أ) کە بۆ پرسیارکردنە، پرسیارکردنی سەرلێسوڕماندن (تعجیب) یانی: سەرت سوڕبمێنێ لەو کەسەی کە بە ئایەتەکانی ئێمە بێبڕوایە!

٢)- ﴿ وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴾، گوتیشی: بە دڵنیایی من سامانم و کوڕانم پێ دەدرێن و، پێم دەبەخشرێن، کە بەدڵنیایی مەبەستی پێ ڕۆژی دوایی بووە.

وشەی ﴿ وَوَلَدًا ﴾، (الوَلَدُ: إسْمُ جَمْعٍ لِلْوَلَدِ المُفْرَد)، لێرەدا ناوی کۆیە بۆ (وَلَد)ی تاك، واتە: ڕۆڵە، هەروەها وشەی ﴿ وَوَلَدًا ﴾، خوێنراوەتەوە: (وَوُلْدًا)، (وُلْد)یش کۆی (وَلَد)ە، وەك: (أَسَدْ وأُسْد)، کتێبێك هەیە بە ناوی: (أُسْدُ الغَابة)، واتە: شێرەکانی دارستان، کە مەبەست پێی هاوەڵانی پێغەمبەرە ﷺ.

کەواتە: کە لاف لێدەدا و دەڵێ: ﴿ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴾، بە دڵنیایی سامانیش و کوڕانیشم، یاخود سامانیش و ڕۆڵەشم پێ دەدرێن، ئەوە قسەیەکی پووچ بۆش دەکات[1].

٣)- ﴿ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ ﴾، خوا ﷻ دەپرسێ: ئایا (ئەو لاف لێدەرە) لە پەنهان ئاگادار بۆتەوە؟ ئایا زانیاریی پەنامەکیی و پەنهانیی هەیە، کە لە ڕۆژی دواییدا، ئاوا مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ و، ڕێزی لێ بگیرێ و، سامان و ڕۆڵەکانی پێ بدرێن؟! ئەم هەمزە (أ)ی پرسیار کردنە: ﴿ أَطَّلَعَ ﴾، بۆ نکووڵیلێکردن و، سەرسوڕماندن (للإنكار والتعجيب)ە، ئنجا ﴿ أَطَّلَعَ ﴾، وەك پێشتریش گوتمان:

---

(١) (وَلَد) یان (وُلْد) بە واتای ڕۆڵە، یان ڕۆڵەکان، دێن، بەڵام زیاتر مەبەست پێیان کوڕان بووە، ئەگەرنا (أولاد، وُلْد، وَلَد) بە کۆی منداڵان دەگوترێ، چ کوڕ بن، چ کچ، چ نێر بن، چ مێ، بەڵام ئەگەر بویسترێ بگوترێ: کوڕان، دەگوترێ: (أبْنَاء)، بە کچانیش دەگوترێ: (بَنَات)، وەك لە سوورەتی (الأنعام)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴿١٠٠﴾ ﴾، واتە: کوڕان و کچانیان بۆ (خوا) هەڵبەست بە بێ زانیاریی [گوتیان: شەیتانەکان کوڕانی خوان و، فریشتەکان کچانی خوان].

(افْتَعَلَ)یە لە (طَلَعَ)، (طَلَعَ عَلَیْهِ)، یانی: زانی، ئەمەش بۆ زێدەڕۆییە لە پەیدابوونی کاری زانیندا، (طَلَعَ)ش، یانی: چووە سەر بەرزاییەك و لەوێڕا ڕووانی، یانی: (أَشْرَفَ عَلَى عَالَمِ الغَيْبِ)، ئایا زانیاریی پەیدا کردووە، دەربارەی جیهانی پەنهان، کە بزانێ لە ڕۆژی دواییدا بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ و، ئاوا ئەو خەیاڵ پڵاوانە بکات؟!

٤)- ﴿أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَٰنِ عَهْدًا﴾، یاخود ئەگەر پەنهانی نازانێ و، ڕۆژی قیامەتیشی نەبینیوە، کە بێگومان نەیبینیوە: ئایا بەڵێن و پەیمانێکی لە لایەن خوای خاوەن بەزەییەوە پێدراوە، ئایا بەڵێنێکی وەرگرتووە لە خوای خاوەن بەزەیی، کە بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا بکات؟ بە تەئکید نە زانیاریی پەنهانی هەیەو، نە پەیمانیشی لە خوا وەرگرتووە.

٥)- ﴿كَلَّا ۚ سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ﴾، نەخێر هەرگیز وا نیە، وەك دەڵێ و، بە دڵنیایی ئەوەی دەیڵێ: ئێمە دەینووسین.

(كَلَّا : حَرْفُ رَدْعٍ وَزَجْرٍ، عَنْ مَضْمُونِ كَلَامٍ سَابِقٍ)، (كلا) پیتی بەرپەرچدانەوەو تێوە خوڕینە، لە نێوەڕۆکی قسەیەکی پێشتر، قسەکەش ئەوەیە کە دەڵێ: ﴿لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا﴾.

ئەم (س)ی ﴿سَنَكْتُبُ﴾، بۆ داهاتوو نیە، بەڵکو بۆ جەختکردنەوەیە، چونکە (سین وسوف)، جاری وایە بۆ شتێکن کە ئایندەدا ڕوودەدا، جاری واش هەیە بۆ جەختکردنەوەن، کە لێرەدا ﴿سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ﴾، یانی: بە دڵنیایی ئەوەی کە دەیڵێ: دەینووسین، بۆچی؟ چونکە ئەگەر بڵێین: (س) بۆ داهاتوو (إِسْتِقْبَالْ)ە، یانی: لەمەودوا دەینووسین! بەڵام یەکسەر ئەو قسەیەی کە لە دەم دەردەچێ، فریشتەکان دەینووسن و، لە زانیاریی خوای پەروەردگاریشدا تۆمار دەکرێ.

ئنجا کە فەرمووی: ﴿مَا يَقُولُ﴾، ئەمە بۆ ئەوەیە تاکو ئەوەی گوتراوە، دووبارەی نەکاتەوە.

ئنجا ئەمە وەك ئەو ئایەتەی سوورەتی (آل عمران) وایە، کە خوا دەفەرمووێ: ﴿قُلْ قَدْ جَآءَكُمْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِى بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَبِٱلَّذِى قُلْتُمْ فَلِمَ قَتَلْتُمُوهُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٨٣﴾﴾، واتە: بڵێ: لە پێش من دا پێغەمبەرانێك هاتن بە بەڵگە ڕۆشنەکانەوە و بەوەش کە گوتتان: ئەوەی کە گوتیان چی بوو؟ گوتیان: ﴿أَلَّا نُؤْمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأْتِيَنَا بِقُرْبَانٍ تَأْكُلُهُ ٱلنَّارُ ﴿١٨٣﴾﴾آل عمران، واتە: بڕوا بە هیچ ڕەوانەکراوێك ناهێنین، تاکو قوربانییەکمان

بۆ نەهێنێ، کە ئاگر بیخوات، یانی: قوربانییەك بکرێ و، ئاگرێك لە ئاسمان بێتە خوار و بیسووتێنێ، هەروەك لە تەفسیری سووڕەتی (آل عمران)دا بە تەفصیل باسمان کردوە و، لە پەیمانی کۆنیشەوە بەڵگەمان لەو بارەوە هێناوە.

ئنجا لە جیاتی ئەوەی خوا ئەو ڕستەیە دووبارە بکاتەوە، یەکسەر دەفەرموێ: ﴿قُلْ قَدْ جَآءَكُمْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِى بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَبِٱلَّذِى قُلْتُمْ فَلِمَ قَتَلْتُمُوهُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٨٣﴾﴾، واتە: پێغەمبەرانێك لە پێش مندا هاتن، بەڵگە ڕۆشنەکانیشیان بۆ هێنان، ئەوەش کە گوتتان، ئەوەشیان بۆ هێنان، قوربانییەك کە دەکرێ، لە ئاسمانەوە ئاگرێك بێتە خوار و بیسووتێنێ، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە خوا قبووڵی کردوە.

٦)- ﴿وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا﴾، هەروەها لە سزاو ئازار بۆی زیاد دەکەین بە زیاد کردن.

(المَدُّ مِنَ العَذَابِ: الزِّيَادَةُ مِنْهُ)، (مَدّ) یانی: زێدەکردن، یانی: دەیخەینە پاڵ و، سزای بۆ زیاد دەکەین، واتە: لە جیاتی ئەوەی ماڵ و منداڵ کە لە دنیادا هەینی، لە دواڕۆژیشدا سامان و کوڕان و کچانی پێبدەین، بە پێچەوانەوە: سزای دەدەین و بەردەوام بۆیشی زیاد دەکەین، ئەو واتایەکی.

واتایەکی دیکەشی هەیە: ئەو سزایەی کە لە دنیادا تێیدایە، کە بریتیە لە ژیانی بێبڕوایی، کە ژیانێکی تاڵە و مرۆڤ تێیدا زۆر شپرزە حاڵە، ئەو سزایەی کە لە دنیادا هەیەتی، بە هۆی کوفرەوە، چونکە ژیانی بێبڕوایی، ژیانێکی قورس و تاڵ و بە زەحمەتە: ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا ﴿١٢٤﴾﴾طه، واتە: هەر کەسێك پشت لە یادی من بکات، ژیانێکی تەنگ و تاڵی دەبێ، با سەروەت و سامانیشی هەبێ، با هێز و دەسەڵاتیشی هەبێ، بەڵام لە دەروونی خۆیدا ناڕەحەتە، هەمیشە ترسی ئەوەی هەیە لە دەستی بچێ، هەمیشە ترسی ئەوەی هەیە بە جێی بهێڵێ، ئەو دنیا جێبهێڵێ، یان دنیا ئەو جێبهێڵێ! هەروەها هەمیشە ترسی ئەوەی هەیە کە بە دیداری خوا شاد بێ و، سزا بدرێ، لەبەر ئەوە بەردەوام هەست بە دڵ سەغڵەتیی و ناڕەحەتیی دەکات، بۆیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا﴾، یانی: ئەم ژیانە دنیاییەشی هەر سزاو ئازارە و، لە دواڕۆژیشدا سزای بۆ زیاد دەکات.

ئەو مانایەم لە تەفسیرەکان دا نەدیوە، بەڵام ئایەتەکە زۆر جوان دەیگەیەنێ.

دەشکونجێ مەبەست ئەوە بێ: دەیخەینە سزاوە و دوایی هەر سزای بۆ زیاد دەکەین، وەك لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ ﴾، یان لە سوورەتی (النبأ)دا دەفەرموێ: ﴿فَذُوقُوا فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴿٣٠﴾﴾، واتە: بیچێژن هەر سزاتان بۆ زیاد دەکەین.

٧)- ﴿وَنَرِثُهُ مَا يَقُولُ﴾، ئەوەش کە دەیڵێ: بە میراتی دەگرین، یانی: ئەوەی کە دەیڵێ، ئەو سەروەت و سامانە کە هەیەتی و ئەو ڕۆڵە و منداڵانە و ئەو کوڕانە کە هەینی و، مەجلیسەکەیان بۆ قەڵەباڵغ کردوە و، لاف ئەوە لێدەدات کە: لە دواڕۆژیشدا دەیین! بەڵام ئێمە ئەوەی دنیاشی لێی بە میرات دەگرین!

یاخود: ﴿وَنَرِثُهُ مَا يَقُولُ﴾، ئەو قسەیەی لێ بە میرات دەگرین، کە دەڵێ: ﴿لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا﴾.

٨)- ﴿وَيَأْتِينَا فَرْدًا﴾، بە تاقی تەنیا، بە سەڵت و قوڵتیی دێتەوە لامان، (الفَرْدُ: الَّذِي لَيْسَ مَعَهُ مَا يصيرُ بِهِ عَدَداً)، (فَرْد) ئەوەیە کە هی دیکەی لەگەڵدا نەبێ، کە پێی ببێتە ژمارە، یانی: تاك، بە کوردیی دەڵێین: سەڵت و قوڵت، واتە: ئەو سەروەت و سامانە، هیچی و، خزم و قەوم و کەسەکەی و، ئەو کوڕ و کچانەی هەینی، هیچیان لەگەڵی نایەن، بە تاقی تەنیا دێتەوە لامان.

**مەسەلەی دووەم:**

**هاوبەشدانەران بە مەبەستی باڵادەستیی و، زاڵ بوون، پەرستراوانی جگە لە خوا دەگرن، بەڵام بە پێچەوانەوە: لەسەریان دەبنە دوژمن و دژ و، لەسەریان قەرزدار بار دەبنەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً لِّيَكُونُوا۟ لَهُمْ عِزًّا ﴿٨١﴾ كَلَّا ۚ سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا ﴿٨٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەو ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً ﴾، هەروەها جگە لە خوا، لە جیاتی خوا، لە خوار خواوە، هەندێ پەرستراویان گرتن، (الإتِّخَاذُ: جَعَلُ الشَّخص الشَّيءَ لِنَفْسِهِ)، (إتِّخاذ) ئەوەیە کەسێك شتێك بۆ خۆی هەڵبژێرێ و، بۆ خۆی دایبنێ و تایبەتی بکات بە خۆیەوە، ئەوانە لە جیاتی خوا و، لە خوار خواوە و، جگە لە خوا، پەرستراوانێکیان بۆ خۆیان گرتن و پەیدا کردن، بۆچی؟

٢)- ﴿ لِّيَكُونُوا۟ لَهُمْ عِزًّا ﴾، تاکو بۆیان ببنە مایەی باڵادەستیی و زاڵبوون، (أي: لِيَكُونُوا مُعِزِّين لَهُمْ وَنَاصِرِيْن)، تاکو زاڵکەریان بن و سەرخەریان بن.

وشەی (عِز) چاوگە، (عِزَة) ناوەکەیەتی، (عَزَّ، يَعِزُّ، عِزّاً، وَعِزَّةً، فَهُوَ عَزِيزٌ)، (فَأُخْبِرَ بِالمَصْدَرِ، لِتَصْوِيْرِ اعْتِقَادِ المُشْرِكِيْنَ فِي آلِهَتِهِم أَنَّهُم نَفْسُ العِزِّ)، واتە: بۆیە فەرموویەتی: ﴿ لِّيَكُونُوا۟ لَهُمْ عِزًّا ﴾، نەیفەرمووە: (لِيَكُونُوا لَهُمْ مُعِزِّيْن)، یان: (لِيَكُونُوا لَهُمْ سَبَبَ عِزَّةٍ)، بە چاوگ (مصدر) هەواڵی پێداوە، تاکو بۆچوون و ئیعتیقادی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان سەبارەت بە پەرستراوەکانیان، بۆ ئێمە وێنا بکات، کە پێیان وابووە ئەو پەرستراوانە: هەر خودی زاڵ بوون و باڵادەستیین، نەك هۆکاری بن!

٣)- ﴿ كَلَّا ۚ سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ ﴾، هەرگیز وانیە، وەك دەیڵێن: بەڵکو بە پەرستنەکەیان بێبڕوادەبن.

ئەمە دوو واتای هەن:

أ- پەرستراوەکان حاشا دەکەن لە پەرستنەکانیان و، بۆیان ڕەت دەکەنەوە و پێی بێبڕوادەبن (ستكفر الآلهة بعبادتهم إياهم).

ب- یاخود: ﴿سَيَكۡفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمۡ﴾، یانی: کە لە دنیادا ئاوا خۆیان پێ هەڵدەکێشن و، ئەو پەرستراوانە دەگرن، تاکو لە دنیادا ببنە مایەی باڵادەستییان، لە دواڕۆژدا، پێیان بێبڕوادەبن و ڕەفزیان دەکەن و، ئەو پەرستنەیان کە بۆیان ئەنجام داون، نایانەوێ، چونکە لەسەری قەرزدار دەبنەوە (سیکفر المشرکون بعبادتهم إیاهم).

٤)- ﴿وَيَكُونُونَ عَلَيۡهِمۡ ضِدًّا﴾، هەروەها ئەو پەرستراوانە، لەسەریان دەبنە دژ و لێیان دەبنە دوژمن.

(الضِدُّ: اسْمُ مَصْدَرٍ، وَهُوَ خِلافُ الشَّيْءِ فِي المَاهِيَةِ أو المُعَامَلَةِ، وَمِنَ الثَّانِي تَسْمِيَةُ العَدُوِّ ضِدّاً، وَلِكَوْنِهِ فِي مَعْنَى المَصْدَرِ، لَزِمَ فِي حَالِ الوَصْفِ بِهِ، حَالَةٌ وَاحِدَةٌ، بَحَيْثُ لاَ يُطَابِقُ مَوْصُوفَهُ).

واتە: وشەی (ضِد)، ناوی چاوگە و، (ضِد) بریتیە لە پێچەوانەی شتێك لە خودیدا، یاخود لە مامەڵەیدا [بۆ وێنە: ڕەش و سپی دژی یەکن، تاریکیی و ڕووناکیی دژی یەکن، ساردو گەرم دژی یەکن، ئەگەر سارد بێ، گەرم نابێ، ئەگەر ڕەش بێ، سپی نابێ، ئەگەر تاریکیی بێ، ڕووناکیی نابێ، ئەوە لە کاتێکدا کە پێچەوانەی یەکدی بن، لە خودو چییەتدا] بەڵام جاری واش هەیە لە هەڵسوکەوتدا دژی یەکن، وەك (عَدُو)، دوژمن، دژی دوژمنەکەیەتی، [واتە: لە هەڵسوکەوتیدا، پێچەوانەی ئەو ڕەفتار دەکات و دژ و پێچەوانەیەتی و لەگەڵی تێك دەگیرێ] تنجا لەبەرئەوەی وشەی (ضِد) لە مانای چاوگدایە، بۆیە کاتێك کە شتێکی پێ وەصف دەکرێ، حاڵەتێکی نەگۆڕی دەبێ کە حاڵەتی تاکییە و لەگەڵ وەسف کراوەکەدا، پێکەڵپێك نایەتەوە.

بۆ وێنە: دەگوترێ: (هُوَ ضِدّي، أو هُمْ ضِدّي، أو هُنَّ ضِدّي)، هەمووی هەر یەکە، چونکە وشەی (ضِدّ)، لە مانای چاوگدایە و چاوگیش کۆ ناکرێتەوە، چاوگ (مصدر) یانی: ئەوەی شتەکەی لێوە دێ، ئنجا شتێك سەرچاوە بێ، پێویستیی بە کۆکردنەوە نابێ، بۆیە کاتێك کە دەکرێتە وەصف، شوێن مەوصووفەکەی ناکەوێ، لە حاڵێکدا کە: دووانە، یان نێرە، یان مێیە، یان کۆیە، یان تاکە، بەڵکو یەك حاڵەت بەخۆیەوە دەگرێ، کە بریتیە لە حاڵەتی چاوگیی و بە شێوەی تاك دێ.

**مەسەلەی سێیەم:**

**تێبەردانی خوا بۆ شەیتانەکان لە کافران، کە بەرەو خراپە هانیان بدەن و، ژماردنی ڕۆژەکانی سزادان، یاخود ژماردنی جۆرەکانی سزادان، بۆ بێبڕوایان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّا أَرْسَلْنَا ٱلشَّيَـٰطِينَ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ تَؤُزُّهُمْ أَزًّا ﴿٨٣﴾ فَلَا تَعْجَلْ عَلَيْهِمْ ۖ إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا ﴿٨٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەو ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّا أَرْسَلْنَا ٱلشَّيَـٰطِينَ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾، ئایا نابینی، (ئایا نازانی) کە ئێمە شەیتانەکانمان ناردوونە سەر کافرەیان! لێرەدا بینین، بینینی چاویی نیە، یانی: ئایا نەتزانی؟ بە چاوی عەقڵ و دڵ نەتبینی؟ ئەی ئەو کەسەی قورئان دەخوێنی؟ یان هەر کەسێ کە دەگونجێ بدوێنرێ، چی نەبینی؟ ﴿ أَنَّا أَرْسَلْنَا ٱلشَّيَـٰطِينَ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾، ئێمە شەیتانەکانمان لە کافرەکان بەرداون، ناردوومانە سەریان، چییان لێ دەکەن؟

٢)- ﴿ تَؤُزُّهُمْ أَزًّا ﴾، بە هاندانێکی زۆر توند هانیان دەدەن و، هەڵیان دەپێچن، دنەیان دەدەن، (**الأَزُّ: الهَزُّ، وَالإِسْتِفْزَازُ البَاطِنِيُّ، ومَأخوذٌ مِنْ أزِيْزِ القِدْرِ، إذَا اشْتَدَّ غَلَيَانُهَا**)، (أَزّ) بە مانای (هَزّ) دێ، یانی: ڕاوەشاندن، پاڵپێوەنان، هاندان، یانی: هاندانی دەروونیی، کە ئەویش لە (أَزِيْزِ القِدْرِ)ەوە هاتوە، مەنجەڵ کە دەکوڵێ و، گزەگزێکی لێوە دێ، کاتێك کە زۆر دەکوڵێ، لەوەوە هاتوە.

کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ ﴾، ئەمە پرسیارکردنی سەرسوڕماندنە (**الإِسْتِفْهَام تَعْجِيْبِيٌّ**)، نەك مەبەست پرسیارکردنی ڕاستەقینە بێ، کە بیەوێ وەڵامەکەی وەربگرێتەوە.

لە شوێنی دیکەدا خوا ﷻ هەواڵی پێداوین، کە شەیتانەکان دۆستی کافرەکانن، وەك لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَـٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾، واتە: ئێمە شەیتانەکانمان کردوونە دۆست و نیزیکی ئەوانەی بڕواناهێنن.

هەروەها لە سوورەتی (الأنعام)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ شَيَـٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِى بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ﴿١١٢﴾ ﴾، واتە: شەیتانەکانی مرۆڤ و جینن، هەندێکیان قسەی بریقەداری فریودەر بۆ هەندێکیان دەنێرن، کە بە تەئکید مەبەست

ناردنی خوتخوتە و خەیاڵی فریودەر و بریقەداری شەیتانەکانە، بۆ دۆستە کافرەکان لە مرۆڤەکان.

٣)- ﴿ فَلَا تَعْجَلْ عَلَيْهِمْ ﴾، لێیان بە پەلە مەبە، یانی: لێیان بە پەلە مەبە خوا سزایان بدات، بەپەلە سزادانیان بۆ مەخوازە.

٤)- ﴿إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا ﴾، بە دڵنیایی ئێمە هەر بۆیان دەژمێرین بە ژماردن، ئەمە هۆکاردۆزیی (تعلیل)ە، بۆ قەدەغە کردنەکە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَعْجَلْ عَلَيْهِمْ ﴾، ئەو نەهێشتن (نهي)ە: پەلە مەکە بۆ سزایان ﴿إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا ﴾، هۆکارەکەی ئەوەیە کە ئێمە هەر بە ژماردن بۆیان دەژمێرین، واتە:

أ- کاتەکانیان بۆ دەژمێرین و ئەوانمان لەبیر نەچووە.

ب- یاخود: کاتەکەیان هێندە کەمە، ژمێردراوە.

ج- یاخود ئێمە سزایان بۆ دەژمێرین، جۆرەکانی سزایان بۆ دەژمێرین: فڵان جۆر و فڵان جۆر و... هتد کە لە ڕۆژی دواییدا پێی سزا بدرێن.

**مەسەلەی چوارەم:**

**باسی بەڕێکردنی پارێزکاران بەرەو لای خوای میهرەبان، بە ڕێزو حورمەتەوە و لێخوڕینی تاوانباران بەرەو دۆزەخ، وەك ڕەوە ئاژەڵی تینو و کە دەبرێتە سەر ئاو، تکا نەکرانیش بۆ هیچ کەس، جگە لەوانەی پەیمانیان لە لای خوا هەیە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ نَحْشُرُ الْمُتَّقِينَ إِلَى الرَّحْمَٰنِ وَفْدًا ﴿٨٥﴾ وَنَسُوقُ الْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴿٨٦﴾ لَّا يَمْلِكُونَ الشَّفَاعَةَ إِلَّا مَنِ اتَّخَذَ عِندَ الرَّحْمَٰنِ عَهْدًا ﴿٨٧﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەو ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:**

**١)- ﴿يَوْمَ نَحْشُرُ الْمُتَّقِينَ إِلَى الرَّحْمَٰنِ وَفْدًا﴾، ئەو ڕۆژە کە پارێزکاران بەرەو خوای بەخشندە، وەك شاند، بەڕێزەوە کۆدەکەینەوە.**

وشەی (حَشر)، واتە: کۆکردنەوە بە ڕەهایی، بەڵام بە پێی سیاق و شوێن دەزانین، چ جۆرە کۆکردنەوەیەکە؟

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ نَحْشُرُ الْمُتَّقِينَ إِلَى الرَّحْمَٰنِ وَفْدًا﴾، واتە: ئەو ڕۆژە کە پارێزکاران بەرەو (خوای) بە بەزەیی و بەخشندە بە شێوەی وەفد، کۆدەکەینەوە، (وَفد)، یانی: نوێنەر، ئنجا (وَفد) بۆ تاك و کۆ بەکاردێ، ئاشکراشە شاندو نوێنەران کە دەچن بۆ لای لایەنێك، بەرگ و پۆشاکی جوان لەبەر دەکەن و، خۆیان دەڕازێننەوە و، خۆیان بۆنخۆش دەکەن، پاشان ئەو ئامرازەی کە پێی دەچن، هەرچییەك بێ، هەوڵدەدەن باشترین بێ، بۆ گەیشتنیان بۆ شوێنی مەبەست.

کەواتە: کە دەفەرموێ: ئەو ڕۆژە کە پارێزکاران بەرەو خوای بەخشندە وەك وەفد کۆدەکەینەوە، هەربێژەی (وَفد) چۆنیەتیی چوونی پارێزکاران دیاریی دەکات، چونکە: وەفدێك کە دەچێ بۆ لای حوکمڕانێك، بۆ لای دەستەڵاتدارێك، هەم خۆی باش ڕێك دەخات، هەم لە لای ئەو حوکمڕانەشەوە: باش پێشوازیی لێ دەکرێ و، ڕێزی لێ دەگیرێ، واتە: ئێمە ڕێزیان لێ دەگرین و بە ڕێز و حورمەتەوە کۆیان دەکەینەوە، ئەوە بە نسبەت پارێزکارانەوە.

٢)- ﴿ وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴾، تاوانبارانیش لێدەخوڕین بە تینوویتیی بەرەو دۆزەخ.

(نَسُوق) (السَّوْقُ: تَسْيِيرُ الأَنْعَام قُدَّامَ رُعَاتِهَا)، (سَوْق)، بریتیە لە دەنگدان و لێخوڕینی ئاژەڵان لە بەردەم شوان و گاوانەکانیاندا، واتە: لێیان دەخوڕین.

وشەی: ﴿ وِرْدًا ﴾یش حاڵە بۆ: ﴿ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴾، یانی: تاوانباران لێ دەخوڕین، لە حاڵێکدا کە حاڵەتی (وِرْد)دان، ئنجا (وِرْد) دەگونجێ کۆی (وَارِد) بێ، یانی: کەسێك کە دەچێتە سەر ئاو، تاکو ئاو بخواتەوە، یان بیهێنێ، دەشگونجێ بەمانای: (ذَاتَ وِرْدٍ) بێ، واتە: کە خاوەنی ئاو خواردنەوەن، لەبەرئەوەی تینوون، دەیانەوێ بچن ئاو بخۆنەوە، کەسێك ژیانی لادێی تۆزێك بینیبێ، گاگەل یان گاڕان دەبینێ، یاخود مەڕ و بزنان دەبینێ، یان حوشترگەل دەبینێ، کاتێك کە دەبینێ دەبرێنە سەر ئاو، زۆر بە پەلە پەل دێن، چونکە تینوون، هەموویان خۆیان تێکەڵ دەکەن و، دەیکەنە تەپ و تۆز و دەنگە دەنگ و، بە حاڵێکی ناخۆش دەبرێنە سەر ئاو، دواییش کە دەگەنە سەر ئاوەکە، بەپەلە پێیدا دەنووسێن، تاوانبارانیش ئاوا بەرەو دۆزەخ، وەك ڕەوە ئاژەڵی تینوو، بەڕێ دەکرێن.

٣)- ﴿ لَّا يَمْلِكُونَ ٱلشَّفَٰعَةَ ﴾، خاوەنی تکا کردن نین، واتە: تکایان بۆ ناکرێ، ئەگەرنا مەبەست ئەوە نیە: تکا بۆ کەس ناکەن، ئەوانە خوا خوایانە کەسێك تکایان بۆ بکات، ئەوە هەر هیچ کە توانای تکاکردنیان نیە، ﴿ لَّا يَمْلِكُونَ ٱلشَّفَٰعَةَ ﴾، واتە: خاوەنی تکاکردن نین، تاکو تکایان بۆ بکرێ.

٤)- ﴿ إِلَّا مَنِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَٰنِ عَهْدًا ﴾، هیچ کەس خاوەنی تکا کردن نیەو تکای بۆ ناکرێ، مەگەر کەسێك پەیمانی لە لای خوای خاوەن بەزەیی وەرگرتبێ، بەڵێن و پەیمانی وەرگرتبێ.

دیارە: ﴿ مَنِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَٰنِ عَهْدًا ﴾، لەگەڵ ﴿ لَّا يَمْلِكُونَ ٱلشَّفَٰعَةَ ﴾، کە (مُسْتَثْنَى و مُسْتَثْنَى مِنْه)ن، لە یەك جینس نین، بۆیە ئەمە پێی دەگوترێ: (إِسْتِثْنَاءُ مُنْقَطِعٌ)، هەڵاواردنێکی دابڕاو، چونکە ئەوەی پەیمانی لە خوای خاوەن بەزەیی وەرگرتوە، کە شەفاعەت و تکای بۆ بکرێ، جیایە لەوەی کە خاوەنی شەفاعەت نیەو، تکا و شەفاعەتی بۆ ناکرێ.

کەواتە: مانایەکەی ئاوای لێدێتەوە: خاوەنی تکاکردن نین و، تکایان بۆ ناکرێ، بەڵام کەسانێك پەیمانیان لە لای خوای خاوەن بەزەیی وەرگرتوە، ئا ئەوانە تکایان بۆ دەکرێ، ئنجا ئەوانەش کێ تکایان بۆ دەکات؟ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) و فریشتە پاك و بێگوناهەکانی خوا، هەروەها لە دوای پێغەمبەرانیش دۆستانی خواو، زانایان وشەهیدان، هەر کەسە بە پێی خۆی.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**باسی قسەی پووچی کافرەکان بە پاڵ دانی ڕۆڵە بۆ لای خوا و، وێناکردنی بێزاریی گەردوون لەو قسەیەی کافرەکان کە بریتییە لە: پاڵدانی ڕۆڵە بۆ لای خوا، بە: نیزیک بوونەوەی شەق و پەق بوونی ئاسمانەکان، قڵیشانیان و لەت و پەت بوون و پارچە پارچە بوونی زەوی و، داڕووخان و بەسەریەکدا ڕمانی چیایەکان، چونکە هەر کەس لە ئاسمانەکان و زەوی دایە، بەندەی خوای خاوەن بەزەییە، هەموویانیشی ئەژمار کردوە و، سەرژمێری کردوون و، هەر کامێکیشیان بە تاقی تەنیا، بە سەڵت و قوڵتیی لە ڕۆژی قیامەتدا دێتەوە خزمەت خوا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ﴿٨٨﴾ لَّقَدْ جِئْتُمْ شَيْـًٔا إِدًّا ﴿٨٩﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ ٱلْأَرْضُ وَتَخِرُّ ٱلْجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوْاْ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدًا ﴿٩١﴾ وَمَا يَنۢبَغِى لِلرَّحْمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴿٩٢﴾ إِن كُلُّ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّآ ءَاتِى ٱلرَّحْمَٰنِ عَبْدًا ﴿٩٣﴾ لَّقَدْ أَحْصَىٰهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا ﴿٩٤﴾ وَكُلُّهُمْ ءَاتِيهِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فَرْدًا ﴿٩٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەو ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ﴾، هەروەها گوتیان: خوای خاوەن بەزەیی ڕۆڵەی پەیدا کردوە، بۆ خۆی بێگومان هاوبەش بۆ خوادانەرەکان، چ ئەوانەی وەك هاوبەش بۆ خوادانەر ناسراون، چ ئەوانەی بەو شێوەیەش نەناسراون، بۆ وێنە: نەصرانییەکان، هەروەها جوولەکەکان، وەك خوا ﷻ لەسەر زاریان دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ ﴿٣٠﴾ ﴾التوبة، هەروەها هی دیکەش هەن، کە خۆشیان پاڵدەدەنە لای کتێبی ئاسمانیی و لای پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلَام) و لەو جۆرە بیرۆکە ئەفسانەییانەیان هەیە و پێیان وایە: خوا ڕۆڵەی هەن، چ کوڕ چ کچ، چ هەردووکیان.

٢)- ﴿ لَّقَدْ جِئْتُمْ شَيْـًٔا إِدًّا ﴾، بە دڵنیایی ئێوە شتێکی زۆر ناقۆڵا، گوناهێکی زۆر زەبەلاح، ناماقووڵییەکی بێرەزاتان کرد، (الإِدُّ: الأَمْرُ المُنْكَرُ الفَظِيعُ والأمْرُ المُسْتَبْشَعُ)، کارێکی ناقۆڵای دزێوی قێزەون دەگوترێ: (آدَهُ الأَمْرُ أي: ثَقُلَ عَلَيْهِ، وَلَمْ يَقْوَ عَلَيْهِ)، لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی کورسیی

دا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَئُودُهُ حِفْظُهُمَا(٢٥٥)﴾، (أي: لاَ يُثْقِلُهُ)، پاراستنی ئاسمانەکان و زەوی لەسەر خوا قورس نیە و، پێیەوە ماندوو نابێ.

کەواتە: (آدَهُ الأمْرُ أي: ثَقُلَ عَلَيْهِ)، کارەکە لەسەری قورس و زەحمەت بوو ﴿لَقَدْ جِئْتُمْ شَيْئًا إِدًّا﴾، بەدڵنیاییی شتێکی قورستان گوت، کە گەردوون نایتوانێ و تەحەمولی ناکات: نە ئاسمانەکان، نە چیاکان، نە زەوی، شتێکی زۆر ناماقووڵ و بێڕەزاتان کرد، ئنجا خوا ﷻ بێزاریی و ناڕەحەتیی و تووڕەیی ئاسمانەکان و زەوی و چیاکانمان بۆ وێنا دەکات، بە چەند تەعبیرێك کە وەك پێشتریش گوتمان: ئەم چەند ئایەتە تاکە شوێنن کە بەو شێوەیە لە هەموو قورئاندا خوا ﷻ بەرپەرچی بیرۆکەی ڕۆڵە پاڵدانە لای خوا بداتەوە بەو هەموو ڕەوانبێژییەو، بەو هەموو تەعبیرە بەهێزو پێزانە، دەفەرموێ:

٣)- ﴿تَكَادُ السَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ﴾، نیزیکە ئاسمانەکان بەهۆی ئەو قسەیەوە، بقڵیشێن.

وشەی: (تَكَادُ) خوێنراوەتەوەش: (يَكَادُ)، هەروەها وشەی: (يَتَفَطَّرْنَ) خوێنراوەتەوەش: (يَنْفَطِرْنَ) بۆ هەردوو وشەکان هەردوو خوێندنەوەکان هاتوون، (يَتَفَطَّرْنَ أي: يَتَشَقَّقْنَ)، (الفَطْرُ: الشَقُّ طُولاً)، (فَطْر) لە تبوونی شتێك بە باری درێژییدا، کە بە کوردیی پێی دەگوترێ: قڵیشاندن، هەڵقەڵاشتن، ئاسمانەکان خەریکە هەڵدەقڵیشێن، خەریکە دەقڵیشێن.

٤)- ﴿وَتَنشَقُّ الْأَرْضُ﴾، هەروەها زەویش نیزیکە لەت و پەت و پارچە پارچە ببێ، چونکە: (شَقَّ)، یانی: لەتی کرد، (إنشَقَّ)، واتە: لەت و پەت بوو.

٥)- ﴿وَتَخِرُّ الْجِبَالُ هَدًّا﴾، هەروەها نیزیکە چیاکانیش بکەون و بەسەریەکدا بڕمێن و بڕووخێن، (الهَدُّ: هَدْمُ البِنَاءِ)، ڕووخاندنی خانوو و دیوار، وشەی: ﴿هَدًّا﴾، (مَفْعُول مُطْلَق)ی (تَخِرُّ)ە، تاکو دەربکەوێ، چ جۆرە کەوتنێکە، چیاکان نیزیکن بکەون بە کەوتنێکی بەسەریەکدا ڕمان و پارچە پارچە بوون.

٧)- ﴿أَن دَعَوْا لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدًا﴾، لە سۆنگەی ئەوەوە کە بۆ (خوای) خاوەن بەزەیی لافی ڕۆڵەیان لێدا، (دَعَوْا) یانی: (طَلَبُوا)، بەڵام لێرەدا یانی: پاڵیان دایە لای خوا، لافیان لێدا کە خوا ڕۆڵەی هەیە.

٨)- ﴿وَمَا يَنبَغِي لِلرَّحْمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا﴾، (خوای) خاوەن بەزەیی بۆی ناگونجێ و لێی ناوەشێتەوە، شایستەی نیە، ڕۆڵە بکرێ، ﴿وَمَا يَنبَغِي﴾، یانی: (مَا يَجُوزُ)، نالوێ، ناگونجێ،

دروست نیە، وشەی (يَنبَغِي)، لە ئەصڵدا (بَغَى أي: طَلَبَ) داوایکرد بەڵام (يَنبَغِي، أي: يَسْتَجِيبُ لِلطَّلَبِ)، وەڵامی داوا دەداتەوە، (وَمَا يَنبَغِي)، یانی: ناگونجێ و، نالوێ.

٩)- ﴿ إِن كُلُّ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّآ ءَاتِي ٱلرَّحْمَٰنِ عَبْدًا ﴾، واتە: هیچ کەس نیە لە ئاسمانەکان و زەویدا، مەگەر وەك بەندە دێتە لای (خوای) خاوەن بەزەیی، دێتە خزمەتی لە ڕۆژی دواییدا، (إِن) لێرەدا لابەرە (نافية)یە.

١٠)- ﴿ لَّقَدْ أَحْصَىٰهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا ﴾، (خوا ﷻ) هەموویانی سەرژمێر کردوە و بەژماردن ژماردوونی، (إِحْصَاء)، واتە: سەرژمێرکردن، کە بزانرێ ژمارەیان چەندە؟ (العَدُّ: ضَمُّ الأَعْدَادِ بَعْضِهَا إلى بَعْض)، خستنە پاڵ یەکی ژمارەکان وەك: (١ و ٢ و ٣ و ٤)، ئەوە (عَدّ)ە، بەڵام (إِحْصَاء)، ئەوەیە کە کۆتاییەکەی بزانی، واتە: بزانی ئەندازەی ژمارەکە چەندە؟ (عَدّ) بریتیە لە: پرۆسەی ژماردن، بەڵام (إِحْصَاء)، بریتیە لە کۆتایی پرۆسەی ژماردن و، زانینی سەرەنجامەکەی.

١١)- ﴿ وَكُلُّهُمْ ءَاتِيهِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فَرْدًا ﴾، هەمووشیان لە ڕۆژی دواییدا، لە ڕۆژی قیامەتدا بە تاك و تەنیایی بە سەڵت و قوڵتیی دێنەوە خزمەت خوا ﷻ.

**مەسەلەی شەشەم:**

**بڕوادارانی کردار باش، خوای میهرەبان خۆشەویستییان بۆ دەڕەخسێنێ:**

خـوا فەرموویـەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجۡعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وُدّٗا ﴿٩٦﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

**١)- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾، بە دڵنیاییەوە ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکان ئەنجام دەدەن، ﴿ءَامَنُواْ﴾، واتە: بڕوایان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە بڕوایان پێ بهێندرێ.**

**بۆیـەش بـەرکار (مَفْعُـول بِه)ەکـەی نەهێنـاوە، تاکـو هەمـووی بگرێتـەوە، ئەگەرنـا دەبووایـە بفەرمـوێ: (آمَنُـوا بِاللّـه وَمَلاَئِكَتـهِ وَكُتُبـهِ وَرُسُـولِهِ وَاليَـوْمِ آخِـرِ ... )، بـەڵام لـە جیاتـی ئـەوە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ءَامَنُواْ﴾، واتـە: ئیمانیـان هێنـاوە بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی کـە پێویسـتە بڕوایـان پـێ بێنـن، ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾، چاکەکانیشـیان کـردوون، وشـەی: ﴿ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾، سیفەتی ئاوەڵناوێـکی قرتێـنراو (صفـة موصـوف محـذوف)ە، یـانی: (عَمِلُـوا خِصَـالَ الصَّالِحَـات)، خەصڵەتـە باشـەکانیان ئەنجـام داون، ئنجـا خەصڵەتـە باشـەکان، پەیوەندییـان بـە ئیـمان و عەقیـدەوە هەبـێ، بـە عیباتـەوە هەبـێ، بـە ڕەوشـت و ئـاکارەوە هەبـێ، بـە بـاری کەسـێتییەوە هەبـێ، بـە لایەنـی کۆمەڵایەتیـی، لایەنـی سیاسـیی، لایەنـی ئابووریی...هتـد، هەمـووی دەگرێتـەوە.**

**ئنجا کەسانێك کە بەو شێوەیەن:**

**٢)- ﴿سَيَجۡعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وُدّٗا﴾، خوای خاوەن بەزەیی خۆشەویستییان بۆ دەڕەخسێنێ، ﴿وُدّٗا﴾ واتە: مەحەببەت و خۆشەویستیی، ئەمە وەك ئەو ئایەتەی سووڕەتی (طه)یە، کە خوا دەربارەی مووسا ﷺ دەفەرموێ: ﴿وَأَلۡقَيۡتُ عَلَيۡكَ مَحَبَّةٗ مِّنِّي ﴿٣٩﴾﴾، واتە: لە لایەن خۆمەوە خۆشەویستییەکم خستە سەر تۆ، واتە: تۆم خۆشەویست کرد، لە لایەن خۆمەوە تۆم وا لێکرد: خۆشویستراو بی، گوتراوە: مووسا ﷺ لەو کاتەدا کە مەلۆتکە بووە، هەر کەسێك بینیبای خۆشیدەویست، هەر بۆیەش دارودەستەی فیرعەون نەچۆتی بیکوژن، هەرچەندە لێی**

لە گوماندا بوون، بەڵام هێندە منداڵێکی شیرین و دڵگیر و خۆشەویست بوو، دەستیان نەچۆیە بیکوژن.

ئنجا لەو بارەوەی کە خوا خۆشەویستیی بۆ بڕوادارانی کردار باش، دەرەخسێنی، زانایان پێنج ڕایان هەن:

١- هەندیکیان گوتوویانە: واتە: لەلای خۆی خۆشەویستییان بۆ دەرەخسێنی و خۆی خۆشیدەوێن.

٢- هەندێکیان گوتوویانە: فریشتەکان خۆشیان دەوین.

٣- هەندێکیان گوتوویانە: لەلایەن بڕوادارانەوە، وا دەکات بڕواداران خۆشیان بوێن.

٤- هەندیکیان گوتوویانە: لەلایەن خەڵکەوە بە گشتی.

٥- هەندێکیان گوتوویانە: لە ڕۆژی دواییدا.

بەڵام من پێموایە: لە یەك كاتدا دەگونجێ ئەوانە هەموویان مەبەست بن، کەسێك کە ئیماندار و کردار باش بێ:

١- هەم خوا خۆشی دەوێ.

٢- هەم فریشتەکان خۆشیان دەوێ.

٣- هەم بڕواداران خۆشیان دەوێ.

٤- هەم هەر خاوەن ویژان و فیترەتێکی باش و ساغ خۆشیدەوێ.

٥- چ لە دنیا و چ لە دواڕۆژدا.

چونکە کەسانی بڕوادار و کردار باش، ڕازاوەن بە خەسڵەت و سیفەتە بەرزو پەسندەکان، هەموو مرۆڤێکیش لە ناخی خۆیدا کەیفی بە خەسڵەت و سیفەتی پەسند دێ، وەك: ئازایەتیی، سەخاوەت، خاکیبەتی، ڕەحم و بەبەزەیی، ئینصاف و دادگەریی، هەموو مرۆڤێك کەیفی بە سیفەتە باشەکان دێ و، ڕقیشی لە سیفەتە خراپەکانە، ئەگەر خۆیشی خاوەنی سیفەتی باش نەبێ و گیرۆدە بوو بێ، بە سیفەتی خراپەوە.

لەو بارەوە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دێنین: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ اللَّهَ إِذَا أَحَبَّ عَبْدًا، دَعَا جِبْرِيلَ فَقَالَ: إِنِّي أُحِبُّ فُلَانًا فَأَحِبَّهُ، قَالَ: فَيُحِبُّهُ جِبْرِيلُ، ثُمَّ يُنَادِي فِي السَّمَاءِ فَيَقُولُ: إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ فُلَانًا فَأَحِبُّوهُ، فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ، قَالَ: ثُمَّ يُوضَعُ لَهُ الْقَبُولُ فِي الْأَرْضِ، وَإِذَا أَبْغَضَ عَبْدًا، دَعَا جِبْرِيلَ فَيَقُولُ: إِنِّي أُبْغِضُ فُلَانًا فَأَبْغِضْهُ، قَالَ:

فَيُبْغِضُهُ جِبْرِيلُ، ثُمَّ يُنَادِي فِي أَهْلِ السَّمَاءِ: إِنَّ اللَّهَ يُبْغِضُ فُلَانًا فَأَبْغِضُوهُ، قَالَ: فَيُبْغِضُونَهُ، ثُمَّ تُوضَعُ لَهُ الْبَغْضَاءُ فِي الأَرْضِ﴾ (أخرجه البخاري: ٣٢٠٩، ومسلم: ٢٦٣٧).

واتە: بە دڵنیایی خوای بەرز کاتێ یەکێ لە بەندەکانی خۆی خۆشویست، بانگی جیبریل دەکات، دەفەرموێ: من فڵان کەسم خۆشدەوێ، تۆش خۆشت بوێ، ئیدی جیبریل خۆشیدەوێ و، دوایی جیبریل لە ئاسماندا جاڕ دەدا، دەڵێ: خوا فڵان کەسی خۆشدەوێ، ئێوەش خۆشتان بوێ، خەڵکی ئاسمان خۆشیان دەوێ، گوتی: دوایی پەسندیی بۆ دەخرێتە سەر زەوی، (واتە: ئەو خۆشەیستییەی بۆ دەخرێتە نێو خەڵکی سەر زەوی) بە پێچەوانەشەوە کاتێك خوا ڕقی لە یەکێ لە بەندەکانی خۆی دەبێ، بانگی جیبریل دەکات دەفەرموێ: من فڵان کەسم ڕق لێیە، تۆش ڕقت لێ هەڵسێ، جیبریل ڕقی لێ دەبێتەوە، دوایی جیبریل لە ئاسماندا جاڕ دەدا: کە خوا ڕقی لە فڵان بەندەیە، ئێوەش ڕقتان لێبێ، ئەوانیش دەیبوغزێنن، دوایی بوغزێنراویی بۆ دەخرێتە نێو خەڵکی سەر زەویشەوە.

**مەسەلەی حەوتەم و کۆتایی:**

**ئاسانکاریی خوا بۆ پێغەمبەر ﷺ کە قورئانی بە زمانی خۆی پێ بخوێنێ و، موژدەی پێ بە پارێزکاران بدات و، کافرانی کەللەڕەقی پێ بترسێنێ و، هەڕەشە کردن لە کافرەکان، کە خوای زاڵ ﷻ گەلێك سەدەی لە پێش ئەواندا فەوتاندوون واتە: لە پێش کافرەکانی سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ کە هیچ هەست و خوستیان نەماوە و، ورتەیان لێ نایەت:**

خوا فەرموویەتی: ﴿ فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ ٱلْمُتَّقِينَ وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوْمًا لُّدًّا ﴿٩٧﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هَلْ تُحِسُّ مِنْهُم مِّنْ أَحَدٍ أَوْ تَسْمَعُ لَهُمْ رِكْزًا ﴿٩٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ئاسانمان کردوە بە زمانی خۆت.

بێگومان ڕاناوەکەی بۆ قورئان دەچێتەوە، ئەوە بەسیاق و سەلیقە دیارە، واتە: ئەم قورئانە کە ئەوان نکوولّیی لێدەکەن و بڕوای پێ نایەنن، بە زمانی خۆت ئاسانمان کردوە، واتە: ئاسانمان کردوە بۆ خوێنران، بۆ لەبەرکران و، بۆ فامکران و لێتێگەیشتن و، بۆ کارپێکردن و جێبەجێکردن، هەمووی دەگرێتەوە.

**ئنجا ئایا ئامانج لەو ئاسانکردنە چییە؟!**

٢)- ﴿ لِتُبَشِّرَ بِهِ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾، تاکو موژدەی پێ بدەی بە پارێزکاران: موژدەی ڕەزامەندیی خوا، موژدەی بەهەشتی خوا، موژدەی سەربەرزیی دنیاو دوا ڕۆژ.

٣)- ﴿ وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوْمًا لُّدًّا ﴾، هەروەها کۆمەڵێکی سەرەخەر و نەسەلمێن و کەللەڕەق و، یاخییشی پێ بترسێنی، (قَوْم)، یانی: کۆمەڵە خەڵکێك، ﴿ لُّدًّا ﴾، کۆی (أَلَدّ)ە، یانی: بابایەك کە زۆر کەللەڕەق و نەسەلمێن بێ و، مشت و مڕی بە ناهەق بکات، واتە: ئەوانیشی پێ بترسێنی و، هەڕەشەیان لێ بکەی پێی و، وریایان بکەیەوە: ئەگەر لەسەر کەللەڕەقیی خۆیان بمێننەوە و، بەردەوام بن، سەرەنجامێکی خراپ چاوەڕێیان دەکات.

٤)- ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ ﴾، لە پێش ئەوانیش دا زۆر سەدەمان فەوتاندووون.

کە دەفەرموێ: زۆر سەدەمان فەوتاندوون، یانی: زۆر کۆمەڵگا کە لە سەدەکاندا بە یەکەوە ژیاون، (قَرْنٍ)، یانی: (أهل قرن)، خەڵکی سەدەیەك کە پێکەوەن لەوکاتەدا.

(كَمْ)، (كَمْ الخبرية)یەو لێرەدا مانای زۆریی دەگەیەنێ، یانی: زۆر کۆمەڵگا کە لە سەدە پێشووەکاندا ژیاون، فەوتاندوومانن.

٥)- ﴿ هَلْ تُحِسُّ مِنْهُم مِّنْ أَحَدٍ ﴾، ئایا هەست دەکەی بە هیچ کامێك لەوان؟ یانی: هەست بە هیچ کامێکیان دەکەی؟ ئەمە پرسیارکردنی نکوولّیلێکەرانەیە، یانی: (مَا تَشْعُرُ مِنْ أَحَدٍ)، واتە: هەست بە هیچ کامێکیان ناکەی، هیچ کامیان نەماون هەست و خوستیان نەماوە.

٦)- ﴿ أَوْ تَسْمَعُ لَهُمْ رِكْزًا ﴾، یان ئایا هیچ ورتەیەکیان لێ دەبیستی؟

(رِكْز: الصَّوْتُ الخَفِيُّ الَّذِي لاَ تَكَادُ تَسْمَعُه)، ئەو دەنگە کپ و نزمەی، کە نیزیکە نەیبیستی، واتە: ئایا تۆ هیچ کامیان هەست پێ دەکەی، مابن؟ هەست و خوستیان ماوە؟ ئایا هیچ ورتەیان لێدێ؟ نەخێر، بەڵکو هەموویان چوونەتە شاری خامۆشان و، هەموویان لەگەڵ خاکدا یەکسان بوون و، تاوێتە بوون، بەڵام کاتێك خوا ﷻ ویستی: جارێکی دیکە ئەوانە لە زەوی دەهێنرێنەوە دەر و، لە گۆڕەپانێکدا کۆ دەکرێنەوە بۆ لێپرسینەوەو سزاو پاداشت، کە ئەو گۆڕەپانەش - وەك لە تەفسیری سوورەتی (إبراهیم)دا گوتمان - لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ ڕوونی کردۆتەوە و دەفەرموێ: گۆڕەپانێکە وەك نانێکی سپی وایە، هیچ بەرز و نزمیی تێدا نیە و، هیچ گوناهی لەسەر نەکراون، کەواتە: نابێ ئەم سەر زەوییەی ئێمە بێ، چونکە ئەم سەر زەوییەی ئێمە، ئەگەر پانتایی دەریاکانیشی بخرێتەوە سەرێ و، هەمووشی بکرێتە مەیدان و گۆڕەپان، ئنجا جێی هەموو مرۆڤایەتیی لەسەر نابێتەوە، لە ئادەمەوە، تاکو کۆتا مرۆڤ، کە لەسەر ئەم زەوییە دەژی، کە ئێستا نیزیکەی هەشت ملیار (٨٠٠٠٠٠٠٠٠٠) کەس لەسەر ئەم زەوییە، دەژین و، بەس خوا دەزانێ چەند ملیاری دیکە دێن و، چەند ملیاریش بە ڕێکراون؟

کەواتە: کاتێك دێ کە ئەوانە لە مەیدانێکدا کۆدەکرێنەوە و، ئەو مەیدانەش لە جیهانێکی تازەدا دێتە گۆڕێ، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ الْأَرْضُ غَيْرَ الْأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ وَبَرَزُوا لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ ﴾إبراهیم، واتە: ئەو ڕۆژە کە زەوی غەیری ئەم زەوییە دەبێ و، ئاسمانەکانیش جگە لەم ئاسمانانە دەبن و، هەموویان بۆ خوای تاکی

مـل پێکەچکـەر دێنـە گـۆڕێ، لـە بازاڕێکـی دیکـەدا، لـە قۆنـاغ و گـەردوونێکـی دیکـەدا، کـە بـەس خـوا دەزانـێ چۆنـە؟

خـوا بـە لوتـف و کـەرەمـی خـۆی یارمەتییـمان بـدات: بـە شـێوەیەك بژیـن، لـەو کاتـەدا کـە دەچینـە مەیدانـی کۆکردنـەوە و لێپرسـینەوە و ڕادەنوێنرێـن لـەلای خـوای زانـای شـارەزا، کـە هیـچ شـتێکی لـێ پەنهـان نابـێ، لـەو ڕۆژەدا سـەربەرزبین و، بـە دەسـتی ڕاسـتمان نامـە و لیسـتی کردەوەکانمـان وەربگرینـەوە، نـەك لـە پشـتەوەڕا و، بـە لای چـەپ داو، سـەربەرزانە بگەڕێینـەوە لای خـزم و کەسـانمان و بڵێـن: ﴿ هَآؤُمُ ٱقْرَءُوا۟ كِتَـٰبِيَهْ ﴿١٩﴾ إِنِّى ظَنَنتُ أَنِّى مُلَـٰقٍ حِسَابِيَهْ ﴿٢٠﴾ ﴾الحاقـة، هـا لیسـتی کردەوەکانـم و بڕوانامەکـەم بخوێننـەوە، مـن دەمزانـی کـە لێپرسـینەوەو سـزاو پاداشـت هەیـە و، خـۆم بـۆ ئامـادە کردبـوو! خـوا لـەو کەسـانەمان بگێـڕێ.

سوپاس بۆ خوای بەرزو مەزن، لێرەش کۆتایی بە تەفسیرو لێکدانەوەی مانای ئایەتە موبارەکەکانی سووڕەتی مەریەم، دێنین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# نێوەڕۆک



## سـوڕەتی الكهف

## سوورەتی مريم